## لەم ژمارەیەدا




دارالحرية للطباعة ـ بغداد

ئەیلولی سالی 1985

# رۆشنبیری نوێ

ژمارە (107)

کۆڤارێکی وەرزیە بۆ لێکۆڵینەوە

دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی

دەری دەکات



نەخشەکێشان و دەرهێنانی هونەری: نەسرین خضر

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الكردية

ساحة الخلاني بغداد/ تەلەفون ـ 8875795 پێنج خەتە

بسم الله الرحمن الرحيم
الجمهورية العراقية

وزارة التعليم العالي والبحث العلمي
رئاسة جامعة صلاح الدين
في محافظة اربيل
مديرية مكتب رئيس الجامعة

العدد /
التاريخ / / ١٩

( سيظل الشهداء أكرم منا جميعاً )

---

الى / دار الثقافة والنشر الكردي/ هيئة تحرير مجلة روشنبيرى نوى
م/ أستفسار حول مجلة روشنبيرى نوى

د يهديكم التحيات ..

أشارة الى كتابكم المرقم ٣٦/١٢/١٩٨١ في ٢١/٥/١٩٨٥ ، للتفضل بالعلم بأن موضوع كتابكم أعلاه قد عرض على مجلس الجامعة الجلسة الحادية عشر المنعقدة في ٢١/٣/١٩٨٥ وأقر المجلس أعتماد النشر في مجلة " روشنبيرى نوى " لغرض الترقيات العلمية .

وحصلت المصادقة الاصولية على القرار ..

مع التقدير

الدكتور خسرو غني شالي
رئيس الجامعة

نسخة منه الى /

- السادة رئيس وأعضاء لجنة الترقيات العلمية / للعلم وجاء / مع التقدير
- ملفة الكتب الصادرة السرية

# عیراقی یەکان
# هەمیشە هەر سەرکەوتوون

- مصلح جەلالی -

ئەوەی ئەمـڕۆ جێی شانـازی بێو نەك هەر لەناوچەکەدا بگرە لای هەموو گەلانی جیهان و دەوڵەتان دیـاربن ئەوەیە کە ڕۆڵـەکـانی عیـراق لە ژێـر سایـەی سەرکردایەتی یە بەتواناکەیدا وەك پێنج ساڵە لە بەرەکانی جەنگـدا دژی رژێمی چاوچنـۆك و نالـەبـاری ئێـران بەرگری لە سەربەستی نیشتمان و وڵاتەکانیان ئەکەن لە بوارەکـانی تری ژیـانیـانـدا لە مەیدانـەکـانی کارو پێشکـەوتنـدا هەمیشـە باڵی تەقـەلـلادان و کاری دڵسۆزانـەیـان لێ هـەڵمـاڵیـوەو توانیـوانـە کە بۆ هەموو لایـەکێ روون بکـەنـەوە کە خاوەنـی توانـایـەکی لەبن نەهاتووی سەرکەوتوون.

سەرباری ئەم ئەرکە پیرۆزانەش... سەرکردایەتی میللەتی عیـراق و ڕۆڵـەکـانی عیـراق.. هەموو ئەوەیان روون کردۆتـەوە کە ئاشتیخـوازن ورێـزی ئەو هاوسێیانە ئەگـرن کە حەز بە ئاشنـایـەتی و دۆستـایـەتی عیـراق ئەکـەن و ئەوەشیـان دەرخستـووە کە دۆستی هەمـوو گەلانی ئازادیخـوازی جیهـانن و بەوپـەڕی توانـایـانەوە دەستی یارمـەتی بۆ ئەو گەلانـە درێـژ ئەکـەن دژی ئیمپـریـالیـزم و شەرهـەلگیـرسـان و دوواکـەوتنن. عیـراقی یـەکـان.. هەروەك سەرکـردایـەتی یـەکـەیـان ئاشکـرای کردووە هەرگیـز چاوی لە زەوی داگیـرکردنی هیـچ وڵاتێـك نیـەو ناشیـەوێ کە ئەم نیازەی هەبێ.. چونکە ئەم جۆرە باوەڕە باوەڕی عیراقی یەکانی ئەمڕۆی پەروەردەی بیروباوەڕێکە ڕێزی هەموو ئەوانە ئەگرێ کە دروشمی مرۆڤـانـەیـان هەڵکردووە وبیرو وباوەڕو کاریان مرۆڤانەیەو خزمەتی مرۆڤایەتی ئەکات..

ئەم گیانەش بێگومان هەموو ئەزانین کە هەڵقوڵاوی بیروباوەڕەکانی تەقینەوەی شۆڕشەکە زۆر لایەنی تریشی گرتۆتەوە... لەوانەش ئەوە کە عیراقی یەکان.. گشت کاتێ پشتی شۆڕشی ئازادیخوازی فەلەستینی بەرنەداوەو چەنـدە توانـای هەبـوو بێو بۆ کرابێ یارمـەتی داوەو تەنـانـەت ئەمـڕۆش ئەم هەستـە بەنـرخـەی دیـارە کە پتـەوکـردنی و تیـرو تەسـەل کردنی هێزی بەرگری کردنی

فەلەستینی یەکانە لە لایەن عیراقی یەکانەوە بۆ گەرانەوەیان بۆ سەرخاکی زەوت کراویان و وەرگرتنی مافی رەوایان.

خۆ ئەگەر بێینە سەر ئەوەی کە عیراقی یەکان لە سایەی سەرکردایەتی دڵێرەکەیانەوە دەورێکی گەورە لەناوچەکەداو لە ریزی برا عەرەبەکانیانداو لە ریزی وڵاتانی بێلایەندا لە پێناوی پەرەپێدان و کۆك کردنی هێزە ئاسایش خوازو دژ بە زایۆنی و ئیمپریالیزم و داگیرکاران ئەگێڕن. ئەمە ئەوە ناگەیەنی کە عیراقی یەکان لەم رووەوە خۆیان بەگەورەتر بزانن لەو دەوڵەت و گەلانەی کە لەگەڵیدان. . بگرە شانازی بەوەو ئەکەن کە توانیویانەو ئەو هەنگاوە بالآیانە بنێن کە کەڵکی بەختیاریو سەربەستی ـ ئادەمیزادی تێدایەو رێزگرتنی هەموو ئەو مافانەیە کە ئاسۆی دواڕۆژی مرۆڤ رووناکتر ئەکاتەوە.

ئەم ئەرکەش کەعیراقی یەکان خستوویانەتە سەرشانی خۆیان دووبارە تواناو دەسەڵاتی عیراقی یەکان دەرئەخات. . کە هەروەك بەرگری لەخاکی خۆیان ئەکەن وبە لێبووردنەوە لەزەمینەکانی کارو گەشەسەندندا خزمەتی ئاوەدانی ووڵاتەکەیان ئەکەن لەدەرەوەی نیشتمانەکەشیان زیاترو چاکتر پایەکانی یەکێتی وبرایەتی گەلان دائەکوتن.

ئەمە لەلایەك. . لەلایەکی تریشەوە. . عیراقی یەکان بێ وچان پەیوەندیان لەگەڵ هەموو ئەووڵاتانەدا هەیە. . کەئەیانەوێ دۆستایەتی لەگەڵ عیراقدا بکەن و نایانەوێ یاخود بڵێین نیازیان وانیە کەدەست بخەنە کاروباری ناوخۆی عیراق و زیانێ پێبەخشن و بەئارەزووی خۆیان خواستی بەسەر دابسەپێنن و. . ئەمەش دیسان ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو باوەڕەی کەعیراقی یەکان بەخۆیان و بە بەرەوپێدانی هەموو ئەوپرشنگانەیە کە رێگەی تاریکی ئادەمیزاد رۆشن ئەکەنەوە. ئیستەش کە هەروەك لەوەوبەر. . سەرکردایەتی شۆرش دروشمی بەرپاکردنی ئاسایشی بەرامبەر بەدەست درێژکارانی رژێمی ئێران هەڵگرت بەو مەبەستەیە. . کە ئەم شەڕەی رژێمی نەزانی ئێران بەسەر عیراقیاندا سەپان خزمەتی عیراقی یەکان و رۆڵەکانی گەلانی ئێران ناکات ودژی هەموو خواستێکی پیرۆزو بێگەردەو ئەوەی کەکەڵکی لێوەر ئەگری. . ئیمپریالیزم و زایۆنی و کۆنەپەرست و خۆفرۆشانی ناوچەکەیە. . بەلام عیراقی یەکان کە بەرگری لەخاك و ـ سەربەستی و ئەومافانە ئەکەن کە لەسای سەرکەوتنی شۆرشەوە دەستیان کەوتووە لەبەر ئەوەیە کەوەك خۆیان بەبرای هەموولایەکی باش و هەموو هاوسێیەکی دڵسۆزئەزانن. . رێگەی ئەوش بەهیچ رەنگی نادەن هێچ وڵاتێك هیچ هاوسێیەك دەست بخاتە کاروباری ناوخۆیان بەڵای زەوی داگیربکات و ـ سەربەخۆی وکامەرانی تێکبدات. .

ئەمەش ئەوبیرە توانامەزنەی رۆڵەکانی عیراق دەرئەخەن کەسەبارەت بەهەمووشت و جوڵانەوەیەکی باش هەیانەو هەرواش ئەوە پێشان ئەدەن کەئەوگیانە پیرۆزەیانە کەدژی هەمووکارێکی ناپەسەندو نارەواو چەوت وچەوێڵ هەیانە. . ئەمەش توانایەکە کە ئاودامان گشت لایەنێکی خێر خوازوچاکە ویست لایەنی ئەگرن و پەنجەی بەجوانی یەوە بۆ رائەکێشن و. . ئەمەیە هەست و کرداری عیراقی یەکان و سەرکردایەتی یەکەیان. . بۆیە ئەبینین لەناو هەموو کۆرێکی نێوگەلان و دەوڵەتانی چاکەخوازداو لەناخۆی دەرەوە لەپێنج ساڵ بەردەوامی شەردا هەمیشە سەرکەوتووەو هەر سەرکەوتووش ئەبێ.

■ ■ ■




**د. کامل بەصیر**

بیروباوەڕ ئەگەر هات و لە زەمینەیەکی رەسەندا رەگ و ریشەی داکوتابوو، وەبە شەونمی مافی نەتەوایەتی و ئارەقی زەحمەت کێشان و گیانی مرۆڤایەتی سەوز بوو بوو، پێویستە سەری رێزو قەدر زانینی بۆ دابنەوێنرێ.

سەر ئەنجام ئەگەر هاتو ئەم جۆرە بیروباوەرە جێگای مشتومر بوو و لە کۆری پەیرەوی کردندا خرایەبەر پێنووسی هەڵسەنگاندنەوە، پێویستە بۆ ئەنجام دانی ئەم جۆرە زۆرانە بیری‌یە راستی‌یەك بگیرێتەبەر زەین، کە دەڵی: بیروباوەڕ کە بیردۆزەیەکە رەوشت و هەڵوێستی هەڵگرانی دروشمەکانی ناشێ بین بە پێوانەی دەست نیشان کردنی چاکەو خراپەی. ئەم راستی‌یە لە بەهەشتی وێژەدا راستەوخۆ ئاکامەکانی دێنە بەر دەست، چونکە وێژە چەند



راستەقینەو ڕاستگۆ بێت هەمیشە پێی ناکرێت ببێت بە ئاوێنەی بیروباوەڕێکی بیردۆزەیی . . وێژە دەنگی سۆزو هەڵچوونی وێژەرەو ئەم دەنگە پاش ئەوەی شەپۆلی ڕەشەبای چاودێران و نەریت و بەرژەوەند پەرستەکان دەبڕێ بە نقەنق دەگاتە خوێنەران، بەڵام بیروباوەڕ بڕیاری یاسای بوونەو وەکو خەونێکی پیرۆز ئەگەر هات و دەرفەتی خستنەڕوو بۆی لوا بیردۆزانە ئاوی درەختی هیوای ستەم لێکراوان دەدات.

بەم پێیە ئێمە کە پتر لە چارەکە سەدەیەك باسی وێژەو وێژەرانمان کردووە، ڕێبازمان هێنانەوەی دەق و شیکردنەوەی بەرهەمی وشەیی بووەو بە هیچ جۆرێك نەمان ویستووە بۆچوونەکانمان بکەین بە خەنجەری لەت لەت کردنی بنەرەتیی بیری.

ئەم تۆژینەوەیەمان دیارە پێویستی بەم سەرنجە هەبوو، بە تایبەتی کە دەم لە بابەتێکی ئاڵۆزو دژوارەوە دەدات هەرچەندە کە لە ناوچەرگەی رووداوەکانی جەنگی (قادسیەی صدام)دا چاو هەڵدەهێنێ، بەڵام لە راستیدا بناغەکەی لەسەر دەیان کێشەی بیریو رامیاریو هونەری دێرین و هاوچەرخ بنیات نراوەو لق وپۆپ بەرەو چەند باسێکی چارەنووسی دەهاوێژێ.

تۆژینەوەی وەهاش[1] هەرچۆنێك بێت پێویستی بە رووبەرێکی فراوان هەیە بۆ ئەوەی بە وردی لایەن و هێماکانی بخرێتەروو، ئەمەش هەڵبەت لەم بوارەدا بۆ ئەم تۆژینەوەیەمان هەڵناکەوێت.

هەرچۆنێك بێت رێچکەی بۆ چوونەکەمان لەم بیابانە فراوانەدا بە پرسیارێکی سەر سوورهێنەر دەشکێنین کە دەپرسێت:

ئایایا هیچ ئاواتێکی خۆش تر لەو بیروباوەرە پیرۆزە هەیە کە فەلسەفەکەی وێنەی بەهەشتی ئاشتی دەکێشێ و لەم بەهەشتەدا درەختی برایەتی و دۆستایەتی و هاوکاریو لێبوردن و دەیان خەونی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە؟!

وڵام دانەوەی ئەم پرسیارە بروا ناکەین لەم ووتەیە دەربازبێت کە دەڵێ: نەخێر، چونکە ئاشتی بە هەموو جۆرو واتاکانیەوە ئاواتی هەمیشەیی مرۆڤ و نەتەوەکانی ئەم سەر زەوییەیەو لە هەموو کات و سەردەمێکدا دروشمەکەی دەشەکێتەوە.

ئەم وەڵامە رەنگە لە دۆزەخی رووداوەکانی مێژوودا بیێ بە پرسیارێك و بپرسێ: کوانێ ئاشتیو، خەونە شیرینەکەی کەی دێتەدیی؟

وێژەی گەلان لە دێرترین سەردەمەوە ئەو پرسیارەیان بەسەر لێوەوە بووە: -

هەستیاری عەرەبی جاهلی (زهیر ن أبن سلمیٰ) نزیکەی هەزارو پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر دەڵێ بە شەری نێوانی عەشیرەتی (عبس و ذبیان داخ کراوەو بە دڵتەزێن ترین تابلۆی سامناك وێنەی شەری براکوژی کێشاوە.

بەرهەمی ئەم هەستیارە دور پاتی دەکاتەوە کە شەری براکوژی، کوشندەترین ئاگرە بۆ لەناوبردنی بەهەشتی ئاشتی، چونکە ئەگەر هات و برا لەگەڵ برادا نەبوو چلۆن دەستی مەرگ دەبەسترێتەوەو ئاسایش تۆوی پیرۆزی لە نێوانی ئەندامانی میللەتێکدا دەچێنێ و زەمینەی ئاشتی جیهانی دابین دەکات؟!.

مێژونوسی ئەگەر لەم روانگەیەوە سەرنج لە رووداوەکانی بدات بۆی ساغ دەبێتەوە کە ئەم کێشەیە سەرمەدییەو هەمیشە ئەو هەرەیە بووە کە لەبەر ئەوەی دەستەکەی لە دار دروست کراوە بۆی چۆتە سەر بەرببێتە دارستانەکان. ئەم جۆرە هەرەیە دەیان بیروباوەر بۆ کول کردنی بەرپا بووە.

سەبارەت بە ناوچەکەمان و بە گوێرەی ئەڵقەکانی مێژوو پێویستە لەبەر دەستی بیروباوەری قورئانی پیرۆزدا بوەستین و بە تیشکی ئایەتە پیرۆزەکانی دەربارەی نرخی ئادەمیزادو مافی میللەتان و مەسەلەی شەرو ئاشتیو جەنگ ئەو کێشەیە بخەینەبەر باس و بزانین وێژە لەم کۆرەدا هەنگاو بە هەنگاو چلۆن رەفتاری کردووە.

ئەنجام دانی کاری وەهاش - هەروەکو لەمەوبەر ووتمان - شانی تۆژینەوەیەك بە فراوانی هەڵی ناگرێت، بۆیە لەم روەوە چەند نمونەیەکی کوردستانی ئێران و فلسطین شی دەکەینەوەو بۆچوونی وێژەرەکانی دەخەینەبەر باس.

قورئانی پیرۆز لە کەرەسەی ووشەی سەلامەوە زاراوەی (الأسلام)ی دارشتووە، بۆیە بە گشتی ووتراوە ئاینی ئیسلام ئاینی ئاشتییە.

هەروەها تێبینی دەکرێت کە لە دۆخی بەیەکا چوونی موسلمانەکان و موشریکە ئەعرابەکاندا هەوڵ دراوە کێشەکان لە رێگای ئاشتییەوە چارەسەر بکرین، بۆ بەڵگە لەم رووەوە خوای مەزن فەرمانی بە پێغمبەر د.خ داوەو فەرموویەتی!

«وإن جنحوا للسلم فأجنح لها وتوكل على الله». [1]

واتـه ئەگـەر هات و موشـریکـە ئەرابەکان بەلای ئاشتیدا شکاندییان تۆش ملیی ڕێگای ئاشتی بگرەبەو.

ئەم ئایـەتـە پیـرۆزە هەڵبـەت ئەوە ناگـەیـەنێ کە ئاشت بونـەوە لە زۆرانی بیرـیدا دەشێ لەسـەر خەرجی بیروبـاوەڕ بێت، بەڵکـو هەر ئەوە دەگـەیەنێ کە کێشەکانی زۆرانـی بیـری ئەگـەر هات و لە ڕێـگـای گفتـوگـۆوە چارەسـەرکـران و بیـروبـاوەڕی ئایـینـی ئیسـلام لەم چارەسـەرکـردنـەدا توشی هیـچ شکشتی‌یـەك نەبـوو، بۆ پێغـەمبـەر د. خ هەیـە بەم ڕێگـایـە قایل ببێت و لە پێناوی ئاشت بونەوەیەکی بیریدا چەك دابنێ.

بەڵگەمان بۆ چەسپاندنی ئەم بۆچوونە لەوەدا وە چنگی دەهێنین کە خوای مەزن ئامـۆژگـاری مۆمنـەکـان دەکـات: ئەگــەر هات و دوو تاقم لە مۆمنــەکـان یەکتـریـان کوشت پێـویستـە ئاشتیـان بکـەنەوە، بەڵام ئەگەر هات و یەکێ لەو دوو تاقمە لە کەلی شەیتان نەهاتە خوارەوەو لەسەر براکوژ ی سوور بوو، پێـویستـە لایـەنی تاقمی ستـەم لێکراو بگرن و دەستەویەخە لەگەڵ ستەم کارەکاندا بجەنگێن، بۆیە خوای مەزن دەفــەرمـوێ: «فـإن بغت احـداهمـا علی الأخـری فقاتلوا التي تبغي حتی تفیء إلی أمر الله». [2]

بەم پێ‌یـە ئاشـت بونــەوەو ئاشـتی خۆی لە خویــدا مەبـەست نی‌یـە، بەڵکـو هۆیـەکـە بۆ چەسپـاندنی حەق و گەڕانەوە بۆ فەرمانی خوا کە لەژێر سێبەرەکەیدا بە پێوانەی بیروباوەڕ هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی وەردەگرێت.

ووردبــوونــەوە لە قورئـــانی پیـرۆز لەم ڕووەوە دووپـاتی دەکاتەوە کە ئاشتی مل کەچ کردن و چەك دانان لە ئاستی زۆرداران و ستەم کاراندا ناگەیەنێ، بگرە ئەوە دەسەلمێنێ کە بەهـەشتـەکـەی تەنیـا لە زەمینـەی دادپـەروەری نێـوانی ئەندامانی کۆمەڵ و میللەتانی بییانیدا سەوز دەبێ. ئێمە کە لەم توێژینـەوەیـەدا لە مەسـەلـەی ئاشتی‌و جەنـگ دەدوێن و ئەرکی ویـژە لەم کۆڕەدا دەست نیشـان دەکـەین پێـویستـە

هیمـابـۆ ئەوە کەین کە ئایینی ئیسـلام ئاینێکی جیهـانی‌یـەو قورئانی پیرۆز هەرچەندە بە زمانی عەرەبی هاتۆتە خوارەوە لە پەیــوەنــدی نێـوانی میللەتـان دواوەو لە دوو مەسـەلـەی چارەنووسیدا مافی ئەو میللەتانەی دەست نیشان کردووە؛ -

یەکــەم: مەســـەلــەی زمــان کە خوای مەزن دەربــارەی فەرمـوویـەتی: «ومن آیـاته خلق السموات والارض واختلاف السنتکم والوانکم». [3]

واتـە لە ئایـاتـەکـانی خوا خوڵقـانـدنی ئاسمان و زەوی‌و جیاوازی زمان و ڕەنگەکانتانە.

کەوابــوو بە دەربــڕینی ئیستــەمـان جیـاوازی زمـان لە میـللەتێکــەوە بۆ میللەتێکی دیی دیـاردەیــەکی سروشتی‌و ژیـانی‌و ئادەمیـزادانـەیـەو ئەم دیـاردەیـە بە پێـوانەی ئایینی ئیسلام لەبەر ئەوەی ئایەتی خوایە ناشێ فەرامۆش بکرێت و هەر حکومەتێك ئەگەر هات و جڵەوی چەند میللەتێکی لە قەوارەیـەکی رامیـاریـدا گرتـەدەست پێـویستـە لەسـەرشانی جیاوازی زمانی میللەتەکان بپارێزێ، ئەمەش هەڵبەت بەوە دەبێت کە هەموو میللەتێك زمانی خۆی بەکاربهێنێ‌و پەرەی پێبدات و لایەنەکانی لە هەموو ڕوویەکەوە لە کارتێکردنی بیـانی دوور بخـاتـەوە، بۆ ئەوەی هەمیشـە بە جیـاوازی لە زمانەکانی‌ترو بمێنێتەوە.

دووەم: مەســەلــەی بوون و قەوارەی میللەتــە، کە خوای مەزن گرنگیـیــەکی تایبــەتی داوەتێ‌و فەرمـوویـەتی.

«یاأیها الناس إنا خلقناکم من ذکر وأنثی وجعلناکم شعوباً وقبائل لتعارفوا». [4]

ئەم ئایـەتـە پیـرۆزە بە شێـوازێکی ڕوون و ڕاستـەوخۆو ڕووی دەم دەکــاتــە خەڵـکی ئەم سەر زەوی‌یــەو پێیــان ڕادەگەیەنێ کە خوای مەزن پاش خوڵقاندنی لە نێرو مێ‌ی میللەت میللەت و خێـل خێـل وا بۆ ئەوەی یەکتـر بنـاسن. هێناونیەتە کایەوە توێژەری هاوچەرخ بەبێ ڕاڤەکردن و تأویل لێـرەدا بۆی هەیـە پشت بە ووشـەو زاراوەکـانی ئەو ئایـەتـە

پیرۆزە بیەستێو سێ ڕاستی سەرەکیی لە کۆڕی پەیوەندی نێوانی میللەتاندا لە ڕوانگەی ئایینی ئیسلامەوە بچەسپێنێ:

-

1 - ووشـەی (الناس) بە واتـە فەرهـەنگی‌یـەکـەی ئەوە دەگەیەنێ کە خوای مەزن حوکمی خۆی لەم ڕووەوە بۆ گشت میللەتان دەخاتە ڕوو.

2 - زاراوەی (الشعوب) کە هەڵبەت مانـاکەی لە دیرترین زەمانەوە هەتا ئەمرۆ گۆڕاوە ئێستا لە دەرفەتی ڕامیاریدا چەند واتاکەی جێگای مشتومڕ بێت لەوە تێناپەڕێت کە کۆمەڵـە خەڵکێکـە چەنـد تایبـەتی‌یـەکی زمانیو مێـژوویی‌و ڕۆشنبیـریو دەروونی جیـاکـەرەوەی لە کۆمەڵێکی دیی هەیە.

3 - ڕستەی (لتعارفوا) دوویاتی دەکاتەوە کە ئەو میللەتانە لەبـەر ئەوەی لەیـەکتـر جیـاوازن و خوای مەزن بە قەوارەی تایبـەت هێنـاونیـەتە کایەوە، بەرژەوەندی‌یان ئەوەیە کە یەکتر بناسن: یەکتر ناسینیش بە مەبەستی خۆپـاراستن لە توانـەوەو لاسایی‌کـردنـەوە، حوکمی خوای مەزن دەهێنێتە دیی، چونکە جگە لەم مەبەستە دژی ئەوەیە کە خوا خەڵکی ئەم زەوی‌یەی میللەت میللەتی جیاواز خوڵقاندووە ئەم ئایەتە پیرۆزانە بەلای ئێمـەوە سەرچـاوەی رووکـاری نەتـەوایـەتی عەرەبی ڕەسـەنـە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئاشتیو جەنگ و مافـی میـللەتـان و پێـی‌دەکـرێ لەم ڕۆژانـەدا شان بەشانی رووکارە جیهانی‌یەکانی‌تر خۆی رابگرێت.

هەرچۆنێك بێت مێژووی ناوچەکەمان دوویاتی دەکاتەوە کە دەیان میللەت بڕوایان بە ئایینی ئیسلام هێناو چوونە ژێر ئاڵای قورئـانی پیـرۆزەوەو لە ئاکـامـدا چەنـد دەوڵـەتێـك پێك هاتن کە لە سنوورەکانیاندا میللەتی جیاواز جیاواز لە رووی زمـان و قەوارەوە خستنیـە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە، هەروەهـا لە کۆتـایی سەدەی نۆزدەیـەمـەوە لەبـەر چەنـد هۆیەکی جیاواز هەمان دیاردە بە چەشنێکی دیی ڕوویدا.

ئێمـە لەبـەر خۆ بەستنـەوە بە ڕێبـازو ئامـانجی تۆژینـەوەکـەمـانەوە بەر لە هەموو شتێك سەرنج لە دەوڵەتی ئێـران لەم سەردەمـەدا دەدەین کە سنووره رامیـاری‌یـەکەی وەکـو بەنـدیخـانـەیـەکی گەورە بەشێك لە نەتـەوەی کوردو نەتەوەی عەرەب بە زەوی‌و زارەکانیانەوە ئابڵوقەداو بە قۆناغە تفەنگی فەرمانڕەوایی شاهنشاهی، ئەمجا رژێمی خومێنی‌و فـارسـە ڕەگـەز پەرستـەکـان بوون بە میرو ئاغاو جەندرمەو سەربـازو بە بەرووبـوومی ئەم بارە تا هەمـوارە ئێشـا ژیـان دەبەنە سەر.

دەوڵـەتی ئێـران لەم وێنـەیـەدا فەرمـانڕەواکانی بەگشتی‌و خومێنی‌یەکان بە تایبەتی لافی ئیسلامیەتی لێدەدەن بەبێ ئەوەی توسقاڵێك ئەو ئایاتە پیرۆزانە بهێننەوە یاد کە مافی ١ میللەتـانی ژێـر دەستـەیـان لە رووی زمـان و قەوارەی نەتەوایەتی‌یانەوە* دەپارێزێن.

پرسیاریش لێرەدا ڕووی دەممان تێدەکات و دەپرسێت: تا چ ڕادەیـەك ئەو میللەتـە ژێـر دەستـانـە بە گوێـرەی بنـەرەتی‌یـەکانی قورئانی پیرۆز هەڵوێستی خۆیان دەربارەی مەسەلەی ئاشتی‌و جەنگ دامەزراندووە؟

ئایا بە ناوی ئاشتی‌یەوە بە مل کەچی لەو لە چەمەگی ئاشتی تێگـەیشتـوون و پەنـایـان بردۆتـەبەر چەك و جەنگی دادپەروەرانەوەو شۆڕشیان بەرپاکردووە؟

بۆ‌وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانە دوویاتی دەکەینەوە کە ئەم میللەتانە هەمیشە ڕاپەریون و شۆڕشی خوێناوییان بەرپاکردووە.

جگـە لەمـەش بە بۆنـەی جەنگی (قادسیەی صدام)ەوە بێگومان دەرفەت بۆ گشت میللەتانی ئێران هاتۆتە کایەوە بۆ ئەوەی ڕابپەڕن و دەرگای بەندیخانەکەیان بشکێنن.

سەرکردایـەتی عێـراق - هەروەکـو تێبینی دەکـەین - کە هەڵـوێستی خۆی لەم کۆڕەدا دەنـوێنێ زاراوەی (الشعوب

الایرانیة) بەکار دەهێنێ، ئەم زاراوەیە مەسەلەیەکی ئایدولوجی‌و بیروباوەری دەهێنێتە کایەوەو بوارمان دەداتێ کە بە گوێرەی باری رۆشنبیری‌و ئابوری‌و کۆمەلآیەتی بەندیخانە گەورەکەی ئیران بڵێین: ئەم بارە پێی نەکراوە میللەتێکی ئیرانی یەکدگیر پێك بهێنی‌و خەباتی ئەم میللەتە لەسەر بناغەی چینێکی ئیرانی یەکگرتوو رابەری بکات.

وێژەی کوردی هەرچەندە لەم رۆژانەدا تا رادەیەکی زۆر پێی نەکراوە سوود لە جەنگی (قادسیەی صدام) وەربگرێت و ئەو ڕاستی‌یە بکا بە هەوێنی خەملآندن و گەیشتنی بە رادەی فەلسەفەی ئایدۆلوجی‌و بیروباوەری کە ناوەرۆکی وێژەی میللەتە ستەم لێکراوەکانە، بەلآم ئێمە لە تۆژینەوەیەکماندا بەناو نیشانی (هونەری کورتە چیرۆکی کوردی‌و جەنگی قادسیە صدام)[5]

سەرنجمان بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە ئەم وێژەیە توانای ئەوەی هەیە بە هۆی هونەری چیرۆکەوە بیێ بە ئاوێنەی نەتەوەی کوردو چیرۆك نوسەکانمان لە بابەتی لاسایی‌کەرەوە لابدەن و ئێش و ئازارو ئاواتی نەتەوەکەیان بکەن بە هەوێنی هونەری چیرۆك نووسینی ئایدۆلوجی.

هەروەها بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر لە هەمان روانگەوە تۆژینەوەیەکمان بەناو نیشانی (خەباتی چینایەتی لە چیرۆکی پێشمەرگەدا). بە دوو بەش[6] دەربارەی رۆمانە بەناوبانگەکەی دکتور رحیم قازی (پێشمەرگە) نووسییەوەو بۆ چوونەکانی ئێستامان بە بۆنەی جەنگی (قادسیەی صدام)ە چەسپاند.

ئێمە کە بەتیشکی بیروباوەرێکی تایەتی لە رووی ناوەرۆك و روخسارەوە ئەرکی شەرشانمان وەکو رەخنەسازێك بەدی هێناوەو بەدی دەهێنین، دووپاتی دەکەینەوە کە پێویستە وێژە لە ژیانی رۆشنبیری‌و شارستانیەتی‌و هەلوێستی رامیاری‌و بزوتنەوەی مێژ ووی ناوچەکەمان و جیهان جیانەکەینەوە.

هەروەها پێویستە بە دەق و رووداوەکان نەبێت، بیروباوەر بیردۆزانە هەڵنەسەنگێنن و بادەی لایەنگیری‌و دەمارگیری بۆ کەس نەگێرین.

خوێنەرە لاوەکان و ئەوانەی بیریان لاوازە رەنگە بۆچوونەکانمان مێژوویانە تێ نەگەیشتبن و لە لقەکانیان هەنگاو بە هەنکاو شارەزا نەبن و وابزانن کە ئێمە لەم کۆڕەدا تازە دەوڵەمەندین.

سەرئەنجام بابزانین دکتور رحیم قازی چۆن خەباتی میللەتی کوردی لە کوردستانی ئیراندا وێنە کێشاوەو چلۆن لە رەوتی فەلسەفەی ئەم خەباتە تێگەیشتووە؟

دکتور رحیم قازی کە رووداوەکانی سەرەتایی ساڵانی چل هونەرمەندانە دەگێرێتەوە وەکو بۆچوونی ئیستای سەرەتایی سالەکانی هەشتا هیچ دان نانێت بە سنووری ئیراندا کە ئیمپریالیزم بۆ ئاغا فارسەکانی کێشاوە لە دۆزەخەکەیدا بەشێك لە نەتەوەی کوردو نەتەوەی عەرەب و چەند نەتەوەیەکی دیی بەندکراون و زەوی‌و زارەکانیان داگیرکراوە بۆیە ئەم نووسەرە لە چیرۆکەکەیدا ووشەی ئێران یان گەلی ئیران بەکارناهێنی، بەڵکو هەمیشە ووشەی گەلی کوردستان بەکاردێنی‌و دەڵی: «گەلی کوردستان تفەنگ و دەمانچەو شێست تیری وە دەست کەوت»[7].

دکتور رحیم قازی کە بەو جۆرە لە سنووری ئیران و هەرێمی کوردستان تێدەگات، ئامانجی ئەوەیە کە گەلی کوردستان وەکو گەلێکی دەست بەسەرا کێشراو لەلایەن فارسەکانەوە پیشان بدات.

با ئەم چەند دێرە بخوێنینەوە کە دەڵێن:

«ئەفسەرەکانی تری لای سەرهەنگ... هەر کەسەی ئاکارە خراپەکانی خۆی دەرهەق بە گەلی کوردستان دەرهێنا..»[8].

کەوابوو خەباتی میللەتی کورد خەباتێکی نەتەوایەتی‌و کێشەکەشی کێشەیەکی ژیانی‌یە لە نێوانی جەماوەری کوردستان و فارسە رەگەز پەرستاندا، بۆیە نووسەرەکەمان زیاتر ئەم مەسەلەیە دەخاتە روو و دەڵێ: «جا وەرە

تاریکەشەو بێ ئەو ئەفسەرانەی ئەرتەشی شاهنشاهی کە لە خراپەو دوژمنایەتی بەدەر هیچ کاریکی دیکەیان لەگەڵ کوردان نەکردبوو. بە کێوو شاخی کوردستان دا برۆن و کوردی چەکداریان لەبەر چاو بێت». [9]

دەربڕینی (لەشکری شاهنشاهی) کە بەو جۆرە نووسەر بەکاریهێناوە روونی دەکاتەوە کە دەوڵەتێك بەناوی ئیرانەوە سنوورەکەی بە زەبری قۆناغە تفەنگ نەبێت خۆی‌ناگرێت؛

بۆیە ئەم نووسەرە سەرنجمان بۆ مەسەلەی جیاوازی زمانی کوردی‌و زمانی فارسی لەم بەیەکا چوونەدا رادەکێشێ‌و دەڵێ: «ئەو لاوە لادێیی‌یە کوردانەی کە بۆ خزمەتی ئیجباری دەبران هەر لە رۆژی هەوەڵەوە لەبەر ئەوەی کە زمانی فارسی نازانن لەگەڵ شەق و پیلاقەو قامچی‌و جنێوی ئەفسەرەکانی فارسی‌زمان روبەروو دەبن». [10]

هەروەها دەڵێ: «میرزا قوتیاس لە دەست شیدارەکانی دەوڵەتی بە تایبەتی لە دەست ژاندارم و پولیس و ئیدارەی سەربازگیری، هێندەی عەزاب و کوێرەوەری‌و چەرمەسەری‌و نالەباری دیتبوو کە رقی دنیای لێ هەڵگرتبوون ئەو بە چاوی خۆی دیتبووی کە کاربەدەستانی دەوڵەت بە چ جۆرێك سوکایەتی نەتەوەکەی‌و زمانەکەی‌و داب و رێ‌و شوێنی وولاتەکەی دەکەن». [11]

دکتور رحیم قازی بەم دوو دەقە بە زەقی وێنەی ئەوە دەکێشێ کە جگە لە نەتەوەی کورد زمانی کوردیش لەلایەن فارسە رەگەز پەرستەکانەوە لە مەترسیدا بوو فارسەکان بە سووکی تەماشای زمانی کوردی‌یان دەکردوو جەماوەری کوردیش، زمانی فارسییان نەدەزانی.

بەم پێیە چیرۆکی پێشمەرگە بەوردی قەوارەی میللەتی کوردو زمانی کوردی پاراستووەو هەرەشەی فارسەکانی لەم رووەوە وێنەکێشاوەو پیشانی داوە کە فارسە رەگەز پەرستەکان لەبەر هیچ هۆیەك مل کەچی بنەرەتی مرۆڤایەتی نەبوون.

لەبەر تیشکی ئەم راستی‌یەدا دکتور رحیم قازی فەرمانرەوا فارسەکان بە داگیرکەرانی کوردستان دەزانێ، بۆیە خەباتی میللەتی کورد بە بزوتنەوەیەکی رزگاری لە چنگی ئیستعماری فارسی لە قەڵەم دەداو دەڵێ: «لە هەرەتی زستانە سەختەکەی ساڵی 1945ی زاینیدا لەلایەن پێشەواوە ئەمر درا کە هێزی پێشمەرگە بۆ رزگاری مەڵبەندی سەقزو دیواندەر لە چنگ هۆردوی داگیرکەران دەرکەن». [12]

ئێمە بەم کورتە تۆژینەوەی (خەباتی چینایەتی لە چیرۆکی پێشمەرگەدا). بابەتێکی بیری‌و رەخنەسازی دەبوژێنینەوەو دەی‌سەلمێنین کە دەوڵەتی ئیرانی دەست کرد، دوو بنەرەتی فەرامۆش کردووە:

**یەکەم:** بنەرەتی پاراستنی جیاوازی زمانی میللەتەکانی.

**دووەم:** پاراستنی جیاوازی قەوارەی ئەم میللەتانە. . ویژەی کوردی لەم رۆژانەدا بەداخەوە وەکو پێویست شوێن پێی چیرۆکی پێشمەرگەی دکتور (رحیم قازی)ی هەڵنەگرتووەو تا رادەیەك پێی نەکراوە باری کوردستانی ئیران لە دۆزخی رژێمی خومەیینیدا وێنە بکێشێ‌و لەبەر تیشکی ئایدۆلوجی‌و بیروباوەری نەتەوایەتیدا ئەرکی خۆی بەدی بهێنێ، بۆیە لەم تۆژینەوەیەدا بۆ چەسپاندنی لێکدانەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەربارەی مەسەلەی ئاشتی‌و جەنگ و جیاوازی زمان و قەوارەی میللەتان بە دەقی ویژەیی پەنا دەبینەبەر ویژەی بەرگریکاری فلسطینی. ئەم ویژەیە هەڵبەت لە بیروباوەری رەسەنی ئەم سەردەمەی نەتەوەی عەرەبەوە هەڵقوڵاوە کە رەگ و ریشەی دەگەرێتەوە سەر قورئانی پیرۆز.

جا بۆ ئەوەی هیمابکەین بۆ جیاوازی ئەم بیروباوەرە لەچاو بیروباوەرە هاوچەرخەکانی دی کە دەربارەی ئەو کێشانە بۆچوونی خۆیان هەیە، لە بزوتنەوەی هۆنراوەی بەرگریکاری فلسطینی‌و هەڵوێستی هەستیارەکانی دەکۆڵینەوە کە بە ووشەی پەیامدار دەستەو یەخەی صهیونیەت دەجەنگێن.

ئاشکرایە کە دەوڵەتی ئیسرائیل دەستکردی ئیمپریالزمەو قەوارەکەی لەسەر زەوی‌و زاری فلسطینی عەرەبیدا بە قۆناغە تفەنگ بنیات نراوە.

سەرەڕای ئەم بارە ناسروشتی‌یە زۆربەی دەوڵەتانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دانیان پێدا ناو بە دەوڵەتێکی شەرعی لە ساڵی 1947ی زایینی لە دەستەی دەوڵەتە یەکگرتووەکاندا وەرگیرا.

هەروەها ئاشکرایە کە بەشێك لە میللەتی فلسطینی لە چوارچێوەی ئیسرائیلی دەستکردا مایەوەو ڕۆڵەکانی دڵیان نەدەهات زەوی‌وزاری باوباپیریان بەجێ بهێڵن و لەپێناوی ئەوەدا شەو و ڕۆژ بادەی ستمکاری‌و کوێرەوەری بنۆشن.

فەرمانڕەواکانی دەوڵەتی ئیسرائل دیارە بە مەرجێك لەم بارە چاویان پۆشی کە ئەم عەرەبە فلسطینی‌یانە بە دانیشتوانی دەوڵەتەکەیان بناسرێن و ببن بە هاونیشتمانی ئیسرائلی.

قەوارەی داتاشراوی ئیسرائیل کە بەم جۆرە پێك هات بەرەنگاری دەیان کێشەی زمانی‌و ڕۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابوری‌و ڕامیاری بوو و کۆمەڵە ناسازەکەی وەکو دەریایەکی بەجۆش ئوقرەی نەدەگرت.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم دۆخە ناسروشتی‌یە لەبەر دەستی ئەندام و کۆمەڵەو جڤات و پارتەکانیدا سێ ڕووکاری ئایدولوجی‌و بیروباوەڕی هاتنەکایەوە: -

**یەکەم:** ڕووکاری دیمکراتی ڕۆژئاوایی کە پەیڕەوی‌کەرەکانی ڕووکەشانە بڕوایان بە سەربەست هەبوو چالاکی ئابوری سەربەستیان بە تاقە ڕێگای پەرەسەندنی کۆمەڵی ئیسرائیلی دەزانی.

**دووەم:** ڕووکاری خەباتی چینایەتی چەپگەری کە هەڵگرانی دروشمەکەی سەرکەوتنی چینی کرێکاری دەوڵەتی ئیسرائیل بە عەرەب و جولەکەوە. بە دەرمانی هەموو دەردێکی میللەتی ئیسرائیلیان لە قەڵەم ئالای ئەم سەرکەوتنەدا عەرەبە ڕۆشنبیری‌و ئابوری‌و ڕامیاری‌یان مسوەگەر بکەن.

**سێیەم:** ڕووکاری خەباتی نەتەوایەتی عەرەبی کە خەباتگێرەکانی دانیان بە دەوڵەتی دەستکردی ئیسرائیلدا نەدەناو بە هیچ جۆرێك خۆیان بە بەشێك لە میللەتی ئیسرائیلی نەدەزانی.

ئەم سێ ڕووکارە لێرەدا جێگای شی‌کردنەوەی لایەنەکانی نابێتەوە، بەڵام تا پێمان دەکرێ لەمەودا لە هۆنراوەی عەرەبیدا هێمایان بۆ دەکەین و بە دەقی ئەم هۆنراوەیە وڵامی سێ پرسیاری سەرەکیی دەدەینەوە!

**یەکەم: -**

ئایا لە ڕێگای ڕێکخراوە ئیسرائیلی‌یەکانەوە چ ویژەیی بن چ ڕامیاری، میللەتی عەرەب لە دۆزخی سنووری دەوڵەتی ئیسرائیلدا دەتوانێ مافی خۆی وەچنگ بهێنێ؟.

**دووەم: -**

چەمەگی ئاشتی‌و جەنگ دەبێ لەسەر چ بنەرەتێکی ئایدۆلوجی‌و بیروباوەڕیدا ساز بکرێت.

**سێیەم: -**

هۆنراوەی عەرەبی فلسطینی پێویستە چلۆن لەم کۆڕەدا ڕەفتار بکات؟.

جولەکەکان هەموویان و تاقمێکی عەرەبی خۆ فرۆش بە گوێرەی ڕووکاری چینایەتی‌و بیری‌و ڕامیاری‌یان مل کەچی خواستی سەرکردایەتی دەوڵەتی ئیسرائیل بوون و بەسەر ڕێکخراوە ئیسرائیلی‌یەکاندا دابەش بوون کە بوونیان بە فەلسەفەی یەکێتی میللەتی ئیسرائیل هاتبووە کایەوە.

عەرەبە خەبات گێڕو ڕووناك بیرەکان بەم حاڵە قایل نەبوون و تێدەکۆشان ڕێکخراوی عەرەبی لەسەر بناغەی جیاوازی هەموو لایەنەکانی ژیانیاندا پێك بهێنن و لە

ڕێگای ئەم جۆرە ڕێکخراونەوە بجەنگێن.

ڕەخنەسازی فلسطینی دەربارەی ئەم مەسەلەیە لە کۆڕی وێژەدا سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە وێژەرە فلسطینی یەکان دوو کۆمەڵ بوون: -

یەکەم: کۆمەڵی وێژەرە خۆپەرستەکان کە لەبەر پارووێک نان و بەرژەوەنـدی ژیانی کەسی و خێزانیان دەستیان بە کڵاوی خۆیانەوە گرتبوو بە هیچ جۆرێك تووخنی بابەتی ڕامیاری و بیری و ئایدۆلوجی نەتەوەکەیان نەدەکەوتن، لە مەیانی هۆنـراوەدا خۆیان بە ناوەرۆکی دڵداری و وصفی سروشت و گریان لە دەست گەردوون خەریك کردبوو.

لە هونەری چیرۆکدا چەند تکنیکی نووسینەکانیان هونەری بێت، پێنوسەکانیان بە کاروباری ڕۆژانەو بابەتی تقلیدی یەوە گیرۆدە بوون و لە ڕوانگەی فەلسەفەیەکی نەتەوایەتی یەوە هیچ بەرهەمێکیان لێ نەدەوەشایەوە، بۆیە ئەم کۆمەڵە وێژەرانە هەرچەندە بە زمانی عەرەبی لاپەڕەیان ڕەش کردۆتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا بە وێژەری عەرەب لە قەڵەم نادرێن.

دووەم: کۆمەڵی وێژەرە خەباتگێرەکان کە سەرەڕای هەمو و دەرفەتە دژوارەکانیان شەرەفی ووشەی پیرۆزیان پاراست و هەموو بەرهەمێکیان لە ڕوانگەی رووکاری نەتەوایەتی یانەوە بە عەرەقی ناوچەوان و خوێنی دڵ نووسیی یەوە:

ئەم وێـژەرانـە بۆ بەکـخستنی بۆچـوونیـان لە رووی بیـروبـاوەڕو چۆنیـەتی ئیش کردنەوە ڕێخراوێکی وێژەیی یان پێك هێنا بە ناوی (رابطة للشعراء العربية)وە.[13]

چالاکی ئەم ڕێکخراوە تا بڵێیت بەرین و کاریگەر بوو، چونکـە شانـۆی ئیش کردنی لە گونـدو دێکانی زەوی‌وزاری فلسطینی داگیرکراودا ڕێك دەخرا. باشترین نموونە بۆ ئەم چالاکی یـە میهـرەجـانـەکـەی (کفریایف) بوو کە لە ڕۆژی 14ی تمـوزی ساڵی 1957ی زاینیـدا گیـراوو دوانـزە

هەستیاری فلسطینی نەتەوە پەرست بەشداری یان تێداکرد.

ڕۆشـنـبیـرە عەرەبـەکـان کە هەستیـان بە نرخی ئەم ڕێکخـراوە کرد لە دەوری خڕ بوونـەوەو بڕیـاریان دا ئاسۆی ڕێکخستن و ئیش کردنی فراوان بکەن.

سەرئـەنجـام لە ڕۆژی (15)ی ایلولی ساڵی 1957ی زایینی کۆبـونـەوەیـەکی فراوانیان بەست و بڕیاریان دا ناوی (رابطـة الادبـاء والمثقفین العـرب) لەو ڕێکخـراوە بنێن بۆ ئەوەی جگە لە هەستیارەکان نووسەرو ڕۆژنامە نوسەکانیش بگرێتەخۆی.

ئەم جموجۆڵە ئاکامی دوو هۆی سەرەکەیە: -

یەکـەم - دووپـات کردنـەوەی جیـاوازی زمانی عەرەبی و میللەتی فلسطینی لە زمانی عبری و کۆمەڵی جولەکەکان.

دووەم - سووربوون لەسەر بوونی سەرکردایەتی عەرەبی لە هەموو ڕێکخراوێکدا.

کاربـەدەستـە ئیسـرائلی یـەکـان کە شارەزای مێـژووی بیـروبـاوەڕی نەتەوایەتی عەرەبن، بەڕاستی مەترسی یان لەم ڕیکخراوە کردوو بە هەموو توانایەکیانەوە بەربەرەکانیان کرد، بۆیـە لە سەرەتـای ساڵی 1960ی زانییـدا لە جمـووجـۆڵ کەوت. ئەمـە لە لایـەکـەوە لە لایـەکی تریشـەوە ئەو کاربەدەستانە لەم تاقی‌کردنەوەیەدا بۆیان ساغ بووەوە، ئەگەر وێژەرە فلسطینی‌یەکان جۆرە ڕیکخستنێکیان نەبێت دەست لە دووبـارە کردنـەوەی پێکهێنـانی ڕێکخستنێکی ڕاستـەقینە هەڵنـاگـرن، بۆیە لەگەڵ ئەم وێژەرانەدا دەرگای گفتوگۆیان کردەوەو بە بەڵـێـن و قسـەی شیـریـن تاقـمێـك لە ڕاڕاو خۆپەرست و هەڵپەرست و خۆفرۆشیان پێك هێناو لە دائرەی وێـژەیی لە (الهستـدرۆت)دا مێشـك و ویـژدان و هەست و نەستیانی پەت کرد.

حبیب القهـوچی یەکـەیـەکە ناوی ئەم تاقمەی تۆماری کردووەو گێـراویـەتی یـەوە کە چۆن لەبـەر دەرگـای (صنـدوق الکتـاب العـربی)دا چۆکیـان ‹ .وداوهبۆ چاپکردنی بەرهەمە لاوازەکـانیـان ماستـاویـان بۆ داگیرکەران سارد دەکردەوەو لە

مهرەجانی یادکردنەوەی دەیەمی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلدا شەرەفی ووشەی پیرۆزیان پێشێل کرد.

بنەرەتی یەکانی قورئانی پیرۆزو نەریتی نەتەوەی عەرەبی دێرین و هاوچەرخ هەڵبەت لەو ... تاقمە بێ بەری یەو بزوتنەوەی مێژ ووی خەباتی وێژەرە راستەقینە فلسطینی یەکان بەڵگەیەکی زیندووەو دووپاتی دەکاتەوە کە ئەو بنەرەتی یانە لەشادەماریاندا قووڵپ دەدات، بۆیە تێبینی دەکەین کە ئەم وێژەرە راستەقینانە چەکی ووشەی عەرەبی یان دانەناوە هەر یەکێکیان لە رێگایەکی گونجاوەوە بۆ مافی نەتەوەکەیان دەجەنگا.

تۆژینەوەکەمان بۆ شی کردنەوەی ئەرکی وێژەی نەتەوایەتی لێرەدا پێویستە سەرنج لە هەستیارە بەرگری کارەکان بدات کە پێشەواکانیان لەبەر چەند هۆیەك قایل بوون بچنە رێزی بزوتنەوەی چەپگیری ئیسرائیلی یەوە.

مامۆستا خالد مصطفی[١٩] لەم رووەوە دووپاتی دەکاتەوە کە پارتی کۆمەنستی ئیسرائیل تاقە هەڵبژاردنی بزوتنەوەی بەرگری کاری فەلسطینی لە زەوی‌و زاری عەرەبی داگیرکراودا بوو.

هەروەها باسی دەکات کە چ کاتێك و چلۆن هەستیارە پێشەوا بەرگری کارە فلسطینی یەکان محمود درویش و سمیح القاسم و توفیق زیاد بوون بە ئەندام لەم رێخراوە ئیسرائیلی یەدا.

هەروەکو لە سەرەتای تۆژینەوەکەماندا دووپانمان کردەوە کە مەبەستمان ئەوە نی یە بیروباوەرێك بیردۆزانە شی بکەینەوە پەنا دەبەینەبەر بەرهەمی ئەو هەستیارانە بۆ ئەوەی بزانین چۆن هەمیشە لە مەسەلەی خەباتی چینایەتی‌و ئاشتی‌و جەنگ تێگەیشتوون و بە چ جۆرێك ناوەرۆکی هەڵبەستەکانیان لەم سەرچاوانەوە هۆنیوەتەوە.

محمود درویش لە هەڵبەستێکدا بە ناونیشانی (سروودی پیاوەکان) بروای خۆی بە دۆستایەتی مرۆڤایەتی وێنە دەکێشێ‌و دەڵێ: -

**هەموو راپەرینێك لە جیهاندا دەمان جوڵێنێ**
**هەموو جوانێك لەم سەر زەوی‌یەدا ماچمان دەکات.**
**هەموو باخچەیەك لەم ئەرزەدا دەنکە گەنمێکی لێ‌دەخوێن.**
**هەموو هەتیوێك ئەگەر هات و بانگی**
**کردین دەچین بە دەنگی‌یەوە لە هەر**
**کونێیەك بێت.**

هەستیارەکەمان لەم وێنەکێشانەدا لە روانگەی بنەرەتی یەکێتی بەرژەوەندی چارەنووسی میللەتانەوە هەست و نەستی خۆی دەچەسپێنێ.

ئەم بنەرەتی یە هەڵبەت نیشانەی خێرمەندانی ئەم چەرخەیە، بەلام مێژوونوسی کە لە رەگ و ریشەی ئەم بنەرەتی یە لەلای هەستیارێکی عەرەبدا دەکۆڵێتەوە بۆی هەیە سەرنج بۆ قورئانی پیرۆز رابکێشێ کە هەزارو چوار سەد ساڵ لەمەو پێش دروشمی یەکتر ناسینی میللەتانی بەرز کردۆتەوەو سەلماندویەتی کە هیچ میللەتێك لەوی‌تر چاکتر نی یە.

محمود درویش لە هەمان هەڵبەستدا هێما بۆ بنەرەتی یەکی دی لە رووکاری فەلسەفەی نەتەوایەتی عەرەبی دەکات و دەڵێ: -

**«لە پاسەوانی بەندیخانەمان بگرە**
**بۆ هێزی دوژمن مل کەچ مەبە**
**شیرینی بیروباوەر.**
**تاڵی ژاڵە دەتوێنێتەوە».**

قسەبۆکراو لەم دێرانەدا میللەتی فلسطینی یە، محمود درویش داوای لێ‌دەکات لە دوژمنەکەی، کە جولەکەیە مان بگرێت و بە چەکی بیروباوەرەوە دەستەویەخەی بجەنگێ.

ئەم داواکردنە دوو ڕاستیمان بۆ ڕچاو دەکات: -

یەکەم: قایل نەبوون بە ستەمکاری بە ناوی ئاشتیو ئاسایشتەوە کە دیسانەوە یەکێکە لە بنەڕەتییەکانی قورئانی پیرۆز دەرحەق بەم مەسەلەیە.

دووەم: بەکارهێنانی ڕەمزی (پاسەوانی بەندیخانە) بۆ پەردە ڕامالین لەسەر ڕەگەز پەرستی ئیسرائیلییەکان کە بەبێ جیاوازی باری کۆمەلایەتی، بەرژەوەندییان بەندکردنی عەرەبە فلسطینییەکانە.

محمود درویش لە هەڵبەستێکی تریدا ڕاناوی کۆی مخاطب بەکار دەهێنێو ڕووی دەم دەکاتە داگیرکەرە ئیسرائیلییەکان دەڵێت:

هەر چوار پەلم توونـد ببەستنەوە
دەفتەرو جگەرەم لێ قەدەغە بکەن
دەمم لە خۆڵ پڕ بکەن
هۆنراوە خوێنی دڵمە
هۆنراوە خوێی نانمە
هۆنراوە ئاوی چاومە
هۆنراوە بە نینوك، بە چاو بە خەنجەر دەنووسرێتەوە.
من هۆنراوە هەمیشە دەڵێمەوە
لە بەندیخانەدا، لە گەرماودا
لە تەویلەدا لەژێر زەبری قەمچیدا
بەدەست بەستراویو زنجیر بەملەوە
من هەمیشە هۆنراوە دەڵێمەوە
من هەمیشە هەڵبەست دەهۆنمەوە
هەزار چۆلەکە بە درەختی دڵمەوە
هەزار ئاواز دەخولقێنن»

ئەم وێنەیە - بەبێ مشتومڕ - زۆرانی نێوانی میللەتی عەرەب و گشت جولەکەکان بە توونـدی پیشان دەداو بە هەڵوێستیان لە هۆنراوەی عەرەبی دووپاتی دەکاتەوە کە ئەمانە نایەنەوێ هۆنراوەی ڕەسەنی بەرگریکار لە دایك ببێ، چونکە ئەم جۆرە هۆنراوەیە ئاوێنەی هەموو جیاوازییەکانی میللەتی عەرەبە لە جولەکەکان، جولەکەکانیش دەیانەوێ ئەم جیاوازییانە بە هەر جۆرە یەکێتییەکی ئیسرائیلی بێت: یەکێتی نیشتمانی بێت یان یەکێتی چینایەتی لە ناوی بەرن.

هەستیاری بەرگریکاری فلسطینی سمیح القاسم زیاتر ئەو زۆرانە بە ڕوونی لە هەڵبەستێکدا بە ناونیشانی (دەمەتەقەیەك لەگەڵ کابرایەکدا) دەخاتە ڕوو و دەڵێ: -

«کابرا: ڕۆما سوتاو بوو بە خۆڵەمێش.
هەستیار: نەخێر ڕۆما نەمرەو نیرۆن مرد.
کابرا: ڕۆما هەرگیزاو هەرگیز لە شعرەکانت تێناگات.
هەستیار: ڕۆما لە شعرەکانم تێدەگات و هەرچیم ووتوە لەبەریەتی.
کابرا: ڕۆما ژێیەکانت دەپچڕێنیو ئاوازەکانت دەخنکێنی.
هەستیار: ئاوازەکانم لە دڵمەوە هەڵدەقوڵێن.
کابرا: ئەوە چییە لەناو دەستدا؟
هەستیار: مشتێ گەنمە.
کابرا: چی لە سنگتدا هەیە؟
هەستیار لە سنگمدا وێنەی، بریندارێك هەڵکەندراوە.
کابرا: لە دەم و چاوتدا ڕەنگی کینەو بووغز دیارە.
هەستیار: لە دەم و چاومدا ڕەنگی زەوی دیارە.
کابرا: شمشێرەکەت بکە بەر گاسنێك.
هەستیار: جەنابت هیچت لە زەوییەکەم بۆ بەجێ نەهێشتووم. ئیتر چی کارێکم بە گاسن هەیە؟!»

هەروەکو ئاشکرایە ڕووبەری زۆران لە نێوانی عەرەب و جولەکەدا زۆر فراوان و بەرێنە، دەیان کێشەی مێژوویی و ڕۆشنبیریو زمانیو چۆنیەتی خەبات و چارەنووسی نیشتمان دەچەسپێنێو دووپاتی دەکاتەوە کە بەرژەوەندی عەرەب و جولەکە لە دەوڵەتی ئیسرائیلدا ئاسمان و ڕێسمانە.

**پرسیـــاری گرنـــگ** لێـرەدا ڕووی دەممــان تێـدەکـات و دەپرسێت: بۆچی سمیح القاسم کەسایەتی ئەم جولەکەیەی ئاشکرا ئەکردووەو ووشەی (کابرا)ی بەکارهێناوە؟!

بەلای ئێمـەوە هەستیـارەکـەمـان ویستـویەتی بە ووشەی کابـرا دوویـاتی بکـاتـەوە کە هەموو جولەکەیەك بەو چەشنە ڕقی لە عەرەبـە، ئەگینـا دەیتـوانی لەبـری ووشـەی کابـرا ووشەی سەرمایەدارێك یان دەرەبەگێك بەکاربهێنێ.

توفیق زیاد لە هەڵبەستێکدا بەناونیشانی (بەیان نامەکان دەســووتیـن) هەڵــوێـسـتـی خۆی دەربـــارەی دروشــمی دۆستایەتیو برایەتیو ئاشتی کە بیردۆزانە لە بەیان نامەکاندا دەنووسرێنەوە دەخاتە ڕوو و دەڵێ: -

**«ئەی هاورێیانی خەبات**
**میللەتەکەم بە فرمێسك دەژی**
**لە دڵ و سەنگیدا برین لەسەر برینە**
**وولاتەکەم... هەموو بستێکی جاماوەر**
**بەخوێن ئاوی دەدەن.**
**خوێنی منیان ڕشت**
**بەشکو خیانەت بکەم، بەشکو بیفرۆشم**
**بە برسێتی ئابلۆقەم دەدەن.**
**بە کوشتن تیر بارانم دەکەن**
**بەژێر دەستیو هەرەشە دەمخنکێنن».**

هاورێیـانی خەبـات کە بەم جۆرە هەستیـارەکەمان باری خوێنیو میللەتـەکـەیو نیشتمـانـەکـەیو هەڵـوێستی دوژمنە جولــەکـــەیـان بۆ دەگێـڕێتـەوە، ڕەنگـە بڕوا بەوە بهێنن کە دروشمی بیردۆزانە قسەی ڕووتەو قسەش ناچێتە ناو گیرفانەوە.

کەوابـوو میللەتی فلسطینی نابێ بە سنـووری ئسـرائیـل قایل ببێت و لە هێلانەی ئاشتی چاوبنوقێنێ، بەڵکو دەبێ بەسکە خشێشی بێت خۆی لە داوی سرکردن و تەزاندنی گیـانی شۆڕشی ڕزگـار بکـات و بە ڕونـاکی بنەرەتییەکانی فەلسـەفـەی نەتەوایەتی شەوەزەنگی ژیان ببڕێت و ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتی فلسطینی عەرەبی سەفراز بهێنێتە دی.

هۆنـراوەی بەرگـریکـاری فلسطینی بەم شیکـردنـەوەیە ئاشکرایە کە ئەرکی خۆی ئەنجام داوەو سەلماندویەتی کە بە ڕاستی بەرهـەمی ڕۆڵـەی بەوەفـاو خەبـاتگێڕو میللەتێکی ستەم لێ کراو.

بەربــڵاوی ئاسـۆی ناوەرۆکی تۆژینـەوەکـەمـان و کەمی دەقــەهۆنـراوەکـان لە وێـژەی کوردی بە تایبـەتی پێـویست دەکات ئەم سەر ئەنجامانەی خوارەوە بچەسپێنین: -

**یەکـەم**: مەسـەلـەی ئاشتیو جەنـگ لە قورئانی پیرۆزدا شۆڕشگێـڕانـە چەسپـاوەو زەمینەیەکی بەپیتی بۆ خەملاندنی هەموو بۆ چوونێکی هاوچەرخ لەم ڕوانگەیەوە ساز کردووە.

**دووەم**: میللەتان سورشتیانە جیاوازی زمان و قەوارە لە هەمـوو هێـزێکی توینەرەوە دەیان پارێزیو هاوکاری نێوانیان لە سوود وەرگرتن لە یەکتر دێتەکایەوە.

**سێیــەم**: وێــژەی کوردی لە کوردســتــانی ئێــرانــدا نموونەیەکی هەیە بۆ وێنەکێشانی چۆنیەتی خەبات دژ بەو فارسە ڕەگەز پەرستانە کە بە ناوی یەکێتی نیشتمان و یەکێتی ئایین دەیانەوێ بیان تۆیننەوە.

**چوارەم**: هۆنـراوەی بەرگـریکاری فلسطینی لە دەوڵەتی ئیــســرائیلی دەست کردا لە ڕووی چۆنیــەتیو چەنــدەوە باشتـرین ئاوێنـەیـە بۆ چەسپـاندنی چەمەگی ئاشتی نێوانی میللەتان و بەرپاکردنی جەنگ دژ بە دوژمنان.

**پێنجـەم**: لەدایـك بوونی چینی کرێکـارو چینەکانی دی دیــاردەیکی سروشتیــەو ئەم دیــاردەیـە لە قەوارەی هەمـوو میللەتێکیدا بەگوێرەی یاسای ژیان ڕوو دەدات.

**شەشــەم**: بەرژەوەنــدی چینـەکـانی میللەتێـك لەگـەڵ بەرژەوەنــدی چینــەکــانی میللەتێکی دی دژ یەکن ئەگـەر هات و لە سنوورێکی ڕامیاری دەست کردا ئەو میللەتانە بە

# بۆ پاراستنی عیراق و ناوچەکەی لە داگیرکردن و شێواندن دەجەنگین

زۆرەملی خڕ کرابــوونــەوەو ئەم کارە بۆ سوودی ناقمێـك لە میللەتێکی دەستەلاتدار ئەنجام درابوو.

سەرچاوەکان


1 ـ سورة الانفال/ الاية 61.

2 ـ سورة الحجرات/ الاية 9.

3 ـ سورة الروم/ الاية 22.

4 ـ سورة الحجرات/ الاية 49.

5 ـ بەیان ژمارە 96ی مایسی ساڵی 1984.

6 ـ بەشی یەکەم لە رۆژنامەی (رۆژی نوێ) ساڵی (2) مارتی 1961ی زاینی ژمارە (1)/ ل 7 بەشی دووەم لە هەمان گۆڤارو هەمان ساڵدا مانگی مایسیو ژمارە (2)دا بلاوکراوەتەوە.

7 ـ چیرۆکی پێشمەرگە: دکتور رحیم قازی/ ل 58.

8 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو/ ل 66.

9 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو/ ل 64.

10 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو/ ل 64.

11 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو/ ل 96.

12 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو/ ل 142.

13 ـ بڕوانە کتێبی (الشعر الفلسطینی الحدیث/ خالد علي مصطفی/ ل 195.

14 ـ بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشو/ ل 247.



# لایەنێکی مێژوویی پەیوەندییەکانی نێوانی عیراق و ئێران و جەنگی قادسیەی صدام

- مولود سورچی -

## سەرەتا

هەموو گەلێکی ئازادیخوازی ئەم سەرزەمینە، هەر یەکە لە ئاستی خۆیدا، بەرامبەر بە پاراستن و بەرگری‌کردن و قوربانیدان لە پێناو سەربەرزیی ئەو خاك و نیشتمانەی بۆ یەکەم جار چاوی تیا هەڵهێناوەو بە ئاوو هەواکەیەوە پەروەردە بووەو تیا گۆش کراوە، لێپرساوە.

تێکۆشان و خوێنەویستن و قوربانیدان لە پێناو سەر بەرزی رۆڵەکانی وڵات و پارستنی خاکی پیرۆزی نیشتمان، لە لایەن نیشتمانپەروەران، ئەرکێکە، لە دەستووری سەرزەوی وبیروباوەڕی ئاسمانی، نرخێکی تایبەت و شوێنێکی پایەبەرزو ڕێزلێنانێکی یەگجار پیرۆزی هەیە.

گیان فیدایی‌و خۆکردنەقوچی قوربانی نیشتمان و شەهیدبوون لەم ڕێگەیەدا، باشترین پاداشتی دوارۆژەو .. لە لایەن یەزدانی گەورەو میهرەبانیشەوە، ڕێزو شوێن و پایەیێکی بەرزو دیارو بڵندی هەیە...

شەهیدیش هەرگیزاو هەرگیز نامرێ‌و لە ناو دڵ و دەروونی میللەتا زیندووەو .. بە نەمرییش ناوی لە لاپەڕە زێڕینەکانی مێژوودا تۆمار دەکرێ‌و دەپارێزرێ‌و .. نەوە دوێ‌و نەوە دەڕوا، شەهید زیاتر لە دڵ و دەروون نزیك دەبێتەوەو..

هەر زیندووەو .. نەمرە.

مێژووی کۆن و نوێی عیراق، باشترین بەڵگەی تێکۆشان و قوربانیدان و ئازایەتی عیراقییەکان، لە پێناو سەربەرزیی رۆڵەکانی‌و پارستنی خاکی پیرۆزی نیشتمان ،لە توێی لاپەڕە نەمرەکانیدا پێش چاو دەخات.. پیشان دەدات کەوا تێکۆشەرانی ئەم خاکە، بە هەر بارو دۆخێکی ناڵەبارو ناسکدا تێپەڕیون، بە پێی بۆلووان و پێکران و رادەی لە توانابەدەر، سەرشۆڕی‌و مل کەچیان قبوڵ نەکردووەو. هەرگیز درێغیان بە خوێن و گەشی‌و پاکی خۆیان لە کاروانی دوورو درێژی خەبات و تێکۆشاندا نەداوە...

لاپەڕە گەشە نەمرەکانی مێژووش شاهیدە..

ئەوەتە مێژوو..

## ئاوردانەوەیەك لە مێژوودا

:

ناکۆکی عەرەب دژی رەگەزپەرستیەتی فارسی دیاردەیەکی کاتیی نیە کە لە ئەنجامی بارودۆخی شۆڕشگێرانەی عیراقی نوێوە هاتبێتەکایەوە... ئەمە بەشێکی زۆر بچووکە کە بە هەموو رەگەز دژ بەیەکەکانی‌یەوە لە زەمانی مێژوویی دەپچرن... لە راستیدا ئەمە بەشە رواڵەتەکەیەتی. خۆ ئەگەر هات و لەم دژیکارییەدا پرسیارکردن رەواو بەجێ بوو، ئەوە بە هەڵەدا دەچین ئەگەر لە عاستی ناکۆکی عیراق و ئێراندا لە سنووری گۆشەی یاسای وڵاتاندا راوەستین... ئەگەر ئەو مەسەلە مافکاریانە هۆی راستەو خۆی بەیەکداچوونەکە بێ، ئەوە راست و بەجێ نیە هەرگیز دڵمان بەوەندە ئاو بخواتەوە.. بەڵکو دەبێ بە قووڵایی مێژووی ئەم مەسەلانەدا بچینە خوارەوە، بۆ ئەوەی بگەینە بنج و بناوانی کێشەکە لە قووڵایی مێژووی ناوچەی عەرەبی‌دا، هیچ گومانیشی تیادا نیە کە ئەم مل ملانێیە لە پێش پەیدابوونی ئاینی ئیسلامەوە بەرپابووەو میللەتی عیراقیش بەر لە پەیدابوونی ئیسلام، بۆ بەرگریکردن لە ئەدگارو تایبەتیەتی‌و خودی شارستانیەتی عەرەبی‌و کەسایەتی نەتەوەیی خۆیان لە دژی هێرشی‌و شاڵاوەکان فارسەکان راوەستاوو بەرپەچیان داونەتەوە.

هەوڵ دەدەین کە کارێکی وا بەرخسێنین ڕووداوەکان خۆیان لە ڕێرەوێکی بە جێ‌و پوختەوە لە خۆیان بدوێن و پەردە لە ڕووی خۆیا هەڵماڵن.

«فارسی» و «ئێران»، زاراوەیەکی ئیمپریالیزم درووستی کردووە بۆ ئەوەی لە پەنایەوە بوار بۆ دەستەڵاتی رەگەزپەرستیەتی فارسی بە سەر نەتەوەکانی تردا

بکاتەوە. ... وەختی خۆی فارس «ئیمپراتۆریەتی کۆرش - 2550 پ. ئەمڕۆ» بوونێکی کۆمەلآیەتی و ڕۆشنبیری دژوار بوو، یەکیەتی و گونجاندنی تێدا نەبوو. ئەم دوو دیاردەیە مەرجی بنەرەتی و سەرەکیین بۆ هەڵگرتن و بڵاوکردنەوەی پەیامی مێژوویی. دەوڵەتی فارسی لە وەختی دروستبوونیەوە ئیمپراتۆریەتێکی لە لای ڕۆژهەلآتی شارستانیەتی عەرەبی یەوە دامەزراندبوو، ئەو ئیمپراتۆریەتە ئیمپراتۆریەتێکی سوپایی فارسی بوو، کۆمەڵێ لەو وەچەو بنەچانە فەرمان ڕەواییان کردووە کە توانیویانە بە پێی تەقیکردنەوەکانیان دەزگا ڕۆشنبیری و کۆمەلآیەتی و ئابووریەکان بخەنە ژێر ڕکێفی دەزگا سوپایی یەکانەوە». (1)

دیاردەی هەرە سەیری ئیمپراتۆریەتی فارسی لە هەموو مێژوودا ئەوە بووە کە هەمیشە پشتی بە کۆمەڵێ چەکداری نۆکەرو بەکرێگیراو بەستووە کە فارس نەبوون و بە پارەگرتبوونی . . . ئەمەش وای لە سوپاکەی کردبوو کە ببێتە دژوارترین نموونەی دڕندەترین سوپای وێرانکارو دوژمنی شارستانیەت. جوانترین نموونەی ئەو دڕندەیی یەش ئەو هێرش و شالآوە نالەبارانەبوو کە ڕەگەزپەرستیەتی فارسی کردیانە سەر شارستانیەتی بابل و هەتا توانیان کاول و وێرانیان کرد.

بەلآم لەگەڵ ئەوەش دا کە مۆرکی ڕەگەزپەرستیەتی فارسی مۆرکێکی سوپایی بوو، لاوازو بێ هێز بوو، شەڕەکانیان لەگەڵ عەرەب و نەتەوەکانی تردا شلۆقی لایەنی سوپایی و باری کۆمەلآیەتی و ڕۆشنبیری و شل و شاوی بوون و خوونەریتی فارسەکانی ئاشکرا کردو سەلماندی کە لاوازن.. ئەوە بوو لە شەڕی - ذی‌قار - دا کە لەگەڵ عەرەبدا کردیان و لە شەڕەکانی لەگەڵ ڕۆمەکانیشدا، تێکشکان و دەزگا سوپاییەکانیان پرش و بڵاوبوونەوەو ترس دایگرتن. هەرچەندە ئیمپراتۆرەکانی فارسی بە سەرگەرمییەوە هەوڵی ئەوەیان دا کە جۆرە ئایدیۆلۆژیەت و باوەڕێکی وا بێننە کایەوە لەگەڵ ڕەگەزپەرستیەتی و لووت بەرزیەتی خۆیاندا بیگونجێنن بۆ ئەوەی بتوانن باری نائاسوودەیی و پاشاگەردانی کۆمەڵگەی هەرەسهێناوی پێ بپارێزن و بیکەنە کوتەکێك خزمەتی بەرژەوەندی دوژمنکاریی و بەربلآوی خۆیان بکات وژی نەتەوەکانی تر، بەلآم ئەو کارە کەڵکی نەبوو..

ڕۆژگار ئەوەی سەلماند کە دەزگای سوپایی بە تەنیا ناتوانێ ئاسوودەیی لە کۆمەڵگادا بەرپا بکات.

یەکێ لەو ڕێگەیانەش کە بۆ پینەو پەڕۆکردنی باری شلۆقیان هێنایانە کایەوە ئاینی زەردەشتی بوو کە لە سەر بناغەی پەرستنی شتێکی هەستپێکرا دامەزراوەو کەڵکی هەیە ئەو شتەس ئاگرە...

مەجووسییەت ئەگەر چی لە بیروباوەڕدا فەلسەفەکاری دەکاو وادەگەیەنێ کە ڕووناکی و تاریکی جمك و دوانەن... هتد، بناخەی ئاژاوەیەکی ڕەوشتیاری و کۆمەلآیەتی دامەزراندووە، ئەو ئاژاوەیەش لە بیروباوەڕی جوولآنەوە تازەکانی فارسەکاندا وەکو (قرمطی) و (بەهائی) و (بابی) و (حەشاشی) یەکاندا سەری هەڵداوەو دەرکەوتووە. ڕاستی یەکەشی ئەوەیە ئەو بزووتنەوە گیانیانەی کە لە ناوەڕوکدا دوژمنی ئیسلام و عەرەبن، لە بناخەدا لە سەر بەرەیلآیی ئارەزووی دەروونی مرۆڤ دامەزرابوون و هاتبوونە کایەوەو ببونە چەرخی لە دایك بوونی جۆرە بەرەلآییەکی کۆمەلآیەتی و ئابووری.

بیروباوەڕەکان (مانی) ش 215 - 272 - لە زەردەشتی یەوە پەرەپێداوەو ئاینی (مانی) دامەزراندوو و بیرو باوەڕی زەردەشتی خستۆتە بۆتەی بیری ڕامیاری یەوە ئەویش بۆ ئەوەی ڕێگە بۆ ڕەگزپەستیەتی فارسی خۆش بکا.

لەو مەسەلەیەشدا - شاپور - شا - پشتی دەگرێ.

مان دەستی کرد بە ئامێتەکردنی ئاینە کۆنەکان و

مەسەلەی (دوانەیی گەردوون) - ڕووناکایی و تاریکی - لە مەجووسییەت و (پەی پێ نەبردن)ی لە بووزییەت و (سیانەی پیرۆز)ی لە عیسایی یەوە وەرگرتووە بۆ ئەوەش کە لە نرخ و بەهاو پیرۆزی پەیامی پێغەمبەران و ئاینە ئاسمانی یەکان بشکێنێ، گەلێ درۆو دەلەسەی بۆ

هەڵبەستن

بە ردەیەك وتبووی (حەزرەتی عیسی شەتیان بووە!!).

لەگەڵ پەیدابوونی ـ مزدەك ـ دا 487 ـ 523 ـ ز، ئایدیۆلۆژیەتی رەگەزپەرستیەتی فارسی گەیشتە ترۆپك و بە وەش لە رووفان و هەرەسی هێنان نزیك بوونەوە . . . مزدەك فەلسەفەی زەردەشتی و مانی تێکەڵ و ئامێتەکردو ئایینی مەزدەکی دامەزراندو لە سەردەمی ـ قباذ ـ شادا (488) بوو بە ئایینی رەسمی دەوڵەت و خەڵکی فارسی بەرەو پیریچوون و بەمەش باری کۆمەڵایەتی کەوتە مەترسی یەوە. بیرو باوەری مەزدەکی لە سەر بناغەی بەرلاەلایی کۆمەلایەتی دامەزراوەو هیچ خووڕەوشتێکی بەرزی کۆمەڵایەتی تێدا نیە.

ابن الندیم ـ ی مێژوونووس دەڵێ «مزدەك فەرمانی پێدان، کە بە ئارەزووی دەروونی خۆیانەوە، رابوێرن و بخۆن و بخۆنەوەو جووت بن و هاوبەشی ژن و خێزانی یەکتر بکەن لە رابواردن دا. .»، . . ئەوەشی خوو نەریتێکی کرژ وکاڵی مرۆڤەو، مرۆڤایەتی لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا پیادا تی ئەپەڕی ئا ئامانەیە کۆڵەکە سەرەکی یەکانی شارستانیەتی فارس. . ئەو شارستانیەتە پووچەڵەی، کە لەگەڵ سەرەتای دەرکەوتنی ئایینی ئیسلامی پیرۆزدا، هەرەسی هێنا.

شەڕی قادسیە مل ملانێیەکی مێژوویی بوو لە نێوان شارستانیەتێکی تازە هەڵکەوتوودا کە هەموو هەل و مەرجێکی بەردەوامی و مێژوویی تێدا بوو لە نێوان قەوارەیەکی شارستانیشدا کە هەمو رەگەزەکانی داتەپین و هەرەس هێنان و تەفرو توونا بوونی تیادا کۆبووبۆوە.

بە کورتی، تای تەرازووی مل ملانەکە لەگەڵ لایەنی رەگەزەکانی قۆناغی مێژوویی نوێدابوو . . . ئەو قۆناغەی کە عەرەب و ئیسلام ناوەرۆکی جەوهەری بوون و مرۆڤایەتیش مەبەستەکەی و هەنگاوی خێرخوازی و خۆش ویستی و ئاشتییانەی ناو شارستانیەتێکی تازەی جیهانی دروست کرد کە هەتا ئێستاش لە مێژووی مرۆڤایەتی دا بەرزو بڵندەوە جێگەی شایانی خۆی هەیە.

لە شەڕی قادسیەوە تاوەکو ئێستا ، رەگەزپەرستیەتی فارسی پێش دەخواتەوەو بیر لە تۆڵەکردنەوە دەکاتەوەو هەر کاتێکیش مەبەستەکانیان بۆ هەمووان ئاشکرا دەبێ ، ئەوە ئیتر سەرکوت دەکرێ وەك چۆن بزووتنەوەکانی قەرامیتەو بابکی و بەرمەکی یەکان پەردەیان لە روو هەڵماڵراو بۆ هەتا هەتایە قەلاچۆکران و لە ناو بران.

لێرەدا پێویستە ئاورێکی مەوزووعی لە

کەسایەتی فارسی بدەینەوە ئەویش لەو لایەنەوە کە مرۆڤی فارسی بە گرێیەك لە جۆری گرێی ـ ئەلماساوا ـ ی جوولەکە گەمارۆ دراوە بەڵام چیە گرێکە وای لە جوولەکە کردووە کە زیاتر پەپکە بخۆن و، فارسیشی وا لێکردووە کە بە لایەکدا برۆن بگونجێ بۆ ئەوەی بتوانن شێوەیەکی تیادا بدۆزنەوە کە باری لێژی سیاسی و ئەیدیۆلۆژییاتی تیادا راست بکەنەوە . . . دوای تێکشکانی یاخی بوونەگەورەکانی قەرمەتی و بەرمەکی یەکان، فارسەکان کەوتنە ئەوە یارمەتی و هێز لە هۆزو تیرە درندەکان وەربگرن بۆ تێکشکاندنی یەکیەتی ئیسلام و عەرەبەو دەوڵەتەکەیان. ئەوە بوو هەندێ لە سەرکردەکانی فارسی زۆر نامەردانە بۆ داگیرکردنی بەغدا لەگەڵ هۆلاکۆدا یەکیان گرت. . . ئەو کارەش ئەوەی دەربری فارسەکان لە ئیسلام و عەرەب داخ لە دڵ بوون و ویستیان تۆڵە بکەنەوە

بەڵام ئەو کارە هیچ دادی فارسەکانی

نەداو لە ناکاو دەوڵەتی مەری سپی و مەری رەش وڵاتی فارسیان گەمارۆداو وەکو هەڵۆ لە سەری نیشتنەوەو

فارسیان شەت و پەت کرد

فارسەکان ، بە تایبەتی شاکانی سەفەوی

ویستیان دەورێکی شانۆگەری بنوێنن و بە ناوی ئایینی ئیسلامەوە کار بکەن، بەڵام [illegible] دادی نەدان و ئەو رێرەوەی گرتبوویان کاتی بە سەر چووبوو.

لە کردەوەو رەوشتی رۆژانەی فارسی دا، هەڵوێستی وا دەبینی کتوپڕ دەزانی ئەمە کارێکی رەگەزپەرستانەیەو بە

هیچ جۆرێك پەیوەندی بە ئاینەوە نیە. هەموو ئەوانەی کە ـە شارە پیرۆزەکانی عیراقدا دەژین و پەیوەندی فارسیان بە عەرەبەوە لە بیرە، ئەو راستییە دەزانن، بەتایبەتی ئەوانەی کە لە سالأنی شەستی ئەم سەدەیەدا لەناکۆکیەکەوە ـریث بوون، بینیان چۆن ململانێکە بوو بە ناکۆکی نێوان (عەرەب و عەجەم). ئەمە بارێکی رامیاری نیە بۆ ـریـوش کردنی تەماو ئامانجی دیاریکراو لە ناوچەکەدا؟ ئەمە دووفاقەیی نیە کە بە ناوی ئیسلامەوە دەکرێ هەروەك چۆن مونافەقەکانی سەردەمی پێغەمبەر دروودی خوای ـو ـی. دووفاقەییان دەکردو دووروویان پیشان دەدا؟..[2]

ئەگەر بە ووردیش لە مەسەلەکە بکۆلینەوە دەبینین پەرەسەندنی باری سیاسی ئێرانی هاوچەرخ، دوو لایەن تعیەن بەرێوە. یەکەمیان ئیمپریالیزم کە بە هەموو جۆرێك ـرمەتی دەدات، ئەویش بۆ ئەوەی ئیمپراتۆریەتی فارسی لە ناوچەی عەرەبیدا دامەزرێتەوەو دەستی بەسەر کەنداوی عەرەبیدا بگرێ. دووەمیان بەندو باوی ئایینی تیرەگەری ئەعیـزە ئەویش بۆ لەتکردنی یەکیەتی عەرەبی کەنداوو دوورگەی عەرەبی. ئەم هەموو کارانەش بۆیە دەکرێ چونکە فارس بە بڕوای پووپەلی خۆی، ئەم ناوچەیە بە جوغزی شارستانیەتی رەگەزپەرستێتی خۆی دەزانێ.

ـــــ دەوڵەتی ئێرانی نوێ، لە ئەنجامی کودەتایەکدا دروست بوو کە پەهلەوی گەورە لە بیستەکانی ئەم سەدەیەدا بە سەر قاجارەکانا کردی... ئاشکرایە ئەگەر یارمەتی دەوڵەتە ئەوروپاییە داگیرکەرەکانی نەبوایە، ئەو (ئەفسەرە لاوە) ـ واتە پەهلەوی گەورە ـ نەیدەتوانی لە کارەکەیدا سەرکەوێ... ئەوەبوو بە یارمەتی بەریتانیا توانی بە سەر قاجارەکانا سەرکەوێ چونکە ئەوان بوونێکی وا رێك و پێکیان نەبوو بتوانن خواستەکانی بەریتانیا ئەنجام بدەن و بەرژەوەندیەکانی بپارێزن.

ئەو قۆناخەش واتا قۆناخی سەردەمی قاجارەکان و سەدەی نۆزدەهەم، دەوڵەت و کۆمەڵگای فارسی رووبان لە کزیو ئاژاوەیەکی سەیرکردبوو، ئەو بارەش بوو بە بوارێك بۆسەرهەلدانەوەی بزووتنەوە مرۆمیە فارسیەکان و هەرەسهێنانی کۆلەکەی کۆمەلأیەتیو پاشا گەردانی رەوشت.

ئەوەبوو بزووتنەوەی ـ بابی ـ و ـ بەهائی ـ وەکو رێکخراوی نهێنی سەریان هەلدا. شایانی باسە، بنەرەتی ئەو بزووتنەوانە لە سەر بیروباوەڕی ئاینە کۆنەکانی فارسیدا دامەزرابوو بەلأم لە ژێر پەردەی ئیسلامدا کاریان پێ دەکرد. بەلأم ئاشکرایە ئەم کۆمەلە بزووتنەوانە بە زۆری زۆردارەکی نەبێ نەیانتوانیوە هەموو فارسی بهێننە ژێر دەسەلأتی خۆیانەوە. ئەو بزووتنەوانە لە ئەنجامی لووت بەرزیو خۆپەرستی تیرەگەرییەوە هاتۆتە کایەوەو دام و دەزگاکانی ئیمپریالیزم زۆریان کەلك لێ بینیوەو شایانی باسیشە کە بابیەکان و بەهائیەکان پەیوەندی بەهێزیان لەگەل ماسۆنیو زایۆنیدا هەیە. لە نێوان ئەم بزووتنەوانەدا کۆلەکە بنەرەتییەکانی

کۆمەلگەی فارسی، دەرکەوتن و گرێکوێرەی رق و کینەیان لە نەتەوەی عەرەب ئاشکرا بوو.

، کە پەهلەوی گەورەشی کودەتاکەی سەرکەوت، بناخەی دەولەتێکی نوێ لە سەر کۆلەکەی رەگەزپەرستایەتی دامەزراند... بەلأم دەولەتەکی پەهلەوی، ئەگەر هەر پشتی بە فارسەکان ببەستایە لاوازو بێ دەرەتان دەبوو، لەبەر ئەوە کەوتە ئاین و ئۆیین و ناوێکی تری لە دەولەتەکەی نا ، ئەویش ئەوەبوو ناوی نا (دەولەتی ئێران). ئاشکراشە هەر لەگەل سەرکەوتنی پەهلەوی گەورەدا دەولەتە گەورەکان کەوتنە دانان و نەخشەکێشانێکی وا کە دەولەتە تازەکەی فارس بتوانێ هەمو گەل و نەتەوەکانی تری ئێران بخاتە ژێر رکێف و تواناو دەسەلأتی خۆیەوە.

لە راستیدا، ئێرانی فارسی، توانی ئازربایجان و کوردستان و بلوشستان و تەبریز بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوەو پاش ئەوساش فارسەکان بە یارمەتی بەریتانیا توانیان ئەهواز بە زەبری هێزی سوپای داگیربکەن.

کوورتە مێژوویەکی پەیوەندیەکانی نێوان عیراق و ئێران:ـ

«مەسەلەی دیارکردنی سنوور لە نێوان ولأتی فارس (کە

هەر لە ساڵی 1935 ـ ەوە بە ئێـران ناوبـراوە)و دەوڵـەتی عوسمانی (کە عیراق لە سەرەتای سەدەی ـ 16 ـ ی.ز ـ بەشێـك بوو، لیی ی)، گرنگتـرین کێشـەی هەڵایسـاوی مێژووی ناوچەکە بوو ـ بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەش، چەنـدەهـا پەیمـان و ڕێکـەوتننـامـە لە نێوانیاندا مۆرکراوە. ڕێکەوتننامەی (زهاب) لە ساڵی 1639، (أمير أشرف) لە ساڵی 1727، (نادرشا) لە ساڵی 1746، (أرضروم ـ ی یەکەم) لە ساڵی 1823، (أرضروم ـ ی دووەم) لە ساڵی 1847، (تـاران) لە ساڵی 1911، (استـانـە) لە ساڵی 1913و لێژنەی دیارکردنی سنوور لە ساڵی 1914.(3)

ڕێکـەوتننـامـەی (زهـاب) کە لە 17ی ئایـاریی ساڵی (1639) بەسترا، یەکەمین هەوڵی دیارکردنی سنوور بوو لە نێوان عیراق و وڵاتی فارس. ئەم ڕێکەوتننامەیە کێشەکانی نێـوانیـان چارەسـەر نەکـردو شەڕ لە نێوانیاندا بەردەوام بوو و هەردوو ناوچەی سلێمانی لە باکوور و ئەهواز لە خواروو، لە گشت ناوچەکانی تردا کێشە گەرمی لە سەر بوو.

لە 28ی تەمووزی 1823دا، ڕێکەوتننامەی ئەرزەڕۆمی یەکەم لە نێوانیاندا مۆرکرا کە دووپاتی هێڵە گشتییەکانی ڕێکـەوتننـامـەکەی (زهاب)ی کردەوە . . . وە لە بەندە هەرە گرنگەکانیدا، مانەوەیان لە سەر سنووری دیارکراوی (ئەو وەخت)و دەست نەدان لە کاروباری ناوخۆی لایەنی‌تر.

کێشـەو تەگـرەکـانی دەستنیشان کردنی سنوور، دەرفەتی چاك زەمینەیەکی خۆشی بۆ وڵاتانی ئەورروپا، بە تایبەتی بۆ بەریتـانیـا و روسیـا، سازانـد کە دەست لە کاروبـاری هەردوو لادا بخەن. لە ساڵی 1840 فارسەکان هەرەشەیان لە شاری سلێـمـانـی کردو داوای ئەهـوازیـان کردو ،دەستوەشاندن لە نێوانیاندا گەرم بوو و ئەوەندە نەمابوو شەڕ ڕابگـەیـەنـدرێ کە بەریتـانیـاو روسیـا، وەك دوو دەوڵـەتی ناوبـژیکـەر، ڕوویـان کردوە ئەم مەسـەلـەیە هەڵایساوەیەوە سەرەنجـام ڕێـك کەوتن لە سەر پێکهێنـانی لێـژنـەیـەکی چوارقـۆڵـی کە بۆ یەکـەم جار لە 15ی ئایـاری 1841دا کۆبـووەوە و ،لـە 31ی ئایـاری 1847دا ڕێکـەوتننـامـەی ئەرزەڕۆمـی دووەم مۆرکـراو هەردوو لایـەنی ئیلزام کردواز بهێنن لەداوا کرد ن ناوچـەی لایـەنی ترەوە عوسمـانیش بەڵێنی لە راوێـژکـارانی فارسـەکان وەرگرت ئیتر چاو نەبڕنە (محمرة)و کەناری (الآیر)ی کەنداوی عەرەبی.

وە هەردوو لا رازیبـوون لە سەر پێکهێنـانی لێـژنـەیەك دەستبەجێ دەست بە کارەکانی دیارکردنی سنووری نێوان عیراق و ئێران بکا.

بەرپابوونی شەڕی (قەرم) ە ساڵی 1853دا بوو بە هۆی ڕاگرتنی ئەرکەکانی لێژنە کە، وە لە نێوان ساڵانی 1857 ـ 1865 ەوە، لێژانەکە بەردەوام بە کارەکانی هەڵدەچووەوەو توانی نەخشـەیـەك بۆ سنـوور لە چیـاکـانی (ئـارات)ەوە تا کەنداوی عەربی دابنێ‌و هەردوو لایەنیش لە سەری رازی‌بوون.

پاش سـاڵـی 1865 بە ماوەیـەك، کێـشـەی سنـوور هەڵایسـایـەوەو پەیـوەندی نێوانیان تەشەنە بووەوە. بەریتانیاو روسیـا، هەردوو لایـان ناچـارکـرد بە «بـاری دانراو» رازی بین و لێـژنـەیـەکیـان لە نیـوێنـەرانی هەرچوار دەوڵەت، بە گوێرەی پرۆتۆکۆڵی 3ی ئابی 1869 پێك هێنا، مەسەلەی دیارکردنی سنوور بە جارێ ببڕێتەوە.

روسیـاو بەریتـانیـا ،بـۆ دابینکـردنی بەرژەوەنـدی‌یـە تایبـەتی‌یـەکـانیـان لە ناوچـەکـەدا، بە کوڵ بۆ بڕینـەوەی ناکـۆکیـەکـانی نێـوانیـان، بەردەوام تەقـەڵلایان دا. . . ئەم ویستـەشیـان لە سەرەتـای سەدەی بیستـەمـەوە زێدەتر بوو و توانیـانی رازی بوونی (بـاب العـالي)و حکـومـەتی فارس وەربگـرن کە لێـژ نـەیـەکی نوێ دیـارکـردنی سنـوور پێك بهێننەوەو ناکۆکیەکان تەواو ببڕنەوە. بەڵام لێژنەکە کە بۆ یەکەم جار لە ساڵی 1906 کۆبووەوەو لە پاشان لە ساڵی 1908 نەیتوانی ئەنجامی ئەوتۆ وەدەست بهێنێ کێشەکە ببڕێتەوە.

لە ساڵی 1908 تا ساڵی 1911 هەرەشەو شەڕو شۆقی لە نێوانیاندا سەر لە نوێ بووەوە. لە 21ی کانوونی یەکەمی 1911دا بە گوێـرەی پرۆتـۆکـۆڵی تاران، لێـژ نـەیـەکی تر

یکهێنراو (18) جار کۆبووەوە ،یەکەمجار لە (قسنطنطینیة) ـە 25ی ئاداری (1912)و دواجاریش لە ئابی هەمان ساڵ لە هەمان شوێنـدا، بەڵام هەروەکو ...نـەوەکـانی ـێژنەکانی پێشوو نەیتوانی کۆتایی بە مەیەلەکە بهێنێ. . .

ـە مانگی تشرینی دووەمی 1913 ، هەرەشەو شەڕوشۆڕ ـەرتعواجبووەوە. لەم ساڵـەدا ،وە بە گوێـرەی برتـۆکـۆڵی قسـطنطینیـة)وە، لیژنـەیـەکی تـر، پێکهێنـرا، لە کانوونی یەکـەمی 1913 دەستی بە کارەکانی کرد. ئەم لیژنەیە نۆ مـانگـی بەردەوام کارەکـانی خۆی بە سەرکـردەوە. . . بە درێـژایی هێڵی سنـوور لە (فـاو)ەوە تا ئارارات، بۆ ئەم مەبـەستـە، رووبـارو گۆم و زەڵکـاوو بیـابـان و گردو کێـوو جـیـکـانی بڕی. . .وەپشتی بە نەخشە ئەسڵی‌یەکەی ساڵی [illegible]دا بەستبوو.

لیژنەکە (227) دینگەی سنووریی چەقاند. . دوا دینگە پێش 24 سەعـات لە بەرپـابـوونی جەنگ لە نێوان روسیاو دەوڵـەتی عوسمـانی (27ی تەشـرینی یەکـەمی 1914) چەقێنـرا. ئەم دینگـانـەش لە سەر نەخشـە دانـان و (35) نوسخەی لێ لە چاپ دراو بۆ هەرچوار دەوڵەت نێرران.

دوای جەنگی یەکــەمی جیهــان، عیــراق لە دەوڵـەتی عوسمـانی جیـا بووەوەو بنـەمـای ئیلتیـزامـاتی دەوڵەیتی (بە تایبـەتی سنـووری عیـراق و ئێـران) مایەوەو عیراق لە ساڵی (1920)دا کەوتــە ژێـر ئینتـدابی بەریتـانیـا . .لـە ساڵی 1921 مەلیــك فەیسـەڵ هێنـراو تاجی پادشـایـەتی‌کـردنی عیراقی پێدرا.

لە ساڵی (1922) موعــاهــەدەی عیــراقی ـ بەریتـانی بەستراو عیراق بە سیغەی موعاهەدەوە خرایە ژێر ئینتداب.

ئێران دانی نەنا بە دەوڵەتی عیراق، کە لە 23ی ئابی 1921دا دامــەزرا. . . وە جۆرەهــا رووداو، بە درێـژایی سنــوور، سەری‌هــەڵــداو، ماوەیــەکی نەبــرد، عیــراق موزەکـەرەیــەکی بۆ حکـومــەتی ئێــران ناردو هەرەشـەی بەکێشانەوەی ئیمتیازاتی قونسڵە ئێرانییەکان لە عیراقدا لێکرد.

لە یەکی نیسانی 1929دا، شای ئێران برووسکەیەکی پیـرۆزبـایی بۆ مەلیـك فەیسـەڵ نارد بە بۆنـەی رازای‌بوونی (عصبـة الامم) لە سەر داوای عیـراق بە هەڵـوەشـاندنەوەی رێکەوتننامەی ـ عەدلی ـ ی پاشکۆی موعاهەدەی عیراقی ـ بەریتـانی ،کـە بە ...نـدبـوو بە داننانی عیراق بە ئیمتیازاتی بێگـانـە کە هاوڵاتیـانی هەندێ وڵاتانی ئەورووپاو ئەمەریکاو ئاسیـا هەیـانبـوو ،لـەوانـەی کە خاوەن کورسی هەمیشەیی بوون لە ئەنجــومـەنی (عصبـة الامم) ـ لە عیـراقـدا. . . مەلیـك فەیسـەڵیش وەڵامی برووسکـە پیرۆزباییەکەی شای دایــەوەو سوپــاســی کرد. . . لە پاشــان سـەرەك دیــوانی مەلـەکی، بە سەرۆکـایـەتی وەفـدی عیراق بۆ ستایشکردنی ئەم هەڵــوێستــەی شا، ناردە تاران و. . . لە ئەنجـامی ئەم سەردانەش، حکومەتی ئێران دانی بە دەوڵەتی‌عیراق.

لە 22ی نیسـانی 1932 ، مەلیك فەیسەڵ خۆی سەری لە تاران دا، وە لە میـان ئەم سەردانـەدا، حکـومەتی ئێران ئارەزووی خۆی وا پیشـانـدا کەوا هێڵی تالفیـك [تـالفیك، وشـەیـەکی ئەڵـەمـانیە لە (ThaL) بە واتای (دۆڵ) و (Weg) بە واتــای (رێگــا) ـ واتــە: ئەو هێڵەی بریتی‌یـە لە قووڵتـرین بەشی ئاوەڕۆگـەی رووبـار]، لە کەنـداوی عەرەبیـدا هێڵی جیـاکردنـەوەی سنـوور بێ لە نێـوان عیراق و ئێران، بەڵام مەلیك فەیسەڵ ئەمەی رەفزکردو ووتی: «کەنداوی عەرەبی ـ رووبار ـ ی عیراقە، نەك رووبارێکی دەوڵەتیی. .».

لەو وەختەی عیراق بە ئەندام لە (عصبة الامم) لە 3ی تەشـرینی یەکـەمی 1932 وەرگیـرا، حکـومەتی ئێران داوا بۆگـەنـەکـەی پێشـووی کردەوە سەبـارەت بە دابـەشکـردنی کەنـداوی عەرەبی . . بـەڵام عیـراق توونـد ئەم داخوازیەی رەفـزکـردو، ئەمـەش بوو بە هۆی تێکچوونی پەیوەندیەکانی نێوانیان. . . هێزی سوپای ئێران ـ بە درێژایی سنوورو لە کەنــداوی عەرەبی‌دا ـ بە کاری دوژمنـانـە هەڵسـایـەوە. . سەرەنـجــام ،عیــراق لە 29ی تشـرینی دووەمی 1934 شکــایــەتی لە (عصبــة الامم) لێکــردو نوسخــەیــەکی شکـایـەتـەکـەشی بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئێـران ناردو تیـایـدا

روون كرايــەوە كەوا هەرچــەنــدە مەســەلـەكـە لە شێـوەى شكايەتنامە دايە ، بەلاَم كار ناكاتە سەر پەيوەندى دۆستايەتى نێوان هەردوو ولاَتى دراوسێ.

(عصبة الامم) لە 14ى كانوونى دووەمى 1935دا لە مۆزەكـەرەكـەى وزارەتى دەرەوەى عيـراق و رەتـدانـەوەى حكـومـەتى ئێـران ـ كۆلێـەوەو چەنـد جار ئەندامانى بۆ ئەم مەبـەسـتـە كۆبـوونـەوەر بێ ئەوەى هيـچ ئەنجـامى ئەوتـۆ وەدەســت بهـێـنــن هەردوو لا پێــى رازىببـن. لە دوا كۆبـوونـەوەدا، نوێنـەرى بەريتـانيا پێشنيارى كرد مەسەلەكە بخـرێتـە بەردەم (دادگـاى عەدلى دەولَـەتان ـ ەوە) نوێنەرى عيـراق رازىبـوونى ولاَتـەكـەى راگەياند، بەلاَم حكومەتى ئێـران رەفـزىكـرد. لە پاشـانە نوێنەرى توركيا وا پێشنيارى كرد كە بە چاودێـرى نوێنـەرێـك لە ـ عصبـة الامم ـ ەوە، هەردوو ولاَت راستەوخۆ لە نێوانياندا وتووێژ بكەن.

هەردوو ولاَت بۆ ئەم مەبـەسـتـە، دوو جار لە (رۆمـا)و (تـاران) راسـتـەو خۆ وتـووێـژ يـان كرد. . . يەكـەمجـار لە (رۆما) لە كۆتايى مانگى كانوونى دووەم و سەرەتاى شوباتى 1935دا بوو، وە دەمراستى ئيتالى سێ پێشنيارى كرد ، ئەمانەن:

(1) ـ مەســەلـەكـە بخـرێتـە بەردەم ـ دادگـاى عەدلى دەولَەتان لە لاهاى.

(2) ـ داوا لە ئەنجومەنى (عصبة الامم) بكرێ لێژنيەك لە سێ كەسـى ياســازان پێــك بهـێنێ يارمـــەتى بدەن بۆ ئامادەكردنى رابۆرتەكەى.

(3) بە زووتــرين كات رێكـەوتننـامـەيـەكى وەختيى بۆ كەنداوى عەرەبى دابنرێ بە گوێرەيەوە ئێران بەشدارى بكا لە بەكارهێنانى كەنداوى عەرەبى.

حكــومـەتى عيـراق لە سەر هەردوو پێشنيـازى يەكـەم و دووەم رازى بوو و پێشنيارى سێيەمى رەفزكرد. ئێرانيش بە پێشنيـارى سێـيـەم قايـل بوو و پێشنيارى يەكەم و دووەميشى رەفز كرد. . . وتووێژەكە تا 25ى ئابى 1935 راگيرا،

(3) دەقـى ماددەى سێيــەمى برۆتــۆكــۆلى پاشكـۆى موعاهەدەى 1937 : «ئەو روخسەتەى لايەك بە كەشتيەكانى جەنگى بێگـانـە دەدات بۆ هاتنـە ناوەوەى بەنـدەرەكان، بە روخسەتدان لە لايەكەى كردوە دەزانرێ».

سەرەراى ئەو دەستكـەوتـانـەن ئێـران لەم موعـاهـەدەيـە دەسـتى كەوت، سالَێ تێنـەئـەپـەرى گەر داواى چەنــد كيلۆمەترێ لە وشكايى يان لە ناوچەى كەنداوى عەرەبيدا نەكــات. . . سەرەراى ئەوەى ،و بە گوێــرەى بەنــدەكـان موعاهەدە نوێيەكەوە، لەو خاكەى عيراق كە زەوتى كردبوو، نەكشـايـەوە. . هەردەم، بە پێى پێـويستـەكـانى رۆژگـارو پاشــەرۆژ و چاوى تەمــاعييـەوە، بەيننابـەين، بارو دۆخى ئەوسـاى عيـراقى بە هەل و دەرفـەت وەردەگرت، زياتر چاو ببرێتە ئاوو خاكى عيراق.

تا بەرپابوونى شۆرشى 14ى تەمووزى 1958، بارودخ بەم جۆرە مايەوە.

لە 25ى ئەيلوولى 1958دا حكـومــەتى ئێــران بەلاَم جارێكى تر لە تاران دەستى پێكـرايـەوە، وە لەوێ ـ واتـە تاران ـ وەفـدى عيـراق چاوى بە رەزا پەهلەوى شاى ئێـران كەوت وەشا داواى لە حكومەتى عيراق كرد يەك يان دوو كيلۆمــەتـر لە پێش (عـەبـادان) لە كەنـداوى عەرەبى و هەر ئاواش لە (محمــرة)دا بۆ ئێــرانى تەنـازل بكـا، سەرەراى ئەوەى كە ئێــران هەر كاتێ دەيــەوێ كەنـداوى عەرەبى بۆ پێويستيەكانى خۆى بە كارى بهێنێ ،قەدەغە نەكرێ!.

وەفدى عيراق لە 25ى ئابى 1935دا گەرايەوە بەغداو داواى شاى ئێران رەفزكرا.

لە 24ى ئايــارى 1936، عيــراق لە سەر پێشنيــازى وتووێژكردنەوە رازىبوو، بەلاَم سەرى نەگرت

لە 29ى تشرينى يەكەمى 1936دا، كە (فەريق بەكر صدقى) بە كودەتــا هەلَســاو وزارەتى (يـاسين الهـاشمى) رووخــا، شاى ئێــران ئەمــەى بە دەرفــەت زانىو داواى لە وەزيرى راوێژكارى ئێران لە بەغدادا كرد لەگەلَ سەرەك وەزيرانى عيراق كۆبێتەوەو ئاگادارى بكات زانىو داواى لە وەزيرى راوێژكارى ئێران لە بەغدادا كرد

لەگەڵ سەرەك وەزیرانی عیراق كۆبێتەوەو ئاگاداری بكات كەو ئێران دەیەوێ كێشەكانی نێوانیان ببڕێتەوە. سەرەك وەزیرانی عیراقیش پێ ووت: «برووسكە بۆ حكومەتەكەت بنێرە، عیراق ئامادەیەو رازی دەبێ بە هەر پێشنیازێ ئێران پێشكەشی دەكات بۆ بڕینەوە ئەم كێشەیە».

وتووێژ دەستی پێكرایەوەو راوێژكاری عیراقی،

- خۆی دایە دەست چاوتێبڕینی تەماعكارانەی ئێران بە بەكارهێنانی «نەزەرییەی تالفیك» لە كەنداوی عەرەبی لە رووبەری چوار میل لە پێش (عەبادان) بەرانبەر بە دانانی ئێران بە برۆتۆكۆلی (تاران - 1913)و برۆتۆكۆل (قسطنطینیة - 1914).

ئێران لە موعاهەدەی 29ی حوزەیرانی 1937دا، ئەم دەسكەوتانەی خوارەوەی دابین كرد.

(1) - راستكردنەوەی هێڵی سنووری عیراق - ئێران لە بەردەم (عەبادان) بە گوێرەی ماددەی دووەمی رێكەوتننامەكەوە.

(2) ماددەی پێنجەم ئەو مافانەی‌دا بە ئێران، كە رێكەوتننامەیەك لە نێوان هەردوو لادا سەبارەت بە كارو باری كەشتیەوانێتی مۆربكرێ ،لەو كاتەی، كە عیراق تەنیا خۆی خاوەن مافە لە. یاسادانان بۆ كاروباری كەشتیەوانێتی.

داوای لە عیراق كرد، هەردوو لا لێژنەیەك پێك بهێنن بۆ چۆنیەتی كارگێری‌و كارو ئەركەكانی كەشتیەوانێی لە كەنداوی عەرەبی‌و كارەكانی هەڵكەنین و كرێی كەشتی‌و پاپۆڕەكان و مایەو قازانج و شتی‌ترو ئەبێ لێژنەكەش مانگی تشرینی دووەم دەست بە كارەكانی بكا، بەڵام عیراق ،لەبەر بارو دۆخی سیاسی‌و ناوخۆی تایبەت بە خۆیەوە، درەنگ وەڵامی داواكەی دایەوە، سەرەنجام ،سەرلەنوێ پەیوەندیەكانی نێدانیان تێكچووەوەو ماوەیەكی نەخایاند ئێران بێ‌پرسكردن عیراق، هەڵ ڕێگەی‌دا بە كۆمپانیای (بان - ئەمریكان) كە - ئەو بەندەرەی‌ئێران لە خسرۆ ئاباد لە كەناری رۆژهەڵاتی كەنداوی عەرەبیدا كرد بوویەوە - وەك بنكەیەكی كارەكانی هەڵكەنین بە كاربهێنێ‌و دایەرەیەكی گومرگ و نووسینگەیەكی تێدا بكاتەوە. كۆمپانیاكە دەستی بەكارەكان كردو یەكەم كەشتی بۆ كەندا بەرەو بەندەرەكە ناردی، بەڵام عیراق رێگای نەداو قەدەغەی كرد بێتە كەنداوو ،لە 9ی حوزەیران 1959دا ئێرانی ئاگاداركردەوە كە ئەم كارەی بە پێچەوانەی گشت رێكەوتننامەكانی سنوورە. ئێران وەڵامی نەدایەوەو چوو رێگای بە پاپۆڕو كەشتیەكانی كۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ - فارسی - شدا كە بە پێی پێویست و هەوەستی خۆیەوە بەندەرەكە بەكاربهێنێ‌و هێزێكی سوپاییشی بۆ پاسكردنی كشتیەكان - بە درێژایی ناوچەكە - دانا.

لە 19ی كانوونی یەكەمی 1959دا، عیراق هەوڵی‌دا كێشەو ئاڵۆزیەكانی سنوور لەگەڵ ئێرانا چارەسەر بكات، بەڵام بێ‌سوود بوو.

لە ساڵی 1961دا عیراق پێشنیاری كرد كێشەكە بخرێتە بەردەم (دادگای عەدلی دەوڵەتان) بەڵام دیسانەوە بێ سوود بوو و مەسەلەكە وەك خۆی ئاڵۆز مایەوە.

لە 25ی حوزەیرانی 1961دا، عیراق رایگەیاند كەوا بە تەنگە مانەوەی پەیوەندی باش و دۆستایەتیە لەگەڵ ئێرانا، بەڵام بە هیچ جۆرێ رێگا بە ئێران نادا بە هەوسی خۆی یاری بە سنوور بكا.

پاش بەرپابوونی شۆڕشی 17 - 30ی تەمووزی ساڵی 1968 لە عیراقدا، دوو دیاردە، پەیوەندی نێوان عیراق و ئێرانی گرتەوە.

لە لایەك، دەوڵەتانی رۆژئاوا ،بە تایبەتی وڵاتە یەكگرتووەكان نەخشەیەكیان بۆ رژێمی شا دانا، كە «دەوری پۆلیس» لە ناوچەكەدا بگێرێ . . .لە لایەكی ترەوە، شۆڕشی عیراق خەریكی چەسپاندی سەربەخۆیی نیشتمانی‌و رەگ داكوتان و بنیاتنانی كۆمەڵێ نوێ بوو.

بەم جۆرە، بۆ رژێمی ئێران روون بووەوە كە ئیتر راستەو خۆ ناتوانێ دەستی تەماعی بۆ عیراق درێژ بكاو داخوازییە بۆگەنەكانی راپەڕێنێ. . . سەرەتا، بە هۆی دام و دەزگای

راگەیاندنەوە، ئەمجا سیاسەتی نەگۆڕاو ،دەست تێخستنی بەردەوام لە کاروباری ناوخۆی عیراق.

بە کورتی، شای ئێران، سنووری بەزاندو ئێشکگەی لە سەر سنوور لە ناو خاکی عیراقدا دامەزراندن و ڕێگای قیرتاوی بۆیان کردەوە. وەبۆ ئەوەی ئەم سنوور بەزینە، بەهێز فەرز بکا، هێزی چەکدارو جۆرەها چەکی تیادانا... لە پاشان، بە پێچەوانەی ڕێکەوتننامەکانەوە، داوای ـ راستکردنەوەدەی ـ سنووری کرد لە کەنداوی عەرەبی، کە عیراقیش ئەمەی ڕەفز کرد ڕژێمی ئێران لە 19ی نیسانی 1969 موعاهەدەی 1937ی هەڵوەشاندەوە بە بیانووی تیووری «گۆڕینی بارودۆخ» بەوەی ئێران کە ئەم موعاهەدەیەی مۆر ـ کردووە، دەوڵەتێکی بێ‌هێزو لاواز بووەو، بە کارتێکردنی بەریتانیا ـ گوایە لای عیراقی گرتووە ـ ،بە (دیاری)ی داوەتە عیراق.[5]

وازی لە عیراق و شۆڕشە تازەپێگەیشتووەکەی نەهێنا... گەف و هەڕەشەی نەبڕایەوە ...دەستی لە دوژمنایەتی‌کردنی عیراق و کاروباری ناوخۆی عیراقەوە هەڵنەگرت... هەردەم هەوڵی ئەوەی دەدا بزووتنەوەی عیراق سنووردارو تەنگەبەر بێ‌و نەتوانێ روو لە گۆڕەپانی نەتەوایەتی‌و بە جێگەیاندنی ئامانجە مەرکەزی‌یەکەی ـ رزگارکردنی فەلەستین ـ بکا.

شای دڵ پڕ لە رق و کینە، بە هاوکاری‌کردن لەگەڵ دایەرەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنی، لە پیلانگێران دژی عیراق نەوەستا... هەڵوێست و شێوازی تەماعکارو ناپاکانەی ئەوتۆی بە کاردەهێنا، بە پێی پێکران و زەفەربردن و دەرفەت، لە شۆڕشی میللەت عیراق بدات و زیان بە سەربەخۆیی نیشتمانی‌و مافەرەواکانی نیشتمانی‌و نەتەوەیی بگەیەنێ.

بارودۆخ بەمجۆرە مایەوە تا مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی جەزایر لە 6ی ئازاری 1975.

ئەم ڕێکەوتننامەیە، کە لە ژێر بارودۆخێکی سیاسی‌و عەسکەری‌و نەتەوەیی تایبەت دا مۆرکرا، پێویست بە مۆرکردنی هەبوو ... سەرکەوتنێکی باش بوو بۆ پاراستنی ئاسایش و بەردەوام بوونی ڕێبازی شۆڕش و چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ دەوروبەردا بێ ئەوەی زیانی ستراتیجی پێ بگەیەندرێ.

سەرۆکی بەڕێز صدام حسین، دەربارەی ئەم ڕێکەوتننامەیە دەفەرموێ: «ڕێکەوتننامەی ئازار کچی بارودۆخەکەی بوو... گەلگەمان باش تێ‌گەیشت... وە ـ لە چوارچێوەی بارودۆخەکەدا ـ بە سەرکەوتنێکی مەزنی داناو بە گەرمیەوە پێشوازی لێکرد، چونکە هەستی بە مەبەستەکەی کرد سەربارەت بە یەکیەتی نیشتمان و پاشە ڕۆژی ولات..».

دوای ڕێکەوتننامەکە، بۆ راپەڕاندنی ناوەرۆك و بەندەکانی، ووتووێژی زۆرکرا... بە تایبەتی دەربارەی سنوورو دینگەدانان. ئەوە بوو هەرسێ برۆتۆکۆلەمانی:

دیارکردنی سنووری ئاوی، نەخشەکێشانەوەی سنووری ووشکایی‌و ئاسایشی سەرسنوور مۆرکران.([illegible])

بە نسبەت راپەڕاندنی ناوەرۆکی برۆتۆکۆلی سنووری ووشکایی، پێویستی بە وەخت دەکرد، ئەمەش کارێکی ئاسایی بوو، پاشان وەلەبەر ڕووداوەکانی ناوخۆی ئێران لە سالانی (1978) و (1979)، کارەکانی ڕەسمی گەڕاندنەوەی خاك دواکەوت.

لە 11ی شوباتی 1979دا شا گۆڕ بە گۆڕ چوو... ڕژێمی نوێ ـ ڕژێمی خومەینی ـ جلەوی دەسەلاتی گرتە دەست.

بۆ بەرژەوەندی ئێران وا بوو، ڕژێم بەرگی رق و کینەی ڕەگەزپەرستی فڕێ بدات و بنسیاتنانی پەیوەندی دۆستانە، بە تایبەتی لەگەڵ ولاتانی دراوسێ، کۆشش بکا. بەلام خومەینی لە جیاتی ئەوە، بە پێداچوونەوەی زنجیرەی رق و کینەی تەماعکارانە دژی نەتەوەی عەرەب و عیراق بە تایبەتی هەڵسا ... بەردەوام بوو لە داگیرکردنی خاکی عیراق کە ئێران ـ بە پێچەوانەی ڕێکەوتننامەکانی سنوور ـ دەستی بە سەراگرتبوو، بە تایبەتی لە (زین القوس) و

(سيف سعد)دا... هەر ئاواش بە نيسبەت هەرسێ دوورگەى (طنب الكبرى والصغرى و ابو موسى)... سەرەراى دەست دانە سياسەتى رەگەزپەرستى و شۆڤينى دژ بە برا عەرەبەكانى ئەهواز (كە ئێران لە 20ى نيسانى 1925 دەستى بە سەرا گرتبوو).

سەرۆكى بەرێز صدام حسين لەع بيرەوەرى دوازدەمين بەرپابوونى شۆرشى 17 ـ 30ى تەمووزەوە، دەربارەى پەيوەنديەكانى نێوان عيراق و ئێران ، پاش گۆرانكاريية نوێيەكانى ناوەوەى ئێران ، فەرمووى: «هەر لە سەرتاوە، هەلوێستێكى ئيجابى و هاوسەنگمان بەرانبەر بە رووداوەكانى ئێران گرتە بەر... پيرۆزبابيمان لە گەلانى ئێران و خواستەكانيان كرد... بە هەلويستى ئاشكراو راگەياندراووە لە ميان وتوووێژى راستەوخۆ لەگەلّ لێپرساوانى رژێم و، لە ژێر رۆشناى و تێروانينى پەيوەندى مێژوويى هاوبەش لە نێوان گەلانى موسلمان و لە سەر بنچينەى رێزلێك گرتن و دەست نەخستن لە كاروبارى ناوخۆوە، دووپاتمان كردەوە كەوا عيراق بە تەنگ پەيوەندى باش و دۆستانەو دراوسێيەتيە لەگەلّ ئێرانا...

بەلام لێپرساوانى رژێم رووبان لەم هەلوێستە دلسۆزو راستگۆيە نەكردو بە شێوازى رەگەزپەرستى و هەلوێستى دوژمنانە وەلاميان دايەوە... نيەتى دوژمنايەتى كردنى نەتەوەى عەرەب و بزووتنەوە شۆرشگێريە خەباتگێرەكەى راگەياند، دووپاتى كردەوە كە چاوى لە خاكى عەرەبى و سياسەتى فراوان بوون لە سەر حيسابى ناوچەنى كەنداوى عەرەبى دايە... ئەم هەلويستانە كە سەرچاوەى رەگەزپەرستى و رق و كينەو دواكەوتووبين، كارەساتى بۆ ئێران هێنا».

**خومەينى و... پيلانەگەورەكە:ـ**

لە سەرەتادا، باسمان كرد كەوا لە چاخى داريوشەوە بگرە تا شا عەباسى بزورگ و تا چاخى قاچارەكان و چاخى نادر شاو جا حەمەرەزا شاو دواجار خومەينى، عەجەمە رەگەزپەرستەكان ويستوويانەو ئەيانەوێ گەلانى دراوسێيان بخەنە ژێر ركێفى خۆيانەوە... بۆ ئەم مەبەستەش هەزاران ئاژاوەو ئاشوب و شەرو پيلان و هەرەشەو... هتد.

بوون بە شملى شەرى ميللەتان و پاشەرۆژى ئەو ميللەتانەيان گرتووە.

كاتێ كە رژێمى زيولّ زيوالّ بوونى حەمە رەزاى شاى تاوانكارو نەفرەت لێكراو روخاو رژێمى خومەينى جێى گرتەوە، عيراق ئێمە بە گەل و حزب و شۆرش و سەركردەكەيەوەو ئەم مەيەلەيەى وەك مەسەلەيەكى ناوەخۆوو سەر ئێرانى دايە قەلەم و پر بە دلّيش نيازخوازى خۆێشى دەربرى، كە حوكمگێرە تازەكانى تاران و توم لە واقيى هەرەتازەى ئەم عيراقەى ئێمە تێبگەن و لاپەرەيەكى تازەو پاك لە پەيوەنديى دۆستايەتى نێوان ئێمەو خۆيان بكەنەوەو گۆشتەزون بەزامەكان بێنن و كۆنە وێنە رەشەكەى رژێمە چەپەلەكەى حەمەرەزا بسرنەوەو روو بكەنە هەوارێكى خاوێنى هاوسێيەتى و دۆستايەتى و برگەو بە ندەكانى رێكەوتنەكەى جەزاير جێبەجێ بكەن و تا بە خەباتى هاوكۆى گەلى عيراق و گەلانى ئێران لە دژى ئيمپراياليزم و زايۆنيزما بدەن.

عيراق زۆر بە ئارامەوە هەولى بێ‌پايانى‌دا تا ئەو حوكمگێرە سەيرانە بخاتە سەر رايتە شەقامى مێژووى مرۆڤايەتى، كەچى هەموو هەولە پاكەكانى بێ هودەو مايە پووچ و بێ ئەنجام بوو و دەرچوو سى و سێ بنەك هەر ئەمە بگرە بەلكو ئەو حوكمگێرە ملهورانە هەر لە يەكەم مانگى روخاندنى كۆنە رژێمى شاوە، دەستيان بە هەرەشەكردو ئاگرى دووبەرەكى‌يان خۆش كردەوەو كۆنە برينەكانيان خستە سوێ و دەزگا راگەياندنەكانى خومەينى، دەستيان كرد بە جوێندان و بە پروپاگەندەى ناغرەواو بە بوختان و بە درۆ مليان بە شالاو هێنانەوە تا بۆ سەر عيراق... بۆ سەر حزب و شۆرش و بۆ سەر شۆرەسوارانى ئەو شۆرشە.

لە جياتى ئەوەى بێن و چارەسەرى زانستانەو پلانى

ووردکارانە بۆ ئەو گیروگرفتە ئاڵۆزانە بدۆزنەوە، لە جیاتی ئەوە، ئەو رژێمە تازە بابەتە رۆژ دوای رۆژ مل هورتر و بەدکارتر ئەبوون و روویان لە ئازاردانی گەلی عیراق و شۆرشی عیراق کرد. . . دەستیان بۆ سەر خاکی پیرۆزی عیراق درێژکردو لە چواری ئەیلوولی 1980 شارو دێهات و ئێشکگەکانی عیراقی دایە بەر ئاگری تۆپ و. . . جەنگی مسەپاند.

عیراق هەر بەرگەی گرت و رێگەی پشوو درێژی گرتە بەرو گەلێ یادداشتنامەی نارەزایی بۆ حکومەتی تاران رەوانە کرد تا دەست لەو کارە نارەوایانە هەڵگەیێت و واز لە پەڵپ گرتن بێنێ و یاری بە ئاگر نەکات. . .

ئەمیش هەر بێ سوود بوو. . کاری دوژمنایەتی و دەستدرێژی چەپەڵی تاران دەهات فراوانتر دەبوو. . تا بە جارێ کاسەی عیراق پربوو. . کار لە کار توازاو بە چاری ناچاری، عیراقی شۆرش لە 22ی ئەیلول، بە بڕوایەکی پۆلایین و بە مەچەکێکی ئاسنینەوە بەرپەچی ئەو دەستدرێژیانەی مێزەر بە سەرانی قوم و تارانی دایەوەو بەرەنگاری چەتەکانی هات و هەندێ لەو خاکانەی کە بە ناهەق داگیرکرابوون رزگارکردو کەلێ شوێنی تریشی لە نێو قوولایی خاکی فارس و لە پێناوی خۆپاراستن و بەرگری لە خۆکردنا خستە ژێر دەست و دیۆ جامانەی ئەو سیناریۆیەی کە ئەهریمەن و بەچکە ئەهریمەنەکانی قوم و تاران دایانابوو، بۆ خۆیان بوو بە مایەی بەڵاو کارەسات. . .

بە مایەی شڵەژان و تۆقاندن و شێتگیربوون. .

وەهەر لە هەمان کات دا سەرکردایەتی پارت و شۆرش، هێزەکانی سوپایی کێشایەوە سەر سنوور بۆ ئەوەی بۆیان دووپات ببێتەوە کەوا عیراق چاوی لە خاکی ئێران نیەو. . بەڵکو کەللەرەقەکان بۆ ئەقڵ و هۆش و مەنتق بگەرێنەوەو دەست لەم دەستدرێژیە هەڵگرن. بەڵام بێسوود بوو. . . بە مەیش عیراقی شۆرشگێر قادسیەی دووەی بەرپاکردو لە قادسیەی صدام گەورەترین دەسکەوتی مێژوویی وەدەست هێناو بوو بە سەرشارێکی تازە لە رەوتی بزووتنەوەی شۆرشی گەلی بە جەرگی عیراق و سەرجەمی نەتەوەی عەرەب و رووبەرووی نالەبارترین و کینەدارترین دوژمنێکی خوێنخۆرو رەگەزپەرست بووەوە. . . ئەوەیشی بۆ دنیا ئاشکرا کرد کە جەنگاوەری عیراقی بە چی گیان و ورەیەکەوە، بە چی بەخشش و لە خۆبووردنێکەوە روو ئەکاتە شەرو لە مەرگ و شەهیدبوونی پر لە سەرفرازی سڵ ناکاتەوە.

هەر لێرەدا، ئەوەی بە وردی لە هەموو لایەنێکی ئەم جەنگەو هۆیە مێژوویەکانی ئەم جەنگەو بە درێژایی پێنج ساڵی رابردوو وردبێتەوەو بە وردیش لە کارە عەسکەریەکانی هێزە چەکدارە دلێرەکانی بەرەی جەنگ رابمێنێ، ئەگاتە گەلێ راستی و گەلێ ئەنجامی ئاشکراو دیاریکراوەوە.

داستانی قادسیەی صدام و لە ئەنجامی روو بە رووبوون ـ بە درێژایی هەزار کیلۆمەتری سنوور ـ بەڵگەی ئەوەی دا بە دەستەوە کە هێزی عیراقی نوێ، خاوەن توانایەکی بێبن و یەکجار بەرزەو لە جەنگیشا لە پێشی هەرەپێشەوەی سەرانسەری سوپاکانی رۆژهەلاتی ناوەراستەوە ئەوەستێت. . . هەر ئەو داستان و روو بە رووبوونەش بوەو ئەبێتە مایەی یەکالاکردنی هێزو توانای جەنگاورەکانمان و ئەوەیش دووپات کردەوە کە بە هیچ کلۆجێ ئۆردوی عەجەم ناتوانێ جێ بە سوپای تێکۆشەری عیراق لێژ بکات . . چونکە سەرەرای ئەوەی، ئەم شەرەی عیراق شەرێکی عادیلانەو رزگاربخوازانەیە، لە هەمان کاتیشا گەلێ هۆی سیاسی و مێژوویی بوّتە سەرچاوەی سەرکەوتنە پەیدەیەکانی یوپاکەمان لە گشت کەرت و بەرەکانی جەنگدا. لەوانەیش:

راستە رێگەی تایبەتی عیراق و سوپاکەی کە بەندە بە فیکری پارتەوە ،بە بەرنامە مەزنەکانی ئەو حزبەوە لە پێناوی گۆرانکاریەکی شۆرشگێرانەی بنەرەتانەی شارستانێتی لە عیراقدا، سەرەرای ئەو دەورە دیارەی سەرکردەی لێهاتوو

ـەھێ صدام حسین لە عیراقا ئەیگێرێت و بە زیرەکیو بە
ـتویی و بێ کۆڵنەدان، هەوڵی بنیاتنانی ژیانێکی نوێی
ـو عیراقێکی نوێو لە هەموو بوارێکی سیاسیو ئابووریو
ـیـری و کۆمەڵایەتیو سوپاییدا ، ئەدات.

ـ بۆ ئەمۆشدا، لە لایەك وا پێمان نایە ساڵی شەشەمی
ـەنگ و جەنگـاوەرە دلێـرەکـانـی عیـراق، جلەوی
ـیـنـکـەری لە کۆڕو بەرەکـانی جەنگـا گرتۆتە دەست و
ـەرخێشن نە بزووتنـەوەی سیـاسیانەو دیبلۆماسیانەی خۆیدا
ـۆ ئەوی رۆژ پێش ئەکەوێت و گەلەکەشمان سات دوای
ـات فـیـری مەشتکـردن ن هەڵگـرتنی دلێـرانـەی باری
ـەرخـستـن و بەرگـەگـرتنی درتـر ئەبیو تا دێ ورەی بەرزتـر
ـتـمیو نە خۆلـوردووتـر ئەبێ. . . لە لایەکی ترەوە گەلی
ـەرسووتاو و تێکۆشەری کوردی کوردستانی ئێران، گەلی
ـەحـستەن و عەرەبستان و ئازربایجان تاو بە خەباتی خۆیان
ـحـەو و داوای ماخی رەوای نەتـەوایـەتیو مرۆڤانەی خۆیان
ـەکـەن و رووبەرووی بەیت و باڵۆرەی کۆنەبازی (کۆماری
ـەری ئیـسـلامی !!!)ی خومـەینیو تاقمـە نەفـامـەکـەی
ـەمـیو خوێنی پاکی خۆیان لەم پێناوەدا ئەبەخشن.

جەنگی رەوای گەلی عیـراقیش چرکـە دوای چرکـە بە
ـیـەتی کار لە رێـرەوی گشتی بەربـەرەکـانێ سیـاسی نێـو
ـێـران و سەنگـەلای ئەکـات. . . بەڵێ لە پاڵ ئەمـانـەشدا
هێـشت عیـراقی سەربـەرزو سەرفـراز، بە زمـانی سەرمـردە
ـێـرەکـەی صدام حسین ـ ەوە بەردەوام داوای وەستـاندنی
خوێن و شەڕ ئەکـات و جاری چارەســەری ئاشتیخـوازانـە
ئەدات و بە مەبەستێکی پاك و بە دڵێکی سافەوە پێشوازی لە
هەمو «مەبەستە پاکەکان»ی نێو دەوڵەتانی کردووەو ئەکات،
بە شێوەیێ ئەو چارەسەرە زیان بە بەرژەوەندیو مافەرەواکانی
عیـراق لە خاك و ئاودا نەگـەیـەنـێ. . چارەسـەرێـکـی
بنەرەتیانەی وا بێت کە بەند بێ بە گیانی عەدالەت و مافە
مێـژوویی و سیـاسییـەکـانمـانـەوە. . کەچی حوکمگێـر
سەرشێتـەکـانی تاران و ئاخـونـدەکـانی قوم، هەر لە سەر
رێبازی ملهورانەی شەڕفرۆشتن دا بەردەوامن و گوێ بۆ هیچ
جۆرە دەنگێکی خێـرخـوازانە راناگرن و بەرژەوەندی گەلانی
ئێـرانیـان پێشێـل کردووەو لە نیـوخەونی ئاشـوبا شاقنەو تلۆر
ئەبنـەوەو نایـانـەوێ ئەم ناوچەیە نەختێ داکاسێو رووبکاتە
بنیاتنان و پاشەڕۆژێکی رووناکەوە.

هەر بۆیەشە، سەرکردەو پاڵەوانی لێهاتوو صدام حسین،
لە ئەنجامی ئەو کەللەرەقیو ئەو شەڕفـرۆشتنـەوە بە زاتێکی
مەوزوعیانەوە بڵێ: «ئەگەر فارسی دوژمن ئەیەوێ درێژە بە
جەنـگ بدات، با درێـژەی پێ بدات تا ئەو رۆژە دێ
تەواوی مافە رەواکانمانی لێ ئەستینین. . .».

چونکـە گەلی نەبـەزی عیـراق و سوپـای دلێـری عیراق
هەمیشەو بەردەوام لە ئەو پەڕی ئامادەبوون دایە بۆ گەرمتر
چوونە نیو ئاتۆنی جەنگ و درێژەدان بەو جەنگەو لە پاڵیشیا
بەرگریکردن لە کەرامەت و دەسەڵاتدارێتی خۆی لە خاکی
عیراقا تا ئەو رۆژە دێ یا حوکمگێڕو ئاخوندەکانی رژێم بە
شێوە قانونیانەو ئاشکرا دان بە مافە رەواکانی عیراق بنێن و
واز لە شالاوی رەگـەزپـەرستـانـەی خۆیان بێنن و دەست لە
کاروبـاری ناوخـۆی عیـراق وەرنـەدەن و رێـز لە دەستـوورو
عورفی نێو دەوڵەتان ـ بۆ ئەم مەبەستە ـ بگرن. . . یا هەر
بە جارێ ئەم جەنگە ـ بێگومانیش هەروایە ـ ئەبێتە مایەی
روخـانـدنی دەستـەو دایـەرە چەتـەکـانی خومـەینیو رژێمە
گێڵەکـەی، کە بەمـەیش، بێگـومـان بنچینـەی ئاسـایش و
دۆستـایـەتیـەکی راستـەقینەو پەیوەندیەکی پاکی مرۆڤانە لەم
ناوچـە گرگـرتـووەدا دائـەمـەزرێو گەلانی ناوچـەکـەش،
نەخوازەڵلا گەلانی ئێران دوارۆژ و ژیانی ئاسودەیان دابین
ئەبێت.[6]

یەکیەتی نیشتمانیو. . . گرەوکردن!!

رژێمی خومـەینیو هاوپـەیمـانـانی گرەویـان لە سەر
عیراقیەکان دەکرد. . زۆریان ووت. . دەیان وت: خۆیان
ناگـرن!!. . لە شەڕدا بەرگـەناگرن!!. . دوودڵیو رارایان
بەرامبـەر سوپـاو جەنگـاوەرە نەبـەردەکـانی عیـراق بڵاو
دەکـردەوە. . . دەیـان وت شۆڕشی عیـراق، لە بزووتنەوەی
خۆبـووژانـدنـەوەیـدا دەوام ناکـات و ناتوانێ جەنگ بەڕێوە

بەرێ!!... ئەمەش کارەساتی بۆ ئێران هێنا. عیراقی یەکان ئیرادەو عەزمێکی پتەوو هێزێکی یەکگرتوون... بە.. قادسیەی صدام، عیراقییەتی تێکرا کوردو عەرەب و برا کەمایەتیەکانی لە نایابترین شێوەی وەفاو تێکەڵی لەگەڵ خاکی نیشتماندا پێشان داو، جوانترین پەیوەندی ئەم گەلەی لەگەڵ شۆڕشەکەیدا دەرخست.

کورد لە قادسیەی صدام دا وەك عیراقی هاوبەشی جەنگی کردووەو دەکات.. باش دەزانێ کە لەم شەڕەیدا لە پێناوی سەربەرزیی نیشتمانیدا خەبات دەکات و.. لە پێناو شتێکی هەرە بەرزو بە نرخ و پایەبەرزدا، بەو پەڕی فیداکارییەوە دەجەنگێت.. ئەو شتە بەرزە خۆشەویستە کە لە ناخی دەروونیدا دەژیت و ڕەگی داکوتاوە، عیراقی نیشتمانیەتی.

ئەم هەستە نیشتمانی یە دەربڕینێکی ڕاست و زیندووە لە قووڵی و مزاوانی و بەهێزیی ئەو پەیوەندیە گیانی یەی کە عیراقی یەکان لە چوارچیوەی یەك نیشتماندا بە یەکەوە دەبەستێتەوە، بێ ئەوەی هیچ تایبەتیەك کار بکاتە سەر ئەم پەیوەندیو یەکیەتی گیانی بە گیانی یە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەو تایبەتیە نەتەوەییەی لە کۆمەڵگای عیراقی نوێدایە، کارێکی کاریگەر دەکاتە سەر بەیەکەوە بەستن و پەیوەندی عیراقی یەکان و وێنەیەکی نموونەیی یەکیەتیی نیشتمانی ڕەنگ دادەڕێژێت.

نواندنی داستانی پاڵەوانێتیی سەربازانی سەدەی بیستەم و ڕێبازی سەرکەوتنی بەردەوامی نەبەردەکانیشمان، بە درێژایی جەنگ ئەم ڕاستیەی سەلماندو دووپاتی کردووە، وەهەر لە یەکەم ڕۆژی جەنگەوە، کە یەکیەتی پتەوە بەهێزی عیراقی یەکان، گرەوکاریی کاربەدەستە

عیراقی یەکان، گرەوکاریی کاربەدەستە چاوچنۆکەکانی ئێران و لێکدانەوەی هاوپەیمانانی ڕژێمی بە موعادەلەیەکی وەرگەڕاوو سەرەوژێر دەرخست.[7]

هەر لە یەکەم ڕۆژی جەنگەوە، پاڵەوانە خوێن گەرمەکانی حزب و شۆڕش ،ئەو ڕاستیەیان دووپات کردەوە کەوا میللەتی خەبانگێڕی عێراق، بە کوردو عەرەب و برا کەمایەتیەکانەوە، بە ڕابەری سەرکردەی لێهاتووی کۆڵنەدەر، سەرەك صدام حسین، ڕۆڵەی ڕۆژانی تەنگانەن و دەزانن چۆن دەجەنگێن و چۆن خەون و پیلانەکانی دوژمنان هەڵدەوەشێننەوەو چۆن بەرگری لە سەربەستیو سەربەزیی خاکی پیرۆزی ئەم نیشتمانە ئازیزە دەکەن و . . هەمیشەو شێرانە خوێنی پاکی خۆیان لە کاروانی مان و نەماندا دەڕێژن و.. مل کەچ نەبوونەو قەتیش مل کەچی قبوڵ ناکەن و.. هەردەم بۆ پێشەوە دەڕۆن و هەرگیز پاشگەزیو گەڕانەوەیان بۆ نیە.

لە میان زیاتر لە پێنج ساڵی جەنگی ڕاستەقینەمانەوە لەگەڵ ڕژێمی کۆنەپەرستی ئێران، حاڵەتی عیراقی بەرچاوو تاك و دیار بوو لە پاراستنی خاك و ئاوی وڵات... ئەمەشی لە چەندەها هەڵوێستدا دەربڕی بۆ ئەوەی حاڵەتی مرۆڤی نوێو بنیاتنانی کەسایەتی نوێی عیراق دووپات بکاتەوەو لەگەڵ سەرجەمی ئەو گۆڕانکاری یە بنەڕەتیانە کە وڵاتەکەمان لە چەشنەها بواردا بە خۆیەوە بینیووە، یەك دەگرێتەوە.

حاڵەت و باری نوێش، کە لەم ڕووەوە دەتوانین دەستنیشانی بکەین، حاڵەت و کێشەو زۆرانبازیە لە نێوان ژیان و مردن لە پێناو پیرۆزیی نیشتمان و قوربانیدان لە پێناو پاراستنی خاك و ئاوو هاوڵاتیانی نیشتمان. . . .ئەمە، بە شێوەیەکی گومان لێ نەکراو، ڕادەی پتەوی بەستنەوەی مرۆڤی عیراقی بە خاکەکەیەوە دووپات دەکاتەوەو دەیسەلمێنێت.

بێگومان، حاڵەتی نوێش «یان ژیان یا مردن» حاڵەتی هەرە بەزی نیشتمانپەروەریەو، هەتا هەتایەش، مێژوو لە بەرپەڕەکانی پارێزراوی خۆیدا، بە دێرین و نەمریی یەوە هەڵی دەگرێت.

لەگەڵ ئەم حاڵەتە نوێیەشدا، جەنگاوەرە خوێن گەرمە نەبەردەکانی عیراق، سەخرەڕای ڕشتبوون و مەعنەویاتی بەرزو توانای لە بن نەهاتوویان، ڕۆژ دوای ڕۆژ، پێشبڕکێی قوربانیدان و بەخشینی خوێنی گەشیان دەکەن بۆ بە

جێگەیاندنی بیروباوەڕی «شەڕ لە پێناو ئاشتی»دا لە ڕێگای نە ناویـردنی زۆربـەی زۆری بەکـرێگیراو و ڕەگەزپەرستانی ڕژێم و تێکشکاندنی هێزی سوپایی دوژمن، داستانەکانی ڕۆژهـەلاتی بەسرەو میسـان و داستـانـەکانی سیف سەعدو خەفـاجیـەو مەنـدەلی و حاجی ئۆمـەران و داستانە مەزنەکەی ڕۆژهەلاتی دیجلەو داستانەکانی تر، بەلگەی مێژوویین.

هاوکارانی خومەینی و. . . ڕووڕەشانی مێژوو:

خواستـە بوگـەنـەکـانی یەکگـرتنـەوەی هەرچوار ڕژێمی خومەینی ـ قەزافی ـ ئەسەردو قەوارەی زایۆنی دوژمن، لای جیهان و رای گشتی و گشت هاولاتییکی عەرەب و غەیری عەرەب، ئاشکراو روونە. . . پێویست بە دوویات کردنەوە ناکـات. بەلام لێـرەدا پەنجـە بۆ تەنیـا چەنـد لایەنی سەیر درێژ دەکەین:

لایەنی یەکەم:

ڕژێـمـی ـ حافـظ اسـد ـ ی تاوانـبـارو دەسـتـە خوێن مژەکـەی، لاوازو بەرەو نەمـان دەڕۆن. . . مانـەوەی ڕژێم بە پەرستنی ئیمپـریـالیـزم و زایـۆنی و بە جێگـەیاندنی پیـلانـەکـانیـانـە . . . هـەلبـەتـە بەرژەوەنـدی ئیمپرایالیزم و دوژمـنـانی نەتـەوەی عەرەبیش لە ناوچـەی ڕۆژهـەلاتی ناوەڕاسـت و کەنـداوی عەرەب، تا ڕادەیـەك، بە هۆی ڕژێمی تاران مسـۆگـەر دەکـرێ و دەپـارێـزرێ. . چونکـە ڕاپەڕێنەری پیلانەکاتە.

دەستـەی ڕژێمی دیمـەشقیش، کارکـەری دلسـۆزی ڕاپـەڕانـدنی پیـلانـەکـانی ئیمپـریـالیـزم و زایـۆنیـزمـە لە ناوچـەکـەدا. . . بەم جۆرە پەیـوەنـدییکی پتەو لە نێوانیاندا پەیـدا دەبـێ و . . . سـەرۆکـی ڕژێـمی دیمـەشقیش، بۆ بەرژەوەندە خۆی و تەنیا مانەوەی لە کورسی یە کارتۆنییەکەی حوکمدا ـ ئەوەی لایانە، سەبارەت بە یارمەتیدانی ڕژێمی تاران بۆی برسترێ، ئەبێ دلسۆزانە، بێ دەنگ ڕاپـەڕتینێت!! . . وە بریـاری قەدەغـەکردنی تێپەڕبوونی نەوتی عیـراق بە خاکـی سوریـاداو دانی ورەهـا چەك و جوبەخانەو شارەزای سوپایی بە خومەینی، نزیکترین بەلگەن.

لایەنی دووەم:

دۆستـایـەتی و هاوکـاری نێـوان زایـۆنی دوژمن و ڕژێمو خومـەینی، ئاشکـراو بەهێـزو پتـەوە. . لە لێـدانی دەزگـای ئەتۆمی عیراقی بگرە تا دەگاتە کردنەوەی پردێکی ئاسمانی لە نێـوان تل أبـیـب و تاران بۆ ناردنـی جۆرەهـا چەك و جوبـەخـانـە بۆ ڕژێمی خومـەینی. . . ئەمـەیـان با بلێین هیچ!! . . لەوە سەیرتر ورتەکەی خومەینی ـ یە: خومەینی دەیـەوێ ـ بەهـۆی زایـۆنیـزمـەکان ـ ، ـ بە ڕێگای ڕژێمی (حـافـظ أسـد)ەوە ـ ، خـاکی داگیـرکـراوی فەلـەستین لە ژێـردەستی ـ جوولـەکـەکـان ـ ڕزگـار بکـات!!! . . سەربەخۆیی لوبنان بپارێزتی!!! . . .

بێگـومـان : «بـە گوێرەی خەون و پیلانە بوگەنەکانیان»، ڕزگـارکـردنی خاکی فەلـەستینیش، بە هۆی یەکگـرتنی هەرچـوار ڕژێمی ڕەگـەزپـەرست و نەفـام، پێـویست بە «بێ هێزبوون»ی عیراقی شۆڕش دەکات!!! . . .

وەبـە پێی ڕێکـەوتننـامـەی خەیالپلاوی خۆیانەوە، (بۆ ڕزگـارکـردنی خاکی فەلـەس تین)، ئەبێ ئێرانی خومەینی عیراق داگیربکات و زایۆنی دوژمنیش، نیوەی خاکی سوریا بخـاتـە ژێـردەستییـەوە، بۆ ئەوەی تەنیـا ـ حافـظ أسد ـ لە (سەرۆکایەتی) نەکەوێ!!!.

لایەنی سێیەم:

ئەوەی سەیرە لەم لایەنە ئەوەیە:

وا دیارە زایۆنیزم بە تەنگە کوردەوەیە!! . . دەیەوێ لە ـ تل أبیب ـ ەوە، بانگی ئۆتۆنۆمی ـ ڕاستەقینە ـ بۆ کورد ڕابهێلێت!!!.

ـ ڕژێـمی خومـەیـنی ـ یش، ئەوەی بۆی دانـرابـوو ڕاپـەڕانـدو بەردەوامـە. . . دەرکـردن و لە سێـدارەدانی ئافرەت و گەنـج و پیری کوردستانی ئێران. . . لێدانیان بە تۆپ و ناپالم و فڕۆکەو ئاگری سووتێنەر. . . چونکە داوای ماف دەکـەن!! . . داوای خود موختـاری دەکـەن. . چۆن خومەینی «مافە ڕەواکان» لە کیسی خۆی بۆ کورد سەرف

بکا؟!!.

ـ أسد ـ یش، لەو کاتەی عیراقی شۆرش ،ئۆتۆنۆمی بە گەلی کوردمانیدا، رابگەیانـد کەوا (عیـراق ناوچەیەکی گرینگی خاکی عەرەبی پیشکەش بە غەیری عەرەب کرد)!!!...

ئەمرۆکـە ـ أسـد ـ ی تاوانبـارو رووڕەش دەیـەوێ، لە قوژبنێکی کۆشکی کۆماریدا، بانگی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد رابهێڵێت؟!!!.

لایەنی چوارەم:

خومـەیـنـی و قەزافـیش لە سەر یەك تاکـە رێگـادا یەك دەگرنەوە.. باشەی ئەی قەزافی ـ ی دایکە جوو نەبوو وتی حەدیسـەکانی پێغـەمبەر (د.خ) درۆن؟ چۆزن وتی (سوننەی نبوی) بوونی نیە؟ بۆچی مێژووی کۆچی لابرد؟

دوای ئەم لێداوانەی قەزافی بە چەند مانگێ، خومەینی جادووکـەر وەڵامی دایـەوە وتی: «پـەیـامی پێغـەمبەر تەواو نیەو... یەکێك پەیدا دەبێ ئەو پایەمە تەواوبکات»... وە خومـەیـنـی هەروەك قەزافـی

مێـژووی کۆچی لابـردو، هەروەك شا، تەنیـا پشتی بە مێژووی کۆنی فارسی دەبەستێ.

هەر چونێـك بێ، قادسیـەی صدام دەرسێـك بوو بۆ بێژینگ کردنی دەسەلاتدارانی عەرەب.. رووڕەشی وەك ـ أسدو قەزافی ـ و تاوانی گەورەیان دژ بە عیراق و نەتەوەو ویجـدانیـان، لە بەرپـەرەکـانی مێـژوودا لە چاپ درا... دادگاشیان ماوە.(8)

**کوردستانی ئێران قەڵایەکی سەختە دژ بە رژێم:ـ**

گەلی کورد لە ئێران وەکو گەلاندی تری ئێران بە دەستی خێـزانی پەهلەوییـەوە تووشی ستەمکاریو زۆرداری هات و هەزاران لاوی لە پێناو سەربەستیدا بەخشیوە. شەهیدی نەمر قازی محـەمـەدمـان لە بیـر ناچێ کە دامەزرێنەری کۆماری کوردی مەهـابـاد بوو لەگـەڵ هاورێکـانیـدا کە لە مەیـدانی چوارچـرا لە شاری مەهـابـادی تێکـۆشـەر، سەرکەوتنە سەر سێدارەو بۆ دوژمنانی میللەتی کورد ملیان کەچ نەکرد، دوای ئەوەی رەزا شا کۆمـاری نویـێ کوردستـانی، بە پشتیـوانی ئیمپـرایـالیزمی ئاغایو زایۆنی زربرایەوە، ناو برد ... بـەڵام ئایـا گەلی کوردی ئێـران بۆ وەرگـرتنی مافـە رەواکـانی خۆی بۆ سەربـەستیو ئازادی واز لە تێکـۆشـان هێنا؟.. وەم، دیارە نەخێر.. نەخێر گەلی دلێری کورد لە کوردستانی ئێران هیچ کاتێ دەستی لە تێکۆشان و شۆرش بەرپـاکـردن هەڵنـەگـرتـووە لە پێنـاو رزگـاریو سەربەستیو خواستە رواکانیدا.(10)

کاتێ گەلانی ئێران لە ساڵی 1978دا دژی رژێمی گۆڕ بە گۆڕ راپـەرین و هاتنـە سەرشـەقام و زەمینـەو مەیـدانـە گشتییەکان و هاواریان دەکرد کە رژێمی شا بروخێ... کە داوای ریمـوکـراتیـەت و سەربـەستیـان دەکـرد، گەلی کوردی نەبەزی ئێران بێ بەشی ئەو راپەرینە جەماوەریو ئەو شۆرشـە میللییـە بە گورە نەبـوو کە هەمـوو لایەکی ئێرانی گرتبووەوەو شان بە شانی گەلانی ئێران بەشداری شۆرشی کرد بۆ روخـانـدنـی رژێمی شا.. وەك گەلانی ئێـران و رێکخراوە رامیارییەکانی، دەستی دابە چەك و لە ناران و شارەکانی تری ئێران بەشداری خۆپیشاندانەکانی کردو، بێ کۆڵـنـەدان، ئازاو مەردانـە بەشـداری شۆرشـەکـەی «خوانـەخـواستـە ئیسـلامییـەکـەی خومەینی!!!»ی کردو هەزاران لاوی کورد خوێنی پاکی خۆی لەم پێناوەدا رشت، بەو مەبـەستـەی ببێتـە قوچی قوربانی ئازادیو رزگاربوون و سەربـەستیو دابینکـردنی مافـە رەواکـانی گەلی کوردی کوردستانی ئێران.

پاداشـتی خومـەینی بۆ گەلی کوردی ئێـران، هەروەك پاداشـتـەکـانـی بۆ گەلـی بلوجـسـتـان و عەرەبـسـتـان و ئازربایجان و گەلانیتری ئێران، دەربەدەرکردن و لە ناوبردن و

لە سێـدارەدان و تەخت کردنی شارو دێهـاتـەکـانیـان بوو... نەك ئەمـەو بەس ،بـەڵکـو بگـرە بە کافرو ناڵەبارو دژی ئایین و موسلمـانێتیو «شـۆرشی ئیسـلامی.. ئێـران ناوی لێنرا.

ـەگـەڵ هەمـوو تەقـەڵـلادانێكدا كە تەڵەكە بازی گەورەو
ـەیتـانی سـەدەی بیستـەم دای بۆ سـەركـەوتن و مرانـدنەوەی
ـەرتـی كوردی ئێران، هەموویان پووچەڵ بوونەوەو شۆڕش
ـەتی سـەنـدو ڕۆژ دوای ڕۆژ خەبـاتی چەكـدارانـەی دژی
حـەیـنی بەهێـزتـر بوو و خاكی كوردستـان بوو قەڵای
ـەهـەستكارانی ڕژێم.

حوێنی گەشاوەی شەهیـدانی كوردستـانی ئێـرانیش بە
ـێـرۆ ـچێو گەلی كوردی ئێـران هەر سەردەكـەوێو لەگەڵ
ـەلـی تری ئێـرانـدا هەر ئەبـێ مافـی ڕەوای خۆیـان
ـەگـرن... هێزی شەڕو تاریكیش ،زوو یان درەنگ، هەر
ـەی نە ناو بچێ.

## سەرچاوەكان

(1) - گۆڤـاری ڕۆشـنبیـری نوێ. ژ 88 مانـگی ئاب و
ـەیلوولی ساڵی 1981. ل16.

(2) - سەرچاوەی پێشوو. ل18.

(3) - مجلة «الجـامعـة». مجلة شهـريـة تصـدرهـا جامعة
ـموصل. «عدد خاص». تشرين الثاني، العدد الثاني. السنة
ـحادية عشرة 1980. ل12

(4) - سەرچاوەی پێشوو. ل14

(5) - سەرچاوەی پێشوو. ل17.

(6) - گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ .ژ88 ساڵی 1981 ،ل6.

(7) - گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ. ژ 97 سـاڵی 1981
ل23.

(8) - القذافي والأسد، من هما؟ وماذا يريدان؟ اصدارات
وزارة الثقافة والاعلام. دار الرشيد للنشر 1981.

(9) معـادات العـراق.. لمصلحـة من؟ سەر وتـارەكـانی
ڕۆژنامەی «الثورة» لە ڕۆژانی 12و13و14ی حوزەیرانی 1979
دەربارەی پەیوەندیەكانی نێوان عراق و ئێران.

(10) ڕۆژنامەی هاوكاری .ژ (2 - 7) لە 1/9/1983.

پەیوەندی نێوان
گەل و سەركردە
بەهێزو تووندە
تێكڕا لەیەك
سەنگەردا
تێدەكۆشین بۆ پاراستنی
بیروباوەڕو
ڕەسەنایەتی هاوبەشی

## جیۆپۆلیتیکس و دەوڵەت و سیاسەتی دەرەوەو چارەنووسی جیهان

# زەوی و دەوڵەت

حیلمی عەلی شەریف

**جێـوپـولـیـتیکس بەم ناوەی ئیستـایـەوە باس و لێکولینەوەیەکی تازەیە، زاناو پسپورە جوگرافیاناسەکانی دەوڵـەتـە سەرمـایەدارو ئیمپریالی‌یە گەورەکانی جیهان هانیویانەتە کۆری زانستی ئادەمیزادەوە.**

**پەیـوەنـدی‌یـەکی تونـدو تۆڵی هەیـە بە چارەنووسی گەل و ولاتە بچوك و مام ناوەندی‌یەکانی جیهانەوە، وە لەگـورەپـانـی ولاتـە گەورە چاوبـرسـی‌یـە چەوسێنەرەوەکانەوە هەڵئەقوڵێت و هی خۆیانەو لەوانەوە بڵاو بۆتەوە، وەپێش ئەمانیش هەر لە دەوڵەتە هاوشانە کۆنەکانی جیهانەوە بە شێوەیەکی تر هاتۆتە کایەوە.**

لەبـەشـی سێـیـەمـی ئەم باسـەدا بەنـاونـیـشـانـی (جیـۆپـۆلیتیکس و خەلـك و دەوڵـەت)، بە دوورروو دریژی لەم باسـە دواین وەبـەسـەرەتـایـەك دەربـارەی بنچینـەی فەلسـەفی و یاسـاو ئایـدیـولـوجی پەیـدابـوونی دەوڵـەت باسـەکـەمـان دەست پێ‌کرد ئنجاچوینە سەر پێوەندی نێوان خەلـك و دەوڵـەت وەبیـرویـاوەری زانـایـانی جیـۆلیتیکس دەربارەی ئەم پێوەندی‌یە.

وەکو لە ژمارەی پێشووی گۆڤاری رۆشنبیری‌دا باسکراوە زانایانی جوگرافیای سیاسی و جیۆپولیتیکس لایان وایەو کە خۆشی هەروایە، دەوڵەت بەبێ زەوی و خەڵك پەیدا نابێت وەبـەپێ‌ی ئەم راستی‌یـە باسی ژمـارەی پێشـوی ئەم گۆڤارە تەرخـان کرا بو خەلـك و دەوڵـەت وەلـەم ژمـارەیـەدا باسی زەوی و دەوڵەت ئەکەین، ئەوەی راست بیت زۆرتر پێوەندی جێۆپۆلیتیکس بەم باسەوە ئەخەینە بەر تیشکی لێکولینەوە.

چونکـە پێـوەنـدی‌یـەکی تونـدو تۆڵی هەیـە بە زانستی هێزو توانای دەوڵەتەوە، دەربارەی دوا رۆژی هەر دەوڵەتێك کلیلی پێش بینی‌کردن ئەداتە دەست مرۆڤ.

لەم چەرخـەو لە چەرخـەکـانی پێشوشداو هیچ نەبێت تا دەوڵەتانی ئیمپریالی و سەرمایەداری گەورەو چاوبرسی لەسەر ئەم سەرزەمینە بمینن، ئەگەر لە دوارۆژدا هی ئەستیرەکانی تری ئەم گەردونەشمان لێ قوت نەبنەوە! هەموو دەوڵەتێکی ئەم سەرزەمینە بە تایبەتی بچکولەو مام ناوەندی‌یەکانی ئەبی هەمیشە دەستیان لەسەر دڵیان بێت کە دەوڵەتێکی لە خۆیان زەلام و گەورەتر پەلاماریان نەدات و دەسەڵات و سەربەستی خاك و خەلکەکەیان پێ‌شێل نەکات.

راستـە ریکخـراوی نەتـەوە یەکگـرتووەکان هەیەو کومەڵە دامـەزراوو ریکخـراوێکی نێـو دەوڵـەتـان هەیە، هەموویان بەپێ‌ی دەسـتـوورو یاسـایـەکی لەلایـەن دەوڵـەتـانی گەورەو پچوکی ئەم سەرزەمینەوە باوەر پێ‌کراو بۆ پاریزگاری ئاشتی و ئاسایشی دەوڵەتانی جیهان خەبات ئەکەن و هاتونەتەکایەوەو رێبازی پاراستنی ماقی ئاسایی ورەوای مروڤایەتی و پێوەندی ئاسـایـی و دۆستـانـەی ئابـوری و ئاڵـوگـوری زانست و تەکنـولـوجیـایـان گرتۆتە بەر وکردۆیانە بەسەر مەشقی رەوتی پیـروزی خۆیـان بەڵام لەوەپێشیش ریکخـراوی نەتـەوەکان (عصبة الامم) و لەم بابەتە ریکخراوە هەر هەبووەو کەچی جەنگی یەکـەمی جیهـان و هی دووەمیش هەلگیـرسـاون و چەنـد ملیـون کەسیکیـان تیـا گوژ راوەو ویـرانکـاری‌یـەکی زۆریشیان داوە بەکۆڵی گەلانی جیهان دا. وەدوای ئەم دوو جەنگـە ویـرانکـەرە فرە کوژەش لەم کوچـەو لەو کوچـەیەی سەرزەمین تا ئەمرۆژەی ئیستاشمان هەر جەنگی دوو قولی و چەند قۆڵی لە نێو دوو دەوڵەت و چەند دەولەتیکدا یان لە نێو دەوڵەتێك و گەلێکی بەشخوراوو زۆر لێکراودا هەر

بەردەوامە.

بۆیە دەوڵەتە گەورە چاوبرسی یەکان کە کشان بەسەر خاکی دەوڵەت و گەلانیان کردووە بەرێرەوی سیاسەتی نەرمووی خۆیان، بەچاوی جیۆپۆلیتیکانەوە سەیری دەوڵەتانی تر ئەکەن هەر وەکو پێویستیشە ئەبێ دەوڵەتانی بچوك و مام ناوەندی وەزاناو سیاسەت مەدارانیان بەهەمان شێوە بڕواننە مەرجە سەرەکی یەکانی هێزو توانای دەوڵەتەکانیان وەدەبەپێی ڕێبازی دوارۆژ بیر لە نەخشەو پیلانەکانی دەوڵەتە تەماعکارەکانی تر بکەنەوە.

دوای ئەم پێشەکی یە کورتە ئیتر باسی مەرجی دووەمی دامەزراندنی دەوڵەت ئەکەین واتە دوای خەلك، کە مەرجی یەکەمە زەوی ئەبێ بە مەرجی دووەمی سەرەکی.

نیاز لە زەوی ئەو پارچە زەوی یەیە کە دەوڵەتێکی تایبەتی دەسەلاتی بەسەردا ئەشکێت و تیایا فەرمانڕەوایی ئەکات. هەر دەوڵەتەش شێوازێکی تایبەتی خۆی هەیە کە لە هی دەوڵەتێکی تر ناچێت.

بەلام هەموو دەوڵەتان لە وەدا بەشدارن کە بناغەیان لەسەر دوو پایەی سەرەکی بەندە، خەلك و زەوی.

ئەوی ڕاست بێ شیکردنەوەی ئەم باسە بەپێی بیروڕای جیۆپۆلیتیکسی سێ خالی گرنگ دێنێتە کایەوە. یەکەمیان دەرفەتی بایەخدار (المجال الحيوي) دووەمیان کشان بەسەر زەوی خەلکی دا (التوسع) سێ یەمیان خۆ پاراستن لە چاو برسیتی بیگانەو تەماعکاران، وە ئەم سێ خالە دووانیان یەکەم و دووەم لە باسیکی سەربەخۆدا لە ژمارەی پیشوی ڕۆشنبیری دا باسکراون وەخالی سێ یەمیان خالێکی ناوکۆییە تا باسەکە تەواو ئەبێت جیگای دیارو گرنگی تیایا داگیر کردووەو ئەتوانین بلێین گەوهەرو ناوەروکی سەرجەمی باسەکەیە.

بێ گومان باسی زەوی هەموو مەرجە سروشتی یەکان ئەگریتەوە کە هەر ئەتوانین لە بریتی زەوی و دەوڵەت بلێین مەرجە سروشتی یەکان و دەوڵەت کەئەم مەرجانەش لە جیگاو قەوارەو شێوەو ئاوو هەواو پانایی و دەشتایی و شاخ وداخی دەوڵەت و پیتو بەرەکەتی زەوی و کەرەسەی خاووسنوور. ئەدویت. وە هەر خالێك لەم خالانە بەپێی سازو ناسازی و بایەخ و بێ بایەخی هێزوتوانای دەوڵەت ئەخەینە تای تەرازووەوە.

بۆ نموونە ولاتێکی دورە دەستی وەکو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەوە تێکەلی دوو جەنگی گەورەی جیهانی ئەبێت کەچی لە هەر دووجەنگەکەدا وەك بەرزوەکی بانان بەسەلامەتی رزگاری ئەبێت، هەروەها پان وبەرینی ولاتی چین، ژاپۆنی لە جەنگی دووەمی جیهان دا نیوە ئیفلیج کردو هەروەها رووبەری یەکێتی سۆڤییەت یارمەتی یەکی گەورەی گەلی سۆڤییەتی ئەم دواییەو رووسی پیشوی دا کە ناپلیون و هێتلەر بشکێنن.

مەرجە سروشتی یەکانیش پەیوەندی یان بەم خالانەی خوارەوە هەیە کە یەکە یەکە باسیان ئەکەین.

1 ـ جیگا (الموقع): جیگای هەر دەوڵەتیك پارچە زەوی و ئاوو سنوورو هەوایەکی دیارو ئاشکرایە بەلام نرخ و بایەخی ئەم جیگایە بەپێی چەرخ و زەمان ئەکێشرێت و نرخی بۆ دائەنرێت لە وانەیە لەکاتیکدا نرخدارو کاتێکی تر هەر هەمان جیگا کەم نرخ و رۆژیك بێت لە کۆری پەیوەندی یەکانی نێو دەوڵەتاندا بێ نرخ ببێت. بۆ نمونە میسری دوای هەلکەندنی کەنداوی سویس پایەی سیاسی و ئابووری و عەسکەری بەرەو هەورازتر سەرکەوت، هەر وەکو دوای داگیرکردنی ئەم کەنداوەو داخستنی لە سالی 1967دا کە پاپورە گەورە نەوت کیشەکان ڕیگایان بەلای خوارووی ئەفەریقادا گواستەوە، پایەی هەمە جۆرەی میسر بەرەولێژی خزا.

هەروەها ئەگەر نەوتی دورگەی عەرەبی وشك بکات یان هەر نەوت ئەو بایەخە ئابووری یەی نەمینی بێ گومان دورگەی عەرەبیش نرخی ستراتیجی خۆی ئەدۆڕێنێت.

دکتور صلاح الدين شامي، کە باسی جیگا ئەکات دوو مەرجی لا گرنگەو بەپێویستیان ئەزانێت لەکۆری نرخاندنی جیگادا بخرینەپێش چاو.

1 ـ بەوردی لە هەر چەرخ و کاتیکدا بڕوانرێنە ئەو هەل و مەرجانەی لەو کاتەدا ئەو جیگایە بایەخداریان بێ

بایەخ ئەکەن.

2 ـ بروانریتە ئەو پیوەندییانەی نێوان رووبەری ولات و ئاوو دەریاو ئۆقیانووس و ئەو پەلانەی کشاونەتە ناوو وشکاییەوە.

وەکو ئەوەی جیاوازییەکی زۆر لە نێوان قەوارەیەکی بەو شکاییە دەورە دراوو یەکێکی تری سەردەریادا هەیە. ئەو دەوڵەتانەی موڵەتی چوونە دەریایان نەبی سیاسەتی دەرەوەیان گەلێك جیاوازترە لەوانەی لە سەردەریان و جێگاکانیان بۆتە مەڵبەندیکی گرنگی بازرکانی و هاتوچۆکردن لەگەڵ دەولەتانی تری جیهاندا.

هەروەها دوکتور صلاح الدین الشامی لەسەر باسەکەی ئەروات و بەپێویستی ئەزانێت خۆ لە وشکە لیك دانەوە دور بخەینەوەو ئەم سێ مەرجەی خوارەوە بکەین بەکیش و پێوانەی نرخاندنی جێگای جوگرافیەوە بەوپێیە شوێنی دەولەت بنرخێنین.

1 ـ مەڵبەندی هاتوچۆ کردنی ئابوری وشارستانییتی لەجیهانداو پەیوەندی بە دەولەتی باس لێ کراوەوە.

2 ـ دەریاو ئۆقیانووس و هاتوچۆی کەشتیوانی و بازرگانی نێو دەوڵەتان لەو ولاتەدا یان نزیك ئەوولاتە.

3 ـ دەوڵەتە هێزدارە گەورەکانی جیهان و ئەو پانایە زەوییانەی دوو بەرەکی چەکدارییان تیدایە ویان لێیان ئەوەشێتەوەو جۆری پیوەندییان بەدەولەتی باس لێ کراوەوە.

ئەوی راست بێت شارەزایانی جیۆپۆلیتیکس کەباسی هەر لایەنێکی دەوڵەت ئەکەن خیرا روو ئەکەنە دوو لقی سەرەکی یەکەمیان باری ئابوری ئەوولاتەو دەرامەتی پیشەسازیو کشتوکال و کەرەسەی خاوی ژێرخاك و قەوارەی خەزینەی ئەو کەرەسەخاوانە دووەمیان لێکولینەوەی جێگاو شوینی ئەوولاتەو هەلکەوتی خاکەکەیو گونجان و نەگونجانی لەکۆری هیرش بردن و خۆپاراستن دا، واتە باری عەسکەری ئەو ولاتە. وە ئەم دوو مەرجەی سەریشەوە پەیوەندیان هەیە بە هەڵکەوتی ئەو ولاتەوە کە ئەویش ئەم خالانەی خوارەوە سنووری بو ئەکیشن و نرخ و بایەخی ئەدەنی یان بێ‌نرخ و بێ خیری ئەکەن.

1 ـ هەڵکەوتی جیگاکەی بەپێی هێلەکانی سەرزەمین:

دوور و نزیکی هەر جێگایە لە هێلی ئاساییان کەمەرەی زەمین (خط الاستواء)ەوە کە بۆی ئەبیتە پیتو بەرەکەت یان دەست کورتی بۆیە ئەو دەوڵەتانەی ئەکەونە ژوورووی کەمەرەی زەمینەوەو ئاوهەوای خوشیان هەیە، دەوڵەتی گەورەو خاوەن سامانیان تیا هەلکەوتووە بەلام ئەو دەوڵەتانەی کەوتونەتە نیوەی خواروی سەرزەمینەوە، دەوڵەتی گەورەیان تیا هەڵنەکەوتووە، چونکە ئاووهەوای ئەو ناوچانە ناسازن.

2 ـ هەڵکەوتی جیگاو ئەندازەی تەرایی و وشکایی شوێنەکەی:

واتە ئاوچەندی تیاگرتۆتەوەو وشکایی چەند. ئەمە ئەوەمان نیشان ئەدات کە خەلکی ئەو ولاتە تاچ رادەیەك بە چالاکی دەریاییەوە خەریکن و چەندیش بە وشکانییەوە. ئەم زانستەش گەلی باری هیزو تواناو ناتەوانایی ولاتیك دەرئەخات.

جگە لەوەی کێشەو بەرەی ولاتە دەریاییەکان جیاوازییەکی دیارو ئاشکرایان هەیە لەگەڵ کێشەو بەرەی ولاتە دوورە دەریاکان. هەروەها ئەندازەی درێژی سنوری وشکانی ولاتێك لەچاو سنوری دەریاییدا ئەبێتە پێوانەیەکی تری ئەم باسە بەو مەرجەی سنورە دەریاییەکەی ئەوراستییەی تیا رەچاو بکریت کە تاچ رادەیەك بەکەلکی هاتوچۆی دەریایی دیت و ئەسکەلەی دەریایی بەکەلکی تیا هەلئەکەوێت و دراوسێکانی تری درو زۆردارن یان ئاسایش دۆست و هاوسێ پەروەرن، چونکە ئەم راستییانە پەیوەندییان هەیە بە باری عەسکەری ئەو ولاتەوەو ئەبنە بناغەیەکی پتەو یان بۆش لەکاتی هیرش بردن و پاریزگاریدا.

لەلایەکی تریشەوە هەندی سنوریتر هەیە هەر چەندە کەوتۆتە سەر دەریاو ئۆقیانوس بەلام بەشی زۆری رۆژانی

سن بەستەڵوکەو هاتوچۆی دەریایی تیداناکریت وەکو سورەکانی ژوورەووی کەنەداو یەکیتی سوڤییەت کە بۆ هاتو چۆی دەریایی زۆر بێ‌خێرن.

لەگەڵ ئەوەشدا ولاتی بێ دەریا خۆ ئەگەرپان و بەرین یت هەرچەندە بۆپیتو بەرەکەت و هاتوچۆو دەرامەت بە تەواو ئەدرێتە قەڵەم بەڵام دەربارەی جەنگ خاوەنانی ئەم ولاتانە ئەتوانن دوژمنانیان بەهەندی وریایی‌و چالاکی‌یەوە لە مەیاندا بیەزێنن. ، وەلەم بارەیەوە فردریك پاشای پروسیاو بلیون و شورشگیرانی روسیا لە شورشی بۆلشەویك دا بە شی کەلکیان لە خاسی‌یەتی جوگرافی ولاتەکەی خۆیان بینی. جگە لەمە ولاتی سنوور داخراوی بێ‌دەریا ئەبێ بۆ ئاڵوگۆری بازرگانی هەر چاوی لەیارمەتی دەوڵەتە دراوسێ‌کانی بێت و پێوەندی خۆی لە گەڵیانا لە سەر بناخەی هاوکاری‌و دۆستانە دابمەزرێنێت تاکو بۆی ببیتە ریباز بو هاتو چۆکردنی هەمەچەشنە.

ئەمەش وە نەبێت هەمووجارێك و لەهەموو هەل و مەرجێك دا بۆ هەموو دەوڵەتێك هەڵسورێت و بەم پێ‌یە نەخشەی سیاسەتی دەرەوەی خۆی بکێشیت. ، بۆ نمونە ولاتە یەکگرتاووەکانی ئەمەریکا دووچاری ئەم کێشەیە نەبوون، چونکە لەگەڵ کەنەدەو مەکسیك دا سنووری هەیەو ئەم سنوورەش هیچ کێشەو بەرەیەکی بو قوت نەکردۆتەوە.

بە پیچەوانەی ئەڵەمانیا کە لەگەڵ دراوسێ‌کانیا هەمیشە گیرودەی کێشمەکیشی سنوور بووە تاکار گەیشتە ئەو رادەیەی هیتلەر هەموو یاساو رەوشت و پێوەندی‌یەکانی نێو دەوڵەتان بخاتە لاوەو جەنگی دووەمی جیهانی بەرپا بکات و هەر ئەو سەرکەشی‌یەش سەرەونگومی کرد.

هەندی جار ناکۆکی ودوو بەرەکی نێو دوو دەوڵەت بەرگێکی میژوویی ئەکات بەبەری خۆیدا یان لایەکیان مەترسی دەست دریژی ئەوی تریانی لێ ئەنیشێت تا کار ئەگاتە ئەورادەیەی بیر لەدروست کردنی دەوڵەتیکی تر بکریتەوە کە ئەو دوو دەوڵەتە لە یەکتری جیا بکاتەوە، یان پارچە زەوی‌یەکی دەوڵەتیکیان ئەخەنە سەر دەوڵەتێکی‌تر تاکو بەوجۆرە ئەو دەوڵەتە خاکی بگاتە ئاستیك کە دوودەوڵەتە ناحەز بە یەکەکە لە یەکتری جۆی بکاتەوە.

وەکو ئەو پارچە زەوی‌یە وەکو زمان خرایە سەر خاکی ئەفغانستان تا روسیای قەیسەری لە هندستانی جاران و پاکستانی ئیستای جیاکردەوە، کە نیازی راستەقینەی ئەم کارە جیاکردنەوەی روسیاو بەریتانیابوو.

ئەگەر ئەم جۆرە جیاکردنەوانە رەزامەندی دوو دەوڵەتە ناحەز بە یەکەکەی تێدابوو ئەوا بێ دەنگ ئەچێتە سەر، دەنا ئەم دەوڵەتە جیا کەرەوانەش (الدول الحاجزة) ئەبنە گۆرەپانی جەنگی نێوان ئەم دوودەوڵەتە.

جەنگیش ئەو کاتە هەلئەگیرسێت کە دوو بەرەکی گەیشتە پۆپەی ناخۆشیی‌و چەك بەکار هێنان بوو بەپشکی نێوان هەردوولایان لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ئیران و ئەفغانستان و تایلاند بوو بوون بە دەوڵەتی جیاکەرەوە، ئیران و ئەفغانستان لە نێوان روسیاو بەریتانیاو تایلاندیش لە نێوان بەریتانیاو فەرەنسادا.

جا ئەگەر دەوڵەتە جیا کەرەوەکان لاوازبوون، بەبێ پەیمانێکی نێو دەوڵەتان ئەو دەوڵەتانە ناتوانن پاریزگاری دەسەلات و سەر بەخۆیی خۆیان بکەن وەکو ئیران کە لە ساڵی 1921دا پەیمانیك لە نێوان یەکیتی سوڤییەت و ئیراندا بەسترا کەمافی نەوت هەڵهینجان نەدرێت بەهیچ دەوڵەتێکی روژئاوا لەپینج پاریزگا (أستان)ی ژووروی ئیراندا وە هەرکاتێك هەرسەربازێکی دەوڵەتێکی رۆژئاوا بەنیازی داگیرکردن پێ‌ی نایە خاکی ئیرانەوە، یەکیتی سوڤییەتیش ئەو مافەی ئەبێت لەشکری خۆی بنێریتە ئیرانەوە. ئەمەجگە لەهەندی بەندی ئاڵوگوری بازرگانی‌و هاوکاری هونەری‌و زانستی. بەرامبەر ئەم ریککەوتننامەیەی نێوان ئیران و سوڤییەت کەلەجەنگی دووەمی جیهانی‌دا لەشکری سووری سوڤییەت ئازربایجان وکوردستانی ئیرانی داگیرکردو دوو دەوڵەتی دیموکراتی لەم دووهەریمەدا دامەزرا، کۆماری دیموکراتی ئازربایجان وکۆماری دیموکراتی کوردستان ئیتر خێرا دەولەتە روژئاواییەکان هەرەشەی داگیرکردنی بەشەکانی تری

ئێرانیان لەیەکێتی سوڤییەت کردو ناچاریان کرد کە لەشکرەکەی بکێشێتەوە خاکی خۆی. ئەوەبوو حەمەرەزار شاش کشانەوەی لەشکری سووری سوڤییەتی بە هەل زانیو پەلاماری هەردو کومارەکەیداو بەزەبری ئاگرو ئاسن هەردوکیانی لە ناوبرد. ئەمە نمونەیەکی ناوڕۆکی جیۆپولتیکسە.

بەڵام ئەگەر دەوڵەتە جیاکەرەوە کە (الدوله الحاجزة) خۆی بە هێزو خاوەن چەك و توانابێت ئەوا هوی ناکەویتە هیچ دەولەتێك و هەروەکو دەسەڵات و سەر بەخۆیی خوی ئەپارێزیت بە فرمانی جیاکەرەوکاری خۆشی هەلئەستێت. وەکو دەوڵەتی سویسرە.

ئەمە دەربارەی دەوڵەتی جیاکەرەوە بەڵام ئەو دەوڵەتانەی بەشی زۆری ولاتەکەیان و شکانییەیان هەر هەمووی وشکانییە یان هەریمی دەرگا لەپشتیات هەیە (Backdoor AREAS) وەکو یەکێتی سوڤییەت کە بەشی سەر دەریای جگە لەوەی بەستەڵوکە گەلێکینێ لە کان و دامەزراوە ئابوریو کشتوکالیو پیشەسازییە گەورەکانی ئەم ولاتە. دوورەدەستە. ئەم دەوڵەتانە زۆر بە پەرۆش هەول ئەدەن بگەنە دەریا چونکە ئەو دەوڵەتانەی سنوریان کەوتۆتە سەر دەریای بەرەڵلاو بەکەلك هەمیشە لەگەڵ زوربەی زۆری دەوڵەتانی جیهاندا پەیوەندییان هەیە یان بەپێی پێویست ئەتوانن پەیوەندییان لەگەڵدا ببەستن جا هەندی لەم دەوڵەتانە ئەگەر بە زۆرو بە جەنگ خۆیان بۆ نەگەیەنرا یە سەردەریا یان ئەم ڕێبازەیان نەگرتە بەر ئەوا بەخۆشیو بەپێی ریککەوتننامەی تایبەتی لەگەڵ دەوڵەتانی تردا بەندەری ئازاد پەیدا ئەکەن و خۆیانی پێ ئەگەیەننە سەر دەریا وەکو چیکوسلوفاکیاو بەندەری ئازادی هەمبورگ لە ئەلەمانیاو نەمسا لە بەندەری تریست دا.

ئەگەر سەیری میژووی روسیا بکەین ئەبینین کە سیاسەتی دەرەوەی ئەم وڵاتە بریتی بووە لە خەباتێکی بێو وچانی دریژ خایەن لە پێناوی گەیشتن بە دەریادا وە لە پێناوی گەیشتن بەم ئاەزووە ستراتیجییەدا دوو چاری گەلێك ناکۆکیو دوو بەرەکیو هەلبژان بووەو هەمیشە دەوڵەتە رۆژ ئاواییەکان و دەوڵەتی عوسمانی بۆ بەربەستی ئەم ئارەزووە خۆیان بۆخستۆتە سەنگەرەوە. ئیستاش یەکێتی سوڤییەت ئەروانێتە سەر سێ دەریای ناوخۆیی وەکو دەریای بەڵتیك و رەش و قەزوین. بەڵام سنووری سەر دەریای دورە خەڵکە وەکو ئەو سنوورەی ئەروانێتە سەر ئوقیانوسی باسفێك خۆ ئەوەی ئەروانیتە سەر ئوقیانووسی نیمچە قطبی لەبەر بەستەڵوك و سەهول بەندان هەر زۆر کەم بایەخ و کەم سوودە.

راستە یەکێتی سوڤییەت لە ناوچەی دەریای بەڵتیك و دەریای رەش و دەریای قەزوین دا لە هەموو دەوڵەتانی ئەو ناوچانە لە هیزی دەریاییدا دەست رویشتووترە بەڵام دانیمارك کە ئەندامی پەیمانی ئەتڵەسییە دەرگای ئەو سەری لێ گرتووەو تورکیا دەرگای ئەوسەری دەریای رەش و ڤەزوینیش سەری بەهیچ دەریایەکی ترەوە بەندنییە.

بۆیە یەکیتی سوڤییەت جارێ پەنای بردۆتە بەر تەکنولوجیای نوێو هەندی نەخشەی تایبەتی کەخۆی لەم گەمارۆدراوییە رزگار بکات وەکو هەڵکەندنی نوکەندی نوێو بەکار هینانی پاپوری سەهۆڵ شکینی ئوتومیو دروست کردنی هەندی پاپوری زەلام وزەبەلاح کەزۆر درەنگ پێویستی بە سوتەمەنی ببێت. بەڵام ولاتانی عەرەب بەگشتی بەپیچەوانەی یەکیتی سوڤییەتەوە هەلکەوتوون، بە دریژایی ساڵ هاتوچۆی دەریاییان بۆ ئەکریت و سنوور کراوەو بەر بەرەللان.

لە لایەکەوە ئەروانن سەر دەریای سپی ناوەراست و بەریکی جەبەل تاریق ـ یان بەدەستەوەیەو لەلا یەکی ترەوە بەشی هەرە زۆری دەریای سوور بەم سەرو ئەو سەریشێوە، ئەمە جگە لەبەرەی روژئاوای هەموو دورگەی عەرەبی.

گەڵێك لە زانا عەسکەریو پسپۆرە جیوپولیتیکسییەکان بەراوردێکی ئەم وڵاتە رووبەر فراوانە بێ دەریاو کەم دەریایانەیان لەگەڵ ئاسایشی نەتەوایەتی ئەو ولاتانەدا کردووەو لەرووی پارێزگاری کردن و بەربەست کردنی هیرشی دوژمنان بایەخێکی زۆریان بەم جۆرە وڵاتانە داوە.

بۆ نموونە ئەڵێن یەکێتی سۆڤییەت لە جەنگی دووەمی جیهانی دا فابریقەو کارخانە گرنگەکانی هەموو گواستۆتەوە بۆ ناوچانەی کەوتوونەتە رۆژهەڵاتی شاخی ئورال و دەشتەکانی سیبریاوە تا چنگ هیزە داگیرکەرەکەی نازی یەکان نەکەون.

ئەوی راست بێت ئیستا پاش ئەوەی تەکنولوجیای جەنگ گەیشتوتە پایەیەکی بەرز وچەکی ئوتومی و فروکەی تیژ رەوی دور رەوو ساروخی دوور رەو ئەگەنە هەموو شوێنیکی ئەم سەرزەمینە کەلکی ولاتانی پان و بەرین و سنوور داخراو لەئاست و پلەی جارانیانا نەماون. لەگەڵ ئەوشدا دەوڵەتانی دنیا ورەیان بەرنەداوەو خۆپاریزی یان فەرامۆش نەکردووە. بونموونە سوید پیشەسازی یەکانی خوی بەتایبەتی ستراتییجی یەکانیانی خستوتە ژێر زەمینەوە وشوینی گەورە گەورەی ئامادە کردووە کە لەکاتی هیرشی ئوتومی دا بەشێکی زۆری خەلکی سوید پەنایان بۆ بەرن و خویانیان تیا بپاریزن.

هەندێ لەم پەناگایانە وەکو ئەشکەوت لە شاخەکانی سویدا هەلکەندراون و هەریەکەیان جیگای (20) هەزار کەسیان تیا ئەبێتەوەو ئەتوانن بۆماوەیەکی زۆر تیایا بحەوێنەوەو پێویستیشیان بەهاتنەدەرەوە نەبێت.

**ولاتانی سەردەریا:**

وڵاتانی سەردەریا گەلێك جیاوازی یان لەگەڵ و وڵاتانی وشکایی دا هەیە چ لە رووی ئاوو هەواو چالاکی کارو گوزەرانی خەلکەکەیەوەو چ دەربارەی سەرچاوەی دەرامەتیان.

ئەگەر سەرنجی میژوو بدەین بومان دەر ئەکەویت کە داگیرکەریتی وکولونیالی لە سەرەتاوە لە ولاتانی سەر دەریاوە بلابۆتەوە وەکو بەریتانیا لە ئەورووپاو ژاپون لە ئاسیادا.

هەروەها دەولەتی خاوەن سامان و دەسەڵاتیش هەر لە دەوڵەتانی سەر دەریاوە دینە پێش چاو، وڵاتی نەرویج هەر چەندە بە ژمارە کەمەو پانایيەکی کەمیشی داگیر کردووە کەچی سێ یەمین دەولەتی خاوەن کەشتی بازرگانی یە لە جیهاندا. هەروەها دانیمارکیش لەم کۆرەدا دەوڵەتێکی خاوەن سامان و کەشتی بازرگانی یە.

گەر چاویك بەمیژووی کون و نوی دا بخشینین بومان دەرئەکەویت کە زۆر جار دەوڵەتانی دەریا چاویان بریوەتە دەوڵەتانی وشکایی لە خۆیان گەورەتر. فینیقی و یونان و شارەکانی ئیتالیاو دوای ئەوان پورتوگال و هولەندەیی و فەرنسایی و ئینگلیزەکان هەموو رێبازی چونە سەر دەوڵەتی ترو سیاسەتی داگیرکەرانەیان گرتۆتە بەر. هەر چەندە ئیستا شوینەواری ئەو داگیرکاری یە لەچەند جیگایەکی بچوکدا ماوەتەوە، وەکو هونگ کونگ و جەبەل تاریق.. هەروەها ئەم ولاتانە خۆشیان بونەتە نێچیری ولاتانی لەخۆیان گەورەو دەسەلات دارتر یان دررو تەماعکار تر. وەلاتانی سەردەریا ئاسان تر داگیرئەکرین لەولاتانی دورە دەریاو پان و بەرین چونکە رێگەی دابەزین و چونە ناوەوە لە دەریاوە ئاسان ترە تا زەوی.

لەم بارەیەوە گەرووە دەریاییەکان ئەبنە ناوچەیەکی گرنگ و ستراتیجی و مایەی دوو بەرەکی و کیشەو بەرەیەکی گەورە لە نێوان دەوڵەتە خاوەن سامان و دەسەلاتە کاندا.

ئەو ولاتانەی کە خاوەنی ئەم گەرووە دەرياییانەن لە لایەکەوە بویان ئەبێ بەخێروسامان، وەپایەی دەرامەت و ستراتیجی یان پێ بەرز ئەبێتەوەو لەلایەکی تریشەوە دەوڵەتانی لە خۆیان بەدەسەڵات تر چاویان تێ ئەبرن و گەلێك جار ناچار ئەبن لەگەلێ مافی رەوای خۆیان پاشەکشێ یان بۆ بکەن و هەندی جاری تریش پەنا ئەبەنە بەر دەوڵەتی گەورە تا لەدەوڵەتانی تر خویان بپاریزن.

گەرووی بۆسفوررو دەردەنیل کە بەدەست تورکیاوەن گەرووی سەندیش کە بەدەست دانیمارکەوەیە هەر دوو دەوڵەتیان خستۆتە سەر ریگای هاوکاری عەسکەری لەگەڵ دەوڵەتە رۆژ ئاواییە گەورەکاندا دژی یەکێتی سۆڤییەت، کە ریگایەکی ستراتیجی عەسکەری و بازرگانی و هاتوچۆ کردنی ئاسایی ئەم وڵاتەن.

هەروەها کاتی خۆی بەریتانیا دەستی گرت بەسەر

گەرووی عەدەن و جەبەل تاریق و سەنغافورەدا، کە ئیستا هەر جەبەل تاریقی بەدەستەوە ماوە تا ریگای هاتوچۆی بازرگانی و عەسکەری بوخوی لە روژهەلاتی نزیك و ناوەراست و بو هندو خوارووی روژهەلاتی ئاسیا مسوگەر بكات.

خۆ کەنداوی سویسیش چنگی هەر دوو دەولەتە کۆلونیالی یە گەورەکەی بەریتانیاو فەرەنسای کیشایە ولاتی میسرەوەو تا لەسالی 1956 یشدا ئەم دوو دەولەتەو ئیسرائیل سێ قۆلی پەلاماری میسری عەبدولناسریان دا تاکو لەلایەکەوە کەنداوی سویس لە مەترسی رزگار بوون دوور بخەنەوەو لە لایەکی تریشەوە رژیمی پیشکەوتن خوازی عەرەب پەروەری عەبدولناسر لە ناوبەرن.

وەولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش تا روژ هەلات و روژئاوای خوی بەیەکەوە ببەسێت و هاتوچوی دەریایی ئاسان بكات، دەستی گرت بەسەرکەنداوی پەنامادا.

کەنداوی پەناما نێوانی سان فرنسیسکۆو نیویورك ی لە 12600 میلی دەریاییەوە هانی یە سەر تەنیا 4500 میل. وەولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دوای بەکار هینانی ئەم کەنداوە کەشتی جەنگی و بازرگانیان بەئارەزووی خویان لە هەردوو ئوقیانوسی باسفیك و ئەتلەسی دا گەشت ئەکەن.

ئنجا وەکو باسی گەرووی دەریایی ئەکەین هەروەها پیویستە باسی گەرووی و شکاییش بکەین کە ئەمیش لەکاتی ئاشتی و جەنگدا بایەخ و شوینی تایبەتی خوی هەیە.

بەلام لەگەل گەرووی دەریایی دا ئەوجیاوازی یەی هەیە کە ئەمیان ئەبی بنکەی عەسکەری پاریزەری لە پەناخویا بۆ دابنریت، بەپیچەوانەی گەرووی دەریاییەوە کە لە دوور خۆی یەوە بوی دا ئەمەزرینریت.

لەگەلی یە وشکاییەکاندا گەلی (گەرووی) خەیبەر بە ناوبانگە چونکە بووە بە سەرەرێی ولاتی هندستان و دەولەتە ئاسیاییەکانی ژوورخۆی.

لە روژهەلاتی ناوەراستیشدا گەرووی سوریا ـ فەلەستین کەلك و بایەخیکی گرنگی لەمیژووی ناوچەکەدا بووە، چونکە ئەم گەرووە بووە بەرێبازیك میسرو شاخەکانی ئاسیای پچوك و دەشتاییە بەپیتەکانی عیراق بەیەکەوە ئەبەستێت.

هەر لە چەرخەکانی پێش میژووەوە ئەم گەرووە سەرەرێی هاتوچوی خەلکی ناوچەکەو گەلیك سەرکردە بەخویان و لەشکرەکانیانەوە بەم گەرووەدا هاتوچۆیان کردووە. هەر ر ەمیس و فیرعەونی میسرەوە تا ئەسکەندەری گەورەو ناپلیون و لەنبی.

وائیستاش قەوارەی زایونیستەکان پەنای ئەم گەرووەی گرتووەو بە تەمایە نەك هەر تاسەر تیایابمێنیتەوە بەلکو هەربیکات بەبنکەیەك بۆخۆکشاندن بەسەر بەشە ستراتیجی یە بایەخدارەکانی دەورو پشتیدا.

شارەزایانی جیۆپۆلیتیکس لە گۆرە پانی باسکردنی شوینی و شکایی و سەردەریادا بایەخیکی تایبەتی ئەدەن بەدورگە چ بۆ خۆ تیا حەشاردان یان بۆ بنکەی عەسکەری تیا کردن.

ئەوی راست بیت رابوردووی گەلیك دورگەو بەکار هینانی گەلێکی تر لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی دا ئەم بۆچوونە ئەسەلمێنن. . لە سەدەکانی رابوردوودا خەلکی ئیرلەندە لە ئیرلەندەو خەلکی کۆنی ژابون لە ژاپون و دانیشتوانی رەسەنی دورگەی فورموزاو سەنگالی یەکان لە سیلان لەم دورگانەدا حەسابونەوەو خۆیان لە پەلاماری داگیرکەران پاراستبو. بونمونە زمانی پاریزراوی خەلکی ئایسلەندە وەکو زمانی نەوریجی پێش هەزار سال وایە چونکە ئەم کۆمەلە خەلکە لەم دورگەیەدا رەوشت و نەریتی کۆنی خویان پاراستووەو زمانە کەشیان ئامیتەی زمانی تر نەبووە.

هەروەها دورگەی قوبرس هەر چەندە لە لایەن سوپای بەریتانیاوە داگیرکرابوو بەلام شاخە سەختە چرەدارەکانی بۆ یونانی یەکانی قوبرس بووبووە پەناگایەکی هەلکەوتوو، کە لەلایەکەوە خۆیان لە گرتن و کوشتنی سوپای ئینگلیز بپاریزن و لەلایەکی تریشەوە بیکەن بەبنکەیەکی بایەخدار بو هیرش بردنە سەر هیزە داگیر کەرەکەی بەریتانیا.

لەگەڵ ئەمەشدا هەموو دورگە یەك نەبووە بە پەناگای دانیشتوانی بەلکو هەندیکیان لەلایەن کومەلانی گەلانی ترەوە داگیرکراون و ئەو داگیرکەرانە وردە وردە دەسەلاتی خویان بەسەردا سەپاندوون و دانیشتوانە کونەکانیان خزانوتە کوجەیەکی ولاتەکەیانەوە.

- بیابان و سنوور: -

سەبارەت بەوەی بیابان رووتەنی یەو کەم بارانە جگە لەچەند واحەیەك نەبیت، کە ریك ئەکەویتە ئەم لاو ئەو لای هەندی بیابانەوە ئیتر بەشەکانی تری بیابان بی بەرو بی دەرامەتن. وەهەموو بیابانەکانی جیهان رووبەریان ئیجگار زورە چونکە ئەگەر وانەبوونایە هەر نە ئەبوون بە بیبان. ئەم خاسی یەتە ئەبیتە هوی ئەوەی بیابان ببیت بە سنووریکی سروشتی و خواکرد لە نیوان ولات و ولاتیکی تردا یان گەل و گەلیکی تردا وەکەم ولاتی گەورەش چاوی تەماعی تی ببریت. ئەمە جگە لەو واحانەی کە هەندی جار دوو دەولەت یان زیاتر لەسەریان لی یان بووە بە ناخوشی وەکو واحەی بریمی کە کەوتوتە چارەکە چول (الربع الخالی)ی دوورگەی عەرەبی یەوەو تا ماوەیەکی زور شانشینی عەرەبی سعودی لەگەڵ عمان دا کیشمەکیشیان لەسەر ئەکرد سەرەرای ئەوەی نیوانی ئەم واحەیەو ئاوەدانی یەکانی شانیشینی سعودی سەدان میل بیابانی لەم داوە.

وەلەسەرەتای سەدەی بیستەم و لەهەندی بیاباندا تا ئیستاش هوزو تیرەی ئەم ولات و ئەو ولات بەتایبەتی خاوەن حوشترەکانیان هەموو بیابانە نزیکەکانی خویان چ ئەوبەشەی مولکی دەولەتەکانی خویان بیت یان ئەو بەشانەی هی دەولەتی تر بن هەر بەهی خویانیان زانیوەو بەسەربەستی بە دووی لەوەرو ژیان و گوزەران دا هاتوو چویان تیا کردووەو کەسیش دەستی نەخستوتە ریگایان واتە چەشنی ژیان و گوزەرانی ئەو ناوچانە نەریت و رەوشتیکی تایبەتی نیو دەولەتی بەو جورەی بو هانیونەتە کایەوە.

بەلام ئیستا کە تەکنولوجیای هاتوچوکردن بەسەر حوشتر لە حوشتر خیراتریشدا بازی داوەو هیلی شەمەندوفەرو فروکەی گەورەی مروڤ بەرو بار بەر هاتونەتە کایەوە، بیابانیش وەکو هەموو بووەکانی تری ئەم سەرزەمینە نرخ و بایەخیکی تری پەیدا کردووە وە لەگەلیك لەم بیابانانەدا کان و کانزای بەنرخی نەوت وئاسن و فوسفات و. . دوزراونتەوە.

ئەم دیاردەیە بیابانی خستوتە ئاستیکی نوی وە، لە لایەکەوە کەلکی سنوور کیشانی خستوتە ئاستیکی خوارترو دووەم بووە بە سەرچاوەیەکی نوی ی دەرامەت و داهاتی دەولەتانی سەرو دەورو پشتی بیابانەکان ئەوەتا بیابانی روژئاوای ژوورووی ئەفەریقا بوتە کوری بەیەکا هەلبژانی خەلکی ئەم بیابانەو مەراکیش و مویتانیاو جەزائیرو لیبیاو، جگە لەو دەولەتانەی لە پشت پەردەوە یارمەتی ئەم دەولەت و ئەو دەولەتی خاوەن ناکوکی یەکە ئەدەن و هانەهانەیان ئەدەن.

- چیاو سنوور: هەروەکو هەندی بیابان و رویار بوون بە سنووری جیاکەرەوەی دوو دەولەت یان چەند دەولەتیك هەروەها چیاش لە زور هەریمی جیهان دا بە هەمان فرمان هەلئەستیت، بەلام جیاوازی یەکی سەرەکی لە نیوان چیاو بیابان دا هەیە کە چیاو دەورو پشتی چیا بەگشتی ئەبیتە مەلبەندی ئاوەدانی و خەلك کوکردنەوە، جگە لەوەی دەربەندو گەرووەکانی ئەم چیایانە ئەبنە ریبازی هاتوو چوکەران.

زور کەس لای وایە کەچیا ئەبیتە سنووری سیاسی نیوان نەتەوەی جیاواز جیاواز لەیەکتری وەچیای هیمالایە بە نمونەی ئەم بوچوونە ئەهیننەوە کە هندستان و ولاتی تبتی لەیەکتری جیاکردوتەوەو چیای برانس فەرەنساو ئیسپانیاو چیای ئالپ لاتین و جەرمانی لە یەکتری جیا کردوتەوە.

بەلام ئەو دیاردانە لە پیش چاومانە لەهەموو هەریمە چیاوی یەکانا ئەم بوچوونە ناسەلمینن. چونکە هەریمە چیاوی یەکان بوونەتە مەلبەندی نیشتەجی بوونی نەتەوەیك

یان چەنـد نەتـەوەیـەکی جیـا جیـا. ئەوانەی یەك نەتەوەیان تیـاکـۆ بۆتـەوەو نیشتـەجێ بووە، ئەو نەتەوەیەی کۆکردۆتەوەو ئاوات و ئامـانجی نەتـەوایـەتی ئەو نەتـەوەیەی تیا خەملّیوەو قازانـج و سوودی بەیـەکـەوە بەستـوون وەکـو دوکتور محمد ریـاض ئەڵێت «کـوردەکـان هەرێمـە چیاوایە سەختەکانی رۆژهـەڵاتی ئەنـازۆل تا زاگـروسیـان داگیـر کردووەو تیـا نیشتەجێ بوون»، هەروەها کشمیرو بوتان و نیپال ـ یش بە نمـونـە ئەهـێنێتـەوە کە سێ ناوچـەی جیـاوازی خاوەن سروشت و نەریت و خاسی‌یەتی نەتەوایەتی تایبەتی بەهۆی چیا سەرختە سەرکەشەکانی‌یەوە تیا پەیدابووە.

ئەوی راست بێت چیا لەلایەکەوە وەکو جیا کەرەوەیەکی خوا کردو سروشتیـانـەو لەلایـەکی ترەوە بەهۆی خاسی‌یەتی تایبـەتی نەتـەوایـەتی لە رووی یاساو نەریتی نێو دەوڵەتانەوە ئەرکی شارەزایانی سنوورکێشی جیهانی ئاسان کردووە.

لە سالی 1659 وە کێشەی سنووری چیای برانس لە نێـوان فەرەنسـاو ئیسپـانیـادا هەیـە، تا لە کۆتـایی سەدەی نوزدەهەمدا هەر دوو دەوڵەت ریکەوتن کەلەسەدەی سیانزە هەمین دا نیوانیان لەم هەریمەدا چۆن بووە هەر لەسەر ئەو رێرەوە لەگەڵ یەکتری‌دا رەفتار بکەن و هەر دوولا دەرگا بۆ شوان و خاوەن ئاژەڵی یەکتری بخەنە سەرپشت.

دەربـارەی چیـا، دوکتـور صلاح الـدین علی الشـامی بەسێ شێوە باسی ئەکات:

یەکەم: ئەو زنجیرە چیایانەی کە وەکو قوتبی موگناتیسی نەتـەوەیـەکی تایبـەتی‌یـان لە خۆیـان کۆکردوتـەوەو بونـەتـە مەلبـەنـدی ئەو نەتـەوەیـەو تیـا ئەژین و ئامـانـج و ئاواتێکی گەلاّلـە کراویـان سنـووری ئاشکـراو دیـاری نەتـەوایـەتی‌و کومەلایەتی‌و سیاسی بو کیشاون. وەکو زنجیرە چیای بەنین لە نیمچـە دوورگـەی ئیتـالیـادا کە یەکیتی‌یـەکی سیـاسی‌و کومەڵە خەڵکیکی دیاری بە دەوری خۆیا کۆ کردۆتەوە.

دووەم: ئەو زنجیرە چیایانەی سنوورێکی سروشتی یان دروست کردووەو بونـەتـە پشتیـوانی سنـووری سیـاسی دەوڵەتێك ودوو زەوی‌یان لە یەکتری جۆی کردۆتەوە. وەهەر کۆمەڵە خەڵکێك خاوەنی خاسی‌یەت و سروشت و نەریت و ئاوات و ئامـانجی تایبـەتی خۆیـەتی. دەربـارەی ئەم جۆرە دیـاردەیـە چیـای ئالپ بە نمـونـە ئەهێننـەوە کە ئیتـالیـاو سویسـرەی لە یەکتـری جیـا کردۆتـەوە. هەرچـەندە هەندی دانیشتوانی سویسرە بەرەگەزوو رەسەن ئیتالین و کەوتوشنەتە ئەو دیو سنووری ئیتالیاوە.

سێیەم: ئەم نمونەیەی لەهی یەکەم و دووەم لا باشترە، ئەویش کە چیـابێت بە پشتیـوانێکی تونـدو تۆڵی سنـووری سیاسی‌و هیچ کیشەو بەرەیەکی لێ نەکەویتەوە.

وەهەر کۆمەڵە خەڵکیك ئازادانە لە هەریمی خۆیاندا بێ دەست درێـژی‌و بروییـانـو پێ گرتنی کومـەڵە خەلکێکی تر گوزەران بکەن. وەکو زنجیرە چیای ئەندیز کە وڵاتی شیلی لە ئەرجـەنتین جیـا کردۆتـەوە. هەروەهـا زنجیـرە چیـای هیمالایە کە هندستان و چینی لە یەکتری جیا کردۆتەوە.

بێگومان وەکو هەموو بووەکانی تری ئەم سەرزەمینە چیا بە تاقی تەنیا نە ئەبێت بە مایەی کۆ کردنەوەی گەلێك ونە ئەشبیت بە جیـا کەرەوەیـەکی تەواوو لە گوڕران نەهـاتـوو بەڵکـو ئەم دیـاردەیـە بەنـدە بە هیـزو توانـای نێـو دەوڵەتانی هەریمـەکـەو هیـزو توانـای نەتـەوە نیشتەجێ بووەکانی ئەم زنجیرە چیایانەوە.

هەروەکو دوکتور محمد ریاض ئەڵیت نەتەوەی کورد زۆر لە کۆنـەوە نیشتـەجێ‌ی زنجیـرە چیـاکـانی هەریمی هەر لە رۆژهـەلاتی ئەنـازۆلـەوە تا زنجیرە چیاکانی زاگرۆس بووە، کەچی بەدرێـژایی میـژوو کوردستـان دوای لەنـاوچـوونی ئیمپـراتـوریـەتی میدیا بەدەست ئیمپراتوری‌یەتە گەورەکانی ناوچەکە، عوسمانلی‌و سەفەوی‌و هی ئەورووپاش بەریتانیاو فەرەنساو قەیسری‌یەکانەوە نالاندویەتی.

وەبـەپێ‌ی قازانجی خۆیـان کوردستانیان هەلسوراندووەو ئەم پارچـەو ئەو پارچـەی کوردستـانیـان کردووە بە هەریمی جیـاکـەرەوە (منطقـة حاجـزە) لە نێـوان خۆیـانـداو ئیتـر چارەنـووسی کوردو کوردستـان و ئامـانـج و ئاواتی نەتەوەی

کورد بەپێی قازانجی جیوپولیتیکسی خۆیان پێشیل کردووە.

بە کورتی چیاو ناوچە چیاییەکان وەکو هەموو بووەکانی تری سەرزەمین و گەردوون لای چاك و بایەخداریان هەیەو لای لاوازو کەم خێرو بێخێریشیان هەیە. لەروی کشتوکالەوە ئەو ناوچانە زۆرتر بە کەلکی میوەو دارو درەختی گەورە دین، سەبارەت بەوەی کەکەمە دەشتن، دانەویلەیان کەم لێ بەرهەم دیت. بویە لە ناوچە شاخاوییەکانی ئەوروپا پیشەسازی میوە سازکردنیان تیا بەهێزو گەشەدارە. میوەی کەمپوت و مرەباو شەراب و ویسکی ئەو جۆرە خواردنەوە کحولییانەی کەرەسەی خاویان میوەیە.

لە لایەکی ترەوە هەلئەکەویت کە لەم ناوچە شاخاوییانە ئاسن و خەلوزو مس ونەوت و کانزای تریان تیا بلوزریتەوە جگە لە تاڤگەی ئاو کە کارەبای پێ بەرهەم ئەهێنریت. لەروی عەسکەریشەوە هەمیشە ئەم ناوچە شاخاوییانە یارمەتی گەلەکانی داون کە بەهێزیکی کەم و چەکی سوکەوە بتوانن روو بە رووی هیزیکی لە خۆیان گەورەترو چەکدارتر بوەستن وپاشەوپاش بەرەو دواوەیان بەرن، شەرە پارتیزانییەکانی گەلەکانی ئەوروپای رۆژهەلات و یونان و فەرنسا دژی نازییە داگیرکەرەکان بەڵگەی راستی ئەم لێکدانەوەیەیە.

**رووبارو سنوور:** رووبار زۆر ولاتی ئاوەدان کردۆتەوەو بۆتە هوی دامەزراندنی شارستانیتی رەسەن و گەورە وەکو شارستانیتی کونی چینییەکان کە بەهوی سێ رووبارە گەورەکەیەوە، هوانغهو ویانغتسیکیانغ و سیکیانغ دامەزراوە هەروەها شارستانیتی سومەرو بابل بەهوی دیجلەو فوراتەوە وەی میسر بەهوی رووباری نیلەوە..

وەرووبار بایەخێکی گەورەتری ئەبێت لەو دەولەتانەدا کە هیچ سنووریکیان ناگاتە سەر دەریا تەنیا لە رووبارەکەیەوە نەبێت وەئەو رووبارەی ئەبیتە سەرچاوەی هاتوچۆکردنی دەریایی.

ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە رووبار ئەبیت بە سنوور لەنێو دوو دەولەت یان چەند دەولەتێك دا. ئەم بوون بە سنوورەش گەلیك کیشەو بەرەو ناکۆکی لەنێو ئەم دەولەتانەدا هانیوەتە کایەوە. ئەمە جگە لەکێشەو بەرەی ئەو رووبارانەی کە سەرچاوەکەی لە دەولەتێك دایەو بەسەر چەند دەولەتێکی تردا ئەکشێت تا ئەرژیتە دەریاوە. ئەم جۆرە رووبارانە لەلایەك ئەم دەولەتانە بە هاوبەشیو هاو سوودی بەیەکەوە ئەبەستی لەلایەکی تریشەوە ئەبنە هۆی مەترسی پەیداکردن لە یەکتری وەکو رووباری نیل کە شا دەماری گوزەران و ژیانی گەلی میسرە، لەسەدا نەوەدی خەلکی میسری لەمبەرو لەو بەری کۆکردۆتەوە.

بۆیە هەموو جاریك کە مەترسی روو بکاتە سەرچاوەکەی خێرا کاربەدەستانی میسری، کاربەدەستانی حەبەشە کە سەرچاوەی نیلی لێ هەلئەقولێت ئاگادار ئەکەن کە ناتوانن چاوپوشی لە دەستکاری کردنی ئەم رووبارە بکەن. چونکە ئەم سەرچاوەیە بەناوچەیەکی دەرفەتداری (منطقة حيويه) میسر لە قەلەم ئەدریت.

دەربارەی سنوور کیشان دوکتور صلاح الدين علي شامی ئەرکی سنووری سیاسی رووبار بەم جۆرەی خوارەوە باس ئەکات:

1 - ناوەراستی رێرەوی رووبارەکە ببێت بە سنووری سیاسی.

2 - ناوەراستی رێرەوی لاقوولاییەکەی رووبارەکە کە کەشتیوانی تیا ئەکرێت بکرێت بە سنووری سیاسی.

3 - قەراغی ئەو دیوی رووبارەکە بکریت بە سنووری سیاسی بەم پێیە هەموو رووبارەکە ئەکەویتە ژێر دەسەلاتی دەولەتێکەوەو ئەوانی تری لێی بێبەش ئەکرێت.

بێگومان تا مرۆڤ بە چاکی لەپیت و بەرەکەت و بایەخی سیاسیو عەسکەریو جیۆپولیتیکسی رووبارێك تێ بگات پێویستە هەمووﻻیەنەکانی رووبارەکە بە باشی تێ بگات، چونکە رووبار هەیە بەناوچەی تەنگە و سەخت و قولدا ئەروات، هی تر هەیە بەناوچەی دەشتاییو پان و رێرەویشی هیمن و لەسەر خۆیە. هەروەکو هەندیك هەیە

وەرزە رووبارە واتە ساڵ دوانزە مانگە نی‌یەو رووباری تریش هەیە ئاوی وشك ناكات.

جگە لەوەی هەندی رووبار دەستكاری نەكریت لە ماوەیەكی كەمدا ریگای خۆی ئەگوریت كە ئەم ریگاگورینەش سەر لە دانەرانی سنوور ئەشێوینیت ویارودۆخێكی تر ئەهینیتەكایەوە بەڵام بەگشتی سەرچاوەی رووبارەكان سەبارەت بەوەی فرە لقن و كەمن بلاون بە كەلكی سنوور نیشانە كردن نایەن.

بو نمونە رووباری راین تا ئەگاتە دەریاچەی بودن (كونستانزە) هیچ سنووریكی پێ نیشانە ناكریت بەڵام دوای ئەوە ئەبێتە سنوریكی میژوویی لە نیوان سویسراو ئەلەمانیاوە ئەلەمانیاو فەرەنسادا. خۆ ئەگەر لەگەڵ رووبارەكەدا واریككەوت زمانی دانیشتوانی ئەم لاو ئەولای رووبارەكەو رەكەزو رەسەنیشیان جیاواز بوو وەكو سنووری بولغاریاو رۆمانیا لەم بەرو لەو بەری رووباری دانووب ئەوا سنووریكی ریكوپێك و دامەزراو بو هەر دوو ولات ئەكێشێت.

رووبەر (المساحە):

بۆ ئەوەی رەوتی سیاسی هەر دەوڵەتێك بە باشی بزانین پێویستە لەگەل مەرجەكانی تری دامەزراندنی دەوڵەتدا سەیری پان و بەرینی ئەو ەولەتە بكەین.

وەكو هەموو ئەزانین سەرزەمین هەر ئەوەندەیە كە هەیە لەوە زیاتر ناكشێت و گەورە تر نابێت بۆیە هەرچەندە دەوڵەتانی جیهان كەم بن یان زۆر هەر ئەبێت لەسەر روی ئەم سەرزەمینە جیگای خۆیا بكەنەوە. دیارە گەورەیی و پچوكی رووبەر یان ئەندازەی هەندەسی ئەو دەوڵەتە خاوەن ئەو پارچە زەوی‌یە، خاوەن سامان یان نیوە سامان یان هەژار ئەكات. بەڵام بە تاقی تەنیا رووبەرەكەی ئەدیاردەیەمان بۆ نیشانە ناكات.، بەڵكو چەند خاڵێك بەسەریەكەوە ئەبنە هۆی نیشانەكردنی ئەم لێكدانەوەیە.

ئەویش بریتین لە چرری‌و شاشی دانیشتوانی ئەو پارچە زەوی‌یەو چۆنیتی دابەش بوون بەسەر هەموو بەشەكانیا تا ئەم دابەش بوونە بگونجیت لەتەك بەرووبوومی ئابوری ولاتەكە دا. هەروەها ئایا داهات و كەرەسەی خاوو كشتوكاڵی لەو ئاستەدا یەكە بەشی ژیان و گوزەرانی خەلكەكەی بكات و لێشی زیاد بێت و بازرگانی...

لەگەل ولاتانی دەرەوەدا پێوە بكریت؟ هەروەها ئایا ریگای ئاسانی هاتووچۆكردنی ناوخۆو لەگەل دەوڵەتانی دەرەوەدا تیا مسوگەر ئەكریت؟ چونكە ئەم خالانە بەردی نباغەن تاكۆمەڵە خەڵكێك لەسەرپارچەزەوییەك بتوانن كۆببنەوەو ئاوات و ئامانجێك لە پێناوی پێكەوە ژیانىدا یەكیان بخات.

دوكتۆر صلاح الدین علی الشامی كەباسی ناوك (النواة) ئەكات كە بۆ دامەزراندنی دەوڵەت لەسەر پارچە خاكێك زۆر پیویستەو ئەڵێت «هەڵكەوتی سروشت كردیان هەلومەرجی نەتەوایەتی واتە نەتەوەیەكی خاوەن خاسی‌یەتی تایبەتی ئارەزووی پێكەوە ژیان بكەن یان قازانجی ناوكۆیی ستراتیجی بەیەكەوە بیان بەستێتەوە ئەم مەرجانە بۆ دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە ئەبن بە ناوك وەئەبنە سەرە پردیك سوودو قازانجی ناوكۆیی دروست ئەكەن».

سەرەرای ئەمە هەرباسی رووبەری‌و لاتێك گەورە یان پچوك هاتە پێشەوە شان بەشانی ئەمە خیرا باسی دەرفەت (المجال) یش دێت بەبیری زانایانی جیۆپۆلیتیكس یان ئەوانەی لەكلاو رۆژنەی جیۆپۆلیتیكسەوە ئەروانئە زەوی‌و زاری ولاتێك. بەڵام رووبەر باسێكەو شتێكەو دەرفەتیش شتێكی ترە وەهەندی‌و لات هەیە رووبەری خۆی لەچاو ئەو دەرفەتە (المجال)ی بەدەستی‌یەوەیەتی زۆر پچوكە وەكو جارانی بەریتانیا كە بەلای كەمەوە چواریەكی هەموو سەرزەمین دەرفەتی دەسەلاتی ئەو بوو. زانایەكی وەكو ریچاردهارتشرون بایەخێكی ئەوتۆ نادات بە پانایی كە باس لە هەلومەرجی دامەزراندنی دەوڵەت ئەكات.

سەربارەت بەوەی ئەڵەمانیا رووبەرێكی كەمی لەچاو دەسەلاتی ئابوری‌و پیشەسازی‌دا هەبوو رووی كردبووە پەیداكردنی دەرفەت (المجال). بەڵام ئینگلیزو ئەمەریكاییەكان چونكە تیرە زەوی بوون بە ئەندازەی

ئەلمانی‌یەکان ئەو بایەخەیان بەپەیداکردنی دەرفەت نەئەدا .

لەگەڵ ئەوەشدا خاتوئیلن سی . سیمپل جوگرافیازانی ئەمەریکایی بیروڕای خۆی دەربارەی ئەم باسە لە بیروڕای فردریك ڕاتزلی ئەلەمانی‌یەوە هەڵئەهێنجا ولەئەنجاما بیروراکانی کوتومت وەکو بیرورای قوتابخانەی هوسهوفەری ئەلمانی وابوو. لە باسێکدا ئەم خاتونە ئەمەریکاییە ئەڵێت «ناکۆکی لە پێناوی بوون و مانـدا لەنێوان گەلان و ڕەگەزە جۆربەجۆرەکانـدا خۆی لەخـۆیـدا ناکۆکی‌یە لە پێناوی دەست خستنی دەرفەت (المجال)دا بۆیە ئەبێ لە کۆری ئەم باسەدا بە وردی ئەو جیاوازی‌یەی نێوان ڕووبەر و دەرفەت تێ‌بگەین.

دوکتور علی المیاح ئەڵێت «دەرفەتی جوگرافی مانای جێگایەکی دیاری‌کراوو ناوچەیەکی خاوەن ڕووبەرێکی نیشانەکراوە کەچی واتای دەرفەت لە جیۆپولیتیکس دا ئاڵۆز ئەبێت و مانایەکی تر ئەدات بە دەستەوە».

دیارە دوکتور علی المیاح نیازی لەوەیە کە دەرفەت ئەو جێگایانەیە ڕەنگە بەپێ‌ی یاسایەکی باوەڕپێ‌کراوو پەیمانێکی مۆرکراوی بەراست زانراوی نێو دەوڵەتان نەخرابێتە ژێر دەسەلات و فەرمانڕەوایی دەوڵەتێکەوە کەچی ئەو دەوڵەتە بە ئارەزووی خۆی کەلکی لێ‌وەرئەگرێت بەڵام زەوی بەپێ‌ی هەموو هەلومەرجێکی نێو دەوڵەتان مولکی دەوڵەتێکەو بەسەربەستی مافی فەرمانڕەوایی تیا کردنی بەدەستەوەیە. وەدەرفەت لەگەوهەردا هەوڵی خۆگەورەکردن و کشان بەسەر خاکی گەلانی تر دا ئەگەیەنێت. ئەویش کە دەوڵەتێك پایەی ئابووری‌و پیشەسازی گەیشتە ئاستێکی زۆر لەخۆی بەرزتر ئیتر بەدوای بازارو کەرەسەی خاوو چەوسانەوەی گەلانی تر دە ئەگەرێت بەتایبەتی ئەگەر بناغەی ئەو دەوڵەتە لەسەر ئایدیولوجی‌یەتی سەرمایەداری دامەزرابێت.

سەربارەت بەوەی کە ئەم باسەمان بە دوورو درێژی لە ژمارەکانی پێشوی ڕوشنبیری‌دا شی‌کردوتەوە لێرەدا باسی بایەخی ڕووبەر (المساحە) ئەکەین ، باسی ئەو ڕووبەرانەی ئاسایشی وڵاتانیان پێ ئەپارێزرێت یان ئەبنە کومەك بۆ ئەم لایەنە.

لەم سەرزەمینەی کەتیایدا ئەژین و وڵاتی وەکو یەکێتی سوڤییەت و چین و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای لەسەرە کەڕووبەریان 8/386/332 میل چوار گۆشەو 3/756/102 میل چوار گۆشەو 3/734/000 میل چوار گۆشەیە وەدەوڵەتی وەکو موناکۆش هەیە ڕووبەری نیو میل چوار گۆشەیە. وڵاتی وەکو بەریتانیا کە لە کاتی خۆیدا حوکمڕانی چواریەکی سەرزەمینی ئەکرد ئێستا تەنیا 94/278 میل چوار گۆشەی بەدەستەوە ماوە.

بەڵام بە هیچ جۆرێك دەوڵەتە زۆر پچکۆلەکان هەر چەندە پایەی شارستانیتی‌و تەکنولوجی‌یان بەرز بێت هەر ناگەنە پلەی دەوڵەتی خاوەن ڕووبەری گەورەی بەپیتو بەرەکەت.

چونکە ڕووبەری پچوك جێگای خەلکی زۆری تێدا نابێتەوە بێ خەلکێکی زۆریش نەبەرهەم زۆر ئەبێت ونە سوپای گەورە دائەمەزرێت کە هەردووکیان پایەی بنچینەیی پێشکەوتن و شارستانیتی‌و خۆ لە دوژمن پاراستنن.

دیارە نیازیش لە ڕووبەر، زەوی‌وزاری بێ‌فەرو بێ بەرەکەت نی‌یە، چونکە وڵاتێکی وەکو ئوسترالیا کە پانایی 3ملیون میل چوار گۆشەیە هەر ئەتوانێت 30 ملیون کەس بە خێو بکات سەربارەت بەوەی تەنیا 1 / 8 ی زەوی‌یەکەی نیشتەجێ‌یە.

بەڵام فرە پان وبەرینی لە کاتی جەنگدا پایەیەکی بەرزو بایەخی گەورەی هەیە، عەسکەری‌یە ستراتیجی‌یەکان و زانایانی جیۆپۆلیتیکس بەم جۆرە وڵاتانە ئەڵێن لە قوڵایی وڵاتدا خۆپاراستن (DEFiNCE iN DEPTh) ئەم وتەیە ئەو وڵاتانەی سەر دەریاش ئەگرێتەوە کە بەهۆی هێزی دەریاییەوە ئەتوانن شەڕر لە خاکی خۆیان و سنووری ڕوو لە دەریا دوور بخەنەوە. یەکێتی سوڤییەت لە جەنگی دووەمی جیهانی دا بەشێك لە خاکی خۆی دا بە دەستەوە تا دوژمن بکەوێتە قوڵایی وڵاتەکەیەوە وئەوسا پاش

خۆئامادەکردن بە هێزێکی گەورەترو رێك وپێك ترەوە پەلاماری بداتەوەو تەفروتونای بکات. ئەمە لەلایەك لایەکی ترەوە ولاتی گەورە لە کاتی جەنگ دا بەشێکیشی دووچاری ویرانکاری بێت، بەشە زۆرەکەی تری بەسەلامەتی بۆ بۆ ئەمێنێتەوە بەلام ولاتی بچوك دوای سەرکەوتنیش ولاتێکی ویرانکراوی ئەکەوێتەوە دەست.

سەرەرای ئەمانە هەمووی، چەکی فرە کوژی نوێ چ ئوتومی و چ کیمیاوی وجورەکانی تریش ئەم بایەخانەیان لە ئاست و پلەی جارانیانا بەرەوە خوار خلیسکانووە.

**شێوە (الشكل):**

شێوەی دەولەت باسێ کە ئەمیش وەکو هەموو لایەنە جوگرافیەیەکانی تری ولات زانایانی جوگرافیای سیاسی و جیۆپولیتیکسی بەخۆیەوە خەریك کردووە. نیازیش لە شێوە ئەوەیە کە ئایا نەخشەی جوگرافی ئەو دەولەتە شێوە خرو چوار گوشەیەیان درێژ و کەمەرباریك یان دوو پارچەو سێ پارچەو چەند پارچەیە.

بێ گومان ئەگەر دەولەتێك خاوەنی هەلومەرجە بایەخدارەکانی تربێت شێوەی دەولەت بۆی ئەبێت بە پشتیوانێکی گەورە چونکە شێوە بەتاقی تەنیا کاریکی گرنگی ئەوتۆی پێ ئەنجام نادریت.

دکتور علی المیاح ئەلیت «ئەگەر درێژی سنووری ولاتێك لەچاو پانایی و لاتەکەدا تاکەمتر بێت ئەوە شێوەی ئەو ولاتە پەسند تر ئەبێت». ولاتێکی وەکو فەرەنسا یان هەنگاریاو رۆمانیا بو نمونەی باشی شێوەی دەولەت لەقەلەم ئەدەن. بەلام ولاتێکی وەکو نەرویج ئەگەر دووچاری هێرشی دەولەتێکی تر بێت لەماوەیەکی کەمدا بە ئاسانی پارچە پارچە ئەکریت. وەکو لە جەنگی دووەمی جیهانی دا ئەلمانەکان پەلاماریان داو هێزەکانی خۆیان بە ئاسانی هەر لە شاری نارڤیك ـ وە لەو پەری ژووروی نەرویجەوە تا شاری ئۆسلوی پایتەختی لە بەشی خوارووی ئەم ولاتە دابەزاندو بەم کارە پێوەندی نێوان ئەم شارانەو ناوەوەی نەرویجیان لەیەك ترازاند.

کەچی سەربارەت بەهەندی هەلومەرجی تر ولاتی شیلی کە خراپترینی شێوەی هەیەو درێژی سنووری ئەگاتە 2600 میل دووچاری پەلامارو داگیرکردن نەهاتووەو بەسەرهاتی وەکو فەرەنساو نەرویجی بەسەر نەهاتووە.

بەگشتی شێوە باشی و خاوەن مەرجە جوگرافیەکان بەتاقی تەنیا هەلکەوتێکی بایەخداری رێك وپێکی ولاتێکی پێ جێبەجێ ناکریت بەلام خۆی وەکو هۆیەك بارودۆخێکی باش بو ئەو ولاتە دێنێتە کایەوە. ئەم باروو دۆخەش لەکوری پاراستنی ئاسایشی ناوخۆی ولات و خۆپاراستن لە هێرشی دەرەوەدا کەلکێکی گەورەی ئەبێت.

بو نمونە پاکستانی جاران کە دوو پارچە بوو، پاکستانی رۆژهەلات (بەنگەلادیش) و (پاکستانی رۆژئاوا، سەبارەت بەوەی کە نێوانی ئەم دوو پارچەیە نزیکەی هەزار کیلومەترە ئەبوو، زۆر بە ئاسانی ئەم دوو پارچەیە لەیەك ترازینراو پاکستانی روژهەلات بەناوی بەنگلادیشەوە وەکو دەولەتێکی سەر بەخۆ هاتە کۆری دەولەتانی جیهانەوە.

ولاتی تریش هەیە وەکو یونان چەند پارچەیەکە، بەلام پارچەکانی ئەم ولاتە زۆر دوورو بلاو نین.

بێگومان لەم مەیانەدا یەکیتی نەتەوەو زمان گەلێك ناتەواوی شێوە دائەپۆشێت. لەوانەبوو ئەگەر خەلکی بەنگلادیش و خەلکی پاکستانی ئیستا لە تەك یەك ئایینی دا یەك نەتەوەش بوونایە ئەم دووری‌یە نەیوایە بەهوی لەیەك ترازانیان.

لەپاڵ ئەم شێوانەشدا شێوەی پەرشوبلاویش هەیە وەکو ئیمپراتوری‌یەتی بەریتانیای جاران کەهەر پارچەیەکی لە کوچەیەکی جیهاندا بوو.

ولاتی کۆو پر لەهێلی هاتوچۆکردن و یەك نەتەوەیان خاوەن یەك قازانج چاکتر ئاسایشی خۆی پێ‌ئەپاریزریت چ هی‌ناوەوە یان هی دەرەوە لە ولاتێکی فرەنەتەوەی شیرازە لاوازی بێ‌رێگاو بانی ئارەزوو جیاواز.

ولاتێکی وەکو یەکیتی سۆڤییەت سەرەرای ئەوەی فرە نەتەوەو فرە ئایین و فرە زمانە بەلام چونکە هەموو نەتەوەکانی

خۆیان بەرۆڵەی خاکی سوڤییەت ئەزانی و ولاتی سوڤییەت بە نیشمانی خوشەویستی خۆیان ئەزانی، لە جەنگی جیهانی دووەمدا وەکو یەك گەلی یەکگرتوو قارەمانانە چوونەوە بەگژ ئەڵەمانە داگیرکەرەکانداو دەستیان لە خەباتی چەکدارانەی دەوڵەتی و میللی هەڵنەگرت تا رژێمی هیتلەری یان لە بەرلین دا رمان.

**هەڵکەوتی پایتەخت:**

کە دەوڵەتێك هێرش ئەباتە سەر دەوڵەتێکی تر یان تاقمە عەسکەریك لە ولاتیکدا بیر لە کودتایەك ئەکەنەوە یان هیزێکی شورشگیری میللی دژی رژێمەکەی خۆی شورش بەرپا ئەکات هەموویان وەکو ئامانجیکی سەرەکی بیر لە گرتنی پایتەخت ئەکەنەوە، چونکە کە پایتەخت کەوتە دەست هەرلایەك لەم لایانە بەدەگمەن نەبێت ئیتر رژیمی پایتەخت لە دەست سەندراو کوتایی دیت.

بێگومان هەڵکەوتی پایتەختیش لەهەموو کات و زرۆفیکدا بەدەست دانیشتوانی یان فەرمانرەوایانی ئەو ولاتە نی یە.

بەڵکو شێوەی ولات دەستێکی گەورەی لە هەلکەوتن و جیگا نیشانەکردنی پایتەخدا هەیە. ئەگەر شێوەی ولات چوار گۆشەیی یان بازنەیی بێت ئەوا دامەزراندنی پایتەخت لەناوەراستی لاتدا کارێکی ئاسان و گونجاو ئەبێت وەکو شاری مەدریدی ئیسپانیایی کە کراوە بە پایتەختی ئەو ولاتە.

وەئەم هەڵکەوتنەی شاری مەدرید چ بو هەڵسوراندنی کاروباری بەریوەبردنی دەوڵەتی و چ بو پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ یان بۆ خۆپاراستن لە هێرشی دوژمن بایەخێکی زۆر شایستەی هەیە.

هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو سوڤییەتی یەکان ئەم راستی یەیان پێش بینی کردو پایتەختی خۆیان لە لەنینگرادەوە گواستەوە بۆ موسکو وە لەجەنگی دووەمی جیهانی دا سوودیکی زۆریان لەم پیش بینی یە دی.

هەروەها تورکە کەمالی یەکانیش پایتەختی خۆیان لە ئەستەموولەوە گواستەوە بۆ ئەنقەرە چونکە لەوەپیش ولاتانی بالقانیان بەدەستەوە بو، نەئەبوو پایتەختی خۆیان زۆر لەم ولاتە ژیردەستانەی خۆیان دووربخەنەوە ئەلەمانەکانی رۆژئاواش دوای جەنگی دووەمی جیهانی شاری بون - یان کرد بە پایتەخت تا لە لەشکری سووری سوڤییەتی دور بکەویتەوە.

کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سالی 1790 دا 13 پاریزگا بوو، واشنتون - یان کرد بەپایتەختی خۆیان چونکە ئەو کاتە ئەکەوتە ناوەراستی ئەم ولاتەوە.

بێگومان بەپێی گەورەبوون و پچوك بوونەوەی ولاتێك وکاروباری بازرگانی و پێوەندی ئەو دەوڵەتە لەگەل دەوڵەتە دراوسێکانیدا، شاریك بایەخداریان بێ بایەخ ئەبێت بو پایتەخت.

بویە ئیسپانی یەکان پایتەختی خۆیان لە یورجوس بو نالدولیلو بو تولیدو ئنجا بو مەدرید گواستەوە.

هەروەها رووسەکان لە کییف - ەوە بو سوزدال بۆ فلادیمیر بۆ مۆسکو ئنجا بو سان بترسبورگ جاریکی تر بو مۆسکو گواستەوە. هەروەها قبلای خان پایتەختی چینی لەکراکورمەوە گواستەوە بو خامپالیك (پەکین).

- داهاتی سروشتی و دەسەڵاتی پیشەسازی:

ئەگەر بەووردی سەیری میژووی مرۆڤایەتی بکەین بومان دەرئەکەویت کە باری ئابوری ناوخۆی دەوڵەتان ماکی هەموو ناکوکی و دوو بەرەکی یەکی ناوخۆو دەرەوە بووە. ئیستاش وەلەمەو واش باری ئابوری هەر بەردی بناغەی ژیان و گوزەران و خۆشی و ناخۆشی کومەلانی ئەم سەرزەمینەیە سیاسەتی دەرەوەی هەموو دەوڵەتێك ئاوینەی چۆنیتیێ ژیانی ئابوری یەتی، ئەو دەوڵەتانەی ئابوری یان پتەو بەهیزە ژیانی ناوخۆیان ئارام و لەسەرخۆو پێوەندی یەکانیان لەگەڵ دەوڵەتانی دەرەوەدا ریکوپیك و ناوبانگی دەرەوەیان بە هیزە، بە پیچەوانەی ئەمانە دەوڵەتە بێهیزەکان و ئابوری لاوازەکان هەمیشە خانە بەجەنگ و نا ئارام و قەرزارو سوکەسەنگن لە نیۆ دەوڵەتانی دەرەوەدا وەئەم

لاوازی ئابوری‌یە ناچاریان ئەکات سەر بۆ دەوڵەتی خاوەن ئابوری بەهێز شور بکەن و بەشێك لە ئازادی‌و سەربەخۆیی نەتەوایەتی خۆیان لە دەست بدەن.

گەربمانەویت سیاسەتی دەرەوەی ولاتێك لە تای‌تەرازوو بدەین وکیش و توانـاو خۆراگـری پێـوانـە بکەین ئەبێ پێش هەموو شتیك لە ئابوری ناوخۆی ئەو ولاتە بکوڵینەوە.

بۆیـە ئەوانـەی بەزانستی چیوپولیتیکـەوە خەریکن پێش هەمووشتیك بیر لە جوگرافیای ئابوری ئەکەنەوە.

بەرهـەم هێنـانی کەرەسـەی خاوو پیشـەسـازکـردنی بۆتە محـەکی جیـاکـەرەوەی دەوڵەتی هەژارو خاوەن سامان لەنێو دەوڵەتانی جیهان دا چونکە ئەمە نەك هەر لەکاتی ئاشتی دا بەکـەلکی خۆش گوزەرانی گەلیـك دیت و بەردی نـاغمەی سەرکـەوتنـەکـانیتی بەلکـو لەکـاتی جەنگیش دا کاروباری عەسکـەری دەزگـا پیشـەسـازی‌یە عەسکەری‌یەکانیش هەر بەکەرەسەی خاوو پیشەسازکردنی کەرەی خاو هەڵئەسورێن.

لەبــەرئــەوە هەنــدی دەوڵـەتی خاوەن سامـان و خاوەن دەستگای پیشەسازی بەهێز کە بۆ هەندی بابەتی کەرەسەی خاو دائـەمێنن، بیـر لە پەیـداکـردنی دەرفـەتی بایـەخداری ئابوری (المجال الحیوی الاقتصادی) یان بیر لە خۆ کشان بەسەرخاکی دەوڵەتانی‌تردا ئەکەنەوە، یان دۆستایەتی لەگەل دەوڵەتانی خاوەن ئەو کەرەسانە ئەگرن و پشت بەو دراوەی بەدستـیـانــەوە کەرەســەی خاوی پێــویــست بۆ پیشــە سازی‌یەکانیان مسوگەر ئەکەن.

لە چەرخەکاتی پێشودا یان هەر راست تر 3000 سال پێش زایینی میســرێکــان لە پێنـاوی دەستخستنی مس و بەردی بەنــرخ و مێتـاڵی تردا هەریمی سینـایـان خستـە ناو سنــووری خۆیــانــەوە. وەلـە ساڵی 17ی پێش زایینی دا سویــسرایـیـەکان بریاریان دا دەشت و کێو بکەن بە دانەوێلە تاکـو لە مەتـرسی برسێتی رزگـاریان بێت. ئینگلیزەکانیش لەســەرەتـاوە لە پینـاوی دەستخستنی خوری زوویـان کردە ئوسترالیاو ئەفەریقا.

وەلە ساڵی 1907دا هەر هەمان مەبەست ژاپونی خستە سەر فاکوفیکی داگیرکردنی کوریا.

دوکتـور علی المیـاح کەرەسـەی خاو ئەکـات بە چەنـد بەشێکەوە وئەلیت «هەرکەرە سەیەك بەرهەمی ناوخۆی کەم بوو ودەستگـا عەسکـەری‌یـەکان پیویستیان پێ هەبوو کە لە دەرەوە بیکرن و پەیدای بکەن بەو جۆرە کەرەسەیە ئەوتریت کەرەسەی خاوی ستراتیجی، بەلام ئەو کەرەسەیەی کەڵکی تایبەتی هەیەو پیویستە هەر لە ولاتی بیگانەوە پەیدا بکریت ئەوا بەوکەرەسەیە ئەوتریت (کەسەرەی مولەق CriticaL) ئەمجا بۆمسوگەر کردنی ئەم جۆرە کەرەسانە بیروڕای «شادەماری ژیـان» هاتـۆتـە نیۆ دەوڵەتانەوە کە دەسەلاتداریتی سیاسی‌و ئابوری دێنێتە کوری سیاسەتی دەرەوەی ئەو ولاتانەوە. هەر لەبـەرئـەمـەش بوو کە ئەڵـەمـانـەکـان پەلـەی داگیـرکردنی رومـانیـایـان ئەکـرد تا دەست بەسەر نەوتی رومانیادا بگرن هەروەها رووکردنە هەریمی قەفقاسیش لە جەنگی دووەمی جیهــانی‌دا هەر بۆ پەیــداکــردنی نەوت بوو. کەرەســەی ستـراتیجی چ کشتـوکـاڵی یان کانزایی بێت بەپێی جیگاو کات ئەگــورریت، لە کاتی خۆیــدا خێڵە رەوەنــدەکـانی مەغۆل بەدووی لە وەرگادا ئەگەران و هەردەستیان نەکەوتایە پەلامـاری ئیمپـراتـوری‌یـەتی چین یان ئەدا. دیارە ئەو کاتە لەوەرگا بۆ ئەم خێڵە رەوندانە بەکەرەسەیەکی ستراتیجی لە قەلــەم ئەدرا چونکــە ژیــان و گوزەران و دەرامــەتیـان لە مەروماڵات و ئاژەڵ دەست ئەکەوت. بەلام لە ولاتێکی‌تردا رەنگە نەوت و یان یورانیوم ببێت بەکەرەسەی ستراتیجی.

بێ‌گـومـان سەرچـاوە سروشتی‌یـەکـان هەر بەتاقی تەنیا دەوڵــەت بەهــیــزو توانــا ناکــەن ،ئــەبــێ لە پاڵ ئەم سەرچاوانەشدا توانای پیشەسازکردنیان هەبێت. وەبۆ ئەوەی دەوڵـەتێـك لەشـەرو ئاشتی‌دا پشت بەخۆی ببەستێت ئەبێ پیشـەسـازی‌یـەکی دوولانـەی هەبێت، لایەکی عەسکەری ئەوی تری ئاسایی ئەم دەستگایانەش بەسەرمایەو کەرەسەی خاوو دەستی کریکاروو شارەزایی پیشەسازی‌و تەکنۆلۆجیای بەرزو هەمەرەنگە هەلومەرجی سەرکەوتنی تەواو دێننە کایەوە.

دكتور على المياح بەرهەم هێنانی عەسكەریش ئەكات بە دوو بەشەوەو ئەڵێت «بەرهەم هێنانی عەسكەری مانای بەرهەمی عەسكەری‌و بەرهەمی مەرج داری عەسكەری‌یە.

وەبەشی یەكەم بەفرۆكەو تانك و تۆپ و گوللەی ئاراستە كراوو پاپوری جەنگی‌و هەموو بەرهەمێكی تری بۆ كاروباری عەسكەری تەرخان كراو ئەڵێت. بەڵام بەشی دووەم بەو بەرهەمانە ئەڵێت كە سەربازوو خەلكی ئاسایی وەكو یەك بەكاریان ئەهێنن. هەر لەسەر باسەكەی ئەروات و ئەڵێت «لەبەشی یەكەمدا كەرتی عەسكەری‌و كەرتی خەلكی (القطاع الخاص) بین بركی لەگەل یەكتری دا ئەكەن تاكو هەریەكەیان باشتر سەرمایەو كەرەسەی خاوو دەستی كریكاریان دەست كەویت، بەڵام لەبەرهەمی مەرج داری عەسكەری‌دا (انتاج عسكری مشروط) بین بركی لە بەكارهینان نەك لەبەرهەم هیناندا ئەكەوێتە نێوان عەسكەروو خەلكەوە.

لە كوتایی باسەكەدا ئەبی ئەو راستی‌یە بخریتە بەرچاو كە هەر دەوڵەتێك هەرچەندە پان وبەرین و خاوەنی كەرەسەی خاو وبێت هیشتا هەر هۆی ئەكەویتە كەرەسەی خاووی ولاتانی ترەوە.

بۆیە ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا نزیكەی بای حەوت ملیار دولار مس و توتیاو فافۆن وتەنجستن و جیوەو مەنغەنیزو كروم و كەسەرەی خاوی تری كریوەو لە گەنجینەدا بەیەدەگ هەڵی گرتووە.

هەروەها ئەڵەمانەكان نەخشەیەكیان بۆ دامەزراندنی ئیمپراتۆری‌یەتێكی ئەڵەمانی كیشابوو كەهەموو ئەوروپاو بەشێكی روژهەلاتی ناوەراست و ئەفەریقای ئەگرتەوە. بەو نیازەی لەبەروو بوومی ئەم ولاتانە كەلك وەرگرن و هەموو كەرەسەیەكی كشتوكالی وپیشەسازی بۆ خۆیان مسوگەر بكەن.

ئیتر بەشی پینجەمی ئەم باسە بۆ ژمارەی داهاتووی گوڤاری «روشنبیری‌نوی» كەكوتایی هەمووباسەكەی پی دێت. ئەوبەشەش دەربارەی بیرو باوەری جیوپولیتیكسانەی سەركردە سیاسی‌و عەسكەری‌و پسپورەكانی ئەم كۆرەی دەوڵەتە گەورە داگیركەرەكانی جیهان ئەبێت. كەهەر لایەكیان بەپێی رووبەری‌و وڵات و هەڵكەوت و دووروونزیكی لەدەریاوەو ژمارەی دانیشتوانی‌و پایەی تەكنولوجی ئابوری‌و عەسكەری خۆیان بیریان لەوبەشە هێزە عەسكەری‌یە كردۆتەوە كەلایان وابووە ئەتوانن هەموو سەرزەمینی پی‌بگرن.

هەندیك بایەخی گەورەیان بەهیزی پیادە داوەو هەندیك بەهی دەریایی‌و هەندێك بەهی ئاسمانی (هیزی‌فرۆكە)و ئیستاش رۆنالدریگن ـ ی سەرەك كوماری ئەمەریكاو دەزگا ستراتیجی‌یەكانی لایان وایە بەپەنابردنەبەر جەنگی ئەستیرە ئەتوانن دەست بە سەر جیهاندا بگرن.

لە سەرەتای ئەم بابەوە ئاتەواوبونی بەشی چوارەمی كەلك لەم سەرچاوانە وەرگیراوە.

1 ـ جیوپولیتیكس ـ الدكتور على محمد المیاح
2 ـ الاصول العامة في الجغرافيا السياسيه والجيوپوليتيكا مع دراسة تطبيقيه على الشرق الاوسط ـ الدكتور محمد رياض استاذ الخفرافيا بجامعة عين الشمس.
3 ـ دراسات في الجغرافيا السياسيه ـ الدكتور صلاح الدين على الشامى استاذ الجغرافيا بكلية الاداب جامعة القاهرة بالخرطوم.
4 ـ القانون الدستورى ـ نظريه الدولة ـ الدكتور منذر الشاوى.
5 ـ القانون الدولى الخاص وفق القانونين العراقى والمقارن ـ الدكتور ممدوح عبدالكريم حافظ.
6 ـ الخليج العربى دراسة الخغرافيا السياسيه ـ الدكتور صبرى فارس الهينى
7 ـ أ. سرالمعروف، مبدأ نكسن وكيسنجر في اسيا.
8 ـ تويبي منهج التأريخ وفلسفه التأريخ.
9 ـ الأمير
10 ـ اراء واحاديث اللغة والادب ـ ساطع الحصرى.

# سۆفیزم لە شیعری کوردیدا

پرۆفیسۆر دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسول

«کورتەی ئەوباسەیە کە لە ڕۆژی 3/2/1984دا لەهۆڵی بەشی ڕۆژ هەڵاتناسی زانستگایە ئازادی بەرلیندا خوێندرایەوەو لەلایەن قوتابی و مامۆستایانی بەشەکەوە موناقەشەکرا، ئەو موناقەشەکردنەو وەڵامدانەوەی پرسیارەکان باسەکەی قووڵترو فراوانتر کردوە.

شایانی باسە کە مامۆستا فەریاد فازیل عومەر وەرگێڕی بە ئەڵەمانیی ئەم کۆڕە بوو.

دیسان نەبوونی سەرچاوەی پێویست هەندێ پەنجەی بەسەر باری باسەکەدا بەجێ هێشتووە.

ع.م.ر

کە باسی «تەسەوف» لەناو کورددا دێتە ناوەوە. ماوەی زۆر باس و لێکۆڵینەوەی درێژهەیە، کە تائێستا کەمی نووسراوەو زۆری ماوە.

بۆ نموونە دەتوانین گەلێك سەرباس «عینوان» بۆ باس و لێکۆڵینەوەی لەمەودووای نووسەران و زانایانی کورد دابنێین، وەك:

مێژووی تەسەوف لەکوردستانا، پێوەندیی نێوان ئەو تەریقەتە سۆفی‌یانەی لە کوردستاندا هەن لەگەڵ ئاینەکانی پێش ئیسلامی ناو کورد.

زۆربەی کوردی موسوڵمان سوننی‌و شافیعین و مەلاکانیان بە عەقیدە ئەشعەرین و دوو تەریقەتە سەرەکی‌یەکەی ئێستای ناو کورد (قادری‌و نەقشبەندی) لە ناو ئەمانەدایە،[1] لەگەڵ ئەمانەش دا لەنێو کورددا هێندیك ئایین و ڕێبازی تریش هەن.[2]

شارەزایانی تەسەوف ـ سۆفێتی وسەر بەتەریقەتی سۆفێتی دەکەن بە دوو بەشەوە:ـ

أ ـ تەسەوف بە کردەوە (سولوك)، کەمرۆڤ خۆی تاقی بکاتەوەو ئەنجامی‌بدات، تا دەگاتە ئاکام.

ب ـ تەسەوف بەهۆی خوێندنەوەو تێ‌گەیشتن، وەکو زانیارییەك.

زۆر لەوانەی لە سەر تەسەوفیان نووسیوە ـ بە تایبەتی بەزمانانی ڕۆژهەڵات ـ بەشێکی گرنگ بۆ ئەدەبیاتی سۆفیزم یا ئەدەبیاتی سۆفیان تەرخان دەکەن، کە بەداخەوە لە کوردیدا کەمتر ئەمە کراوە. بەڵێ لە دیوانی چاپکراو و دەستخەتی زۆر لەو شاعیرانەدا کە بە بیر یا بە کردار سۆفی بوون، ڕەگەزی ئەم ئەدەبیاتی سۆفیزمە، یا بەشێکی گرنگ لە ئەدەبیاتی سۆفیزمی ڕۆژهەڵات دەبینین، بە لام کەمتر کتێب و لاپەڕەی تایبەتی‌یان بۆ تەرخان کراوە، یا دەستنیشان کراون.[3]

وەك وتمان دوو تەریقەتی سەرەکی لە کوردستانی ئەمڕۆدا قادری‌و نەقشبەندین. بەڵام لە کۆندا تەریقەتی نووربەخشی کە سەید محەمەدی نووربەخش ـ برای سەید عیساو سەید مووسا (یا شێخ عیسێ‌و شێخ مووسێ)ی بەرزنجەیی دایمەزراندووە، لە کوردستاندا باو بوو، تا سەید بابە ڕەسووڵ هات و تەریقەتی (عەلەوی)ی خستە پاڵ کە بەشێکە لە تەریقەتی (خەڵوەتی). ئەم دوو تەریقەتە لەناو سەیدەکانی بەرزنجەدا باو بوو و لە هەموو کوردستاندا. بڵاو بۆوە.

لەزەمانی سەید محەمەدی نۆدێیدا، شێخ ئیسماعیلی قازانقایە یا (ولیانی) کەکوڕی سەید محەمەد بوو هەر دوو تەریقەتی لەسەر دەستی باوکیدا وەرگرت و چوو بۆ بەغدا، لەوێ چاوی بە

شێخ ئەحمەدی ئەحسائی کەوت، بەیعەتی پێکردو تەریقەتی قادریی لێ وەرگرت و گەڕایەوەو لە گوندی قازانقایە جێ‌نشین بوو. خەڵك لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێکرد، زوربەی مەلای کوردستان و عیراق دووای کەوتن.

هەرچی تەریقەتی نەقشبەندیشە ئەوە بڵاوە کە مەولانا خالید (1777 ـ 1826) هێناویتە کوردستانەوە. بێگومان بەو شێوەی بەکۆمەڵ بوونە نەقشبەندی‌یە هەر لە زوور وولات و مەڵبەندی ڕۆژهەڵاتدا لە سەر دەستی مەولانا خالیددا بووە.

بەڵام کە بە ئەدەبیاتی کوردیی سەر بە سۆفیزمدا دەچینەوە، زۆر نموونەی ئەوە دەبینین کە ڕێو شوێنی نەقشبەندی یەکان لە کوردستاندا پێش ئەوەش زانرابێ، بەتایبەتی لای شاعیرێکی وەك مەلای جزیری.

نووسەری ئەم دێڕانە ماوەیەکی ژیان و بەرهەمی نووسینی خۆیی بو ئەدەبیاتی سوفیزم تەرخا نکردووەو تا ئیستاش ئەوداڵی ئەو پیشکە شکردنەی کتێبی ئەحمەد خانی، کە لێرەدا بەکوردی تۆماری دەکەمەوە گەورەترین بەڵگەی ئەم سەودایی کارمە:ـ

«باوکە...

ئەو کەسانە زۆرن کە لەکاروان و ڕێڕەوی ووشەدا بەرهەمی خۆیان پێشکەش بە باوکە کۆچ کردووەکانیان کردووەو بەمە دانیان بەهەقی پەروەردەکردن وچاکەپێزانیندا ناوەو خۆشەویستی‌یەکیان دەرخستوە، کە بەرامبەر بە باوك لە دڵی هەموو کەسێکدا سەر دەکات.

ئەبێ کێ بێ لە نەمامی خۆیدا شتێك لە باوکی نەبینێ و کێ بێ باوکی خۆی بەپیاوی چاك نەزانێ و یادی ئەو بەنەمر دانەنێت؟.

ناڵێم لە هەموو باوکان چاکترو مەردتر بوویت، ئەو زوڵمەش ناکەم کە جیاوازی و دیاریی تۆ لەناو باوکان و خەڵکدا دەرنەخەم.

ساڵێك تووشی سیل بووبوویت و لە مەسەحێکی سەر بەدێرێکی لوبنانیدا کەوتبوویت، لە کۆتایی قەسیدەیەکدا هاوارت کرد

سەفووت ئەمە سرێکە لە مزگەوتەوە بۆدێر
خۆ تۆ بەحسابێ لەهەوا خواهی مەدینەی

پەنهانیی بەری شانازیی من بە پەروەردەکردن و کارتێکردنی تۆوە وا لەم «سر»ەداو لێرەوە شتێك لە دەرووندا دەبینم کە بە ئەدەبیاتی سوفیزم و سامانی نەتەوەو بەچەپی سەربەست و شۆرشەوە پێکەوە دەبەستێ و منیش لەمەدا بەگونجاوی لە هەڵوێستێکی بەردەوامدام و لە قووڵایی دەروون و بوونمدا شتێك دەبینم کە خۆشەویستی‌ی سۆفیانی مەزن و تێکۆشەرە شۆرشگێرە مەزنەکان یەك دەخات و هەموویان بەو پیاوانە دەزانم کە لە کاروانی مێژوو و عیرفاندا دەرۆن و ئەو کاروانە بەرەوپێش دەبەن ئەوانەی لە نزیکەوە تۆیان نەدەناسی، دان بەم چاکەیەی تۆدا ناهێنن بەسەرمندا...

ئەوانەش کە پەی‌یان بەم (سر)ە نەبرد، تێگەیشتنی پێوەندیی بەتینی نێوان ئەم بە پەروشی‌یە جیاوازانەیان لە دەست چوو،

کە شەخسیەتی بەرزی خانی، وەك یەکێك لەو پیاوە گەورانە وێنەیەتی.

ئەگەر منیش توانیبێتم ئەم «سر»ە ئاشکرا بکەم، ئەوا ئەم بەرهەمەم شایانی ئەوەیە پێشکەش بە تۆ بکرێت»[4]

کە سەرسامی بەرامبەر بەم نهێنی‌یە نەما. ئەوسا دەتوانم بڵێم بەری سەرنج ڕاکێشەر لە بزووتنەوەی سۆفیزمدا لای من لە پاڵ بە دووای راستیدا گەڕانی سۆفیەکانی کۆن و قوربانی دانیان لەو ڕێگەیەدا، ئەدەبیاتی سۆفیزمە، بەتایبەتی ئەدەبیاتی بەرزی سۆفیانی ڕۆژهەڵات و ئەرکی لێکۆڵینەوەو پیشاندانی پەنهانی‌ی ناودێری سۆفیانەی شاعیرانی کوردیش ئەرکی ئێمەو هاوەڵەکانمانە.

بە تایبەتی ئەوانەی کە ڕۆژگار دەرفەتی ئەوەی داوونێ لە جەمسەرێکەوە پێوەندی‌یەکیان لە گەڵ جیهانی سۆفیزمدا هەبێت.[5]

ئەركی ئێمـــەیـــە كە بایـــەخی شیعـــری كەســانی وەك «بـابـەتـایـەرو مەلای جزیری‌و ئەحمەدی خانی‌و مەولەوی‌و مەحوی‌و ئەحمەدی كۆر»وا دەربخەین كە لەكۆڕی شیعری (حـــافـزو جەلالــەدینی رۆمی‌و فەریـدەدینی عەتتـارو عەلی شێرنەوایی‌و إبن الفارض)دا ناویان بێت.

لە هەندێ نووسینی لەمەوبەرماندا ستایشی ئاینیمان لە شیعـری تەســەوف جیاكردەوە. جیاوازی‌یەكەش لە وەدایە، كە ئەو شیعرە كوردی یانەی سەربەتەسەوفن، لەم پلەدا بۆ ئەو پلە پێـوەنـدی‌یـان بە (مقـامـات و احـوال)ی سۆفیـانەوە هەیــە، دیمــەنی خۆشــەویستی‌و جوانی لەو شیعـــرانــەدا دەبڕێتەوە سەر یەكێتی‌ی بوون (وحدة الوجود)ی سۆفیان، زۆر لە ئیستیلاحاتی سۆفیانەی تێدا بەكاردێت.

هەرچی ستـــایشی ئاینی‌یـــە، تەنـانـەت لای شاعیـری گەورەی وەك نالـی (1797 ـ 1855) ئەوە خۆی لەم جیهانی سۆفیانەیە بە دوور گرتووەو تەنیا دەربڕینی سۆزی موسوڵمانێكی خاوەن باوەڕە بەستایشی خواو پێغەمبەر ویارانی ئەو دەربـڕاوە. بەڵام لە ناو كورددا تەنـانـەت ئەم چەشنـە شیعـرانـەش لە دەرگـایـەكی تـرەوە هاتـوونەتەوە ناو جیهانی سۆفیـانـەوە. چونكـە دەروێش و سۆفیی كورد (بـەتـایبـەتی دەروێشی قادری بەدەم دەف لێدانەوە)، شیعری كەسانی وەك نالی‌و حەمدی‌و بێخود لە ستایشدا دەكەن بە كەرەسەی سۆزو وەجدی زۆیان و بە زەمزەمەوە دەیخوێننەوە.

بابـە تایـەری هەمدانی[6] خۆی لە ئیستیلاحاتی سۆفیزم بە دوور دەگرێ، بەڵام لە هەموو چوارینێكدا ئەو دیمەنی جوانی‌ی یارو دەشت و دەرو كێـوە دەبینێ كە (تـەجـەللا)ی جوانی‌ی پەروەردەگارە..

مەلای جزیـری كە نیسبـەتی خۆی دەداتـەپاڵ سەعدی‌و جامی‌و حافـــظ، ئەوەش لە یاد ناكـــات كە چ لە مەیـدانی شیعرداو چ لە مەیدانی سۆفیزمدا خۆی بە جیاواز دابنێت:

گەر لوئلوئی مەنسوور ژ نەزمی تو دخوازی
وەر شیعرێ مەلێ ببین تە بە شیرازی چ حاجەت

چونكە ئەم شاعیرە وەك رەندێكی خەراباتی، بە بادەی سۆفیتی مەست، خۆی دێنێتە پێشەوەو خۆیمان پێ دەناسێنێ:

ب حەق رەندێ خەراباتم ژ دێرێ ڤی دەمی هاتم
چ هێڤی هوون دكەن ئیرۆ ژ ڤی رەندی خەراباتی
د ئیقلیمێ سوخەن میرم، د شعریدا جهان گیرم
(ویعلو موكب العشاق في أعلام راياتی)

ئەم شاعیرە گەورەیە (1407 ـ 1481) كە دەتوانرێ بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی شیعری كلاسیكی كوردی دابنـرێت.[7] بەكـۆمـەڵی خاسیەتی تایبەتی شیعری خۆی‌و شیعـری كوردیی لە سەر بنـاغـەكـانی شیعـری ڕۆژهەڵات دامەزراندووەو لەوانیشی جیاكردوونەتەوە.

ئەوەی پێـوەنـدیی بە باسی ئەمـرۆمـانەوە هەیە كە باسی تەسەوفە لە شیعری كوردیدا ـ ئەوا دەتوانین ئەگەر هەموو شیعـری نەبێت، زوربـەی شیعـری مەلای جزیری بخەینە خانەی تەسەوفەوە.

كۆمـەڵێـك لە مەبـەسـەكـانی شیعـری سۆفی لە دیوانی مەلای جزیریدا كۆدەبنەوە.

دەیان ئیستیلاحی تەسەوف بە پەتەوی لە جێی خۆیداو بە مەبـــەسی پێـوەنـدی بوون لەگـەڵ جیهـانی سۆفیـزمـدا لەو دیوانەدا جێی كراوەتەوە.

هەر لە یەكـــەم لاپـــەڕەوە «ذات»و «صفـــات»و «أثـــار»و «اسم»ی «لم یزل» وەك شتێكی «مقـــدس» دەبنـــە ڕەمـزی «وجود»و لەگەڵ جوانی‌ی كەون و پەروەردگاردا لێكدەدەن:

حوسن و جەمالی خواست ئەڤین
ڤێكرا دیەك ذاتی جەڤین
نوورا قەدیم بوو عەشق وڤین
وان ل پێكڤە نازو عیشوەدا
عشق ژ نوورا (لایزال)
حسن و جەمالا بێ (مثال)
ئیساندی‌یە لمووم و شماڵ
دیسا خوە لێ پەروانەدا

ئیتـر پاش ئەمـە (عـدیم)و (قـدیم)، (ظـاهـر ومظهر)،

ارادة)و (اختیـار) دەبنـە «تـەجەلای وجوود» و وێنە نواندنی «نفحـــە»ی (روح القـدس)و چیـرۆکی دروستبـوونی کەون دەکەن بەفەیزی خوایی:

هەر یەك ژ فەیضا ئسمەکی
تێن صورەتا طلسمەکی
لەو مەعنەیا هەر جسمەکی
پەرتەو ژ نوورەك لێ ڤەدا[8].

مەلای جزیـری هەر لەم دیمـەنی کەونـەدا «عـاشق و معشـوق» دەکـات بەیـەك و بەدەرخـەری «صفـات» و لەو ڕێگەیەوە لە میحرابی (تەوحید)دا خۆی دەبینێتەوە.

مەلای جزیـری‌پێش ئەحمـەدی خانی لەسـەر پێـرەوی فیسـاغـۆرسیـەکـان و (اخـوان الصفـا) ئاسمـان بەنـۆ نهۆم (تـەبـەقـە) دەزانێ‌و یەکێتی‌یـەك لەنـاو بزووتنـەوەی بورج و ئەستێرەو مۆسیقاو سەمادا دروست دەکات و وەجدو زیکری سۆفیـان دەبـەستێت بەو ڕەگـەزانـەوە. ئەمـەش بۆ نووسینی مێژووی سۆفیزم لە کوردستانا گرنگی‌ی خۆی هەیەو ڕەنگە مەلای جزیری‌ی پێ بەرینەوە سەر تەریقەتی مەولەوی کە هەنـدێ ڕۆژ هەڵاتنـاس بە هۆی مۆسیقـاو سەمـای کاتی زیکرەوە بە «سووڕدەر» و «سەماکەر» یان ناو دەبەن.

مەلای جزیری لە پراکتیکی شیعرەکانی خۆیدا عەشقی «حـەقیقی»و عەشقی «مـەجـاز»ی سۆفیـان دەکات بەیەك و خۆی سەربـەو هەردوو عەشقـە یەکگـرتـووە دەزانێ، کـە کەمجار دەتوانین لە شیعرەکانیدا لەیەکتریان جیا بکەینەوە.

عاشق ئەر جارەك ژ بالا لێ بذەت بەرق مەجاز
دی لنك (صاحب) دلان حەتتا ئەبەد بت سەرفراز
کەشفی ئەسرارێ صفاتان بێ مەحەبیەت نابتن
صورەتی ئەسما دڤێتن دا بکین ژێ فەهم راز

لە ئەنجـامیـشـدا مەلای جزیـری هەمـوو عەشقی حیکایەت و ئەفسانەو ڕووداویی ئەم سەر زەمینە لە عەشقی. خوایێر ا کولا دەکا نەوە.

چونکـە جوانی‌ی هەمـوو یارێـك لای ئەو «تـەجللا»ی جوانی‌ی پەروەرگارە:

مەی نە نۆشی شێخی سەنعانی غەلەت
ئەو نەچوو نیف ئەرمەنستانی غەلەت
میسلی مووسا وی تەجەللایا تە دی
ئی تودی کانی خەتا هانی غەلەت

ئەو (تەجللا) یە لای مەلای جزیری هەر ئەو تەجللایەی لای زوربەی سۆفیانە کە وێنەی کۆنی لە کێوی (توور) ەوە دەست پێدەکات:

دل کعبەیە مەولایە لێ
ناری کەلیم ئیسایە لێ
بانگی (انا الله) دایە لێ
هەم کەعبەو هە (طور)ەدڵ

مەلای جزیـری مەستـی‌ی ژیـان و مەستی‌ی وەجـد دەباتەوە سەریەك (خمّ)ی سۆفیان و ئەم لە وەسفی (مەی) ەکەیدا گومان لە جۆری (مەی) دا ناهێڵێ:

ساقی ژ ئەزەل بە دوو قەدەح بادە ب من دا
هەتا ب ئەبەد مەست و خومارو تەلەسم دا

ئەوە (مەی)ی پیری سۆفیانەیە لای شاعیر دەروون پاك دەکاتەوەو (تەز کیەی نەفس) دەکات:

جامێ عشقێ پاکێ ڕۆحانی طهورا باطنە
ئێ نەنووشی هەر وەما حەتتا ئەبەد ناپاکی رووح

مەلای جزیـری وەك زۆر لە سوفی‌یـە مەزنـەکـانی پێش خۆی لە یەك تاودا (بە شێوەی (شطحە) یەکی سۆفیاندا، هەمـوو کۆشش و هەوڵی سۆفیـانە لادەداو (سۆفی) گەیشتنە پلە بە کارێکی ئەزەلی دەزانێ:

عاشقی مەستی ب عەشقی، نی‌یە حاجەت ب مەیی
واردی واردو ئەحووالی ب ئە و رادی کت
تە غەرەز ڤێك کەتنا یەك و لێك مورشیدی بت
سالك و طالبێ ئیرشادی ب بوغدادی چ کت
جەهد ئو سەعی‌و تەلەب ، بێ ئەسەرەك سافی نەهن
تو نەبی پەردەنشین چاکەرو قەووادی چ کت
چ ئەسەر دی ل بەری خارە بکت قەترەئی ئاب
قەلەمێ مە ب دوو سێ قەترەئی زوههادی چ کت

دێ ژ حەق جاذبەیەك دل بگرت وەرنە «مەلا»
ژ ئەزەل گەر توو هیدایەت نەبت ئیرشادی چ کت[9]

فەقێی تەیران (کۆتایی سەدەی شانزەیەم) تەجروبەی سۆفیـانـەی خۆی دەرێـژێـتـە ناو داسـتـانـی (شێخی سەنعان)ەوە. بەگشتی حیکایەتی شێخی سەنعانەکەی ئەمیش لەوانە جیا ناکرێتەوە کە لە ئەدەبیاتی رۆژهەلاّتدا پێش ئەو و پاش ئەو نووسراون، بەلاّم لە وورده شتدا (تفاصیل) جیاوازیی هەیە، ئەنجامیش هەر بە بەرزگرتنی خۆشەویستی یە، دانانی خۆشەویستی ی سۆفیانەیە بە کارێکی دەروونی ی دوور لە مەرجی کات و شوێن (زەمان و مەکان)و پایەی کۆمەلاّیەتیو تەمەن و ئاین و بەستنەوەیەتی بە باوەڕی یەکێتی ی بوون - (وحدة الوجود)ەوە.

لووتکەی ئەدەبیاتی (سۆفیزم)ی کوردی، بەلای ئێمەوە لە داستانی (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانی (1650 - 1707) دایە.

خانی لە پاڵ زۆر باسی فەلسەفیو ڕای فەلسەفی کە شاعیرانە لەدوو توێی دارشتنەوەی حیکایەتی (مەم و زین)ی ناو فۆلکلۆری کوردیدا جێگەی کردۆتەوە دەبینین خانی «تیتیۆلۆگیا - علم الکلام وفەلسفە تێکەڵ دەکات و بەرەو تەسەوفیان دەبا، زۆربە ووردی، فەیلسووفانە یەکێتی بوون (وحدة الوجود) و سۆفیانە یەکێتی ی شهوود تێکەل دەکات. لێرەدا ئەوقسەیەی پروفیسۆر ابو العلاء عفیفی ی بەسەردا دێتە دی کە دەربارەی فەیلەسووفە سۆفی یەکان ووتوویەتی: «سۆفێتی ی ئەوان ئەنجامی کارێکی فەلسەفی ی تازەیە لە مەیدانی ئایندا[5]

خانی تێکڕای داستانەکەی لە چوارچێوەیەکی سۆفیانەدا دادەڕیژێ، بەڵکو بەباسی سۆفیانە کۆتایی پێ دێنێ، وەك تەسەوف ئەنجام و مەبەستی ئەو بێ لەم هەموو لێووردبوونەوەیەی ژیانیو بیرو فەلسەفە، یا وەك ژیان و نەگەیشتنە ئەنجامی کۆنکرێتیو یەکسەر لەم لێووردبوونەوەیەدا شاعیری بەرەو گێژاوی بیری سۆفی بردبێت.

کە خانی لەگەڵ هەر یەکێك لە فەیلەسووف و سۆفیەکاندا بەراورد دەکەین شێوەی هەندێکیانی لادەبینین و دووبارەکردنەوەو ووتنەوەی بیری هەندێك لەمانە لەماناو ووشەیدا دەبینین. بەلاّم ئەم جیاوازیو تێکەڵیو هەمەڕەنگی یە لەبەر دەمی شەخسیەتێکی جیاوازدا دامانەنێت کەخوێنەرو وەرگرو ڕێگەگرە بەر (سالك)ە. ئەگەر لە تێکەڵ کردنی فەلسەفەو عیلمی کەلام و خۆشەویستی ی خوادا ڕێگەی غەزالی ی گرتبێ، ئەوا وەك ابن عربي بووە بە سۆفیو یەکێتی ی وجوودو یەکێتی ی شهوودی کۆکردۆتەوە. یا وەك حەللاج ڕێگەی لە خوادا فەنا بوون (الفناء في الله)ی گرتووەو هاواری (آنا الحق)ی لێ هەڵدەستێ بەلاّم هاوارەکەی ئەم، شێوەیەکی تری هەیە. هاواری خامەی هونەرمەندێکە ووردبوونەوەی خۆی بە زمانی قارەمان و کەسانی داستانەکەیەوە بگێڕێتەوەو لە نەخشەکێشانی وێنەیەکی تیۆریی بیری سۆفیزمەوە نزیك دەبێتەوە.

ئەگەر بەرنامەیەك بۆ بیری سۆفیزم دابنێین و لە داستانی (مەم و زین)ی خانیدا بۆ بەندەکانی ئەو بەرنامەیە بگەڕێین، ئەوا وێنەیەکی لە تەواوی یەوە نزیکی ئەو بەرنامەیە دەبینین.

ئەگەر بەناچاری بۆ ئەم باسە بچینەوە سەر ئەو کتێبەی دەربارەی ئەحمەدی خانی نووسیبومان، ئەوا لەسەر ناوی باسەکانی تەسەوفدا ئەم سەرناوو باسانە بە لێدوان و نموونەوە دەبینین:

**1 - زوهدو تەسەوف:**

هەر لێرەدا باسی زیکر دەکرێو جیاوازیی زیکری زمان و زیکری دڵ لای خانی کراوە. هەر لە بەدەم ئەم باس هاتندا هاتووینە سەر باسی عەشق و ووتراوە کە خانی دوو جۆرە عاشق دەبینێ.

کەسانێ کە لە دنیادا بە یەکتر گەیشتنیان دەوێت و بە بیری ئەو لە بەیەکتر گەیشتنی ئەو دنیا بێ بەری دەبن. یا دەیانەوێ لەو دنیا بەیەکتر بگەن بەوە لە بەیەکتر گەیشتنی

ئەم دنیا بێ بەری دەبن. هەردوو دەستەش بەلای ئەوەوە بە پێی (هیمـەت و ئیختیـار) لە شتێـك بێ بەری دەبن، هەرچەندە خانی بەگشتی لای وایە کە بەیەکتر گەیشتنی ئەم دنیا خۆشەویستی بەتاڵ دەکاتەوە.

خانی لە هەڵـوێستی فەلسـەفی‌ی خۆیـدا، کە هەندێك جار لەگـەڵ سۆفێتیـدا تێکـەڵـەو هەنـدێ جار لێی براوە، هەردوو چەشنـە خۆشـەویستی‌یـەکـە بە بەشێـك یا بە وەرگێـراوێـك لە خۆشـەویستی‌ی پەروەردگار دەزانێت. لای خانی وایە کە سۆفی‌ی ڕاستەقینە عاشقی ڕاستەقینەیە، هەر وەك خانی زانـاو زاهیـدو سۆفیش لەکـۆری ئاینـدا بەسێ جۆری جیاواز دادەنێ

لە باسی پێغمبەردا دەڵێ:

وەرعاوی وەرەنگ دین قەوی کر
شەرعی وی سیرات موستەوی کر
عالم هەمی میسلی ئەنبیانە
عابید هەمی جەمعی ئەولیانە

**2 ـ ئیستیلاحاتی سۆفیزم:**

ئەگەر هەرچی ئیستیلاحات هەیە کۆیان بکەینەوە، ئەوا خانی‌و سۆفیزم بە یەکدگیری دەبینین، بەڵکو قووڵ بوونەوە لە سۆفیـزمـدا بە خوێنـدنـەوەو کردار وای لێ دەکـات کە ئیستیـلاحـاتی سۆفیـان لە باسی سۆفیزمدا بەکار بهێنێ، یا بیخـوازێ‌و لە شوێنی‌تـردا بە کاری بهێنی. زۆرجـاریش لە داستـانـەکـەی خانیـدا هەر لەم دو جێگەیەدا ئیستیلاحاتی وەك: مریـد، هیمـەت، فنـاء ذوق، تجلی، سالـك، سالیکی مجرد... هتد دەبینی.

**3 ـ مەقامات و ئەحواڵ:**

هەرچـەنـدە خانی ناچێتـە ناو باسی تیـۆری‌و کۆری جیـاکـردنـەوەی (مـەقـامـات و ئەحـواڵ)ەوەو پلە بەپلە نایانگرێت، بەڵام دوو قارەمانی داستانەکەی لە فەسڵەکانی دواییـانـدا وەك دوو سۆفی نەخشـە دەکێشێ کە بەکـردار ڕێگـەی سۆفێتی یەکیـان گرتبێ کە بەم (مـەقـامـات و ئەحواڵ)ەدا بڕوات.

(مـەم)ی قارەمـانی ئەو کە دەخـرێتە بەندیخانەوە دەگاتە دووا پلەی (پـاکـردنـەوەی دڵ)، کە دووا پلەی ڕێبـازی سۆفێتی‌ی دەروێشانە.

(یـەقین) دووا حاڵی خانی‌یـە، تێکـەڵ بوونی گیـانی (مەم و زین) پاش مەرگی مەم بەحاڵی (یەقین) وەسف دەکات.

پێشاندانی مەسەلەی گیان لای خانی‌و گەشتی گیان بە ناو مەقامات و ئەحواڵدا، کەبریتی‌یە لە گیانی (مەم و زین)و گیـانی خانی خۆی کە لەو گەشتـەدا هاوڕێـانـە لە بەردەمی کۆمەڵە بیری خانیدا دەربارەی ئەم مەسەلەیە ڕاماندەگرێت و پێوەندیی ئەومان بە سۆفیانی‌ترەوە پیشان دەدات.

لەو کتێبەدا گەشتێکمان لە باسی (گیان)دا لەگەڵ خانیدا کردووە، دەبین خانی لە مەسەلەی گیان و یەکێتی‌ی لەش و گیان و جیاوازیاندا یا لە مەسەلەی (لاهووت)و (ناسووت)دا لەگـەڵ ئیفـلاتـوون و حەلـلاج و ئیبن سینادا یەکدەگرێتەوەو بیـری سۆفیـانی وەك (قـاشـانی)و (ابو بکری طمستانی) لە بارەی (گیان) ەوە بە چەشنێکی تازە دادەڕێژێتەوە.

خانی هەمـوو داستـانـەکەی خۆی بەجۆرێك لە گەشتی گیان و جۆرێك لە شهوودی گەیشتنە (مەقام) دادەنێ. هەر لەفـەسڵەکـانی سەرەتـادا کە داوای مەی لەساقی دەکات بۆ ئەوەی وەك مەل بکەوێتە ووتن و (ترنم)، کەشف و شهوود بە بەشێك لەنووسینی پاش مەست بوون دەزانێت.

دا کەشف بین لمن کەرامات
مەشهوود بین لمن مەقامات

خانی لە ڕەفتـاری (مـەم)و ژیـان و مردنیـدا شتێـك لە بینینی ئەحواڵ و مەقامات دەبینێ‌و لە مردنی ئەودا بەشێك لە باوەڕی خانی دەبینین دەربـارەی گیـان، هەرچـەنـدە دەیەوێ پاکانە بۆ خۆی بکات لە باوەڕ بە هەندێ شتی جیا لە شەرع و زاهیـری ئەو. خانی بە نەخشـەکێشـان باس لە (ئیلحـاق و ئیتیسـال)ی گیـان دەکـات، هەرچەندە بەووتن پاکانە بۆ ئەوە دەکات کە باوەڕی وابێت.

باسێکی گرنـگ لە بیـری سۆفیی خانیـدا ئەوەیـە کە

بەپێچــەوانــەی زۆر لە سۆفیــانـەوە کە دەبێ «دەستگـر» یا «مامۆستاو شێخ» یان هەبێ ئەم خۆی بە شێخ و دامەزرێنەر دادەنێ ، ئـەمـەش بە چەشنێکی زیـرەکـانـە دەردەبـرێ کە (مەم)ی قارەمانی داستانەکەی دەکات بە شێخی خۆی:

شێخی کو ب دل ئەز موریدم
ئەو روحی رەوان و ئەز قەدیدم
هەرچەند لبا وە ناڤی مەم بوو
لێ پادشەهەك عەلی هیمەمم بوو

گیـانی مەم لای خانی بەحـاڵی (ئـونس و طمأنینـە)دا رەت بوو و گەیشتـە (مـوشـاهـەدە)و (شهود)ێکی ناتەواو و (یـەقین)یش بە دووای ئەودادێت، کە بەرای سۆفیـان دووا پلەی سالێکە.

**4 ـ گەیشتنە پلەو فەنابوون لە خوادا:**

سۆفیـان دوو لایـەنی جیـاوازی یەکتر تەواوکەر لە ژیاندا دەبیین، کە لایــەنی کۆشش (مــوجـاهــەدە)و دەروون پاك کردنـەوەیـە لە پاڵ لایـەنی کەشف و ئیشـراقـدا هەندێکیان هیدایەت یارێگە بینینەوەبە بەری کۆشش دەزانن.

خانی مەسەلەی پاك کردنەوەی دەروون پیشان دەدات و بنـاخـەی کەشف وئیشـراقی تێـدا دەبینێ و شیعـری خۆیو داستـانـەکەی بەوێنەیەکی کەشف دەزانێت کە سەرچاوەکەی پاکـردنـەوەی دڵـە. هەروەك (مـەی)ی خوایی بەسەرچاوەی کەشف و ئیشراق و سەرەتای ئیبداع دەزانێت.

خانی (مەم)ی قارەمانی خۆی پاش کۆشش و دەروون پاکبـوونـەوە دەگـەیێنێتـە پلەی «قـوتب» یا «شێـخ کامیل» یا «شـاهـباز» . لـە وێنـەیەکی خەستیشدا کە لە دەورەی ژیان دەدوێـت و چەنــد لێـکــدانــەوە هەڵــدەگــرێت، دووای پەرەسـەنـدنی منـداڵ دەکـەوێت لەسکی دایکا تا لە دایك بوون و ژیان و بوون بە موریدی واسیل و ئەوسا وێنەکە لە وێنـەی ئینســانـەوە دەکـات بە وێنـەی (رووەك ـ نبـات)و لەپشت ئەو وێنەیەوە بیری سۆفیانەی خۆی دەردەبرێت.

خانی لەگەڵ سۆفیانیتردا دەچێتە ناو مەسەلەی شەرع و سۆفیزم، یا (باتین و زاهیر)ە وەو لە زۆر دێرە شیعردا تێکەڵ بەو موناقەشەیە دەبێت.

**5 ـ بوونی پێشووی گیان:**

خانی وەك زۆر لە فەیلەسـووف وسـۆفیـانی موسـولمـان دووای ئەو بیــرەی ئیفــلاتــوون دەکــەوێت، کە جیهـانی کۆنـکــرێـتیو جیهــانی سێبــەر هەبێو گیــان پێش لەش هەبوویێو لە گەلێك دێری مەم و زیندا ئەم بیرە دەردەخا.

**6 ـ شەریعەت و سۆفیزم:**

خانی وەك غەزالیو کەسانیتر دەیەوێ شەرع و سۆفیزم یا (زاهیرو باتین) یەکخات، هەر چەندە لە هەندێ شتی جیــاواز لەگــەڵ شەرعــدا باس لە دینی (عــەشقبـازی)و بەندە کانی ئەو دەکات.

**7 ـ باسی «نەفس و گیان»**

خانی وەك زۆر لە سۆفیان «نەفس» لە «گیان» جیادەکا تەوە، واتە نەفسی حەیوانی لای ئەو شتێکەو گیان شتێکیترە

**8 ـ رەوشتی سۆفیانە (آداب المتصوفە):**

کە هەواڵی وورد دەربارەی ژیانی خانی خۆی نەزانین، ئەوا لەرێی (مەم و زین)ە وە لە بیری ئەو دەربارەی رەفتارو رەوشت وورد دەبینەوەو ئەمەش لای ئەو هەر رەفتاری سۆفیانەیە.

ئەوانەی لە سوفیزم دوواون ئەم رەفتارانە دابەش د ەکەن بەســەر «رەفتــاری ژن هێنــان و خواردن و رۆژووگــرتن و برایەتیو جورئەتی ئەدەبیو دوعاو رێو شوینی»دا.

لای خانی هەمــوو رەگــەزەکـانی ئەم رەفتـارە دەبینین. هەرچـەنـدە بەرامبــەر بەژن هێنـان رای جیاوازی لادەبینی بەڵام هەڵـوێستی بەرامبـەر بەژن هەڵـوێستی سۆفیانەیەو لە ئەدەبیاتی ئینسانیی هاوچەرخەوە نزیك دەبێتەوە.

خانی داوای دوور کەوتنــەوە لە خۆراك و خۆشییــەوە دەکات، بەڵام پەسندیی شتی بۆن خۆش دەکات.

گەلی وێنــەی جوان بۆ برایــەتیو وەفــاداری نەخشــە دەکێشێو هەر لەو مەیدانەدا بەسوکی تەماشای (ماڵی دنیا) دەکات و داوای سەرف کردنی دەکات بۆ (برایەتی)و

کرداری چاکە.

رای خانی دەربارەی حاکمان، کە هەموویان لە «جنسی مار» دەبینێ. بەشێکـە لە ئازایـەتی و جورئـەتی ئەدەبیی سۆفیان. هەروەك بەشێك لە (مەم و زین)ە کەی دەچێتە ناو دوعای بەسۆزی سۆفیانەوە.

9 ـ **ئەدەبیاتی سۆفی:**

لەمەیدانی ئەدەبیاتی سۆفیدا ـ لە مەم وزینی خانیدا کۆمەڵێك باس و دێرو وێنەی بەسۆز دەبینین کە هەندێکیان دارشتنەوەی بەسۆزو کوردییانەی وتەی سۆفیانی ترەو هەندێکیان زادەی بیرو خامەی خانی خۆین. لەناو ئەو باسانەدا دەتوانین ئەم وێنانە بەدی بکەین.

«ستایشی پێغمبەر، خۆشەویستیی خوایی و باسی ئەو داستانی دڵدارییانەی خەڵك دەیانگێرنەوە یا نووسراون، خانی لەم باسەدا دڵی عاشق دەباتەوە بەرەو عەشقی خوایی و هەموو پێوەندییەکی نێوان ئەم عەشقانە بەشتێکی سەر بەجیهانی خواپەرستی دەبات و لەهەندێ بەراوردی ئەم دوو جیهانەی عەشقدا لە هەموو ئەدەبیاتی سۆفیی ڕەت کردووە، بەڵکو وای لێ دێت کە خۆشەویستیی لەش و گیان هەر بەیەك بزانێت.

10 ـ **مەی:**

باسی مەی لای خانی باسێکی بەسۆز و گەشەدارە هەرچەندە هەر لەم (مەم و زین)ەیدا سێ جۆرە باسی مەی دەبینین ـ باسێکی تەقلیدی بە تایبەتی لە سەرەتای فەسڵەکانیدا، باسی مەیی جیهانی، باس بردنەوە سەر مەیی خوایی.

11 ـ جیاکردنەوە یا یەك خستنی یەکێتیی وجوود لەگەڵ یەکێتیی شهوود دا، یەکێکە لەباسە گرنگەکانی نێدوانی فەلسەفەو سوفیزم ئەم تێکەڵییە هەندێ ڕۆژهەڵاتناسی وا لێکردووە کە بیری یەکێتیی وجوود بەبیری سەرەکی بزانن لە تەسەوفی ئیسلامیدا.

بە بەراورد لەگەڵ وتەکانی ئەبوویەزیدی بەسطامی و جونەیدی بەغدادی و شبلیدا کە باس لە وەحدەتی شهوود دەکەن و بەهاوتای (تەوحید)ی دەزانن و بە بەراورد لەگەڵ وتەکانی إبن عربی و (ئیفلۆتین)ی ئەسکەندەری و ئەشعەرییەکان و حەللاج دا دەگەینە سەر وێنەی یەکگرتی یەکێتیی بوون و یەکێتیی شهوودی لای حەللاج، لەرێگەی فەناوە.

سۆفیزم بەگشتی، دیاردەیەکی ئایدیالیستییە. پڕە لە ئارەزووی ئادەمیزاد بۆزانین و ناسینی کەون و لە زەحمەت کێشان لەپێناوی ئەو زانینەدا. هەروەك بەڵگەی سەرنەکەوتنی ئەو بیرەیە کە ئاین شیدەکاتەوەو سۆفیان پێیدەڵێن (زاهیر) لە ئیقناعی سۆفیدا، لەبەر ئەوە بە کۆشش (موجاهەدە) لەناو بیری غەیبیی ئایدیالیستیدا بۆ لێکدانەوەیەکی تر دەگەرێت (بەمەش دەووترێت باتین). ئەمە جارو بار پیاوی سۆفی لە گەیشتنە بنەرەتی مەتریالیی کەونەوە نزیك دەکاتەوەو هەندێ وتەی پێدەڵێ کە بە (شطحات)ی سۆفیان دەزانرێ.

یا دەچێتە ناو ئایدیالیستییەکی لە دین قووڵترەوەو ئەم دیمەنانەش هەموو خانیدا دیارن و بەمە وێنەیەکی ڕوونی بیری سۆفیی داوینێ.

داستانی مەم و زین لە پاڵ بایەخی ئەدەبیی گەورەیدا بەشێکە لە ئەدەبیاتی سۆفی و دەبێ لە کاتی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیاتی گشت ڕۆژهەڵاتدا جێی خۆی بدرێتێ.

ئەکادیمی ئۆربیللی خانی لەریزی فیردەوسی و ڕۆستاڤیلیدا دادەنێت.

بەڵێ ـ وەك ئەو دەڵێت ـ کورد ئەو شاعیرەی خۆیان بیرنەچۆتەوە، بەڵام دەبێ هەموو ڕۆژهەڵات و هەموو ڕۆژ هەڵاتناسانیش یەکێك لە شاعیرانی گەورەی ڕۆژهەڵاتیان لە بیر بێت، کە کارێکی ئیبداعیی گەورەی بەخشیوە بەڕۆژهەڵات، بەڵام تائێستا پشت گوێ خراوە.

پاش خانی گەلێك شاعیری ترمان هەن کە سەر بە جیهانی تەسەوفن، یا شیعرەکانیان دەچنە ناو ئەدەبیاتی تەسەوفەوە، مەولەوی عەبدولرەحیم (1221هـ ـ 1300هـ) یەکێکە لەو شاعیرانە کە دەبێ لەباسی ئەدبیاتی سۆفیدا

بەشی تایبەتی بۆ تەرخان کرێو لە هەموو مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا جێگەیەکی گەورەو شایانی بۆ دابنرێو لە چەند مەیدانێکدا بە سەر ئامەدا دانرێو لە شیعری تەڕو پرسۆزی بدوێین.

مەولەوی لە پاڵ ئەو شیعرانەیدا کە بەگیانێکی سۆفیانە نووسراون. بە کتێبی بە شیعر نووسراوی «العقيدة المرضية» و «الفضيلة» و چەندکتێبی‌تر لە ڕیزی دانەرانی ئەدەبی فێرکردن (تەعلیمی)ی سۆفیزمدا جێی خۆی کردۆتەوە.

مەحوی (1830 ـ 1904) دیسان لەو کەڵە شاعیرە سۆفیانەیە کە دەبێ باسی تایبەتی بۆ هەر دوو لایەنەکەی شیعرەکانی تەرخان بکرێت، چ ئەوانەی سەر بە سوفیزمن و چ شیعرەکانی‌تری کەئەوانیش بەتوندی عەشقی حەقیقی‌و مەجازی لە بابەتی شیعرێکی (دیریکی) جواندا جێگە دەکەنەوە.[11]

لە هەندێ سەرچاوەدا دیوومە کە شێخ ڕەزای تاڵەبانی (1835 ـ 1910)ەی شاعیری (سەتیرستی) کورد دەبەنە ڕیزی شاعیرانی سەر بەسۆفیزمەوە. ڕاستە ئەو بەشە شیعرانەی شێخ ڕەزا کە بوو ستایشی ئاینی تەرخان کراون سۆزی هۆرەیەکی دەروێشانەی لە دڵەوە هەڵقوڵاویان تێدایە.

لەم مەیدانەدا دەتوانین ناوی گەلێك شاعیری‌تر تۆمار بکەین وەك سابیری‌و مەلای جەباری‌و گەلێکی‌تر. دوو بەرگی تائێستا چاپ کراوی «یادی‌مەردان»و بەرگەکانی تری کەرەسەیەکی گەورەبۆ ئەم مەبەسە دەخەنە بەردەست.

کە باسمان لە «تەسەوف» کرد لە ئەدەبیاتی کوردیدا، دەبێ لایەك بەلای دیمەنی ئۆپۆزیت (دژ)ی مەسەلەکەشدا بکەینەوە.

لە شیعری کوردیدا نموونەی زۆرمان هەیە کە شاعیران دژ بە ئەم لایەن یا ئەو لایەنی تەسەوف یا سۆفی‌و دەروێش دەدوێن.

لەکاتێکدا کە تەسەوف لە سنووری تیۆری‌و کردار «سلوك»ی تاقە کەسییەوە بوو بە تەریقەت و ئەم تەریقەتانەش لە جیاتی ئەوەی لەسەر پێڕەوی دامەزرێنەران و سۆفییە بەراییەکان بڕۆن و دوژمنی شاه و سوڵتان و دەستداران و زۆرداران بن و دۆست و پشتگری هەژاران بن. بوونە دەستەیەکی تازەی فیئوداڵ لە وڵاتدا و سەر بەسوڵتان بوون و کەوتنە بڵاوکردنەوەی نەزانی‌و دواکەوتوویی‌و پڕوپووچ و خەرافات ،ئەوا دەنگ بەرامبەر بەم لایەنە هەر لە شیعری ئەوانەدا بەرزدەبێتەوە کە چ لەپێوەندیی ڕۆژانەدو چ لە زۆر لە شیعرەکانی خۆیاندا لەجیهانی سەر بە سۆفیزم دوور نین.

حاجی قادری کۆیی (1817 ـ 1897) لە ئەستەموولەوە بە شیعر نامە بۆ کوردستان دەنووسێ‌و داوا لەخەڵك دەکات کە واز لەتەکیەو چڵکنی‌و ڕیشی درێژو پرچی درێژی دەروێشانە بێنن و دووای شێخەکانیان نەکەون[12]

مەلا مەحمەدی کۆیی دەڵێ:

هەتا شێخێك لە کوردستان بمێنێ
ئومێدی زیندەگانیت پێ نەمێنێ
بە کەشکۆل و سوواڵ و فەقرو زیللەت
محاڵە کاکی خۆم تەشکیلی دەوڵەت

شێخ ڕزای تاڵەبانی دەڵێ:

لازمە بۆ شێخ سویەینان گورگە خەو
تابڵێن شێخ عابیدەو نانوێ بەشەو

مەحوی دەڵێ:

ڕیشێکی پان و تووکی بناگوێ درێژو لوول
سۆفی لەدینی لادە بەدیمەن لە جوو دەکا.

یا دەڵێ:

بە پێچی خواروخێچ ئیما دەکاپیری تەریقەت: بێ حەقیقەت پیرە زاهید پیرە، گوم کردوو تەریق ئەمما

یا دەڵێ:

واعیز، لە من بڵێ بە نەزەر تەعنە بەس بدا
دینی بتانە دینی من، ئەو مەزهەبی زەهەب

یا دەڵێ:

که شێخ و واعیزو سۆفی به جەنەت بەن گەدوگیاڵ
دەبێ ئەمسالی ئێمە بۆ جەهەنەم بەن سرو سیاڵ

یا دەڵێ:

شێخێ هەمەوەندێکی دەدا پەندو نەسیحەت
ئەو قوربەسەرەی دابووە بەر فەحش و فەزیحەت
خۆش هاتەجەواب و ووتی: تو حەقتە ،فەقەت من
قوتاعی تەریقم، نەوەکو قوتاعی تەریقەت.

ئەم نموونانە هەر لە شیعر ی، ئەوانەوە بوو، که وەك ووتمان خۆیان سەر بەجیهانی ئاین و سۆفیزمن. خو ئەگەر لایەنی‌تر بگرین، که زۆرتر هەموو نایدیالیستێتی‌و ئایدیالیزم دەگرێتەوە ئەوە نموونەمان زۆرز و لەم باسەی پێ‌دەچینەدەرەوە.

(1) ئەو مەسیحیانەی لە شارانی وەك هەولێرو سلیمانی وناوچەی عێنکاوەو رەواندزو حەریرو دیانەدا دەژین خۆیان به کورد دەزانن. زمانی کلدانی که لەماڵەوە پێی دەدەوین، زۆرتر لەزمانی ئاینی دەچێت و ئەمان لە زۆر ڕووەوە لەئاسووریی کوردستان جیاوازن که ئەوان زمانی جیاوازیشیان هەیەو خۆشیان به میللەتێکی سەربەخۆ دەزانن.

لە کوردستانی عیراقدا جوولەکەش هەبوون، ئەمانەش لە ماڵەوە بەکلدانی قسەیان دەکرد و لە دەرەوە به کوردی ،پاش ساڵی 1950 بەپێی پلانێك پاڵ بەهەموویانەوە نرا که بەرەو فەلەستینی داگیرکراو برۆن.

(2) ئەوەی دەربارەی کاکەیی نووسراوە هەمووی یازوربەی لە سەرچاوەی دەرەوەیە، واتە لەناو کاکەیی‌یەکان خۆیانەوە نی‌یە، لەبەر ئەمە ئەم چەشنە بەراوردە لە نێوان ئەوان و تەنانەت «درووز» یشدا دەگونجێ. هیوادارین لاوە کاکەیی‌یە خوێندەوارەکان به سەر گرێی باوەڕ شاردنەوەدا زاڵ بین و هەندێ شتی ڕاستەقینە دەربارەی ئەم ڕێبازەش بنووسن، که بەشێکە لە سامانی بیر لەمێژووی کورددا.

(3) دوو بەرگی یادی مەردانی زانای گەورە مەلا عەبدو لکەریمی مودەڕیس لەپاڵ لایەنی سۆفێتی خۆیدا گەلێك لایەنی ئەدەدبیاتی سۆفیزمیشی پاراست و هێنایە ناو کۆڕی لێکدانەوەی زانستی یەوە.

(4) بڕوانە: الدکتور عزالدین مصطفی رسول. احمدی خانی. شاعراً ومفکراً فیلسوفاً ومتصوفاً. بغداد ،1979. ص3،4

(5) که ووتمان سۆفیزم بەبیرو بەکردار (فکرو سلوك) جیان. دەتوانین بڵێین ـ نووسەری ئەم دێرانە به تەریقەت وەرگرتن و کردار پێوەندیی به جیهانی سوفیانەوە نی‌یە، بەڵام کورد ووتەنی ـ بەبنەماڵە زۆر پێوەندیی لەگەڵ ئەو جیهانەدایەو هەر ئەوە به ئەدەبیاتی سۆفیزمی‌یەوەی بەستووە.

(6) ـ لەووتاری رابوردوودا ووتم:

زوربەی مێژووی ئەدەبی کوردی نووسان لەسەر ئەوەن که بابەتایەری هەمدانی (935 ـ 1010)م شاعیری کوردەو چوارینەکانی ئەو سەرەتای دیاری شیعری کوردین.

(7) ئەم بڕیارە ناکۆکی‌ی لەگەڵ ئەوەدا نی‌یە که بابەتایەر به شاعیری کورد بزانین ،یا بڵێین پێش مەلای جزیری شاعیرمان نەبووە، چونکە یەکەم شاعیر که به پێی مێژوو تائێستا دیوانی تەواویمان دەستکەوتبێت و دیوانەکەی هەموو مەرجەکانی دیوانی کلاسیکی‌ی شیعری تێدا بێت ئەوەمەلای جزیری‌یە.

(8) یا دەڵێ:

دڕێاو ان خەت و خالان کو نە حەرفێن قەڵەمینە
مە ژ فەیزا تەیە مەستانە ڕەوان جامە لەبا لەب

یا: قەلبێ مە شوبهی زێڕێ ژ فەیزا تەجەللا گرت
ما ڕوو سیەهـ و صفری صفەت ڕەنگی صەفاگرت

(9) ئەم بیرە لای سۆفیی تریش هەیەو دەیبەنەوە سەر ئایەتی (125 ـ الانعام) قورئان.

(فمن یرد الله ان یهدیه یشرح صدره للاسلام و من یرد ان یضله یجعل صدره ضیقاً حرجاً کأنما یصعد في السماء).

(10) الدکتور ابو العلا عفیفی، التصوف ـ الثورة الروحیة في الاسلام، القاهرة 1963، ص14.

(11) بۆ ئەوەی لە نرخی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیاتی سەر بەسووفیزمی ئەم دوو شاعیرە مەزنە کەم نەکەمەوە. ناچمە ناو کۆڕی لێکۆڵینەوەی کورتیانەوە. هیوا دارم دەرفەتی‌ترمان بۆ باسکردنیان دەستکەوێت.

(12) ئەمە لەکاتێکدا که حاجی قادر ستایشی مەولانا خالیدی نەقشبەندی دەکات.

# نالی و ئەدەبیاتی دراوسێی

د. أمین علی موتابچی
زانکۆی بەغدا
کولیجی ئەدەبیات

## پێشەکی: -

دامەزرێنەرو مامۆستای شیعرو ئەدەبیاتی کوردی سەردەمی میرنشینی بابان حەزرەتی نالی، یەکێکە لە ئەستێرە گەشەکانی ئاسمانی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی.

نالی هەروەکو جزیری لە شێوەی شیمالی‌داو خانای قوبادی‌و بێسارانی‌و مەولەوی لە شێوەی گۆرانی‌داو بابەتایەری عوریان لە شێوەی جنوبی‌دا، خاوەنی قوتابخانەیەکە کە هەر ئەو قوتابخانەیەیە تا ئێستا بۆتە بنکەو ناوەرۆکی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی.[1]

نالی هەر وەکو هەموو شاعیرێکی کوردو، شاعیرانی دراوسێ‌و شاعیرانی وولاتانی دی، شیعرو ئەدەبیاتی شاعیرانی کوردی پێش خۆی‌و شاعیرانی دراوسێ‌ی لەبەر هەمەکانیا ڕەنگی داوەتەوە، ئەمەش وەکو یاسایەك وشتێکی ئاسایی وایە، چونکە کاریگەری شاعیرانی خۆو دراوسێ دەورێکی باڵای هەیە لە بۆ ئاڵ کردن و پوختەکردنی هەر شاعیرێك لە هەر نەتەوەو زمانێك دا.

چونکە دەبێ شاعیر شیعری شاعیرانی پێش خۆی‌و هاوچەرخی بزانێ‌و شارەزایی هەبێ لە شیعری شاعیرانی دراوسێ‌ی‌دا، لەبەر هەر هۆیەك بێ. «نظامی عروضی» لە «چهار مقالە»دا لەژێر بابەتی «چۆنێتی شاعیرو شیعر»دا دەڵێ:

«.. ئەما شاعیر بەو پلەیە ناگاێت «بە واتا ئەو پلەیەی کە ناوو نیشان و بەرهەمی بمێنێ‌و بنووسرێتەوە» مەگەر لە هەرەتی لاوی‌داو لە رۆژگاری گەنجی‌دا بیست هەزار بەیت لە شیعری پێشینیان لەبەرکات «فێری بێت»و دە هەزار لە بەرهەمی دواییەکان «متأخران» لەبەر چاوی بێ. وە هەمیشە دیوانی مامۆستایان بخوێنێتەوە و فێری‌بێ بۆ ئەوەی بزانێ ئەوان چۆن لە تەنگانەو ووردی قسە رزگاریان بووە، تاکو ڕێگاو جۆری شیعر لە تەبعی ئەودا نەخش ببەستێ‌و عەیب و هونەری شیعر لە لاپەرەی هۆشیا بچەسپێ، تا «شیعری» ڕوویکاتە پێش کەوتن و تەبعیشی بەلای بەرزی‌دا.[2]

نالی شارەزاییەکی تەواوی هەبووە لە زمان و ئەدەبیاتی عەرەبی‌دا، چونکە زمانی قورئانی پیرۆزەو خۆشی پیاوێکی بەدین و عالمێکی دیندار بووە. جگە لە عەرەبی لە زمان و ئەدەبیاتی فارسیشی‌دا دەستێکی باڵای هەبووە هەروەها لە زمانی‌و ئەدەبیاتی تورکیش دا. لە فارسی‌دا ـ هەروەکو لەدواییدا باسی دەکەین ـ بەهۆی ئەوەی کە زمانی فارسی زمانێکی زانستی‌و ەبی بووەو تەنانەت کورد لە ئەلف وبێ‌یەکەیەوە بیگرە تا

عەروزو قافیـەو، زاراوەی ڕێـزمـان لە ڕێگـای فارسی‌یـەوە وەرگـرتـووە. جگـە لەوەی کە گەڵێ کتێب و نووسـراو کە لە مزگـەوتـەکـانـدا دەخـوێنـرا بە فارسی بوون. هەروەهـا هەر ئەم شارەزاییەی خوێندەوارانی کوردی ئەو سەردەمە لە فارسی‌دا وای لێ‌کـردون تەنـانـەت پەخشـانیش بە فارسی بنـووسن، بۆیـە پەخـشـانی کوردی ـ جگـە لەوەی کە دەم بەدەم وەرگیـراوە لە چیرۆك و داستان و مەتەڵ کە بۆمان ماوەتەوە ـ بەشێوەی نوسین بە واتـا تۆمـارکـراو تائێستـا شتێکی‌وامـان بەدەستـەوە نی‌یـە کە مێژووەکەی پێش پەیدابوونی شیعری کوردی بێ، وەیا لەگەڵیا پەیدابووبێ.

بەڵام شارەزاییەکەی لە تورکی‌دا شتێکی ئاشکرایە چونکە ئەو بەشـەی لە وولاتـی نالـی ئەو سەردەمـە لەژێر فەرمـانـداری حوکمـومـەتی عوسمـانی‌دا بووەو زمـان و ئەدەبیـاتی عوسمانی تا ڕادەیەك باو بووە. جگە لەمەش نالی ساڵانی دوایی عومری لە ئەستەموڵ پایتەختی عوسمانی ڕابوردووە.

جەنابی مامۆستا مدرس لەم بارەیەوە دەفەرموێ:

«نـالی لە سەرەتـای چەرخی نۆزدەهـەمـدا ژیـاوە. لەو سەر دەمەدا زمانی باوی ئەدەبی بریتی بوە لە زمانی عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی، چونکە کوردستان یا سەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی یا ئێـرانی بووەو زمـانی ڕەسمی یا فارسی یا تورکی بوە، بێجگـە لەوەش کە زمـانی عەرەبی زمـانی ئایینی پـیرۆزی ئیـسلام بووەو کوردستـانیش تێکـڕا یەکێـك بوە لە وڵاتە ئیـسلامەکان. سەرەڕای ئەوە کە نالـی خۆیـشـی خوێنـدەوارێـکـی ئایینی‌و مەلایـەکی موسـوڵمـان بووە. جا بۆیـە، نالی ئەگـەر چی بەشی زۆری شیعری بە کوردی وتوە، شیعرەکانی وشەی زۆری فارسیان بە دەس کاریـەوە یا بێ‌دەسکـاری تێـدایە. هەروەها وشەی زۆری عەرەبی‌و زاراوەی ئایینی‌و زاراوەی زانیارییە ئاینیەکانی وەك فیقهو ئوصـولی دین و مەنطیق و فەلـەکیـاتیـان تیـدایـە، کە بە شێوەی ئیقتبـاس و تەلمیـح بەکـاری هێنـاون. ئەو شیعـرانـەی کە لە «موناجات»و نزاو پاڕانەوەدا وتوونی هەموویان ئەنجامی ئەو کارە کاریگـەرەن کە ئایینی ئیسـلام لە ناخی دەروونیـدا کردوویـەتی

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە زیرەکی‌و توانایی نالی لە زمانی کوردی‌و زمـانـەکـانـی دراوسێ‌دا وای لێ‌کـردووە کە ئەگـەر شاعیرێکی خۆمانە وەیا دراوسێ کاری‌تێ‌کردبێ، بە جۆرێکی‌وا ئەو بیـرو خەیـالـەی داڕشتـووە کە زۆر بە زەحمـەت هەستی پێ‌بکـرێ. جگـە لەوە دەبێ بزانین، کە ئەگـەر هاتـوو بیـرو خەیاڵێك لەلای شاعیرێك وەیا چەند شاعیرێکی خۆ یا دراوسێ لەیەك بچن مەرج نی‌یە لە هەموو جارێکا لەیەکتریان وەرگرتبێ، خۆ ئەگـەر لە جاریـەکـا نالی وەری‌گـرتبێ بە شێـوەیەکی تایبەتی خۆی وای‌داڕشتووە کە کردویەتی بە خۆماڵی. ئەم هونەرە باوەو هیچ کەموو کوڕیەکی نی‌یە بۆ شاعیری دووەم.

بەڵام ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە چونکە شاعیرانی ئەم ناوچەیە لەژێـر کاری‌گـەری زمـانی عەرەبی‌دا بوون (ج ئێرانی‌یەکان و چ تورکەکان) ـ بە واتا لەژێر کاری گەری قورئانی پیرۆزو بەلاغەو بەدیعی عەرەبی‌دا بوون، هەروەهـا ناوچـەو باری کۆمـەڵایـەتی‌و نزیکی‌و فەرمـانـڕەوایی وای‌لێ‌کـردوون کە تا ڕادەیـەك بەتـایبەتی شاعیـرانی کۆنمـان لە ڕووی هەست و بیـرو خەیـاڵـەوە زۆر لە یەکـەوە نزیـك بن جگـە لەوەی کە نزیـکی زمـان لە نێـوان هێندێکیاندا ڕۆڵی گرنگی هەبووە ـ هەروەکو گوتمان چونکە نالی وەستـاو بلیمـەت بووە لە شیعـردا، ئەگەر بەرهەمێکی شاعیرێك وەیـا چەنـد شاعیـرێکی دراوسێ کاری‌تێ‌کـردبێ بەئـاسـانی دەرنـاکـەوێ. وەستـایی نالی‌و شارەزایی لە هونـەری «بـدیع»داو بەکـارهێنـانی ئارایش لە قسـەداو بەخشینی گیانی کوردی بەسەر شیعـرەکـانیـدا ـ هۆن بۆ ئەوەی کە هەستی پێ‌نـەکـرێ. بە پێچـەوانـەی نالی‌یـەوە شاعیـرانی بەرزی کورد وەکـو جزیـری مەولەوی، خانی، فایەق، سالم، شیخ ڕەضا محوی تا دەگاتە پـیرەمـێـردو بێـخـودو شیـخ نوری‌و گۆران، کاری‌گـەری شاعیرێکی‌دی ئەگەر خۆیی بێ وەیا دراوسێ پێوەیان دیارە.

کاری‌گـەری هونـەری بەدیـع لەسـەر نالی زۆر ئاشکرایە، وە دەبـوایـە نالی نازنـاوی «بـدیـع»[4] بوایـە هەروەکـو چۆن چەنـد شاعیـری بەنـاوبـانگ هەن کە نازنـاویان «بدیع»ە وەکو «بدیعی بلخـی» ئێـمـە دەتـوانـیـن بڵێـن نالـی لە ڕوی تەڕوپـاراوی

غەزەلەکانی‌یەوە حافزی کوردە.[5]

من لەم چەند لاپەرەیەدا بەپێی توانا ڕەنگ دانەوەی زمان و ئەدەبیاتی عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی پێشان دەدەم ئەویش بەم جۆرە.

1 - بۆ عەرەبی:

أ ـ ئەوبـەیت و نیـوبـەیتـە عەرەبیانە دەخەمە بەرچاو جگە لەو بەیت و نیو بەیتانەی کە ووشەکانی عەرەبین و بە شێوەی کوردی دەری‌بڕیون و تەنها حەرفی (جر ویا عطف)ی لەگەڵدا بەکارهێناون.

ب ـ ئەو اقتبـاس و ئیشـارەتـانـەی کردونی بۆ ئایاتی قورئان و حەدیثی پێغەمەر (ص).

ح ـ داستان وحیکایاتی قورئان و پێغەمبەران کە لە بەیتەکانیا ئیشارەتی بۆ کردوون.

د ـ ئەوەی شایـاتی باسـەو جێی سوپـاسـە جەنـابی مامۆستا (مـدرس) لە دیـوانـەکـەیدا لە هەر بەیتێکا ئیشارەتێ یا ئیقتباسێ بووبێ پێشانی‌داوە، بەڵام ئەوەی من لێرەدا دەیکەم ئەوەیە کەمێ درێژترو بەژمارەوە ئەو ئایەتانە پێشان دەدەم لەگەڵ هێندێ بۆچوون دا.

2 - بۆ فارسی‌و تورکی‌یەکەی لە شوێنی خۆیدا پێشان دەدرێ.

بۆ نووسینی ئەم باسە پەیرەوی ئەم شێوەیەم کردووە:

1 ـ دیوانی نالی ـ مدرس ـ م کردووە بە ئەساس.

2 ـ بۆ ئەوەی خوێنـــەر مانـــدوو نەبێ لە بۆ دۆزینـــەوەی ئەو بەیتـەی کە قســـم لێـوەکـردووە، ژمـارەی غەزەلـەکـەو حەرفی غەزەلەکەو لاپەڕەکەشیم دەست نیشان کردووە.

3 ـ ئەگەر بەیتێك پێویستی بە شەرح و روون کردنەوە بێ - خوێنـەر دەتـوانێ سەیـری شەرحـەکـەی بکات لە دیوانی نالی - مدرس - دا. چونکە بە پیویستی نازانم جارێکی‌تر، شەرحەکەی (مـدرس) لێـرەدا بنـووسمـەوە خوێنەر یەکسەر سەیری «مدرس» بکات، باشترە.

وە ئەمـــەی لەم چەنــد لاپـەڕەیـەدا کە دەیخـەمـە بەرچـاوی خوێنەرانی بەرێز دڵۆپێکە لە دەریای شاعیرێتی بێ‌پایانی نالی، وە ئەمـە هەروەکـو دەڵێ مشتێ نمـونـەی خەروارێکە چونکە من ناتوانم بڵێم هەموو شتێکم پیشان داوە، ئەمە وەکو سەرەتایەکە بۆ باس و نووسینی‌دی کە شارەزایـــانی گیـانی نالی دەتـوانن حەقی خۆی بدەنێ.

1 ـ غەزەلی 1/أ ل75.

**جان بەر لەبی بۆسەی لەبتە عاشقی زارت**

**«فالبائس یستوهب من فیك معاشا».**

**«لاحول ولاطول ولا قوة الا**

**باللە، لە القدرةُ، والکائنُ ماشا»**

**نالی نییەتی سیحری بەیان، حیکمەتی شیعرە**

**ئەمما نییەتی قووەتی دڵ، قودرەتی ئینشا**

مامۆستا مدرس دەفەرموێ لێرەدا ـ [لە نیوەی یەکەمی ئەم شیعرەدا ئیقتباس لە فەرموودەی پێغەمبەر هەیە کە فەرموویەتی «ان من الشعر لحكمة، وان من البیان لسحرا» .... لە نیوەی دووهەمیشیدا ئیقتباس لە ئایەتی» أأنتم أنشأتموها، ام نحن المنشئون» هەیە].[6]

غەزەلی 3/أ ل83.

**سهم الف القد فقد صاد فؤادی**

**صاد هو من عینه، قد صاد فسادا**

ئەم بەیتە عەرەبی‌یەی نالی بریتی‌یە لە دەفتەرێك لە هونەرە بەیانی‌یەکان، ئەنواعی جیناس و لەتافەت و جوانی تیادایە.

مامۆستا مدرس دەڵێ (ئەم شیعرە بۆ ئەوە دەست ئەدا گەلێ جۆرە یاریێ تیادا بە وشە بکرێ بۆ نمونە بشخوێنرێتەوە:

صه من الف القد، فقد صاد فؤادی
صاد هو منِ عینه، فقد صار فسادا

له دەستنووسێکدا کە لامە ئەم بەیتەی بە جۆری یەکەم وەکو لای مدرس نووســـراوە، بەڵام لە سەرەوەی بە جۆرێـکـی تریش ئیشارەتی بۆ کراوەو بەم جۆرەی لێ دێ.

سهم الف القد فقد صادف واواً
صاد هو من عینه، قد صادف صاداً[7]

هەروەها لە دەستنووسێکی‌تردا بەم جۆرە نووسراوە:
سهمی الف القد وقد صادف قسادا
صادی هو فی عینك، قد صادف صادا[8]

غەزەلی 9/أ ل 101
هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە، یەقین
خۆی کە دامێن گیری شاهی ئاصەفی ثانی دەکا[9]

ئەو کەسە تەحدیثی نیعمەت بێ موراد و مەطلەبی
میثلی «نالی» ئیمتیثالی ئەمری یەزدانی دەکا

لێـرەدا ئیشـارەتـە بۆ ئەم ئایـەتـە: (واما بنعمة ربك فحدث) ئایەتی (11).

سورەتی (الضحی)

غەزەلی 13/أ ل114.
یابدرُ علوّاً وضیاءً وکمالا
فالغصنُ مع الأصلِ الی فرعك مالا

★ ★ ★ ★

ماعادَ لَكَ البانُ، ولا اللینةُ لیناً
اذ عَدَّ لَكَ الباریءُ حُسناً وجمالا

★ ★ ★ ★

بادِرْ، وَأغرِ کوکبَةَ البدر بداراً
قد فقت سنا الشارق، لاذُقتَ زوالا.
دنیا بە فیدای قەددی بکە، دامەنی‌بگرە
طوبی لِمن اختارَ علی المالِ مآلا.

غەزەلی 1/ب ل133
عاجز مەبە هەرگیز لە درۆو ئیفکی حەسوودان[10]

★ ★ ★ ★

لێرەدا ئیشارەتە بۆ مەوزوعی عائشەو دواکەوتنی لە قافڵەکە ـ ئەوەبوو سورەتی «النور» بۆ پاکانەو پاکیزەگی عائشە هاتەخوارێ بۆ پێغەمبەر.

ئەو ئایەتەی کە دەڵێ:

«إن الذین جاءوا بالافك عصبة منکم..» ئایەتی (24)

سورەتی النور

غەزەلی 1/ت ل137
لاکین ئەمە دونیایە، گەهێ سوورە، گەهێ شین
«لایُسألُ مَن عاشَ، وَمَن مات، وَمَنْ فات؟!»

غەزەلی 2/ت ل145.
دەسرۆکەیی هەوری چ حیجابێکە کە تێدا
«شمسُ فلك الحسن أنارَتْ فَتوارت».

غەزەلی 1/چ ل157.
گەر ئەشرەف و مەحبووبە یوسف کوڕی یەعقووبە[11]
کچ بوو بە خریداری یەعنی کە زولەیخا کچ

لێـرەدا ئیشـارەتە بۆ داستانی یوسف و حەزلێ‌کردنی زولەیخاو پاك دامەنی یوسف. [قال هی راودتنی عن نَفسِی وشَهِدَ شَاهِدُ مِن أهْلها إن کانَ قَیمصُهُ قُدمِن قُبُلٍ فَصَدقَت وهُو مَن الکاذبین ئایەتی (26)].

و [وإن كان قميصه قُدّ دُبُر فكذبَت وهو من الصادقين (27)
فلمـا رأى قميصـهُ قُدَّ من دُبُـر قال إنَّـهُ مِن كيـدكُن إن كيـدكُن عظيمٌ (28) .

يُوسف اعـرِضْ عن هذا وآسْتَغفِـرى لَذنبـك إنـك كُنت من الخاطئينَ (29)

سورەتی یوسف.

**صیدیق و عەزیز هەروەك یووسف كە نەبی بوو كوڕ**
**صیدیقەیی مەعصوومە وەك داكی مەسیحا كچ**[12]

ئیشارەتە بۆ ئەوەی كە یوسف صیددیق بووە واتا ڕاستگۆ وەكو لەم ئایەتەدا هەیە «یُوسف ایها الصدیقُ أفتینا فی سبع بَقراتٍ سِمانٍ یأكُلُهنَّ سَبعٌ عِجافٌ وسَبع سُنبلاتٍ خُضرٍ وأُخَرَ یابِسـاتٍ لعلی أرجِعُ إلی الناس لَعلَّهمُ یَعلَمُون.

ئایەتی (46) سورەتی یوسف

لە نیو بەیتی دووەمیشدا ئیشارەتە بۆ پاك داوێنی حەزرەتی مەریەم دایكی حەزرەتی عیسا:

«قالت رب أنی یكونُ لی ولدٌ ولم یُمسَسنی بشرٌ قال كذلك الله یَخلُقُ مایشـاء إذا قَضیٰ أمـراً فإنمـا یَقـولُ له کُن فیکـون» ئایەتی (47).

سورەتی آل عمران

غەزەلی 1/ح ل164.

**پڕكە قەدەحی پڕ فەرەحی بێ‌تەرەح و غەم**
**«ناوِلْنی، ونادِمنیو غازِلنی بالأفراح».**

**غەزەلی 1/ر ل170.**

**ئیلتیقای پۆلاو ئاسن هەر نیزاعەو گیرودار**
**«جەمعی ماءو نارو، زەندو زەندەوو، مەرخ و عەفار».**

**غەزەلی 1/3 ل201.**

**هەرچی مەحبووبەم دەبینێ وا تەحەییور دەیگرێ**

**سوێن دەخوا بەخوا دەڵێ «بالله ماهذا بشر».**[13]

ئیشـارەتـە بۆ حیكـایـەتی زولـەیخـا، كە كاتێ لەنـاو ژنـانی ئەشرافدا بڵاو بووەوە كە حەزی لەیوسف كردووە لۆمەیان دەكرد، ئنجا ئەویش هەموویانی بانگ كردو لە ژوورێكی ئاوێنەبەندا دانیان و یەكی جەقۆیەكۆو نارنجێك یا سێوێكی دایە دەستیان و لەو كاتـەدا یوسفی بانـگ كردە ژووری، كە ژنـەكـان یوسف و جوانی یوسفیـان دی هەمـوو لە تاوانـا دەستی خۆیـان لەبـاتی نارنجـەكـە بڕیو گوتیـان ئەمـە بەنی ئادەم نی‌یە ئەمە فریشتەیە.
لێرەدا ئیقتباسە لەم ئایەتە:

«فلمـا سَمِعت بَمكـرِهِنَّ أرسَلت إلَیهِنَ وأعتـدَتْ لَهُن مُتكئـاً وأتت كلُ واحِدةٍ مِنُهنَّ سِكیناً وقالَتِ آخرجُ عَلَیهِن فَلَما رأیْنَهُ وأكبرَنَه وقَطَعن أیدیهُنَّ وقُلنَ حاشا لله ماهذا بَشَراً إن هذا إلا مَلَكٌ كریمٌ» ئایەتی (31).

سورەتی یوسف

غەزەلی 4/ر ل204

**1) سپی ئەذیرە هەموو موو لە سیرری «وَجْهُ» لەسەر**
**2) مونەووەرە، لە طەرەف نوورەوە بووە بە نەذیر**

وەكو مامۆستا (مدرس) دەفەرموێ ئیشارەتە بۆ ئەم ئایەتانە:

1) «كل من علیها فان» ئایەتی (26) سورەتی الرحمن.
«ویبقی وجه ربك ذو الجلال والاكرام» ئایەتی (27).

سورەتی الرحمن

2) الله نُورُ السمواتِ والارض مَثَلُ نُورِهِ كمشكاةٍ فیها مِصباحٌ المصباحُ فی زُجَاجَةٍ آلزُجاجَةُ كأنها كَوكَبٌ دُرِیٌ یوقدُ من شَجَرةٍ مُبـاركـةٍ زیتـونـةٍ لا شرقیـةٍ ولا غربیـةٍ یكاد زَیتُها یُضیء ولَو لم تَمْسَسْهُ نارٌ نورٌ علی نورٍ یَهـدِی الله لِنُوره من یَشـاء ویضربُ الله الامثال للناس والله بكل شَیء علیمٌ. ئایەتی (35).

سورەتی النور.

بەیت: مروری نەكسە كە عەكسی قەمەر دەكا بە ڕەمەق

ڤوبوولی نیکسه دەگێڕێ کە عەکسی ڕیش بەشیر.

ئیقتباسە لەم ئایەتە:

«وَمَن نُعَمِّرهُ نُنَكِّسه في الخلقِ أفلا يعقلُون» ئایەتی (68).

سورەتی (یاسین)

دەلیلی ڕۆشنە بۆ بەدەو عەودو کوریتیی عومر

تەنی هیلال کە بە طەلعەت جوان، بە خەلعەت پیر

مامۆستا مدرس دەفەرموێ! لێرەدا ئیشارەتە بە ئایەتی:

«قُل أمَر ربي بالقِسطِ وأقيموا وجوهكُم عِند كُلِ مسجِدٍ وآدعُوهُ مُخلصينَ لَهُ الدين كما بدأكم تعودُون» ئایەتی 29.

سورەتی الاعراف

سەراپای ئەم غەزەلەی نالی کە چەند بەیتێکمان پیشان دا ئیشارات و ئیقتباسە لە قورئان و حەدیث و هونەری سەرف و نەحوو، هەروەها هونەرە بەیانی‌یەکان و یاری‌کردن بە ووشە. کە ئەمە لە دەست هەموو کەس وەیا بڵێین هەموو شاعیرێک نەهاتووەو نایەت مەگەر هەر نالی بێ توانیبێتی ئا بەم جۆرە، ئەو باس و مەبەستانە لە قاڵبی شیعردا دارێژێ.

غەزەلی 1/ز ل222.

ناری سینەم گەر نەبێ غەرقم ئەمن

ئاوی چاوم گەر نەبێ ـ سووتاوم ئەز

«ابن الفارض» دەڵێ.

فلولا زفيري اغرقتني أدمعي

ولولا دموعي احرقتني زفرتي

مامۆستا مسعود محمد دەڵێ:

نالی ئەم واتایە هێناوەو گوێزاوەیتەوە بۆ ناو بەتێکی خۆی ـ بەواتا ئەو بەیتەی سەرەوە ـ

سەیری چەپکێك لە گوڵزاری نالی ـ گوڤاری کۆری زانیاری کوردی ـ ژمارە 2 ـ 2 ـ 1974 ل50 بکە.

غەزەلی 1/ق ل248.

قوربان مەحاڵە پێکەوەبن صەبرو ئیشتیاق

خاریج لە نەصصی ئایەتی تەکلیفی «لایطاق»

لێرەدا ئیشارەتە بۆ ئەم ئایەتە.

«لايُكلِّف الله نفساً إلا وسعها لهاما كسبت وعليها مااكتسبت ربنا لاتؤاخذنا إن نسينا او أخطأنا ربنا ولا تحمل علينا إصراً كما حملته على الذين من قبلنا ربنا ولا تُحمِلنا مالا طاقة لنا به واعفُ عنا وآغفر لَنا وارحمنا انت مولانا فانصرنا على القَوم الكافرين» ئایەتی (286).

سورەتی «البقرة»

غەزەلی 1/م ل261.

لە قوربی «قاب قوسین»ی دوو ئەبرۆت

منی «ادنی» چ دوور و دەربەدەر مام.

ئیقتباسە لەم ئایەتە:

«ثُم دَنا فتدلىٰ (8) فكان قاب قَوسَينِ أو أدنى (9) سورەتی «النجم».

غەزەلی 11/م ل299.

تابەکەی وەك ڕاوییەو، وەك سانییەی سێ پەل شکاو

بێ طەواف و سەعی‌و عەمرە هەر بخەوم و هەر بخوم:

لێرەدا باس و ئیشارەتیشە بە مناسکی حەج:

«إن الصفا والمروة من شعائر الله فمن حج البيت أو اعتمر فلا جناح عليه أن يطوف بهما ومن تطوع خيراً فإن الله شاكرٌ عليم» ئایەتی (158).

سورەتی البقرة

غەزەلی 5/ن ل326.

**رەقیب و مودەعی فیتنەو حیلاڵەی چاوی جادووتن**
**لە گۆشەیی گۆشەوارەت نا ئیبی هارووت و ماروتن.**

لێرەدا باسی داستانی ئەو دوو فریشتەیە دەکات بە ناوی «هارووت و ماروت» و بابەتی جادویی و گوامراییان.[14]

وە لەم ئایەتەوە ئیقتباسی کردوە:

«واَتَبعوا ماتتلُوا آلشياطينُ على مُلكِ سُليمانَ وماكفَرَ سليمانُ ولكن الشياطين كفروُا يُعَلِّمونَ آلناسَ آلسِحرَ وما أُنزلَ على الملكين ببابل هارون وماروتَ وما يُعلِّمانِ من أحَدٍ حتى يَقوُلا إنّما نحن فتنه فلا تكفرْ فيَتَعَلَّموُنَ مِنهُما مايُفَرِقُون به بينَ المرء وزوجـه ماهمْ بضـارِّينَ به من أحـدٍ إلاّ بإذن آلله ويَتعلَّمـوُن مايَضُرُهُم ولا ينفعُهُم ولقَد عِلموُا لمَن آشتراه مالَهُ فى الأخره من خلقٍ ولبِئسَ ماشروا أنفُسُهم لوكانوا يَعلموُن ئايەتی (102).

سورەتی (البقرة)

غەزەلی 9/ن ل340.

**صەحرا بە تەجەللی دەکەنە وادیی ئەیمەن**
**قامەت شەجەرو، مەظهەری ئەلطافی ئیلاهن.**

ئیشـارەتـە بۆ داسـتانی حەزرەتی موسی لە وادی ئەیمـەن لە کێوی تور.

لەم ئایەتەوە ئیقتباسی کردووە.[15]

«فَلمـا أتـاهـا نُودىَ من شاطىء آلـوادى آلأيمن في البقعـة المبـاركـة من آلشجـرة أن يامـوسى إنى أنـا الله رَبُّ آلعالَمِين» ئایەتی (30).

سورەتی (القصص)

غەزەلی 4/هـ ل401

مامۆستا مدرس دەفەرموێ (نالی لەم پارچە شیعرە نایابەیدا. کە چ لە بارەی دەوڵـەمـەنـدیی سۆزو چ لە بارەی تەکـنیکی هونـەرییـەوە، پێشـەنگەو بەر لەو چەشنی لە کوردیدا نەبینراوە، کۆمـەڵێ وشـەی کوردیو عەرەبیو کوردی عەرەبیی بەکـارهێناوەو تێکـرا بە شێـوەی عەرەبی دایـڕشتوون و پێڕەوی دەستوری زمانی عەرەبیو سەرو بۆروژێری دوا پیتی وشەی، لە زمانی عەرەبیدا بەسەردابڕیون).

پارچەکە بەمە دەست پێدەکا:

**درونی لِدار الـ (شارَزورِ)و بَرْدِه**
**کَفرْ میـكْ گرْم إلی آوی سَرْدِهِ**

غەزەلی 5/هـ ل406.

**بەناری عیشق و ئاوی دڵ، جەسەد وەك حەضرەتی مووسا**
**طەریقی: بەحری فیرعەون و، ڕەفیقی: ئاتەشی طووره.**

لێرەدا کە دەڵی بەحری فیرعەون: باسی داستانی پەڕینەوەی موسـاو کۆمـەڵـەکـەی لە دەریـاکـەداو غەرق بوونی فیـرعـەون و کۆمەڵەکەی کە دوای مووسا کەوتبوون..

ئەمە ئایەتەکەیە:

1 ـ «وجـاوزنـا ببنى إسـرائيـل آلَبحرَ فأتبَعُهم فِرعَونُ وَجُنوُدُهُ بَغياً وَعَدواً حتى إذا أدركَهُ آلغَرَقُ قالَ آمنتُ أنه لا إله إلا الذى آمَنَت به بنوُ إسرائيل وأنا من المسلمين». ئایەتی (90).

سورەتی یونس

2 ـ «وانجينـا موسى ومن معـه اجمعين (65) ثم اغـرقنـا الآخرين (66) سورەتی (الشعراء).

وەکە دەڵێ ئاتەشی طورە:

ئیشارەتە بە داستانی موسا لە کێوی طور:

3 ـ «فلمـا قضى موسى آلاجـل وسـارَ بأهلِهِ آنَسَ من جانب الطور ناراً قالَ لأهلِهِ امكثوُا إنى آنست وناراً لعلى آتيكم منها بخبرٍ أو جذوةٍ من النار لعلكم تصطلون» ئایەتی (29).

سورەتی (القصص).

خەراباتی دڵی «نالی» مەفەرموو: خاڵییە، نایەم!
بەمەرگی تۆ قەسەم، چاوم! بە فیکرت بەیتی مەعموورە..

لێرەدا جگە لە واتا ئاشکراکەی کە دەڵێ مەڵێ دڵت شکاوەو وێرانەیە.. بەمەرگی تۆ قەسەم «مەعمورە» ئاوەدانە بە جۆرێك وەکو بەیتی مەعمور کە «کەعبەیە» وەیا ئەو «البیت المعمور»ەی کە لە ئاسماندا لە دەوری مەکەیە بەرامبەر کەعبە هەموو رۆژێ «70» هەزار فریشتە دەچنە زیارەتی‌و تەوافی‌و نوێژدەکەن: (دەڵێن ئەو بەیتە لە ئاسمانی سێهەم یا شەشەم یا حەوتەم دایە).
«والطور» وکتب مسطور (2) في رق منشور (3) والبیت المعمور (4).

سورەتی «الطور»

قەسیدەی 7/هـ ل415.
ئەی ساکینی ریاضی مەدینەی مونەووەرە
لوطفێ بکە، بفەرموو، مەدینەی منەو وەرە.

لێرەدا هەروەکو مامۆستا مدرس دەفەرموێ ئیشارتە بۆ فەرموودەی پێغەمبەر «مابَین بَیتی‌و مِنْبَری رَوضَةٌ مِن ریاضِ الجَنَّةِ».

«کهف الأنام» هیجرەتی ئەصحابی پێ‌ڕووقوود
بیکە بە خاکی خادیمی قیطمیری ئەو دەرە

لێرەدا ئیقتباسە لە حیکایەتی «اصحاب الکهف»[16] جگە لەوەی کە ئیشارەتیشە بۆ کۆچ کردنی ئەصحابەی پێغەمبەر.. لە مەککەوە بۆ مەدینە.[17]
ئەم ئایەتانە باسی داستانی «اصحاب الکهف» دەکا:

«وإذا اعتزلتُموهُم وما یَعبُدون إلا الله فأوا الی الکهفِ ینشُر لکمُ ربکم من رَحمَتِهِ ویُهیء لکمُ من أمرِکُم مِرفقاً» ئایەتی (16).
«وتحسبُهم أیقاظاً وَهُم رُقُود ونُقَلِّبُهم ذات الیمینِ وذات الشِمال وکلُبهم بَسِطٌ ذِراعیهِ بالوصید لو اطلَعْتَ علیهم لولّیت منهم فراراً ولملِئت مِنهُمْ رُعْباً» «18».
«ولبثوا في کهفِهم ثلاث مائةٍ سنین وازدادُوا تسِعاً «25» سورەتی (الکهف).

پەیغام بەروحەبیی خودا «خاتم الرُسُل»
رەوضەی لە ئەرض و سایە لەسەر چەرخی ئەخضەرە

ئیشارەتە بەوەی کە پێغەمبەر ئیسلام «خاتم الرسل والانبیایە».
«ما کانَ مُحمداً أبا أحَدٍ مِن رِجالکم ولکن رسَول الله وخاتَم النبین وکان الله بکل شیء عَلیماً» ئایەتی «40» سورەتی «الاحزاب».

گوفتاری نۆشی شاهیدی صەد شەهدی فائیقە
رەوخساری خۆشی «أظْهَرْ مِنْ» شەمسی ئەنوەرە[18]

لێرەدا ئیشارەتە بۆ ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە لە قورئاندا پێغەمبەری بە رۆژ تەشبیه کردووە.

1) «یاایها النبی أنا أرسلناك شهیداً ومُبشراً ونَذیراً» ئایەتی (45).
«وداعیاً الی الله باذنه وسراجاً منیراً» ئایەتی 46 سورەتی «الاحزاب».
2) خوای گەورە لە شوێنی تردا بە رۆژ و مانگ و ئەستیرە تەشبیهەکردووەوە لەم ئایەتەدا ناوی بە نور دەبا:

«یاأهل الکتاب قد جاءکم رسولنا یبینُ لکم کثیراً مما کُنتمُ تُخفُونَ من الکتبِ ویعفوا عن کثیر قد جاءکُم من الله نُورٌ وکتابٌ مبین (15).
سورەتی «المائدة»

ئەو شاهی ماهی میسرە، ئەهالی لە ڕێی سوجوود
قوربان دەڵێ کە بەندە ئەمەو بەندە پەروەرە.
ئەو دێ دەبا بە کەشمەکەش، ئەم دێ دەبا بەلوطف
ئەو شاهی دڵبەرە، ئەمشەهەنشاهی دڵدەرە

سەیـری شەرحی «مـدرس» ل427وە کتێبی قصص الانبیـا وقصص القرآن بکە[19]

شوبهەی نیە کە شەمس و قەمەر سێبەری ئەون
نیسبەت بە هەردو وەجهی وەکو نوورو سێبەرە

مامۆستا مدرس دەفەرموێ لێردا ئیشارەتە بۆ حەدیثی قودس «لولاك، لولاك، لما خَلقت الافلاك»

بۆ ئەوەی باشتـر لە بابـەتی نوری پێغبـەر بگـەیت سەیـری «قصص قرآن مجید» مشهور بە سور آبادی بکە. ل408 ـ 318.

با بێنەسەر وەجاهەتی قەدری لەکن خودا
بۆ عاصییان لە مەغفیرەت و صەرفی مەغفیرە
رەحمەت بە حوسنی صوورەتێ ئینسان ظوهووری کرد
«خیرُ البَشرَ» لەقەب بە شەفاعەت مویەشەرە

. . . خوای گەورە ئەو نورەی کە نوری (محمد مصطفی) بوو کردی بە دە بەشـەوەوە لە یەکـەمـی عەرش و لەوی‌تـری کورسـیو. . تا لە دەمـەم گیـانـی پاکـی «مـصطـفی» ای خەلق کرد. . چونکـە لەو قەتـرە ئاوانـەی لەو پرژایـە خوارێ پیغـەمبـەرانی خەلق کرد ئەوەبـوو هەمـوو بانـگ و هاواریـان کرد «اللهم اجعلنـا من أمـة محمـد» هەر لەبـەر ئەویـە کە سوێندی بەگیـانی مصطفی خواردو گوتی «لعمـرك انهم لفی سكـرتهم یعمهون» ئایەتی «72».

سورەتی «الحجرات»

بۆ زیادەی شارەزایی لەم داستانە سەیری ل418 ـ 419 لە کتێبی قصص قرآن مجید ـ نیشابوری بکە.[20]

ئەمـە ئەو پەڕی قەدرو ڕێـزە لە بۆ پێغـەمبـەر لەلایـەن خوای گەورەوە هەروەها شەفاعەتیش دەکات بۆ ئومەتی خۆی:

«وما أرسَلنا من رسول إلا لیُطاع بإذن الله ولو انهم إذ ظلموا أنفُسهم جاءوك فآستغفروا آلله وآستغفر لهمُ الرسولُ لوجدوا آلله تواباً رحیماً» ئایەتی «64».

سورەتی «النساء»

«وما ارسلناك إلا رحمة للعالمین» ئایەتی (107) سورەتی الأنبیاء.

سەعدی شیرازی دەڵێ:[21]

«شفیع مطاع نبی کریم     قسیمٌ جسیمٌ نسیمٌ وسیم

ئەم فەرشە خاکییە دەتەکێنن لە تۆزو گەرد
ئەم عەرشە نۆ صەحیفەیە دەیکەن بەیەك پەڕە

لێرەدا هەروەکـو مامـۆستـا مدرس ئیشارەتی بۆ کردوە، باسی ڕۆژی قیامەت دەکاو پێچانەوەی ئاسمانەکان و گۆڕانی ئەم زەویە بە جۆرێکیتر ـ هەروەها ئیشارەتە بۆ ئەم ئایەتانە:

«یوم تُبدَّلُ الأرض غیر الأرض والسماواتُ وَبَرزُو آلله آلواحدِ آلقهّار»

«یـومَ نطـوی السمـاء کطی آلسجـل للکتب کمـا بدانا أول خلق نُعیدهُ وعداً علینا إن کنا فاعلین». ئایەتی «104».

سورەتی الانبیاء

جمال الدین اصفهانی لەم بارەیەوە لە قەسیدەیەکا کە باسی ڕۆژی قیامەت دەکات بەمە دەست پێدەکات:

چودر نور ددقراش امرکن فیکون
سرای پردە سیماب رنگ آینەگون[22]

نالی: رۆژی قیامەت (فاذا هم قیام)و شەخص
قائیم چەقیوە، کێلە، لەسەر خاکی مەحفەرە

وەکو مامۆستا مدرس دەفەرموێ «فإذا هم قیام» ئیقتباسە لەم. ئایـەتـە «ونفـخ في الصـور فصَعِقَ من في السمـاوات ومن في الأرض إلا من شاء الله ثُمَّ نُفِـخ فيـه أُخـرىٰ فإذا هم قيـامٌ ينظرُون» ئایەتی «68».

سورەتی «الزمر»

لایمك «زەبانییە» لەسەروکاری نارە، نار
«هَلْ مِنْ مَزيد» زوبانیە وەك ماری ئەژدەر

لێرەدا ئیشارەتە بە ئایەتی:

«يَومَ نَقولُ لِجهنمَ هَل آمتلأتِ وتقولُ هَل من مَزيد» ئایەتی «30».

سورەتی «ق»

تەشخاص خاصة «تَشْخَصُ ابْصارُهُم» هەموو
«وانَفسیْ» یانە هەر یەکە بۆ خۆی موحەییەرە

ئیقتباسە لەم ئایەتە:

«ولا تحسبنَ الله غافـلاً عمـا يعَمـلُ الظـالُمون إنما يُؤخِرّهُمْ لِيوم تَشخَصُ فيه الأبصار» ئایەتی «42».

سورەتی «ابراهیم»

«اقترب الوعد الحق فإذا هی شاخصةٌ أبصار الذين كفروا ياويلنا قد كُنا في غفلةٍ من هذا بل كُنا ظالمين» ئایەتی «97».

سورەتی «الانبیاء»

زێرو زەبەر دەبن بە دو فیرقە، لە فیرقەتەین
وا وەیل و ئیمتیازە کە کێ بێنە کێ بەرە

لە دۆزەخیـەکـان هاواری ئەمـە دێت: «واقتـرب الوعدُ الحق فإذا هی شاخصة ابصارُ الذين كفرُوا ياوَيلنا قد كُنا في غَفلَةٍ من هذا بل كُنا ظالمين» ئایەتی «97».

سورەتی «الانبیاء»

وە لە بەهەشتیەکانەوە دەنگی: «وأمتازوا اليوم أيُها المجُرِمُون» ئایەتی «59» سورەتی «یاسین» دێت کە بە دۆزەخیەکان دەڵێن.

ئەگەر کەسینە، تابیعی بەردو حەرارەتە
یەعنی وەقوودی نارە، بوخاری موسەییەرە.

ئیشارەتە بۆ ئایەتی «فإن لم تَفعلوا وَلَن تفعلُوا فاتقوُا النّارَ ألتى وقُودُها آلناسُ وَالحِجارَةُ أُعِدّت للكافرِينَ» ئایەتی «24».

سورەتی البقرة

باڵی ڕووی لە کەففەیی میزانە، یەکسەرە
هەرچەند سەرە موتابیعی میعیاری دووسەرە

ئیشارەتە بۆ ئەم ئایەتە:

«فأمّا من ثَقُلَت موازينُهُ (6) فَهوَ في عِيشةٍ راضِية (7) وأما مَن خفتْ موازينُهُ (8) فأمه هاويةٌ (9) وما أدراك ماهِيه (10) نارٌ حاميه (11).

سورەتی «القارعة»

مەخزوونی ڕوقعە، حەببە بە حەببە، لە کەففەدا
خالیص دیارە، مس کەم مسە، عەینی زەڕ زەڕە.

«فمن يَعمل مِثقالَ ذَرَّةٍ خَيراً يَرهُ (7) ومَن يَعمل مِثقالَ ذَرّةٍ شراً يَرهُ (8)».

سورەتی (الزلزله)

غەزەلی 9/هـ ل450.

«حلقە درگوش»ی کەڵی ڕەنگینی تۆیە ئەم دەفە
با نەناڵێ، لێیمەدە «عَنْ لَطمْهِ کُفُّ الکَفَة»!
سەیری شەرحی مدرس بکەڵە ل450.

نەی، کە صاحیب سیرِڕە، سەرتاپا بە ئەمری «اکن» کونە
باطینی (قِف قِف علی سَرِّی)، بە ظاهیر قەف قەفە

ئیشارەتە بۆ ئایەتی «إنما أمرُهُ إذا أراد شيئاً أن يقول لهُ كُن

فیکونْ» ئایەتی «82».

سورەتی «یاسین»

لەئایەتی «47» سورەتی آل عمران

ئایەتی «117» سورەتیء البقرة

ئایەتی «35» سورەتی مریم «أن یقول کن فیکون» هاتووە.

صاحێبی «علم الکتاب» موطریبی هودهود نەفەس
یا سولەیمانە لە «اخوان الصفا» ئاصەف صەفە.

وەکو مامۆستا مدرس دەفەرموێ عیبارەتی «علم الکتاب» ئیشارەتە بە ئایەتی «قال الذی عندهُ علم من الکتاب أنا أتیكَ به قبلَ أن یرتد الیك طَرفُكَ فلما رآهُ مُستقراً عِندهُ قال هذا من فَضلِ ربی لیَبلُوَنیء أشکُرُ أم أکفُرُ ومَن شکر فإنَّما یَشکُرُ لِنفسِه ومَن کفر فإن ربی غَنیٌّ کریمٌ «40».

سورەتی «النمل»

ئیشارەتیشە بۆ داستانی حەزرەتی (سلیمان) لێرەدا بەراوردی دەکا لەگەڵ سلێمان پاشای بابان دا.

غەزەلی 11/هـ ل458

دڵم بەردە ئەگەر شاخە بە چاوی سووکی مەنوارێ
بەخۆرایی نەسووتاوە، ئەمیشە کێوی طوورێکە

کە دەڵێ کێوی طوور ئیشارەتە بۆ تەجەللای نوری خودا لە کێوی سووتاندنی سوتاندنی کێوەکەو ئەو خاکە سووتاوە بووە بە کل کە چاوی پێ دەرێژن:

«ولَما جاء موسی لمیقاتِنا وکلمهُ ربُهُ ربِّ أرنی أنظرُ إلیكَ قالَ لَن تَرَانی ولکن أنظُرْ إلی الجبَل فإن أستقَرَّ مکانهُ فسوف ترانی فلَما تجلَّی ربُهُ للجبل جَعَلهُ دکًا وخرَّ مُوسیٰ صَعِقاً فَلمَّا أفاق قالَ سُبحانَكَ تُبتُ إلیكَ وأنا أوّلُ المؤمنین». ئایەتی «143».

سورەتی «الاعراف»

قەسیدەی 18/هـ ل482.

چ مەککە؟ دارو بەردی قاعیدەی ئەرکانی ئیسلامە
چ طەیبە؟ مامو خاکی مائیدەی ئەنواری ئیمانە

هەروەکو مامۆستا مدرس دەفەرموێ کە دور نی یە وشەی «قاعیدە» ئیشارەت بێ بە ئایەتی: «وإذ یرفع ابراهیم القواعد من البیت واسماعیل ربنا تقبل منا انك أنت السمیع العلیم».[23]

ئایەتی «127» سورەتی «البقرة»

ئەتادو عەرفەج و خیطمیو عەضات و عەوسەج و ئەثلی
چ دامەن گیرو شین و دڵ نشینی رێی غەریبانە!

لە بەشی یەکەمی بەیتەکەدا ناوی ئەو گیایانە دەبات کە لە سەحرادا کە لە رێی حەج دا دیونی دەبات بەعەرەبی.

چ رەوضە؟ رەوضەیی جەننەت! چ جەننەت؟ جەننەتی قوربەت!
چ قوربەت؟ قوربەتی راحەت! چ راحەت؟ راحەتی جانە!

سەیرکە چەند بەجوانیو شاعیرانە کوردیانە ئەلەفوزی ئەو وشە عەرەبیانەی دەربڕیوە، چونکە جگە لە ئەداتێ «چ» پرسیار باقیەکەی وشەی عەرەبین.

صەریری جونبوشی تەخت و مەحەففەی مەخمەڵی سەوزی
دەڵێی تەسبیحی مورغانە، لەسەر تەختی سولەیمانە[24]

لێرەدا ئیشارەتیشە بۆ ئەوەی کە حەزرەتی سلیمانی زمانی تەیری زانیوە.

«وَورِثَ سُليمـانُ داودَ قالَ يِاأيها النـاسُ عُلّمنـا مِنطقَ الطَّير وأوتينا من كُلِ شيء إن هذا لهو الفضل المبين» ئايەتی «16». سورەتی «النمل»

**چ نوورێکە لە حوجرەی ڕەوضەدا وا قائیمە قوببەی،**
**قەوامی عەرش و فەرش و قەلبی ئینس و قالەبی جانە**

زۆربـەی ئەم وشـانـە کە عەربین تارادەیـەك وەکـو زاراوە بەکـارهـاتـووە، لەبـەر ئەوە نالی زۆر بەجـوانی و بە شێوەیەك کە خوێندەواری ئەو سەردەمە لێی تێدەگەن بەکارهێناون، چونکە زمانی ئەدەبی کوردی شێوەی نالی تازە وردە وردە خەریك بوو لە قاڵبدا دەمەیی.

وەکـو لە شەرحی مدرس د،ا هاتـووە، لێـرەدا ئیشـارەتـە بە حەدیثی قودس «لولاكَ لولاكَ... لما خَلقتُ الافلاك» سەیری ل418 ـ 419 قصص قرآن مجید نیشابوری بکە.[25]

**موحەممەد، ئەحمەدی مورسەل، مونیری مینبەرو مەحفەل**
**بە شیری ئاخیرو ئەو وەل، نەذیری خوێش و بێگانە**

ئیشارەتە بۆ ئەم ئایەتانە:
«یاأیُّها النَّبي إنا أرسلناكَ شاهِداً ومَبشراً ونذيراً» ئایەتی «45».
«وداعياً إلى الله باذنِهِ وسراجاً مُنيراً» ئایەتی «46» سورەتی «الاحزاب».

**سیراجی ئەنبیا، خەتمی ڕوسول، نووری موبین حەق**
**کە عالی کەعب و قەدرو دەست و صەدرو خاتەمی شانە**

لێرەدا ئیشارەتە بۆ ئەوەی کە نوری پێغەمبەر لە سامی نوحەوە پشت بەپشت هات تا گەیشتە ابراهیم وە لەمەوە بوو اسماعیل بەواتـا نوری هەمـوو پێغـەمبـەرانـە.. هەروەهـا خاتەمی ئەنبیایە چونکـە کە ئادەم سەری لە زەوی بەرزکـردەوە تیـشـکی نوری «مـصطـفـیٰ» ای دی کە هەمـوو دەوروبـەری ئادەمـی ڕۆشن کردۆتەوە، گوتی خوایە ئەمە چ نورێکە کە لە ناوچەوانی منـدا دەدرەوشێتـەوە، نیـداهـات گوتی ئەمە نوری فرزەندێکە لە فەرزەنـدانت «خـاتم انبیـا».. ڕۆژی قیامەت هەموو پێغەمبەران لەژێر ئالاّی ئەودا دەبن.
سەیری لاپەڕەی (410 ـ 411) ـ لە قصص قرآن مجید ـ ی ـ نیشابوری بکە.

**لە جوملەی موعجیز ئەندەر موعجیزی: ئەحکامی قورئانە**
**کە میعراجی بوڵەندی ئەووەلی ئایاتی «سوبحان» 26/5.**

ئیشـارەتـە بۆ موعجیـزەی میعراجی پێغەمبەر. لێرەدا مەبەستی لە سورەتی «اسراء» یە کە خوای گەورە دەفەرموێ.
«سُبحـان الـذی أسـرىٰ بعَبـدِهِ لیـلاً من المَسجـدِ الحـرام إلى المَسْجـدِ الاقصىٰ الـذي باركنـا حولـه لنـريـه من آيـاتنا إنه هو السميعُ البصير». ئایەتی (1).
سورەتی «الاسراء»

**شەوەمما کەوکەبەی هەر کەوکەبی نیلی فەلەك دەتگوت**
**لە میصری ڕۆژی زینەت دەستی مووسای ئیبنی عیمرانە[27]**

کە دەڵێ دەستی موسـای ئیبنی عیمـرانـە، ئیشـارەتە بەوە کە موسا کاتێ دەستی لە باخەڵیا دەردەهێنا سپی دەدرەوشایەوە.
«ونزع یده فإذا هي بيضاء للناظرين» ئایەتی «108».
سورەتی «الاعراف»

**لە هیجـری یووسفی میعـراجی، یەعقـووبی فەلـەك، چاوی**
**نوجوومی بوو سپی هێشتاکو هەر حەیران و سەهرانە[28]**

کە دەڵێ ئەستێرەکان چاویان سپیبوو بەواتا کوێربووە وەکو یعقـوب لە دووری یوسف «وتَـولی عَنهمُ وقـالَ یاأسفی علىٰ یُوسُفَ وَأبیَضت عَیناهُ من ألحُزنِ فَهوَ کَظِمٌ» ئایەتی «84»

سورەتی «یوسف»

موشەڕڕەف بوو بە تەختی عەرش و تاجی قوربی «عند الله»
بە هەرچی دەرجی «او ادنی» و «ما اوحی» قورئانە.

«او ادنی» ئیشارەتە بۆ ئایەتی:
[«ثم دنا فتدلی «8» فکان قاب قوسین او ادنی «9»] سورەتی النجم.
«فأوحیٰ إلی عبده ما أوحیٰ» ئایەتی «10» سورەتی النجم.

چونکە جبرائیل بوو هات و بردی بۆ میعراج:
هەروەها جاری یەکەمیش هەر ئەو بوو سروشی پێغەمبەرێتی بۆ هێناو لێی‌نزیک بووەوە وە ئەمجارەش کە بردی بۆ میعراج [29]

موورادم نیللەت و پاڕانەوەی حاڵە، نەوەك نەعتە
بە چەن بەیتێکی کوردانە، کە قورئانت نەنا خوانە

نالی: چەند جوان دەڵێ، بە چەند بەیتێکی کوردی دەپاڕێمەوە لێت، چونکە من ناتوانم وەسفی تۆ بکەم، تۆ قورئان وەسفی کردویت کە دەڵێ «وإنكَ لَعلی خُلقٍ عظیم» ئایەتی «4».
سورەتی «القلم»

غەزەلی 31/هـ ل571.
ئەهلی ئەم شارە هەموو نۆکەرو ئەتباعی ئەون
یووسفی میصرە عەجەب جاهـ و جەلالێکی هەیە!

باسی بەشێ لە داستانی یوسف دەکات، ئەوە بوو حەبس کراو دووای ئەوەی بەربوو، بوو بە خەزانەداری عەزیزی میسرو لەدواییدا لە جێی ئەو دانیشت و بوو بە خاوەن جاهـ و جەلال.[30]

غەزەلی 37/هـ ل588.
ڕوومەتت شەمعی شەوی قەدرە، دڵم پەروانەیە
نەحری مینای ڕۆژی عیدە، ڕۆحەکەم قوربانییە

لێرەدا ئیشارەتە بەم ئایەتانە:
شەوی قەدر «إنا انزلناهُ في لَیلةِ القَدرِ «1» وما أدراكَ مالَیلةُ القَدر «2» لَیلَةُ القَدرِ خَیرٌ من ألفِ شَهر «3» سورەتی «القدر».
نەحری مینای ڕۆژی عیدە «فلما بلَغَ مَعهُ السعی قال یابُنیَّ إنی أری في المنامِ أنّي أذبَحكَ فانظُر ماذا تَری قالَ یاأبَتِ إفعَل ماتؤمَرُ ستجِدُني إن شاءَ الله مِن الصابرین» ئایەتی «102».
سورەتی «الصافات»

غەزەلی 4/ی ل633.
بە وەقتی تەلبییە مەستی شوهوودی «صبغة الله» بێ!
بە گاهی تەروییە سیرڕی «یدالله» دەستیاری بێ
(سەیری شەرحی مدرس بکە ل633)

قویووضاتی «صەفا»و «مەروە» هەروەك ناودان دەم دەم لە یەنبووعی دڵی پڕ زەمزەمەی میزانی جاری بێ.
لێرەدا ئیشارەتیش هەیە بۆ مناسك و شعائری حەج وەکو لەم ئایەتەدا دەفەرموێ «إنَّ الصَفا والمروَة مِن سعائر الله فمنْ حَجَّ البَیتَ أو اعتَمر فَلا جُناحَ علیهِ أن یَطَّوفَ بهما ومَن تَطوَّعَ خَیراً. فإنَّ الله شاکرٌ علیمٌ» «158».
سورەتی «البقرة»

ئەگەر خەڵوەت نشین بێ «جانی‌جانان» بێ ئەنیسی ئەو
وە گەر هیجرەت گوزین، ڕۆحی «عەزیزان» یاری غاری بێ.

لێرەدا ئیشارەتیش هەیە بۆ کۆچ کردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە لەگەڵ «ابو بکر»دا و خۆشاردنەوەیان لە غارەکەدا:

«إلا تنصُرُوه فَقد نصَرهُ آلله إذ أخرجهُ الذين كفرُوا ثانى أثنين إذ هُما في آلغارِ إذ يقولُ لصاحِبِهِ لاتحزن إنَّ الله معنا فانزلَ الله سكينهُ عليهِ وأيدَهُ بجُنودٍ لَم ترَوها وجَعل كِلمة الذين كفروا السفلىَ وكلمة الله هي العُليا وألله عزيزٌ حكيم». ئايەتی «40».

سورەتی «التوبة»

عەزەلی 5/ی ل637.

**مەعلومە لەوێ رازو خوطووری دڵی «نالی»**
**[«إدخَلٌ بَقلبي، وَبأسْرارِهِ نوجيی»].**

غەزەلی 9/ی ل655.

**ساقی: وەرە مەیخانەیی دڵ کۆنە رەحیقی**
**گەر مایلی طەوفی حەرەم و بەیتی عەتیقی**

رەحیق: کە شەرابەو شەرابیش ئەوەی کۆنەبێ مەقبوڵە. بەواتا «عەتیق بێ».

هەروەهـا «بـەیتی عەتیقی»ماڵی کۆن بەواتـا کەعبـەیـە کە حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ اسماعیل کوردیدا دروستیان کردووە چونکـە کەعبـە یەکـەم خانـووەو یەکـەم بەیتـە کە بۆ خەلق دروست کرا تاکو عیبادەتی خوای گەورەی تیادابکەن.

چونکـە گەل و هۆزەکـانی‌تـر خانـوویـان دروست نەکردبوو بۆ پەرستن و عیبـادەت تیـایـدا بە واتـا پەرستنی بتـەکـانیان. لێرەدا ئیشارەتە بەم ئایەتە:

«إن أولَ بیت وُضِعَ للناس للذین ببكة مُباركاً وهُدى للعالمين».

ئايەتی (96) سورەتی «آل عمران»

«فيه آياتُ بيناتُ مقامُ إبراهيم وَمَن دَخَلهُ كان آمناً ولله على الناس حج آلبيتِ أستطاع إليه سبيلاً ومن كفر فإن ألله غنى عن العالمين». ئايەتی «97»

سورەتی «آل عمران»

غەزەلی 10/ی ل657

**«بَرقَ البَصَرَ» لەبەر بەرق تەلەئلوئی لە ئالی**
**«خَسِفَ القَمَرَ» لە ئیشراق قیامەت جەمالی.**

ئەوانەی لەناو کەوانەکە دان عەرەبین و بە عەرەبی نوسیونی‌و بەکاری هێناون. ئەوانی‌تریشی جگە لە حەرفی جەرو کەسرەی «تـەرکیبی ئیـزافی» یا وەسفی نەبێ، عەرەبین بەڵام دەربـڕین و نووسین و شێوەی کوردی بەسەرا پۆشیون.

**بە مەلاحەتی تەکەللوم هەموو زەمزەم و مەلیحی**
**بە فەصاحەت و تەبەسوم هەموو کەوثەرو زولالی**

ئەو وشە عەرەبیانەی کە لێرەدا دەیان بینن نالی بە شێوەی کوردی دەری‌بڕیون.. هەروەکو چۆن شاعیرە ئێرانی‌یەکان کاتێ ووشە عەرەبیەکانیان بەکار دەهێنا، بەشێوەی فارسی دەریان دەبڕی‌و تەلەفوزی فارسی‌یان دەدا بەسەردا.

غەزەلی 11/ی ل662

**وادی بووە بە وادیی پڕ نووری «طور»ی «نار»**
**«نەعلەین» لە پێ فڕێبدە «نالی» بە «ئەیمەنی»**

ئیشارەتە بەم ئایەتانە:

«إذ رأى ناراً فقالَ لأهلهِ امْكُثُوا إنىّ آنستُ ناراً لعلى آتيكُم منهـا بِقَبس او أجـدُ على النـار هُدى «10» فلمـا أتـاهـا نُودِى ياموسى «11» إنى أناربَكَ فاخْلَعْ نعليكَ إنك بالوادى المقُدَّس طوًى «12» سورەتی «طه».

«فلما قضىٰ مُوسى آلاجل وسارَ بأهلهِ آنَسَ من جانب الطُور ناراً قالَ لأهله آمكثُوا إنِّى آنَسْتُ ناراً لعلى آتيكُم منها بخَبَرٍ أو جَذوةٍ من النـارِ لَعَلَّكُم تَصطلُونَ «29» فلَمـا أتـاهـا نُودىَ مِن شاطىء آلـوادِى الأيْمنِ في البُقعـةَ المِبـاركـة مِن الشجـرةِ أن

ياموُسى إنّي أنا الله رَبُّ العالمين «30».

سورەتی «القصص»

غەزەلی 14/ی ل679

شتێکه بێ‌شەبیهـ و جینس و فەصلٚ و کەشف و تەقریره

موبەڕڕایه له تەقریرو حەدیثی حادیث و ڕاوی.

وەکو مدرس دەفەرموێ:

وشـەی بێ شەبیهـ ئیشـارەتـه به ئایـەتی «فـاطِـرُ السمـاواتِ والأرضِ جَعَـل لكم من انفسكُم أزواجـاً ومن الأنعـامِ أزواجاً يذرؤكُم فيهِ ليس كمثلِهِ شيء وهو السَّميعُ البصيرُ» ئایەتی «11».

سورەتی «الشوری»

ئەم جۆرە بەیتانە ئەگەر چی تاکە تاکەی وشەکانی عەرەبین، هەروەکو گوتمان تەلەفوزو شێوەی کوردی بەسەرا داوە.

* قورئاندا بە «ماأُخْفِي لَهُمْ» مەکتوم و مەختومە میان نابێ بە تەفسیری دو صەد «کەششاف» و «بەیضاوی»

مامۆستا مدرس:

ئەو خوایه کە کەس لە کونهی ناگا لە قورئانا بە ئایەتی:

«فلا تعلم نفسٌ ما أخفي لهم من قرّةِ اعيُنٍ، جزاء بما كانوا يعملون» باسی لێ‌کراوە. (ئایەتی «17» سورەتی «الشجرة»).

موبەیيەن بوو لە قورئاندا بە نووری «قُرَّةُ الأعْيُنِ» نەواضیح بوو بە «کەششاف»و، نەڕۆشن بوو بە «بەیضاوی».

ئیشارەتە بۆ هەمان ئایەتی:

«فَلا تعلمُ نفسٌ ما أُخفِيَ لهُم مِن قُرَّةِ أَعيُنٍ جزاء بما كانوا يعملون».

(ئایەتی «17» سورەتی السجدة)

غەزەلی 20/ی ل711.

لە بوستانی «ئیرەم»دا قەط نییە وەك

شەمامە وەك شەمامەی وەك شەمامەی

باخی ئیرەم لە قورئاندا ناوی هاتووە «إرم ذاتِ العِماد (7) ألتي لم يُخلَق مِثلُها في البلد (8).

[سورەتی 11] والفجر»].

یەك نیم رخت: «ألَيستُ منكم بِبَعيدٌ»

وان نیم دیگر: «إنَّ عذابي لَشدَيدٌ»

گەلێ ئایەت لە قورئانی پیرۆزدایە کە باسی «عذابی شدید» دەکا بەڵام لێرەدا ئیقتباس لەم ئایەتەیە:

«وإذ تأَذَّنَ ربُكمُ لئن شكـرتُم لأزيـدنكُم ولئن كفـرتُم إن عذابي لَشَديد». ئایەتی «7».

سورەتی «ابراهيم»

برگرد رخت نوشته «يُحيي وَيُميت».

«مَن مات مِن العشقِ، فَقَدْ مات شَهيدْ

زۆر ئایەت هەیە لە قورئانی پیرۆزدا کە باسی (يحي ويميت) دەکات وەکو «هو يحيي ويميت واليه ترجعون» (ئایەتی «56» سورەتی یونس).

جگە لە ئایەتی 257 سورەتی «البقرة»

جگە لە ئایەتی 156 سورەتی «آل عمران»

جگە لە ئایەتی 156 سورەتی «الاعراف»

جگە لە ئایەتی 116 سورەتی «التوبة»

جگە لە ئایەتی 080 سورەتی «المؤمنون».

تکـایـە بۆ شـەرحی بەیتـەکـان وەکـو لەپێشەوە گوتمان سەیری شەرحی «مـدرس» بکـەن. ئەگـەر ئیشـارەتیشمـان بۆ نەکردبێ، سەیری‌کردنی شەرحی بەیتەکان لای «مدرس» زۆر پێ‌ویستە.

## ٤ ـ نالی و زمان و ئەدەبیاتی فارسی: ـ

هەروەکو لەپێشەوە گوتمان نالی وەکو هەموو خوێندەوارێکی کوردی ئەو سەردەمە بەواتا هەروەکو هەموو مەلایەکی ئەو دەورەیە ـمی ئەو زروفەو ناوچە جوغرافیایەو باری سیاسی یەی کە میەتەکەی تیادابووە، دەبوایە شارەزایی پەیدابکا لە زمان و ئەدەبیاتی دراوسێکانی‌دا هەر وەکو پیشانمان دا.

عەرەبی بە هۆی دینی پیرۆزی ئیسلام و زمانی قورئانەوە شەرەزاییەکی تەواوی تیادا هەبووە ـ هەروەها لە زمان و ئەدەبیاتی عەرەبیش دا بە هۆی ئەوەی کە گەلێ لەو کتێبانەی کە لە مزگەوتەکاندا دەیان خوێند بە فارسی بوون جگە لەوەی کە زمانی ـلی ـ ئەلف وبێ‌کەی و گەلێ زاراوەی زانستی و عەروزو قافیەو مەبەستەکانی شیعر کە عەرەبین لە رێگای فارسی‌یەوە وەرگیرابوو، هەروەهـا دیوانی شاعیرە بەرزەکانی ئەو زمانە لەسەر دەمی خوێندەوارانی ئەو سەردەمە بووە وەکو سەعدی و حافزو نظامی و گەلێ شاعیرو ئەدیبی دی.

جگە لەوەی کە نووسین و ئینشائی سەردەمی ئەو بەو زمانە بووە لەبەر کاریگەری و نزیکی ئەو دوو زمانە لەیەکەوە.

لێرەدا دەمەوێ بەشێك لە رەنگ دانەوەی شیعری فارسی لە شیعری نالی‌دا بخەمە بەرچاوە هەروەها زیرەکی توانایی نالی یش پیشان بدەم. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە نالی جگە لەوەی کە وەکو هەموو شاعیرێکی موسڵمانی ئەم ناوچەیە، شارەزاییان دەربارەی بەرهەمی «نظامی و سەعدی و حافظ و جلال الـدین رومی و جامی» هەبووە، شارەزایی تەواویشی دەربارەی گەلێ شاعیرانی‌تری ئەو زمانە بووە وە ئەم بەیتەی کە دەڵێ:

**نالی ئیستە تاجی شاهی و تەختی خاقانی هەیە**

**شەوکەت ئارا ـ موحتەشەم دیوانە، فیکرەت صائیبە**[31]

بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە نالی زۆر شارەزا بووە لە ئەدەبیاتی فارسی‌دا هەر لەبەر ئەوەیە کە کاتێ غەزەلێك ویا بەیتێکی نالی دەبینی وا هەست دەکەی کە ئەو غەزەلە ویا ئەو بەیتە لە هینی ویا لە ریزی یەکێ لەو شاعیرە بەناوبانگانەی دراوسێ‌یە، کەچی کە سەیر دەکەی بە جۆرێکی وا دای‌رشتووە ئەگەر لە جایەکا لەژێر کاریگەری شیعری شاعیرێکی ئەو دراوسێ‌یەدا بووبێ بە ئاسانی دەرناکەوێ. جگە لەوەی کە نالی لەوان کەمتر نەبووەو زۆر بیروخەیاڵی هەیە کە تایبەتی‌یە بەخۆیەوەوە ئەوانەشی کە رەنگ دانەوەی شیعری شاعیرانی دراوسێی تیادا دەرکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر کەمن بە جۆرێکی وەها دای‌رشتووەو رەنگ و گیانی کوردی بەسەردا کێشاوە کە ئەمەشی جێی شانازی‌یە.

ئەو شاعیرانە نالی لەو بەیتەدا ناوی هێناون بەم جۆرەیە:

**شاهی**: شاعیرو خەت خۆشی بەرز کە لە هونەری نەخش و سازدا دەستێکی باڵای بووە لە ساڵی 857 کۆچی‌دا کۆچی دوایی کردوە.[32]

**خاقانی**: «افضل الدین ابو بدیل بن علی خاقانی بایەی لە قەسیدەدا یەکەمە، جگە لە غەزەل. لە ساڵی 595 کۆچی‌دا کۆچی کردووە.[33]

**شوکت شیرازی**: شمس الدین حسن ـ لەپیاوە باشەکان و نەجیب زادەکانی فارسە.[34]

**محتشم**: مولانا کمال الدین محتشم کاشانی ـ علی کوری خواجە میر احمد لە ساڵی «996» کوچی‌دا کۆچی دوایی کردوە.[35]

**فیکرەت**: «فکرت لاریجانی» ناوی سید نعمە الله ـ لە ساداتی لاریجانی مازندەران بووە، لە زەمانی فتحعلی‌شای قاجاردا ـ مامۆستای شازادەکان بووە.[36]

**صائب**: «صائب تیریزی» محمد علی بن میرزا عبدالرحیم صائب تیریزی لە شاعرانی سەدەی دوانزەهەمە. لە ساڵی «1080» کۆچی‌دا مردوە، لە شاعیرانی شێوە «هیندی» بە واتا «ئەصفەهانی» دەژمێرێت.[37]

نالی غەزەلی 1/3 ل83.

**تاتایی سەری طوررەی پر پێچش بادا**

هەر تایەکی بارێکی گوڵ و ناڵە بەبادا

شوکت شیرازی: دەڵێ: [38]

همــه آفــاق پراز رایـحـه مشـك شود
ازخـم زلـف تو گربـای صبـابگـشـایـنـد

«هـەمــوو ئافــاق پڕ لە بۆنی موشــك (میســك) دەبێ
لە پێــچی زوڵفی تو ئەگــەر بای سەبــا بیکــاتــەوە

غەزەلی 1/5 ل89.

نالی: شیرمی جا نەوتم یا مەیە؟ چا بوو فەرمووی
عەکسی لەعلی لەبی مەرجانە لە فنجانمدا

حافــز: مادر پیــالــه عکــســی رخ یار دیــدەایــم
ای بیــخــبــر ز لذتُ شرب مدام ما[39]

«عەکسی رووی یار دەبینین لەپیاڵەدا ئەی بێخەبەر لە لەززەتی خواردنەوەی (شەراب) ویا خواردنەوەی بەردەوامی ئێمە.

نالی: بەحشی سیرڕی دەهەنی نوقطە بە نوقطە بگەڕێ
سەری موویێ نییە بێ نوکتە لە دیوانمدا

حافز:

گفــتــم بنــقطــه دهــنــت خود که بُرد راه
گفــت ایــن حکــایــتیــســت که با نکتــەدان کننــد

گوتم: کێ دەتوانێ ڕێ بەرێ بە دەمت؟
گوتی: دەمم حیکایەتێکە دەیگێڕنەوە بۆ خەبیر بۆ هەڵ هێنانی

د. ابراهیم الشواری لە شرحی «ترجمة»ی ئەم بەیتەدا دەڵێ:
ثغره ضیق فهو یشبه النقطة في ضآلته وصغره
الکشف عنه لضآلته وصغره إلا خبیر یحل المعمیات والالغاز.

نالی:

نالی ئەو نوقطە کەوا بوو بە نیشانەی چاوی

من لە صەفحەی ڕوخی ئەو دولبەرە نیشانم دا

حافز:

مردم دیــده ز لطــف رخ او در رخ او
عکس خود دیــدگــمــان برد که مشـکیـن خالیست

عەکس چاوم لەســەر گۆنــەی نازکــی ئەو
بیــلبــلەی چاوم لەســەر گۆنــەی نازکــی ئەو

ئەوەنــدە گۆنــەی ناســك و ڕوون بووە بیــلبــلەی چاوی کە نوختــەیــەکی ڕەشــە لەســەر گۆنــەری عەکس داوەتــەوەو (بــەواتا) ڕەسمی بیلبلەی چاوی لە گۆنەیدا دەرکەوتووەو وایزانیوە خاڵێکە لەسەر گۆنەی لای‌نالیش هەمان واتای هەیە.

غەزەلی 6/أ ل93

نالی: مەثەلی حاڵی ئەشکەنجەیی غەمدا
وەك ناڵە لە نەیدا وەکو نالە لە قەڵەمدا

جلال الدین رومی (مولوی):

بشنو ازنی چون حکایت می‌کند
وز جدائیها شکایت می‌کند[40]

ئەمە یەکەم بەیتی مەولەوی‌یە (جلال الدین رومی) کە مثنوی پێدەست پێکردووەوە مثنویش بریتی‌یە لە دەوری «26» هەزار بەیت.

دەڵێ: گوێبگــرە لە شمشــاڵ «نــای» چۆن حیکـایــەتــەکەی دەگێڕێتەوە ئەویش شکاتە لە دەست جیابوونەوەو دوری.

غەزەلی/ 9 ل101

ضابیطەعی طەبعم سوارە، ئیدیعای شاهی هەیە
موحتەشەم دیوانە، داوای تەختی خاقانی دەکا

سەیری شەرحی مدرس بکە ل102 ـ 103

لێرەدا هەمیســانــەوە ئیشــارەتە بۆ ئەو شاعیرانە کە لە (31)دا

باسمان کرد نالی خۆی لە مانە بە کەمتر نەزانیوە. وە شارەزایی نالی پیشان دەدا لە زمان و ئەدەبیاتی ئەم شاعیرانە.

**ئیستیطاعەو قووەتی طەبعم، بە کوردیو فارسی**
**عارەبی ئیظهاری چالاکیو چەسپانی دەکا**

ئەم بەیتە شارەزاییو توانایی نالی لە زمان و ئەدەبیاتی فارسیو عەرەبی جگە لە کوردی کە زمانی خۆیەتی دەچەسپێنێ.

غەزەلی 14/أ ل118

نالی: **ئەی واعیظی باریدچییە هەروەك هەرەسی کێو**
**بەو وەعظە کە بایە هەمو، هاتوویی بەسەرما؟**

**حافز:**
**برو بکـار خود ای واعـظ ایـن چەفـریـادسـت**
**مرافـتـاد دل ازرەتـرا چە افـتـادسـت**
**برۆ بە لای ئیشتەوە ئەی واعیز ئەم هەروا هاورە چیە؟**
**دڵم لە رێ لای داوە بە تۆ چی؟ مەبەستت چییە؟**

غەزەلی 1/ب ل133

**عاشق هەوەسی مەیکەدەو و عیلمی بەسیطە**
**عاقڵ طەلەبی مەدرەسەوو جەهلی مورەککەب**

حافز:
**حدیث مدرسەو خانقە مگوی کە باز**
**فتاد درسر حافظ هوای میخانە**

توخوا! ئیتر باسی مەدرەسەو خانەقا مەکە
ئارەزوی مەیخانەو شەراب کەوتە سەری خافز
(کەڵکەڵەی مەیخانە شەراب کەوتە سەری خافز)

غەزەلی د/1 ل168

**غەزەلی فارسی**

**ابروان تو طیبان دل افگارانند**
**هردو پیوستە ازان برسر بیمارانند**
**گنج رخسار تو دیدن نبود زهرەمرا**
**کە زلف تو برو خفتە سیەمارانند**
**ماهزاران، زغمت خستەو ناکام، ولی**
**کامیاب از گل روی تو خس و خارانند**
**برسرکوی خود از گریە مکن منع مرا**
**زانکە گلهای چمن منتظر بارانند**
**نرگسان تو کە خواب همە عالم بروند**
**خفتگانند، ولی رهزن بیدارانند**
**«نالیا» ارچەسگانش همەشب نالانند**
**کە نە آن شینقگان نیز جگر خوارانند**

ئەم پارچەیە شارەزاییو توانـایی نالی پیشـان دەدا لە زمان و ئەدەبیـاتی دراوسێی شەرقی، بۆ شەرحی ئەم پارچەیـە سەیری دیوانی نالی/ مدرس ل168 ـ 169 بکە.

دو بەیتی فارس/ 6 ل219

**آن زلف مشکبار بدان روی چون نگار**
**گر کوتەاست، کوتهی از وی عجب مدار.**
**شب دربهار میل کند سوی کوتهی**
**آن زلف چون شب آمدو آن روی چون بهار**

غەزەلی م/12

نالی: **مەجلیسێکی چەمەن و بولبول و بەزمی گوڵ و مول**
**بەدو صەد مەدرەسەوو دەرس کیتیابی نادەم**

حافـز: **ازقـیـل و قا مدرسـە حالـی دلـم گرفـت**
**یکـچـنـد نیـز خدمـت معـشـوق و میکـنـم**
**لە بگرەوبەردەی مەدرەسە دڵم گیراوە**
**هیچ نەبێ جاریکێش خزمەتی مەعشوق و شراب و پیاڵە بکەم.**

کردووه».[7]

دوای ئەم رووکاری پێشەکی‌یەی، ئنجا هاتووە، لە ژێر ناونیشانی.

«چاکی زانستی مێژووەدا، بەشێکی تەرخان کردووە، دوای ئەوەش؛ ناونیشانێکی بچووکتری داناوە کە ئەمەیە:

«لێکۆڵینەوەی رێگەکانی نووسینی مێژووو روونکردنەوەی هەڵەو خەیاڵکردی مێژوونووسان و، باسکردنی هەندێ هۆو بنەمای ئەو هەڵانە»؛[8] لەمەشەوە بە ئاشکرا بەرنامەی هۆشمەندانەی ئیبن خەلدونمان بۆ دەردەکەوێت کە لە رەخنەکاری مێژوودا ویستوویەتی لەسەری بروات و، ئەوەشمان بۆ روون دەبێتەوە کە لەم رێگەیەدا، ئەو پیاوە، چاوساغ و خاوەن رای خۆی بووە.

کەواتە ئەم خاوەن بیرە، بەگوێرەی توانای خۆی و دۆخی ژیان، تەواوێ، ئاگاداری ئەو کارە خەتەرناکە بووە کە دەکەوێتە ئەستۆی ئەو کەسانەی دێنە مەیدانی مێژوونووسینەوە.

نەك هەر ئەوەندە، بگرە لەوەش زیاتر رۆیشتووەو دەفتەری مێژوونووسی مەزن «ئەلمەسعودی»ی هەڵداوەتەوە، کە زیاتر لە چوار سەدو پەنجا ساڵ پێش خۆی[9] ژیاوە، بە راستیش یەکێك بووە لە خولیا لەسەرانی بیری مێژووناسی لە ناو عەرەب و هەموو موسڵمانانیشدا، بە رادەیەکی وەها کە (ڤۆن کریمەر). «هیرۆدۆتی عەرەب»ی[10] ناولێناوەو ئیبن خەلدون خۆشی لە پایەیەکی بالادا دایناوەو ئیمامی مێژووناسانی»[11] پێ‌ووتووە.

رەخنەگرتنی ئیبن خەلدون لە مەسعودی لاپەڕەیەکی زۆری کتێبەکەی گرتووەتەوە، تا، جارێکیان بەوە دوایی بە ووتەیەکی هێناوە کە دەڵێت: «ئەم دەنگوباسە لە راستی‌یەوە دوورن، بە قوولاییش پرن لە هەڵەو هەرزەیی و خەیاڵکاری‌و، لە چیرۆکی هەڵبەستراویش دەچن».[12] ئنجا دەڵێت:

«ئەوەی لەمانە بە گوێتدا هەڵدەدرێت بڕوای پێ‌مەکەو، لە دەنگوباسان سەرنج بدەو، لەگەڵ یاسای دروستدا بەراووردیان بکە، زۆر بە باشی بۆت ساغ دەبنەوە».[13] ئەم ووتەیەی ئیبن خەلدون، بێ‌گومان داوایەکی هۆشمەندانەو تەواوەو، نیشانەی ئەوەیە کە زۆر ئاگاداری مێژووبووە ئومێدەواریش بوو کە مێژوویەکی ووردکار بنووسێت و هەموو کارەساتەکانیشی بداتەبەر رەخنەو یەکالاکردن و تاقی‌کردنەوەو هەموو گێرانەوەیەکی نامافوولێش پەرکات و بیداتەدواوە. ئەو کۆسپ و تەگەرانەشی لێ‌روون بوو کە کاتی خۆی نەیانهێشتووە مێژوو بە شێوەیەکی راست و دروست بنووسرێتەوە. بە نموونە لایەنگری‌و دامێنگرتنی مەزهەبێکی دیاری‌کراو یەکێك بووە لەو کۆسپانە، چونکە وەکو ئەو دەڵێت: «لایەنگری سەرکوێری‌یە». هەروەها پشت گرتنی کاربەدەستێك و فەرمانرانێك یان داتاشین بە لای بنەماڵەیەکدا بۆ مشەخۆری، دیسان یەکێکە لەو کۆسپانە، ئەو دەڵێت: هۆیەکی گومڕاهی‌و چەوت ڕەفتاری‌ی هەندێ مێژوونووس ئەوەیە کە لە بەرپێ‌ی خاوەن پارەو پایەدا دەکەوتە کلکەلەقێ‌و خۆتێ هەڵسوون و، ژیان و پلەو پارەیان پێویستەو هیچی‌تر.

لەوانەشە، مێژوونووس حەز بە شارەزابوون بکات و بیەوێت شتی راست بنووسێت، کەچی دەشکەوێتە هەڵدێری نووسینی خەیاڵکاریشەوە ئەگەر، تەنیا هەر لەم و لەوەوە وەرگرێت و بێ‌نووسێت و عەقڵی خۆی نەخاتەکار، واتا ئەو جۆرە مێژوونووسە لەسەر نووسراوەکانی مێژوونووسانی پێش خۆی دەروات و، بێ‌لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی ووتەکانی ئەوان، وەریاندەگرێت و دەیانتووسێت، واتا وەك شتی بەپێزیان لێ‌وەردەگرێت، هی بێ‌پێزو بێ‌بایەخیشیان لێ‌وەردەگرێت و دەیاننووسێت.[15]

لاسایی‌کردنەوەش لە نووسینی مێژوودا وەکو گێرانەوەی زانیاری‌یەکانی شەریعەت نی‌یەو جیاوازە (بە تایبەتیش هی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر) (د. ر). بەلام ئەوەی راستی بێت، ئیبن خەلدون لە نووسینەوەی مێژوودا، ـ هەرچەندیشە رەخنەی لە نووسینی مێژوونووسانی پێش خۆی گرتووە ـ کەچی لە هی ئەوان بە کردار لای‌نەداوەو رێبازێکی تازەی نەگرتووەو، شتێکی بەکەڵکی دانەهێناوە.

حيت دەبینین مێـژ ووی هەر لە سەر ناوەرۆکــە کۆنـەکـەی ســیمەومو پێشی نەخستووە. بەڵێ ئیبن خەلدون گەر لە شانی پێشـەکی)یـەکـەیەوە تێ‌ی‌بڕوانین تازەخواستێك و نوێخوازێکی ـگێڕانەیە، بەڵام لە نووسینی کتێبەکەی تری‌دا (کتاب العبر ميون المبتدأ والخبر في ايام العرب والعجم والبربر) لاسایی‌ی مێژوونووسانی پێش خۆی دەکاتەوەو لەبەریان دەنووسێتەوە. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە ئیبن خەلدون وەکو دوو گیانی ناو جەستــەو بانێکی دوو هەوا بە ئاشکــرا لەو دوو کتێبــەی‌دا خۆی‌دەنوێنێت، کە پێویستە تێکەڵیان نەکەین و لێکیان بکەینەوە، ـیك سەرمـان لێ‌بشێـوێت و لێمان تێك بچێت و بکەوینە سەر ـگەی نەهاتی ئاڵوزکاوی‌و گومڕاهی.

لەگـەڵ ئەوەشـدا، لە نووسینـەکانی خۆی‌دا، ئەو لایەنانەشی ـەی بەدڵ بووە، کە پەیـوەنـدی‌ی بە مێژ ووەوە هەیـە. ئەوەتـا بە جۆرێـك سەیـری (کتـاب العبـر. .)ەکـەی خۆی دەکـات کە: «کتێبێکە دەنگوباسی هەموو جیهانی تێدایەو، هەموو ستەمێکی حەقو زەقی ئاسـان کردووەو، هۆکارو بنەماکانی کارەسات و ڕووداوی دەوڵەتەکانیشی خستووەتەڕوو»[16] ئومێدیشی ئەوەبو کە ئەم کتێبەی ببێتە بناغەیەك و مێژوونووسان دوای خۆی چاوی‌لێ‌بکەن.[17] کەوابێت، لێرەدا، دەبێت بپرسین، ئایا ئیبن خەلـدون لەم بانـگە هەڵـدانـەیـدا هیـچ سەرکـەوتـنـێکی دەست کەوت؟ ئەوە زانراوەو ئاشکرایە کە هاوچەرخەکانی خۆی، هەمـوویـان، بە یەك چاو سەیـریـان نەکـردووەو چونـیـەك هەڵیان نەسەنگاندووەو لە ناو خۆیاندا، دەربارەی ئیبن خەلدون زۆر ڕاڕاو جیـاوازبـوون. . بگـرە هەندێکیشیان بە سەختی‌یەکی تەواو ڕەخنـەیـان لێ‌گـرتووەو، هەندێکی‌تریشیان، لەبەر نایابی‌ی بیـروراکـانی (پێشـەکی)یـەکـەی بە چاوی ڕێـزگـرتنـەوە سەیریان کردووە، بەڵام لە نووسینی مێژووەدا چاویان نەپۆشیوەو ڕەخنەیان لێ‌گرتووە، بەتایبەتیش ڕەخنەیان لەو مێژ ووەی گرتووە کە، باسی (مـەشـریق) واتـا مێـژ ووی وولاتـانی خۆرهـەڵات دەکات کە (عیراق و وولاتی شام دەگرێتەوە). بە نموونە، ئیبن حەجـەر ئەلعـەسقـەلانی ئەلمیصری‌ی مێژوونووس (م 852ك/ 1449ز)، کە خۆی بەڵگـەنـامـەی لەو وەرگرتووەو بە شانوباڵیدا هەڵـدەداو چاکــەو کرداری باشی دەردەخـات، کەچی لەگـەڵ ئەوەشدا هێشتا لە نووسینەکانی ئەو مامۆستایەی خۆی بەگومانەو، ئەوەندەی پێ‌ناچێت و دەڵێت:

ئیبن خەلــدون بە شێــوەیــەکی ڕوون و ڕاست ئاگــاداری دەنگــوبـاس نەبـووە، بەتـایبـەتیش دەنگـوبـاسی رۆژهـەڵات. بەدروددین ئەلعینی‌ی مێـژ وونـووسیش (م 855ك/ 1451ز) لە کتێبــەکـەی خۆی‌دا (عقـد الجمـان في تأريـخ اهـل الـزمـان) هەروەکو ئیبن حەجەری لێوە نووسیوەو، نووسەری‌تریش هەبوون کە هەر وایان لە بارەوە نووسیوە.[18]

ئەوانە، کە هاوچەرخ و هاوسەردەمی خۆی بوون، ئەوەبوو بە چاوی ڕێـزگـرتن سەیـریـان دەکـردو سەریـان لێ‌ی سوڕمـابوو، دواییش لە دڵیان گرت و ڕق و کینەیان لە دەرووندا لێ‌ی جۆشاو کەوتنـە بەربـەرەکـانی‌و جاروبـاریش بە ئاشکرا دوژمنایەتی‌یان لە دژ ی بەرپادەکرد. بەڵام ئەمڕۆ ئەگەر مێژووەکەی بە شێوەیەکی ڕاست، کە وەکـو هەیـە هەڵسـەنگێنین، کە ئێستـا ئەو گێژەنگی دوژمنـایـەتی‌یـە نەمـاوەو ئەو کەفوکوڵی ڕق و کینەیە نیشتووەتەوە، دەبـیــنـیـن کە ئەو خاوەن بیــرە گەورەیــە لە بارەی سەرەتــای گونـجــانــدنی گێــڕانــەوەو باس کردنی ڕووداوو، (مــەنتیقی) باوەڕپێ‌کـردنی‌یـەوە، چەند نموویەکی خستووەتەڕوو پێشکەشی کردوون و لە بەشی باسکـراوی پێشـەکی‌ی کتێبـەکـەی‌دا «فضل علم التأريخ وتحقيق مذاهبه. .» دەری‌بڕیوە. لەوێ‌دا، ئەوەی «ئەلمەسعودی»و گەلێ مێژوونووسی‌تریش لە بارەی لەشکرەکانی «بـەنی ئیسـرائیلەوە» نووسیـویـانـە کە گوایـا موسـا پێغـەمبـەر لە بیــابــانــەکــەدا، دوای ئەوەی پاکـوپیسی کردوون و چەکی بە تواناکـانیـان داوە، بە تایبـەتیش بەوانـەیـان کە تەمـەنیان بیست ساڵان و لە بیست زیاتربوون، دوای ئەم بژارکردنە، ژماردوونی‌و شەش هەزار کەس یان زیاتر بووبن)،[19]

ئەم ئەو باسانە وەها دادەنیت کە ـ بێ‌گومان ـ ناتوانن خۆیان لەبـەر ڕەخنـەکاری‌یەکی کاکڵکردا[20] ڕابگرن چونکە لە ڕووی جوغــرافی‌و ستــراتیجی‌یــەوە ڕێ‌ی تێ‌نــاچێت و، پێکهێنـانی

لەشکرێکی گەورەی، بەو جۆرە، گەر نەشڵێین، ستەمە دەتوانین بڵێین گەلێـك گرانــە، بە تایبـەتیش ئەگـەر لەگـەڵ لەشکـرانی میللەتــانی تــردا بەراووردبکــرێت کە گەلێــك «لـــە «بـــەنی ئیسرائیل»یش بەهێزترو فەرمانڕەواتربوون. یان، ئیبن خەلدون، ووتــەنی، «لــەشکـرێـك بەو گەورەیی یـە، دووره بتـوانێت لەو شوێنەدا بکشێت یان بکەوێتە کوشتارەوە».

چونکـە «ئـەو زەوی یـە ئەو فراوانی یـەی نی یەو تەنگە»و ئەگەر لەشکرێکی ووها، هەتا چاوبردەکات بە دوو ریز، یان بە سێ ریـز، یان زیـاتـر، بێتەنەبەردەوە، زەوی یەکی فراوان و ماوەیەکی دووری دەوێت. ئەمجا دەڵێت؛ : ئەم دوو لەشکرە چۆن چۆنی دەکەونە کوشتارەوە، یان چۆن چۆنی لایەکیان سەردەکەوێت کە قۆڵێکی ئاگای لە قۆڵـەکـەی تـری نەبێت؟ ئەوەی ئیستـاش هەیە هەروەهــایـــەو بەڵگـەی ئەوەیـە، رابـوردووش هەروەکـو ئاینـدە وایــە».[21] دوایـیش بەڵـگـــەی بەرێوجێی تــریش دێنێتــەوەو زیادەووتنی مەسعوودیی پێ بەدرۆ دەخاتەوەو[22] ئنجا دووایی بە قسـەکـەی دێنێت و هۆی ئەم زیـادەووتنـە لێـك دەداتـەوەو «ئـەو زیادەووتنە لەوەوە هاتووە کە هەندێ مرۆڤ حەز لە شتی سەیرو سەرسـوڕهـێن دەکـەن و، زمـانیش هیچی تێ نـاچێت و، ئەو کەسـانـەش کە دووی ئەو دەنگـوباسە دەکەون و لێی دەکۆڵنەوە گێلن و ئەوەنـدەش بەتـەنگـەوە نین».[23] دوای ئەوەش درێـژەی دەداتێ و هەندێ گێڕراوەش بە نموونە دێنێتەوە کە مێژووتووسان بە درۆو دەلەسە هەڵیان بەستووە.

ئنجـا دەیـانـداتـە بەر نەشتـەرکـاریی رەخنـەو لێکـۆڵینـەوەو بەرپـــەرچیـــان دەداتـەوەو بە نمـوونـە، دەڵێت: «تـەبـابیعـە» کە پاشاکانی یەمەن بوون، باکووری ئەفەریقایان داگیرنەکردووەو درۆیـــە.[24] هەروەهـــاش نەهـــامـــەتیی بەرمـــەکیی یـــەکـان کە هارونــەڕەشیــد بەســەریـانی هێنـا، کە عەبباسـەی خوشکی هارونەڕەشید درۆیە دڵی لە جەعفەری کوڕی یەحیای کوڕی خالیـد چوویێت و حەزی لێ کـردبێت، ئەلـرەشیـدیش ئەوەنـدە جێی باوەڕنی یـــە کە ئارەق خۆر بوویێت و لەگـەڵ سەرخـۆشـان سەرخۆش بوویێت، ئیبن خەلدون دان بەوەدا نانێت و دەیەوێت نەیسەلمێنێت و بەدرۆیبخاتەوە.[25] هەروەهاش دەڵێت: خەلیفە مەئـمـوونـیـش ئارەق خۆر نەبـووە.[26] دوایـیش ووتـەی ئەو مێـژوونـووسـانـەش دەداتـەدواوە کە گومانیان لە رەسەنی خەلیفە فاتمی یەکان کردووە،[27] هەروەهاش رەسەنی ئیدریسی یەکان کە نەوەی حەسـەنی کوڕی عەلیی کوڕی ئەبی تالبن.[28] لەسـەر ئیمام مەهدیی سەرۆکی دەوڵەتی موەحیدینیش[29] دەکاتەوەو، رای تەواوی خۆشی بەرامبەر بە ووتوواتی تری مێژووش دەردەبڕێت.[30]

ئیبن خەلـدون لەمـەر ئەو دەنگـوبـاسـانـەی مێژووە دەڵێت: ئەمانە هەموویان لە راستی یەوە دوورن و درۆن، خەیاڵکردێکی کۆنی هەرزەیی و هەڵـەن و لە چیـرۆکی داتـاشـراو دەچن[31] ـ لە جێگـەیـەکی تـریشـدا ووتویەتی: ـ «بەوانەی بۆت باس دەکرێت بروا مەکە، سەرنجی دەنگوباسان بدەو لێیان ووردببەرەوەو لە سەنگی یاسای دروستی بدە، ئەمجا بۆت روونەبنەوەو بە باشی بۆت دەردەکەون»،[32] جا ئەوانە بە مشەخۆر لە قەڵەم دەدات، کە ئەو ئەفسـانـانـانـە بە شێـوەیـەکی بەرێوجێ لێـك نادەنـەوەو دەڵێت: «کاکڵ و توێکڵ تێکەڵ بووەو راستگۆو درۆزن رەشبەڵەکیانە».[33]

ئەم خاوەن بیــرە، ئەو نمــوونــانـەی بە رەخنـەکـاریی یـەکی کاکڵکــردەوە هێنـاوەتـەوە تا لە راستیی هەمـوو دەنگـوبـاسێـك دڵـنـیـابـبـیـن و پاکـوپـیـسـیـان بکـەیـن. بەڵام ، هەرچەندە توانیویتی کە ئەفسانە بێ ڕێوجێ، بە تیری رەخنە بپێکێت و، ئەوانـەش دابـربکـات کە بەرگەی رەخنەی مێژووکرد ناگــرن، کەچی بەرامـبەر بە هەنـدێ ئەفسـانـەی تـر، کە خۆی باسی دەکـات و، جێگـای باوەڕ نی یـە، بەرگی بێلایەنیی لەبەر خۆی داماڵیوەو تووشی هەمان ئەو لایەنگری یە بووە کە خۆی بە شێــوەیــەکی راســت و دروست لەوەپێش، خوێنــدەوارانی لێ ئاگادارکردبووەوە. ئەوەتا تەواوی و بە شێوەیەکی ـ دوگماتیکیانە ـ بریار دەدات کە ئیدریسی یەکان «کاربەدەستانی سەدەی دووەم و سێ هـــەمی کۆچی ـ هەشتـەم و نۆهـەمی زایینی ـ لە مەغـریـب» رەسەنیان راستەو ووهایە، بەو بەڵگەیەی کە خودا ئەهل وولبەیتی

«هـ البيت» له گوناه ششتووهتـهوه وهكو قورئان دهفهرمویّت، ههرئهوه رێی تیٚناچیّت كه له ئال ولبهیت «آل البيت» نهبن.

ڕچهی بهرنامهكاریی ئیبن خهلدون ههرچهنده ڕاسته، بهلاّم ههگهڵ ئهوهشدا، وهكو ههموو میٚژوونووسهكانی‌تر، له نووسینی میٚژووهكـهیدا، بیٚ‌هـهڵـهشـهو ههڵه نهبووهو لهو بهرنامهیهی كه خوّی داینــاوه، لایداوه، چونكـه ڕاستی‌ی تهواوو بیٚ‌لایـهنی‌ی ئهو ئامـــانجیٚكــه، تا میٚـژوونـووس پیٚی‌دهگـات، دهپسیٚت ـ ههوش سهیـرتـرو ترسنـاكتـریش ئهوهیـه كه ئیبن خهلـدوونیش حورمهتی دهسهلاّتدارانی كردووهو، تا، كه، تهواویٚكیش، لیٚبراو نهستی‌دایـه زانیـاری هیٚشتـا ههر دهستی لهوان ههڵنـهگـرت و به تهواوی پهیـوهنـدیی لهگهڵیاندا نهبری‌و سوودی له داڵدهداری‌ی ئهوانـه ههر وهردهگـرت. ئهو له میصـر ژیـاوهو سوڵتان (ئهززاهیر بهرقـوق «الظـاهـر برقـوق» 784 ـ 801ك، 1382 ـ 1399ز) دهنـــدهی داوهو چاوی لیٚی‌بـووه. ئیبن خهلـدون، كه، خوّی، میٚژوونووسان به ئاگادههیٚنیٚتهوهو دهڵیٚت: نهكهن «دووی خاوهن بهرمو پایه بكهون و پیٚیاندا ههڵبڵیٚن».

كهچی خوّی ههڵ خلیسـكــاو به ههردوو پیٚوه كهوتـهنـاوی، ئهوهتا ئهوهی ههڵبهستوو كه گوایا، سوڵتان بهرقوق، به ڕهسهن، دهچیٚتــهوه سهر هوٚزی غهســـــان، به مهبــهستی ئهوهی كه به عهرهبی لهقهڵهم بدات و ڕیٚزیٚكی زیاتری بوٚ برهخسیٚنیٚت. جا، هاتووه بوٚ ئهم مهبهسته دهستی‌كردووه به پشكنین و بیركردنهوه، تا، كه زانیی ئهم میره، له هوٚزی چهركهسه، واتا ئهوانهی كه له چیاكانی دهوروبهری وولاّتی قهفقاس و ڕووس و لان له باكوور ژیـاون و نیشتـهجیٚبـوون، كه گوایـا ئهوانه لهو غهسسانانهن كه كاتی خوّی به سهروٚكایهتی‌ی (جهبهله بن ئهلئهیههم «جبلة بن الايهم»)ی میریانهوه گهیشتوونهته وولاّتی ڕوٚم.. هات و ئهمهی دوٚزیـیهوهو ووتی: ـ دوورنی‌یـه ڕهسـهنیـان تیٚكـهڵ بوبیٚت، ئهو چهركـهسـهش كه خوّی به غهســـان لهقـهڵهم بدات (وهكو ئیبن خهلدون دهڵیٚت)، ئهوه. ههر له غهسسانهو، ڕاست دهكات و، ڕهسهنه.[34]

ئیتـر دوای ئهم لیٚكـدانـهوهیـهی تیٚكـهڵبـوونـهی ڕهســهنـه، به زمــانیٚكی پیٚــداهـهڵ گوتنی ئهوتـوٚ دریٚـژه به نووسین دهدات كه تهواوی ڕهفتـاری كلكـهلـهقی‌و ماستاوساردكردنهوهی ناو كوٚشكی پاشــایــانی پیٚــوه دیــاره. ئیبن خهلـدون ئهوهیـه كه ئهو كتیٚبـه «پیٚشـــهكی»یـه نایابـهی خوّی له خهلاّتی سوڵتـانی مهغـریب و لئـهقصــا (المغـرب الأقصى «ئـهبی فارس عهبـدولعـهزیـز بن ئهبیلحـهسـهن ئهلمـرینی‌ی ـ دووهم ـ»)دا پیٚشكهش كردووهو بهم شیٚـوازهش پیـایـداهـهڵـدهڵیٚت: ((میری موسوڵمانان، سهروٚكی خوٚمان، ئیمامی تیٚكوشهر، سهروهرو خوٚبهختكار، وولاّتان گرو چاكــهكــارو بیٚگـــوزهران و ههژار، بهخشین ڕهفتـار، كوٚكـاری زانیـاری‌ی پرشـوبـلاّو، خاوهن ڕای دروست و درهوشـاو، ڕوٚڵهی سوڵتــانی گهورهی تیٚكــوٚشــهرو پیــروٚزی سهروهرمـان، نهوهی سهروٚكــانی پایـهبڵنـدی (هـوٚزی مرین)، ئهوانـهی كه ئایینیـان تازهكردهوهو زیندوویان كردهوه»..

ئیتر به جوٚریٚكی ئهوتوٚ لهسهری‌دهڕوات و پیایداههڵدهڵیٚت تا دوو لاپهڕهی تهواوی بوٚ پڕ دهكاتهوهو له بهرایی كتیٚبهكهیدا زیاتر له (250) ووشهی پیادا دهڵیٚت.[35]

ئهمـــهش بهڵگــهیــهكی تهواوی ئهوهیـه كه ئیبن خهلـدون، سهرهڕای ئهوهی له ڕووی بیركردهوه، بهرنامهكاری‌یهكی ڕاستی بوٚ خوّی دوٚزیـوهتـهوهو، دانـاوه، كهچی، به كردار نهیتـوانی ئهو نهخشه ڕاست و دروستهی كه به دهستی خوّی ڕهنگی‌ڕشتبوو له گریٚ‌و قوٚرت و چهوتــوچــهویٚلی ڕاست بكــاتــهوه. ئهو ههڵـهو ههڵــهشـهیی‌یـهی ئهویش تیٚی‌كـهوت، یان لهبـهر ئهوهبـووه كه ئهوهنده ههستی به لای بیروباوهڕهكهی خوٚیهوه نهبووه كه دهبوو لیٚی لانهدات، یانیش به ههموو ههست و هوٚشی خوٚیهوه ئهو ڕیٚگــهیـهی گرتـووه، كه له مهیـدانی ڕامیـاری‌دا خهریـك بووهو دهستكهوتی ژیانی خوّی پیٚدابین كردووهو سوودی ماددی‌ی لیٚ‌وهرگرتووه.

ئهم باســه ئهوهنــده كاریٚـكی ئاســان نی‌یــه، لهم كورتــه لیٚكـوٚڵینـهوهیـهدا بتـوانین ئهوهی ئیبن خهلدون له دهنگوباسی ناو میٚژووهكهیدا داینـاوه ڕوونی‌بكهینهوه. ئهو لهو میٚژووه فراوانهدا، كه دایـنـاوه وهكـو میٚـژوونـووسانی‌تری پیٚش خوّی‌و ئهوانهی پاش

خۆی، دوو جۆرە کرداری هەیە:

کردارێکی ئەوەیە، کە لەوانەی پێش خۆیەوە وەریگرتووەو نووسیویەتی، کردارەکەی تریشی ئەوەیە، کە تەماشادەکات و تێدەڕوانێت. ئەو پرسیارەش، کە دەیکەین ئەوەیە، ئایا ئیبن خەلدون بە چاکیی ئەوانەی هەڵبژاردووە، کە وەریگرتوون؟ ئایا بەسەر ئەوەدا، کە وەریگرتووەو لەبەری نووسیوەتەوە، هیچ ئەو بەرنامەیەی خستووەتەکار، کە خۆی داوایدەکرد مێژووی لەسەر بنووسرێتەوەو مێژوونووسان بیخەنەکار؟ واتا ئایا ئیبن خەلدون، بەگوێرەی بەرنامەگەرییە تازەکەی خۆی، (بەرنامەی بەکارهێنانی بەڵگەی هۆشمەندانە) لە نووسینەوەی مێژووی سەدەکای رابووردودا، هیچ لە مێژوونووسانی پێش خۆی سەرکەوتوتر بووەو؟ لەوان باشتری نووسیوە؟.

وەڵامی ئەم پرسیارەش وەنەبێ تەواوێ سوودی بەرنامەکەی ئەوەی تێدابێت. هەر بە نموونە: ئیبن خەلدون دەڵێت، لە سەردەمی حوکمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتابدا (خوای لێ ڕازیبێت) دەست کرا بە گرتنی وڵاتی مەغریب. ئەمەش خەیاڵکردنێکی سەرسوڕهێنە کە بە مێشکی مێژوونووسێکی گەورەی وەك ئیبن خەلدوندا هاتووە. کە دەشڵێت:

«ژنە زەیوانە مەغریبییەکە» 127 ساڵ ژیاوە، ئەم وتەیەش ـ وەکو خۆی دەڵێت ـ دووبارە هەر ئەوە دەگرێتەوە کە (مرۆڤ حەز لە ئەفسانەی سەرسوڕهێن دەکات)و، ئەوەیە کە خۆی نووسەرانیتری لێ بەئاگا هێناونەتەوە، کەچی خۆی کەوتە ناوی.

ئەوانەی ووتمان (شتێکە لە گشتێك)و بەڵگەیەکی تەواون کە ئیبن خەلدون، هەرچییەکی نووسیبێتەوە، بە باشی نەیداوەتە بەر تیشکی ئەو بەرنامەکارییەی کە خۆی سازیکردووە، کە هەوەکو هۆشی بە لایەوە نەبووبێت و لەبیریچووبێت، وابووە.

ئەویش بە چەشنی گەلێك لەوانەی، کە بە دەستی خۆیان بەرنامەی لێکۆڵینەوەیان داناوەو، ڕێوشوێنی بەجێی ڕەخنەکاریی ئەفسانەیان نیشان داوەو، خاوەنی بیردۆزەیەکی تەواوبوون لە فەلسەفەی مێژوودا، کەچی لە لێکدانەوەی رووداوە مێژووکردەکاندا سەرنەکەوتوون و تیایدا کۆڵ بوون.

ئیبن خەلدونیش هەروا بووەو، کەم و زۆر لەوانیتر کەموزیادیی نەبووە، لە رووی پێداکوتان و چەسپاوی‌و بەراوورد سەرنج و لێکۆڵینەوەوە هەر وەك ئەوان بووەو بەوانی نەووتووە بچن بەولاوە، بە جۆرێکی وەهاش کە مرۆڤ هیچ هەست بەوە ناکات کە ئەم خاوەن بیرە مەزنە بە شێوەیەکی تازەبابەت مێژووی نووسیبێتەوە.

کەواتە کتێبی (العبر) لە رووی گێرانەوەوە، وەکو ووتمان، بێکەموکووری نییەو، زۆریشی تێدایە، بە جۆرێك کە بەرگی پڕ شانوشەوکەتی لەبەر داماڵیوەو ئەو چریسکەیەشی کە تا ماوەیەکی زۆریش پێوەی دەدرەوشایەوە خامۆش بوو نەما. بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم خاوەن بیرە کە شتێك دەگێڕێتەوەو، بە چاویش دیویەتی، نرخی خۆی هەیەو پشت گوێ ناخرێت، واتا ئەو رووداوانەی کە لە چەرخ و سەردەمی خۆیدا دیونی، یان هاوبەشیی لە سازدانیدا کردووە، لە ماوەی ژیانی خۆیدا، وەکو نوێنەرێکی چالاك دەورەکەی خۆی دەخاتەروو.

بەمانەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئیبن خەلدون مێژوونووس نەبووە بەو مانایەی، کە هەیە، بەڵام لە کارو فرمانی مێژووکردەوە هەنگاوی ناوەو، ئەوەی بە چاوی خۆی دیویەتی، بە شێوەیەکی ووردکاری ئەوتۆمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە لە گێرانەوەی ئەم دەم و ئەو دەم گەلێك تەواوترە.

چونکە ئەو زۆرتر بەتەنگ ئەوەوە بووە کە هۆو ئەنجامی رووداوەکان روون بکاتەوە، نەك هەر بیانووسێت و هیچیتر. ئامانجیش لە نووسینی مێژوودا، خودی مێژووەکە نەبووە، بگرە مێژووی بە رێگەیەك دادەناو بە دەرسێکی دەزانی کە ئەو هەرەسهێنانە گەورەیەی پێ تێبگات کە دیتی‌و بوو بە لووتییەوە. ئەویش وەکو خەڵکیتر، بە گیانەڵای شارستانێتیی ئیسلام ئێش کەوتە دڵی (ئەندەلوس و، داگیرکاریی رابوردووی چاخ دروشمان و، داگیرکاریی مەغوڵ و هێرشەکەی تەیموری لەنگ کە لە ژیانی خۆیدا ڕەوویداو گەلێ نەگبەتی‌و نەهامەتیتریش) بەمانە هەموی دڵتەنگ بوو.

لەبەرئەوانە، دەیویست، بەو بیرەتیژەی خۆی ئەو یاسایانە

ـــێــتــەوە کە شارستــانێـتـی‌ی پێ‌دادەمــەزرێـت و پەرەی
ـو ـحـێـێـت و دای‌دەکـوتێ و دەشێ‌خـات و لەناویشی‌دەبات. جا
ـ ـەـو بنەمایانە چۆن چۆنی دەدۆزرێتەوەو دەزانرێن ئەگەر ئەو
ـحـتی بە دوویاندا دەگەرێت، لە مێژووەوە دەست پێ‌نەکات،
ـ ئەگەر لە دەفتەری شارستانێتی‌یەکانەوە بنەماکانی ئەخوێنێت؟
ـو جۆرە مێژوو دەبێتە خەبەرگاو، دەبێتە کۆگایەکی گەورەی
ـقر کــردنــەوەی ئەوتــۆ کە پاســاکــانی ئاوەدانکـردنـەوەی پێ
ـحـرێـنــەوە، چونکــە مێــژوو ئەو پاســایــانــە دەداتــە بەر
ـحـەرکـاری‌ی لێکـۆڵینـەوەو لێکـدانەوە کە وەکو تیشکێك هەمو
ـو و کەلـەبـەرێکی روونـاك دەکاتەوە، یان وەکو خۆی دەڵێت:
«هەموو ئەو رووداوو بارو دۆخانەی مێژوو، خۆی».

سەرچاوەکان: ـ

ـ کتێبەکەی د. طه حسین (فلسفه ابن خلدون الاجتماعیة).

2 ـ د. نوال السعداوی (قراءة جدیدة في فکر وفلسفة ابن خلدون مجلة التضامن ژمارە ـ 28ی ساڵی 1983.

3 ـ لە دەرفەتێکی‌تردا باسی بیروڕای هاوسەردەمانی ئیبن خەلدون ـ ـە بەرەی ئیبن خەلدونەوە چی‌یە، باسیان دەکەین.

4 ـ لەم ڕووەوە بڕوانە (جوستون بوتول، ابن خلدون، فلسفته لاجتماعیة ـ ص ٩٧.

5 ـ المقدمة چاپی (دار الکتاب اللبنانی. بیروت 1979) ل: 2

6 ـ هەمان سەرچاوە لە /3

7 ـ هـ. س. ل: 6

8 ـ هـ. س: ل: 12

9 ـ مەسعــودی لە دەورووبــەری ساڵی 346ك/ 957ز. دا کۆچی دوایی‌کردووە، ئیبن خەلدونیش ساڵی 807ك/ 1406ز.

10 ـ د. شاکر مصطفی کتێبی (التأریخ العربي والمؤرخون) جـ 2، ل 52 بۆ ئەوەش زیـاتـر لەم مێـژوونـوسـە گەورەیـە بگـەیت، بڕوانە کتێبەکەی د. هادی حمود حسین (منهج المسعودی) چ/ بغداد/ 1984.

11 ـ المقدمة ل/ 52.

12 ـ هـ. س. ل: 18.

13 ـ هـ. س. ل: 20.

14 ـ ل: 58

15 ـ ل: 13

16 ـ ل: 8

17 ـ ل: 53

18 ـ بڕوانە د. عبدالرحمن بدوی (مؤلفات ابن خلدون) القاهرة 1962 ص ل: 281 ـ 188.

19 ـ المقدمة ل: 13.

20 ـ رەخنــەکـاری‌ی کاکڵکـرد: بریتی‌یە لە شی‌کـردنـەوەی ئەصلە مێــژوویـیـنــەکــە تا بە باشی روون بکــرێتــەوە مانــاکــەی لێــك بدرێتــەوەو لە لێکــدانــەوەی نووســراوەکـە ماناکەی وەربگیــرێت و مانــای پیت بە پیتی دیــاری بکــرێت و مانا راستـەقینـەکـەشی بزانـرێت و مەبـەسی دانـەری کتێبـەکـەش بزانرێت چی‌یەو چی‌دەڵێت.
بڕوانە. حسن عثمان، منهج البحث التأریخی./ 118.

21 ـ المقدمة ل: 13 ـ 14.

22 ـ هـ. س ل: 14 ـ 16.

23 ـ هـ. س، ل: 16.

24 ـ هـ. س. ل: 16 ـ 19.

25 ـ ل: 26.

26 ـ ل:, 30 ـ 32.

27 ـ ل: 33

28 ـ ل: 37

29 ـ ل: 42 راستی‌ی رەسەنەکەشی، ل: 44.

30 ـ ل: 45 ـ 56.

31 ـ ل: 18.

32 ـ ل: 20

33 ـ ل: 46

34 ـ کتێبی (العبر) ج 1 ل: 1011 ـ 1012.

35 ـ المقدمة ل: 9 ـ 11.

# سەرمایەداری و

# بازرگانی بە بەندەوەکردن

ئەم بابەتەو لێکۆڵینەوەی (الاستعمار الحدیث والرق)ی (دکتور مسعود ظاهر) لە زانکۆی لوبنان دا.
لەم کۆرەدا بە باشترین لێکۆڵینەوە داندراون.

[redacted]

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد[1]
کۆلێژی ئاداب ـ زانکۆی بەغدا

وەك ئەزانین مرۆڤایەتی ئێجگار زۆر لەمێژە بەندەو بەندەیی لە ژیانی خۆیا دیوە. هەر پاش ئەوەی چەردەیەك گەشەکردن لە ژیانی ئادەمزادی سەرەتاییدا پەیدابوو وئادەمزاد قۆناغی کۆمۆنەیی بەجێهێشت و فێری دارایی تایبەتی بوو وجیاوازی لە داراییدا لەنێوان ئەم و ئەوا پەیدا بوو، سیستێمی بەندەیش سەری هەڵدا[2] کە بەپێی مێژوو، لەچاو کۆمۆنەییە پاشکەوتووەکەی ژیانی ئادەمزادی پێش ئەو مێژووەدا، هەنگاوێك بوو بۆپێشەوە.

لەبەرئەوەیش کە ئەم ناوچانەی ڕوژهەلاتی خومان لە مەیدانی گەشەکردنی شارستانەتیدا لەپێش هەموولایەکەوە بوون، ئاشکرایە ئەبێ شێوە پێشینەکانی بەندەیش، کە لە مێژوودا

ـــراون، لەم ناوچانەدا سەریان هەڵدابێ. بەڵام لە جۆرچێوەی شێوە کلاسیکییەکەیا لە وڵاتانی یۆنان و رۆمانی کۆنیا قاڵبی وەرگرت، کە رۆژێ لە رۆژان ئەوانیش هەر بەشێك لە رۆژهەڵات دائەنران. هەر بەندەییش بوو بەدرێژایی سوجی ساڵانی نێوانی هەزاری یەکەمی پێش لەدایك بوونی عیساو سەدەی پێنجەمی پاش لەدایك بوونی بوو بە چوارچێوەی سیستێمی کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسیی ئەو وڵاتانە.

کە سیستێمی دەرەبەگییش بە خۆیو دام و دەزگاکانیەوە پەیدابوو، بەندەیی لەناونەچوو، بەڵکو شێوەی نوێی وای گرتە خۆی لەگەڵ پێویستییەکانی کۆمەڵی نوێدا بگونجێو لەجاران زیاتر پێوەندی بە زەویو بەروبووی کشتوکاڵەوە پەیداکرد.

بەگوێرەی ئەوەی لە (Doomsday Book)[3] دا نووسراوە لە کۆتاییەکانی سەدەی یانزەهەمدا نزیکەی 25 هەزار زەویبەندە[4] لە ئینگلتەرە هەبووە، کە بەشێکی زۆریان لە کێڵگەکانی کلیسادا کاریان ئەکرد. بەڵام شێوە کلاسیکییەکەی بەندەیی، راستەکەی، لە زۆرترین وڵاتانی ئەو رووپای رۆژاوادا برابووەوە، تەنها لە هەندێ لەو شارانەیا کە ئەکەونە لێواری دەریای ناوەراستەوە وەك ڤینیسیاو جنەوە تا دوادوایی سەدەی شازدەهەم درێژەی کێشا.[5]

تەبیعی بوو سەرهەڵدانی سەرمایەداری کار بکاتە سەر جۆری بناخەو بنەرەتی بەندەیی، چونکە سروشتی سەرمایەداری خۆی وایە هەر لە پەیدابوونیەوەو بەتایبەتی پاش گەشەکردنی، «کێوی ترین گەل بەدوای خۆیا بەکێش ئەکا». لەگەڵ ئەوەیشا کە شێوەی نوێی هێنانە بەرهەم لەسەر سوود لێبردنی کاری ئازادی بەکرێ دامەزراوە، سەرمایەداری هیچ سڵی لەوە نەکردەوە، هەر ئەوەندە بۆی لوابێو قازانجی تیا بووبێ، شێوەکانی پێش چەرخی خۆیشی بەکاربێنێ، تەنانەت بە ئیش پێکردنی بەندەیشەوە، بەڵام دیارە لە چوارچێوەی خستنە قاڵبێکی نوێدا بەگوێرەی پێویستییەکانی قۆناغی نوێ. ئەوەبوو ئەسپانیاییەکان و پورتوگالییەکان و پاش ئەوانیش هۆڵەندەییو فەرەنسەییو ئینگلیزەکان ئەچوونە هەرکوێ لە دەرەوەی وڵاتی خۆیان،[6] دانیشتووانی ناوخۆی ئەو شوێنانەیان ئەخستە بەر بێگار. هەر ئەمەشە ئەوەمان بۆ روون ئەکاتەوە کە بۆچی تا دوا دوایی ئەم دووسەدەیەی دوایی، لەگەڵ تەوژمی بەتینی ئەو گەشەکردنەیشدا کە لەگەڵ سەرهەڵدانی سەرمایەداریدا پەیدابوو، بەندەیی لە هەندێ ناوچەدا هەر مابوو.[7]

لەمەوە ئەتوانین بڵێین لە سەدەی شازدەهەمەوە قۆناغێکی نوێی بڵاوبوونەوەی بەندەییو شێوەی کارپێکردنی بەندە دەستیپێکرد. ئەم قۆناغە راستەوخۆ پێوەندی بەو ماوەیەوە هەبوو کە پێی ئەڵێن ماوەی کەڵەکەکردنی سەرمایەی سەرەتایی (تراکم راس المال الأولی)و پەل هاویشتنی کۆڵۆنیالیزم لە وڵاتانی ئاسیاو ئەفەریقاو ئەمەریکادا[8].

کشتوکاڵ کردن لە وڵاتانی هەردوو ئەمەریکای سەروو و خوارووا پەرەیەکی فراوانی سەندبوو و گەشەیەکی زۆری کردبوو. بەهۆی ئەوەوە، لەو وڵاتانەدا بەرادەیەکی ئێجگار بەرفراوان دەسیان دایە کار بە بەندە کردن لە چوارچێوەیەکی نوێدا. ئەمەیش تێکرا لە کۆمەڵە هۆیەکەوە پەیدا بووبوو کە هەریەکەیان بگری کاری لەوی تریانا ئەکرد، چونکە ئەوەبوو لە جیهانی نوێدا دوو جۆرە قەوماوی دژ بەیەك شان بەشانی یەك هەبوون کە بریتیبوون لەوە لەلایەکەوە کرێکاری چ ناوخۆییو چ ئەورووپایی زۆر کەم بوون و لەولایشەوە سامانێکی ئابووریی زۆری بە هیچ جۆرێ نەهێنراوە بەرهەم لە بەردەستدا بوو لە جیهانی نوێدا. ئەمە پاڵی بە سەرمایەدارەکانەوە نا رووبکەنە کیشوەری رەش و بەدوای کرێکاری هەرزان بەهادا بگەرێن. دانیشتووە ئەسڵییەکانی جیهانی نوێیش کە هیندییە سوورەکان بوون کە کۆڵۆمبسی دۆزەرەوەی ئەمەریکا ئەڵێ باشترین خەڵکن کە خوا دروستی کردبن، هەڵوێستێکی تەواو ناجۆریان بەرابەر بە داگیرکەرانی وڵاتەکەیان هەبوو، چونکە ئازاری زۆریان بەدەستەوە چێشتبوون و پێیان خۆش بوو بمرن تا ئەوەی هاوکاری لەگەڵ ئەوان بکەن، سەرەرای ئەوە ژمارەیشیان هەر لەخۆیا کەم بوو. بەشێکی زۆریشیان بەهۆی ئەو جۆرەها دەردو داوەوە کە ئەو داگیرکەرانە لەگەڵ خۆیان هێنابوویان بۆ جیهانی نوێ، لەناوچووبوون.[9] لە هەمان کاتیشدا پادشای ئەسپانیاو پورتوگال بریارێکی رووکەشییان دەرکردبوو کە نابێ هیندییە سوورەکان بکرێن بە بەندە. ئەمە هەموو وای لە ئەورووپاییەکان کرد پتر رووبکەنە عەشاماتی ئەفەریقا کە لەو

سەردەمەدا پتر لە دوو پێنج یەکی سەرانسەری دانیشتووانی زەوی‌یان پێك ئەهێنا.[10]

بەم جۆرە سروشتی سەرمایەداری خۆی و خاسیەتەکانی نیوەی رۆژاوای تۆپی زەوی کە ئەوروپایی‌یەکان لە یەکەمین قۆناغەکانی گەشەکردنی سەرمایەداریدا لە کیشوەرەکەیانا - دۆزیبوویانەوە، جۆرە گەشەکردنێکیان لە مەیدانی بازرگانی بە بەندەوە کردندا داسەپاند کە هەرگیز لەوەپێش هاوتای رووی‌نەدابوو، کە بازرگانی بە بەندەوە کردنیش بەرادەیەك سوودبەخشبوو لێ دەرچووبووە گەورە پیاوانی پێشکەوتووترین وڵاتی ئەورووپا سڵیان لەوە نەئەکردەوە ناپەسەندترین شێوەی بکەن بە پیشەی خۆیان، بەڵکو وای‌لێ هاتبوو پادشایان و کاربەدەستانی گەورەی ئەو وڵاتانە خۆیان چاودێری‌یان ئەکرد.

ئەوەبوو، بۆنموونە، چارلسی دووهەمی پادشای ئینگلتەرە (1660 - 1685) خۆی بووبوو بە یەکێ لە هاوبەشانی ئەو کومپانی‌یە بەریتانیایی‌یانەی بازرگانی‌یان بە بەندەوە ئەکرد[11].

ئیمپریالیستەکان لەپێناوی برەوپێدانی ئەم بازرگانی‌یەداو بۆ دابین کردنی بەردەوامیی هۆیەکانی، هیچ کۆیان لەوە نەئەکردەوە پەنا بەرنە بەر سووکترین و سەیرترین شێوە، هەر لە بڵاوکردنەوەو داچاندنی تۆوی ناکۆکی و دووبەرەکی‌یەوە لەناو خێڵەکانی ئەفەریقادا بیگرە بە فروفێڵ و زۆڵاێەتی بە مەبەستی خۆش کردنی ئاگری شەڕو ئاژاوە لەنێوانیانا بۆ ئەوەی ژمارەی دیلەکانیان کە ئەبرانە بازاڕی بەندەفرۆشی زۆرتر بێ، تا ئەگاتە بڵاوکردنەوەی بەدرەوشتی و داوێن پیسی لەنێوانیانا، تەنانەت هەر لە سایەی بازرگانی بە بەندەوە کردندا پیشەسازیی شەرابی رووم دروست کردنی ئەمەریکا قۆناغێکی گەورەی بری. لەبەر ئەوە هیچ سەیر نەبوو لەپێناوی بەردەوامیی ئەم سەرمایە خرکردنەوەیەی ئیمپریالیستەکانا، بازرگانە ئینگلیزەکانی بەندەفرۆشی هانی ئەفەریقایی‌یەکان بدەن کە فێری خواردنەوەی ئەم جۆرە مەیانە ببن. ئەمەش تەنها دڵۆپێکە لە دەریایەك.

هەر بە مەبەستی هێنانەدیی ئەم ئامانجە، لەپێشاندا ئەسپانیایی و هۆڵەندەیی‌یەکان و ئەوجا ئینگلیزەکان بەتایبەتی، مەڵبەندو کومپانی‌یەکی زۆریان بۆ بازرگانی بە بەندەوە کردن لە کەنارەکانی رۆژاوای ئەفەریقادا پێکەوەنا. سەرپەرشتی‌کەرانی ئەو کومپانی‌یانە پێوەندێکی بەتینیان لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆك خێڵە دەسەڵاتدارەکانی ناوچەکە پێکەوەناو بەیارمەتیی ئەوان کەوتنە هێرش بردنی تایبەتی بۆ راوە بەندە لە هەرکوێ بۆیان بلوێ چ لە کەنارەکانی ئەفەریقاو چ لە ناوەوەی کیشوەرەکەیشدا.

ئەم کومپانی‌یانە لەلایەن دەوڵەتەکانیانەوە چاودێری‌یەکی تایبەتی ئەکران، چونکە ئەوگەشەکردنە بەپەلەی، بازرگانیی ئێجگار بەقازانجی بەندە بەخۆیەوەی دی، کارێکی کرد ئەو بازرگانی‌یە ببێ بە یەکێ لە هۆیەکانی جەنگە تازەکانی نێوان دەوڵەتە ئەورووپایی‌یەکان و، بە بابەتێ لە بابەتەکانی پەیمانەکانی نێو دەوڵەتان وەك پەیمانی ئاشتیی ئۆترێخت لە ساڵی 1713دا[12] کە دوایی بە جەنگی میراتگریی ئەسپانیی! لەنێوان فەرەنسەو دەوڵەتە دوژمنەکانیا هێنا کە ئینگلتەرەو هۆڵەندەو پرووسیاو ساڤۆی بوون.[13]

ئیسپانیایی و پورتوگالی‌یەکان کە پێشەنگی دۆزینەوە جیوگرافیایی‌یە مەزنەکانن، لە خەریك بوونا بە بازرگانی پێوە کردنی بەندەدا لە خەڵکی‌تر لەپێشترن. پورتوگال یەکەمین دەوڵەتێکی ئەورووپایی‌یە هەر لە ناوەڕاستی سەدەی پازدەهەمەوە خەریکی ئەم بازرگانی‌یە بووە، بەڵام سەدەیەکی بەسەرا تێ‌نەپەڕی ئینگلتەرەو هۆڵەندەو فەرەنسەو دانیمارکیش هاتنە ئەم مەیدانەوە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دوا دەوڵەتی گەورە بوو ژمارەیەکی کەم نا لە پارەدارەکانی دەستیان دایە کڕین و فرۆشتنی بەندەو تا دوادوایی سەدەی نۆزدەهەمیش هەر خەریکی بوون.

هێشتا ماوەیەکی کەم بەسەر دۆزینەوەی جیهانی نوێدا تێپەڕیبوو، کە یەکەمین کۆمەڵی ئەفەریقایی لە سەرەتای سەدەی شانزەهەمدا گەیشتنە جزیرەی هایتی. لە سەرەتای ساڵی 1517وە بەندە گواستنەوە لە ئەفەریقاوە بۆ جزیرەکانی رۆژاوای هیندو بەتایبەتی بۆ برازیلی دەوڵەمەندو بەدەرەتان بەشێوەیەکی رێکوپێك دەستی پێ‌کرد.

تا درەنگێ بەندە گواستنەوە بۆ ئەو ناوچانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئیستایان لێ پێکهاتووە، دەستی پێ‌نەکرد، ئەوەیش بەهۆی ئەوەوە بوو لەبارەی خێروبێری ئەو ناوچانەوە بەهەڵەدا چووبوون و وایان ئەزانی هیچی ئەوتۆیان تیا نی‌یەو

لەبەرئەوە درەنگ کەوتنە سوود لێوەرگرتنیان. تەنانەت ئەسپانیایی یەکان لە نەخشەکانیانا بە خاکەکانی سەرووی مەکسیکیان ئەوت ناوچە هەژارەکان یا ناوچە بێ پیت و فەڕەکان! کە ئینگلیزەکان ڕوویان کردە جیهانی نوێ، لەڕاستیدا لە وڵاتێکی چۆڵ وهۆڵ بەولاوەیان نەدی، بەڵام بۆیان دەرکەوت دەوڵەمەندترین شوێنی ڕووی ئەم ئەستێرەی زەوی یەیە کە تا ئەوکاتە پێی نەنرابوە سەر. ئەو ڕۆژە ئینگلیزەکان لە مەیدانی گەشەکردنی سەرمایەداریدا مەودایەکی زۆریان بڕیبوو، بۆیە زۆر زوو لەو مەیدانەدا لە ئاوەڵە ئەورووپایی یەکانیان پێش کەوتن.

ئەمەیش واتە باشترین تەمامی سەرمایەداری گوێزرایەوە بۆ باشترین خاك تیا بڕوێنرێ کە سیانزە ئاوایی یەکەیان[14] بوو لە ئەمەریکای سەروودا، ئەوەی خاکی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکای ئەمڕۆی لێ پێکهاتووە. بەهۆی ئەوەوە ئەم وڵاتە لە هەر شوێنێکی کە زیاتر پێویستی بە ڕەنجی شانی بەندە هەبووە بۆ هێنانەبەرهەمی خێروبێری. ئەمەیش بەئاشکرا لە بازرگانی پێوە کردنی بەندەدا ڕەنگی دایەوە کە تا ڕادەیەکی سەرسام کەر پەرەی سەند. جا بۆ بەڵگە هێنانەوە بۆ ئەم ڕاستی یە ئەوە بەسە کە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین کە نرخی بەندە لەو سەردەمەدا چەندی زیاد کرد. لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمدا نرخی یەك بەندە گەیشتبوە 17 پاوەن یا تەنێك شەکر،[15] کەچی لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا گەیشتە 300 دۆلار. پاشان بەرزتریش بووەوە تا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا گەیشتە 1800 دۆلار کە بەپێی توانای کڕینی ئەو سەردەمە پارەیەکی زۆر بوو. بەڵام ئەم ڕاستی یە لەگەڵ ناباری و ناهەمواریشیدا ئەوەندەی وێنەی ئەو قازانجە خەیاڵی یەی بازرگانە ئەورووپایی و ئەمەریکایی یەکانی بەندە خڕیان ئەکردەوە، وێنەی دڵ ئازاردەری بازرگانی پێوە کردنی بەندەمان پێشان نادا. پوختەی قازانجی هەر بازرگانێکی بەندە لە فرۆشتنی بەندەیەکی لاوی 18 ساڵان لە ماوەی نێوان ساڵانی 1821و 1825دا گەیشتە 334 دۆلار. پاشانیش لە ماوەی نێوان ساڵانی 1821و 1825دا گەیشتە 334 دۆلار. پاشتریش لە ماوەی نێوان ساڵانی 1856و 1860دا گەیشتە 1306 دۆلار.[16]

یەکەمین کۆمەڵە بەندە کە گەیشتە خاکی ئەمەریکا، لە 21 کەس پێکهاتبوو. ئەمانە لە ساڵی 1619دا لە ئەفەریقاوە گوێزرانەوە بۆ ڤێرجینیا. لە سەرەتادا ژمارەی بەندە ئەفەریقایی یەکان وردە وردە بەرز ئەبووەوە. بەگوێرەی سەرچاوە ڕەسمی یەکان ژمارەیان لە هەموو ئاوایی یەکانی بەریتانیادا لە ئەمەریکای سەروو لە ساڵی 1650دا تەنها 1600 کەس و لە ساڵی 1670دا 6971 کەس بوو،[17] بەڵام زۆری نەخایاند شان بەشانی گەشەکردنی سەرمایەداری لەو ئاوایی یانەداو لە ئەنجامی زۆربوونی پێوەندی ئەو ئاوایی یانە بە بازاڕی دەرەوەو بەتایبەتی بە بازاڕەکانی ئەورووپای ڕۆژاواوە، گەشەکردنێکی لەپڕو گورج بەسەر ئەم وەزعەدا هات، ئەوەبوو تەنها لە ماوەی نیوسەدەدا، واتە لە ساڵی 1700ەوە تا ساڵی 1750 ژمارەی قولەڕەشە ئەفەریقایی یەکان لەو ئاوایی یانەدا 800٪ زیادی کردو لە تەنها 28 هەزار کەسەوە گەیشتە زیاتر لە 236 هەزار کەس. لە ماوەی بیست ساڵی لەوەپاشیشدا بروابەدوو قات کە ئەوەبوو لە ساڵی 1770دا گەیشتە نزیکەی 460 هەزار کەس. ئەم زیادەیە لە یەك کاتدا هەم «نیسبی»یش و هەم «موتڵەق»یش[18] بوو، چونکە ئەوەبوو دانیشتووانی هەموو ئاوایی یەکان لەو دواساڵەدا کە ساڵی 1770یە گەیشتبوە نزیکەی 2 ملیۆن و 150 هەزار کەس.[19] بەم جۆرە قولەڕەشە ئەفەریقایی یەکان لە دوارۆژەکانی پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی سەربەخۆیی ئەمەریکادا 20٪ی تێکڕای دانیشتووانی وڵاتەیەککگرتووەکانی ئەمەریکاو 40٪ی تێکڕای دانیشتووانی وڵاتە خوارووەکانی ئەمەریکایان پێك ئەهێنا.

شۆڕشی سەربەخۆیی ئەمەریکا کە لە ساڵانی 1775 - 1783دا ڕوویدا، خۆی لەخۆیا بەرەنگاربوونەوەیەکی بەجێی هەوڵ و تەقەلای مەترۆپۆل[20] بوو بۆ کۆسپ و تەگەرە هێنانە ڕێی ڕەوڕەوەی سەرمایەداری لە موستەعمەرەکانیا. بۆیە شتێکی زۆر تەبیعی بوو ئەنجامە جوان و گەشەکانی ئەم شۆڕشە ببن بە هێزێکی پاڵ پێوەنەری نوێ بۆ گەشەکردنی لەوەپاشی سەرمایەداری لەو موستەعمەرەدا. ئەمەیش لە هەمان کاتا واتە زۆربوونی پێویستیی ئیش پێ کردنی بەندە لە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکادا بەڕادەیەکی ئەوتۆ هەرگیز لەوەوبەر شتی وا ڕووی نەدابێ. ئەمەیش کێشایەوە بۆئەوە کە بازرگانی بە بەندەوە کردن لەو ماوەیەدا بگاتە چڵەپۆپەی. بەم پێ یە ژمارەی

قولە ڕەشەکانی ئەمەریکا گەلێ لە جاران بەپەلەتر کەوتە بەرزبوونەوە. ئەوەبوو لە ساڵی 1790دا گەیشتە زیاتر لە 757 هەزار کەس و لە ساڵی 1810دا گەیشتە دوو ملیۆن و 200 هەزار کەس و لە ساڵی 1860دا لە 4 ملیۆن و نیو تێپەڕی کە نزیکەی 4 ملیۆنیان[21] بەندەی بەپارەکڕراو بوون.[22]

بەندە بەپارەکڕراوە ئەفەریقاییەکان کە بران بۆ جیهانی نوێ بەتایبەتی ئەوانەیان بران بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان و برازیل، بەشدارییەکی کاریگەریان لە کاری کەڵەکەبوونی سەرمایەی سەرەتاییدا کرد کە بە یەکێ لە بنەڕەتە ناوەندییەکانی هەر گەشەکردنێکی سەرمایەداری دادەنرێ. ئەمانە بەهۆی خەریک بوونیانەوە لە قورسترین کاری کێڵگەکانی وڵاتە خوارووەکانی ئەمەریکاو ناوچە شاخاوییەکانی برازیلدا بە کەمترین ئەرک و مەسرەف، دەوریان گەلێ زۆر بوو لە بۆپێشەوە بردنی ڕەوڕەوەی سەرمایەداریدا لە ئەمەریکا. لە سایەی کاری بەندەوە کێڵگەی گەورەو بەدەرەتانی قازانج فرەو بێ‌شوماروو بە بیری کەسا نەهاتووی زۆر لە وڵاتە خوارووەکانی ئەمەریکا پێکەوەنرا. بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم قسەیە تەنها چەند نموونەیەکی پیشاندەر دێنینەوە: توتن کە بۆ یەکەمین جار بەشێوەیەکی ڕێکوپێک لە ساڵی 1612دا لە وڵاتی ڤیرجینیا دەس کرا بە چاندنی، ڕادەی هێنانە بەرهەمی زۆر بەپەلە بەرزبووەوەو بازاڕی بەبرەویشی لە دەرەوەی وڵات دەسگیر بوو. لە ساڵی 1616دا ئەندازەی ئەو توتنەی لە ئەمەریکاوە نێررایە دەرەوە بۆ تەنها ئینگلتەرە 2500 ڕەتڵ[23] بوو، کەچی پاش تەنها چوار ساڵ گەیشتە 119 هەزار ڕەتڵ و پاش دە ساڵی‌تر گەیشتە 450 هەزار ڕەتڵ. بەڵام تا ساڵی 1688 گەیشتە پتر لە 28 ملیۆن ڕەتڵ و تا ساڵی 1772 گەیشتە 113 ملیۆن ڕەتڵ. برنجی تەنها لە کارۆلیناو جیۆرجیاوە بۆدەرەوە نێرراو لە ساڵی 1770دا گەیشتە 83 ملیۆن ڕەتڵ و، برنجی تەنها لە کارۆلیناوە نێرراوە دەرەوە لە ساڵی 1775دا گەیشتە ملیۆنێک و 122 هەزار ڕەتڵ.[24]

لە سایەی کارپێ‌کردن و چەوساندنەوەی بەندەوە لە ساڵانی نەوەدی سەدەی هەژدەهەمەوە، لە وڵاتە خوارووەکانی ئەمەریکادا قەڵەمبازێکی زۆر زل لە هێنانە بەرهەمی پەموودا دەستی‌پێ‌کرد کە لەوەوپێش شتی‌وا ڕووی نەدابوو لە مێژوودا. ئەوەیش بوو بە هۆی پاڵ پێوەنانێکی بەهێزی‌تری ڕەوڕەوەی گەشەکردنی سەرمایەداریی ئەمەریکاو جیهان لە یەک کاتا. ئەوەبوو لە ساڵانی 1790 ـ 1792دا هێنانەبەرهەمی پەموو لە 3 تا 6 هەزار فەردە[25] بوو، کەچی لە ساڵی 1800دا گەیشتە 100 هەزار فەردە، واتە لە کەمتر لە 10 ساڵا 333قات زیادی‌کرد، کە ئەمەیش بەپێی هەموو سەنگە و ترازوویەکی ئەندازەو کات و شوێن ڕادەیەکی ئێجگار زۆرە، بەڵام بەرزبوونەوەی بەپەلەی هێڵی دەرخەری هێنانە بەرهەمی پەموو لەم ڕادەیەیشا نەوەستاو هەر ئێجگار توند بەرەو بەرزبوونەوە ئەڕۆیشت، بەچەشنێ کە تەنها بەرهەمی خوارووی ئەمەریکا لە ساڵی 1859دا گەیشتە نزیکەی 5 ملیۆن و 400 هەزار فەردە.[26]

بۆئەوەی مەسەلەکە باشتر لە هەمووسەرێکەوە بخەینەڕوو، ئەڵێین بەرهەمی پەمووی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ساڵی 1790دا تەنها نزیکەی 4 ,٪ی بەرهەمی جیهان بوو، کەچی لە ماوەیەکی کەما بەشێوەیەکی خەیاڵی بەرزبووەوە تا ڕادەیەک لە ساڵی 1831دا پتر لە 49٪و لە ساڵی 1840دا پتر لە 62٪ی بەرهەمی جیهانی پێک ئەهێنا.[27] ئەوەیش بڵێین کە پەمووی خوارووی ئەمەریکا بوو، بوو بە بایەخدارترین پایەو پلەی گەشەکردنی پیشەسازیی سەرووی ئەمەریکاو، سەرووی ئەمەریکایش بوو بەپەلە بوو بە دڵە لێدەرەکەی سەرمایەداریی ئەمەریکا.

لەگەڵ بایەخی ئەم شتانەیشدا، ڕۆڵی پەمووی خوارووی ئەمەریکا لە کاری گەشەکردنی سەرمایەداریدا هەر بەوەوە نەوەستا. ئەوەبوو هەر زۆر زوو دەس کرا بە ناردنە دەرەوەی پەمووی ئەم ناوچەیە کە بە ئارەقی ناوچاوو شان و قۆڵی قولەڕەشەکان ئەهێنرایە بەرهەم. لەم ڕووەوە ئەوەندە بەسە کە بڵێین بۆنموونە لە ساڵی 1860دا زیاتر لە نیوەی پەمووی خوارووی ئەمەریکا تەنها بۆ ئینگلتەرە ئەنێررا کە ئەمەیش واتایەکی گەورەی هەیە چ لە کاری کەڵەکەبوونی سەرمایەو چ لە خڕکردنەوەی پارەی بێگانەدا کە دوو مەرجی زۆر بایەخداری پەلەپێ‌کردنی گەشەکردنی سەرمایەدارین.

بۆئەوەی لە ڕۆڵی خوارووی ئەمەریکاو بایەخی هێنانە

ـەرهەمی پەموو لە ڕەوتی گەشەکردنی سەرمایەداریی وڵاتە ـەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بگەین، ئەبێ پەنجە بۆ ڕاستی‌یەکی ـبەخداریتریش ڕابکێشین، ئەویش ئەوەتە کە بەدرێژایی نیوەی ـەکەمی سەدەی نۆزدە کە ماوەی کاریگەری گەشەکردنی ـەرمایەی ئەمەریکایە، پەموو بایەخدارترین شت بوو لەناو ـستەی بەروبووی بۆدەرەوە نێرراوی ئەمەریکادا. ئەوەبوو لە ـساڵی 1815دا بایی تێکڕای بەروبووی بۆدەرەوە نێرراوی ـئەمەریکا 53 ملیۆن دۆلار بوو، 18 ملیۆن دۆلاری بایی پەموو ـبوو. لە کاتێکیشا کە لە ساڵی 1835دا بایی بەروبووی ـبۆدەرەوە نێرراوی ئەمەریکا گەیشتە نزیکەی 116 ملیۆن دۆلار، ـبەشی پەموو لەم بایی‌یە گەیشتە نزیکەی 65 ملیۆن دۆلار. لە ساڵی 1860یشدا بایی تێکڕای بەروبووی بۆدەرەوە نێرراوی ـئەمەریکا گەیشتە نزیکەی 334 ملیۆن دۆلار، کە بەشی پەموو ـلەم بایی‌یە گەیشتە نزیکەی 192 ملیۆن دۆلار واتە پتر لە ـنیوەی.[28]

کەواتە گەشەکردنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەمووی، ـنەك تەنها بەشی خوارووی، تارادەیەکی زۆر پشتی بە هێنانە ـبەرهەمی پەموو و سنعاتی کردنیو بۆدەرەوە ناردنی بەستبوو. لە سایەی سەری پەمووەوە ترازووی بازرگانی لەنێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئینگلتەرەدا بۆ سوودی لایەنی یەکەم بوو. ئەمەیش لە ڕەوتی گەشەکردنی سەرمایەداریی ئەمەریکادا واتایەکی گەورەی هەیە، نەخوازەڵا ئەگەر سەرنجی ئەوە بلەین کە شۆڕشی پیشەسازی لە ئینگلتەرەدا لەدایك بووەو ئینگلتەرە تا دەساڵەکانی دوایی سەدەی ڕابوردوویش لەناو هەموو دەوڵەتە سنعاتدارەکانا لەڕووی بەروبووی پیشەسازی‌یەوە پلەی یەکەمی بووەو، گەشەکردنی پیشەسازیی ئەمەریکا لە قۆناغە پێشینەکانیا تا ڕادەیەکی زۆر پشتی بە شارەزایی ئینگلیزەکان و مەکینەو ئامێری ئەوان بەستبوو، بۆیە لەخۆڕایی نەبوو ڕۆژێ لە ڕۆژان لەندەن ئەیویست لە ڕێگای دانانی قانوونی‌واوە کە چوونی وەستاو سنعاتکاری لێ‌هاتووی ئینگلیز بۆ ئەمەریکاو ناردنی چەند جۆرە ئامێرو مەکینەیەك بۆ ئەوێی پێ قەدەغە بێ، کۆسپە بێنێتە ڕێی گەشەکردنی سەرمایەداریی ئەمەریکا.

لێرەوە ئەتوانین بگەینە ئەنجام گیری‌یەکی بایەخدار لە چوارچێوەی ئەم باسەماندا. ئەویش ئەوەیە کە ڕۆڵی پەموو لە گەشەکردنی سەرمایەداریی ئەمەریکادا، لە ڕۆڵی خوری لە گەشەکردنی سەرمایەداریی ئینگلیزدا کەمتر نەبووە، بەڵکو گەشەکردنی پاشتری سەرمایەداریی ئینگلیز کەم پشتی بە پەمووی ئەمەریکا نەبەستبوو.

ڕۆڵی بەندە لە گەشەکردنی سەرمایەداری‌یا لە برازیل وێنەیەکی بچکۆلەی ڕۆڵیانە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا. لە ساڵانی سەدەی حەڤدەدا 33 هەزار قولەڕەش لە برازیل هەبوون لە 200 کێڵگەی قامیشە شەکردا کاریان ئەکرد. هەر کێڵگەیەك لەو کێڵگانە کارگەیەکی تایبەتی خۆی هەبوو شەکری تیا پاڵفتە ئەکرا. تێکڕای بەرهەمی ئەو کارگانە 4,500 تەن بوو.[29]

هەروەك لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، لە برازیلیش ژمارەی بەندە هەمیشە هەر ڕوو لە زیادی بوو. لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا ژمارەیان 100 هەزار کەس بوو، واتە سێ‌یەکی تێکڕای دانیشتووانی وڵاتەکە بوو هیندی‌یە سوورەکانی لێ دەرکەی، بەڵام لە ساڵی 1823دا گەیشتە نزیکەی ملیۆنێك و 150 هەزار کەس و، تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم گەیشتە دوو ملیۆن و نیو.[30] لێرەیش، هەروەك لە ئەمەریکا، زووربەی کارپێکردنی ئەم بەندانە لە کێڵگەکان و لە کانە گرانبەهاکانا بوو. ژمارەیەکی زۆری ئەم بەندانە لە ناوچە لێوار دەریاکانی ڕۆژهەڵات و سەرووی وڵاتدا خەریکی هێنانە بەرهەمی قامیشە شەکرو پەموو و گەنمە شامی بوون. لە ناوچەکانی خوارەوەیش لە هەرچی زیاتر خەریکی هێنانە بەرهەمی قاوە بوون.

زۆری پێ‌نەچوو برازیل شوێنێکی تایبەتی لە هێنانە بەرهەمی قاوەدا لە جیهانا داگرت و، کەمێك پێش برانەوەی سەدەی نۆزدەهەم 40٪ی قاوەی جیهانی گرتەوەو زۆر بەپەلە بازارەکانی دەرەوەی داگیرکردو بوو بە سێ‌یەکی تێکڕای بەروبووی بۆدەرەوە نێرراوی برازیل. لە سەرەتای دەی هەشتەمی سەدەی ڕابوردوودا برازیل ساڵی 3 ملیۆن و 800هەزار فەردە[31] قاوەی ئەناردە دەرەوە.

دەرهێنانی کانە گرانبەهاکانی برازیل ڕۆڵێکی بایەخداری لە

گەشەکردنی سەرمایەداریی ناو خۆیش و ئەورووپایشدا بینی، بەتایبەتی سەرمایەداریی پورتوگال کەبرازیل لەژێر دەستیا بوو و، هیی ئینگلتەرا کە پورتوگال بەهۆی لاوازیی‌یەوە لە سەدەی هەژدەهەمەوە کە دەس کرا بە دەرهێنانی زێرو ئەڵماسێکی زۆر لە برازیل و بەندەیەکی زۆر بۆ ئەم مەبەستە خرانە بەرکار، وەك ژێردەستەیەکی ئەوی لێ هاتبوو. بۆیە لە ڕێکەوت نەبوو لە ماوەی دەرهێنانە بێ‌شومارەکەی ئەو دوو کانە گرانبەهایەدا کە ڕێکەوتی ساڵانی 1740 ـ 1760ی ئەکرد، تێکرا ساڵی لای کەمی 50هەزار بەندەی تازە لە ئەفەریقاوە ئەهێنرا. بێ‌سوود نابێ ئەوەیش بڵێین کە برازیل لە ماوەی ساڵانی 1780 ـ 1820دا زیاتر لە نیو ملیۆن گرام هەر زێڕی هێناوەتە بەرهەم.[32]

بەندەی جیهانی نوێ، هەرچەند لە بارێکی کۆمەڵایەتیی نزمیشدا ئەژیان، سەنگێکی سیاسیی بەئارەزووی خۆو بێ‌ئارەزووی خۆی هەست پێ‌کراویان هەبوو. ئەمەیش هەروا لەخۆیەوە نەهاتبوو، لەئەنجامی کۆمەڵە هۆیەکەوە بوو بەتایبەتی دوو هۆلەو هۆیانە. هۆیەکیان پێوەندی بە سەنگی ئابووری‌یانەوە هەبوو کە بوویوو بە بنکەیەکی گەورە خاوەن کێڵگەکان پاڵیان پێوە دابوو. ئەویشیان پێوەندی بەو کاروەلام (رد الفعل)ە بەجێ‌یەوە بوو کە چەوساندنەوەیان لەناویانا ئەیخوڵقاند. ئەتوانین خاڵی یەکەمی ئەم دوو خاڵە بەکورتی بەو واتە پڕمانایە دەربڕین کە گینۆفیس لە بەسەرداهاتنەوەیەکی باری سیاسیی وڵاتە خوارووەکانی ئەمەریکای پێش شەڕی ناوخۆییدا وتوویە کە ئەوەیە: «لەوێ ڕێگا بەرەو دەسەڵات، بەناو کێڵگەدا ئەڕۆیشت».[33]

ڕاستەکەیشی کلیلی ژیانی ئابووری‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی لە وڵاتە خوارووەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەناو دەستی خاوەن کێڵگەکانا بوو کە لە یەك کاتا سێ شتیان لەخۆیانا کۆکردبوەوە: هەم خاوەن زەوی بوون و هەم خاوەن بەندەو هەم خاوەن پارە.[34] توانای هەرکام لەمانە لەبنەڕەتا لەسەر ئەوە بەند بوو کە چەند بەندەی هەبوو کە دەسەڵاتدارەکانیان بە سەدانیان هەبوو.[35]

ئەو چەوساندنەوە لە وزە بەدەرو ئەو ئازاردانە نا مرۆڤانەیەی قولەڕەشەکانی ئەفەریقا لە نیشتمانی نوێیاندا ئەیان چەشت، زۆر لەو وێنەو دیمەنە تراژیدی‌یانە سەخت ترو ناڕەحەت تر بوو کە خانمی بنووسی ئەمەریکایی هـ. ب. ستاو لە ڕۆمانی بەناوبانگی «زنجەکەی مام تۆم»دا نەخشی کێشاوە. گەڕۆکە پێشینەکان کە سەریان لەو ناوچانە داوە، باسی باری ژیانی لەرادەبەدەر تاڵ و سەختی قولەڕەشەکانیان کردووەو بەدڵنیایی‌یەوە ئەڵێن: «تەنانەت لەناو عوسمانی‌یەکان و بەربەرەکانیشدا وێنەی ئەو دڕندەیی‌یەیان نەدیوە کە لە ئەمەریکادا حوکمڕان بوو».[36]

ئەم گەڕۆکانە سەرسامیی خۆیان لەوە دەربڕیوە کە ژیانی خاوەن کێڵگەکان و بەندەکانی برازیل چەند لە یەك جیا بوو، ئەوان لە چ خێرو خۆشی‌یەکدا ئەژیان و ئەمان لە چ کڵۆڵی‌و کوێرەوەری‌یەکدا،[37] کە بەهۆی ئەوەوە ڕادەی مردن لەناو بەندەکانا گەیشتبوە ئاستێك ئەقڵ نەیبڕێ. لە ساڵانی دەی حەوتەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ژمارەی قولەڕەشەکانی برازیل ئەوەندە کەم بووەوە، پاش ئەوەی 30 ساڵ لەوەپێش دوو ملیۆن و نیو بوون وەك وتمان، گەیشتە ملیۆنێك و 800 هەزار کەس. ئەم ژمارەیە هەرچەند ژمارەیەکی سەرسام کەریشە، تراژیدیاکە بەتەواوی دەرناخا، چونکە برازیل لە ساڵانی دەی پێنجەمی سەدەی نۆزدەهەمیشا ساڵی 30 هەزار قولەڕەشی لە ئەفەریقاوە ئەهێنا، واتە ئەو بەردەوام قولەڕەش بەکێش کردنەی لە ئەفەریقاوە بەکێشیان ئەکردو ئەیانهێنا بەشی ئەوەی نەئەکرد ئەو ناتەواوی‌یە پڕکاتەوە کە بەهۆی مەرگی بێ‌ئامانەوە لەناویانا پەیدا ئەبوو. ئەم بەندانە لە هەمووشت بێ‌بەش بوون، تەنانەت نەیان ئەهێشت ئەو زێڕو ئەڵماسەی بەڕەنجی شان و ئارەقەی ناوچاوان لە کانیان دەرئەهێنا، تەماشای بکەن. کە ڕۆژی سەخت و درێژی کارپێ‌کردنیان ئەبرایەوە، زۆر ورد ئەیانپشکنین و تاوتووی گیان و سیپاڵەکانیان ئەکردن.[38]

بەڵام تراژیدیای قولەڕەشە برازیلی‌یەکان لەچاو ئەو بارەی براکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایان تیا ئەژیان، زۆر ئاسان بوو. بۆنموونە لە برازیل مارەکردنی زۆر لە کچە قولەڕەشەکان لەلایەن خاوەن کێڵگەکان و خەڵکی ترەوە بوو بەهۆی پەیدابوونی تاقمێکی کۆمەڵایەتیی خاوەن ڕەنگ و سەنگ کە پێیان ئەوتن (موولات)[39]، بەڵام شتی‌وا وەختە بڵێم لە

ولاتــە یەکگــرتــووەکــانی ئەمــەریکادارووناتــەئــەدا، چونکــە ئەوی ڕەگــەزپــەرستی لەڕادەبــەدەر تونـدو تیـژ و بێ‌ئامان بوو. لە

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا سەرمایەدارەکان تەنانەت سلیان لەوەیش نەئــەکــردەوە دەسـگــرۆیـی سازمــانی نهێنیی ترسێنی (کوکلوکس کلان ـ سوارانی ئەلقەی زێرین)[40] بە پارە بکەن کە دەیان ساڵ سەیرو سەمەرەتـرین و ناشیـرین و ناپەسـەندترین شێوەی ئازارو سزادانیـان بەرانبەر بە قولەڕەشەکان بەکارئەهێنا. ئەم کوکلوکس کلانانـە هەر تاوەنـاتـاوێ بە تاریکەشەو بەرگێکی سپی‌یـان لەبـەر ئەکـردو کەللەسەری مردوویان ئەگرت بەدەستەوە کە پشکـۆی گەشیـان لە کون و کەلـەبـەرەکـانیا دانابوو. لە زۆر شـرو ناوچـەدا بەوجـۆرە هێـرشیـان ئەبـردە سەر قولـەڕەشـەکان و ئەمـیـان ئەکـرد بە لێـدان و دارکـاری کردنیان و ئەیانکوشتن و لە ئەوروبــەرو قەراخ شارو دێهـاتــەکــانـا بە لق وپـۆپی درەختـا هەڵیـان ئەواسین. بەهـۆی ئەم ژیـانـە سەختـەوە بوو قولـەڕەش ئەواتی مەرگی خۆی ئەخواست تا «بۆ خۆی بێ‌دەنگ لەناو گۆڕا پەل ڕاکێـشـێ»و، بە دڵ و دەروونـێکی پڕئـازاری ئەوتــۆوە لە بەس کردن نەیەت، لە دڵی خۆیا ئەیوت: «داخی بەجەرگم! بۆ ئەمە هاتمە دنیاوە؟!».[41]

شتێکی تەبیعی بوو کاروەڵامی قولەڕەشەکانیش بەرامبەر بەم چەوسـانـدنـەوە نامـرۆڤانەیان زۆر توندو سەخت بێ. ئەوەبوو لە هەرلایــەکـی ئەمــەریـکــادا هەبــوون چەنــدجــار لە ڕووی چەوسێنـەوەکـانیـانـا ڕاپـەڕین و، هەر لە ولاتـە یەکگـرتـووەکانی ئەمــەریکــا پێش سەربــەخـۆیی 25 جار ڕاپـەڕین. ئەمـەیش واتـایـەکی گەورە ئەگـەیـەنێ. جاکە سەربەخۆیی ئەمەریکایش هیچی ئەوتۆی بۆ ئەوان پێوە نەبوو، دیسانەوە کەوتنەوە ڕاپەڕین و زۆرجـاریش ڕاپـەڕینی لە جاران تونـدو تیـژتـر. ئەوەبوو لەکاتی ڕاپـەڕینـەکـەی ساڵی 1831دا کە بە سەرکـردەیی (نـات تۆرنێر (Nat Turner) ڕوویدا کە قولەڕەشەکان بە پێغەمبەری دائەنێن، شۆڕشگێڕە چەکی سەرەتایی بەدەستەکان لەم کێڵگەوە ئەچوون بۆ ئەو کێڵگــەو، لە هەرلایـەك خاوەن کێڵگـەیـەکیـان بەرچنـگ ئەکەوت بە سەخت ترین شێوە ئەیانکوشت.

قولـەڕەشـەکـانی ولاتـە یەکگـرتـووەکـانی ئەمەریکا لە هەموو ڕێگـەیـەکـەوە بەدوای ئازادیـدا ئەگـەڕان. بۆنمـوونە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا کۆمەڵێکیان پێکەوەنا ناویان لێنابوو «ـێلی نهێنیی شەمـەنـدەفـەر» سەرپـەرشتیی ڕاپێ‌کـردنی قولەڕەشەکانی ئەکـرد لە ولاتـە خواروەکـانی ئەمـەریکـاوە. ئەم «هێڵی نهێنیی شەمەندەفەر»ە «وێستگە»ی تایبەتیی خۆیشی هەبوو کە بریتی‌بوو لە ماڵی دۆست و برادەران لەوانــەی دژی بەنــدەیی بوون. ئەم «هێڵ»ە لە ولاتەکانی خوارووی ئەمەریکاوە دەستی‌پێ‌ئەکردو لە ولاتــەکـانی سەرەوەی یا لە کەنـەدا ئەبـڕایـەوە. ئەم «هێـڵ»ە لە ماوەی ساڵانی 1830 ـ 1860دا توانی ئازادی بۆ نزیکەی 60 هەزار بەندە دابین بکا.

خەبـاتی قولـەڕەشـەکـان لەپـاش شەڕی ناوخـۆی ئەمـەریکا شێـوەیـەکی نوێی ڕێکـوپێکی گرتـەبەر. لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا چەند بزووتنەوەو کۆمەڵەی سیاسیی وەك «ڕێکخراوەی نیـاگــارا» دامــەزرا کە بەدەرەوەبــووتــریـن ڕۆشـنـبیــرە دژ بە ڕەگـەزپـەرستی‌یـەکـانیان تێدا کۆبووبوونەوە. شایانی وتنە ژیانی پڕکــوێــرەوەریی قولــەڕەشــەکـان پاڵی بەم ڕێکخـراوانـەوە ئەنـا دروشمی‌وا بەرزکــەنـەوەو هەڵـوێستی‌وا وەربگـرن دوورنـەبێ لە سەرچڵی‌و سەرەڕۆیی. بۆنمـوونـە ڕێکخـراوەی «نیاگارا» بە یەك چاو سەیـری هەمـوو ئەمەریکایی‌یە سپی‌یەکانی ئەکردو گشتیانی تێکرا بەدوژمنی قولەڕەشەکان دائەنا. پەڕگریی بزووتنەوەی «گارفی»ی[42] قولەڕەشەکانیش گەیشتە ڕادەیەك هەموو ڕەشەکانی بانـگ ئەکــرد بۆ ئەوەی ولاتــە یەکگــرتــووەکـانی ئەمـەریکـا بەجێ‌بێڵن و، دروشمی «گەڕانەوە بۆ کۆشی دایکی نیشتمان ـ ئەفەریقا»ی بەرزکردەوە.

هەر لەم جۆرە بزووتنـەوەو ڕاپـەڕینـانـە لە ولاتانی ئەمەریکای لاتــینـیشــدا ڕوویدا. ئەوەبــو لە سەدەی شازدەو حەڤــدەدا بەربـەرەکـانێ‌یـەکی سەخت لە ئاوایی‌یەکانی ئەسپانیادا بەرپابوو لەلایەن قولەڕەشەکانەوە کە لە کێڵگەکان هەڵاتبوون. برازیلیش بزووتنەوەیەکی لەم چەشنەی لە ساڵانی 1630 ـ 1667دا تیا ڕوودا. ئەوەبوو نزیکەی 20هەزار قولەڕەش هەڵاتن بۆ ناو باخە خورما چڕەکان و جۆرە دەوڵەتێکی سەربەخۆیان تیا دامەزراند[43]

دەیـان ساڵ بەردەوام بوو و قارەمـانـانـە بەربـەرەکـانێی هێزەکانی پورتوگال و هۆڵەندەی کرد، بەڵام ئەم هێزانە سەرەنجام توانی‌یان بەو هێرشەی لە ساڵی 1694ەوە بردیانە سەری لەناوی بەرن.

خەباتی دادپەروەرانەی قولەڕەشەکان بەخۆرایی نەڕۆیشت. قولەڕەشەکان لە شەڕی ناوخۆی ئەمەریکادا کە هەنگاوێکی بایەخداری مێژوویی بوو بۆیشەوە،[44] هێزێکی کارا بوون. لە سایەی خەباتی پێشەوای قولەڕەش (تۆسێن لاوڤێرتیور Taussaint Lauverture 1743 ـ 1803)ەوە بەندەیی لە هایتی هەڵوەشێنرایەوەو دانیشتوانی ئەو جزیرەیە بۆ یەکەمین جار سەربەخۆیی یان وەرگرت.

★ ★ ★

دوا جار با بزانین ئەفەریقا خۆی لە بازرگانی پێوە کردنی بەندەوە لە سایەی سەرمایەداریدا، چیی دەسگیر بوو؟

ئەوەی دەسگیر بوو کە چاکترین رۆڵەی خۆی لە نیشتمانی خۆیانداو بەکۆڵی دەریاو ئۆقیانووسەکانەوەو لە نامۆییدا لەکیس چوو. چاکترین لاوی خۆی کرد بە خۆراکی گەرانی رەوروەوەی سەرمایەداریی جیهان. بەگوێرەی ئەو زانستییانەی کەسانی پسپۆری وەك پرۆفیسۆر (دۆبوا ـ Dubios) پیشانیان داوە ژمارەی ئەو قولەڕەشە ئەفەریقاییانەی هێنرانە جیهانی نوێ لە 10 ملیۆن کەس زیاتر بوون. پتر لە 10 ملیۆنیشیان لە رێگەدا مردوون. بەهۆی ئەو شەڕە خێلانەشەوە کە بازرگانانی بەندە نایانەوە لەنێوانیانا، نزیکەی 80 ملیۆنیان لێ کوژران[45].

ئەمەیش واتە ئەفەریقا لە ماوەی سێ سەدەدا (تا ناوەڕاستی سەدەی رابوردوو) 100 ملیۆن کەسی لە باشترین لاوانی خۆی لەکیس چوو کە باشترین هێزی بەرهەم هێنی کیشوەری رەش بوون. بۆیە هیچ سەیر نییە ئەگەر رادەی هێنانە بەرهەمی ئەوەندە کەم ببێتەوە بگاتە رادەیەك هەرگیز پێش هاتنی ئەورووپاییەکان شتیوای بەخۆیەوە نەدیبێ. گەلێ هۆز باشترین رۆڵەی خۆیانیان لەکیس دا، گەلێ هۆزیتریش هەر بەتەواوی لەناوچوون. بەشێکیکەیشیان لەترسی بەندەکرو فرۆشەکان رایان کرد بۆ ناو دارستانە ئیستیوائییەکان و لەوێ برانەوەو قەلاچۆ بوون. بۆنموونە لە گینیادا بازرگانی کردن بە بەندەوە بوو بە هۆی فەوتانی نزیکەی هەموو دانیشتوانی ناوچەکانی کەنار دەریا، لەگەڵ ئەوەیش کە ئەو ناوچانە بەر لە هاتنی ئەورووپاییەکان لە هەموو شوێنێکیتری ئەفەریقا چڕوپڕتر بوون و خەڵکیان زیاتر تیا بوو. کەناری عاجیش لە سایەی فەرەنسەییەکانەوە وەزعی زۆر لەوە باشتر نەبوو.

لە لایەکیکەیشەوە بازرگانی بە بەندەوە کردن بوو بەهۆی تێکچوون و رووخانی گەلێ دەوڵەتی ئەفەریقا کە لەپێش بوون بە باوی ئەو بازرگانییەدا هەبوون و حوکمرانییان ئەکرد. ئەمەیش کاری دەوڵەتە ئەورووپاییەکانی بۆ دابەش کردنی ئەفەریقا لەناو خۆیاندا ئاسان کرد، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوەیش بەداخەوە لەناو مێژوونووسە ئەورووپاییەکانا کەسانیوا هەن هەوڵ ئەدەن بروبیانووی ناپەسەند بۆ بازرگانی پێوە کردنی نەنگین و شەرماوەری بەندە بلۆزنەوەو، وای دائەنێن شتێکی ناچاری بووە بۆ ئەوەی دانیشتووە ئەسڵییەکانی جیهانی نوێ نەچەوسێننەوەو، هۆیەك بووە لە هۆیەکانی بڵاوکردنەوەی دیانایەتی[46].

سەرەنجامی دواجاری بازرگانی پێوەکردنی بەندە، بەش بەحاڵی ئەفەریقا، کەم بوونەوەیەکی زۆری ژمارەی دانیشتووان و[47] هێنانە بەرهەمی کشتوکاڵ و کۆسپ هاتنە رێیەکی بێڕادەو سنووری گەشەکردنی هێزە بەرهەم هێنەکانی ئەفەریقاو پاشکەوتنی شارستانەتیی ئەم کیشوەرە کە هێشتا پاشماوەی بارە بەکۆڵیەوەو، دافرەقانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی بێهاوتای بوو. بەرانبەر بەمەیش سامانی سەرمایەدارەکانی ئەورووپا چ لە ئەورووپاکەی خۆیاناو چ لە هەرکوێیەکی جیهانی نوێ کە پێیان تێ نابێ چەند قات زیادی کرد. رازی یەکەمی پاشکەوتنی ئەفەریقا لە کاروانی جیهان تا لەم خاڵەدا دەس نیشان ئەکرێ.

قەرزی کیشوەری رەش بەسەر شارستانەتیی سەردەمەوە قەرزێکی قەبەیە، بە خوێن و فرمێسك و ئارەقێکی رژاوی زۆری ئەفەریقا کەوتووەتە ئەستۆی سەرمایەدارەکانی ئەورووپاو جیهانی نوێو، بە پاشخوانەی سەر مێزی ئەو سەرمایەدارانە نابژێرێتەوە کە بە منەت نانە سەرو پروپاگاندەیەکی زۆرو هەڵلا هەڵلاو هەیت و هوتێکی سەیرو سەمەرەوە ئەمرۆ ئەینێرن بۆ هەندێ وڵاتی ئەفەریقا[48].

● وەرگێر: محمدی مەلا کریم

## پەراوێزەکان:

(1) دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەم باسەی بۆ کۆڕی (مەسەلەی بەندەیی لە ئەفەریقا) نووسیوە کە (کۆمەڵەی دەوڵەتانی عەرەب) لە 27ەوە تا 29ی حوزەیرانی ئەمساڵ لە توونس ڕێکی خست و ئەویشی بۆ بانگ کردبوو. دوکتۆر کەمال بۆی نەلوا خۆی بەشداری لە کۆڕەکەدا بکا، لەبەر ئەوە باسەکەی لەلایەن دوکتۆر ئەحمەد ئیبراهیم دیابی سەرپەرشتی کەری کۆڕەکەو سەرۆکی بەشی مێژووی ئەنیستیتووتی باس و لێکۆڵینەوەی سەر بە (کۆمەڵەی دەوڵەتانی عەرەب)ەوە لە بەغدا ـ خوێنرایەوە. ئێستا کە ئێمە ئەم باسە بەکوردی بڵاو ئەکەینەوە، یەکەمجارە بڵاو ئەکرێتەوەو چاوەڕوانین دوکتۆر خۆیشی بە عەرەبی بڵاوی بکاتەوە ـ وەرگێر.

(2) پەیدابوونی بەندە بەوردی ئەگەڕێتەوە بۆئەوە کە فێربوونی کشتوکاڵ و حەیوانداریو تەشی ڕستنی ناومال بوو بە هۆی زۆربوونی بەرهەم و، لە هەمان کاتیشا بوو بە هۆی زۆرتربوونی کاری ئادەمزاد چ بە تاك تاك و چ بە کۆمۆنە کۆمۆنەو خێزان خێزان و خێڵ خێڵ. لەبەرئەوە پێویست بوو لەم لاو لاوە کەسی تر بێنن ئیشی پێ بکەن. ئەمەیش لە ڕێگەی جەنگەوە چارکرا ـ کە لەوانەیە پێشتر ویستبێتیان بەزۆر خەڵکی لایی‌یە بۆ ئەم کارە بەکێش بکەن و ئەوەیش کێشابێتیەوە بۆ جەنگ لەنێوان دوو لاکاندا ـ بەم چەشنە بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئادەمزادا جەنگ پەیدابوو کە بوو بەهۆی بەدیل گرتنی ئەندامانی تاقمی بەزیوو بە زۆر کارپێ کردنیان بۆ سوودی تاقمی سەرکەوتوو، یا وەك خاوەنی کتێبی (بنەڕەتی خێزان و دارایی تایبەتیو دەوڵەت) ئەڵێ: «لە یەکەمین دابەش بوونی کۆمەڵایەتی‌یەوە، یەکەمین دابەش بوونی گەورەی کۆمەڵ بە دوو چینی خاوەن و بەندە، بە دوو چینی چەوسێنەوەو چەوساوە ڕوویدا ـ وەرگێر.

(3) بە کتێبی دادگای بەسام ناووبانگی دەرکردووە. کۆمەڵە هەڵژماردن (احصاء)ێکە لەبارەی زەویوزارداری‌یەوە لە ئینگلتەرە، بە فەرمانی ولیەمی یەکەمی بگیر لە ساڵی 1086دا کۆکراوەتەوە.

(4) زەوی‌بەندە: قن ـ Serf

(5) «Sovetskaya Ictoricheskaya Encyclopedia», T. XI, P. 816

(6) ئینگلیزەکان، بە پێ‌لێ‌نانی خۆیان، زۆر لەمێژ نا، لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانا، لە عێراقا بێگاریان بە خەڵك کردووە.

(7) تا دوا ساڵەکانی نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیە هەندێ شێوەی بەندەیی لە بەشێ لە موستەعمەرە ڕۆژهەڵاتی‌یەکانا هەر مابوو.

(8) پێش ئەو مێژووەیش ئەورووپایی‌یەکان، لە سنوورێکی تەسکدا، بازرگانی‌یان بە بەندەوە کردووە. یەکەمین کۆمەڵی بەندەی ئەفەریقایی لە سەرەتای چەرخی سەرمایەداریدا، لە ساڵی 1441دا گەیشتە لیشبۆنەی پایتەختی پورتوگال.

(9) «Novaya Istoria», T. I (1640 - 1870), Moscow, 1978, P. 218.

(10) «Bolshaya Sovetskaya Encyklopedia», third edition, T. II, P.442.

(11) بڕوانەرە: J. H. Parry, Europe and a Wider World (1415 - 1715), third edition, London, 1966 PP. 152 - 153.

(12) «Treaty of Utrecht»

(13) C. Hayes, Modern Europe to 1870, New York, 1959, P. 275.

(14) لەو شوێنانەدا کە دوکتۆر کەمال وشەی (موستەعمەرە)ی بەمەعنا (ئاوەدان کراوە) بەکارهێناوە، وەك هەر لە سەرەتاوە ئیمپریالیستەکان خۆیان بە نارەوا بۆئەو مەعنایەیان بەکارهێناوە، من بە (ئاوایی)م کردووە بە کوردی. لەو شوێنانەشدا کە بەمەعنای ولاتێ بەکاری هێناوە کە ئیمپریالیزم خێروبێری بخواو کەل و پەلی خاوی بەرێ بۆ خۆیو سنعاتی خۆیی تیا ساغ کاتەوە، منیش هەر بە (موستەعمەرە)یی هێشتوومەتەوە، چونکە هێشتا زاراوەیەکی وا نەهاتوەتە کوردی‌یەوە واتای سیاسیو ئابووریی (موستەعمەرە) بگەیەنێ ـ وەرگێر.

(15) J. H. Parry, Op. Cit., P. 153 P. 151.

(16) «Problemi genezisa Capitalisma», Izd Nauka, 1970,

(17) Ibid, PP. 147 - 148

(18) مەبەست ئەوەیە ژمارەی بەندەکان هەم بەش بەحاڵی

لەوەوپێشی خۆیشیان زیادی کردو، هەم لەچاو ژمارەی دانیشتووانی تریشا ـ وەرگێر.

(19) L. M. Hacker, The Triumph of American Capitalism, New York, 1965, P. 98.

(20) مەترۆپۆل: وڵاتی خاوەن موستەعمەرە ـ وەرگێر.

(21) بەگوێرەی هەڵژماردنی ڕەسمی ژمارەی بەندە بەپارە کڕاوەکانیان 3,953,760 ملیۆن بوو.

(22) «Problemi genezica Capitalisma», P. 149

(23) ڕەتڵێك 10 هۆقە یا 2564 گرامە ـ وەرگێر.

(24) Ibid, PP. 153 - 156

(25) فەردە: باڵە. هەر باڵەیەك 500 ڕەتڵ بوو.

(26) «Problemi genesisa Capimalisma», P. 156

(27) Ibid, PP. 161 - 162

(28) Ibid, PP. 162 - 163

(29) «Sovetskaya Istoricheskaya Encyclo Pedia» T. II, P. 671.

(30) Ibid, PP. 671 - 672, «Novaya Istoria», T. I, P. 582.

(31) هەر فەردەیەك 60 کیلۆگرام قاوەی تیابوو.

(32) بۆزانینی زیاتر بڕوانەرە:

«Novaya Istoria», T. I, PP. 582 - 583, «Sovetskaya Ictoricheskaya Encylo Pediya» T. II, P. 672.

(33) E. O, Genovese, the Politcal Economy of Slavery. Studies in the Economy and Society of the Slave South, New York, 1967, P. 29

(34) «Novaya Istoria», T. I, P. 214

(35) تێکڕای ژمارەی خاوەن بەندەکانی خوارووی ئەمەریکا بەرلە شەڕی ناوخۆ نزیکەی 385 هەزار کەس بوو.

(36) مەبەستم داکۆکی کردن لە عوسمانی یەکان نی یە، بەڵام ئەم بەراورد کردنەی عوسمانی و خاوەن بەندەکانەی ئەمەریکا بە یەك زیاتر لە گیانێکی سەلبیی یەوە هەڵقوڵاوە کە زۆر لە بنەوس و خاوەن بیرە بۆرژواکانی ئەورووپا لێی ڕزگار نەبوون ـ وەرگێر.

(37) «Novaya Istoria», T. I, P. 582

(38) Ibid, PP. 583 - 584

(39) بە ئەسپانیایی «Mulato» لە وشەی (مەولاة)ی عەرەبی وەرگیراوە (کە واتە: خانم ـ و). بەشێکی زۆری گەلی وڵاتی ئەمەریکای لاتینی و ئەفەریقا لەمانەن.

(40) ئەم ڕێکخراوەیە لە ساڵی 1865دا دامەزرا. لەبەر بەدەسەڵاتی و توانای لەرادەبەدەری پێی ئەڵێن «ئەمپەراتۆریەتی بەبەرچاوەوە نەبوو».

(41) بەیتی یەکەم لە فۆلکلۆری قولەڕەشەکان و بەیتی دووهەمیش هی شاعیری قولەڕەش هۆرتۆنە.

(42) بە ناوی پێشەوای بەناوبانگی قولەڕەش گارڤی Garvi یەوە.

(43) بە دەوڵەتی پاڵمارێس Palmares بەناوبانگەو پێشەوای هەڵکەوتووی قولەڕەش زوومبی Zumbi سەرکردەیی کردووە.

(44) ژمارەی ئەو قولەڕەشانەی لە سەردەمی شەڕی ناوخۆدا (1863 ـ 1865) چەکیان هەڵگرت نزیکەی 90 هەزار کەس بوو.

(45) بڕوانەرە:

S. D. Skazkina, Istoria Srednikh Vekov, T. II, Moscow, 1966, P. 54.

(46) بۆنموونە بڕوانەرە: C. Hayes, OP. Cit., PP. 182 - 183.

(47) وەك وتمان، دانیشتووانی ئەفەریقا تا ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەم پێنج یەکی دانیشتووانی جیهان بوون، پاشان چ بەشێوەیەکی موتڵەق و چ بەشێوەیەکی نیسبی دایانە کزی و کەم بوونەوەو زۆریان کەم کرد، تا وای لێ هات لە ساڵی 1940دا دانیشتووانی کیشوەری ڕەش 190 ملیۆن بوون کە ئەیکردە هەشت یەکی دانیشتووانی جیهان. جا بۆئەوەش کە تێ بگەین ئەمە چەند کەمە، ئەبێ ئەوە بهێنینەوە بەرچاو کە دانیشتووانی ئەفەریقا زاوزێیەکی زۆر ئەکەن.

(48) نموونەیەکی ئەمە ئەو ئاهەنگی گۆرانی وتن و مۆسیقاژەندنەیە کە لە ئەمەریکاو ئەورووپادا بەرێیان خستووەو گوایە بار بۆی بۆ برسی یەکانی ئەفەریقا پێ خرئەکەنەوە. بۆیە منیش ڕووی دەم ئەکەمە هەموو ئەو کاپیتالیستە «خێرۆمەندانە»ی ئەمەریکاو ئەورووپاو پێیان ئەڵێم: بەرێزەکان دەس لە چەپاوکردنی سامانی هەمەجۆری ئەفەریقا هەڵگرن و «گاڵی خۆتان وەگوێزن»، ئیتر کەسیش خێرو سەدەقەی لە ئێوە ناوێ ـ وەرگێر.

■■■

# پاشەکیەکی بلاوبوونەوەی کەلچەروزمان و ئەلف و بێی یونانی لە رۆژهەلاتدا ودیکۆمێنتەکانی هەورامان لەچوارچێوەی ئەم مێژووەدا

د. جەمال رەشید ئەحمد
بەشی مێژوو کۆلێجی ئەدەبیات
زانکۆی بەغدا



موسا خێزانی فراٹاتیسی چوارەم نیوەی سەدەی یەکەمی پێش زایین

پاش ئەوەی لە چەند ژمارەیەکی دوایی ئەم گۆڤارەدا، لە ژمارەی (10)ی گۆڤاری (کاروان)داو هەروەها لە کتێبی (دراسات کردیة في بلاد سوبارتو ـ بەغدا 1984)دا لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی ئەو دێکومێنتانەی هەورامانم کردبوو، کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە ناوچەی هەوراماندا دۆزرابوونەوە، و لەبەر ئەوەی ئەم نوسراوە گرنگانە، بێجگە لەو لایەنەوە، دوو لایەنی تریان کە (مێژوویی و یاسای)یە وپێویستیان بەشی کردنەوەیەك هەیە بەتایبەتی بابەت و هۆی بلاوبوونەوەی یونانیان و کەلچەرو شارستاینیان و پاشان زمان و نوسینیان لە رۆژهەلاتدا بەگشتی ودەبێت رێگەریان تا کۆتایی سەردەمی حوکمرانی پورثەکان لەم هەرێمەدا، کە وولاتی کوردەواری بەشێك بووە لەو جیهانە، روون بکرێتەوە ئەم دێکومێنتانەی هەورامان، ئەو کارەساتە گرنگانەی کە پەیوەندیان بە سەردەمی ئەو پاشایانە هەیە، کە نێویان لەم نوسراوانەدا تۆمار کراون چاك روونیان دەکەنەوەو رادەی پەیوەندی کەلچەری و زمانەوانی وولاتی کوردەواری بەو چینەدەستەلاتدارانە بەدی دەکەن، ئەمە بێجگە لەوەی کە

پەیوەندیەکی ئابوریی رێك وپێك نێوان کوردانی سەدەی یەکەمی پێش زایین بەدیار دەخات لەژێر تیشکی پەیوەندیەکی یاسایی زۆر بەرز کە لەو ناوچانەدا پێش چەند سەدەیەك بڵاوبۆتەوە بە کاریگەری مەکەدونیان (سەلوقی) بێ گومان.

لەبەر روون کردنەوەی ئەو راستیانەی سەرەوە هەروەها پێویستە رۆشنایێك بەسەر ئەم پلەیەدا بخرێت و لە گۆشەی مێژوویدا رۆلی ئەم دیکومێنتانە روون بکرێتەوە پاش ئەوەی کەڵچەرێك لە وولاتی یونانەوە بڵاودەبێتەوەو لەگەڵ گیانی ئەو شارستیانە کۆنانەی باژێرەکانی رۆژهەلاتدا تێکەلاو دەبێت وبەرهەمی یەکیەتی مێژووو یاساو نوسین و جۆری بیرکردنەوەی لەم دیکومێنتانەدا زۆر جوان بەدیار دەکەون، ئەویش جیهانی هێللنیزمە (سەیریکی نەخشەی یەکەم بکە) گومان لەوەدا نەماوە کەوا هەرسێ پارچە نوسراوەکان، پاش ئەوەی کە ساڵە هیللینیەکان لەسەریان تۆمارکراون و بەحیسابی ساڵی زایینی (مەسیحی) دەگەرێنەوە نێوان سەرەتای سەدەی یەکەمی پێش زایین تا کۆتایی ئەو سەدەیە (88، 22 ـ 21، 11 پ. ز) وپاش ئەوەی لەم سەردەمەی (70) ساڵەدا کە بەسەر دۆزینەوەو شی‌کردنەوەی ئەم نوسراوانە تێپەر بووەو راستیەکی مێژوویی زۆر بەچنگ کەوتوە، دەتوانین ئەوسەر سورمانەی پرۆفیسور مینس، کە دەڵێت «کاتی تۆمارکردنی ئەم دیکومێنتانە بە یونانی شتێکی چاوەرێ نەکراو بووە» کۆتایی پێ بهێنین و بۆ خوێنەری کوردی بەرێز کارەساتی ئەو سەردەمە روون بکەینەوە کە پەیوەندی بە کارەساتی دی هەرێمی رۆژهەلاتی ئاسیای بچوکدا هەیە.

لەکاتی تۆمارکردنی ئەم نوسراوانە دەوڵەتی رۆمان، کە بەناوبانگترین هێزی ئەو سەردەمە بووە، یەکسەر پەیوەندیەکی تونیدی لەگەڵ ئەو هەریمەدا بووە، وشان بەشان لەگەڵ هێزی پورتەکان ناوچەکانی کوردنشینیان دابەش کردبوو، بەلام لە هەمان سەدەدا دوو هێزی دی رۆلێکی گرنگ لەم هەرێمەدا دەگێرن، یەکێکیان (تیگران)ی ئەرمەنی کە نێوی لە دیکومێنتەکاندا تۆمارکراوە، و دووهەمیان میثراداتی شەشەم کە پادشای بونتوسە (Pontus) لەسەر دەریای رەش و[2] بەنێوی یوپاتور (120 ـ 63) بەناوبانگ بووە. سەرەرای ئەو راستیەی کەوا ئەم هەموو هێزانە لە ناکۆکیەکی سیاسیدا بوون بەلام هەموویان رۆلەی کەلچەرێکی یەکگرتووبوون کە یونانیەکان و زمانی یونانی دەورێکی باڵای هەیە لەم بوارەدا. ولەبەر روون کردنەوەی ئەم راستیە بە پێویستی دەزانم لە گشت لایەنی ئەم مێژوویانە بکۆڵمەوە تا گومانێك لەو پەیوەندیانەی نێوان وولاتی کوردەواری‌و ئەم جیهانەدا نەمێنێت.

**(1) کورتەیەك دەربارەی وولاتی یونان و دانشتوانی‌و کەلچەریان و رۆڵیان لە وولاتانی دیدا**

نێوی یونان شێوەیەکی کۆنی رۆژهەلاتی‌یە بۆ وولاتی رۆژئاوای ئاسیای بچوك ولە بنەرەتدا لە (یون) پێك هاتووە نیشانەی کۆم (ان) کەوتۆتە سەری بۆتە (یونان). بەلام سەبارەت بە میللەتانی رۆژهەلات، هەموو دانشتوانی رۆژئاوای ئاسیای بچوك و خوارووی نیمچە دوورگەی بەلکان لە ژێر ئەو ناوەدا ناسراون و ئیمرۆ لە کوردیدا زۆرجار بە(وێنان) بەکاردێت.

لە سەردەمی هۆمیروسدا (سەدەی نۆ ـ هەشت پێش زانیین) ئەم وولاتە بە هیچ نێوێك نەناسرابوو تەنها نێوی (ئاخایی Achaiis) نەبێت، کە ئاولناوێکی مێ‌یە بۆ وشەی (زەوی ـ زەمین gaia) یان (نیشتمان Patris) بەلام ئەم نێوە هەموو وولاتی یونانی نەگرتبووەو بەڵکو تەنها بەشی ژوورووی نەبێت، ئەو بەشە (لایە) لە ناوچە (ئەساليا) کە بە (ئاخیا Achaia) بەناوبانگ بووەو مەڵبەندی ئەخیلیوس (ئەخیل) بووە کە پاڵەوانی داستانی (ئەلیاذە)ی هەمیرووس بووە.

لە لایەکی ترەوە هۆمیروس ناوێکی دی بەشێوەی (ئەرگۆس Argos) بۆ ئەم وولاتەی تۆمارکردوە[3] کە لەراستیدا نێوی شارێك بووە لە ناوچەی ئەرگۆليس لە (پلوپونیز)دا

(نیمچە دوورگەی مورەی ئەمڕۆ)، وئەم شارە لە تەنیشت شارە کۆنە بەناوبانگەکەی ئەو وولاتە بووە بە (میکینای) ناسراوە کە لە سەردەمی خۆی پایتەختی (ئاگامێمنون) سەرۆکی مەزنی هێرێشی سەر ترۆی (طروادە)بوو، وبەهێزترین دەولەتی وولاتی یونان بووە. پاشان هومیروس نێوی ئەرگوس بۆ هەموو پلوپونیز بەکاردێنێت کە دەڵێت کەوتۆتە وولاتی هیلاس (واتە وولاتی یونان).[4]

هومیروس مەبەستی بە وولاتی هیللاس ناوچەیەکی بچوك بووە نزیك وولاتی (ئەخیل) لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی (ئەسالیا)و، هەروەها بەنێوی (هیللینی) مەبەستی دانشتوانی هیللاس بووە کە بە شێوەی (پانهیللین Panellene) بەواتای یەکیەتی گریك بەکار هیناوە.[5] بەڵام بەشێوەیەکی فراوانتر ئەم ناوە پاش سەدەی هەفتی پێش زایین بەکارهاتووە. لەلایەکی ترەوە ووشەی گرایك Graeci ناوێکە لەلایەن ڕۆمانەکانەوە بەیونانیان ووتراوە لە کاتێکی درەنگتردا ویەیوەندی بەکۆمەڵی (Graioi) هەیە کە لە ڕۆژهەلاتی هەرێمی (بویوتیا) لە یوناندا دەژیان و ئەمانە شاری (کیمی یان کومای)یان دروست کردو بەهەمان ناو یونانەکان شارێکیان لە خوارووی نیوان 750 ـ 725پ. ز دروست کرد، لەبەر ئەوە رومانەکان نێوی دانشتوانی ئەو شارەیان بە گریك دانا وپاشان ئەم نێوە بوو بەنێویکی گشتی بۆ هەموو دانشتوانی یونان لەلایەن ڕۆمانەکانەوە.

لە لایەکی ترەوە نێوی (یونان) لەبنەرەتدا لە نێوی (ئیون Ione) کە دانشتوانی سەر بەهەمان کۆمەل، دانشتووی ڕۆژئاوای ئاسیای بچوك، پێك هاتووە. لە سەرەتادا ئەم ناوە بەشێوەی (ئیایون Iaone) بووە، پاشان هەروەکو ووترا نیشانی کۆی (ان)ی کەوتۆتە سەرو بۆتە (ئیونان ـ یونان)و ئەم گروپە یەکەم کۆمەڵی دانشتوانی وولاتی یونانی کۆن بووەو هەر لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایینەوە پەیوەندی لەگەڵ دەولەتە کۆنەکانی ڕۆژهەلاتدا پەیدا کردووە. وئەم یونانیانە، لەبەر ئەوەی زۆربەیان لە قەراخ دەریاکانی مەرمەرەو سپی و رەشدا نیشتەجێ بوون پەیوەندیەکی پتەویان لەگەڵ کوپروس (قبرص)و ئەو شارە کۆنانەی قەراخ دەریا لە تورکیاو سوریا و لوبنانی ئەمڕۆدا پەیداکردبوو و بازرگانیەتیەکی توندیان لەگەڵ هەبووەو لەبەر ئەوەی هەر لەو سەردەمیشەوە ئاشوریەکان و هەروەها میتانیەکان بەرێگەی حیثیەکانی ناوەراستی ئاسیای بچوکدا چ بە ڕێگەی دیبلوماسی چ بەرێگەی ئابوریدا پەیوەندیەکیان لەگەڵ ئەم یونانیانەدا دروست کردوە. لەبەر ئەمە چەند جارێك ئاشوریەکان پەلاماری شارە یونانیەکانیان داوە لە قەراخی زەریای سپی لە وولاتی فینیقیاداو ناویان بە (یەمانی) بردوە.[6]

پێش بلاوبونەوەی رەگەزی کۆمەلە عەشایرەکان یونانی کۆن، دوو ناوچەی مێژوویی ومەلبەندی شارستانیەتی گرنگ لە وولاتی یوناندا هەبووە، یەکەمیان ناوچەی (کریت)و ئەویتریان بەنێوی شاری (کنوسوس) لەسەر زەریای ئیجە کە بە نێوی پاشای گەورەشیان (مینۆس) ناسراوەو پلەکانی ئەم شارستانیەتیە بە پلەکانی (مینەوی) ناو دەبرێت. لە راستیدا ئەم دوو مەلبەندە دەتوانرێت بگوتریت، کە بناغەی کەلچەری یونانی کۆنیان دامەزراندوە کە بووە هۆیەك لە پەیدابوونی هیللیزم و لە جیهاندا بلاوبووەوە.[7]

پاش تەمەنێکی درێژی ئەم شارستانیەتیەی کریت و کنوسوس، چەند کۆمەلێك لە کۆچەرانی یونانی کۆن بەرەو ئەم وولاتە لە باکورەوە روو کرد ولەناو ئەو عەشایرانە ئەمانە خوارەوە ناو بانگیان دەرکردبوو:

1 ـ کۆمەلی عەشایری ئە سالیەکان.
2 ـ کۆمەلی عەشایری بیوسینیەکان.
3 ـ کۆمەلی عەشایری دووریەکان.

پاشان لە ناوچەی (ئەسالیا)وە کۆمەلێك (ئاخی و ئیولی) بلاوبونەوە قەراخی دەریای ئیجەو دوابەدوای ئەمە ناوچەکە بەنێوی (ئیولیس) نێوبانگی دەرکرد لەمێژوودا، بەلام نێواندی دۆلی هیرموس و دۆلی میاندر بوو بوو بە مەلبەندی (ئیونی)ەکان، کە لە بنەرەتدا لە قەراخەکانی (ئەتیکاو

ئەرگـولیس) بڵاوبـوونـەوە. لە خوارووی ئەمانەوە عەشایری دووریـەکـان نیشتـەجێ بووبـوون، بەتایبەتی لە دوورگەی (رودوس وکـوس)و خوارووی رۆژ ئاوای ئاسیـای بچـوك (تورکیای ئەمڕۆ).[8]

ئەو بیـروبـاوەڕەی دوکتـور (لطفی عبـدالـوهـاب یحیی) مامۆستـای مێژ ووی شارستـانیەتی زانکۆی ئەسکەندەریەو بەیـروت کە دەڵێت «دەریـاکـان سنـورێکی سروشتی بوون لەبـەردەم ئیمپـراتوریەتی حثیو ئاشورو میسرداو ڕێگەیەکی باشی دابــوەوە بڵاوبــوونـەوەی ئاسـایش و مانـەوەی وڵاتی یونان و پەرەسەندنی ژیانی شارییدا»[9] ڕاستیەکی بەجێ یە، وبـووبـوونـە هۆی گۆڕینـەوەی شێوەی حوکمی پاشایەتی بۆ ئوروستـوکـراتیـەتی بە تایبەتی لە شارەکانی (ئەثیناو سپارتەو کورینثە)دا. دوابەدوای ئەمە یونانیەکان دەستیان خستەسەر زۆر لەو دوورگەو زەویو زارانەی دوور لە وڵاتیان وەکو لە پروبـونتـوس (دەریای مەرمەرە)و ئیلیوکزین (دەریای ڕەش)و سەرووی ڕۆژئـاوای ئیجـەو سیسیلـیا (صقلیە)و ئیتـالیـاو تەنانەت لە هەمان سەردەمدا گۆڕینێکی سیاسیو ئەنتوگرافی زمانەوانی لەرۆژهەلاتی ناوەڕاستدا ڕووی دابووەوە، ئەویش بەپـەیـدابـوونی مادەکـان و هەخـامـەنشیەکان و لەناوچوونی دەوڵــەتـی ئاشــورو ئوارتــوو هیثـیو هەروەهــا میســری فرعەونەکان، بەڵام پاش ئەو جەنگەی میدیا ولیدیاو پەیمان بەستنیــان لەســەر روبــاری هالیس دا کە ببێت بەسنـوور لەنیوانیاندا پەیوەندیەکی سیاسیو شارستانیەتی نوێ لەم جیهانەدا پەیدابوو و بەڵکو لە دواییدا یونانەکان زانیاریەکی باشیان لە هێرشەکەی ساڵی 403پ.ز کە کورش بەسەر ئەردەشێـردا لە ناوچـەی بابلدا کردیو لە شەری کۆنـاکـسادا کوژراو کسینـوفـون ئەو پاشمـاوەی یونـانیـانەی ئەو لەشکرە ساڵی 401 پ.ز بەسەلامەتی گەڕاندیانیەوە بۆ وڵاتی خویـان.[10] و ئەم دەنگــو باســانــە کە لەم هێـرشـەدا کۆ کرابووەوو لە یونانـدا بڵاوبووەوە بناغەیەکی باشی کوتابووەوە بۆ هاتنــەوە ئیسکـەنـدەری مەکـەدۆنی بەرەو ڕۆژهـەلات پاش کەمتـر لە سەدەیــە، ئەو هاتنــە کە مەبــەستی گرنگی بڵاوکــردنــەوەی کەلـچـەری هیللینی بوو (هیلینـزم)، واتـە سەرەتـای دەست پێکـردنی چەرخێك بوو کە شارستانیەتی یونـان تێـدا بلاو دەبـووەوە، ئەو شارستـانیەتی یە کە لەکۆتایی هەزارەی دووی پێش زایین سەری هــەلـدابـووەوو تا سەدەی هەفتــەمی زایینی بەردەوامی کرد لە هەمــەجۆر وڵاتـانی ئاسیاو ئەورووپاو ئەفریقیادا.

لەبـەر ئەوەی ئەم شارستـانیـەتی یـەو کەلچـەرە بووبوو بە ڕووداوێکی جیهـانی، دەتـوانرێت بگوترێت، کەوا وڵاتی یونان خۆی بەلایەك لە لایانی ئەو جیهانە کەلچەریە فراوانە دەژمێـررا کە پەلـی هاویـشتـبــووەوە ناوەراستی ئاسیــا و هینـدستـان و سەرووی ئەفـریقیاو ئەورووپا تا ئەو وولاتانەش کە کەوتبـوونـە سەر ئەتلەنتیـك و دوورگەی بەریتانیا. بەڵام لێــرەدا دەبێت ئەوە بزانین کەوا گرنگ نیـە هەر میللەتێـك بەیـونـانی قسـەی نەکـردبێت نەکـەوتبێتـە ژێـر کاریگـەری کەلچــەری هیللینی تەنـــانـەت چینی دەستـەلاتـداریـەتی دەوڵــەتــی پورث کە دوژمـنـی ڕۆمـــان بوون لەم ڕووداوە ڕزگاریان نەبووە.

هەروەهـا گرنـگ نیـە هەر میللەتێکش بەیـونـانی قسەی کردبێت لەژێر پەردەی کەلچەری هیللینیدا ژیابێت، وەکو ئەوانەی کە لەسەروو سەرووی ڕۆژئاوای یونانـدا ژیاون، هەروەهــا دانـشتــوانی کوپــروس (قبــرص) وکیلیکیــاو شوێنانیتر، تەنانەت هەندی عەشایری دانشتوی ڕۆژئاوای (تەراکیا) - بولگاریایئەمرو - بەهیچ جورێك پەیوەندیان بەم کەلچـەرە نەبـووە، و لە دەرەوەی سنـووری هێڵی هیللینـزم ژیـاون تا ڕۆمـانـەکـان بەکـاتێکی درەنگتر خستنیانە ناو ئەو هێڵەوە، چونکـە ئەم ڕۆمـانـانـە، بێگـومـان، گەورەتـرین میللەت بوون لەناو ئەو میللەتانە کە کەوتبوونە ژێر سیبەری ئەو کەلچـەرەوە و دەستـەلاتـداریەکی بەهێزیان پەیداکردبوو بەڵام درەنگتر کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەو کەلچەرە ئەگەر بەراوورد بکــرێــن بەمــیـللەتـــانـیتـرەوە و دەوریــان لە بڵاوکــردنـەوەی زۆرتـربـوو تا ئەوانیتـر لەگـەڵ ئەمـەشـدا ڕێـزگـرتنیـان بە مێـژ ووی یونـان و زمـانیـان و کەلچـەریـان شان بەشان لەگەڵ لاتینیدا قوڵترە تا وولاتانیتر. هەر لەبەر ئەمــەش بوو کە زۆربــەی زۆری نوســەرانــی ڕۆمــان،

ـە بەرەتدا یان یونانین بەلاتینی دەیاننوسی، یان رۆمان
ـوون لەژێر کاریگەری بیری یونانی، یان هەر بەزمانی
یانی دەیاننوسی. لەبەر ئەمەیشە بەهەڵە ووشەی
کەلچەری هیللینی) بەکەلچەری گریکی (واتە یونانی)
ـراوە، بەڵام هەروەکو ووتمان کە نیوی هیللینی تەنها
ـەنیوی (هیللاس)ەوە وەرگیراوە کە لەسەرەتادا نیوی
ـوچەیەك بوو لە دەووروبەری بەشی سەرووی کەنداوی
(مالیا) لە لای ئەو سنوورەی، کە نیوەراستی وولاتی یونان
ـە بەشی باکوری جیادەکاتەوەو هیچیتر.

لەراستیدا هیللینی لە یونانـدا بوو بە شێوازێکی دیارو
ـیەت لە شیوازەکانی ژیان، لە سەرەتادا خۆی لەنێو
ـسایەکی سەرەکیدا دەنواند، کە ئەویش (دەوڵەتی
شارە)بوو، هەموو کە سێکیش، کە لەنێو شاردا پێرەو
ـەکرا، بە هیللینی دەژمێردرا باوەکو جیاوازی لەبنچینەو
پەروەردە کردنیدا هەبوویێ ئەو شتەی، کە ئەو کەلچەرە
ـەبیاردەخات سوود وەرگرتنیبوو لەو یاسایە، کە کردبوویە
هۆیەکی کاریگەر بۆ دەربرینی تیروانینێکی تایبەتی بۆ
هەبوون (وجود)و کەوا ئادەمزاد پێوانەی هەموو شتێکەو
گەورەی هەبوونە. بۆیە دەتواندرێت بگوترێت، کەوا
کەلچەری هیللینی یەکەمین کەلچەرە، کە باوەری ئاینزا
(مذهب)ی برواهینانی بەشێوەیەکی ئاشکراو دیار بەئادەمزاد
هێناوە.

کە فیلیپی مەکەدۆنی هەوڵیدا یەکخستن و یەکگرتنێك
هۆی یەکگرتنی هیللینی پێك بهێنێت بۆ ئەوەی بەهۆیەوە
دەسەڵات داریتی بەسەر هەموو شارەکانی یونانیدا
هەبێت[11] هەر ئەوسابوو ئەم دەسەڵات داریتیەی بەرەو
رۆژهەڵات بەهۆی ئیسکەندەری کوریەوە دەستی پێکرد.

بەم جۆرە گەر مەکە دۆنیەکان لە رووی هێزی سوپاوە
وولاتی یونانیان داگیرکردبوو، ئەوە رۆشنبیری یونانی باڵی
بەسەر کەلچەری مەکەدونیان دا کێشابوو. پاش کۆچی
دوایی فیلیپ، کە لە ساڵی 336 پ.ز بوو ئیسکەندەری
کوری چاوی لە رۆژهەلات بریبوو لەراستیشدا توانی ئەو
پلانەی خۆی لە ماوەی نۆ ساڵان دا جێبەجێ بکات و بۆ
کارگێرانی ئیمپراتۆریەتەکەی پشتی بەتوانای یونانیان
بەستبوو، کە لە بواری کارگێری و سوپایی و روشنبیریدا
پێشکەوتوو بوون و هەتا لەدوای دوا ماڵ ئاواییشیدا لە
ساڵی 323 پ.ز سەر لەشکرەکانی خۆی
ئیمپراتۆریەتەکەیان لەنێوان خۆیان دا دابەش کرد. بەم
جۆرە هەڵی تێکەڵاو بوونی کەلچەری گریکی بە کەلچەری
رۆژهەڵاتیدا پەیدابوو بە شێوەیەك. هەموو ناوچەیەکی
گرتبوّوە لە رۆژهەڵات وەیا وولاتی یونان داو هیلینزم
نیشانەی ئەو کاریگەرە گریکییەیە بۆ ئەم جۆرە کەلچەرە
نوێیە.

پاش ئەم کارەساتە ئەو دەستەڵات داریتیە ناوەندیەی
ئەسکەندەر، لە کاتێکی زۆر کورتدا لەنێواند
سەرلەشکرەکانی دابەش کرا، پاش شەری ئیپسوس ساڵی
301 دژیەکتری وسەر لەشکرەکان بوون بەپادشای ئەو
ناوچە هەمەجورەی ئیمپراتوریەتی مەکەدۆنیان. کاساندەر
لەمەکەدەنیادا، لیسیماخوس لە تەراقیادا ئەنتیگۆنوس لە
ئەنادۆل و سوریادا، بتولیمی لە میسرداو سیلوکوس
(سلوقس) لە رۆژهەلاتداو لە ناو ئەمانەدا تەنها ئەنتیگۆنوس
کە ئەو کاتە تەمەنی هەفتا ساڵ بووە هەوڵی داوە یەکیەتی
ئەم دەولەتە بپارێزێت،[12] لەپێناوی ئەمەدا شەرێکی گەورە
لەنیواندیاندا رووی داوە لە کوتاییدا ئەو ناوچانە بەو جۆرە
دابەش کراوە، ومەبەستی دامەزراندنی ئیمپراتوریەتێکی
هیللینی یەك گرتوو لەم کاتەدا مردوە (نەخشە ژمارە 2)
لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێ لەم شوینانە رزگاریبوە
لەژێردەستەی مەکەدونیان یان هەندێ شوێنی کەوتۆتە
ژێردەستیان، بەڵام لەناو هەموویاندا دەستەلات داریتی
سەلوقی توانی بۆ ماوەیەکی درێژ دەستی درێژ بکاتە
ناوچەیەکی فراوان هەتاکو وولاتی هیندوستان کە لەلایەن
ئیسکەندر خۆی داگیرکرابوون. شەری ئیپسوس کوتاییکی
نەهێنا بەو ناکۆکیەی نێواند سەرلەشکرەکان، وپاش مردنی
کاساندر دیمتریوس هەرچاوی لە ناوچەکانی سەر زەریای
ئیجە بوو بەڵام لیسیماخوس چوو بەگژیاو لە ئەنادول
شکستی پێهێنا لە کۆتاییدا ئەمیان بەدەست سەلوقس

لەناوچوو لە کۆروپێدیوم لە ناوچەی (ئیونیا)دا (ساڵی 280 پ.ز).

لەگەڵ ئەو گەشانەوەی دەوڵەتی رۆمانی لە ئەوروپادا وپەرەسەندنیان لە ئاسیادا کاری ئەوتۆی نەکردە سەر هێزی (سەلوقی) کە تەنها هێزێك بوو لەوێدا دەستی خستبوە سەر وولاتانی ئەم کەرتەیەدا تا پەیدابوونی دەولەتی پورث.

بێ گومان ئەم رووداوانە لە ئاسیای بچوك و سەرووی میزوپوتامیا وخوارووی قەفقاسیادا دوورنەبوون لە ناوچە کوردنیشینەکان و بەشێوەیەکی یەکسەر زۆربەی ناوچەی کوردەواری بەندبوون بەم هێزانەوە بەتایبەت هێزی سەلوکیان

## (2) پورثەکان و رۆلیان لە رۆژهەلاتدا لەسەردەمی هیللینزمدا

پورثەکان لەسەرەتای مێژوویاندا کۆمەلێ کۆچەر بوون لەنێوان هەزارەی یەکەمی پێش زایین هەتاکو سەدەی یەکەمی زایین لەو ناوچانەی خوارووی رۆژهەلاتی دەریای قەزوین، کە ئیمرۆ بە تورکمانیاو خوارسان (لە کۆندا بە پورث ئاوا - پەرتاڤا) بەناوبانگە کوژەرایان کردوە.[13] لە سەرەتادا سەر بە دەولەتی میدیاو پاشان هەخامەنشی بوون دوا دوای ئەمانە مەکەدۆنیەکان دەستیان درێژکردە ئەم ناوچانەی پورث، کە لە 250 پ.م توانیان دەولەتێکی بچوك و رزگارکراو لە دەستەلات دارێتی مەکەدۆنی پێکەوەبنێن و لە دوایدا بوو بەبناغەی ئیمپراتوریەتەکەیان و زمانەکەشیان تا سەدەی 3 - 4 زایینی هەر بەکارهاتوە لەو ناوچانەداو لەشوێنانی تردا.[14]

لەراستیدا پەیوەندیەکی زمانەوانی و مێژوویی کۆن ئەم پورثانە دەبەستێت بەو کۆچەرانەی ناوەراستی ئاسیا کە بە (سەکەس یا سکیث - ساکا) ناوبانگیان دەرکردبوو و تا ناوەراستی سەدەی 3 زایینی هەر لەوێدا نیشتەجێ بووە.[15] بەڵام وا دیارە ئەو دەستەلات دارێتی یە هیللینی یە بەسەر پارثیادا هۆیەکی گرنگ بووە بۆ پەیدابوونی بناخەی دەولەتیان، کە یەکەم سەرۆکیان لە مێژوودا بە (ئەرشاك) ناوبانگی دەرکردووە لە ساڵی 232 - 231 پ.ز (سەلوقس)ی دووهەم ناچار بوو دان بە حوکمرانی (تیریدات)ی یەکەم بهێنێت کە برای ئەرشاك بووەو پاشای هەموو وولاتی پارثیا بووە. پایتەختی ئەم دەولەتە لە سەرەتادا (گیکاتومپیل) بووە کە کەوتبوە خوارووی رۆژئاوای دامگان (دامغان)ی ئەمرۆ، بەلام پاشان شوێنی چینی دەستەلاتداری ئەم پورثانە بۆتە شاری ئەکپەتانا (هەمەدان)ی ئەمرۆ پاشان شاری (سەلوقیە) لەسەر رووباری دیجلە کە لەلایەن مەکەدونیەکان دروست کرابوو.

سنووری سیاسی پارثەکان بەپێی هێزەکانی دەوری بەری خۆیان دەگۆرا. سەیرێکی نەخشەی 3، 4 بکە لەلایەك سەلوقیەکان و لەلایەکی ترەوە رۆمەکان، لە رۆژهەلاتەوە دەولەتی گریك - باکتری، لەگەڵ عەشایری کۆچەرانی ناوەراستی ئاسیادا. ساڵی (209 پ.ز) ئەنتیوخوسی سیهەم پەلاماری شاری (گیکاتومپل)ی داو داگیری کرد، وپاش رێکەوتنێك دیسان ئەرشاکیەکان دەستیان بەسەر وولاتی پارثیادا هێنا.

لە سەردەمی میثراداتی یەکەم[16] سنووری دەولەتی پورث زۆر فراوان بوو لە رۆژهەلاتدا کە دەستی بەسەر (باکتریا)دا هێنا، پاشان ساڵی (161 - 155 پ.ز) دەستی بەسەر (میدیا)دا هێنا، لە (141 پ.ز)دا زاڵ بوو بەسەر سەلوقیەکانی سەر ووباری دیجلەو شارەکانی (بابل، ئوروك.. هتد)ی داگیرکرد، هەروەها پەلاماری (عیلامی)دا. لەگەڵ ئەم هەموو دەستەلارێتی یە، خەبات لەگەڵ عەشایری ساکا (سەکەس) زۆر گران بوو، ئەمانە دەستیان گرتە سەر وولاتی پارثیا خۆی و بەهیدیش بەرەوخوار دەبوونەوە.[17] (سەیری نەخشەی ژمارە 4 بکە).

لە سەردەمی میثراداتی دووهەم[18] توانرا هەندی لەو شوێنانەی، کە ساکاکان گرتبونیان بیگەرێننەوە، بەتایبەتی ناوچەی (درەنگیانە) بەلام پاشان ساترایی (سەکستان) ناوچەکانی (ئاریاو مەرگیانا)ی خستە ژێر ناوی گشتی

خۆی.

میثراداتی دووهەم، وەکو پادشاکانی هەخامەنشی، نێوی (پادشای پادشایانی) بە خۆیەوەنا، و لەم کاتەشدا بوو کە پەیوەندیەکی دیبلوماسی لەگەڵ وولاتی چین دا دروست کرا،[19] پاشان دەستیان درێژکردە سەر ئەرمەنستان (سەیری نەخشەی ژمارە 5 بکە) لە ساڵی (92 پ.ز)، پاش خەباتێکی زۆری نێواندا ئەمانەو ڕۆمانەکان رووباری فورات بوو بەسنووریان، بەڵام یەکەم جەنگی فراوان ساڵی (65 پ.ز)و لە ناوچەی (کوردوینی) لە خوارووی گۆمی وان (ناوەندی کوردستانی ئەمرو) لە بەینی ئەم دوو هێزەدا دەستی پێکرد، تا وای وای لێهات لە سەردەمی ئۆرودی دووهەم (57 ـ 37 پ.ز) لەشکری ڕۆمانی لەژێر سەرکردەی (لیسینیا کراسا) گەیشتە مێزوپوتامیاو ناوچەیەکی زۆر وولاتی کوردنشینی داگیرکرد. بەرامبەر ئەم هێرشە پورثەکان توانیان ساڵی (40پ.ز) هەموو ئاسیای بچوك داگیربکەن، تەنانەت سوریاو فەلەستینش.

(سەیریکی نەخشەی ژمارە 5 بکە).

بەڵام پاشان کەوتە بەرەو وولاتی (میدیاو ئاتروپاتینا) وەکاتی تیکچونی نێوان فراهاتی چوارەم (37 ـ 2 پ.ز)و تیریداتی دووهەم، ئەوەی یەکەمیان پەنای بردە ساکاکان، وئەویتریان پاڵی دایە ڕۆمەکان، لێرەدا لاوازی کەوتە دەولەتی پورث، لە ساڵی (20 پ.ز) لەگەڵ ڕۆمەکاندا ڕێکەوتنێك بەرپاکرا بەمەرجێك ئەرمەنستان بدرێت بە ڕۆمانەکان رووباری فوراتیش ببێتە سنووریان لە ڕۆژئاوادا، واتە پورثەکان سوریاو فەلەستین و ئەرمەنستان و لایەکی زۆری وولاتی کوردەواریان لە دەست چوو. (سەیرێکی نەخشەی ژمارە 6 بکە).

بەکورتی، دەوڵەتی پورث تا ساڵی 226 زایینی بەردەوام بوو، و لەم ساڵەدا ئەردەشێری پاپەکان کە لەبنەماڵەی ساسانی بوو توانی کۆتایی بە حوکمی پورثەکان بهێنێت و ئەردەوانی پێنجەم پاش خەباتێکی چەند ساڵە بکوژیت و کۆشکی حوکم لە دەست دەربگرێت و لەبەر روون کردنەوەی سەردەمی حوکمرانی ئەو پادشا پورثانە، کە نێویان پەیوەندی هەیە بە دێکومێنتەکان هەورامان (لەسەدەی یەکەمی پ.ز) ساڵی حوکمیان و نێویان بەم جۆرەی خوارەوە ڕێك دەکەوێت.

| شێوەی نوێی نێوەکان | شێوەی لاتینی | کاتی حوکمرانیان (پ.ز) |
|---|---|---|
| 1 ـ (مهرداد)ی دووهەم | میثراداتیس 11 | 123 ـ 88 ، 87 |
| 2 ـ (گودرز)ی یەکەم | گوثارزیس | 91 ـ 81 |
| 3 ـ (ئۆرۆد)ی یەکەم | ئۆرۆدیس 1 | 81 ـ 75 |
| 4 ـ سیناتروك | سیناتروکیس | 75 ـ 79 ، 69 |
| 5 ـ (فەرهاد)ی سێیەم | فراثاتیس 111 | 69 ـ 58 ، 57 |
| 6 ـ (مهرداد)ی سێیەم | ئۆرۆدیس 111 | 57 ـ 36 |
| 7 ـ (ئۆرۆد)ی دووهەم | ئۆرۆدیس 11 | 57 ـ 36 |
| 8 ـ (پیروز)ی یەکەم | پەکۆروس 1 | لە 37 ـ مردوە |
| 9 ـ (فەرهاد) چوارەم | فراثاتیس 17 | 38 ـ 2 |
| 10 ـ (تیرداد)ی دووهەم | تیریداتیس 11 | 30 ـ 25 |
| 11 ـ (فەرهاد)ی پێنجەم | فراثاتیس 7 | 25 ـ 4 |

هەروەکــو لە سەرەتــای ئەم لێکـۆڵینـەوەدا باس کرا کەوا بێجگـە لەم دوو هێـزە سیـاسیو کەلچـەریـە هێـزێکی‌تری سیهـەم پەیـوەنـدی بەو سیاسەت و کەلچەرە هەبووە ئەویش یەکەمیان هیزی تیگرانی ئەرمەنی[20] (کە نێوی بە شێوەی تیگرانیس لەگەڵ خێزانیا کلیوپاترا[21] لە دێکومینتەکە تومار کراوە ئەویتـریـان میثـراداتی شەشەم پادشای (بونتوس)ە کە خەزووری بووە.[22]

## (3) کورتـەیـەك دەربـارەی تیگـرانی ئەرمـەنی و میثراداتی پونتوس (هێزی سێهەم)

تیگران (تیگرانیس) یا (دیکران)ی یەکەمی مەزن (140 - 55 پ.ز) پادشای ئەرمەنستان بووە لە سەرەتای 95 یا 94 پێش زاییندا. لە کاتی حوکمرانی ئەم پادشایە دەوڵەتی ئەرمـەن گەیشتـە پلە یەکی بەرزی یەکگـرتـوو لە مێژوویدا هەرچـەنـدە بۆ کاتێکی کورتیش بوو، بەڵام بە بەهێـزتـرین وولاتی رۆمان دەژمێردرا.

تیگران کوری (یا برازای) ئەرثاڤاسدیسی دوهەم بوو، و یەکێك بوو لە بنەماڵەیەك لە سەدەی دووی پێش زایین لە لایـەن (ئـەرتـاکسیـاس) هاتبـوە کایـەوە. پاشان تیگران بە (رهینــة) لە لایـەن میثـراداتی دوهـەمی پورث برا بۆ پارثیـا پاشـــان ئازادکـــراو گەرایـــەوە وولاتـی خۆی بەرامبـــەر بە ناوچـەیـەك کە کەوتبـۆە سنـووری میـدیـا و بە (هەفتادۆڵ) بەناوبانگ بوو.

لەم کارەســاتـە بە دووا، تیگـران دەستی‌کـرد بەفـراوان کردنی وولاتـــەکـــەیو پەلامـــاری وولاتی سوزیفینی (کـە کەوتبـۆە رۆژهـەلاتی روباری فورات)دا وپاشان پەیمانێکی بەست لەگــەڵ میثـراداتی شەشـەمـدا کە پادشـای وولاتی بونتـــوس (قـەراخـەکـانی رۆژهـەلات، خواروی زەریـای رەش) بووو پاشان کچی میثراداتی (کە نێوی کیلوپاترا بوو) مارەکـــرد و بە هێـــزەکـــانـی هەردوولا چوونـــە ناو وولاتـی (کـــەپـــەدوکیـــا) لە رۆژهـــەلاتی ئاسیـــای بچـــوکـــدا، و

ئەنجـامـەکـەشی هاتنەوەی هێزی رۆم بوو لەم کایەدا ساڵی 92 پ.ز.

دوا بەدوای ئەمـە، تیگـران شەڕێکی لەگـەڵ پورثەکاندا هەڵگیـرسـاند لە خوارووی رۆژهەلاتی زەریای قەزوین دا، کە ناوچەیەکی بێ‌هێز بوو لەلایەن پورثەکانەوە پاش مردنی میثـراداتی دوهـەم ساڵی 87 پ.ز بەتـایبـەتی ئەو ناوچەیە بەدرێـژایی‌کـات بەر پەلامـاردانی سەکـەسـەکان دەکەوت. تیگران لەو کاتەدا توانی (هەفتا دۆڵ) بگەڕێنێتەوە زۆربەی زۆری وولاتی میـدیـا بخـاتە ژێردەستەی خۆیو بەم جۆرە بوو بە (پادشای پادشایانی) وولاتی ئەتروپاتیناو گوردوینیو ئەدیـابـینیو ئوســروینیو هەمـــوو ناوچـــەکـــانی سەروەی میـزوپـوتـامیـا (کـوردستانی تورکیای ئەمرو)و لە قەفقاسیادا پاشـایـانی ئیبیـریـا (گـورجستانی ئەمرۆ) ئەلبانیا (داغستان ئەمرۆ) دانیان بە پادشای پادشایەتی تیگرانیان. نا و لە لە ساڵی 83 پ.ز کۆشکی سەلـــوقی لە سوریـادا لەنـاوچـوو بەرامـــبـــەر بە تیــگـــران و پاش

پاش ئەم سەرکـــەوتنـە سیـاسیـە شاری (تیگـرانـوکـرتـا)ی دروست‌کرد (مە یافارقین)و لە ساڵی 72 پ.ز دەستی‌کرد بەشەر لەگەڵ روومانەکاندا کە لوکوللوس توانی ساڵی 69 بە ئەرمینیـــا داخـل بێت و تیگـران نزیـك شارەکـەی خۆی، تیگـــرانـــوکـرتـا شکستی بهێنێ روژی شەشی ئوکتـوبـەر. دووهـەم جار دیـسانەوە نزیك (ئەرتەکساتا) مانگی سیپتەمبەر ساڵی 68 شکستی‌هێنـــاو وای کرد لە تیگـــران کە لەگـەڵ میثرادات هێزیان بکەن بەیەك بەڵام کورەکەی لە کلیوپاترا کە نێـــوی هەر تیگـــران بوو دژی باوکی وەستـــاو لەگـــەڵ پورتـەکـانـدا بوو بەیـەك و فەرهادی سێهەم یارمەتی‌دا بەڵام باوکی زال بوو بەسەریاو کورەکە خۆی گەیاندە سەرکردەی رۆم (پومپیوس) کە بەرەو ئەرمەنستان دەهات. لە کۆتاییدا تیگـــران سالی 66 پ.ز تەسلیمی رۆم بوو. پـــومپیـــوس پادشایەتی خۆی پێ بەخشی لەژێر چاودیری خۆیاندا.

تیگـــران بیست ساڵی‌تـر حوکمی‌کـرد وەکـو نوێنـەریکی رۆمانی بەڵام وولاتانی سوفینیو گوردوینیو جێی‌تری لە

دەست دەرچوو.

ئەرتاڤاسدیسی کوری پاش خۆی، جێی گرتەوە. و لەبەر پاراستنی ئەرمەنستان گومان لەوەدا نیە. کە تیگرانی ئەرمەنی بەپیویستی دەزانی کیلوپاترای کچی میثرادات مارەبکات.

ئەم کلیوپاترایە کچی میثراداتی شەشەمە پادشای ناوچەکانی گورجستانی ئەمرۆو خوارووی زەریای رەش و ناوەراستی ئەنادۆل. کە لەو کاتەدا بە بونتوس Portus بەناوبانگ بوو.

ئەم کچە شووی کردە تیگرانی ئەرمەنی بەلام لە مێژوودا بێجگە لەم کلیوپاترایە چوار کەسی تر هەیە بەم ناوە کە ناوبانگیان دەرکردوە.

1 - کلیوپاترەی چوارەم (سالی 69 پ.ز لەئیسکەندەریە لەدایک بووەو سالی 30 مردووە، پادشای میسر ودۆستی یولیوس قەیسەرو مارك ئەنتونی و خوشکی بطولیمی هەشتەم بووە.

2 - کلیوپاترای یەکەم کچی ئەنتیوخوسەو ژنی بطولیمی پێنجەمە میسر بووە، سالی 193 - 176 پ.ز.

3 - کلیوپاترای دووهەم (سەدەی یەکەمی پ.ز) ژنی و خوشکی (بطولیمی ئیورکیتیس)ی دووهەم پادشای میسر.

4 - کلیوپاترای سیهەم (سەدەی یەکەمی پ.ز) برازای و ژنی دووهەمی (بطولیمی ئیورکینس) دووهەم پادشای میسر.

لەم سەردەمەدا، کە دەولەتی رۆمانی هێزیکی جیهانی بو، پایتەختەکەی (رۆما) توشی گێچەلیەکی گەورە بوو، لە کۆتایی سەدەی دووی پ.ز دووبەرەکی کەوتە ناو ئەندامانی ئەنجومەنی پیران (سیناتو)، لە کۆتاییدا ئەفسەرێکی ژیر بەنێوی (ماریوس) سالی 111 پ.ز وپاشان یەکێ دی بەنێوی (سولا)، کە هەردوکیان دوژمنایەتیەکی گەورەیان لەبەیندا هەبوو، توانیان رۆما لەم هەرایە رزگار بکەن و [23] بایەخەکی زۆر بدەنە رێك خستنی لەشکری رومانی، پاشان دەستیان کرد بە رێکخستنی باری ئابوری، ئەمجا پەلاماری ئەو هێزانەی دەرەوەیان دا کە دژ بەرۆما شۆرشیان هەلگیرساندبوو لە ئاسیاو ئەفریقیادا.

ئەوەندەی بە باسەکەمان پێوەست بێ دەلێین، پاش ئەوەی کە میثراداتی شەشەم پادشای بونتوس لە ئاسیای بچوکدا دەستی درێژ کردبوە سەر زۆر ناوچە، داوا لە سولا کرا، کەوا (ئاریو بارزانیس) بگەرێنێتەوە سەر تەختی شاهانەی کەپادۆکیا لەبەرێ رۆژهەلاتی ئاسیای بچوکدا، کە میثراداتیس دەری کردبوو. سولا ئەم رووداوە گرنگەی بە سەرکەوتویی بەجێ هێناو پێشوازی سەفارەیەکی کرد، کە لە پارثیاوە هاتبوون بۆ ئەوەی پەیمانی ئاشتی لەگەل کۆماری دا مۆربکەن.

لە سالی (91)دا گەرایەوە رۆما، لەبەر توانایی و پایەی لەشکری حیزبی ئوروستوکراتی وەکو سەرکردەیەك چاوی تێ بریبوو.

ئەم مەترسییە لە لایەن ولاتی (پۆنتوس)ەوە، کە کەوتبۆ لێواری خوارووی رۆژهەلاتی زەریای رەشەوە سەری هەلدا. لەو کاتەدا میثراداتی شەشەم، کە نازنێوی یوپاتور (120 - 63) بوو پاشایەتی دەکرد. ئەم پاشایە پیاوێکی بەرێزو وپایەدار بوو، باوەکو توانای لەشکری ورامیاری زۆر بەهێز نەبوو، بەلام هەولیدا دەسەلات دارێتی خۆی بخاتە سەر ئاسیای بچووك، بەتایبەتی ئەو ناوچەیەی بە نێوی کەپادۆکیای مەزن نێوبراوە ئەمە بۆ هۆی بەرەنگاری بوونی بەرامبەر بەر رۆما، کە ئارەزووی نەدەکرد هیچ جۆرە فەرمان رەواییەکی بەهێز لەم ناوچەیەدا دابمەزرێندرێت، بەتایبەتی ویلایەتی ئاسیا (برجامون)، کە لەسالی 129 دامەزێندرا وهەروا (کیلیکیا)ش لە سالی 123دا کرا بە ویلایەت.

لە سالی (90)دا میثراداتیس ولاتی (بیثینیا)، کە کەوتبۆ نێوان ولاتەکەی خۆی و ویلایەتی ئاسیای رۆمانی داگیرکرد. بەلام لە سالی (89)دا کشایەوە، ئەمەش لە ئەنجامی هەرەشەو گورەشەی رۆمانان دا بوو، کە خەریك بوون (نیکومیدیسی دووەمی) پاشای بیثینیای لێ هەل بگەرێننەوەو هانی بدەن بۆ داگیرکردنی (پۆنتوس)، ئەوسا میثراداتیس هیچی بۆ نەمایەوە تەنیا بەرەنگاری کردنی رۆمان نەبێت، لەو کاتەدا کە رۆمان لە جەنگ دا بوون

لەگەڵ ئیتاڵیکان دا، میژاداتیس دیسانەوە (کەپادۆکیای) داگیرکردەوەو نیکۆمیدیسی دووەم)ی بەزاندو بەسەر ئەو هێزانەدا زاڵ بوو، کە بۆ دژایەتی ئەو ئامادەکرابوون و سەرلەشکری هێزەکانی بەدیل گرت وکوشتی، جا ویلایەی ئاسیای بچووکی خستە ژێر رکێفی خۆی‌و کەشتیوانەکانی زەریای ئیجەیان بڕیوە، تەنیا (رودس) بەرهەڵستی کردن، زۆر لە شارانی گریکی لە ئاسیای بچووك دا ە ژێر ئاڵای ئەودا کۆبوونەوەو بە رزگارکەریان دادەنا لە جەوری باج کۆکەرەوەکانی رۆمانی‌دا.

هەر ئەوەندەی میثراداتیس بانگەوازی سەر هەڵگیرساندنی‌دا، لایەنگارانی فەرمانەکانیان بەجێ‌هێناو لە ویلایەتی ئاسیادا هێرشیان بردە سەر رۆمان و ئیتاڵیکان و وا دەگێرنەوە لە یەك رۆژدا (80,000) هەشتا هەزار کەسیان لە نێوبرد، کە دەڵێن زۆربەیان باج کۆکەرەوەو بازرگان و کاربەدەست بوون، هەروا لەم رووداوەدا منداڵ و ئافرەستێکی زۆریش لە نێوچوون.

لە هەمان کات دا (ساڵی 88) وا رووی‌دا حیزبی دیمەرکراتی لە ئەثینادا دژی فەرمان رەوایی ئولیگارکی (کەم)، کە بە پشتگیری رۆمان دامەزرابوو، شورشی بەرپاکردو دەستی بەسەر فەرمان رەوایەتی داگرت وخۆی خستە ئامێزی میثراداتیس بۆ ئەوەی مزیای بکەوێت. پاشای ئاسیاوی سەرلەشکری خۆی، کە نێوی (ئەرخیلاوس) بوو بە سەرۆکایەتی هێزێکی گەورەوە بەرەو ئەثینا نار، لە رێگەدا بەسەر ئەو ناوچەیەی دادا کە لە ژێر دەسەڵات دارێتی ئیتالیان دا بوو لە دوورگەی (دیلوس)، کە ناوچەرگەی جم وجۆڵی بازرگانی رۆژهەڵات بوو. ئەرخیی‌لاوس لە وڵاتی گریك دابەزی‌و زۆربەی هەرێمەکانی باشوور لایەنگرییان لێ‌کردو پشتیگربوون و لە هەمان کات دا سەرۆکەکەی لەشکرێکی زۆر گەورەی لە باکوورەوە بە رێگەی تەراکیاو مەکدونیادا نارده وڵاتی گریك.

لە ساڵی (85) لە زەریای (ئیجە)دا کۆمەڵێك کەشتی بە دەرکەوتن بە سەرکردەی (لوکوللوس)،[24] کە لەو شارە رۆژهەڵاتیانەدا کۆکرابوونەوە، کە سەر بە رۆمان بوون. لوکولوس کەشتیوانەکانی میثراداتیسی بەزاند، بەم جۆرە رێگە بۆ (سولا) خۆش کرا بۆ ئەوەی زەریا بەرەو ئاسیا بپەڕیتەوە.

لەو کاتەدا (فلاکوس)ی کونسول بسفۆر پەڕیبۆوەو بەرەو وڵاتی بثینیا رۆیشتبوو، بۆیە هێزداری میثراداتیس کەم بۆوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی زۆر لە شارانی گریکی وازیان لێ‌هێناو بێزاری خۆیان پێشان دەدا سەبارەت بەو یارمەتی‌دانەی پێشکێشی میثراداتیشیان دەکرد. فلاکوس بە دەستی سەربازانی یاخی‌بووی خۆی کوژراو فیمبریا بوو بە سەرکردەو توانانی دژمن ببەزێنێت و پرگامون داگیربکات، کە پاشای ئاسیاوی کردبوویە پێتەختی خۆی. میثراداتیس رای‌کردو ئامادەیی خۆی بۆ ووت وێژکردن لەگەڵ سولا پێشان دا، چونکە سولا لە کەنارەکانی ئاسیای بچووك نێزیك دەبۆوە. جا لەبەر ئەوەی سولا ئارەزووی کۆتایی پێ‌هاتنی ئەو جەنگەی دەکرد بۆ ئەوەی بگەرێتەوە ئیتالیاو بەرامبەر بە دژمنەکانی بوەستێت، بۆیە لە مانگی ئابی ساڵی 85دا لە شاری (داردانوس)، کە کەوتبۆ نێزیك تروادە، (ئاشتی داردانوس) مۆرکراو لەم رێك کەوتنەدا میثراداتیس دەستی لەو هەموو ناوچانە هەڵگرت، کە لەم دواییانەدا لە ئاسیای بچووك دا داگیری کردبوون، هەروا سزای جەنگیش بژمێرێت، کە (2000) دووهەزار (تالنت) بوو، هەروا چەند کەشتییەك بە رۆمانەکان ببەخشێت و سنووری بنتوسیش بگەرێتەوە سەر باری جارانی.

لەبەر ئەوەی ئەو رێك کەوتنەی لە نێوان سولاو میثراداتیس مۆر کرا سنووری بۆ ئەوەی دووەم دانا، بۆیە هەڵگیرسانەوەی جەنگ سەر لە نوێ کارێکی چاوەڕێ‌کراو بوو، میثراداتیس وڵاتەکەی خۆی بەهێزکردو لەشکرەکەی رێك وپیکتر کرد، چونکە چاوەڕێی جەنگی دەکرد لە دژی رۆمانەکان داو دەستی بە جووڵانەوەی جەنگی لە ئاسیای بچووك دا کرد، تا ئەو پلەیەی هێزی رۆما کە پارێزگەری کەلچەری یونانی بوو لەم ناوچەیەدا کزبوو. بەرادەیەك رۆمانەکان توانای گەرانەوەی هێزی جارانیان نەما، زەریا پڕ

ـو لەو کەشتیـوانـانـەی کیلیکیـا، کە هێـرشیان دەبردە سەر کەشتی رۆمـانـەکـان، تەنـانـەت پەلامـاری لێـوارەکـانی ئیتالیشیایان دەداو خەلکیان دەفراند لە بازاری دیل فرۆشاندا ئەیان فرۆشتن ویا داوای داراییکی زۆریان دەکرد بۆ ئەوەی ـیـو دارەکـانیـان بەرەڵا بکـەن، ئەم رووداوانـە وایـان لە ئەنجـومـەنی (سنـاتـو)کـرد بە سەرکـردایـەتی سرڤیلیـوس ەشکرێك بنێریتە ئەو ناوچانەی، کە لە ئاسیای بچووك دا داگیـریـان کردوون وەکـو (لوکیا، بامغولیا، کیلیکیا) تاوەکو پەلاماریان بدەن، ئەم پەلاماردانە سەری نەگرت چونکە بەر ئەوەی کارەکـەیـان دیـمـاهـی پێبێـت، سەرکـردەکـە بانگ کرایـەوە رۆمـا. بێجگـە لە میثراداتیس و لپستیوانانی کەشتیـوانی دژمنێکی دی رۆمـانیـان هەبـوو، کە مەتـرسی ئەمانە کەمتر نەبوو، ئەویش (تیگرانیسی یەکەم).

(دیکـرانی یەکـەم) ـ پاشـای ئەرمـەنستـان بوو و زاوای میثـراداتـیس بووە کە ئەویش پانـتـی خاکی خۆی فراوان دەکـردو بەرەو کەپـادۆکیـا خزاو بەری باکـووری وولاتی میسوپوتامیای لە دەست پورثیان وەرگرت و هەروا لە ساڵی (83)دا هەموو سورپای خستە ژێر دەستی خۆی. هەروا میثـراداتـیس هەوڵـی‌دا بثـینـیـا نەکـەوێتـە ناوچـەی دەسـەڵات دارێتی رۆمـانـەکـان، چونکـە بە هۆیـەوە دەیان توانی بەری زەریای رەش بگرن بەدەستەوەو رێگەی دەردەنیـل و پسفـۆری لێ‌دابخـەن. بۆ بەدی هێـنـانی ئەم مەبـەستـەی پستگیـری کوری پاشـای پثینا کرد، کە داوای پاشایەتی باوکی کۆچ کردووی خۆی دەکرد. کە سینا تۆی رۆمـا بەم هەڵـوێستـەی میثـراداتیس ئاگـادار بووو مەتـرسی جەنـگ رووی تێکـردن بۆیـە پەلامـاردانـی خاکـی میثراداتیشیان بە لوکولۆس سپارد، بەڵام هێرشەکەی سەری نەگرت.

لە سەرەتای ساڵی (74)دا میثراداتس ویلایەی بثونیای داگـیـرکـردو هەروا ویـلایـەی ئاسـیـای خستـە ژێـر دەسـەڵات دارێتی خۆیو گەمـارۆی شاری کوزیکوسی‌دا، کە کەوتـبـۆ سەر لێـواری زەریـای مەرمـەرە، بەڵام ئەم گەمـارۆدانـە زۆری نەخـایـانـد، چونکـە لوکولۆس رێگەی هات وچۆکردنی لێ بریو میثراداتیسی ناچارکرد بگەرێتەوە بثینیاو دووچاری زەرەرو زیانێکی زۆری کرد، و هەر دوای میـژاداتیس دا بوو تا پەنـای بردە ئەرمـەنستـان و لوکـوڵـوس داوای لە پاشای ئەرمەنستان کرد بۆ ئەوەی میثراداتیس بدا بە دەستـەوە، بەڵام پاشـای ئەرمـەنی خواستـەکـەی بەجێ نەهێنـاو لە ئەنجـام دا لوکـوڵـوس بەبێ رەزامـەنـدی سیناتۆ رووی لە ئەرمـەنستـان کردو پایتـەختـە تازەکـەی، کە نێوی (تیگرانەکرتنا) بوو داگیرکرد لە ساڵی (69).

هەروەکـو پلوتـارخ دەڵیت (کـە تیگـرانی ئەرمەنی توانی (زاربیـونـوس) پادشـای گۆردوێنی (دیـاربـەکـری ئەمـرۆ) بچەوسێنێت کاتێك، کە لوکولوس لە شاری تیگرانوکرتا بوو هێزەکانی ئەدیابێنی (هەولێر) وئاشورو گوردوینی (کوردەکان ج.ز) و کەپـەدوکیـا بێنـە ئەوێ دپـاڵی پێ بدەن) هەروەهـا پالوتارخ دەڵیت «میدیەکان وگۆردوێنی وئەدیابێنیو عەرەبی خوار وولاتی بابـل و ئەلبـانـەکـان (داغستان)، وئیبیریەکان (جیـورجیـا)و دانشتـوانی سەر روبـاری ئاراکس لە ژێـر سەرکـردەی پادشـاکـانیـان لای لوکـولـوس ئامـادە بوون..

وهەروەکو دوترا کە زاربیونوس پادشای گۆردوێنی بێزار بوو لە ژێـر دەستی تیگـرانی ئەرمـەنی بە دزی پەیـوەنـدی بە (ئاپیوس) کرد کە پەیمانێك لەگەڵ رۆمانەکاندا ببەستێت، کە لەژێر سەرکردەی (لوکولوس)ن.

بەڵام ئەمـە کە ئاشکـرا بوو، زاربیـونـوس کوژرا لەگەڵ مال و منـدالیـا پێش ئەوەی رۆمـانـەکـان بگـەنـە وولاتی گۆردوێنی. لەبـەر ئەمـە لوکـولـوس ئەم کارەسـاتـەی لەبیـر نەچـوو، هەر وەکـو گەیشتـە ئەو وولاتە ئاهەنگیکی رەسمی پاشایانەی بۆ شەرەفی زاربیونوس پێك هێنا وتەرمەکەی بەو زێـرو زیـور سامـانـەی، کە لە تیگـران و هێـزەکـانی دەست کەوتبـوو، رازێنـرا ولوکولوس بەدەستی خۆی ئاگری مەشخـەلی داگیـرسـانـدو بۆنی دابەش کردە سەر کوساکارو وهاورێبانی زاربیونوس، هەروەها فەرمانی‌دا پەیکەریکی بۆ دروست بکرێت» [25].

لە دوای ساڵیـك لوکـولـوس هێـرشی خۆی بردە سەر ئەرمەنستان بۆ ئەوەی بە یەکجاری هەمووی داگیر بکات،

بەڵام سەربازانی لێ یاخی بورن وئارەزووی لوکولوسیان بەجێ نەهێنا، بۆیە ناچار بەرەو مێسوپۆرتامیا جێگری لەشکری لوکولوس دا لە جەنگ دا بوو، ئەو سەرکردایەتیەی بە لوکولوس بەخشرابوو، هیندێکیان لێ دەرگیرابوونەوەو ئەو یارمەتییەی رۆماوە داوای کردبوو، بە دەستی نەگەیشتبوون، میثراداتیس پونتوسی بۆ خۆی گەراندبۆوە هەروا تیگرانیس ئەرمەنستانی وەرگرتبۆوە، ئەمانە هەموو رووبەرووی لوکولوس بوون، بۆ ئەوەی نەتوانێت بە یەکجاری میثراداتیس و تیگران لەنێو بەرێت و لە برێتی ئەویش کاروباری سەربازی بە پومپی (25) بسپێردرێت.

لەو کاتەی، کە پۆمپی بە سەرۆکی لەشکری رۆمانی ناوچەی ئاسیای بچووك دا دامەزرا، خۆی لە خوارووی ئاسیای بچووك دا بوو، یەکسەر سەرکردایەتی خۆی بەرەو باکووری رووباری هاکیس گواستەوەو لەوێ‌دا چاوی بە لوکولوس کەوت بۆ بەدەستەوەدانی سەرکردایەتی، کە لە کۆبوونەوەیەك دا بوو هەمووی نەسرەوتی و هەرەشەو جنێودان باڵی بەسەردا کێشابوون، چونکە لوکولوس لەو باوەردا بوو، پۆمپی هەموو پایەبەرزێکی لێ زەوت دەکات و هەموو یاسایەکی پێ‌شێل دەکات و بەروبوومی سەرکەوتنیشی دەنۆشێت.

بەر لوەی پومپی هێرش بباتە سەر پونتوس، پەیمانێکی لەگەڵ فەرهاد (فراتیس)ی پاشای پورث بەست، کە نێوانی لەگەڵ پاشای ئەرمەنستان دا تێك چوو بوو، هانی‌دا، تا هێرشی بردە سەر تیگران، مەبەستی پومپی لەوەدا بۆ ئەوە بوو، تیگران خەریکی جەنگ بێت لەگەڵ پورثەکان داو نەتوانێت یارمەتی میثراداتیس بدات، لەو کاتەی خۆی پەلاماری پونتوس دەدات لە ئەنجام دا، میثراداتیس نەیتوانی بەرامبەر لەشکری پۆمپی بوەستێت، کە نێزیکەی (20,000) بیست هەزار کەس بوون و رای‌کردو داوای یارمەتی لە تیگرانی زاوای کرد، تیگران لەبەر ئەوەی دژی پورثەکان وەستابووو گەمارۆی پێتەختە کۆنەکەیان دابوو، زۆر بە ساردی پێشوازی لە میثراداتیس کردو لە دوایی‌دا بەدیل گرتی، بەڵام میثراداتیس خۆی لە دیلی رزگار کرد.



مارکوس ئەنتۆنیوس
٨٢٠-٦٠٠ پ.ز
«مارك انطونی»



ئۆکتاڤیانوس
«٦٢ پ.ز - ١٤ ز
گایوس یولیوس کەیسەر
ئۆکتاڤیانوس

لەو کاتەدا کوری پاشای ئەرمەنستان لەگەڵ پورثەکان دا رێك کەوتبوو وبانگێستنی پۆمپێی کردو پۆمپێ رووباری فورات پەڕیوەو بەرەو پێتەختی ئەرمەنستان بەرێکەوت، تیگران ئەم هەڵوێستەی زۆر پێ ناخۆش بوو وچاکی خۆی دامالی و خۆیدا بەدەستەوە لە بەهاری سالی (65)دا دیسانەوە پۆمپێ هێرش بردەوە سەر میثراداتیس و لە رێگەدا هەر ناوچەیەکی پێیدا دەرۆیشت دەیخستە ژێر دەستی خۆی، مەبەستیشی لەم داگیرکردنانە دۆزینەوەی سنوورێکی زەریایی بوو بۆ دەسەلات دارێتی خۆی.

لە دوای خۆ بە دەستەوەدانی تیگران، گۆرنیێکی کت وپڕ بە سەر پێوەندی نێوان پۆمپی و پورشەکان رووی‌دا، فراتیس هەولی‌دا ناوچەی (گوردوێنێ) لە تیگران زەوت بکات، پۆمپی نەی‌هێشت هەولدانەکەی سەربگرێت، بەڵکو خۆی ناوچەی (گوردوێنێ)ی داگیرکرد، لەو کاتەدا فراتیسی پاشای پورث لەشکرەکەی خۆی کشاندەوەو داوای پەیمان و رێك کەوتنێکی نوێی لە نێوانیان دا کرد، بەلام پۆمپێ گوێی نەدا داواکارێکەی فراتیس و ناوچەی (گوردوێنێ)ی گەراندەوە ژێر دەسەلات دارێتی تیگران هەروەکو لەمەو بەر روون کرا.

پۆمپێی بە پێی ئەو سەرچاوانەی رۆمانی‌یە (بەتایبەتی کتێبەکەی پلوتارخوس) گەیشتە نزیك دەریای قەزوین و دەستی خستە سەر وولاتی میدیاو ئەتروپاثینا وزوربەی زۆری وولاتی کوردەواری، ولەم شوینلنەدا رێکخستنیکی یاسایی و ئابوری و کومەلایەتی فراوانی بەجێ هێنا.

بێجگە لە زۆر شوینی‌تر، ئەو خاکانەی کە کەوتبوونە سەرووی مێزوپوتامیا نێواند دیجلەو فوراتەوە، کە ناوچەیەك بوو، پاشاکانیان بەدرێژی مێژوویان لەجەنگدا بوون بۆ داگیر کردنی خاکی یەکتر.

پۆمپێی هەموو ئەم ناوچانەی دابەش کردە نێوانیان تەنها وولاتی ئەدیابێنێ (حدیاب) درایە پورثەکان، بەلام هەروەکو ووترا گوردوبێنی (ناوچەی دیاربکر)درا بەتیگران و هتد.

ئەم ناوچانە بەسایەی پومپێی دەستووریان بۆ دانرا بەبایەخ دانی بە بوژاندنەوەی ژیانی هیللینزم، کە ئەم ناوچە هەمەجۆرانەی بەیەك گرتەوە لەژێرسیبەری دەولەتی شاردا (پۆلیس).

لەبەر ئەمەش بوو پۆمپی هانی خەلکی دەدا لەشاردا بژین و خۆی سی‌ونۆ شاری لە ئاسیای بچوك و سوریادا دروست کرد بێجگە لە یانزدە شار کە لە بثینیاو پونتوس دروست کردبوو و لە هەموو شوینێکدا ئۆتۆنۆمی دەبەخشیە وولاتە (دەولەتە) ناوچەییەکان پاشان هانی ئەو کەسانەی دەدا کە سیاسی بوون بۆ بەدەست هینانی مولکایەتی زەوی‌وزارو لە بەرهەمی ئەو زەوی‌یانە یەك بەدە بدرێت بەسەرکردایەتی رۆم. ئەمە بێجگە لەو قانونە کە کۆکردنەوەی (رەسمی ضریبە) مافی درایە دەست دەستەلاتداریتی شارەوانی هەر شارێك کە پاشان لەگەل رۆمانەکاندا بەکۆمەلی کۆدەکرایەوە.

ئەم سیاسەتەی پۆمپێی لە روژهەلاتی ناوەراستدا دوو شتی بوژاندەوە، یەکەم ژیانی هیللینزم، کە بلاوبوونەوەی زمان و نوسین و کەلچەری یونانی ئاوێنەی راستەقینەی بوو. دووهەم باری ئابووری زۆر گەشایەوەو دانشتوانی بەر سنوری ئیمبراتوریەتی رۆما وەصفی ئابوری رۆژانەیان زۆر چاکتر بوو لە شوێنانی‌تر.

ئەم دوو دیاردەیە لە دێکۆمینتهکانی هەوراماندا بەئاشکرا دیارن چونکە لەم کاتەدا تۆمارکراون و ئەو کارەساتانە دوور نەبوون لە هەورامان و دانستوانی کە ئەمانەش هەر بەشێك بوون لەو رووداوە مەزنانە.

لە رۆمادا پاش کوشتنی یولیوس کەیسەر سالی 44 پ.ز هیچ کەسێك لە جێی ئەو دانەنرابوو کە ببێت بەجێگری، لەبەر ئەمە گێچەلێکی گەورە لە رۆمادا پەیدابوو، بەلام حیزبی کەیسەر توانی حوکم لەوێدا بپارێزێت ولەسەر ئەم حیزبە مارکوس ئەنتونیوس[28] (مارك أنطونی)ی کونسول لەگەل چەند کەسێکی‌تر راوێستا بوون. بەبێ چاوەروانی، (ئوکتافیوس)، کە کوری کەیسەری (بەخێو کراو ـ بالتبنی)[29] بوو بەرامبەر بە ئەنتونیوس پەیدا بووو هاتەوە رۆماو داوای میراتی کەیسەری

دەکرد، هەرچەندە ئەنتونیوس زۆر بایەخی بەم دوژمنە لاوازە نەدا، بەڵام لە کۆتاییدا هەر بەدەست ئەمیش لەناوچوو، کە بووبوو بە هێزێکی گەورە.

پاش پەیمانی (تارینتوم)[30] نێوان ئەم دووانەدا ئەنتۆنیوس بەرەو رۆژهەڵات بۆوە ساڵی 36پ.ز بە رێگای ئەرمەنستانەوە خەریك بوو بۆ (میدیا وئەتروپاتینی) بچێت ولەوێوە پەلاماری پورثەکان بدا، بەڵام ئەرمەنەکان یارمەتی پورثەکانیان دا وئەنتۆنیوس لەم ساڵەدا (لە رۆژهەلاتی ناوچەکانی کوردنشین) شکستی هیناو کتوپر گەرایەوە دواوە بۆ ئەوەی لەشکرەکەی بپارێزیت، کە 20,000 سەربازی لەناو چووبوو،[31] وازی لە پەلامارداني پورثەکان هینا وئوکتافیوس کە بەڵێنی دابوویێ بە یارمەتیدانی بەجێی نەهێنا بە بیروباوەری نیلسون دوابواز، ئەنتۆنیوس (مارك ئەنتوانی) لەگەڵ میدیەکاندا رێکەوتبوو، کە پێکەوە بچن بە گژ پورثەکاندا، بەڵام ئەمان بە یارمەتی (ئەرتاکسس) شاهزادەی ئەرمەن کە پەنای هێنابۆە لای پورثەکان توانیان سەربکەونە سەر رۆم و میدیەکاندا.[32] پاش ئەم کارەساتە ئەنتۆنیوس لە شاری (ئەنتاکیا)دا ساڵی 37 پ.ز مارەی کیلوپاترای بری، کە بوو بەهۆی فراوان بوونی ئاسووی تێکچوونی لەگەڵ ئوکتافیوسدا، وساڵی 34 پ.ز لە شاری ئیسکەندەرییە لە میسردا ئەنتونیوس کیلیوپاترای ناونا بە (پادشای پادشایان)و حوکمرانی میسر وکوپروس و کریت وفەلەستین، هەروەها ناوی (بەتلیموسی کەیسەر) وکوری نا بە (پادشای پادشایانی) ئەرمەنستان و میدیاو پارثیاو کورەکەی‌تری ناونا بە پادشای سوریاو فینقیاو کیلیکیا. . هتد. ئەم دان پیانانە نیشانەی ئەوە بوو کە هەرچی ئەو ولاتانەی لەشکری رۆمانی داگیری کردبوون بەبێ شەر خرانە ژێر دەستی پادشایەتی میسر.

ئەم کردەوەیە بوو بە هۆی هاتنەوەی ئوکتافیوس بە لەشکریکی گەورە بەگژ ئەمانەدا ولە کۆتایی جەنگێکی فراواندا ئەنتونیوس و کلیوپاترە ومندالەکان خۆیان کوشتەوە هەروەکو لەمەو پێش باس کرا.[33]

پاش ئەوەی ئوکتافیوس لە هاوینی ساڵی 30 پ.ز شاری ئیسکەندەریەی داگیرکرد لە میسردا دەستی کرد بە رێك خستنی ولاتەکانی رۆژهەڵات وپاشان ساڵی 29 پ.ز گەرایەوە شاری رۆما.

لە کاتێکدا ئەم رووداوانە، کە لە ئیمپراتۆریتی رۆمانیدارووی دەدا، هەمان گیروگرفت لە ناو سیاسەتی ناوەندی پورثەکاندا هەبوو. ئەم گیروگرفتانە کە پەیوەندی بە سەردەمی دێکومنیتەکانی هەوراماندا هەیە، هەرچەندە زۆر روون نەبوتەوە لە کاتی دۆزینەوەیاندا، بەڵام پاش تێپەر بوونی پتر لەنیوە سەدەیەك هەندی نێوی ئەو پادشایانە کە نێویان بە شێوەی (ئەرساکیس) لە دێکومینتەکاندا تومار کراوە ئاشکرا بوون کاتی فەرمانرەوایی‌یان زانراوە.

هەر لەو کاتەدا کە ئوکتافیوس سەرکەوتۆتە سەر لەشکری ئەنتونیوس وکلیوپاتراوە دەستی کردوە بە رێك خستنی ولاتەکانی رۆژهەڵات (کە ولاتی کوردوێنی و ئەدیابێن (دیاربکرو هەولێر) بەشێك بوون لەو ولاتانە، تیرداد ناوێك توانیویەتی بە لەشکرێکی تایبەتی فەرهاد لە حوکمی ولاتی پورث دوور بخا، ئەمیش بۆیە پەنای بردۆتە لای خێڵەکانی ساکا (سکیث) لە سەرووی رۆژهەلاتی ولاتەکەیاندا.

ئەم فەرهادە (فراثاتیسی چوارەم کە لەمەو بەر باس کرا - بروانە وێنەکەی لە کۆتایی ئەم باسەدا)ە وتیرداد پاش ئەوەی بەرانبەر ئەنتونیوس شکستی هێنا لە جەنگێکدا، ولەشکرەکەی بێ هێنر بوو، پاشان هەروەکو زانیمان ئوکتافیوس لە میسر گەرایەوە بۆ رێك خستنی ولاتەکانی رۆژهەڵات و لە ئاسیای بچووکدا لە زستانی 30 - 29 پ.ز خەریکی ئەو مەبەستە بوو، فەرهادی چوارەم بە یارمەتی خێڵەکانی سەکەس توانی بە سەر (تیرداد)دا زاڵ بێت وئەمیش پەنای بردە لای ئوکتافیوس، ولە بەهاری (ساڵی 26 پ.ز) تیرداد جارێکی‌تر بە هێزێك لە روباری (فورات) پەرییەوە ولە ناوچەی (بیبلاد زیك کلات بولاق) بەرامبەر یەکتری شەریان کردوە وپاش ئەم جەنگە تیرداد بە ناوی (دوهەم) لە پارەکاندا ناوبانگی دەرکردوەو بۆ ماوەیەکی کەم حوکمرانی کردوەو ئەو پارانە کە بەنێوی ئەمەوە لە سکە

دراوە تەنها دەگەرێنەوە ساڵی 26 پ.ز پاشان پەنای بردۆتە هێزی ئوکتاڤیوس وکورەکەیشی هەر لە لای رۆمانەکاندا ماوەو بەنێوی (گایوس جولیوس تیریداتیس) ناوبانگی دەرکردوە، بەڵام زۆری پێ نەچووە کوژراوە.[34]

وادیارە ئەم تیردادە بە زوویی لە حوکم دەرنەکراوە، چونکە پارەیەکی پورثی بە نێوی ئەووەوە (ساڵی 25 پ.ز) کە لە شاری (سەلوقیە) لە سکە دراوە هەر باو بووە، لەگەڵ ئەمەشدا دوو مانگ پاش چاپ کردنی پارەکە شاری (سەلوقیە) کەوتۆتە دەست فەرهادەوەو ئەمیش بە نێوی خۆی پارەی لە سکە داوە ولەمەو دوا نێوی تیرداد بە هیچ جۆرێك لە مێژوودا نەهاتوە. بێگومان ئەو (رەزە) کە لە دێکومێنتی دوهەمدا فرۆشراوە پەیوەندی بەسەر دەمی ئەم فەرهادەوە هەیە ونێوی هەر چوار ژنەکەی لەم (دێکومێنتەدا تومارکلاراوە کە نێویان ئۆلینێر، وکلیوپاتراو باسیرتا وَبیشیشباناپشە بوون.

## پەیوەندی کارەساتەکانی سەدەی یەکەمی پ.ز بە دێکومێنتەکانی هەورامان

لە ژمارەی رابووردووی ئەم گۆڤارەدا، لە هەمان بابەتدا چەند دیاردەیەکی گرنگمان دی، کە پەیوەندیان بە کوردانی سەدەی یەکەمەوە هەبوو ولێرەدا بەم جۆرەی خوارەوەو، لە ژێر تیشکی ئەو کارەساتانەی کە لەمەوبەر باس کران، روون دەکرێنەوە:

1 - زۆربەی زۆری نێوی کەسی لەم دێکومێنتە مێژوویانەدا سەر بە زمانی رەسمی دەوڵەتی پورثە کە ئەمرۆ لە زمانی کوردیەوە دوور نیە، وهەندێکی لای کوردان باوە.

2 - ئەم نێوانە پەیوەندیان بەو ئاینانەوە هەیە، کە پێش چەند سەدەیەك نێوی خوداکانیان لە ولاتی کوردەواریدا پەیدا بوە، پاشان ئەم دیاردە (روحی)یە لەگەڵ ژیانی (مادی)ی هیللینیدا تێکەڵاو بووەو کاری کردۆتە سەر نێوەکان و کۆتایی هەموو ئەم نێوانە بەشێوەیەکی یونانی تەواو بووە.

3 - ئەمە بێجگە لەوەی کە ئەلف وبێ دوان لە نوسراوەکان ئەلف وبێیکی یونانین لە بنەرەتدا، بەڵام لەبەر پێویستی یەکی زمانی ناوچەیی یەکەو هەروەکو دیاردەیەکی هیللینی، هەندی نیشانەیەك و واژەیەك لەم نوسراوانەدا تومارکراوەو ووشەیەکی باو بوە لەم ولاتانەدا و تا ئیستاش لە هەندێ ووشەی کوردیدا بەجی ماوە وەکو (کەیوانو - کەیبانو).

4 - لە لایەن شێوەی یاسایی یەوە (قانونی)، ئەم بەلگەنامانەوا دیارە پەیوەندیەکیان بە بیوژاندنەوەی قانونەکانی هیللینی، کە لە لایەن پۆمپێی لە رۆژهەلاتدا ژیاندرایەوە هەیە، چونکە ئەم ناوچەیە دوور نیە لەو ولاتی گۆردوێنی و ئەدیابێنی (هەولێر)و کەرخا بێت سەلوخ (کەرکوك) کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری سیاسی و کەلچەری ئەم جیهانە سەرلەنوێ، هەر چەندە لە دێکومێنتی سێهەمدا (11 پ.ز) کە بە ئەلف وبێی ئارامی تومارکراوەو لە پاش ئەوانی تر بە چەند ساڵێك (پاش 77 ساڵ، 20 ساڵ) نوسراوە، ئەم کاریگەریەی هیللینی کز بوە تا وای لێدێت پاش چەند ساڵێك تر (پاش پەیدا بوونی عیسای مەسیح) بە یەکجاری دووربێتەوە لە جیهانی رۆژهەلاتی یەکانەوە بەگشتی و لە ولاتی کوردەواری بە تایبەتی، وکاریگەری هیللینی لە دێکومێتی سیهەمدا تەنها لە مێژویەکەیدا دیارە.

5 - لە دێکومێنتەکاندا دیارە کە ژن و ژن خوازی نێوان برا وخوشك و دایك دیاردەیەکی ئایینی و قانونی بوە چ لە ولاتی پورثداو چ لە ولاتی ئەرمەنیدا، بێگومان هەر واش بوە لە ولاتی کوردەواریدا. ئەم دیاردەیە هەر چەندە لای هەندێ لە سەرکردەکانی رۆم باو نەبوە بەلام بەلگە زۆرە کە لەوێشدا ئەم دیاردە کۆمەلایەتی یە پەیرەوی کراوە.

به وێنه پاش جەنگەکەی ئەنتونیوس زۆر لە رومانەکان بە دیل گیران بە دەست پورثەکانەوە (نزیکەی 20,000 کەس) هەروەکو لەمەوبەر باس کرا، بەڵام ئەم دیلانە بەرەڵا کران وگەرانەوە وولاتەکانیان لەبەر ئەمە ساڵی (20 پ.ز) ئەوگوستوس بە دیاری کچێکی ئیتاڵی بە نێوی موسا (بروانە وێنەی ئەم ئافرەتە لەگەڵ ئەم لێکۆڵینەوەدا)ی نارد بۆ فەرهادی چوارەم ولەم ئافرەتە کورێکی بوو کە هەر بە فەرهاد (فەرهاتیس پێنجەم) ناوبانگی دەرکرد ولە ساڵی (2 پ.ز) موسا وەکو شاژن داوای تاج وتەختی بۆکورەکەی دەکرد، فەرهادی چوارەم بەزەهر خواردن لەناوچوو، وفەرهادی پێنجەم لە جێی دانیشت ودایکی خۆی (موسا) کە رۆمانی بوو شووی پێکرد.[35]

6 ـ ئەو نازنێوە کە بە یونانی بە شێوەی (باسیلیونتوس باسیلیوس ـ پادشای پادشایان) تومار کراوە لە کوردیدا نەماوە، کەچی لە زمانی عەرەبیدا شێوەی (باسل)ی وەرگرتوە وهەروەها ووشەی (البسالة، استبسل... هتد) لێ دەرهاتوە بەڵام بە واتا کۆنەکەی یونانی لە عەرەبیدا بەجێ ماوە.

7 ـ لەگەڵ ئەوەی کە دووان لە دێکومێنتەکان (ساڵانی 88، 22) بە ئەلف وبێی یونانی نوسراون، بەڵام دەقی نوسراوەکان ونێوی پادشایان باری سیاسی ئەو ناوچەیە بەدیاردەخەن، کە لەژێر دەست پورثەکان بووە، وبەهیچ جۆرێك نێویکی رۆمانی وەکو رووبەکی سیاسی لەم نوسراوانەدا تۆمار نەکراون، هەروەها ئەوەی سێهەم نێوی هیچ پادشایەك لەسەر تۆمار نەکراوە واتە ناوچەی هەورامان لەباری سیاسییەوە سەر بە رۆما نەبووە لەم ساڵانەدا.

8 ـ ئەو نازنێوەی پادشایانەی پورث (ئەرشاك) کە لە بنەرەتدا نێوی باپیرەگەورەی ئەم بنەماڵە بووە بە شێوەی یۆنانی (ئەریساکیس) تۆمارکراوە. ئەم نێوە کەسیە بنەماڵەی پورث بۆتە نازنێو بۆ هەموو پادشایانی ئیمبراتورێتی پورث لە دواییدا. بەڵام بەپێی ساڵی تۆمارکردنی ئەم نوسراوانە دەتوانرێت بزانرێت مەبەست بەو (ئەرساکیس)ە کێیە.

9 ـ لە راستیدا چەرخی سەلوقی لە یەکی نیسان ساڵی 311 پ.ز دەست پێدەکات. بەڵام چەرخی ئەرشاکی لە یەکی نیسانی 247 پ.ز دەستی پێکردوە، واتە پاش سەلوقی بە 64 ساڵ، هەرچەندە لە هەندی سەرچاوە گومان هەیە، کەوا ئەم چەرخە سەلوقییە ساڵی 312 پ.ز دەست پێکردبێت،[36] بەڵام لە سەرچاوە مێخیەکانی وولاتی بابل ئەوەی یەکەم (311 پ.ز) دەکرێت بە سەرەتای ئەو چەرخە.

لەبەر ئەو راستیەی سەرەوە، مانگی ئەپیلایوس ساڵی 225ی سەلوقی، کە لە دێکومێنتی یەکەمدا (بەهەردوو دەقەکەیەوە) تۆمارکراوە دەکاتە مانگی تشرینی دووهەمی ساڵی 88ی پێش زایین. ساڵی 291 سلوقی کە لەسەر دیکومینتی دوهەمدا تومار کراوە بەم حیسابە دەکاتە ساڵی 22 /21/پ.ز. ساڵی 300ی سەلوقی لەسەر دێکومێنتی سێهەمدا دەکاتە 12/11 پ.ز.

10 ـ لەم دێکومێنتانە نازنێوێکیتر بە شێوەی (فیلهللینوس ـ بە واتای خۆش ویستی هیللینی) سەبارەت بەنێوی ئەرساکیس (ئەرشاك) بەکار هاتوە. ئەم نازنێوە زۆرجار لەلایەن پاشایانی پورث بەکار هاتوە، بەڵام لەم دوو دێکومێنتەدا بێجگە لەم نازنێوە چەند نازنێویکیتر بەکارهاتوە وەکو (باسیلیوس باسیلیون ئەرساکوی ئیورگیتۆی دیکایۆی ئەپیفانوس فیلهیللینوس) واتە پادشای پادشایان (ئەرشاك)ی خێردار دادپەروەر پرشنگدار خوش ویستی هیللین، لەپێش هەر نازنێوێکیش ووشەی (کەی) بەکارهاتوە. ئەم نازنێوانە لە راستیدا هێشتا هەر لەسەردەمی میثراداتی یەکەمەوە بەکارهاتوە بەتایبەتی (فیلهیلین) بەڵام تەنها (هیمیروس) یەکەم پادشا بووە، کە

نازنێوی (ئەپیفانوس ـ پرشنگدار)ی بەکارهێناوە. وئەم نازنێوانە هەروەکو گریشمان دەڵێت پێوانێکی سیاسی هەبووە.[37]

11 ـ بەپێی ئەو شیکردنەوە مێژوویی‌یەی رابووردوو وا دیاردەکەوێت کە دێکومێنتی یەکەم لە سەردەمی کۆتایی ژیانی (میشراداتی دووهەمدا 123 ـ 88 یا 77 پ.ز) تۆمارکرابێت و مەبەست بە ئەرساکیس هەر میشراداتە، ئەگەر (گۆتارز) نەبێت کە لەنێوان 91 ـ 81 دەستەلاتداریتی پەیداکروەو لە نوسراوەکانی بەردین و هەروەها لە نوسراوەکانی بابلدا پاش میشرادات نێوی (ئەرساکیس)ی بەخۆیەوە ناوە.[38]

بەڵام لەبەر ئەوەی نێوی (ئاریازاتیس)ی ژنی میشراداتی دووهەمدا کە لە راستیدا بە ئەرمەنی (ئەوتۆمایە کچی (تیگرانس)ە پادشای ئەرمەنستان هەروەها نێوی پادشای ئەرمەنیش بە نازنێوی پادشاهی مەزن (باسیلیوس میگالو) بەکارهاتووە لەگەڵ میشراداتی دووهەمدا پەیوەندی باش بووە، بەتایبەتی پاش ئەوەی لە (رەهینە)یی ئازادکراوەو بۆتە پادشای ئەرمەنستان بەڵام بێ‌گومان هێشتا نازنێوی پادشای‌پادشایانی وەرنەگرتوە، واتە ئەم دێکومینتەی یەکەم پێش پەلاماردانی تیگران بەسەر سوریاو فینیقیاو کەپەدوکیادا نوسراوە، ولە سەردەمی میشراداتی دووهەمدا نوسراوە (بروانە وێنەی ئەم پادشایە) وادیارە ئەوتوما (ئاریازاتیس) دەورێکی گرنگی گێراوە لای مێردی (میشراداتی دووهەم) بۆ رزگارکردنی باوکی (تیگران)ی ئەرمەنی کە تەمەنی گەیشتبووە 45 ساڵ بۆیەو لە ساڵی 94 پ.ز لە جێی (ئەرتوئاسدیس) بوو بە پادشای ئەرمەنستان.

پاش نوسینی دێکومێنتی یەکەم بەدوو ساڵ، واتە ساڵی 86 پ.ز تیگران، کە چەند شوێنێکی داگیرکرد بوو بە (پادشای پادشایان) وناوبانگی جیهانی دەرکرد، وهەر لەم ساڵەدا بوو پاش مردنی میشراداتی دووهەم لەگەڵ کورەکانیدا تێک چوو، ووڵاتی ئەتروپاتیناو میدیای داگیرکرد.

12 ـ هیچ گومان لەوەدا نیە کەوا مەبەست بە (ئەرساکیس) لە دێکومێنتی دووهەمدا فەرهادی چوارەمە (فەرائاتیس)، کە کوری پیروز ق(پاکوروس) بووەو ساڵی 37 پ.ز پاش کوشتنی، باوکی دەستەلاریتی گرتۆتە دەست. ئەم پادشایە بەربەرەکانی لەگەڵ مارکونس ئەنتونی کردووەو بەسەریا زاڵ بووە هەروەکو لەمەوبەر روون بووەوە، پاش ئەوەی دیلە رومانی‌یەکانی بەرداوە کەنیشکێکی ئیتالی بەنێوی (موسا)ی پێشکەش کراوە کە پاشان بۆتە دایکی فەرهادی پێنجەم.

فەرهادی چوارەم کورەکانی (سیراسپادانیس، فەرائاتیس، رۆداسپس، ڤونونیس)ی ناردۆتە ووڵاتی رۆمان و ئیمبراتوری پێ‌سپاردوون. ئەمە نیشانەی ئەو پەیوەندیە پتەوەیە نێوان هەردوو جیهانی هیللینی کە لەم دێکومێنتەدا دیارە.

13 ـ لە دێکومێنتی دووهەم وادیارە، کە فەرهادی چوارەم پێش کەنیشکە ئیتالیەکە (موسا) چوار شاهزادە ژنی بووە کە نێویان بە (ئۆلینییر، کلیوپاترا، باسێرتا، بیسشیبانپس لەم دێکومێنتەدا تۆمار کراوە، وئەمانە هەموویان ساڵانی 21/22 شاهبانو بوون.

لە نێوکانیان دیارە، هیچ نەبێت ئۆلینییرو کلیوپاترا شاهزادەی سەلوقین و ئەوانی‌دی لەوانەیە خەلکی میدیاو ئەتروپاتین بن و لە بنەماڵەی شازادەکانی ئەو ناوچانەبن هەروەکو سترابون دەیگێرێتەوە.[40]

14 ـ دێکومێنتی سیهەم، کە بە ئەلف وبێی ئارامی ساڵی 11/12 پ.ز تۆمارکراوە، هەر دەگەرێتەوە سەردەمی حوکمی فەرهادی چوارەم بە چەند ساڵێک پێش کوشتنی لەلایەن (موسا)ی ژنی و کورەکەی کە فرائاتیس (فەرهادی پێنجەم) باوبانگی دەرکردبوو.

بەگشتی دەتوانریت بوترێت، کەوا ئەو سەردەمەی نێوان ساڵی تۆمارکردنی دێکومێنتی یەکەم و دووهەم،

رۆژهـــەلاتی ناوەراست بە دەوڵـــەتی پورث و میـــدیـاو ئەتـــروپـاتین و ئەرمینیـاو وڵاتی کوردەواریو ئەنـادول و سوریاو کەپەدوکیاو کیلیکیا (ئاسیای بچوك) بەگشتی لە گیروگرفتێکی سیاسیو عەسکەری ئالۆزدابوون.

بەڵام سەردەمی نێـوان دێکـومینتی دووهەم و سێهەم باری سیاسیو عەسکەری لە هێمنیو ئاسایشدا بووە. لەگـەڵ ئەمـانـەشدا هێشتا بیری هیللینی هەر زاڵ بووە بەسەر شێوەو جۆری ژیانی ئادەمزادا لەم هەریمەدا.

**سەرچاوەکان**

---

1 ـ بروانە باسەکەی پرۆفیسور ئیلیس مینس لاپەرە 33.
Minns E., Parchments of the Parthiad from Avroman in Kurdistan, Jour. Hell. Stud. 35 (1915), P. 33.

2 ـ لە کۆتـایی سەدەی دووی پیش زایین، ئەو ناوچـانـەی کە ئەمـرۆ کەوتـوونەتە نیوانڤی وڵاتی گورجستان (جیورجیای شوڤـیێتی)و تورکیـا لە خوارووی دەریـای رەش، یەکی گرتبۆوە لە ژێر ئالای پادشای بەناوبانگی ئەو ناوچەیە بە نێوی میثرادات و وڵاتەکەش بە نێوی پونتوس ناوبانگی دەرکردبوو چونکە ئەو دەریایە کە ئەمرو بەرەش ناوبانگی دەرکردوە لە بنەرەتدا دەریای پونتوسە. میثرادات نازناوی (یـوپـاتـور) بەخـۆیـە نابـوو چونکە خێزانەکەیان بێگومان کەوتبۆوە ژێر کاریگەری ژیانیو کەلچەری هیللینزم. میثرادات پیاوێکی بەتواناو تەماحکار بوە وزۆر هەوڵی داوە هەمـوو ئاسیـایبچـوك درۆژهـەلاتی ناوەراست بخاتە ژێر دەستـەی خۆی بەڵام رۆمـا بەرەنگـاری کرد لە نێـوانـد سالەکانی (120 ـ 63 پ.ز)دا.

3 ـ بروانـە: د. عبـداللطیف أحمـد علی، التأریـخ الیونانی/ الـعـصـر الـهـلالی/ بیـروت 1976. ل8 هەروەهـا ئینسوکلوپیدیای بەریتانی ووشە «گریك».

4 ـ بروانە هەمان سەرچاوەکان.

5 ـ هەمان سەرچاوەکانی سەرەوە.

6 ـ هەمان سەرچاوەکانی سەرەوە.

7 ـ بروانە ئینسوکلوپیدیای بەریتانی، ووشەی کریت و کنوسوس.

8 ـ بۆ ئەم ناوچانە بروانە سەرچاوەی رابوردوو، ووشەی گریگ، هەروەها بروانە کتیبی:
آ. بتری، مدخل الی تأریخ الاغریق وأدبهم وآثارهم، ترجمة یوئیل یوسف عزیز. بغداد 1977، ل 8، 10

9 ـ بروانە:
لطفی عبـدالـوهـاب یحیی، الیونان ـ مقدمة في التأریخ الحضاري. بیروت 1979 ص 96.

10 ـ سەیری ئەو هەوال و پشکنینانەی کسینوفون بکە لە کتیبی (ئەناباسیس)دا بە هەر وەرگیرانێك بێت.

11 ـ لطفی عبدالوهاب یحیی، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل 184.

12 ـ بۆ ئەم دەورەو سنوری دەستەلات داریەتی ئەو دەولەتانە بروانە:
Colin Mc Evedy., The Penguin Atlas of Ancient History 1967 PCO.

13 ـ پەرتاڤا پاشان کەبوە بە پارثیا شێوەیەکی کۆنی ئەم ناوەیە، کە لە نوسـراوەکـانی دارادا لە شاخی بیستـونـدا بەرچـاو دەکەوێت و یەکێك بوو لە ساترابەکانیان. لە کاتی حکـ- سەلوقس (312 ـ 281 پ.ز) وئەنتیوخوسی یەکەم، کە بە سوتێر بەنـاوبـانگـە (281 ـ 261) عەشـایـری پارنی (ئەپارنی) سەکەسی بە کۆمەلێکی زۆر بوون بە دانشتوانی وڵاتی پارثیـا. وبـە پێی رای ئینسـوکلوپیدیای بەریتانی یەکەم پایتەختی پارثەکان لەم وڵاتەدا شاری (دارا) بوە کەئیستـا بە (أبی‌ورد) بەنـاوبانـە پاشـان بۆتـە شاری (هێکـاتـومپیلوس) وئـەم پورثانە توانیان لە شەری کارهای (نزیك حران) سەرکەوتنیکی گەورە بە سەر رۆمانەکان بە چنگ بهینن. بۆ ئەم مەبەستـانـە بروانە ئینسوکلوپیدیای بەریتانی، ووشەی پارثیا.

14 ـ بروانە ئینسوکلوپیدیای مێژوویی سوڤیتی، ووشەی پارفیا. بەزمانی روسی.

15 ـ بروانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

16 ـ میثراداتی یەکەم (جاربەجار بە میثریدات)یش دەخوینرێت وبە (ئەرساکیسی شەشەمیش) بەناوبانگە، پاشای پورث بوو لە نێواندی سالەکانی 171 ـ 138 پ.ز حوکمرانی کردبوو پاش ئەوەی فراهاتی برای کۆچی دوایی کردبوو. پێش سالی 160 پ.ز وولاتی میدیای لە ژێر چنگ سەرداری سەلوقی تیمارخۆس دەرهێنا ودەستیشی بە سەر وولاتی تەپوریا (طبلاستان) وتراکسیانا درێژکردو لە چنگ ئیوکراتیدیس پادشای باختریا دەرکردو ناوچەی ئیلامایس (عیلام)ی داگیرکرد و(بابلی)شی هینایە ژیر حوکمی خوی (142 ـ 141 پ.ز) بەڵام دیمتریوسی دوهەم نیکاتور هەولی‌دا کە بابل بگەرێنێتەوە.

میثراداتی دوهەم نێوی بە پانهیلین دەرکردبوو کە واتای (خۆش ویستی شارستانیەتی یونانی)یە. سەیرێکی ئینسوکلوپیدیای بەریتانی بکە، ووشە میثرادات.

17 ـ لە راستیدا بە هێزی تایفەکانی ساکا (سکس) پورثەکان سالی 130 پ.ز توانییان لەشکری خۆیان بەهێز بکەن ولە وولاتی کوردەواری بچن بە گژ رۆمەکاندا کە لەم کاتەدا لەژێر سەرکردەی ئەنتیوخوسی هەفتەم بوون و بەسیداتیس ناوبانگ بوو (138 ـ 129 پ.ز).

سوپای ئەنتیوخوس، کە فەوجێکی خەڵکی ئیسرائیل بووە بەسەروکایەتی یوحەنا هیرکانوس، لەگەڵ هێزی پورثەکاندا لەسەر روباری (زێ کەورە) لە کوردستاندا کەوتوونەتە جەنگ ولەشکری پورث لیرەدا، کە بە سەروکایەتی ئیداتیس ناوێك بوە شکاوە وکشاوەتەوە دواوە. بۆ مەبەستە بروانە:

نیلسون دوبواز، تأریخ سیاسی پارث آشکانیان تهران، ترجمة علی اصفر حکمت. ل 22.

18 ـ میثراداتی دوهەم کە لە نێواندا (123 ـ 988 پ.ز) حوکمرانی کردوە کوری ئەردەوانی دوهەم (ئەرتەبانوس)بوە. توانی لە سەرەتای حوکمیا ناوچەکانی رۆژهەلاتی دەولەت کە لە لایەن سەکەسەکان (ساکا) داگیر کرابوو رزگار بکات. ولە رۆژ ئاوادا دەستی بە سەر وولاتی میزوپوتامیا هێنا، پاشان سەرکەوتە سەر پادشای ئەرمەن (ئەرتاڤاسدیس) وکورەکەی تیگران (لەواییدا تیگرانیسی یەکەم) بوو بە بارمتە (رهینە) لە لایان. وبە پێی هەندی سەرچاوە، بەرانبەر بە (دولەکانی هەفتا) تیگران ئازاد کراو گەرایەوە ئەرمەنستان. بۆ ئەم بابەتە سەیریکی ئینسوکلوپیدیای بەریتانی بکە ووشە میثرادات.

19 ـ بروانە ئەنسوکلوپیدیای مێژوویی سوڤیتی. ووشەی پارفیا.

20 ـ بۆ پتر کردنی زانیاری سەیریکی کتێبی.

Neilson C. Debevoise., A Political History of Parthia. Chicago - Tllinois 1938

وەرگیرانی ئەم کتێبە بەفارسی بروانە

نیلسون دوبواز، تأریخ سیاسی پارث اتشکانیان. تهران ترجمة علی اصفر حکمت. ل. 244 ـ 250.

هەروەها بروانە: ئینسوکلوپیدیای بەریتانی. ووشەی تیگران.

21 ـ بروانە هەمان سەرچاوەی پێشوو. ووشەی کلیوپاترا.

22 ـ میثراداتی شەشەم پادشای پونتوس بە (ئیوپاتور) ناوبانگی دەرکردبوو. سالی (63 پ.ز) لە شاری پانتیکاپالیوم (کسیرچی ئەمرۆ لە ئۆکرانیای سوڤیتی‌دا) داوای کوشتنی خۆی کرد. لە نێوان سالانی 120 ـ 63 پ.ز حوکمرانی خاکی پونتوس لە سەرووی ئەنادۆل کردوە، رێگای بە رۆمان گرت کە بەرەو رۆژهەلات بێن و دەستەڵاداریتی پەیدا بکەن.

میثرادات لە سەرەتای ژیانی سیاسیدا دایکی خۆی لابرد، کە پاش باوکی حوکمی وولاتەکەی دەکرد تا سالی 115 پ.ز وپاشان دەستی درێژ کردە سەر ناوچەکانی قەراخ دەریای رەش وئەمجا دوو جەنگی گەورەی لەگەڵ رۆمادا بەرپا وتێدایانە سەرنەکەوت، هەروەها جەنگێکی‌دی بەرامبەر بە پادشای بیثینیا (نیکۆمیدیسی سیهەم) کردبوو، لەبەر ئەم ئەنجامانەو لەسەر داوای خۆی لە لایەن سەربازەکانی کوژرا. بروانە ئەنسوکلوپیدیای بەریتانی ووشە (میثراداتی شەشەم).

23 ـ ماریوس وسولا بە هەردووکیان خدمەتێکی باشی کۆمەلایەتی وولاتی خۆیان کردوە بەڵام لەبەر سەرکردایەتی لەشکری رۆمانی کەبەرەو شەری میثراداتیسی پونتوس ئامادە کرابوو تێك چوون. لە

کۆتاییدا سولا بوو بە سەرکردە وماریوس لەگەڵ کەسانی تر پەیمانی بەست کە ئەم جەنگە کە بسورێنێتەوەو میللەتیش بەسەر 35 عەشیرەتا دابەش بکرێت. لەبەر ئەوەی ئەم کردەوانەی ماریوس بە زۆری کرا سولا لەشکرەکەی بەرەو رۆما هێناو ماریوس و هاورێکانی رایان کرد بەڵام سولا نوێنەریکی حیزبی پیران ونوێنەریکی حیزبی گشتی کرد بە دوو کونسول و دانیان لە رۆما. بۆ ئەم مەبەستانە بروانە:

Plutarch., The Lives of The Noble Grecians and Romans - Encyclopaedia Britannica, NC. 1952.

هەروەها بروانە: د. عبداللطیف أحمد علی، التأریخ الرومانی - عصر الثورة: بیروت 1973.

آ. بتری، مدخل الی تأریخ الرومان وأدبهم وأاثارهم. بغداد 1977، ترجمة الدكتور یوئیل یوسف عزیز.

24 - لوكـولـوس (لیكینیـوس) 109 پ.ز- 57 پ.ز یەكێـك بووە لە ئەفسەرەكانی سولا لە جەنگی یەكەمیاندا لەگەڵ میثرادایتیسی شەشەمدا. بوو بە كونسول سالی 74 پ.ز پاشـان سەركـردایـەتی لەشكـری رۆمانی لە ئاسیادا پێ‌ی سوپێـردرا وچـەنـد جەنگێكی گێـراوە لە ئاسیادا وهەندی گیروگرفتی ئابوری‌و یاسایایی لەوێدا ریك خستوە. وساڵی 66 پ.ز ئەم سەركـردایـەتی‌یـە لە لوكـولـوس وەرگیـراوە ودراوە بە پۆمپێی. بۆ ئەم مەبەستانە بروانە كتێبی پلوتارخ بەندی لوكولوس و پۆمپێی.

25 - پاش ئەم كارەسـاتـە، فەرهـادی سیهـەم (فـراثاتیس كە بە ثیوس) ناوبانگی دەركردبوو) لە جێ‌ی باوكی سینەتروكس دانیشت. ئەمـە لە كاتێكـدا، كە دەولـەتی میثـرادات پادشای پونتوس بەرەو كزی دەرویشت. بروانە پلوتارخ. ل 412 لە وەرگیری ئینكلیزی.

دوابەدوای شەری تیگرانوكرتا (سالی 69 پ.ز) وشكستی تیگـرانی ئەرمـەنی ومیثـراداتی پونتـوس، فەرهـاد توانی ناوچەی (هەفتا دۆل) لە چنگە تیگران دەربهێنێ وولاڵاتی ئەدیابێنێ (هەولێر)و سەرووی میزوپوتامیا داگیر بكات. بروانە تأریخ سیاسی پارت ئەشكنیان تهران ل 52 ترجمة علی اصغر حكمت.

26 - پۆمپێی (گنـایـوس پومپیـوس 106 - 48 پ،ز) كوری (پـومپیـوس ئیستـرابون)ی كونسولی (سالی 89 پ.ز)ە. لەگەڵ باوكیا سەركەوتە سەر دوژمنانی سولا ساڵانی 83 - 82 . لەبەر ئەمە ئەنجومەنی پیران (سیناتو) هێزیكیان بۆ رێك خست، كە بچێت بەگژ كۆمەلی (ماریوس)دا. لە ئاسیـا وئـەفـەریقـادا رۆلێكی عەسكـەری گەورەی نواندوە پاشان بووە بە سەركردەی هەموو لەشكری رۆما لە ئاسیادا دژ بە میثراداتی شەشەم. سەبارەت بەم رووداوانە بروانە: كتێبی پلوتارخ، بەندی پۆمپێی.

27 - یولیوس كەیسەر (گایوس) سالی 101 - 100 پ.ز لە عەشیـرەتی یولیـا لە دایـك بووە كە عەشیرەتێكی پایەبەرز بوە. لە بەر ئەوەی ماریـوس پوری ئەمی (یـولیـا) هێنـاوە وخۆیشی كچی كنا (كورنیلیا) هێناوە یەكسەر لە سەرەتای ژیانیا لەگەڵ حیزبی دیموكراتی وەستاوە پاشان سولا بوو بە هۆی دوور خستنـەوەی بۆ ئاسیـاو كیلیكیـاو لەوێـدا (سـالانـی 80 - 78 پ.ز) بە دیـل براوە پاشـان بە پارەیـەكـی زۆر رزگـاری بوە. دوا بەدوای مردنـی سولا گەراوەتەوە شاری رۆما دەستی كردوە بە پاڵ پشت كردنی كۆمەلی سەر بە ماریوس بە ووتە بەرزەكانیەوە پاشان چووە بۆ رۆدوس ولـەئـەسپـانیـادا نێـوان ساڵانی 69 - 68 كاری‌كـردوە كە گەراوە تەوە رومـا لە گەل كراسـوس بەرەیـكـی دورسـت كردوە. دژ بە پۆمپێی كە هێـزی لەم شارەدا بەرەو زۆری دەچوو.

پاش چەنـد پیشـەیـەكی سیاسی هەمەجۆر لەكۆتایی‌دا كەیسـەر سالی 49 بوو بە دیكتـاتـور كە گەورەتـرین پیشە بوە لەو سەردەمەدا. ودووبارە سالی 47 هەمان پیشەی گرتۆتە دەست تا دە ساڵ، ئەمە بێجگە لەوەی لە هەمان كاتدا (كونسول)یش بووە وسەرۆكی پەرستگاهیش بووە. بە گشتی زۆربـەی زۆری سەرۆكـایـەتی ژیـانی دینی‌و سیـاسی‌و تەنـانـەت كۆمـەلایـەتی كەوتۆتە دەست یولیوس كەیسـەر بێجگـە لە سەركـردایـەتی زۆربـەی جەنگەكانی لەشكـری رۆمـانی لە كەرتـەی ئاوروپـاو ئاسیاو ئەفریقیادا

ولـەزۆربـەی ئەم شـوێنـانـە پادشا ناوچەیی‌یەکان سـەر بەم بوون، تاکو وای لێ‌هات کلیوپاترا لە میسردا وولاتەکەی پێشکەش کرد.

لە کوتایی ژیانیدا، لە کاتێکدا کە ئامادە بوو هێزێکی گەورە بەرەو (داکیا) وروژهەلآت دژ بە پورثەکان ببات لە لایـەن چەنـد ئەنـدامێکی ئەنجومەنی (سیناتو) سالی 44 پ.ز کوژرا.

28 ـ مارك ئەنتوانی (82 ـ 30 پ.ز) سەرکردەیەکی رومانی عەسکـەری‌و سیاسی بوە لەگـەڵ یولیـوس کەیسـەردا لە حیزبیکدا رێك بوون. خۆی وچەند کەسێك لەخزمەکانی ئەنـدامی سەرکـردایـەتی سوارانی کەیسەر بوون وهەمیشە لەگەڵ کەیسەر لە گیروگرفتی سیاسیدا وەستاوە بە تایبەت دژ بە پۆمپێی. سـالی 44 بوو بە کونسـول پاش کوشتنی کەیسـەر پاشـان بۆتـە حاکمی وولاتی گال (فـەرەنسـای ئەمرۆ). دوابەدوای ئەمە بۆتە یەکێك لەو سێ کەسەی، حوکمی ئیمبراتورێتی ومانی کردوە.

پاش ئەوەی سەرکردایەتی چەند جەنگێکی لە ئاسیادا کردوە چۆتـە شاری ئیسکـەنـدەریـە (سـاڵانی 41 ـ 40) وخۆشەویستیەك نێوان ئەم وکلیوپاترادا پەیدا بووە.

ساڵـی 40 پ.ز گەڕاوەتـەوە ئیتـالیـا وخـوشکی ئوکتافیوسی مارەکردوە کە هەر بە (ئەکتافیا) بەناوبانگە.

ساڵی 37 دیسـان گەڕاوەتـەوە سوریـا لەگەڵ کلیوپاترا یەکتریان گرتوەو پاشان ئوکتافیای تەلاق داوە پاش ئەوەی کە پیشەی دوور خراوەتەوە. پاش پەلامـاردانی ئوکتافیوس بە هیـزیکـی گەورە وگـەیشتنی ئەم هێـزە بۆ میسـر ئەتنـونیـوس و کلیوپاترا ومنداڵەکانیان خویان کشتوە ساڵی 30 پ.ز.

بۆ ئەم مەبـەستـە بروانـە ئینسـوکلوپیـدیـای بەریتـانی ووشەی ئەنتونیوس. هەروەها بروانە:

د. عبداللطيف احمد علی، التأريخ الرومانی. ل 338 ـ 362.

29 ـ مارکـوس ئۆکتـافیـوس یەکێکـە لە پیـاوە ناودارە سیـاسی عەسکەریەکانی رومانی سەدەی دوهەمی پێش زایین کە دوا بەدوای یولیوسی کەیسـەر حوکمرانی رۆمانی کردوە دژ بە مارکـوس ئەنتـونیـوس، هەروەهـا دژی چاك کردنەوەی مەسـەلـەی زەوی‌وزار وەستـاوە، کە لەلایەن سیمپرونیوس گراکوس (تیبیریوس) پاڵیوراو بوو.

30 ـ ساڵی 29 پ.ز ئەنتـۆنیـوس گەڕایـەوە رۆژهـەلات لە کاتێکـدا کە (ئیللوری)یـەکـان هێـزیکی ترسێنەر بوون لە مەکەدونیاداو پورثەکانیش ئاسیای بچوك و سوریایان داگیر کردبـوو. ئەنتـۆنیـوس زاڵ بووە سەر (ئیللوری)یـەکـان و ئەفـەسـەریکی ئەم سوریـای لە جنگ پورثەکان دەرهێنا.

پاشـان ساڵی 38 پ.ز ئەنتـۆنیـوس گەڕایـەوە ئیتـالیـا بە بانگ کردنی لەلایـەن (ئـوکتـافیـانـوس)ە کەچی ئەمەش نەهـاتـە کۆبـوونـەکـە بەپـێی پەیمـانی نێـوانیـان چونکـە پێی ناخـۆش بوو ئەنتـۆنیوس پیـاوێکی هەلکـەوتـوو بێت. بەڵام لەگـەڵ ئەمـەشـدا کۆبـوونـەوەکـە لە شاری تارینتوم سـاڵی 37 پ.ز بەسترا چونکـە ئوکتـافیـانـوس پێـویستی بە یارمـەتی هەبوو پاش دۆڕانـەوە لە شەڕی سکـستـوس پۆمپێـی، هەروەهـا ئەنتـونیـۆس پیـویـستی بە سەربـازی ئیتـالی بوو بەکاریان بهێنێن لە شەڕی پورثـەکـانـدا بەڵام باوەڕیـان بە یەکتری نەبوو. لە کۆتاییدا پەیمانێك لە نێوانیاندا بەسترا کە دەبوا بەپـێ ئەم پەیـمـانـە ئەنتـونیـوس 120 پاپـۆر بدا بە هاوپەیمانی خۆی بەرامبەر چوار هێزی پیادەی رومانی کە لە ئەفریقیادا بوون. ئەنتۆنیوس ئەم پەیمانەی بەجێ هینا بەلام ئوکتـافیـانـوس بەجێی نەهێنـا، پاش ئەم کارەساتە ئەنتـونیـوس چوو بۆسـوریـا ولەوێوە خەریکی پەلاماردانی وولاتی پارثیـا بوو، وهـەروەکـو ووتـرا کە بەرێگای میدیاو ئەتروپاتینی چووە ناو وولاتی پارثەوە.

31 ـ بۆ زانیاری سەیری: د. عبداللطيف احمد علی، التأريخ الرومانی ل. 355 بکە.

32 ـ بروانە نیلسون دوبواز، تأریخ سیاسی پارث ل. 114.

33 ـ سەبارەت بەم کارەساتانە بروانە:

33 ـ سەبارەت بەم کارەساتانە بروانە:

د. عبـداللطيف احمـد علی، مصـر والامبـراطـوريـة الرومانية في ضوء الأوراق البردية. القاهرة 1965. ل 21 ـ 40.

34 ـ بروانە نیلسون دوبواز، تأریخ سیاسی پارث ل 115.

35 ـ بروانە هەمان سەرچاوە ل 121، 125، 127.

36 ـ بروانە لێکۆلینەوەکەی پروفیسور ئەیس مینس ل 37.

37 ـ بروانە: R. Ghirshman., Iran 1954 P. 266

38 ـ بروانە: نیلسون دوبواز 100 ل 32 ـ 36.

39 ـ ئەوتوما نێویکی ئەرمەنی‌یە بەڵام لەلایەن میثراداتی دووهەم نازنیـوێکی پێ‌بـەخشـراو کە (ئـاریـازاتی)بـوە بەواتـایی (بەگزادە یان گەورەزادە).

40 ـ بروانە: Strab., Geography. XI, XIII. 1 بەئینکلیزی.




جیهانی هیللینی کاتی سەرهەلدانی هێزە پارچەییەکان
( سالی ١٩٤ پ.ز )
(٢)




سنووری
ئیمپراتۆریەتی پورت لە جیهانی هێلینیدا
(١٤٥٠ پ.ز)




جیهانی هێلینی پاش دابەشکردنی ئیمپراتۆریەتی
مەکەدۆنی نێوان سەرکردەکانی لەشکری ئیسکەندەر،
کاساندەر و لیسیماخۆس و ئەنتیگۆنۆس و پتۆلیمی و سیلوکوس
( ساڵی ٣٠١ پ . ز )




جیهانی هێللینی وگەشەکردنی تێژەکانی
ئەرمەن و پونتوس ( سالی ٢٤ پ . ز )

(٥)

# بەشێك لە ژیان و بەرهەمی زانا و شاعیری کورد
# مەلا عومەری رەنجووری شالەبەگی

● عبدالرقيب يوسف ●

دوو ساڵ لەمەوبەر بیستم مامۆستای بەڕێز مەلا عەبدولکەریمی مودەڕریس دیوانی ڕەنجووری بۆچاپ ئامادە دەکا. لەبەرئەوەی کە هێندێك زانیاریی نایاب و دەگمەنم لەبارەی ژیانی ئەم شاعیرەوەو بەدەسخەتی خۆی لە لابوو بەپێویستم زانی بەمەبەستی سوود لێ وەرگرتن بۆ مامۆستای بنێرم و لەسەر چاوەکەیی ئاگادار بکەم. بۆیە نامەیێکم بۆ ناردو، ماوەیێکیش لەوە بەدوا بە ناونیشانی تەکیەی قادرییەوە کە مامۆستا زۆر لەوێ دەبێ نامەیێکی دیکەم لەم ڕووەوە بۆ ڕەوانەکرد.

لەوچەندانەی پێشوودا، کە دیوانەکەی ڕەنجووری کەوتە بازارەوە سەرنج دەدەم نووسەري بەڕێز کاك محەمەد عەلی قەرەداخی ئامادەی کردووە. کاتێك لیێ وردبوومەوە بۆم دەرکەوت نامەکانمی بەرچاو نەکەوتووە تادەستنووسە دەسخەتەکانی ڕەنجووري ببینێ‌و، ژیانەکەیی بۆ ڕوون ببێتەوە. بۆیە لەپێشەکی دیوانەکەدا دەڵێ هیچی وا لە ژیانی شاعیر نازانێ‌و. گلەیی لە ڕوونا کبیرانی ڕابردوومان دەکا کە ژیانی شاعیرانیان نە نووسیوەتەوەو بەسەرهاتی زورکەسی وەهامان بزربوون. ناوبەناو گەلێك کەسی تریش ئەم گلەیی‌یە دەکەن ،گلەیی ون بوونی ناوو بەرهەمی زاناو شاعیرانمان و نەزانینی ژیانیان، وەك ئەو برادەرانە تا ئێستا نەیانزانیبێ سەرچاوەو برینی ئەم دەردو نەخۆشییە چییەو لە چییەوە پەیدا بووە.

نەبوونی مێژوو نووس لە کوردستاندا زۆربەی زۆری کەلەپورو مێژووی گەلەکەمانی لە نێو بردوە چونکە ئەرکی مێژوو نووسانە ژیانی شاعیرو زاناو گەورە پیاوان و باسی ڕوو داوی تاڵ و شیرنی بنوسنەوەو، بیانپارێزن و بۆ نەوەکانی داهاتوویان بەجێ بهێڵن.

مێژوو وەك بەن و دەزووی تەزبێح وەهایە، کە بەن نەبوو یاپچیرا هەرزوو دەنکەکان ون دەبن و دەفەوتێن.

بائەو برادەرانە باش لەم هۆیە حاڵیّ ببن و هانی یەکترو هەموو ڕووناکبیرانی کورد بدەن بۆ ڕووکردنە مێژوو ،بەتایبەت نووسینەوەی مێژووی کورد، تا وەکووچی تر وەك ئەمرۆکە لە دەوری شیعرو چیرۆکی نوێ کۆنەبنەوەو لەو لایشەوە مێژووو ڕووکانی کەلەپووری شارستانەتیمان بێ خاوەن نەمێننەوەو لە نێو نەچن. دەبێ ئەوش بزانین کە ئەوکتێبە دەستنووسانە بەخەتی مەلاو فەقێ کوردەکان نووسراون و زانستی جۆربەجۆری وەك کتێبەکانی نحو صرف ،فقە کلام، بیان، . . . هتد دەگرنەوە .بۆ ڕوون کردنەوەی هێندێك ڕووداوی مێژووی‌و ژیانی چەندین زانای کوردو بابەتی دی کەڵك بەخش و دەست دەدەن. نووسیار (کاتب)ی ئەو دەستنووسانە زۆر زانیارییان لەسەر پشت و پەراوێزو قەراخی لاپەرەکان نووسیوە کە دەبنە سەرچاوەی مێژوویی.

وەك پاشتر دەبینین تا رادەیێکی باش ژیانی رەنجووریمان لە ریێ ئەم کۆمەڵە (مجموعە) نووسینەی خۆیەوە بۆ دەردەکەوێ. هەر بەو پێیە ،ژیانی مەلا سەعیدی هیرانیشمان بەو خاڵە پڕو بڵاوانە خستە روو کە لە کتێبە دەستنووسەکانیدا تۆماری کردوون ئەم دەستنووسانە بەلگە نامە (وثیقة)ن بۆ ژیانی ئەم زانایانەو نووسینی بەسەر هاتی ژیانیان بەم شیوەیەو لەبەرتیشکی ئەو خورە زانیارییانەدا دەبێتە نووسێنیکی بەلگەنامەیی (وثائقی).

ئێستا بیست هەزار دەستنووسی کوردستان کەوتووتە نامەخانەی مۆزەخانەی عێراقەوە لە بەغدا کە پێویستە رووناکبیران هەموویان بپشکنن و، ئەو زانیارییە بڵاوانەی لەسەر لاپەرەکانیان نووسراونەوە ـ وەربگرن و بەم چەشنە دەتوانین کتێبە دەستنووسەکانی کوردستان بەسەر چاوەییکی گرنگ بۆ مێژووی کوردو کوردستان حسێب بکەین.

ئەو زانیارییەی کە دەمانەوێ لێرەدا باسی بکەین لە کۆمەڵە نووسراوێکدا (مجموعە) هاتووەو دوازدە کتێب و بابەتە کتێبە بەدەسخەتی رەنجووری خۆی نووسراونە وە. ئەم نووسینانە وان لە نامەخانەی وەزارەتی ئەوقاف لە بەغداو نمرەکەیان (974)ە[1]. لەم کۆمەڵەیەدا رەنجووری چوار لیستەی مێژوویی سازکردووە، چوار لیستەکە بەم شێوەیەیە:

یەکەمیان لەبارەی سوڵتانە عوسمانییەکانەوەیە دووەمیان لەسەر والییەکانی بەغدایە لەسەر دەمی عوسمانییەکاندا ،سێیەمیان بەم ناونیشانەیە «تاریخ والیهای کردستان و غیر» ـ واتە مێژووی والییەکانی کوردستان و هێندێکی تر، هەرچی لیستەی چوارەمیانە زۆربەی لە بابەت شیخەکانی عەوداڵان و رەنجووریو بنەماڵەکەیەتی. رەنجووری لەپاڵ هەرناوو رووداوێکدا مێژووەکەیی نووسیوەو، بەوجۆری دەردەکەوێ لە نووسینی ئەو بەسەر هات و کارەساتانەدا کە لە زەمانی ئەودا روویان داوە گەلێك ورد بووە یا لە وانەیە هێندێکیانی لە کتێبی دیکەوە وەرنەگرتبێ زۆر جار مێژووی رۆژ و مانگ و کاتی وەك (پێش نیوەرۆ)و (دەمی چێشت خواردنی) نووسیوە. زۆربەی جار نیشانە (رمز)ی مانگەکانی لە باتی ناوی تەواویان تۆمارکردووە، هەروەك لەم گوتارەدا لە لیستەی سێیەم و چوارەمدا دەیبینین. ئەو لیستانە لە نامەخانەی وەزارەتی ئەوقافدان لە ژێر نمرەی (869/5 مجامع)و (974/9 مجامیع)ولە نێوئەو کۆمەڵە دەستنووسەدان. هەروەها سێ لیستەی تریشیان تێدان رەنجووری قەرزو قوڵەیی خۆی لە خەڵك و هی ئەویش لای خەڵك و هێندێك سات وسەوداو شتی دیی تێدا نووسیوە.

مەلا عومەری رەنجووری برێك خاڵێ لە بارەی ژیانی خۆیەوە نووسیوە، وەك مێژووی لە دایك بوونی خۆیو ناوی باوك و عەشیرەت و چەندانێك لە کەس و خێزانی خۆیو ناوی بەشێك لەو جیگایانەی لێیان دانیشتووە یا سەفەری بۆ کردوون.

بگرە ساڵی بالغ بوونی خۆیشی دەست نیشان کردووە کە تا رادەییکی دیار بەسەرهاتی ژیانی پی دەخریتە روو. ئەگەرکتێبی تری دەستنووسی بدۆزینەوە رەنگە زۆر لایەنی دیکەی ژیانیمان ئاشکرا بۆ روون ببێتەوە. ئەمانەی خوارەوە ئەو خاڵانەن کە باسمان کردن:

1 ـ چەند جارێك لەو کۆمەڵە دەستنووسەدا ناوی خۆیو باوکی بەم شێوەیە هێناوە «عمر بن خالد بیك» ناوی «عمر رنجوری بن خالد» لەسەر مۆرەکەی هەڵکەندراوە. چەند جارێکیش لە هەمان دەستنووسدا ناوی خۆی بە «فقی عمر»و «ملا عمر» نووسیوە.

بەرێز کاك محەمەد عەلی قەرەداخیش لە دیوانی رەنجووریدا گوتوویە ناوی باوکی (خالید)ەو باپیرەیشی (عومەر)ی ناو بووەو ئەو زانیارییەی لە دەمی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەرریس وەرگرتووە. دەبێ ئەوەش بلێین کە لە وشەی «بیك»ەوە ئەوە دەردەکەوی وا رنجووری لە خێزانێکی پایە بەرز بووە.

2 ـ رەنجووری وەك لە لیستەی چوارەمدا نووسیویە لە ساڵی (1164)ی کۆچیدا (= 1750 ـ 1751ی زایین) لە

دایك بووه كاك محەمەد عەلی قەرەداخیش هەمان مێژووی لە دایك بوونی لە لێكدانەوەی دێرە شیعرێكی شاعیرەوە بە ئەنجام هێناوە.

3 ـ ڕەنجووری لە خێڵی «شالەبەگی»یە هەروەك لە كۆتاییی «بـاب الفـرائض» لە «تحفـەی ابن حجـر»دا لەم گوزارەیـەی خوارەوە داخستوویەتی‌یە ڕوو.

«تمت من یدالحقیر الفقیر المحتاج الی رحمة ربه الكبیر عمرالرنجوری بن خالد بیك الشالەبكی‌عشیرة والشافعي مذهباً والعلوانی والأبـدالاني طریقة. غفـر الله له ولأبـویـه ولكـافـة المسلمین بجاه محمد صلی الله علیه وسلم في سلخ ب 1205».

واتـە ڕەنجـووری نووسینی كتێبـەكـەی لە كۆتـایي مانگی (رجـب)ی سالـی (1205ی كۆچـی = 1790 ـ 1791ی زاینین)دا تەواو كردووە.

ڕێبـازی (علواني)كـە شاعیـر ئامـاژەی بۆ كردووە لقێكـە لە ڕێبـازی خلوەتی (الطـریقـە الخلوتیـە) شێخ حسێنی قازی لە لاپەڕە (3)ی «سراج السالكینی»دا دەڵێ: عەلوانیی خلوەتی لە زەمـانی شێـخ بابـا ڕەســووڵ (واتـە بابـا ڕەسـوولی گورەی بەرزنجـەیی‌ەو لە سەدەی شازدەهـەم)دا واتـا زەمـانی سەیـد محـەمـەدی نۆدێی (بـاوكی شێـخ حەسـەنی گڵەزەردە) لە نێـو ساداتی بەرزنجـەو هەمـووكـوردستـانـدا بڵاو بووەو شێـخ بابـا ڕەسووڵیش ئەم ڕێبازەی لە شێخ شەمسودین شوشیی بادینانییەوە وەرگرتووە.(2)

4 ـ نووسیــویــە «ســاڵی توبـە 1190». دوور نییـە مەبەستی ڕەنجووری لەوە تۆبە كردنی بوویێ لەسەر دەستی شێخ ئەحمەدی عەود الآن لەو ساڵەدا كە دەكاتە (1776 ـ 1777)ی زایین.

5 ـ ناوی براێكی خۆی بردووە كە «فـەقێ صالـح»ەو نووسیـویـە لە سەرەتـای مانگی موحەڕڕەمی ساڵی 1197 (1782 ـ 1783ی زایین)دا ژنێكی بە ناوی (شەهناز)ەوە هێنـاوەو لە ڕۆژی (12)ی ڕەبیعـولئەووەلی ساڵی (1205) «1790 ـ 1791ی زایـیـن» دا كوڕێـكـی بووەو ناوی «خالید» فەقێ صالح كچێكی هەبووە بەناوی «صراحی» (سوارحێ‌یەوە.

6 ـ ڕەنجوری‌و عەشیرەتەكەی «شالەبەگی» كاك محەمەد عەلی گوتـوویـە ڕەنجـووری لە خێڵی «زەنكەنە» یەو لەسەر بەرگی دەرەوەی دیوانەكەیش وشەی «زەنگەنە»ی خستووەتە پاڵ ناوەكەی. لە لاپەڕە (7)دا دەڵێ: بەپێی شیعرەكانی كە بەزاری «گـۆران»ە بە زەنگـەنـە دادەنـدرێت بەلام كە هیچ بەڵگەیێكی پتەو لە دەستدا نەبوو، نەدەبوو. ئاوها نەترسانە ئەوەی لە سەر بەرگی دیوانەكە بنوسیبایە بەڵكە وا چاكتر بوو ئەم ڕایەی هەر لە پێشەكییەكەدا بهیشتبایەوە.

هەرچی ساخكردنەوەی ناوی خێڵی «شالەبەگی» شە كە بەش بە خۆی بە ناو بانـگ نییـەو لە هیـچ سەرچـاوەیێكـدا نەمدیوە، بۆی كە وتمە سەرو سۆراخكردن و پرسین.

بۆ ئەم مەبەستە دەوری دە نامەم بەمەلاو لادا ناردوو، لە سلێمانی‌و چەمچەماڵ و كەركووك و هەولێر زۆر پرسیارم لەم بارەوە كرد.

بەڕێـز مێـژوو نووسی كۆیـە مامۆسـتـا تاهیـر ئەحـمـەد حەوێـزی لەوە لآمی نامـەكـانمـدا سێ نامەی بۆ نووسیوم، دەڵێت: «بە (دۆڵێ خەلەكان) دەڵێن (دۆڵی شالە بەگیان) كە لە دێ (بستـانـە) دوو ڕیـانی ڕانیـەو كۆیـە ـ وە درێـژ دەبێتەوە تا سەر ڕووباری (زێ) زنجیرە چیای (كۆسرەت) یش پێ دەلینێ (كۆسرەتی شالە بەگیان).

ئەمیش سنووری خۆرئاوای دەشتی بیتوێنە لە لای زێی بچـووكـە لای دوكـان ئەم زنجیـرە چیـایـە لە زنجیرە چیای سورداش جوێ دەكاتەوە حالێ حازر خێڵەكە نەماون. لە زەمـانی هێنـدێـك پیـرەمێردی كۆیەوە ئەوەم دەستگیربووە كە یەكێــك لەم شالــەبــەگیـانــە ناوی (نیهـاد بەگ) بووەو لە شەڕێكدا سەركەوتنێكی باشی بۆ عوسما نییەكان بەدەست هێنــاوە. سوڵـتــانـیش لە پاداشـتی ئەوەدا جوگــەی دێ (كەلكان)ی لە دیوی خۆرهەلاتی (كوسرەت) پێ

بەخشیوە.

پاشتر زانیم کە ئیستە گوندێکی بچووك وا لە ناوچەی سورداش بە ناوی شالەبەگی یەکانەوە بە (کانیی شالەبەگە) ناسراوە بەڵام دانیشتوانەکەی شالەبەگی نین بەڵکوو (جافە رەشکە)ن ئەم دێیە دەکەوێتە نێوان دێی (تەلان)و (کانی هەنجیر)ەوە. زانیارییەکانی مامۆستا تاهیر هومێدی دۆزینەوەی ئەم خێڵە یا هیچ نەبێ پاشماوەی ئەم خێڵەی لە لا پەیدا کردم بەتایبەت لەو ناوچانەدا کە لە زێی بچووکەوە نێزیکن سەر ئەنجام زانیم کە شالەبەگی لە ناوچەی بیتوێنێ هەن لە شێوەی کۆمەڵە خێزانێکی بڵاودا لە ناوچەی (رانیە)دا نیشتەجێن. رۆژی پینجی نیسانی 1984 لە هەولیر (کە چووبووم بۆ دروستکردنەوەی هێندێك کەموکوریی روانگە - مرصد - ی ستێرناسی - فلکی ی کوردیی دێ‌گراوێ) . چووم بۆ (چوارقورنە) لە دەشتی بیتوێن لەوێ چەندماڵێکی شالەبەگیەکان هەن، بە دەنگی چەند کەسێکی ئەم خێڵە برێك زانیاریم لە بارەی خویانەوە تۆمار کرد بە تایبەت بە دەنگی حاجی ئەحمەد رەسوولێ مام ئاغاو کۆیخا فەتحوڵڵای حەمەدی مام ئاغاکە لە بنەماڵەی سەرۆکی شالەبەگیانن..

پوختەی ئەو زانیارییانە ئەمەی خوارەوەیە:

ئیستا بە خێڵی شالەبەگی دەڵین (شالی ئاغایی) ئەمانە لە بنچینەدا لە ناوچەی (لاجان)ی موکریانەوە بۆ بیتوێن یا راستتر بڵێین کوردستانی ئەم دیو هاتوون. بەشی (حاجی هەمزە) کە ئەمرۆکە لە لاجان دەژین لە شالەبەگی یەکانن و لە بەر ئەوەشە کە وشەی (لاجانی)و (شالی) هەر دووك بۆ ناوی کوڕ لە نیویاندا بەکار دەهێندرێن لە دێی (میرزا رۆستەم) کە گوندێکی گەورەی دەشتی بیتوێنەو ماوەیێك مەڵبەندی ناحیەی چنارانی سەر بەقەزای رانیە بووە - نیشتەجێ بوون شالەبەگیان گەرمیان و کوێستا نیشیان کردووە. هاوینان چوون بۆ هەوارگەکانی (قەندیل)و، زستانان هاتوونە ناوچەی (قەڵاسیوکە) بۆ دێی (کلێسە)و (گویتەپە) لە ناحیەی ئاغجەلەر نێزیك دێی (عەودالان) شالەبەگیان بوونە تە موریدی شیخەکانی عەودالان و، ئیستاش دەڵین ئیمە موریدی ئەوانین وەك چۆن رەنجووری موریدیان لەم هاتووچۆیەی گەرمیاندا ،گەورەی شالەبەگیان کە رەسوولێ باوکی مام ئاغا بووە لە سەر (بەردی کونەمێروو 3)ی لای دوکان بە هەڵە کوژراوە.

تیرەی شالی ئاغایی لە دێی میرزا رۆستەم پتر لە هەموو دانیشتوانی تری ئەم دێیە کە دەوری (800) ماڵێك بووە - وەکو تیرەیێکی سەربەخۆ هەر دەم دیار بووە ئەمانە لە میرزا رۆستەم خەریکی کشتوکێل بوون. لەزەمانی سوار محەمەد ئاغای بڵباسدا، لە تەنگانەدا هاوکارییان لەگەڵ بڵباسەکاندا هەبووە بەتایبەت لە سالانی سیدا کە لەسەر زەوی و زار دووبەرەکییان لەگەڵ پشدەرییەکاندا هەبووە. پاشتر کە دێی میرزا رۆستەم ژێر ئاوی زەریاچەی دوکان کەوت، شالەبەگی کانیش وەك خەڵکەکەی بە بیتوێن و سەنگەسەردا بلاو بوونەوە. شالەبەگیان ئیستا بە (150 - 200) ماڵی دێنە ژماردن و دەڵین جاران بەشێکی کەمیان نەبێ هەموو لە دێی (میرزا رۆستەم) دا دەژیان بێ گومان دابرانی ناوی شالەبەگی بەسەر چیای کۆسرەت و دۆڵی خەلەکاندا، واتە (کۆسرەتی شالەبەگیان)و دۆڵی شالە بەگیان)، پیشاندەری ئەوەیە کە دەبێ شالە بەگی لە رابردوودا خێڵێکی گەورەو خاوەن دەستەلات بووبێ بەڵام خۆیان دەڵین نەمان بیستووە کە شالی ئاغایی واتە شالەبەگی رۆژێك لە رۆژان خێڵێکی گەورە یا خاوەنی ئەو جۆرە دەستەلاتە بووبێ دەشڵێن شالە بەگی بە زاری (گۆران) قسەی نەکردووە، بەڵکە هەروەك ئەمرۆ بە سۆرانی ئاخاوتووە. بۆیە دەبێ رەنجووری لە کەرکووك یا لە سەردەمی فەقێیە تیدا فیری زاری (گوران)ی بووبێ‌و سەر ئەنجام بەو زارە شیعرەکانی هۆندبێتەوە.

ئەوەش دەڵین کە نەیان بیستووە مەلا لە نێو شالەبەگیاندا پەیدا بووبێ‌و ناوی رەنجووری‌یان نەبیستووە.

لە بارەی بن و بنەچەی شالەبەگی‌یەوە حاجی ئەحمەدو کۆیخا

فەتحولـڵا دەڵێن: گەرچی ئێمـە تایـەفەیەکی سەربەخۆین بەڵام هەرخۆمان بە بڵباس و مەنگوڕ زانیوەو ،لە گەورەکانمان گوێ لێ بووە کە دەچینـەوە سەر بڵبـاس و مەنگـور. لەگـەڵ ئەوەشـدا هێندێك بڵباس وایان بەگوێمدا داوە کە شالەبەگی بڵباس نین لەگەڵ بڵباسدا ژیاون وبڵباس پاراستوویانن.

دوور نییـە ئەمـانـە بە بنچینـە لە بڵبـاس و مەنگور ـ ەکان بن (بڵبـاسـو مەنگـور لە بنـەڕەتدا یەك خێڵی کوردە). شایانی باسە ڕەنجووری خۆی کە ئەو گوزارەیەی پێشووی نووسیوە یەکەم جار ناوی خێڵەکەیی نە نوسیوەو جێگاکەیی لە نێوان «بن خالد بیك»و وشەی «عشیرة» دابە سپێتی هێشتووەتەوەو دوایی لە سەر هەمان جێ نووسیویە (الشالەبکی) ئەویش هەر بەو قەڵەمەو بەو جۆرە حیبـرە واتـە ماوەییـەکی زۆری پێ نەچـووە، گەرچی لە چەنـد پیتێکدا پتر دەستی داگرتووە وەك پیتی ئەلف و لام بە چەشنێك ئەستوورتر لەوانی پێشوو دەردەکەون. دیارە ئەمە خۆی لە خۆیدا بێ هۆنییە: توبڵێی ڕەنجووری ئەوکاتە لەوە دڵنیانە بوو بێ کە لە خێڵی بڵباسە یازانیویە شالا بەگی لە بڵباسەکانەو دوو دڵ بووە لەوەی بنـوسێ (الشـالـەبکی) یا (البلباسی) یان ووشەیەکی تر.

جێی گوتنە، لە ماڵی کاك حسێنی مام ئاغا شەجەرەیێکم بینی بە ڕێـز فەرهـاد بریندار مام ئاغـا [کـە ڕوویێـو «مساح»ە] بۆ بنـەمـاڵـەکـەیـانی ئامادە کردووە کە بنـەمـاڵـەیێکی گەورەی شالـەبـەگیـانـە. شەجـەرەکـە گەورەیـەو بەم شیـوەیـەی خوارەوە زنجیرەی ناوی باوو باپیرانی لە کۆنەوە پشتاو پشت هێناوەتەوە:

(حەسەن ئاغا ـ ئەحمەد لاجانی ـ شالی ئاغا ـ مام ئاغا ـ ئەحمەد ـ بریندار ـ حەمەد ـ مام ئاغا ـ ڕەسوڵ ـ مام ئاغا ـ بریندار ـ فەرهاد.).

کاك فەرهاد ئەو شەجەرەیەی لەسەر ئەو زانیاریانە سازکردووە کە لە پیـرەمێـردانی خێڵەکـەیانی وەرگرتوون[4] سەر گەورەکەیان مام ئاغا بووە، بەپێی دەفتەری سەرنووس (النفوس)ە کەی لە ساڵی (1890)دا لە دایك بووەو، ناوی دایکی (ئایشێ) یەو تا (1947/7/23) ژیـاوە دەڵـێن ساڵی (1922)لـە شەڕی دەربـەنـدی ڕانیـەدا لە دژی ئینگلیزەکان بەشداریی کردووە. پاش مام ئاغا عەبدوڵڵای کوڕی بووتە کۆیخا کە ساڵی لە دایـك بوونی لە دەفتـەری سەرنـووسـەکـەیـدا (1908)ەو، لە (1960/3/14)دا زیـنـدوو بووە وەك لە (هـویـة تجهیـز الحنطـه لقضـاء رانیه لسنة 1960 ـ الرقم 107)دا هاتووە کە کاتی خۆی وەریگرتووە چونکە تا دوو ساڵ دوای دەرکردنی جووتیارەکانی ئەو دێهاتانەی بیتوێن کە ژێـر ئاوی زەریـاچـەی دوکـان کەوتن ـ میـری هەر نەفەرەو شەش کیلۆ گەنم و هەرمـاڵـەی چەنـد دینـارێکی دەدانێ هەموو مانگێك.

7 ـ ڕەنجووری کاتی خۆی لە ئاغجەلەردا نیشتووە کە ئێستـا مەڵبـەنـدی ناحیـەیێکـە لە پارێـزگای سلێمانی بەڵام نازانین چەند سال لەوێ ماوەتەوە.

پاشتر باسی ماڵ گۆیزانەوەی ڕەنجووری بۆ کەرکووك دەکەین.

8 ـ ڕەنجـووری نووسیـویـە «والعلواني والأبـدالاني طریقـه» ئەمـە ئەوە ئاشکـرا دەکـا کە موریـدی شێخەکانی عەودالان بووە لە ناوچەی ئاغجەلەر.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە ڕەنجـووری لە دیـوانـەکـەیـدا هێندێك شیعری لە ستایشی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عەبـدوڵـلای عەودالانیـدا گوتـووەو لە لیستـەی چوارەمـدا مێژووی لە دایك بوون و کوچکردنی شێخی تۆمار کردووە.

شێـخ ئەحمـەد پیـاوێکی بەنـاوبـانگی سەردەمی خۆی بووەو، ناوو مۆرەکـەی لە برێـك بەڵگـە نامـە (وثیقـە)ی کوردیـدا هاتـوون. دوو شیـوە مۆری لەو بەڵگـەنـامـەیـەی بابانەکاندا بەدی دەکرێت کە لە ساڵی (1201)ی کۆچیدا نووسراوەو ئیمزای ئیبراهیم پاشای ئاواکەرەوەی سلێمانیی لە سەرەو لە ژمـارەی ڕۆژی (1982/12/3)ی ڕۆژنـامـەی (العراق)دا بڵاومان کردووەتەوە. بڵاوکە ڕەوەی دیوانەکەش دەڵێ ڕەنجووری موریدی شێخ ئەحمەد بووە، ئەوەش لە (ل 10 ـ 11)ی دیوانەکەدا دەست نیشان کراوە.[4]

9 ـ ڕەنجووری ناوی (ساری)ی خوشکی بردووە کە لە

(27)ی شەووالی ساڵی (1198)دا («1783 ـ 1784)ی زایین» کۆچی دوایی کردووە.

10 ـ کوڕێکی بووە ناوی ناوە «ئیسماعیل» ئەوە لە ڕۆژی (13)ی ذی‌الحجەی ساڵی (1197)ی کۆچیدا «1782 ـ 1783)ی زایین» بووە.

هەروەها ڕەنجووری نووسیویە کە «صراحی» برازای بۆ ئیسماعیلی کوڕی هێناوە. لە ڕۆژی هەینی (21)ی ڕەبیعولئاخیری ساڵی (1215)ی کۆچیدا «1800 ـ 1801ی زایین» مارەیی بڕیوەو لەسێ شەممەی (26)ی هەمان مانگدا کوڕەکەی بەزاوا بووە. وەك بیستوومە «سوراحێ» بۆ ناوی ئافرەت لە ناوچەی سەقزیان ڕاستتر بڵێم کوردستانی ئێراندا باوە ورانیە و کویسنجق.

11 ـ ناوی کچێکی هێناوە کە «مصری» یەو، ڕۆژی سێ شەممەی نیوەڕاستی مانگی موحەڕڕەمی ساڵی (1193)ی کۆچیی «1779ی زایین» لە دایك بووە. لە جێیەکی تردا باسی شووکردنی ئەو کچە دەکا لە پێنجی مانگی جەمادیل ئاخیری ساڵی (1212)ی کۆچیدا «1797 ـ 1798ی زایین».

ڕەنجووری باسی «مصری»یەی لە ژێر ناوی «سلطانە»دا کردووەو لە تەنیشت ناوی «فەقێ ئیسماعیل»ی کوڕیدا نووسیویە. پێ دەچێ ئەوە کچی ڕەنجووری بووبێ، بەتایبەت لە بایەخ پێدان بە مێژووی لە دایك بوون و شووکردنیدا دەردەکەوێ.

12 ـ مێژووی مارەبڕینی دوو کچی پیاوێکی بەناوی «شێخ عیسا»وە هێناوە، یەکەمیان ناوی «سلطانە»یە وساڵی (1192)ی کۆچی «1778ی زایین» مارەی بردراوەو، دووەمیان ناوی «ئامنە»یە وساڵی (1204)ی کۆچی «1789 ـ 1790ی زایین» مارەی بردراوە.

ڕەنجووری لە تەنیشت یەکدا «انکاح سلطانە . . .» و «انکاح امنە. . »ی نووسیوەو، نەیگوتووە لەچ پیاوێك مارەکراون . باسی مردنی هەردوو کیانیشی کردووە، سلطانە لەبەرەبەیانی ڕۆژی سێ شەممەی (23)ی ڕەبیعولئەووەلی ساڵی (1209)ی کۆچیدا «1788 ـ 1789ی زایین»و ، امنە لە کاتی چێشت خواردن ڕۆژی (12)ی ذی‌الحجەی بەرانبەر بە ڕۆژی دووەمی تەشرینی ساڵی (1213)ی کۆچیدا «1798 ـ 1799ی زایین». بایە خدانی زۆری ڕەنجووری بە مێژووی کۆچی دوایی کردنی ئەو دوو ئافرەتە بەو جۆرە وردەکارییە دەمانخاتە سەر ئەو ڕایە کە هەردووکیان ژنی بووبن و، پاش مردنی (سلطانە) خوشکەکەیی هێنابێ‌و ساڵێك دوای گواستنەوەی سلطانە «مصری» یەی کچی بووبێ. شتی سەرنج ڕاکێش لێرەدا ئەوەیە کە کاتی ئەوەی ڕەنجووری لە خۆی‌و براو خوشکی دەدوێ واتە ماڵ و منداڵ و کە سوکاری، باسی ئەو دوو ژنە دەکابانی ناوی هەمویان پێکەوە دەهێنی کەپێ دەچی ژنی‌بن .

13 ـ ڕەنجووری ساڵی (1192)ی کۆچی «1778ی زایین» لەگەڵ «شێخ»دا تا داقووق (طاقوق) چووە بۆ خواحافیزی کردن و بەڕێ کردنی (حەسەن پاشای)ی والیی کەرکوك.

ڕەنجووری ناوی ئەو شێخەی دیاری نەکردووە، بەڵام چونکە لەپێش ئەو خاڵە داو لەتەنیشتیەوە ناوی «شێخ حسێن»ی نووسیوە ـ وەك لە مەودوا باسی دەکەین پی‌دەچی کە هەر «شێخ حسێن» بێ جا ئەم بەڕێ کردنە هەر دەبێ لەوکاتەدا بێ کە حەسەن پاشا لە نیوەی ئەو ساڵەدا کرا بە والیی بەغدا.

14 ـ ڕەنجووری لە ساڵی (1196)ی کۆچیدا «1781 ـ 1782ی زایین» لەخزمەت «شێخ حسێن»دا سەفەری کردووە بۆ بەغدا.

15 ـ ڕۆژی (19)ی ذو القعدةی ساڵی (1197)ی کۆچی «1782 ـ 1783ی زایین» ماڵەکەیی بردووەتە نێزیك «مسجد جدید» واتە مزگەوتی نوێ لە کەرکوك بەڵام نەیگوتووە لە کوێوە هێناویە.

16 ـ ڕۆژی (15)ی صفری ساڵی (1201)ی کۆچی «1786 ـ 1787ی زایین» ڕەنجووری لە (ئاغجە لەرەوە



ماڵەکەیی گواستووەتەوە بۆ کەرکووك و هەر نێزیکیش بووە لە «مسجد جدید». دیارە جاری پێشوو زۆر لە کەرکووك ناماوەتەوەو، دووریش نییە دوایی یەکسەر لە کەرکووك چووبێتە ئاغجە لەرو، هەردوو جاریش لە نێزیك «مسجد جدید» نیشتە جێ بووبێ.

## مزکەوتی ڕەنجووری

وەك گوتمان ڕەنجووری دوو جار ماڵەکەیی گواستووەتەوە بۆ کەرکووك بۆ نێزیك (مسجد جدید). مانگی شوباتی 1984، بۆ دۆزینەوەی ئەم مزگەوتە چووم بۆ کەرکووك. بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدو لمە جیدی قوطب کە ئەمرۆ لە باشترین مەلایانی کەرکووکەو تەمەنی لە هەشتا ساڵ پتر دەبێ، پێی گوتم: «لەقەلای کەرکووك مزگەوتێك هەیە، تابیرم بێ، پێیان دەگوت (الجامع الجدید)». منیش چووم بۆقەڵاو مزگەوتەکەم بینی کە دەکەوێتە پشت (مەقامی دانیال پێغەمبەر) ولەسەر ڕووکاری پێشەوەی نووسراوە «الجامع الجدید».

مزگەوتەکە پچووکە، بەڵام شێوەی دروستکردنەکەی جوان، میحرابێکی نەخشداری گەلێك دڵگیری هەیە. بەردی مەڕمەڕی سەر دەرگاکەی پێنج دێرە شیعری لەسەر نووسراوە، دێڕی یەکەم عەرەبیو دووەم فارسیو سێ دێڕەکەی ترتورکین. بەپێی نووسینەکە، مەلاوەلیی کوڕی حاجی ئیبراهیم لە ساڵی 1142ی کۆچیدا «1729 ـ 1730ی زایین» ئاوای کردووەتەوە، واتە پێش لەدایك بوونی ڕەنجووری. بە مزگەوتەکە شیان گوتووە «مزگەوتی عوریان» کە هی بنەماڵەی مەلا وەلی بووەو گۆڕی هێندیکیانی تێدایە.

کۆنترینیان گۆڕی (حاجی عەلی ئەفەندی الخطیب المطعون سنه 1187هـ)و (الحاج عبدالله بن عریان 1240)ە. بیرێکی ئاو لە حەوشەکەیدایە دەکەوێتە لای دیواری خۆرهەڵاتیەوە ومجیورەکەی مەلاوهاب کە تائیستا دوجار لەگەڵم هاتووە مزگەوتە کە هەر لەم بنەماڵەیە.

ڕۆژانی (17 ـ 21)ی مانگی ئایاری 1984 بەمەبەستی دەست خستنی پاشماوەی بەڵگەنامەیی لەکەرکووك بووم. بەڕێز کاك محەمەد صاڵحی مەلا عومەری ئۆمەر گومبەتی کە

مموستاینکی وریاو زیرەکەو بزانم لە (ازهر) یشی خوێندوە، وەك چۆن باوکی یەکێـك بووە لە مەلا باشـەکـانی کەرکـوك ـ پێی گوتم: «لـەمێـژە لەپیـرە مێـردانم بیستـووە کە مزگـەوتی (شێخی، ڕەنجـووری) مزگـەوتـەکـەی ئێستای زێوێ یە (جامع الزویە)و، مەلای تەکیـەی شێـخ عەبـدولکـە ریمی کربچنـەوەیـە لەپشت گەرەکی ئیمام قاسم ،نێزیکەی چل ساڵ لەمەو بەر من بەکاولی بینیومە پێیان گوتووە مزگەوتی ڕەنجووری.

تەنـانـەت پیـرەمێـردەکـان دەڵێن کتێبـەکـانی (شێخی ڕەنجووری)یان خستووەتە ژێر میحرابەکەیەوە، چونکە مزگەوتەکە غەرووخـابـوو و با لەو کتێبـانـەی دەداو لاپـەڕەکـانیـانی پرژو بڵاودەکردەوە». ئێوارەی ڕۆژی (20)ی ئایار من و ناوبراو وکاك قادری برای کە مامۆستایە بۆ دیتنی مزگەوتەکە چووین کەدەوری پازدە ساڵە سەر لەنوێ ئاواکراوەتەوەو، وێنەیم گرت.

هەروەهـا کاك محـمـەد زیـادی شێخ تەهای شێخ سەعیدی کەرکووکیش پێی گوتم: باوکم دەیگوت ئەم مزگەوتە مزگەوتی ڕەنجووری‌یە.

جا بەوەدا پێ دەچێ مزگەوتی دووەم هیی ڕەنجووری بێ، نەك یەکـەمیـان، چونکـە کەس نەیگـوتـووە ئەوەی یەکـەم هیی ڕەنجووری بووە بەڵکوو تەنیا (الجامع الجدید)ی پێ دەڵێن.

شایستـەی باسـە کەڕەنجووری یەکەم جارماڵەکەیی هێناوەتە کەرکوك ئەو مزگەوتەی ئاواکردووەتەوە، چونکە یەك مێژووی بۆ هێنانی ماڵی و ئاواکردنەوەی مزگەوتەکە تۆمارکردووە.

دیارە یا ئاواکردنەوە کە کەم بووەو هێندەی نەخایاندووە، یالەو ڕۆژەوە دەستی بە ئاواکـردنـەوەی کردووە یابـڕیـاری ئاواکردنەوەی داوەو، دەشبێ بووبێ بە مەلای ئەم مزگـەوتـە. ئەمـەش وێنـەی مزگەوتەکەیە (مزگەوتی زیوێیە)



# گۆڕی ڕەنجووری

مامۆستا محەممەد صالحی مەلا عومەری ئۆمەر گومبەتی پێی گوتم:

چەند سالێك لەمەو بەر هەولم دا هێندێك زانیاری لەبارەی ڕەنجووری یەوە کۆبکەمەوە لەم ڕووەوە، چەند لاپەرەیێکم نووسی پێش چل سال لەپیرەمێردە کانیشی بیستووە کە گۆڕی ڕەنجووری دەکەوێتە نێو گۆڕستانی «ئیمام غەیبی»ی پشت گەرەکی ئیمام قاسمەوە.

پیرەمێردی وەك سابیرو تۆفیقی مەلا قادر کەخەلکی ئەم گەرەکە بوون، گۆڕەکەیان پێشات داوم و، دەیانگوت دیومانە موریدەکانی شێخی ڕەنجووری کە ئەودەم پیربوون دەهاتنە سەر گۆڕەکەی‌و سۆزیان دەکردو دەروێشانە هەلدەپەرین و دەیانگوت ئەمەگۆڕی شێخی ڕەنجووری‌یە. ئەو کاتە گومەزەکەی ڕووخابووو شوێنەواری چوارپایەکەی مابووەوە، واتە دەبێ لە شێوەی چادر یاچەتر بوویێ‌و سێ گۆڕی تێدا بووە. بەلام لە سەرو بەندی جوولانەوەی ڕەشید عالی گەیلانیدا (1941) هێندێك لە گۆڕستانە کە بەگۆڕەکەی ڕەنجووری یەوە تێکدراووەو کراوە بەباخ و ئێستاپێی دەلێن «حدیقه مشتل بلدیه کرکوك» داوام لە مامۆستا محەمەد صالح کرد جێ گۆڕ ەکەیم پێشان بدات ئێوارەی ڕۆژی (20)ی ئایار لە پشکنینی دەستنووسەکانی بنەمالەکەیان بوومەوە کە هێندێك شتی بەنرخی لە نێودا بوو، وەك ئیجازە نامەیێکی مەلا یەحیای مزوری کە داویە بەمەلا ئەحمەدی کوری حاجی ئیبراهیمی ئۆمەر گومبەتی لە سالی (1245)ی کۆچیدا «1829 ـ 1830ی زایین»و مۆری مەلا یەحیای پێوەیە، دوونامەی شێخی سیراجوددینی تەوێلەو ئیجازە نامەی خەلیفایەتی شێخ نورەددینی بریفکانی کە لە مەلا مەحمودی موصلی وەرگرتووەو، کتێبێکی دەستنووس لەدانانی مەلا ئەحمەدی کوری حاجی ئیبراهیمی ئۆمەر گومبەتی . ئۆمەر گومبەتیش دێیەکی ناوچەی کۆیەیە لەناحیەی تەقتەق و جێی زانست بووەو قوتابخانەیێکی گرنگی هەبووە. پاش وێنەگرتنی برێك لەم بەلگەنامانەو، وێنەکردنی تەکیەی ئۆمەر گومبەت کە دەکەوێتە ئەوبەری باکووری ئیمام قاسمەوە لە نێزیك خاسە ـ پێکەوە چووینە نێو باخەکەوەو، توانیمان جێ گۆڕەکەی لەبازنەیێکی (26) هەنگاو بدادەست نیشان بکەین کەوالە (40) هەنگاوی خۆرهەلاتی دەرگای باخەکەوەو، دەرگاکەیشی کەوتووەتە نێزیك قوژبنی باشووری باخەکەوە، واتە دووریی نێوان جێ‌گۆڕ و قوژبنەکە هەر چل هەنگاوێك دەبێت جێ گۆڕەکەی هەر (53) هەنگاوێك لەپەنجەرەکانی قوتابخانەی سەرەتایی ئیمام قاسمەوە دوورە، چونکە قوتابخانەکە لەبەردەمی دەرگای باخەکە دایە. جێ گۆڕەکە، یانی ئەو بازنەیەی کە گۆڕەکەی دەکەوێتە نێو ،(3 ـ 4) مەترێك نێزیکی دیواری دەستە چەپی باخەکەیە، لە کاتێکدا ڕووت لە باشوور بێ‌و رووکاری باخەکەش لە خۆر هەلاتەوە بۆ خۆر ئاوایەو، تەنیشتی دەستەچەپی گۆڕستانە «گۆڕستانی ئیمام غەیبی» کە لە باشوورەوە بەگۆڕستانی ئیمام قاسمەوە بەستراوە.

پاش دیاری کردنی جێ گۆڕەکەی، چەند کۆمەلە بەردێکمان داناو ،لە هەموو لایێکەوە وێنەیمان گرت. لەوکاتەدا دەیان قوتابیی کورد لە نێو باخەکەدا موتالاو دەوریان دەکردەوەو لەوجێیەدا گرد بوونەوەو ئیشەکەیان بەدل بوو. وێنەیێکی ئەو کۆبوونەوەیەمان گرت، چونکە لەیەکەم کۆڕی یادکردنەوەی ئەم شاعیرە دەچوو کە شیعرەکانی تارادەیێك بۆنی کوردایەتی لێ دێت.

ئەو کەسانەی لەوکات و شوێنەدا ئامادە بوون شارەزا ی جێگە کەبوون و بەخەلکی تری دەلێن و ئیدی زەحمەتە لە بیربچێتەوە ـ ئومێدەوارم ڕۆژێك لەڕۆژان گومەزێك لەو جێیەدا دروست بکرێت و گۆڕەکەی سەر لە نوێ ڕێك بخرێتەوە. وەك چۆن توانیمان چەند مانگ پاش ئەوە کێل و ئێسکی لەشی جووتە دلدار «قەرو گولەزەر» بدۆزینەوە لە دیێ پلنگانی دۆلی ئاکۆو، سەر لەنوێ گورەکەیانمان بنیات نایەوە، دوای ئەوە کە ئەندازیاری بەرێوەبەرایەتی ڕێگەوبان و پردی سلێمانی محەممەد ڕەشید نوری لەحەفتاکاندا بەتەقەمەنی تەقاند بوونیەوە.

هیوامان وایە ئەم کارانە خزمەتێکی پچووك بن لەرێی
ـێندووکردنەوەی کەلەپووری شارستانەتیماندا.

پاش گەڕانەوەم لە کەرکوك مامۆستا محەمەد صاڵح
ـێنەیێکی دەستکردی جێ گۆڕی ڕەنجووریی لەدەستکردی بەرێز
ـێ محەمەد ساڵەیی لە کەرکوك بۆ ناردم، لەگەڵ نامەیێك
ـخۆم داوام کردبوو. چونکە وام بەباش زانی بەدەستی خۆی
لەبارەی مزگەوت و گۆڕی ڕەنجووری‌یەوە بۆ پنووسێت
ـوەك بەڵگەیێك بمێنێتەوە.

ئەمەی خوارەوە دەقی نامەکەیە:

دەربارەی ڕەنجووریی شاعیر

ئەوی بیزانم دەربارەی ژیانی ڕەنجووریی شاعیر لەم دوو حاڵەدایە:

1 ـ گۆڕەکەی 2 ـ تەکیەکەی.

گۆڕەکەی: گۆڕی ئەم شاعیرە مەزنە ئەکەوێتە ناو باخچەی «مشتل البلدیه» بەشی بەلای قەبرستانی (امام غەیبی) ـەگەڕەکی ئیمام قاسم لەکەرکوك. شوێنی ئەم قەبرستانە ئێستا تەخت کراوەو کراوەتە حەدیقە، بەڵام خۆم پێچکەی گومەزی ڕووخاوم دیوەو لەژێر ئاست گومەزەکەداسێ قەبرهەبوون وەلە هەندێ کەسم پرسیوە دەربارەی‌وا دەینووسمەوە.

حاجی صابر توفیق مەلا قادر:ـ کەیە کێکە لەتەمەن درێژەکان و پەروەردەی ئەم گەڕەکەیە. لێم پرسی دەربارەی شێخی ڕەنجووری، وڵامی ئەوەبوو کە (مەحسوویەکانی ڕەنجووری) ئەهاتن لەسەر ئەم قەبرانە کۆ ئەبوونەوەو سۆزیان ئەکردو لەناو سۆزەکەدا هەموو جارێك ئەم قسەیان ئەوتەوە «یاخوا ڕەنجووری قەبرت پڕ نووربێ». وەئە وشیعرانەی ئەم مەحسوویانە ئەیانخوێندنەوە لە دانانی ڕەنجووری خۆی‌بوون.
هەروەها حاجی صابر دەیوت ئەم مەحسوویانە پیرو بەتەمەن بوون و ناسراوبوون بەدەروێشەکانی شێخی ڕەنجووری‌و ئەیان وت (واتە دەروێشەکان) ئەمە گۆڕخانەی شێخی ڕەنجووری‌یە.

تەکیەکەی:ـ حاجی مەلا عەبدوڵڵا مەلا محەمەد ئەمین ناسراو بە (خاوەن دنگەکە) دیگێڕایەوەو دەیوت: ئێمە منداڵ بووین ئەچووینە شوێنی ئەم مزگەوتەی ئێستای (زیویە) کەناسراوە بەمزگەوتی (شێخ جەبار)لە (گەڕەکی یادگار). مزگەوت بوو دیوارەکانی مابوو پێی ئەوترا (تەکیەی ڕەنجووری)و چۆڵ بوو یاریمان لێ ئەکرد هەروەها (حاجی مەلا عەبدوڵڵا) ئەیوت لەناو مزگەوتەکە پەڕی کتێب باڵەبیردو ئەیانوت ئەمەپەڕی کتێبەکانی شێخی ڕەنجووری‌یە. هەروەها ئەیوت وام زانیوە کە کتێبەکانی ڕەنجووری بۆئەوەی لەژێر دەسوپا نەمێنێ کراونەتە ناوصندوقێك و لە (میحرابی) مزگەوتەکەدا لەناو خاك داپۆشراون!

وە لەپاشا مزگەوتەکە ڕووخاوەو منطقەکەش چۆڵ بووەو زووربەی خانووەکان تێك چوونەو چۆڵ بوونەو تائەم دوایی‌یە هەر کەلاوە بوون.

بەڵام لەم دوایی‌داو دوای ئاوەدان بوونی گەڕەکە خەڵکەکەو بەسەر پەرشتی مەلا جەبارو حاجی تۆفیق سەر لەنوێ مزگەوتەکەیان دروست کردووەتەوە لە گەڕەکی (زیویە)یە.

هەروەها دەربارەی شێخی ڕەنجووری لە (محەمەد ئەحمەد خدر)م پرسی کە خەڵکی گەڕەکەو لە پیاوە بەتەمەنەکانە . . وتی:ـ لەبەر ئەوەی کاتی گەنجیەتیم هەر لەکەیف و ڕابواردن بەسەر ئەبرد زۆر مەلاقەو ئاگاداریم لە پیاوچاکان و دیندارەکان نەبوو. بەڵام ئەوی لای من هەبێت دەرهەق شێخی ڕەنجووری لە (زیویە) ژیاوە، مەلا بووەو شێخ بووەو شیعری زۆر بووە.

هەروا ئەیوت باوکم زۆر عاشقی شیعرەکانی شێخی ڕەنجووری بوو، کتێبێکی شیعری لای باوکم بوو زۆری خۆش ئەویست تەنانەت کە نەساغ کەوت و بۆسەر دکتۆر بردیان (بۆ شارێکی کە کەئێستا لەسەر یادنیم بەغدا بوویانەنا) لەبەر خۆشەویستی ئەو کتێبەی لەو حاڵەتەشدا لەگەڵ خۆی بردو تائێستا لەبەر چاومە کە لەنێوان گۆشت و جل و بەرگدا قایمی کرد ـ لەو بردنەدا باوکم بەسەر یامردو خەبەری مردنی ڕۆژی ڕەشی پێشان داین فەقیرو نەبوو بووین و من عەسکەری ڕاکردوو بووم و بگیرامایە ڕەمی ئەکرام ـ بۆیە کە خەبەری باوکم نەزانم چۆن

ئەپەرژێمە بەر خەبەری کتێبەکەی. بەڵام ئەوی لەبیرم ناچێو هەردەم دێتە پێش چاوم ئەو کتێبەیە کە تاچە رادەیەك باوکم لای عەزیز بوو تەنها لە نەخۆشیە کەشیدا لەبیری نەکردو نایە باخەڵی!

محمد صالح ملا عمر عمر گنبدی

تێبینی: ئەو دوو دێرەی خەتی لە ژێر دایە مەبەست تیادا من لەیادم نیەنەك محەمەد ئەحمەد خدر.

لەم زانیاریانەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە رەنجووری شێخایەتیی کردووەو خاوەنی موریدو تەکیەش بووە.

## مۆری رەنجووری

لە نێو ئەم کۆمەڵە دەستنووسەی رەنجووریدا، لە کۆتایی دەستنووسی کتێبی «ایقاد الضرام علیٰ من لم یوقع طلاق العوام» کە بە «طلاق الاکراد»ی زانای کورد محمد (ابن الحاج) بە ناوبانگە، مۆری رەنجووری پێوەیە مۆرەکە بازنەیی‌یە دەورەکەی (13ملم)ەو لە سەری نووسراوە «عمر رنجوری بن خالد»و، مێژووی دروستکردنەکەیی لە سەر هەڵکۆڵدراوە، دوور نیە (1203)یا (1210)ی کۆچی بێت.

نووسینەکە دوو دێرە، (عمر رنجوری) لە دێری سەرەوەدایەو (بن خالد) لە دێری ژێرەوەیو کلکی (یێ)یەکە بۆ پاشەوە درێژ کراوەتەوەو کراوە بە جیاتی نێوان دوو دێرەکەو، مێژووەکەش کەوتووەتە ژێر دێری دووەمەوە. نووسینەکە بە شێوە خەتی فارسی یاتەعلیق نووسراوەو، نەخشێکی گیایی گوڵداریش بە سەر مۆرەکەوە هەڵکۆڵدراوە.

رەنجووری لە کۆتایی ئەم کتێبەدا ئەم گوزارەیەی خوارەوەی تۆمارکردووە.

**«کتبه الحقیر الفقیر عمر الشهیر برنجوری ابن خالد بیك غفر لهما ولسائر المسلمین سنة ست و مائتین بعد الالف یوم الخمیس وقت الضحیٰ اثنی عشر یوماً مضیٰ في شهر شعبان کان خمسة وعشرین من الآزار الرومیة والله أعلم بالصواب»**

## رۆژنامەی رەنجووری

هەوڵی بۆ کۆ کردنەوەی زانیاری لە بابەت ئەم شاعیرەوە بەرهەمێکی دیکەی رەنجووری دەست خستین کە ئەویش ساڵنامەکەیەتی. پشووی نیوەی ساڵی 1984 بۆ جاری دووەم بەو کۆمەڵە دەستنووسەی رەنجووریدا چوومەوە کە لە نامەخانەی وەزارەتی ئەوقافەو هاتم بۆ کەرکووکیش بۆ دەست نیشان کردنی «مسجد جدید»ی رەنجووری رۆژی (10)ی شوبات چوومە هەولێرو، کاتی تۆمارکردنی بیرەوەری مامۆستای بەرێز مەلا شەریفی هەولێری کە تەمەنی بووە بە (93) ساڵ و زانایێکی باشی هەولێر بووەو چەندین ساڵ دەرسی بە فەقێیان گوتووە وبیرەوەرییێکی زۆری هەیە - باسی رەنجووریو خێڵی شالە بەگیم لێ‌پرسی مامۆستاش گوتی: من هیچی لە بارەوە نازانم ئەوە نەبێ کە رەنجووری ساڵنامەیێکی هەیەو، من سەردەمی فەقێیەتیم لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا دانەیم لە لای کاکم (مەلا محەمەد ئەمینی هەوایی) بینیوە کە بۆ خۆی نووسیبووەوەو رەمەزانان بە تایبەت بۆ خەڵکی دەخوێندەوە. پێشتر لە هیچ کەسێکم نەبیستبوو کە رەنجووری شتی وەهای هەیە، بۆیە قسەکەی مامۆستام بە لاوە یەکجار گرینگ بوو ئیتر منیش هەر دەمو دەست داوام کرد لە بەرێزان: دوکتۆر محەمەد شەریفی کوری کە راوێژکار (مستەشار)ە لە وەزارەتی ئەوقاف و مەلا سەعدوڵڵا مەلا محەمەد ئەمین هەوایی و محەمەد عەلی قەرەداخی - کە هەوڵ بدەن ئەو ساڵنامەیە لە نێو کتێبەکانی خوالێخۆشبوو مەلا محەمەد ئەمیندا بدۆزنەوە لە بەغدا ئەوانیش ساڵنامەیێکیان بە دەسخەتی (هەوایی)ی شاعیرو زانا بۆ من نارد ،کە بینیم زانیم هی رەنجووری نییە، بۆیە داوام کرد جارێکی تر بۆی بگەڕێن ئەوانیش دۆزییانەوەو بۆیان ناردم، سوپاسیان دەکەم.

ساڵنامەکە (23) لاپەڕەیە، زۆربەی لاپەڕەکانی (19) دێڕن، لە چوار جێگەدا هێندێك لاپەڕەی لێ‌کەوتووە ،رەنگە دە لاپەڕەیێك یا زیاتری لێ کەوتبێ.

ئەم دانـەیـە سالّی 1334ی کۆچی «= 1915 ـ 1916ی زایین» لە لایـەن هەوایییـەوە نووسـراوەتـەوە، وەك لە کۆتـایی یەکەیدا ئەم گوزارەیەی نووسیوە.

«تمام شد روزنامه ملا عمر رنجووری رحمه الله[14] درشهر ربیـع الآخر رۆز جمعـه سنة هزارو سەصـدو سی 30 چهـار ازدست احقر بندکان محمد أمیغ هوایی ابن حاجی ملا احمد صائم..»

دەستنووسـەکـە بە فارسی‌یەو ،هەر حەوت دێڕێکی پێشەکی یەکەی بە عەرەبی‌یەو سەرەتاکەی بەمە دەست پێ‌دەکات:

«الحمـد لله الـذي خلق الشمس منیـراً وجعـل لهـا مستقراً بتقدیره العزیز الحکیم وقدر له منازل حتی عاد کالعرجون القدیم»

ناوی «عمر رنجووری» بەم شێوەیە لە پێشەکیدا هاتووە:

«امـا بعـد بر اربـاب دانش و کمـال وا صحـاب هنـروذوی الفضـل معلوم و هویـدا باشـد که فقیـر حقیر عمر رنجووری بر صفحة مدعا عرض مینماید»

ئاواش کۆتایی پێ‌هێناوە.

«ودین رسالة مختصره ازین زیادتر نمی کنجاند امید بجناب اقدس الیهی که اکر چیزی نالایق بعقیده درو ذکر شده باشد قلم عفو برویکشدو مقبول نظر طالبان و خوانندکان کرداند انه جواد حلیـم رؤف رحیم» ڕەنجـووری سالّی (1225)ی کۆچی (= 1810ی زایین) ئەم کتێبـەی دانـاوە، چونکـە دوو جار بە نووسین و جارێك بە ژمارە لە لاپەڕە (16)ی ئەم دانەیەدا ـ ئەو مێـژووەی سەرەوەی تۆمـارکـردووەو بابـەتی حیسـابی لە سەر ئەو ساڵە هێناوەتەوەو گوتوویە ڕۆژی (12)ی مانگی (صفر) ڕۆژی هەینی سەعـات سێ‌و (44) دەقـە خۆر لەو ساڵـەدا گەیشتـووەتە کەلوو (بورج)ی حەمەل و بووە بە نەورۆز ڕەنگە ڕەنجووری لە سەرەتای ئەو ساڵەدا یا لە کۆتایی‌یەکانی ساڵی پێشتر دەستی بە دانـانی سالّنـامـەکـەی کردبێ ،چـونکـە ڕۆژی (18)ی مانگی موحـەڕڕەم کە ڕێکـەوتی پێنجـەم ڕۆژی ئازار بووە گەیشتـووەتـە لاپەڕەی چوارەم و باسی کەلووەکان دەکات ئەویش بە پێی ئەم دەستنـووسـە ئەگـەر چی لە نێـوان لاپـەڕە (2)و (3)دا هێنـدێك لاپەڕە کەوتوون.

مێــژووی. مێـژووی ئەو ڕۆژەی دوو جار لەو لاپـەڕەیـەدا نووسیوەتەوەو بابەتی سالّنامەیی لە سەر جێ‌بەجێ‌کردووە بەوەدا ئەوەمـان بۆ دەردەکـەوێـت کە ڕەنجـووری تا سالّی (1225) زیندوو بووە.

مێژووی کۆتـایی هێنـان بە ڕۆژنـامـەکەی‌و ئەوەش لە حەزو بایـەخی شاعیـرەوە دوورن چونکـە ڕەنجـووری ئارەزۆوێکی مێـژوونـووسـانـەی هەبـووەو حەزی لە نووسینی مێژووی سالّی کردووە. دوو رنییـە مێـژووەکـە ی هەبـوو بێ، بەلاّم نووسیاری هێندێك لە دانەکانی کتێبۆڵکەکە نەینووسیبێ.

## ناوەڕۆکی ڕۆژنامەکە

نووسەر لە پێشەکیدا ناوی چەند زانایێکی زانستی سالّنامەی هێنـاوەتـەوە، وەك مەولانـا محـەمەد خاقانی‌و محەمەد بن جمال الدین نجومی‌و مەولانا مەلا یونس جۆڵە مێرگی ..ئێمە هیچ لە بارەی ژیانی مەلا یونسەوە نازانین دیارە لە سالّنامەدا دەستی هەبووە.

ڕەنگـە مەلا یونس (هـەلکـاتینی) یان وەك هێنـدێکی‌تر دەڵێن (ئەرقەتینی) بێ کە مێژوونووسانی وەك مەردۆخ[6]

دەڵـێن خەڵکی ناوچـەی هەکـاری بووە کە جۆڵـە مێـرگێ مەڵبەندەکەی بووەو تا ئەمرۆکە مەڵبەندی ویلایەتی هەکاری‌یە لە کوردستانی تورکیا. مەلا یونس کتێبی «ظروف»و «ترکیب»ی کە بە تەرکیبا مەلا یونس» بەناوبانگە ـ داناوە.

ئەم دوو کتێبە لە بابەت نەحوی عەرەبی‌یەوەن و بە پەخشانی کرمانجین و یەکجار وردن..

ڕەنجـووری لەو سالّنـامـەیـەدا باسی هەلاّتن و ئاوا بوونی ئەستێـرە ی گەلاوێـژ و کۆ «پێـروو»و تەرازوو دەکـات و لە کە شنـاسـی (الانـواء الـجـویـه) دەدوێ کە زۆر لایـەنی ئەو کەشناسی‌یە کوردەواری دەگرنەوە.

حیسابداری کورد (حەسەن گابەڵەك)ی مەنگوری کە دەوری چوارده ساڵ لەمەو بەر کۆچی دوایی کردووە.

ئەو جۆرە کە شنـاسـی یـەی تاقی کـردووەتـەوە. هەروەهـا رەنجـووری قسـە لە سەر کەلـووە ستێرناسی (فلکی) یـەکـانـی ئـاسـمـان و چۆنـیـەتـی پێـکـهـاتـنـی وەرزەکانی ساڵ و ئەفلاك و ئەستێرەکان دەکات و دوایی دێتە سەر هەر چوار ساڵنـامـەکـان: ساڵنامەی کۆن، ساڵنامەی رۆمی ،ساڵنامەی هیجری‌و ساڵنامەی جەلالی. رەنجووری دەڵێت ئەم کتێبەی لە سەر ئەو چوار ساڵنامەیە داناوە، بەڵام تەنیا ئەو بەشە زانیـاریـیـە لەو ساڵنـامـەیـەدا ماوەتـەوە کە لەبـارەی ساڵنـامـەی هیجـری‌یـەو هەرچی ئەوانی ترن تەواو نین چونکـە هەر بەشـەی هێندێك لە باسەکەی کەوتووە، واتە پێ‌دەچێت برێکی باشی لێ فەوتـابێ. سێ خشتـە (جـدول) لەو بەشـەدا هەیە کە ماوەتەوە.

لەوە دەچێت ئەم کتێبە درێژ و ورد بووبێ لەبەر ئەوەی رەنجووری دەستێکی باڵای لە زانستی ساڵنامەدا هەبووە. لە ژمارەی رۆژی 1984/9/5ی رۆژنـامـەی (العـراق)دا پێنـاسینێکمـان لە سەر ساڵنامەی رەنجووری بڵاوکردەوە.

## رەنـجـووری تا ساڵی «1225»ی کۆچی زیندوو بووە

هێشتـا مێـژووی کۆچی دوایی‌کـردنی رەنجـووریمان بۆ ساغ نەبـووەتـەوە، بەڵام هەر ئەوەنـدە دەزانین کە تا ساڵی 1225ی کۆچی (= 1810ی زایین) زینـدووبـووە، چونکـە لەو ساڵـەدا خەریکی رێکخستنی ساڵنامەکەی بووە.

هەروەهـا لە لیستـەی والییـەکـانی بەغـدادا مێـژووی کۆتایی هاتنی حوکمڕانی سلێمان پاشا خوا هرزادەی بە ساڵی 1225 داناوە.

لە هەمـان ساڵـدا عەبـدوڵـڵا پاشـا (بە پلەی یەکەم لە لایەن عەبـدورڕەحمـان پاشـای بابـانـەوە کرابووە وەکیلی وەزیر یارەنگە فەرمـانـی وەزارەتـەکـەی لە مانـگـی (جـمـادي الاول)دا لە ئەستـەمـوڵـەوە گەیشبێتـە بەغـداو رەنجـووریش تا ئەو کاتـە ساڵنامەکەی تەواو نەکردبێ.

دوور نییـە رەنجـووری لەو ساڵـە یان ساڵی پاشتـردا کۆچی دوایی کردبێ چونکە ئەگەر تا کۆتایی حوکمڕانی عەبدوڵڵا پاشا بژ یابایە لەوانە بوو ناوەکەی لە لیستەکەدا تۆمار بکردبایە.

شایـانی باسـە کە هەر لەم لیستـەیـەدا مێـژووی (1225) بۆ کۆتـایی حوکمـڕانی عەلی پاشـا (1217 ـ 1222) دانـدراوە ئەوەش هەڵەیەو رەنجووری خۆی ئەم هەڵەیەی نەکردووە بەڵکوو یەکـێـکـی تر ئەو دووەی کردووە بە پێـنـج و لە لای وا بووە کە سلێمـان پاشـا ساڵی 1225 دوای عەلی پاشـا (کـە دەبێ تێیدا کوژ رابێ) بووە بە والی بەغدا.

وەك چۆن لە لیستەی یەکەمدا یەکێك لە لایەن خۆیەوە ناوی «سلطان محمود» زیاد کردووەو مێژووی (1204)ی بۆ دەست پێکردنی حوکمڕانی یێکەی داناوە، لە کاتێکدا (1223)یە بەلای منـەوە شێـوەی نووسینـەکـەی لە هی رەنجووری جیاوازە ،ئەگەر چی بە هۆی نیـزیکی لێـك چوونیـانـەوە هەست پێکـردنی ئەو جاوازییە لە بەینی هەردوو خەت ئاسان نیە.

ئەم خاڵانە تا رادەیێکی باش ژیانی ئەم شاعیرە کوردەمان بۆ روونـاك دەکـەنـەوە، ئەویش لە رێی بەڵگـەنـامـەوە کە شاعیر بە دەسخەتی خۆی نووسیویە.

لە راستیـدا باشتـرین رێگـە بۆ کۆڵینـەوە لە ژیـانی ناوداران نووسینیـەتی لەبـەر تیشکی ئەو زانیـارییـەدا کە بە خەتی خۆیـان نوسیـویـانن، چ وەك زانیـاری پرژ وبڵاوی سەرکتێبی دەستنووس یاوەك نامەیان بۆ خەڵك ونامەی نووسراو لە خەڵکەوە بۆ ئەوان و هەر فرمان و بریارێکی رەسمی لە بارەیانەوە چونکە ئەمانە هەموو بە بەڵگەنامە (وثائق) دادەندرێن.

لێـرەدا وای بە باش دەزانیـن کە دەقی لیستـەی چوارەم بهێنینـەوە، لەبـەر ئەوەی زۆربـەی ئەو خاڵانـەی پێوەنـدییـان بە ژیانی رەنجووری‌یەوە هەیە تێیدا بەدی دەکرێن.

لیستـەی سێیـەمیشمـان بەلاوە گرنگـەو لەوانـەیـە چەنـد مێژوویێکی هێندێك لەو رووداوانە لە هیچ سەرچاوەیێکدا ئاوا بە

ردی نەهاتبن لەوانە مێژووی «شەڕی ئاوەگرد» کە یەکجار بایەخدارە بەلامانەوەو داستانێکی نەتەوایەتی کورد بووەو بووەتە هۆی لە نێو چوونی فەرمانڕەوایەتی یێکی کوردی بە ناوی فەرمانڕەوایەتی «کویسنجاق»ەوەو ، شەهید بوونی (عوسمان پاشا)و قوچ پاشای برای دەتوانین ئەم دوولیستەیەو تەنانەت دوو لیستەکەی تریش بە کارێکی مێژوویی ئەم شاعیرە کوردە دابنێین کە گیانێکی مێژوو پەرستی هەبووە.

ئەو کەمە دەستکارییەی ئێمە لەم لیستانەدا کردبێتمان ئەوەیە کە مێژووی ڕووداوەکانمان جویٚ کردووەتەوەو خەتێکمان خستووەتە نێوانیانەوە، چونکە خوێنەر ئاوا پتر سوودی لێ وەردەگرێت ، لەو جێیانەشدا کە ڕەنجووری نیشانەی بۆ مانگە عەرەبی یەکان داناوە ئێمە ناوی تەواوی مانگەکانمان نووسیوە، چونکە هەموو کەسێك بەو نیشانانە (رموز) مانگەکان ناناسنەوە. هەروەها چەند جارێك وشەی (بابان) مان لە لێوان دوو کەواندا نووسیوە بۆ ئەوە کە خوێنەر دەمودەست بزانێ ئەو میرە بابانی بووە.

جێ گوتنە کە بە پێ سەرچاوەی مێژووی لە مێژووی ئەو ڕووداوانە نەکۆلیوینەوەو بە نیازی لێکۆڵینەوەوە نەمان هێناونە ناو ناوانەوە، بەڵکە لە پەراوێزدا لە بڕێکیان دواوین.

ڕەنجووری شالە بەگی لە لیستەی چوارەمدا هێندێك بابەتی دیکەشی باس کردووە. وەك چەند جار هێنانی سەتڵی لە چەرمی گا دروستکراو (دۆلکە) بۆ بیری مزگەوتەکە کە نرخەکەی (نیو قورۆش) بووە.

ئەویش لە یەکێك لەو ساڵانەدا کە دوور نیە (1209)ی کۆچی بێت «1794 ـ 1795ی زایین» چونکە مەلا عومەری ڕەنجووری بە (سهو) «1029»ی نووسیوە.

نووسیویە «حسین بیك» لە ڕۆژی (20)ی مانگی ذو القعدة واتە لە دوادوایی یەکانی ئەو ساڵەدا بۆ کاری ئاو هەڵگۆزتنی بیر کریویە. ڕەنگە هەبێت شتی وا بە بێ بایەخ بزانێ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوسا لە شارو ناوچە دەشتایی یەکاندا کە کانی و کارێزو ڕووباریان تێدا نەبوو ئەو سەتڵانە پێویستی یێکی گرینگ بوون چونکە خەڵك پشتی بە ئاوی بیر بەستووە. لەو شارانەدا وەك کەرکووك وەستاو دوکانی تایبەت هەبوون بۆ دروستکردنی و فرۆشتنی ئەم جۆرە کەرەستەیە وەکوو «حاجی صالح». ناوێك کە وەستای ئەوە بووەو ڕەنجووری لە (ل 334)ی لیستەکەدا باسی ئەوەی کردووە کە دۆلکەیێکی یا بۆ مزگەوت یان بۆ ماڵی خۆی دروستکردووەو هێناویەتیەوە، ئەویش لە سەرەتای مانگی جمادی الثانی ـ «16 ئەیلول»ی ساڵی 1218ی کۆچیدا «1803 ـ 1804ی زایین». ئەم بابەتانە کە پێوەندییان بە باری ئابووری و کۆمەلایەتی یەوە هەیە بۆ مێژوونووس بایەخدارن.

هەروەها باسی (بارانی پەڵە)ی کردووە لە ڕۆژی دووشەممە (3)ی جمادی الاخری ساڵی 1209ی کۆچی «1794 ـ 1795ی زایین»و ڕۆژی دووشەممە (14)ی مانگی ربیع الآخر ی ساڵی (1208)ی کۆچی کە بەرانبەر بە (9)ی «تەشرینی دووەم»

«1793 ـ 1794ی زایین». لە چەند جێگەیێکی تریشدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، وەك پەڵەدانی ساڵی (1210)ی کۆچی «1795 ـ 1796ی زایین»

کە لە پێش نیوەڕۆژی (27)ی تەشرینی یەکەم بەرانبەر بە (25)ی مانگی ربیع الاخر بووەو هی ساڵی (1205)ی کۆچی کەوتووەتە ڕۆژی (22)ی ربیع الاخر (4ی تەشرینی دووەم) (بڕوانە ل 334ی دەستنووسەکە).

بایەخدانی ڕەنجووری بە مەسەلەی پەڵەدان هەر لەبەر ئەوە نەبووە کە ناوبراو حیسابدارێکی بەرزی کورد بووە لەو سەردەمەداو چاوەدێری کەش و ئاووهەوای کردووە، بەڵکە لەبەر ئەوە کە پەڵەدان لایەنێکی گرنگی ئابووری ئەو دەمە بووە کە کشتوکاڵەو جووتیارانی کورد بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەم کاتەیان کردووە تا بتوانن دەخڵیان شین ببێ ئەگەر تەماشای ئەو چوار ساڵەی پێشوویان بکەین بۆمان دەردەکەوێت پەڵەدانیان تێدا دواکەوتووە ساڵی (1209) یەکجار وشك و بێ باران دێتە بەرچاو هەرچی ساڵەکانی تریشن پەڵەیان تێدا پاش نەکەوتووە چونکە دەکەونە نیزیك (5)ی تەشرینی دووەمەوە. بە پێ ڕوانگەی

ستێرناسی (المرصد الفلكي)و ساڵنامەی گراو کە ساڵی 1983 لە دێی «گراو» لە باکوری خۆرهەڵاتی هەولێردا لە سەر شاخی (داری لوکان) دۆزیمانەوە ـ خەڵکەکە «قوچی گەلاوێژ»ی کردووەتە نیشانەی (پەڵەدان). واتە هەر کاتێك خۆر گەیشتە سەر ئەم قوچەبەردە کە لە جێ ئاوا بوونی ئەستێرەی گەلاوێژدا داندراوە لە روانگەکەدا ئەوەش لە گەڕانەوەیدا لە «قوچی گەڕانەوەی سەری هاوین»ەوە کە خولگەی قرژاڵە (مدار السرطان)و نیشانەی کەلووی قرژاڵە بۆ «قوچی ئەووەڵی زستان» کە خولگەی گیسکە «المدار الجدي» ونیشانەی کەلووی گیسکە ئەو دەمە پەڵە دەدات و ڕێکەوتی پێنجی تەشرینی دووەم دەبێت.

لە (ل 4)دا ڕەنجووری باسی بەندکرانی عەبدوڕڕەحمان ئاغا (کور محمد؟) دەکات لە (15)ی مانگی (ربیع الاول)ی ساڵی (1213)ی کۆچیدا (1798 ـ 1799)ی زایین.

لە (ل 5)دا باسی ئەوەی کردووە کە تفەنگی (بەکر بەگ)ی هەڵەدینی لە لا بووەو محەمەدی کوڕی یوسفی ڕەش و عەلی وەیسی یاغەمری نامەی (شێخ ئیبراهیم) یان بۆ بردووە وئەویش تفەنگ و (قالب) ەکەی داوێ و بۆ ئیسماعیل بەگی هەڵەدینیان بردووە.

ڕەنجووری هیچ مێژوویێکی لێرەدا نەنووسیوە لە (1218)ی کۆچی بە دەر کە بۆ بابەتێکی تری بووە. باسی ئەم (بەکر بەگ)ەم لە شێخ کاکە حەمەی شێخ عەبدولکریمی شەدەڵە پرسی، گوتی نازانم کێیە، ناوی محەمەد بەگی هەڵە دێنم بیستووە کە خاوەن دەستەڵات بووە وئێستاش بنەماڵەیان لە هەڵەدن ماوە.

لە (ل 99)دا مێژووی کۆچی دوایی کردنی سلیمان خضر ڕۆژبەیانی نووسیوە کە ڕێکەوتی (27)ی مانگی ڕەجەبی ئەوی هەیینی ساڵی (1205)ی کۆچییە «1790 ـ 1791»ی زایین.

شایستەی باسە کە مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی لە گوتاری المعروفون من الروژ بيانيه (الروزبهانيه) في الكتب التاريخيه)دا کە لە ژمارە یازدەی گۆڤاری دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراقدا بلاوکراوەتەوە، باسی خدربەگی ڕۆژ بەیانی دەکات و دەڵێت لە نیوەڕاستی سەدەی دوازدەهەمی کۆچیدا سەرۆکی خێڵی ڕۆژبەیانی بووەو چەند کوڕێکی هەبووە ـ لەوانە مەلا حامید بەگ ،سەیفی بەگ، خالید بەگ و ناوی ئەوانی تری نەهێناوە.

دەڵێت خدر بەگ خانوویێك و زەوی‌و زاری تری هەبوون لە کەرکووك جادوور نییە ئەو سلێمانەی کە ڕەنجووری مێژووی کۆچی دوایی‌کردنی نووسیوە کوڕی ئەم خدر بەگە بوو بێت.

هەر لەو لاپەڕەیەدا مێژووی کۆچی دوایی کردنی (شێخ موسای شێخ عەلی مۆرتکە)ی بە (1)ی مانگی شعبانی ساڵی (1205) داناوە لە دێی کوفریدا. ئەم کابرایە برای شێخ مەحموودی مۆرتکەیە کە لە لیستەی چوارەمدا مێژووی کۆچ کردنەکەی هاتووە.

ئەگەر چی زانیاریمان لە سەر ئەم کەسانە نییە بەلام دوور نییە لە پاشە ڕۆژدا شتی نوێیان لە بارەوە بە دەست بخەین و، ئەوساش پتر پێویستمان بەو مێژووانەی ڕەنجووری دەبێت.

## لیستەی چوارەمی ڕەنجووری

| | |
|---|---|
| 1126 | وفات شيخ اسماعيل أبدا لانی قدس الله سره العزيز |
| 1157 | وفات شيخ عبدالله ولدی شيخ اسماعيل قدس سرهما. |
| 1133 | تولد شيخ احمد ابن شيخ عبدالله (أبدالانی) |
| 1219 / 2 (ربيع الآخر) | وفاتش (شيخ احمد ابدالان) رحمه الله يوم الثلاثاء قبل الزوال. |
| 1201 | وفات شيخ عمر ابن شيخ عبدالله ابدالاني، |
| 1196 | آمدن سليمان پاشای وزير والی بغداد بخانه كشه دفعۀ اول |

| | |
|---|---|
| 1196/ 12 ذو القعدة | وفات ملا يوسف كاريزى |
| 1209 /6 ربيع الآخر روزيكشنبه | وفات شيخ محمود بن شيخ علي مورتكه |
| 1164 | تولد عمر رنجورى |
| 1178 | بلوغش (يانى بالغ بونى رەنجورى) |
| 1190 | سال توبه |
| 12/1205 را (ربيع الأول) | تولد خالد بن فقي صالح |
| 1192 | انكاح سلطانه بنت شيخ عيسى |
| 8/1204 ع | انكاح آمنه بنت الشيخ |
| 1197 | انكاح شهناز ازاخو ام فقي صالح درماه محرم وآوردنش در غرۀ صفر المظفر |
| 1193/ يوم الثلاثاء | تولد مصري نصف المحرم |
| 5/12012 ج (جمادى الآخر) | شوهر كردنش (يانى مصرى) |
| 13/1197 ذي الحجة | تولد فرزندى اسماعيل در آخر ايام تشرين (9) |
| 23/1203 ربيع الأول وقت الفجر روز 3 شنبه | وفات سلطانه |
| 1196 | درخدمت شيخ حسين رفتن به بغداد |
| 1192 | درخدمت شيخ بطاقوق رفتن درعقب حسن پاشا والى بغداد (10) |
| 19/1197 ذوالقعدة | آوردن خانه بنز (بنزد) مسجد جديد وتعمير او |
| 15/1201 ص (صفر) | آوردن خانه از آغجه لر بنزد مسجد جديدة در كركوك |
| 27/1198 شوال | وفات همشيرام سارى |
| 26/1216 ل (شوال) دروشنبه (دردوشنبه) 9 ذو القعدة داخل كوئه | نصب محمد پاشا ولد محمود پاشاى كوى |
| 1213 ذي الحجة يوم الجمعة وقت جاشت روز دوم أيام تشرين | وفاة آمنه بنت الشيخ |

| | |
|---|---|
| 21/1215 ربیع الآخر جمعه | انکاح صراحیٰ بنت فقی صالح ئەز فقی اسماعیل فرزندی ام ودخ (ودخل) بها 26 (ربیع الآخر) 3 شنبه |
| 3/1209 جمادی الآخر روز دوشنبه | وفات خدیجة حسن فرامز |

## لیستەی سێیەمی مەلاعومەری رەنجوری

(تاریخ والیها (ی) کردستان وغیر (11)

| میژوو | روداو |
|---|---|
| 1110 | شکست میر سلیمان (12) |
| 1120 | شکست بکربیگ (13) |
| 1136 | فتح همدان |
| 1160 | قتل نادرشا درحوالی مشهد وکلات |
| 1152 | قحطی مشهور |
| 1146 | شهیدشدن طوپال عثمان پاشا درقرب آغجەلر (14) |
| 1145 | امدن طهماسب برادرزادهٔ نادرشا |
| 1171 | آمدن شیخ علی خان |
| 1169 | تسلط وکیل دولت کریم خان زند |
| 1155 | سال قونباره |
| 8/1160 رمضان | دعوای قم چوغه(15) |
| 1176 | سوختن شهربان بدست خطرآغا |
| 26/1164 رمضان (روژی)خمیس | فتح آب کردوقتل عثمان پاشای‌کوی(16) |
| 1143 | قتل خانه پاشا (17) |
| 1166 | فتح سنجار |
| 1175 | قتل محمد پاشا قرەداغ درپی‌باز(18) |
| 1178 | قتل سلیمان پاشای بابان (19) |
| 25/1163 شعبان | شکست حسن آلی خان |
| 1171 | طاعون قلعه چوالان وآمدن بادینی |
| 1156 | وفات خالد پاشا |

| | |
|---|---|
| 1170 | قتل سليم پاشا (20) |
| 1189 | آمدن شفى خان (21) |
| 1188 | شكست على مراد خان ومحمد پاشا(22) |
| 1191 | شكست خسروخان در زره‌بار(23) |
| 1186 | وآمدن بكر بيك برادر پاشاى وزير بكركوك |
| 1192/25 صفر | قتل تيمور پاشاى كوى (24) |
| 1192/27 جمادى الآخر | وفات احمد پاشاى بابان |
| 1192 | قتل شوره پاشا |
| 1194 /رمضان | قتل محمد پاشا وعمر پاشا |
| 1202 | جنگى بكرآغاى عزير باخلق كركوك |
| 1198/6 جمادى اإول يوم الأحد | قتل محمود پاشا بابان درمحال |
| | ضاوغ بلاغ ويلتمر (25) |
| 1202 | وفات محمود پاشاى كوى (26) |
| 1204/9 جمادى الأول | وفات عثمان پاشا (بابان(دربغداد |
| 1199 | تعميرسليمانيه وتخريبى قلعه |
| | چوالان (27) |
| 1206/7 ذوالقعده | فتح تمر پاشاى مللى (28) |
| 1216/26 ل (شوال) يوم الأحد | نصب محمد پاشاى كوى (29) |
| | رفتن عبدالرحمن پاشا ببغدا بعداز |
| 1212/ غرهٔ رمضان | قتل أحمد كهيا خربنده اوغلى وعزل شدن او أزحكومت سليمانيه |
| 1212/16 ذوالقعده | نصب ابراهيم پاشا برسر سليمانيه‌فقط |
| 1215/5 ذوالقعده | آمدن تمر پاشا (مللى) بكركوك بجهت حكومت عرفا |

# پەراوێز

(1) ئەم (مجموعە) یە کە بەدەسخەتی ڕەنجووری‌یە بریتیەلە (12) کتێب وناميلکەو نووسينی پرژ وبلاو کە لەسەر لاپەرەيێك يان پتر نووسيونی. ئەمانەن:

1 ـ کتێبی: لمع اليسيرة لەبابەت ماتماتيکەوە.

2 ـ باب الفرائض لە تحفة ابن حجر لە سەرەتای مانگی ڕەجەبی ساڵی 1205 دا نووسيوە.

3 ـ کتێبێك لەسەر (الفرائض).

4 ـ بابەتی نيکاح لە تحفة ابن حجر.

5 ـ بابەتێك لە تحفة ابن حجر، (20)ی (صفر)ی (1207)ی کۆچی نووسيوە.

6 ـ طلاق الأكراد «ايقاد الضرام على من لم يقع طلاق العوام» هی زانایکورد (ابن الحاج)ە. لە کۆتايی‌يێکەی نووسيويە «كتبه الرنجوری‌بن خالد بيك سنة 1206/12س» واتە (12)ی مانگی شعبان.

7 ـ هەڵبەستێك (منظومة)ی سيوطي ساڵی 1206 نووسيوە.

هەروەها (شعری کلشن) پەرەيێکە وا لەسەر پەراوێزی ئەم مێژووە «1224 و 25 دا 21 کانون أول و 9جدي»، واتە ساڵی 1224 و 25 ذو القعدة.

8 ـ طبقات الشافعية هی ابوبكر بن هداية الله (المصنف الكورانی)يە، لەکۆتايی‌يێکەی نووسيوە: من يد أحقر العباد و افقرهم الى رحمة الله تعالىٰ ابن خالد بيك عمر الرنجوری غفر لهماو لكافة المسلمين آمين 1206 في غرة شعبان».

9 ـ شرح قصيدة الشيبانی في علم الكلام، ساڵی 1207، «27را» واتە لە 27 (ربيع الاول)دا نووسيوە.

10 ـ شرح محمد بن عمر التلمسانی علىٰ قصيدة السنوسي. ساڵی 1206، 15 ربيع الآخرة نووسيوە پەراوێزێکی ڕەنجووری خۆی بەسەرەوەيە.

11 ـ اختلاج نامە. بەفارسی. ساڵی 1206، 19ی ڕەجەب کۆتايی بە نووسينی هێناوە. پاش ئەوە پەرەيێك هەيە بەناوی «بانك كردن كلاغ» و «بانك كردن گوش»ەوە. ئەمجا هەرچوار ليستە مێژووی‌يەکەی ڕەنجووری دێن.

12 ـ خشتەيێك بەناوی گيانلەبەرانەوە. چوار لاپەرەش بەدوايدا دێ لە هەمان بارەوە. بابەتی ئەم دەستنووسە فارسی‌يە بەلای منەوە سەيرو نائاشنايەو لە (ل 335 ـ 339) دەگرێتەوە.

(2) کتێبی «سراج السالكين»، شێخ حسێنی قازی سلێمانی بەزمانی فارسی لەسەر چەند ڕێبازێکی سۆفيگەری «تصوف» داناوە، وەك ڕێبازی قادری نەقشبەندی، چشتی‌و خلوەتی. پێشەکی‌يێکەی ئەمەيە:

«الحمدلله الذي نقه قلوب العارفين بنور معرفته وشرح صدور المحبين بسر محبته..» دانەيێکم لەم کتێبەديوە بەدەسخەتی مەلامحەمەدی هەوايی‌يە کەساڵی 1323ی کۆچی لە دێ ترپەسپيان نووسيويە. ئەم دانەيە 37 لاپەرەيەو هەر لاپەرەيێکی 18 دێری تێدايە. ئێستا وا لەلای بەرێز مامۆستا مەلا سەعدوڵلای کوری لە بەغدا. ئەم کتێبە لە بابەتی خۆيدا بەنرخە.

مامۆستای زانا شێخ محەمەدی خاڵ لە کتێبی (الشيخ معروف النودهي /ل 83)دا بەسەرهاتی ژيانی شێخ حسێنی کوری شێخ مەحموودی نەقيبی نووسيوەو ،گوتوويە ساڵی 1292ی کۆچی (1875ی زايين) کۆچی دوايی کردووە و ناوی چوار کتێبی هێناوەو دەڵێت زۆر شيعری کوردی‌و فارسی ئەوم لايە. مامۆستا مەلا عەبدو لکەريمی مودەرريس لەکتێبی (علماؤنا في خدمة العلم والدين /ل 174 ـ 175)دا باسی ژيانی ناوبراوی لە هی مامۆستا خاڵ وەرگرتووە. ئەوەی شايانی باسە شێخ حسێن ساڵی 1264ی کۆچی (1847 ـ 1848ی زايين) قازی سلێمانی بووە، وەك لەشەجەرەی سەييدەکانی شابەديندا دەردەکەوێ کە ڕۆژی 23ی شەووالی ئەو ساڵە بروانامەی ڕاستيی پێداوە.

(3) بەردی کونەمێروو بەردێکی گەورەيە لەنێو ڕووباری زێی گچکدايەو هەموو لايێکی ئاوە.

دەکەوێتە ئەو راستەوە کە زێیەکە لە خوارووی دووریانی دوکانی کۆن و تازەدا پێچ دەکاتەوە وزیاتر وابەلای قەراخی خۆرهەلاتی زێوە و لە رێگەی گشتییەوە دیارەو هەر ئەم بەردە بەو شێوەیە لەو ئاوەدا هەلکەوتووە. ئەم بەردە کونەمێروویێکی پر لە مێرولەی تێدایە لەبەرئاو ریێ پەرینەوەیان نییە. ئەم بەردە لەکن خەلك بەناوبانگەو نازاندرێ ئەو مێرولانە لە کوێ خواردەمەنی بەدەست دێنن، ئاخۆ ژێر زێیەکە کونی وەهای لییە بۆ قەراخ کە هاتووچۆی پێدابکەن، یان رێگەی‌تریان هەیە بۆ ژیان وینەشمان گرتوە

(4) کەچووم بۆ چوارقورنە ئەو کەسانەم لە خێلی شالەبەگی دیت، حاجی ئەحمەد، کوێخافەتحولـلا، محەمەدی حجی ئەحمەد، زرار بایز رەسوول مام ئاغا، محەمەدو جوامێرو پێروت هەرسێ کوری حسێنی مام ئاغا. پێش چوونم بۆ ئەوێ سوودم لە کاك عەزیز مەلا ئەحمەدی گرجانیی بلباسی‌و حاجی صالح حەسەنی کولەردی‌و سەلیم عەرەب سۆفی فەتاحی جاسەنەیی‌و شێخ رەزای شێخ محەمەدی باسەرەیی ـ وەرگرت. ئەمەی دوایی‌یان هێندێك زانیاریی لەبارەی باوکیەوە داینێ کە لەجاسەنە لەگەلّ شێخ مەحمووددا بەشداریی شەری کردووەو یەك دوو سالّ لای ئینگلیزەکان بەندکراوە و سالّی 1937 کۆچی دوایی‌کردووە. شالەبەگیان لە دێهاتەکانی سەر بە شێخ محەمەد وشێخەکانی تالەبانی لای کۆسرەتەوە کشتوکالّیان کردووە، وەك: باسەرەو شوشکاو کەلکان و میوژە. کاك دلشاد تۆفیق مەلا صدیقی رانیەیی ئەو زانیارییانەی بەدەنگی شێخ رەزا تۆمارکرد بۆمان.

(5) مەلا محەمەد ئەمین هەوایی کوری مەلا ئەحمەدی دووشوانی‌یە، سالّی 1341ی کۆچی (1922 ـ 1923ی زایین) کۆچی دوایی کردووە. وەك مەلاشەریف و خوالێ خۆشبوو (مەلا طەیب)ی جووتەبرای ناوبانگە باش بووەو، هێندێك شیعری کوردیشی هەیە.

مەلا محەمەد ئەمین لەخانەقا لەشاری کەر کووك خوێندوویەو، پێدەچێت خانەقاکە ئەوەی سەیید ئەحمەدی خانەقا بێ چونکە لەوێ خوتبەیێکی بێ نوقتەی نووسیوە، ئەویش لە سالّی 1308ی کۆچیا (1890 ـ 1891ی زایین) وەك لە کۆتایی‌یێکەیدا نووسیوەیەو لەنێو کۆمەلە دەستنووسێکدایە کە بەخەتی خۆیەتی (مجموعة خطية).

سالّی 1311ی کۆچی (1893 ـ 1894ی زایین) لە قوتابخانەی مەلا محەمەد صالحی موفتی لەکۆیە خوێندوویە، هەروەك لە کۆمەلە نامەیێکدا (منشآت) نووسیوەیەو لە (20)ی موحەررەمی ئەو سالەدا کۆتایی پێ هێناوە. لە (20)ی (جمادي الاول)ی ئەو سالەدا وەك خۆی تۆماری‌کردووە، کۆمەلەنامەیێك (منشآت)ی تری نووسیوە. وەك لە کۆتایی کتێبی «نصاب الصبیان»دا کە بەخەتی خۆی‌و لە (20)ی (جمادي الاول)ی ئەو سالەدا دوایی پێ‌هێناوە، سالێ 1314ی کۆچی (1896 ـ 1897ی زایین)لە مزگەوتی گەورەی کۆیە لای مەلا عەبدوللای جەلی خوێندوویە. ئەم کتێبە فەرهەنگێکی فارسی ـ عەرەبی‌یەو بەشیعرە، هەر پارچەیێك لەو کتێبە وەك (نوبهارا ئەحمەدی خانی) بەحرێکی عەرووزی تێدا بەکارهاتووە.

هەر لەو مزگەوتەدا ئەو یادداشتەی مەلا عەبدوللای جەلی نووسیوەتەوە کەلەنێو کۆمەلە دەستنووسی خەتی هەواییدایەو باسی چوونی خۆی دەکات بۆ ئێران بۆ گەراندنەوەی ئەو کوردانەی کە هەلاتبوون بۆ ئەوێ.

مەلا محەمەد ئەمین کۆمەلە نامەیێکی زۆری فارسی‌و عەرەبی نووسیوەو گەلێکی تریشی کۆکردووەتەوە. برێکیان هیی زانایانی کوردن، وەك نامەی شێخ حەسەنی گلەزەردە (کە لە سەدەی هەژدە هەمدا کۆچی دوایی کردووە) لە وەلامی نامەی (ناردشا)داو نامەیێك شێخ حسێنی قازی و، نامەمەی (زینی دحلان) موفتی‌و مێژوونوس لە سعودیة بۆ مەلاعومەری باوکی مەلا ئەفەندیی هەولێری‌و، برێکی‌باش لە نامەکانی مامۆستاکەی زانای گەورە مەلا عەبدولـلای جەلی ـ وەك نامەی بۆ شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحموودی نەمر و بۆ شێخ بهاء الدینی بامەرنی و بۆ شێخ عومەری بیارەو بۆ شێخ حوسامەددینی تەوێلەو بۆ شێخ حەسەنی کانیی کە بودی‌و بۆ مەلا عەلیی کانیی کەبودی‌و

بۆ کەسانی تر. ئەوانە هەموو لەو کۆمەڵە (مجموعة) دەستنووسەدایە کەوا لەلای بەڕێز مەلا سەعدوڵڵای کوڕی. من کۆکردنەوەی ئەم کۆمەڵە نامەیە وەك (مجموعة الرسائل) کە بەعەرەبی هەیە بۆ فێربوونی نامەنووسین ـ کە مەلامحەمەد ئەمینی هەوایی کۆی کردوونەوە بەکارێکی پێویست دەزانم ئەگەر بەناوی ناوبراوەوە بەچاپ بگەیێندرێت. لەبارەی ژیانی هەوایی‌یەوە هێندێك زانیاریم بەدەنگی مامۆستا مەلا شەریف تۆمارکردووە.

(6) شێخ محمد مردوخ: مێژووی کوردو کوردستان، بەشی یەکەم، ل 169 (بەفارسی)و بەشی دووەم ل 95. وەرگێڕانی محمدفدا، چاپی 1958.

مامۆستای خوالێ خۆشبوو عەلائەدین سەجادی لە (مێژووی ئەدەبی کوردی /ل87، چاپی دووەم)دا ناوی مەلا یونسی هەلکاتینی هێناوە. لەل 608دا دەڵێت دوکتۆر کەمال فوئاد لە دەستنووسە کوردییەکانی ڤزبادن دا گوتوویە:

مەلایونس خەڵکی خیزان (هیزان)ەو خاوەنی کتێبی (تصریف و طروف و ترکیب)ە بەزمانی کوردیو ساڵی 1785 کۆچی دوایی کردووە.

یوسف ضیاء لە (الهدیة الحمیدیة)دا گوتوویە: تصریفا کرمانجی هیی مەلا حسێنی شیفکی‌یە (کەخەڵکی مکسێ)یە، واتە گەڕەکی شیفکا ئەمە شیفکانی ناوچەی مزوری‌نییە. تەماشای (دیوانا کرمانجی ل 116 ـ 117)بکە، لەگەڵ دەفتەری (شازدەهەم) ژمارە (32) لەزنجیرەی ژیانی ناودارانی کورد کەکتێبێکی گەورەمانەو دەستنووسە.

(7) دەربارەی سلیمان پاشا وعبدالله پاشا تەماشە (دوحة الوزراء ل250) بکەیێ شێخ رسولی کەرکوکی.

(8) ڕەنگە ئەم مەلا یوسفی کارێزی‌یە ئەو (کارێزی)یە شاعیرە بێ کە ڕەنجوری پێنج خشتەکییەکی لەسەر هۆنراوەیێکی ئەو هەیە (بروانە: دیوانی ڕەنجوری، ل 231).

(9) ڕەنجوری دیاریی نەکردووە کە ئاخۆ تشرینی یەکەمە یان دووەم ،بەڵکو بە تەنیا نووسیویە «تشرین».

(10) شێخ ڕەسوولی کەرکوکی لە (163)ی کتێبی «دوحة الوزرای ـ چاپی بەیروت»دا باسی دامەزرانی حەسەن پاشادەکاو، دەڵێ: پاش کۆچکردنی عەبدوڵلا پاشای والیی بەغدا محەمەدبێك و ئیسماعیل کهیە هەردووکیان هەوڵیان دا ببن بە والیی بەغداو، بەو هۆیەوە ئاژاوەو دووبەرەکی پەیدابوو.

جاکە حەسەن پاشای والیی کەرکوك نامەیێکی بۆئەستەموڵ نووسی‌و دەوڵەتی لە بارودۆخی بەغدا ئاگادار کردەوەو خۆی بۆ ئەم کارە دەست ـ نیشان کرد، پەسندکرا. کەچی حەسەن پاشا لەبەر ناکۆکیی نێوان میرەکانی کوردستان و بەتایبەت شەڕوشۆڕی نێوان محەمەد پاشای بابان و ئەحمەد پاشای برای، ماوەیێك لە کەرکوك مایەوەو نەچووە بەغدا. ئەو ناکۆکییە هەر دوو دەوڵەتی عوسمانی‌و ئێرانی خستە جەنگەوە. مێژوونووسی ناوبراو بەدووروودرێژی باسی ئەورووداوانەی کردووە (بروانە ل163 ـ 166ی کتێبی باسکراو). حەسەن پاشا نەیتوانی چارەسەری باری بغداو بگرە عێراقیش بکا، بۆیە تەنیا حەوت مانگ و (28) ڕۆژ فەرمانڕەوایی کردو ،پاشتر لە ناوچەی دیاربەکر کۆچی دوایی کرد.

(11) پیتی (ی)ی دووەم لە وشەی «والیهای» نەنووسراوە.

(12) شکست میرسلیمان ساڵی (1110)ی کۆچی (= 1698 ـ 1699ی زایین):

مەبەستی (سلێمان بەبە)یە ،کە بەپێی قسەی خوالێ خۆشبوو محەمەد ئەمین زەکی ،کوڕی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەیە یا لە نەوەیەتی‌و قەڵاچوالانی کردووە بە مەڵبەندی فەرمانڕەوایی بابان. دوای چەند سەرکەوتنێکی میر ـ سلێمان بەسەر لەشکری عوسمانیدا، عوسمانییەکان لەشکرێکی تری زۆریان لە بەغداو دیاربەکرو حەڵەبەوە هێناوەتەسەری‌و، لەم جارەدا شکاوەو بەپێی کتێبی «کلشن خلفا» ئەم شکانەی لەساڵی (1111)دا بووە. پاش ئەوە بردراوە بۆ ئەستەموڵ و لەوێ لیێ خۆشبوون و گەڕاوەتەوەسەر فەرمانڕەوایی‌یەکەی خۆی «بروانە: محەمەد ئەمین زەکي، تاریخ سلیمانی‌و ولاتی، چاپی کوردی،ل (54 ـ 56)».

ڕەنگە مێژووەکەی ڕەنجوری ڕاستتربێ‌و ،شەڕەکەی لەو ساڵەدا بووبێ‌و ،چوونی بۆ ئەستەموڵ لەساڵی (1111)ی کۆچیدا بووبێ.

لە لاپەڕە (296)ی «کلشن خلفا /چاپی نەجەف ـ 1971»دا کە نظمی زادە مرتضیٰ أفندي و موسیٰ کاظم نورس لە تورکییەوە کردوویانە بەعەرەبی، ئەو بابەتە بەم جۆرە هاتووە :ـ لەساڵی (1101)ی کۆچیدا « بەهەڵە 1100 نووسراوە» میرسلیمان و میر حەسەنی بەبە تا نێزیکی کەرکوك هێرشیان هێناو (دلاوەر)ی موتەصەریفی کەرکوك لەشەڕدا کوژرا. دەقی نامەی والیی بەغدا حەسەن پاشا بۆ میرسلێمان لەم سەرچاوەیەدا بڵاوکردراوەتەوەو، ئەویش دەردەخاکەوا چەند ساڵێکە میرسلێمان دەستی بەسەر ناوچەی سلێمانیدا گرتووە.

شایانی باسە کە ئەو زانیارییەی ئەمین زەکی دەیداتە پاڵ (کلشن خلفا) لەم چاپە عەرەبییەدانییە لەوانەیە لە چاپێکی تریدا هەبێ و خوالێ خۆشبوو، دیبێتی .ئەم سەرچاوەیە هەر ئەوەندەی تێدایە کە ساڵی (1112)ی کۆچی (= 1700 ـ 1701ی زایین) میرسلێمان فەرمانڕەوای ناوچەی شارەزوور واتە ناوچەی سلێمانی نەبووە ،بەڵکە (یوسف پاشا) فەرمانڕەوایی کردووە. دوورنییە دەوڵەتی عوسمانی ئەو کارەی پێ سپاردبێ‌و بابانی نەبووبێ.

هەر لەم بارەوە بڕوانە: «لونگریك، أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث، ترجمة جعفر الخياط، ص 119».

(13) شکست بکربك ساڵی (1120)ی کۆچی ( = 1708 ـ 1709ی زایین):

مەبەستی مەلاعومەری ڕەنجوری بەکربەگی برای میرسلیمانی بەبەیە، کە بە پێی قسەی ئەمین زەکی بەگ، دوای برای تەیمورخان بووەتە میری بابان.

مێژوونووسی گەورە محەمەد ئەمین زەکی لە لاپەڕە (59)ی «تأريخ سليماني»دا دەڵێ: حەسەن پاشای والیی بەغدا لەساڵی (1126)ی کۆچیدا (= 1714ی زایین) لەشکری بردووەتە سەر بەکر بەگ و شکاندوویە پاشتر بەکربەگ بەدزییەوە چووەتە بەغداو لەوێ ناسراوەتەوە و بەفەرمانی حەسەن پاشا کوژراوە. لەم ڕووەوە تەماشای لاپەڕە (328)ی «کلشن خلفا»کە.

هەر لە لاپەڕە (329)ی ئەم سەرچاوەیەدا ئەوە خراوەتەڕوو کە کوڕەکەی ئەحمەد پاشای وەزیر لەساڵی (1127)ی کۆچیدا کراوە بە والیی شارەزوورو بووەتە فەرمانڕەوای ناوچەی سلێمانی.

(14) طوپال عثمان :ـ سەرلەشکرێکی چالاکی عوسمانی بوو، لەیۆنان لە دایك بووەو، لەشەڕێکدا لەگەڵ سوپای نادر شادا لەساڵی (1146)ی کۆچیدا (=1733 ـ 1734ی زایین) کوژراوە. ئەوەکا هێندێك مێژوونووس بەڵکە زۆربەیان دەڵێن لەناوچەی (لەیلان) بەکوشت چووە (بڕوانە: لونگریك، أربعة قرون من تأريخ العراق الحديث، ص 178). هەروەها لۆنگریك دەڵێ ئەم کارەساتە لە 26 ـ ی تشرینی یەکەمدا بووە، بەڵام ڕەنجوری لەڕووی شوێنی کوژرانیەوە دەڵێ لە ئاغجەلەر بووە. لەم بارەوە بڕوانە (تأريخ ماردين / ص174)ی عەبدولسەلام ماردینی .دانەیێکی وێنەگیراومان لەسەر دانە دەستنووسەکەی «دار الكتب و الوثائق القومية» قاهیرە لەکن هەیە.

(15) دەعوای قەمچووغە لە زەمانی سەلیم پاشای باباندا ڕووی داوە ئەو دەمە کە ئەحمەد پاشای والیی بەغدا بەهێزێکی زۆرەوە پەلاماری میرنشینی بابانیدا، شێربەگی برای سەلیم پاشا لەگەڵ هێزێکی باشدا بە قەڵای قەمچووغەوەبوو کە قەڵایێکی سەختەو دەکەوێتە سەردەربەندێکی زنجیرە چیای سورداشی باشووری خۆرهەڵاتی (دوکان). هەرچی سەلیم پاشاش بوو خۆی لە قەڵای (سرۆچك) توونکردبوو. لەشکری عوسمانی قەمچووغەیان داگیرکرد، بەڵام شێربەگ نەکەوتە بەر چنگیان. لە دوایدا پەلاماری سرۆچکیان داو، سەرئەنجام هەردوولا پێك هاتن و ،ئەحمەد پاشا گەڕایەوە بۆ بەغداو لە ڕێ لە دەلی عەباس ،مرد.

جا کە سلێمان پاشای زاوای ئەحمەد پاشا بوو بە والیی بەغدا، سەلیم پاشا زاوای ئەحمەد پاشا بوو بە والیی بەغدا، سەلیم پاشا هێنایە لای خۆیو، ئەویش لە ڕازونیازی

تێ نــەدەگــەیشت و لە بەغـدا ساڵی 1170ی کۆچی (1756 ـ 1757)ی زایین لەسێدارەی دا.

عبـدالـرحمن السویدي بەبۆنەی سەرکەوتنی ئەحمەد پاشا لە شەڕی قەمچوغـەداو پەلاماربردنەسەر (سرۆچك) هۆنراوەیێکی (54) دێــڕیی هۆنـدەوە کە تێیـدا کوردی کردووەتـە نەوەی «ماء السمـــاء»ی عەرەب لەپێی قســەوقسـەڵـۆکێـك کە لە مێـژووی ئیسلامدا هەیە ئەوەتا دەڵێ:ـ

« وظن زعماً بنو ماء السماء بأن
ينجو ب (قمجوغة) من حادث جلل
اذ حصنها محكم البنيان مرتفع الأركان
شاهق أربى فوق كل على
خرقاء راسخة في الأرض شامخة
في الجو ناجمت العيوق في الحمل»

پاشتر کە ستایشی سەختیی دەکاو، دەریدەخا دەکەوێتە نێوان دوو شووراوە، دەڵێ: «وشار (شير) على أعوان نجدته بأن نعجل سيرا لاعلى مهل».

تەماشـای کتێبی سویـدی «حـديقة الزوراء في سيرة الوزراء ،ص 93 ـ 95» بکە کەدەستنوسە لەنامەخانەی (القادرية)دایە لە بەغداو نمرەکەی (س 1355)ە.

شێــخ ڕەســوولی کەرکـوکی لە«دوحـة الـوزراء، ص 93 ـ 94»دا، باســی شەڕی قەمــچــوغــەی کردووەو مێــژووی (1160)ی کۆچــیــی (1747ی زایـیــن) پێداوەو، ڕۆژی ڕوودانـەکـەی کە هەشتی مانگی ڕەمـەزانـە ،دیاریی نەکردووە. عبدالرحمن السویدی یش هەر دەست نیشانی نەکردووە. لەوانەیە ڕەنجـوری خۆی ئەم مێـژووەی نەهێـنـابێ، بەڵکـو لەسەر برێك دەستنووسی نووسراو لە کوردستاندا یا لە هێندێك مەلاو فەقێوە وەرگـرتبێ. ئەم مێـژووانـە زۆرجـار لەسەر کاغەزێك یان لەسەر بەرگ و قەراخی لاپـەڕەی دەستـنـووسێـك ،نـووسراون. محەمەد ئەمین زەکیی ڕەحمـەتی لەلاپـەڕە (68)ی (تـاریـخ سلێمانی)دا بەکورتی باسی شەڕی قەمچوغەی کردووە.

(16) آب کرد «ئـاوەگـرد»، وەك لێمـان کۆڵیوەتەوە، چیایێکە دەکــەوێتــە باکــوری خۆرهــەڵاتی کۆیــەوە. شێـخ ڕەســوولی کەرکـوکی لە «دوحـة الـوزراء، ص 116 ـ 117»دا زۆرباش باسی ئەم داستـانـەو هۆیـەکـانیی کردووە. بگرە لەهەموو مێژوو نووسێکی دیکــە چاکتــر. ئێمــە لە هۆنـراوەکـەی عبـدالـرحمن الســویـدی بەدەر، لەهیــچ سەرچـاوەیێکی تـردا نەمـانـدیوە لەبەر ئەوەیشــە کە شەڕی ئاوەگــرد و باسی عوسمــان پاشــای کۆیــە کەقـارەمـانێکی وڵاتپـەروەری کورد بووە: نەکـەتووەتە بەر چاوی مێژوونووسانی کورد.

کەرکووکی لەبارەی ڕووداوەکانی ساڵی (1160)ی کۆچییەوە «1747ی زایین» دەڵێ: سەلیم پاشای بابان لەزەمانی نادرشاوە گومـانی لێدەکـرا ویـاخی دەبـوو. تا لەم دوایی یـەدا «پـەیمانی لەگـەڵ موتـە صەڕیفی کۆیـە عوسمـان پاشا دا بەست و، جۆی بوونـەوەو سەربـەخـۆیی ڕاگـەیـانـد»و لەنـاوچـەی کوردەواریـدا دەسەڵاتیان پەیداکرد و وردە وردە دەستیان بەسەرداگرت.

ئیـدی وەزیـر ،(واتـە سلێمان پاشا أبو ليلةی والی بەغدا)، نەیـدەتـوانی بەبێ دەنگی بمێنێتـەوە، بەڵکـە کەوتە لەشکرکێشی و جەنگ کردن لەگەڵ شۆڕشگێڕاندا.

لەئـەنجـامـدا بەسـەریـانـدا زاڵ بوو وەسـەلیم پاشا هەڵات و پەنـاوی بردە بەروڵاتی ئێـران و، ئامـۆزاکـەی (سلێمـان پاشـای بابان)لە جێی خۆی کرابە موتەصەڕیفی بابان. بەڵام عوسمان پاشـا پەنـای نەبـردە ئێـران، چونکـە پێشتـر خراپـەی دەرهەق بە ئێرانییان کردبوو. ئیتر ڕووی کردە لایێکی نەزانداراو کاتێك وەزیر گەڕایـەوە کەرکـوك و چەنـد ڕۆژێـك تێیـدا مایـەوە، بیستی کە عوسمـان پاشـا هێـزەکـەی خۆیی کۆکـردووەتەوەو خۆی لەچیای ئاوەگرد (آب کرد) قاییم دەکا.

ئەوجـا سلێمـان پاشـا بڕیـاریدا هێـزەکـەیـان لە ناوبـا بۆیە گەڕایـەوە ناوچـەکـەو ئابڵوقـەی دان لە قەڵاو جێگەسەختەکانداو ئاوی لێ برین. ئەگەرچی عوسمان پاشاو هێزەکەی ئازایەتییەکی وەهـایـان پێشـان دا کە لەوە پتـرنـابێ، بەڵام لە پاشـدا شکان و

زۆریـان لێ‌كـوژراو، عوسمـان پاشـاو براكـانی (ئیبراهیم بەگ و سلێمـان بەگ) وحـەسـەن بەگی كوڕی بە دیـل گیـران و وەزیـر سەری برین و ناردنی بۆ ئەستانە (ئەستەموول).

شێخ ڕەسوول بەسەرهات و چارەنووسی (قوچ پاشا)ی برای عوسـمـان پاشـایـشـی ڕوون كردووەتـەوە كە بەلای مێژوونووسانمانەوە ئاشكرانەبوو قوچ پاشا ئەو پالەوانە كوردە بووە كە بەرانبەر لەشكری نادرشا دلێرییەكی كەم وێنەی نواندووەو، بەخـۆیو هێـزەكـەیەوە چووەتە (موسل) هێندێك لەشاعیرانمان، وەك حاجـی قادری كۆیـی، ستـایـشیـان كردووەو حوكمـەتی عوسمانی‌یش لە پاداشتی ئازایەتییەكەیدا كردوویە بە فەرمانڕەوای هەولێر.

شێخ ڕەسوول دەڵێ پاش داگیركردنی ئاوەگرد، سلێمان پاشا چووەسـەر قۆچ پاشـا لەقـەلای هەولـێـر و، دوای نۆڕۆژ گەمـارۆدانی، قۆچ پاشـاگیـراو سەریـان بڕی‌و، لەگـەڵ سەری چەند پیاوێكیدا، ناردیانە ئەستەموول.

بەم شێـوەیـە میـرنشینی كۆیسنجـاق لە نێوچووو، كۆیە كەوتە دەست بابانییەكان.

لەگەڵ ئەوەشدا جاروبار تەیمور پاشای كوڕی عوسمان پاشاو كوڕەكانی سەریان بەرزدەكردەوەو دەكەوتنە خۆیان. عبدالرحمن السویدی بەبۆنەی سەركەوتنی والیی بەغداوە لە شەڕی ئاوەگردو شەڕی هەولێـردا هۆنـراوەیێكی (20) دێـڕیی هۆنیـوەتەوە ( بڕوانە كتێبەكەی: حدیقة الزوراء في سیرة الوزارە، ص3).

زانیـارییـەكی باش و لەبـارمـان لەسـەر ئەم بابـەتـە لەكنە كە هیـوادارین ڕۆژێـك لەڕۆژان بلاوی بكـەینـەوە. جێی باسـە كە خانووەكەی قۆچ پاشا دەكەوتە قەلای هەولێرەوەو شارەوانی هەولێر لەسـالانی پەنجـادا دەرگـای قەلای ڕووخاندو ئەویش بەوهۆیەوە تێداچوو. ئێمە لە سێ سەفەرماندا بۆشاری هەولێر هەوڵمان دا ئەم خانـووە بدۆزینـەوە، تابـۆمـان ساخ بووەوە بە تەنیشت بەری خۆرئاوای دەرگای باشووری قەلاوە بووەو دەرگایێك لەنێوانیاندا
هیـوادارین ڕۆژێـك لەڕۆژان بلاوی بكـەینـەوە. جێی باسـە كە خانووەكەی قۆچ پاشا دەكەوتە قەلای هەولێرەوەو شارەوانی هەولێر
لەسـالانی پەنجـادا دەرگـای قەلای ڕووخاندو ئەویش بەوهۆیەوە تێداچوو. ئێمە لە سێ سەفەرماندا بۆشاری هەولێر هەوڵمان دا ئەم خانـووە بدۆزینـەوە، تابـۆمـان ساخ بووەوە بە تەنیشت بەری خۆرئاوای دەرگای باشووری قەلاوە بووەو دەرگایێك لەنێوانیاندا
بووە.

واتە بەسەراوە بەسترابووەوە و لەگەڵ دەرگاكەدا ڕووخێندراوە. هەرچی كۆلانی خانووەكەیشە كە پێی دەڵێن «حەرەم كوچەسی» ،هێشتـا ماوەو، وەك دەست نیشـانمـان كردووە بڕێتییە لە یەكەم كۆلانی پچووك و تەنگەبەری لای خۆرئاوای ئەو مزگەوتەی كە لە تەك دەرگـای قەلادایـەو دەكـەوێتـە بەری خۆرئـاواوە. درێـژیی كۆلانـەكـە نێـزیكـەی (20 ـ30) مەترێكەو، پێویستە ناوی قۆچ پاشای لەسەر بنووسرێ. هەر بۆ ئەم مەبەستە ئەو لێژنە شوێنەوار ناسەمان ئاگاداركردەوە كە بۆ بوژاندنەوەی قەلای هەولێر تەرخان كراوە.

(17) قتـل خانـە پاشـا سالێ (1143)ی كۆچی (1730 ـ 1731ی زایین).

خانە پاشا (خانە محەمەد پاشا) كوڕی تەیمورخانی بابانەو، پیاوێكی زۆر چالاك بووە. سالێ (1136)ی كۆچی (1723 ـ 1724ی زایـیـن) لەگـەڵ ئەحمـەد پاشـای وەزیـردا چووە بۆ داگیركردنی شاری (هەمەدان)و، كراوە بە فەرمانڕەوای ئەم شارەو چەند سالێك فەرمانڕەوایی ناوچەی (ئەردەلان)ی كردووە.

محەمەد ئەمین زەكی دەڵێ نازاندرێ چۆن كۆتایی پێ هاتووە.

بەلام لە (كلشن خلفا)دا هاتووە كە كوژراوە پاش ئەو خالید پاشـا فەرمـانـڕەوایی گرتـووەتەدەست. (تەماشای ل 60 ـ65ی تأریخ سلێمانی، بكە).

هەرچی ناوی خانـە پاشـایـە لە چاپـە عەرەبییـەكەی (كلشن خلفـا)دا نابـیـنـدرێ ئەمین زەكی بەگ كە مێـژووی كوشتنی ناوبـراوی نەنـووسیـوە، دەبێ لەوەوە هاتبێ كە نظمی زادە یش مێژووەكەی ناو نەهێنابێ.

لۆنگـریـك لە لاپـەڕە (157)ی كتێبـەكەیدا «أربعة قرون من

تأريخ العراق الحديث» دەڵێ: خانە پاشاو خالید پاشای برای لەکەرکووکەوە تاهەمەدانیان لەژێر دەستدابووەو، هەردوو کوڕی بەکر بەگ بوون (ل95). ئیستاله باکوری روژ ئاوای (سەید صادق) جوگەیەکی ئاوی گەورە هەیە بە ناوی «جوگەی خانەپاشا» وەلەئاوی شاتوانی سەید صادق دێت.

(18) قتل محمد پاشا قرەداغ دربی‌باز: (1175)ی کۆچی (1761 ـ 1762ی زایین).

محەمەد پاشا کوڕی خانە پاشای بابان بووەو هەوڵی داوە فەرمانڕەوایی لەچنگی سلێمان پاشای بابان دەربهێنێ، بەڵام والیی بەغدا هێزی بۆ یاریدەی سلێمان پاشا ناردووە. محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ شەڕەکە لەسەر (چەمی نارین) واتە لەکفری رووی داوە، ئەویش لە ساڵی (1174)ی کۆچیدا. هەروەها ئەوەیشی لە کتێبە مێژوویی‌یە دەستنووسەکەی خوالێ خۆشبوو حسێن ناظم وەرگرتووە کە محەمەد پاشا هێزی (باجەلان)ی لەگەڵدابووەو لە (پێ‌باز) واتە لەسەر چەمی (سیروان) لەنێوان کەلارو دەربەندیخان شەڕەکە قەوماوەو ئەویش کوژراوە. بەم جۆرە قسەکەی حسێن ناظم لەگەڵ هی ڕەنجووری شاعیردا یەك دەکەوێ.

(بروانە: محمد أمین زکی تأریخ سلیمانی، ل 71).

(19) قتل سلیمان پاشا بابان (1178)ی کۆچی (1764 ـ 1765ی زایین).

لەبارەی کوشتنی سلێمان پاشاوە زانای کورد عەبدوڵڵا بێتوشی بەخەتی خۆی ئەم دەقەی خوارەوەی نووسیوە:ـ

«تأریخ وفات سلیمان پاشا أبن خالد پاشا لیلة الجمعة من ذی الحجة سنة 1178 قتل في بیته داخل الحرم دخل علیه لیلاً رجل من قصبة کوی أسمه فقه ابراهیم فضربه خنجراً وهو نایم علی فراشه فمات من تلك الضربة بایام قلائل رحمه الله تعالی».

بێتوشی ئەوەی لەسەر پشتی کتێبی سیوطی «البهجة المرضیة في شرح الألفیة» نووسیوە، کە هەمووی بە دەستنووسی خۆیەتی و ئێستا لە نامەخانەی ئەوقافی سلێمانییدایەو ژمارەکەی (2315)ە. ئەم نووسینەی زانای مەزن بێتوشی لەبارەی چۆنایەتیی کوشتنی ئەمیرە بابانییەوە نرخێکی زۆری هەیەو بە بەڵگەنامە (وثیقة) یێکی بایەخدار دادەندرێ چونکە لە ڕۆژانی کوژرانیدا یان ماوەیێکی کورت پاش ئەوە نووسیوە چونکە وەك مامۆستای بەڕێز شێخ محەمەدی خاڵ لەکتێبە بەنرخەکەیدا (البیتوشی، ص 21 ـ 22) دەڵێ بێتوشی تاساڵی (1178)ی کۆچی لەشاری (احساء) بووە و، ساڵی (1179)ی کۆچی لە گوندی ـ بێتوش ـ بووە (کە دەوری 30 ـ 40 کیلۆمەترێك لە قەڵاچوڵان دوورە کەسلێمان پاشای تێدا کوژراوە). جا دوورنییە لە دوادوایی‌یەکانی ساڵی (1178)ی کۆچیدا لە (احساء)ەوە گەیشتبێتە کوردستان یان لە مانگەکانی سەرەتای ساڵی داهاتوویدا.

(20) قتل سلیم پاشا بابان (1170)ی کۆچی (1756 ـ 1757ی زایین):

لەم ڕووەوە بڕوانە برگەی شەڕی قەمچووغە وشەڕی ئاوەگرد.

(21) آمدن شفی‌خان (1189)ی کۆچی (1775 ـ 1776ی زایین) مەبەستی ڕەنجووری لە هاتنی شەفی‌خان (محەمەد شەفیع خان)ی زەند، ئەمەیش وەك مەردۆخی کوردستانی دەڵێ: (پاش دیل کرانی عەلی موراد خانی زەند لەلایەن ئەحمەد پاشای بابانەوە کە سەرلەشکری ئەو هێزە ئێرانییە بوو بۆ یاریدەدانی محەمەد پاشای بابان هاتبوو، کەریم خانی زەند زۆر توورە و دڵتەنگ بوو و محەمەد شەفیع خانی لەگەڵ دوازدە هەزار شەڕکەردا بۆ یارمەتیی محەمەد پاشاناردو خوسرەوخانی ئەردەڵانیش لەو پەلامارەدا بەشداربوو. بەڵام کە بەرەو شارەزوور هاتن، ئەحمەد پاشا بەبێ شەڕو شۆڕ هەڵات و محەمەد پاشایش لەجێی ئەو بوو بە فەرمانڕەوای بابان.

شەفیع خان و خوسرەوخان دوای حەوت مانگ گەڕانەوە بۆ ئێران) مەردۆخی ئەمەی لە (تأریخ کردستان و توابع، بەرگی یەکەم، ل 135)دا نووسیوە بەبێ ناوهێنانی مێژووی ساڵەکە.

کەرکووکی‌یش کەلە (ل150 ـ 151)دا باسی هێرشی سێ قۆڵیی کەریم خانی زەند (کەسەرۆکێکی کوردبوو) بۆ سەر عێراق

دەکـا کە یەکێکیـان ئەم هێـرشـەیـەو ئەوی دیکەیان پەلاماردان و داگیـرکـردنی شاری (بـەسـرە)یـە، ناوی شەفیـع خان ناهێنیٚ و مێژووەکەیی دیاری ناکاو، ئەوەیش مێژووەکانی ڕەنجوریمان پتر لەلا گرنگ دەکا.

دیـارە کەرکـووکی زۆر سەرکـەوتـوو نەبـووە لە تۆمـارکـردنی زنجیرەی ڕووداوەکانی سالآنی (1186 ـ 1192)داو، مێژووی زۆربـەیـانی نەنـووسیـوەو تێکـەڵی کردوون. هەرچی کارەکـەی مەردۆخیشە ڕێکوپێکترو پوختەترە.

(22) شکست علی مراد خان و محمد پاشا (بابان):ـ

تەماشای باسی «آمدن شفی خان»بکە. لەپێشدا باسمان کرد کە عەلی‌موراد خان لەلایـەن ئەحمـەد پاشای بابانەوە دیل کرا. وەك کەرکووکی لە (ل 149)ی کتێبەکەیدا دەڵێ ،ئەوە لە چیای (سەرسیر) واتە لای (چوارتا) ڕووی داوە. هێزی ئەحمەد پاشا وحـاجی سلێمـان ئاغـا (متسلم البصـرة) لە پێنـج سەد کەس تێپەڕی‌نەدەکرد، چونکە سەربازە عوسمانییەکان لەترسی دەهەزار شەڕکــەری عەلی مورادخــان بەبێ‌شــەڕ ڕایـان کرد. ئەحمـەد پاشــایش بەدیــل گیــراو ـ ەکــەی خۆی نارده بەغــدا و والیی بەغدایش ڕێزی لیٚ‌گرت و ناردیەوە ئێران.

(23) شکست خسروخان در زرەبار:ـ

شێخ محەمەدی مەردۆخ جارێکی‌تر لە فەرمانڕەوایی خوسرەو خانی ئەردەلانی دەدویٚ‌و دەڵێ:ـ لەســاڵی (1191)ی کۆچیـدا (1777ی زایین) عوسمانییەکان لەشکریان کردەسەر ئێران .لەو دەمـەدا محـەمـەد پاشـاي بابان فەرمانڕەوایی شارەزووری دەکرد (واتە ناوچەی بابان)و لەلایەن کەریم خانی زەندەوە داندرابوو.

محەمەد پاشا لەگەڵ عوسمانییەکاندا پیك هات و، بەهێزێکی زۆرەوەکە هەشت هەزاری عوسمانی بوو ڕوویان کردەمەریوان. خوســرەو خانی ئەردە لانیش بە دوو هەزار کەســەوە لە (سنـە)وە هات بۆ بەرگری‌کردن و، لەرێگە نێزیکەی حەوت سەد سواری کوردانی گەڕووس و مەراغەیی پیٚ‌گەیشت و لە ڕۆخی زەریاچەی (زرێبـار) لە مەریـوان شەڕدەستی پیٚ‌کـرد. لەسەرەتادا لەشکری گەڕووس و مەراغـە شکـان و پاشتر لەشکری خوسرەوخان شکاو

زیانی سیٚ‌سەد کوژ راوو سەدو حەفتادیلی لیٚ‌کەوت. هێندێك لە کوژ راوو دیلەکان لە گەورەپیاوانی شاری (سنە) بوون. محەمەد پاشـای بابـان لەتـرسی کەریم خان نەیـوێـرا بێتـەپێشەوە. جاکە خوسرەوخان گەڕایەوە (سنە)و کەریم خانی ئاگادار کردەوە، زۆر توورە بوو و لەسیٚ قۆڵەوە لەشکری نارده سەر عوسمانییەکان ، لە قۆڵی کوردستانەوە واتە (سنە)و مەندەلی‌و قۆڵی (بەسرە)وە کە صادق خانی برای پێش ئەو داگیری‌کرد.

کاتێك محەمەد پاشای بابان زانیی ناتوانیٚ خۆ لەبەر هێزی عەلی مورادخـانی زەنـدو خوسـرەو خانـدا ڕابگـریٚ ،بەبیٚ شەڕ کشایەوە دواوەو هەڵات «براونە:

مەردۆخی کوردستــانی، تاریـخ کردستـان و توابـع ،بـەرگی یەکەم ،ل (133 ـ 135)، چاپی‌دووەم»

شێخ ڕەسووڵی کەرکووکی‌یش باسی شەڕی زرێباری کردووەو دەڵیٚ:

دەوڵـەتی عوسمـانی محـەمـەد باشای بابان و ئەحمەد پاشای برای نارده سەر ئێران. ئەحمەد پاشا لە (زەهاو) وەستاو مایەوەو شەڕەکەی بەدڵ نەبوو.

هەرچی محەمەد پاشا بوو توانیی لەشکری ئێران کە دوازدە هەزاربـوو بە سەرکـردایـەتیی خوسـرەوخـان بشکێنیٚ‌و، نێزیکەی هەزار کەسیـان لیٚ‌بکـوژ یٚ، ئەویش لەجێگـەیێـك کەپیٚ دەڵێن «سطرنجات کروکی»و دەکەوێتە سەر سنووری هەردوو دەوڵەت.

عبــدالـرحمن السـویـدي یش پەنجـە بۆ ئەم سەرکـەوتنـەی محەمەد پاشا درێژ کردووە (لەم بارەوە بروانە: تأریخ حوادث بغدادو البصرة، ص69، لێکۆڵینەوەی دوکتۆر عماد عبدالسلام رؤوف، 1978.

(24) قتل تیمور پاشای کوی:ـ

تەیمور پاشا کوری عوسمان پاشایەو، کاتی (شەڕی ئاوەگرد) نەکـەوتـەبـەر دەستی سلێمـان پاشـای والیی بەغدا تاوەکو باوکی سەری ببـڕیٚ‌و بیکـا بە دیـاری بۆ سوڵتـان، دەبیٚ تەیمـور پاشـا لەگـەڵ کاربـەدەستـانی بەغـدادا ڕێـك کەوتبیٚ: چونکـە ساڵی (1176)ی کۆچی (1762 ـ 1763ی زایین) لەلایــەن عومـەر

پاشـــای والیی بەغـداوە کرا بە موتـەصـەریفی کۆیـە و حەریـر: ئەویش دوای لەناوچوونی ڕاپەڕینی سلێمان پاشای بابان. بەڵام پاش چەند ساڵێك کە عومەر پاشا نێوانیان لەگەڵ محەمەد پاشای باباندا خۆش بوو، تەیمور پاشای لابردو، کۆیەو حەریری خستە ژێـر دەستی محـەمـەد پاشـاو ،تـەیمـور پاشا یش گەلێك دڵگیر بووو، لەگـەڵ ئەحمـەد پاشـاو براکـەی مەحمـوود پاشای باباندا هەرسێ لە کەرکوك نیشتەجێ بوون. ساڵی (1191)ی کۆچی (1177ی زایـیـن)، پاش کەوتـنـی ئەحـمـــەد پاشـــا لەگـــەڵ ئێـرانییـەکـانـدا، تەیمـور پاشـا کرایـە فەرمانڕەوای کۆیەو حەریر ،سـاڵی دواتـر تەیمـور پاشـاو محەمەد پاشای بابان بەدیل گیران لەشـەڕی تاسلۆوجـە (طـاشليجـە)دا ،لـە لایەن ئەحمەد پاشای بابانـەوە کە بە یارمـەتیی هێـزێکی کەریم خانی زەندەوە هاتبووە ناوچەی بابان. تەیمور پاشا سەرئەنجام بەدیلی کوژرا (بروانە: دوحة الوزراء، ص 145، 151، 158، 164، 166 ـ تأريخ حوادث بغـداد والبصـرة، نووسینی عبـدالـرحمن السـويـدي، لێکۆڵینەوەی د.عماد عبدالسلام، ص103) چاپی بەغدا 1978

لەکتێبەکەی کەرکووکیدا زۆربەی جار ناوی تەیمور بە «نمر» واتـە بە (نـون) هاتـووە. ئەو هەڵـەیـە هیی دانەری کتێب نییە، چونکـە هەرخـۆی ناوی «تمـر» واتـە بە «تێ»ێ هێناوە. مامۆستا تاهیر ئەحمەد حەوێزیش لە لاپەڕە (65)ی «مێژووی کۆیە»دا باسی «تەمر» پاشای کردووە، بەڵام نەیزانیوە کە کوڕی عوسمان پاشایەو لە میرەکانی کۆیەبووە. بگرە عوسمان پاشایشی بە بابانی داناوە (ل55)و نەیزانیوە میرێکی کۆیەو برای قۆچ پاشابووە.

مامۆسـتـا تاهیـر ئەم زانیـارییەی دوایییانی لە محەمەد ئەمین زەکیی ڕەحمەتی وەرگرتووە، لەکاتێکدا ناوبراو لە لاپەڕە (73)ی کتێبـەکـەیـدا (تاريخ سليماني) بە کوڕی عوسمان پاشای میری سۆرانی لەقەڵەم داوە.

(25) قتل محمود پاشای بابان لە ساڵی (1198)ی کۆچیدا (1782 ـ 1783ی زایین مەحمـــود پاشـای بابـان بۆ ڕاپـەڕین لەدژی عوسمـانییـەکـان هێـزەکـەی خۆیی لە دەربـەندی بازیان کۆکـردەوە، بەڵام ئیبـراهیم پاشـای بابـان و چەنـدانێکی تـر لە بابانییان و برێك لە هێزەکە وازیان لە مەحمود پاشا هێناو چوونە پاڵ هێزی سلێمان پاشای والیی بەغدا. بۆیە هێزەکەی مەحمود پاشـا شکـاو خۆیشی چووە دیـوی ئێـران و ،سـاڵی دواییش حوکمەتی زەند لە ناوچەی موکری کردیە فەرمانڕەوا. بەڵام بوداق خانی کوڕی شێخ علي خانی فەرمانڕەوای موکری ڕازی نەبوو و کەوتـە شەڕوشـۆڕ لەگـەڵ مەحـمــود پاشـاو کوڕەکـەی عەبدوڕڕەحمان پاشا. لەم سەروبەندەدا گوللەیێك لە مەحمود پاشـا دەکـەوێو لە «یـەلتـەمـر» دەکـوژرێو، عەبـدوڕڕەحمـان پاشـایش دەکشێتـەوە بۆ (سـەقـز)و، بوداق خانیش درێژە بە فەرمانڕەوایییەکەی خۆی دەدا.

ئەم بوداق خانـە ئەو بوداقـەیـە کە چەنـد بەڵگـەنـامـەیێکی دەستنووسی لەبارەوە هەیەو برێتین لە چەند نامەیێکی هێندێك لە والییـەکـانی بەغـداو برێکی تریان چەند بەڵگەنامەیێکی بەنرخی فەرمانڕەوای موکریانە (بروانە:ـ

دوحة الوزراء ،ص177 ـ 178 ـ حسێن حوزنی موکریانی، لاپـەڕەیـەك لە دیـریکی کوردستانی موکری، 1947،ل 6،7 ـ عثمـان بن سندالبصـري، مطـالـع السعـود، دەستنووسـە لە نامەخانەی وەزارەتی ئەوقاف، ص73).

(26) مەحمود پاشای کوڕی تەیمور پاشای کۆیە لە ساڵی (1196)ی کۆچیــدا (1781 ـ 1782ی زایـیـن): کاتێــك مەحمود پاشای بابان لەگەڵ عوسمانییەکاندا تێکچوو، ئەویش لەســەر فەرمـانـڕەوایی بابـان، لابـراو مەحمـوود پاشـای کۆیـە بەشێـوەیێکی ڕەسمی کرایـە فەرمـانـڕەوای کۆیـەو حەریر. بەڵام چونکە کۆیە پێشتر لە ژێردەستی مەحمود پاشای باباندا بوو، پەلاماریداو مەحمود پاشای کۆیەی گرت و بەندیکرد. جاکە لە بەغداوە هێزیان بۆ شەڕی مەحمود پاشای بابانبنارد، لەکۆیە کشـایـەوەو مەحمـود پاشـای کۆیـەی ئازادکرد. بەڵام سلێمان پاشای والیی بەغدا جارێکیدی مەحمود پاشای کۆیەی نەکردبە موتەصەریفی کۆیەو حەریر، بەڵکە ئیبراهیم پاشای بابانی لەسەر ئەم کارە دامەزراند، بۆئەوەی بێ بەکۆسپێك لەبەردەم مەحمود

پاشای باباندا. ئەوجا مەحموود پاشای کۆیەیشی هێنایەوە بۆ بەغدا.

سالّی (1201)ی کۆچی (1786 ـ 1787ی زایین)

مەحموود پاشای کۆیە لەگەڵ لەشکری بەغدادا بۆ لێدانی هێزەکەی حاجی سلێمان بەگی شاوی لە (فلوجە) چوو و لەشەردا بەدیل گیراو، پاشان بەرەڵلا کرا. لەگەرمەی شەردا (بەکر بەگ)ی کۆیەیش کوژرا، کە دوورنییە خزمێکی بوویێ.

کە عوسمان پاشای برای عەبدوڕڕەحمان پاشای بابان لەساڵی (1203)ی کۆچیدا (1788 ـ 1789ی زایین) لە فەرمانڕەوایی میرنشینی بابان لابراو لە بەغدا بەندکرا تا کۆچی دوایی‌کرد، ئیبراهیم پاشا لەلایەن سلێمان پاشای والیی بەغداوە لەجێی ئەو داندراو ،مەحموود پاشایش کرابە موتەصەڕیفی کۆیەو حەریرو، هەر لەوساڵەدا کۆچی دوایی‌کردو، کۆیەو حەریر دران بە ئیبراهیم پاشا (بڕوانە: دوحة الوزراء، ص175، 176، 184، 190، 191 ـ عثمان بن سند البصري، مطالع السعود، ص73).

(27) تعمیری سلیمانیەو تخریبی قلعەچوالان لەساڵی (1199)ی کۆچیدا (1784 ـ 1785ی زایین):

بێ‌گومان گواستنەوەی پێتەختی میرنشینی بابان لەقەڵاچوالا ـ نەوە بۆ سلێمانی، لە زەمانی ڕەنجووری شاعیردابووەو، ئەو مێژووەی شاعیر هێناویە بایەخێکی زۆری هەیە. ڕەنجوری ئەوەی ئاشکرا کردووە کە قەڵاچوالان ساڵی (1199)ی کۆچی پاش تەواو بوونی بنیادنانی سلێمانی، ڕووخێندراوە و خەڵکی کاریتەو دارەڕای خانووەکانی خۆیانیان لەوێوە بردووەو لە خانووی تازەی سلێمانیدا بەکاریان هێناون. تەنانەت پەنجەرەو دەرگای مزگەوتە کانیشیان نەهێشتووەتەوە. ئەوەتا چوارچێوەی دەرگای مزگەوتی شێخ ئەمین خان لەگەڕەکی سابونکەرانی سلێمانی هیی مزگەوتی قەڵاچوالانی ئەم بنەماڵەیە بووە.

(28) تمر پاشای مللی:ـ باسی تەیمور پاشا لەزۆر سەرچاوەدا هەیە.

عبدالسلامی موفتیی ماردین لە کتێبە دەستنوسەکەیدا (تاریخ ماردین) زانیارییەکی تێرو تەسەلی لەبارەی تەیمور پاشاوە نووسیوە، چونکە خێڵی میللی یەکەم خێڵی دەستەڵاتداری ناوچەی ماردین بووە. لە لاپەرە (314)دا عبدالسلام دەڵێ: ساڵی (1205)ی کۆچی (1790 ـ 1791ی زایین) سلێمان پاشای والیی بەغدا بۆ لێدانی تەیمور پاشا هاتە ناوچەی ماردین و چوارمانگی تێدامایەوە. سەرئەنجام تەیمور پاشا ڕایکرد و، پاش چەند ساڵێك چووەوە بەغدا بۆ لای سلێمان پاشاو، ئەویش داوای لەسوڵتان کرد لێی خۆش بیٌ و بیبەخشیٌ. ئەمجا پلەی وەزیریی لەساڵی (1215)ی کۆچیدا (1800 ـ 1801ی زایین). پیٌ درا.

جا ئەوەی کە ڕەنجوری دەڵیٌ تەمەر پاشا هاتووەتە کەرکوك، دەبیٌ لەو کاتەدا بوویٌ کە چووە بۆ بەغدا، یان لە گەڕانەوەیدا بوویٌ.

(29) محەمەد پاشای کوری مەحموود پاشای کۆیە:ـ ڕەنجوری نووسیویە ڕۆژی یەکشەممەی (26)ی مانگی شوالی ساڵی (1216)ی کۆچی (1801 ـ 1802ی زایین) «تنصیب»کرا واتە دامەزراو «تعیین» کرا. ئەم زانیارییە لە لیستەی سێیەمدا هاتووە. بەڵام لە لیستەی چوارەمدا، لەباتی ڕۆژی یەکشەممە «الأحد» ڕۆژی (دوشنبە) واتە دووشەممەی نووسیوە و لەژێر ئەویشدا «9القعدة داخل کوئە»ی تۆمارکردووە کە لەوە دەچیٌ تەواوکەری گوزارە (عبارة) یێکی تربیٌ ،چونکە ئەم دووخەتە گچکەیە وەك نیشانەی (=) لە پەنایدا نووسراوە.

شێخ ڕەسوولی کەرکووکی لەبارەی محەممەد پاشاوە لە (دوحة الوزراء)دا نووسیویە، دەڵیٌ:ـ ساڵی (1116)ی کۆچی کە عەبدوڕڕەحمان پاشای بابان و سەلیم بەگی برای لە (حیللە) بەندکران، سلێمان پاشا محەممەد پاشای کردبە موتەصەڕیفی کۆیەو حەریرو پلەی پاشایەتیشی تی‌یشی پیٌ بەخشی. ساڵی (1220)ی کۆچی (1805 ـ 1806ی زایین) عەلی پاشای والیی بەغدا داوای لە محەمەد پاشاو عەبدوڕڕەحمان پاشای بابان کرد کە هێزی خۆیان بهێننە کەرکوك و لەوێ چاوەڕوانی ئەوبن تاکو بۆ لێدانی خێڵی (عبید)ی لای خابوور (خابووری

کن رأس العین) بچن. ئەوانیش هێزی خۆیانیان هێنا، بەڵام چونکە ڕقیان لە یەکتری بوو، عەبدوڕڕەحمان پاشا محەمەد پاشای کوشت. عەلی پاشایش قینی لە هەردووکیان بوو، دەیویست قوتاری بێ لەدەستیان، لەبەر ئەوە کە عەبدوڕڕەحمان پاشا بەهەموو شێوەیێك زەمی پاشای دەکردو شانازیی بە باوپیرانی خۆیەوە دەکردو، محەمەد پاشایش وای لێ هاتبوو ڕقەبەرایەتیی لەگەڵ عەلی پاشادا دەکردو بەرەنگاری دەبووەوە.

جا چونکە ئەو سەردەمە ئەوە نەبوو کە عەلی پاشا بتوانێ بە ئاسانی شتێك بەرانبەر بە عەبدوڕڕەحمان پاشابکا، نامەیێکی پڕگلەیی بۆ نووسیو، کۆیەو حەریری خستە ژێر دەستەڵاتییەوە. (بڕوانە: دوحة الوزراء، ص220، 228 ـ تاهیر ئەحمەد حەویزی، مێژووی کۆیە، ل 80).

پاش محەمەد بەگ ناوی یەکێکی دی لەم بنەماڵەیە هاتووە کە ئەویش عوسمان بەگەو، کەرکووکی لە (ل 283)ی هەمان کتێبدا نووسیویە:

ساڵی (1233)ی کۆچی (1817 ـ 1818ی زایین) عوسمان بەگ و محەمەد عیسا ئاغا (ی کۆیسنجاقی) گەیشتنە ئەو لەشکرەی کە داود پاشا فەرمانی دابوو بچێتە سەر مەحموود پاشای بابان (کوڕی عەبدوڕڕەحمان پاشا) ئەم لەشکرە کۆیسنجاقی داگیر کرد کە لە دەستی مەحموود پاشادا بوو و، حەسەن بەگی برایشی کە لیێ هەڵگەڕابووەوە کرا بە موتەصەڕیفی کۆیەو حەریر. ئیتر نازانین حەسەن بەگ چیی محەمەد بەگە.

لەوە بەئاگاین کە پاش (شەڕی ئاوەکرد) فەرمانڕەوایی کۆیە ڕووخاوەو، جاروبار بەگەکانی کۆیەیش توانیویانە لەکاتی ناکۆکیی نێوان بابانییان و عوسمانییەکاندا، دەستەڵات بگرنە دەست.

تیرەی (بەگزادە) لەکۆیە ماون و، دەڵێن ئێمە لەنەوەی قۆچ پاشاین. عەبدوڵڵابەگی کوڕی سەعید بەگ کە خاوەنی خانووێکی نەخشداری کەلەپووریی گرنگ بووەو زۆرجار ناوی لە نووسینەکانماندا هاتووە، لەم بنەماڵەیە بووە هێندێکیان لەزووەوە چوونەتە گردماملك لەناو (گەردی)یان و، لە هەولێریش بڕێکیان لێ هەن پێیان دەڵێن «میران بەگی».

## سەرچاوەکان


1 ـ کومەلەو لیستە مێژووە ودەستنوسەکانی ڕەنجووری نامەخانەی وزارەتی ئەوقاف لەبەغدا نمرە (974)و (974/9 مجامیع) و (869/5 مجامیع).

2 ـ عبدالرحمن السویدی /حدیقة الزوراء في سیرة الوزراء. دانە یەکی دەستخەتی دانەر لە نامەخانەی القادریە بغداد نمرە (س 1355)

3 ـ عثمان بن سند البصری /مطالع السعود دەستنوسی نامەخانەی وزارەتی ئەوقاف نمرە (5840 ).

4 ـ عبدالسلام الماردینی /تاریخ ماردین دانەیەکی وێنەکراومان لەسەر دانەی دەستنوسی (دارالکتب والوثائق القومیة) لە قاهرة نمرە (813).

5 ـ شیخ حسین ی قاری /سراج السالکین. دانەیەکی دەسنوس لەلای ملا سعدالله ملا محمد امین هەوایی لە بەغدا

6 ـ کومەلە یەکی دەسنوس بەخەتی ملا محمد امین هەوایی لەلای ملا سعدالله کوری لە بەغدا

7 ـ دیوانی ڕەنجوری بلاوکراوی محمد علي قرەداغي

8 ـ نظمي زادە مرتضي افندي/ کلشن خلفا. موسی کاظم نورس لە تورکییەوە وەرگێراوە بۆ عەرەبی چاپی نجف 1971.

9 ـ عبدالرحمن السویدی /تاریخ حوادث بغداد والبصرة لێکولینی د.عماد عبدالسلام رؤوف بغداد 1978.

10 ـ شیخ رسول کرکوکی /دوحة الوزراء. موسی کاظم نورس لەتورکییەوە کردووەتە عەرەبی چاپی بیروت.

11 ـ لونکریك/ اربعة قرون من تاریخ العراق الحدیث.

جعفر الخیاط لە ئینگلیزییەوە کردووەتە عەرەبی چاپی پێنجەم بلاوکراوی مکتبة التحریر بغداد.

12 ـ محمد امین زکی /تاریخ سلیمانی بەکوردی چاپی یەکەم 1939.

13 ـ شیخ محمدی خال /البیتوشی. چاپی بغداد 1958.

14 ـ شیخ محمد مردوخ/ تاریخ کردستان وتوابع ب أ چاپی دووەم.

15 ـ طاهر احمد حویزی/ مێژووی کۆیە بەکوردی چاپی یەکەم 1962.

16 ـ شیخ محمدی خال /الشیخ معروف النودهي 1963

17 ـ ملا عبدالکریم /علماؤنا في خدمة العلم والدین 1983


تێبینی: -

1 ـ ئەم گوتارەم لەیەك کات دا نەنوسیوە بەلکو بەین بەینم نوسیوە.

2 ـ برای ڕوناکبیر کاك صدیق صالح پاکنوسی ئەم گوتارەی کردووە زۆرسوپاسی دەکەم.

# پەرەسەندنی مێژوویی واتای ووشەو دەوری لە دەوڵەمەندکردنی زماندا

## « ووشەوانی »

دوکتۆر نەسرین فەخری

کەرەسەی زمان ووشەیە
بۆیە بۆ زمان گەیشتن
پێویستە لە ووشە بگەین

أ ـ ووشەی «دڵ ـ DIL

دڵ: ووشەو ناوێکی دیارو ئاشکرایە بۆ ئەوەی زیاتر تێی بگەین و بیناسین، بشزانین کورد چۆن و چەند تێی گەیشتووە، با بەناو زمانەکەماندا بگەرێین و لە عاستی «دڵ» بوەستین لە هەر نموونەو شوێنەدا بەم شێوەیەی خوارەوە.

دڵ: لە ووشەی ناسادەدا
«دارێژراو، لێکدراو»

دڵدار: ناوو ئاوەڵناوێکی دارێژراوە: لە:
دڵ + پاشگری «دار» کە بەواتای (خاوەن)ە پێکهاتووە.

پاشگری «دار» پاشگرێکی دیارو باوو ئاشکرایە لە کوردیدا بۆ نموونە سەرنج بدە. باڵدار (خاوەن باڵ ـ تەیرو تیوور، باڵندە، زامدار، عەلەمدار، بریندار، زماندار هتد..

دار ـ ناویشی بڕوانە

دار
ناو — پاشگر بە واتای «خاوەن»
درەخت — داری ووشك
(دارو درەخت)
(جووتە ووشە) — داری سووتاندن

دڵدار ـ دڵداری: خۆشەویستی.

● دلاوەر: دڵرفێن.

لە: دڵ + 1 + وەر (پاشگرە)و دووبارە بە واتای (خاوەن) دێت پێکهاتووە. وەك: پاشگری (دار) بەڵام هەر یەکە لە شوێنی خۆیدا بەکاردێت. ئەمیش پاشگرێکی دیارو باوە، دووبارە سەرنجی ئەم نموونانە بدە: بەهرەوەر، سەروەر، جانەوەر، بەختەوەر، پەروەر هتد..

لە «دلاوەر»دا سەرنجی دەنگی (ل) بدە کە سووکە بۆ ئاسانی.

دڵزار: ناوو ئاوەڵناوە، بەواتای «غەمگین، غەمبار، بەئازار، پێکهاتووە لە: (دڵ + ئازار)و بووە بە (دڵزار).

2 ـ دڵ باغچە، لانەی دڵ، دڵ لانە..

کەواتە ئەم (زار)ە «زار»ی ناوو پاشگر نیە، بەڵکو

چوّته شیّوه‌یه‌وه.
بروانه:
زار (ناو)
پاشگر باغچه
گولّزار، لاله‌زاز
ده‌م
بیّزار: بیّ‌ده‌م
بیّزار: په‌ست
- دولبه‌ر - (دلّبه‌ر)، ناوو ئاوه‌لّناوه، له (دل بردن)ه‌وه هاتووه
- دلّنیا: ناوو ئاوه‌لّناوه، دژی (دوو دلّ)ه، دلّنیای کردم.
- دلّشاد: ناوو ئاوه‌لّناو، پیّکهاتووه له:
دلّ + شاد دلّ شاد: ئه‌مروّ دلّی شاده
دلّشاد: دلّشاد دلّ شاد نیه
دلّخـــواز: بوّ که‌سیّـك یان شتیّکـه که ده‌چیّتـه دلّـه‌وه، خوّشت ده‌ویّت، حه‌زی پیّ‌که‌یت، پیّکهاتووه له:
دلّ + ره‌گـی فرمـــانـی خواستن (خـــواز) = ناوو ئاوه‌لّناوی لیّکدراو، دلّخواز، دلّخوازه.
- دلین: دلّخواز.
- دلوّڤان: دوّست، خوّشه‌ویست، دلّدار، (دلوّوان) (خاوه‌ن دلّ)..
دلارام: دلّ + ئارام (ئارام).. سره‌وت.. سه‌بر، ئارام گرتـــن دان به‌خـــوّدا گرتـــن. بووه به دلارام: بوّ کورتی‌و ئاسـانی له‌پـالّ سووك کردنـه‌وه‌ی ده‌نگی (ل)ه که‌ش.
هه‌روه‌ك له (دولبه‌رو دلاوه‌ر)دا.
دلّــه‌کــه‌لّــه‌شـیّــر: ناوه بوّ جوّره تریّـیــه‌کـی سپـی ده‌نـك دریّـژی، بنك ئه‌ستووری، سه‌رباریکه، ناوی بچووکی تیّدایه.[1]
دلارا: بوّ شویّنیّکی دلّگیـره که دلّی تیّـدابکـریّتـه‌وه.
له‌وانه‌یه، (دل ئارا) بیّت.
هتد.....
دلّ - له ئیدیوّم و زاراوه‌دا
دلّپاك: (دل پاك) (دلّپاکی): هیچی له دلّدا نیه، یان هیچی له دلّدا نامیّنیّت، ناوو ئاوه‌لّناوه:
دلّ + پاك دلّ پاك
دلّپاك
مروّڤ که دلّی پاك بوو لیّی مه‌ترسه.
دلّپاك به‌راستی دلّی پاکه.
دلّ پیس: به گومان، دژی «دلّپاك»ه.
دلّ پیسی: گومان کردن.
دلّ پیس کردن: گومان په‌یداکردن ده‌رباره‌ی که‌سیّك، دلّی لیّ پیس کردووه: که‌وتوّته گومانه‌وه لیّی.
دلّ نه‌رم: دلّی زوّر نه‌رمه، زوو رازی ده‌بیّت و ئاشت - ده‌بیّته‌وه. دژی «دلّ ره‌قه».
دلّ ره‌ق: بروانـــه: سه‌ره‌وه: دلّ نه‌رم - دژی یه‌کـــن، به‌ئـاســـانـی نه‌رم نابیّـت، دلّ قایـمـــه: دلّـی ناسوویّت، بیّ‌ره‌حمه.
دلّ قایمه: هاو مه‌به‌ستی (به‌جه‌رگ)ه.
دلّ ناسك: (حساس) خاوه‌ن هه‌ستیّکی ناسك، زوو زویرده‌بیّت زوو هه‌ست به هه‌ر شته‌و هه‌ر قسه‌یه ده‌کات.
دلّگیر: دلّگیر، بوّ دوو واتای دژ یه‌ك به‌کاردیّن له:
(دلّ گیران)ه‌وه هاتووه. بروانه:
دلّگیر
زیر، غه‌مگین، په‌ست
دلّم، یان سه‌ردلّم گیراوه
ئه‌م شویّنه‌خوّشه

دڵ گیره (دڵ دەکاتەوە

دڵ تەنگ: دڵگیر، پەست، غەمگین، دژی دڵخۆش.

دڵ خۆش: دڵخۆش، ناوو ئاوەڵناوێکی لێکدراوە بەواتای، شادو بەکەیف، دژی دڵ تەنگ دێت.

دڵ گران: دڵگیر، عاجز، دڵ تەنگ. مرۆڤ کە پەست دەبێت هەست بەقورسایی یەك دەکات لەسەر دڵی و هەموو لەشی دادەگرێت.

دڵ بەستە:[2] دڵبەند، بۆ شتێکە ئارەزوو بکرێت، بچێتەدڵەوە ئەو کەسە دڵی پێوەبێت.

دڵ تەڕ: بۆ کەسێکە حەز لە کەیف و سەفاو شتی جوان بکات، (دڵتەڕ - تەڕپۆش)یش دەگرێتە.

دڵپڕ: دڵ پڕبوون. لە داخا، لە قینا، لە زۆر خواردن، دڵـم پڕبـووە، زۆرم خواردو خواردنـەکـە سەر دڵی گـرتـووم دڵی پڕبـووە: قوڵپی گریـانی دێت، گریان گرتوویەتی.

دڵی لێی پڕبووە: لێی کەوتووە بە قینا.

یان نیشانەی ڕشانەوەیەو لەوانەیە برشێتەوە.

دوو دڵ: دوودڵە، دژی دڵنیایە، بەگومانە.

دڵ ڕفێن: دڵگیـر، دەچێتـە دڵـەوە، لە (ڕفین و فرین) یەکن و جێگـۆڕکێ لە دەنگـەکـاندایە. دڵی بۆی هەڵ ئەڕفێ لە خۆشییاندا..

دڵ سارد: دڵسارد دوو دڵ، دژی دڵ گەرم، دڵی لێی ساردە، دڵی ساردبـۆتـەوە لەو کارە، واتـا: بەدڵی نیە، لێی پەشیمانە.

دڵساردی: بەرانبەر (بەکەس یان شت)ە.

دڵ گەرم: دژی (دڵ سارد)ە، بروانە سەرەوە.

هەروەها، دڵساردیو دڵ گەرمی.

دڵ ڕەش: دڵ ڕەق و دڵ پیس، دژی دڵ نەرم و دڵپاك.

دڵ ڕوون: دڵ خۆش، دڵم ڕوون بۆوە گەشایەوە.

دڵ گران: دڵگیر، پەست.

دڵ فراوان: دڵ گەورە.

دڵ ڕاگرتن: دڵ نەشکاندن، دڵ کردن. دڵی ڕابگرە: دڵی مەشکێنە.

بێ دڵی نەکردن: دڵ ڕاگرتن: بروانە سەرەوە.

دڵ بردن: دڵبردن تێکچوونی دڵ بە هۆی خواردنەوە.

هەنگوینەکە دڵی بردن، گرو کزەکز لە دڵەوە هاتن.

پێ خواردن (ئیشتیهاکردن)

حەزلێ کردن (خۆش ویستن).

دڵ نەبـردن: پێ نـەخـواردن. پێم ناخـورێت، واتـا: دڵم نایبات، یان ئەو کەسە تێرە، یان (ئیشتیهای نیە).

دژی: (دڵ بردن).

دڵ مردوو: بۆ گەنج و تەمەن کەمێکە، کە دڵی بەدنیاوە نەبێـت و حەز لەشـتی جوان و خۆش نەکـات.

دیارە زەمانە دڵی ڕەنجاندووە.

دڵ ڕەنجـاو: دڵ شکـاو، دڵ ڕەنجـان - دڵ شکـان، زویـربـوون دڵ ڕەنجـانـدن. دڵ شکـانـدن، زویرکردن (تێهەڕو تێنەپەڕن.

دڵەلەرزی: دڵی کەوتە لەرزین. دڵی کەوتۆتە ترسەوە، مەترسی دایگرتووە، (دڵەکوتێ)ی پێ کەوتووە لە ترسانا، دڵی دەلەرزی - زیاد لە سنووری خۆی لێدەدات، کوتەکوت دەکات کە ئەنجامی نەخۆشیشە.

دڵ تێکـەڵ هاتن: دڵ بەیـەکاهاتن، بۆ کەسێکە کە ئەو خواردنـەی خواردوویـەتی نارەحـەتی دەکـات و دەیەوێت هەڵی - بهێنێتەوەو ناتوانێت، یان ئەگەر چاوی بەشـێـکـی پیس کەوت یان بۆنـی شتێکی پیسی کرد دەست دەکات بە قرپ وقوپ و دڵتێکەڵهاتن.

دڵ بەیەکاهاتن: بروانە دڵ تێکەڵ هاتن.
دڵ خاوبوونەوە: سست بوون و تێکچوونی دڵ، نیوە لە هۆش خۆچوونێك.
سەردڵ کەوتن: دڵ پڕبـــوون بە هۆی زۆر خواردنـەوە، یان خواردنێــك کە پێت نەکــەوێت، مەبــەست نارەحەت بوونی دڵە بە هۆی پڕبوونی، (معدة)وە.
دڵ پێداچوون: چوونەدڵەوە، حەزکردن لە شتێك، یان خۆش ویستنی کەسێك، هاومەبەستی (دڵ پێوە بوون)ە.
دڵ پێوەبوون: بروانە سەرەوە: دڵ پێداچوون.
دڵ لەخـــۆدامــــان: دڵ بەخــــۆســــوتــــان، بەزەیــی بەخـــۆداهــــاتنــــەوە، بۆ کەسێکــە کە هەست بە جیاوازیو (مەغدوور) بوون بکات.
دڵ بەخۆسوتان: بروانە سەرەوە (دڵ لەخۆدامان).
دڵ لەخـۆچـوون: بێهـۆش بوون، بێهـۆش کەوتن، لەهۆش خۆچوون، بوورانەوە، دڵ ساردبوونەوە.
دڵ ساردبـــوونـــەوە: بروانــە دڵ لەخـۆچـوون ـ دەشگوترێت: (لەخۆچوون).
بروانە «دڵ ساردی»ش.
دڵ ئازاردان: دڵ ڕەنجـانــدن، دڵ شکـانـدن، دڵ برینــدارکــردن، کەســەرخستنـەدڵـەوە، بەو کەسەش دەگوترێت:
دڵزار (بروانە ـ دڵزار ـ لە سەرەتایی باسەکەدا).
دڵ کرمن: دڵ پیس، بوغز لەسك، قیناوی، بەدگومان.
دڵ کرمۆڵ: دڵ کرمن ـ هەردووك یەکن.
دڵەراوکێ: دڵ + راو + پاشگری (کێ).[1]
دوو دڵیکـردن، دڵنیـانـەبـوون، دڵی لە ئەگـەرو نەگەر دایە. بیکات یان نا، (چاولەدەر)یش.
دڵەکزێ[2]: یان، دڵەکزە: جۆرە دڵ تێکچوونێکە، یان

دڵ ـ بەیـەکـداهـاتنـە، بەتـایبـەتی ئەنجامی زۆر شیــرینی خواردن، دڵ کزەکـزی پێدەکـەوێت، دەسووتێتەوە، گری لێدەبێتەوە. بروانە (دڵ بردن).
دڵ کورکان:[3] دڵ لێدان بۆ شتێك، حەزو ئارەزوو کردنی.
دڵ کرانـــەوە: دڵ خۆش بوون. کە دیم دڵم کرایـەوە، کە دەیبینم دڵم پێیدەکرێتەوە (فەرەح بوون).
دڵ سووتان: یان دڵ پێسووتان: بەزەیی پێدا هاتنەوە، دڵ پێسووتان: دڵم پێیدەسووتێت.
دڵ سووتان ـ جگەرسووتان.
دڵ سووتـــاو: جگــەر سووتــاو، بۆ کەســێـکــە خۆشەویستێکی یان منداڵی بمرێت. زیاتر بۆ (منداڵ) بەکاردێت.
دڵ شکاو: دڵ ڕەنجاو. کۆست کەوتوو، بەدڵی شکاوەوە سەری نایەوە، یان حەرامە دڵی مەشکێنە.
دڵ بەجێهێنان: بەجێهێنانی ئارەزووی کەسێك، یان ئاشت کردنەوەی.
بەجێهێنانەوەی دڵ: ڕازیکرن و ئاشت کردنەوەی پاش زیـزبـوون و دڵ شکانی لەبەر هەر هۆیەك بێت، ئەمـەش هاومەبەستی نموونەکەی سەرەوەیە، یان هەر خۆیەتیو تەنیا ئاڵوگۆڕکراوە لە نێوان شوێنی وشەکاندا. یان دڵ هێنانەجێ.
دڵ ئاورشـــێـــن کردن: دڵ ئاودان، دڵ خۆش بوون و کرایەوە، خۆشی کەوتنەدڵەوە، دڵ گەشانەوە.
دڵ ئاودان: دڵ ئاورشێن کردن. بروانەسەرەوە.
دڵ ئاوخـواردنەوە: (1) دڵنیابوون، حەسانەوەو هەست کردن بە ڕەحـەتی ئەنجـامی باوەرکـردن بەشتێـك لێی بەگومان بوو، ڕزگاربوونی ئەو کەسە لە دوو دڵی.
2) ئیســراحـەت کردن ئەنجـامی هەق وەرگرتنێك

یان تۆڵە وەرگرتن.
دڵ ئاوەدان: دڵ فراوان، دڵ کراوە، وریاو هۆشیار.
دڵ خۆشبوون: شادمان بوون. بروانە دڵ خۆش.
دڵ خۆش کردن: چاوگـێـکـی لێکـدراوو تێپـەڕی (دڵ خۆش بوون)ە یەکێـك یەکێکی کە بخـاتـە خۆشییەوە، دڵی خۆش بکات.
دڵ خۆشی دانەوە: دڵدانەوە، بەسەریەکێکدا هاتن، لاواندنەوەی.
دڵ وەستان: دڵ لەکارکەوتن، لەلێدان کەوتن، (مەرگی مجافاة)یشی[4] پێدەڵێن (السکتة القلبیة).
دڵ تۆقیـن: دڵـم تۆقی کـرد ـ تەقی، شەقی بـرد، لە خەفەتانا یان لە ڕقانا، یان لە ترسانا، بروانە: دڵ تۆقین.
دڵ تەقین:[5] شەق بردن. بروانە: دڵ تۆقین و دڵ تۆق کردن.
دڵ کەوتنـەخـوارەوە: داچڵەکین، ترسـان. ئەنجـامی کارێك، یان خە بەرێکی ناخۆش و لەپڕ.
دڵدانەوە: بروانە دڵ خۆشی دانەوە.
دڵ سەندن: دڵدانەوە، دڵ خۆشی دانەوە.
دڵ داکـەوتن: دڵ داخـوارپـان، داچڵەکین لە ترساندا بروانە:
دڵ کەوتنەخوارەوە.
دڵ داخورپان: بروانە سەرەوە: دڵ داکەوتن.
خورپەلەدڵەوە: بروانە: دڵ داخورپان.
هاتن
دڵەخورپێ: دڵ داخورپان.
دڵەتەپێ: دڵەخورپێ.
دڵ نەوایی کردن: دڵ نەوایی، دڵدانەوە، ئاشت کردنەوە.

هتد

---

سەرنجی ئەم نموونانەش بدە کە لە شێوەی ڕستەدایە

---

ـ دڵی بەهیچ ناکرێتەوە: ئەوەندە پەست و بێزارە.
ـ کەسەری[6] خستە دڵیەوە: دڵی بریندارکرد، دڵی شکاند.
ـ داخ چووە دڵمـەوە: بۆ کەسێـك لە خەفـەتـاندا ئاگـر لە دڵـی بـەربـبێـت جا بۆ بۆشـتـێکی یان کەسێکی خۆشـەویستـە کە زیـانی پێ گـەیشتنێت وەك ئاگر بنێت بەدڵیەوە وایە.
ـ دڵ لەدڵ مەدە: بۆ کەسێك گومان لە کەسێك بکات، یان بڕوای پێ گەم ببێتەوە، کە هی ئەوە نەبێت.
ـ قەد دڵی پیرنابێت: چاوی تێر نابێت، زۆر حەزی لە دنیایە، بەکەیف وزەوقە. ئەمەش بۆ کەسێکە کە بەتەمەن بێت و وەك کەسێکی تەمەن بچووك و لاو بجوولێتەوە. بەپێچەوانەی: دڵ مردوو.
ـ هیچی بەدڵ نیـە: هەرچی بۆ بکـەیت هەر نارازییـەو (شوکرانەی خواناکات).
ـ هیچی لەدڵانیە: ئەوەندە دڵ ساف و فراوان و پاکە.
ـ قین لەدڵە: بەپێچەوانەی (هیچی لە دڵانیە)یە ـ بوغز لەزگە، دڵ پیس و ڕەشە.
ـ دڵی بەبـەریـەوە نەمـاوە: زۆری دەردو مەینەتی دیوەو کێشاوە، ئیتر لەوە زیاتر لە توانایا نەماوەو بەرگەی خەفەتی تر ناگرێت.
ـ وەك نەشتەر دای لەدڵم: بۆ خەبەرێك یان قسەیەکی ناقۆلاو جەرگ برە.
ـ دەچێتـە دڵـەوە: ببینی خۆشتێ دەوێت، ئارەزووی دەکـەیت، بۆ شت و بۆ کەسـە. بەپێچـەوانـەی ناچێتە دڵەوە.
ـ دڵی بەدنیـاوەیـە: حەزی لە دنیـا ـ هێشتـا تێـری نەخـواردووە لە دنیـا، چاوی لە دنیـایـە، هێشتـا

گەنجە، چاوی لە دنیابوو، دڵی بەدنیاوە بوو.
پێش وەخت کۆچی کردو دنیای فانیی
بەجێ‌هێشت، جوانە مەرگ بوو، ڕەنجەڕۆبوو.
- بەدڵ شکاوی سەری نایەوە واتا: بە عەزرەتەوە مرد،
خۆشیی نەدی لە دنیاو لە ژیانی.
- بەهیچ شتێك دڵی ئاو ناخواتەوە: قەد دڵی پاك
نابێتەوە.
قین لە دڵە، بوغز لە زگە.
هتد....

---

## دڵ لە هەندێك (پەند)دا

- دڵ ئاوێنەی دڵە.
- دڵ وەك شووشە وایە کە شکا دەشکێ (ناچێتەوە جێی خۆی).
- سەرکزی دڵ ورییایە - پەندو ئیدیۆمە.
- دڵی من سوڵتانە، کەتە ماڵی وانە، چەند ڕەشەو

چەند جوانە. (3*)

---

بڕوانە ئەم نموونانەش کە بە دوو جۆر لێك دەدرێنەوە، بەپێی کەس و شوێنی بەکارهێنانی:
- د،ڵی دڵ نیە ئەوەندە ناسکەو زوو زویر دەبێت.
ئەوەندە ڕەقە بەهیچ نەرم نابێت.
- با بە دڵی نەبێت: بزانە چی تاتْ پێ دەکات.
بزانە چیتان پێ‌دەکات.
با بە دڵی بێت: بزانە چۆن دەیکات.
بزانە چی دەکات.
دوا شت (دڵ) لەم چەند دێرە شیعرەدا:

1 - ئاخۆ بە چ شاخێکەوە گیرساوە دڵی من؟!
یاخۆ بە چ داخێکەوە سووتاوە دڵی من؟!
2 - دڵ لە دەردی وەتەن شەوقی نەماوە.
وەك کەوی ناوقەفەس عەشقی شکاوە..

---

**سەرچاوەکان:**

1) - خاڵ - فەرهەنگی خاڵ.
2) - خاڵ - پەندی پێشینان..
3) - عومەر دەشتەکی - پەندی کوردی.
4) - ئەوەی دەیزانم و کۆم کردوتەوە.

## پەراویزەکان

1 - پاشگری (گێ): لە کوردیدا ئەم پاشگرە لە گەلێك شوێن بەرچاو - دەکەوێت بۆ نموونە بڕوانە.
چاوبڕکێ: چاو + بڕ - (ڕەگی چاوك و فرمانی بڕین).
کە جۆرە سەیر کردنێکە، بچرپچرە، چاونووقاندن و کردنەوەی لەسەریەك.
سەرەتاتکێ: ئەمیش دووبارە بۆ جۆرە سەیرکردنێکە بەسەر هێنانە پێشەوەو خستنەوەی لەسەر یەك، بۆ نەبینین و هەست پێ‌نەکردنی.
گاگۆڵکێ: جۆرە ڕۆیشتنێکە بۆ منداڵی تازە پێ‌گرتوو، کە خەریکە پێ‌دەکرێت، دووبارە ڕۆیشتنێکی ناتەواوە.
دڵەڕاوکێ: دوو دڵی، بۆ دڵێکە لە ئەگەرو نەگەردا بێت (سەرنج بدەن لە هەموویاندا جووڵەیەکی یان کارێکی بچرپچرە.
یان سەیرکردنێکە بەم جۆرە)..

هەروەها:

هەڵپـەرکێ: هەڵ + پەڕ (ڕەگی چاوگ و فرمانی - پەڕین - هەڵپەڕین + کێ).

حەماموکێ، چاو شارکێ: دووياريی منداڵانەن.

هتد..

2 - سەرنـجی ووشـەی (دڵ) بدەن لە گەڵـێـك نموونەدا، لە جێگەی (معدة) بەکارهاتووە. هەروەك لە عەرەبیدا (نفس) بەکاردێت دڵم تێکەڵ دێت - نفسی تلعب) هتد.. بۆ سەرنج.

3 - کورکان - دڵەکورکان - کورکە کورك - ناوی دەنگەو بۆ جۆرە گریانێکی نزمە وەك نووکەنووك وایە، دەڵـێـن: هەر کورکـەکـورکێتی، هەر دەکـورکێنی: بەتـایـبـەتی بۆ منـداڵی بیـانـووگـر بەکـاردێت تا داواو ئارەزووی بهێنرێتە دی، چونکە نایبرێتەوە تابێزارت دەکات..

4 - مەرگی مجـافـاة (مجـافـاة - لە - جفـاء - وە نەهاتووە، بەڵکو - مفاجاة - وە هاتووە - واتا - لەپڕ - مردنی لەپڕو لەناکاو.

5 - تەقـیـن و تۆقـیـن - هەڵـتـۆقـیـن - ئاوسـان و کیف کردنە، کە لە ئەنجامدا دەتەقێت ئەو شقە. واتا - هەڵتۆقی و تەقی.

بۆ دوومەڵ، برینێك ئاو دزی کردبێت، یا کیسەیەك زیاد لە توانا فووی تێبکرێت یان پڕبکرێت.

6 - کەسەری خستە دڵیەوە - (کەسەر) لە (کسر)ی عەرەبییەوە هاتووە.

7 - بەعـەزرەتـەوە سەری نـایـەوە - (عـەزرەت) لە (حسرة)ی عەرەبییەوە چۆتە کوردییەوە.

ب - ووشەی (زمان Siman)

زمان

زاراوە لغة Language

ناو اللسان Tongue

1 - لە کوردیـدا بەم جۆرەش لە عەرەبیـدا ووشـەی (زمـان) «اللسـان» وەك زاراوە بەکـاردێت بۆ گفتـوگـۆو قسـەکـردن، بۆ لەیـەك گەیـیشتن. کەواتـە «زمـان ڕووداوێکی کۆمەلایەتییە»و کە دەڵێین زمانی کوردی واتا زمـانی کۆمـەڵی کورد، هەروەهـا «زمـان گرنگتـرین نیشانەی نەتەوەیە» بەم جۆرەش «لسان العرب» = «لغة العرب» زمانی قسەکردن و خوێندن و نووسین.

2 - زمـان: ناوە بۆ ئەو پارچـە گۆشـتـە دیـارو ئاشـکـرایـەی کە وا لە دەمـدا، کە بەکـاردێـت بۆ قسـەکـردن و خواردن و چەشـتـن و بۆ ئەم دیـوو ئەو دیوکردن بە پارووش.

زاراوەی «زمـان» لە ناوەکـەوە وەرگیـراوە چونکـە بە هۆیـەوە هەست و نەبست و بیـروبـاوەڕو هەرچی هەیـە دەردەبڕرێت، هەر لەبەر ئەمەش بووە بە ناوو زاراوە بۆ ئەو ڕووداوە لە کوردیو عەرەبیـدا کە پێـیدەڵـێن «من باب اطلاق الجزء علی الکل» «ناونانی گشت بە ناوی بەش» «نـانـی ناوی بەشێـك لە گشت» بە هۆی ئەو پەیوەندییەی هەیە لە نێوانیانداو دەیان بەستێت - پێکەوە..

زمـان - زبـان - زوان: بە هەر سێ شێـوەکـەی بەکـارهـاتـووە لە کوردیـداو بەکـاردێت بە پێی زاراوەو ناوچە. لە فارسیدا (زبان)ە دوورنیە کاری ئەو زمانە بێت.

(زمان): لە ووشەی دارێژراوو لێکدراودا

1 - زمانەوان = زمان + ە + پاشگری (وان)[1] = ووشەی دارێژ راو. بە واتای خاوەن زمان = سەربەزمان = شارەزا = پسپۆر «عالم لغوی - متخصص» «Linguist»

زمانەوانی: علم اللغة «Linguistic»
2 ـ زانای زمان: زمانەوان = هاومەبەست.
3 ـ زانستی زمان: بڕوانە «زمانەوانی» لەسەرەوە.
4 ـ زمانناس «زمان + ناس» (ناس: ڕەگی چاوگ و فرمانی تێپەڕی ـ ناسین ـ ە) = ناوو ئاوەڵناوێکی لێکدراوە. بۆ کەسێکە زمان بناسێت، لە زمانی خەڵک بگات، شارەزای زمانیانە، یان شارەزای زمانەو ئاگاداری دەستوورو زانستەکەیەتی.
5 ـ دەستووری زمان = ڕێزمان.
6 ـ ڕێزمان ـ بڕوانە «دەستووری زمان».
7 ـ زمانزان (زمان + زان ـ ڕەگی چاوگ و فرمانی تێپەڕی زانین) = زمانزان زمانەوان ـ لغوی (زاراوە)
چەند زمانێك دەزانێت ـ ئاوەڵناوی لێکدراو
زمانناس.
لە چەند زمانێك دەگات.
8 ـ زمانە ـ
زووانە = «سەری دارێکی لەلەکراوی دادراوە بۆ ئەوەی زبانە
بکرێت بە کونی دارێکی تردا، هەروەها ئاسنێکی باریکە لە ئاوزوونەدا دەچێ بە کونی قایشا، بڵێسەی ئاگر»یشە.
9 ـ زمانە بچکۆلە: پارچە گۆشتێکی باریکە لە قوڕگدا. لە زمان دەچێت (لسان المزمار).
10 ـ زمانمەلیچك: «تووی درەختی بناو».
11 ـ زمان گرتن: (1) بۆ منداڵێك کە دێتە زمان، یەکەم جار دەست دەکات بە قسەکردن، زمانی دەکرێتەوە.
(2) ـ قسەکردن بەبێ شەرم، زمانی گرتووە = بێبیرکردنەوەو بێپەروا قسەدەکات، زمانی درێژ بووە.
هتد.....

زمان لە هەندێك ئیدیۆم و زاراوەدا:

1 ـ زمان پاك: زمانی پاکە، قسە جوان و ڕێك وپێك، قسەی نارەواو ناشیرین ناکات، ناوە کەس نابات بەخراپی، زمانی خۆی گرتووە.
زمان پاکی: زمانپاکی بەرزیی خاوەنەکەی دەردەخات.
2 ـ زمان پیس: دژی زمان پاکە ـ بۆ کەسێك بەکاردێت کە جوێن فرۆش و قسە ناقۆڵایە، لە قسەی ناشیرین بەولاوە هیچیتری لەدەم نایێتە دەری.
زمان پیسی ـ دژی ـ زمان پاکی ـ یە.
3 ـ زمان لووس: دەزانێت چۆن قسە بکات و کاری خۆی بباتەسەر، بەزمان گاڵتە بە خەڵك دەکات، زمان خۆشە.
4 ـ زمان خۆش = زمان لووسی: بەزمانی خۆش مار لە کون دێتەدەرەوە».
5 ـ زمان شیرین: بڕوانە زمان خۆش. لەگەڵ منداڵەکە بە زمانی خۆش و شیرین بجووڵێرەوە.
6 ـ زمان تاڵ: دژی (زمان شیرین)ە.
7 ـ زمان درێژ: زمانی درێژە: بۆ کەسێکە لە سنووری خۆی بچێتە دەرەوە، شەرم و گەورەیی لێك نەداتەوە، زۆر بڵێیەو زۆر لەسەر قسە دەڕوات، هارە لە زماندا، زمانێکی پێوەیە هەر نەبێتەوە. زمان درێژی.
8 ـ زمان کورت: دژی: زمان درێژە. بۆ کەسێکە کە لەبەر هەر هۆیەك بێت نەتوانێت لەسەر قسە بڕوات، دەم کوت ـ بکرێت.
9 ـ زمان شڕ = دەم شڕ = زۆر بڵێ = دەم دڕاو.
ئەوەی زۆریش بڵێت: چاکیش دەڵێت و خراپیش.
: 1 ـ زمان بەد = زمان شڕ، زمانبەدی.
11 ـ زمان دڕ: زمانی دڕە = دەم هارە، زمانی شڕە،

توندوتیژە لە زماندا، زمانی ئەوەندە تیژودڕە ئەڵێی نەشتەرە.

12 ـ زمان بەرباد: زمان بەد، زمان شڕ.

13 ـ زمان گیران = زمان شکان، لاڵ بوون، دژی زمان گرتن.

14 ـ زمان شکان: زمان گیران بڕوانە سەرەوە، زمانی شکاوە: لە قسەکەوتن: بەهۆی نەخۆشییەوە یان ترس، کە کوشندەو قورس بێت.

15 ـ زمان گەستن: پەشیمانی گرتن، پەشیمان بوونەوە، خەفەت خواردن بۆ شتێك کە لەدەست چووبێت.

16 ـ زمانباز: درۆزن، تەڵەکەباز. (زوانباز).

17 ـ زمان بەست: دەم بەست (زوانبەس).

18 ـ زمان بەستە: گیانداری بێزمان، بەسزمان.

19 ـ بەسزمان: خۆی (بەستە زمان)ە سەرنجی رووالەتی بدە). زمانی لە دەمدا نیە. دژی زماندارو زمان درێژە.

20 ـ زماندار: دژی (بەسزمان)ەو هاوەبەستی: دەم هەراشە.

21 ـ زمان کێشان: بۆ کەسێکی زۆر تینووە یان ماندوو و تینووە. دەڵێن: وەختە زمانم بشکێت لە تینوواندا.

22 ـ زمان شکان: بڕوانە زمان کێشان و (زمان شکان) لەسەرەوە بۆ بەراوردی کردن، زمان شکان لە قسەکەوتن لە عەزرەتانا بەڵام زمان کێشان بەتایبەتی منداڵ زمانی دەردێنێت، پیشانی دەدات واتە داوای ئاو دەکات، گەورەش لەم حاڵەتەدا وای بەسەر دێت.

23 ـ زمان بەرەڵڵا: دەم شڕ، زمان درێژ، زمانی زۆر بەرەڵـلایە، چەنەبازە، هەرچی بەزمانیدا بێت دەیڵێت بێبیرکردنەوەو بێشەرم.

24 ـ زمان بڕاو: زمانی بڕاوە، بۆ کەسێکە (نق لەخۆی ببڕێت) لەبەر هەر هۆیێك بێت.

هاوەبەستی: دەم کوت ـ بووە، زمانی نیە، هەروەك زمانی بڕابێت وایە لە بێ دەنگیدا. دژی زمان درێژ و زمان بەرەڵڵایە.

25 ـ زمانی بۆ نەخولقاوە: بێزمانە، بڕوانە (زمان بڕاو).

26 ـ دوو زمانە: دوو رووە، وەك وایە بەروو پشتی بۆ نیە، جێی بڕواو متمانە نیە.

روو بە روو دەم چەور

پاشە ملە دەم تەور

27 ـ زمانی ئەڵێی نەشتەرە: زمان شڕە، زمان دڕە زمان تیژە.

28 ـ زمانی لە دەمدا نیە: بڕوانە، زمانی بۆ نەخولقاوە.

29 ـ زمانی لەتەك سەریا بازی دەکات: چەنەبازە، زۆر بڵێیە، نازانێت بێدەنگ بێت.

30 ـ زمان درێژی دەست کورتە: بێدەسەڵاتە، هەر قسەی پێیەو بەس، هیچی لەدەست نایێت.

31 ـ زمانی زمان نیە: زۆر هارو هاجە، کەس دەرەقەتی ـ نایێت.

32 ـ زمانم بوو بە پەلاس ـ لە ماندوو بووندا و دەم هیلاك بوون.

33 ـ بە زمانی شێر ئەکا بە رێوی: (شێر ئەکاتە رێوی) زمانبازە، زمانی خۆش و شیرینە.

زمان: لە هەندێك پەندو قسەی نەستەقدا:

1 ـ زمان بەڵای سەرە.

یان، زمانو بە لە گیانو.

2 ـ زمان بووستێت سەر رەحەتە؛

یان: ئەگەر زمان بیەڵێت سەر رەحەتە.

3 ـ سەر ووتی بە زمانی.

هەتاکو تۆم جیرانی رەحەتیم نابێ لە گیانی

یان رەحەتیم نین لە گیانی.

4 ـ زمان سەرت نەبرم ئەبرى سەرم
5 ـ بە زمانى خۆش مار دێچێتە كونێ.
یان: زمانى خۆش مار دبەتە كونێ.
6 ـ بە زمانى خۆش مار لە كون دێتە دەرەوە
بەپێچەوانەی ژمارە (5 ـ پێنج) بەڵام هەر دوولا لەسەر (زمان خۆشی) وەستاوە.
7 ـ ئەگەر زاڵ نەبی بەستەزمان ئەبێ.
8 ـ ژێر بەندە زبان، ژێر دیزە ئاگر واتا:
زمانی مرۆڤ وەك ئاگری ژێر دیزە وایە.
9 ـ سەگ زمانی بگاتە برینی خۆی چاك ئەبێتەوە.
10 ـ زمان برییە سەر فەحسیاییە.
12 ـ بووكی زمان نەبوو، خەسووی ئیمان نەبوو.
13 ـ زمانی شیرین لە بە هەشتی هاتییە.
14 ـ زمان پارێزگارتە، ئەگەر پاراستت دەتپارێزێ.
15 ـ زمانی سۆر درۆیی ناكا.
16 ـ نانـت جۆیـین بێ و خولقت گەنمین بێ: واتـە زمانت خۆش بێت.

---

**زمان لە هەندێك هۆنراوەدا:**

زێوەر دەڵێت:
وای ووت كە كەوتە ئەو موسیبەتە.
«زمان بوەستێ سەر بە رەحەتە».
پیرەمێرد دەڵێت:
دەردی جوانییە پێوەندی پێی گوڵ
«بەڵای زمانە قەفەسی بولبول.

---

**زمان لە مەتەڵدا:**

---

ئەم لا دیوار ئەو لا دیوار تیایەتی سەگێكی هار (سەگی هار = زمان) كە دربێت نەك نەرم و قسەخۆش

**زمان لە هەندێك دووعادا**

1 ـ زمانت برن.
2 ـ زمانت بەبرین چێت.
3 ـ دەك لاڵ بێت، زمانی شكێت.

گشییـان بۆ كەسێـك بەكـاردێت كە هەڵەو هەڵەشی بكـات و ئەوەی نابێـت بیـڵێـت و بیــدرلێنێت بڵاوی دەكاتەوە، كەواتە دووعایە لەو كەسە نەك بۆی.

**سەرچاوەوە پەراوێزەكان:**

---

**پەراوێزەكان**

پاشگری (وان) پاشگرێكی (ناوی)ی كوردیی دیارو باوە بەواتای (خاوەن) دێت، بۆ ناوو ئاوەڵناو بەكاردێت وەك:

مەلەوان، پاڵەوان، ئاشەوان، كاروان، گاوان هتد...

2 ـ زبانە ـ زبانە ـ چۆتە عەرەبییەوە بۆ هەمان مەبەست بە گشتی.

**سەرچاوەكان:**

---

1 ـ ژ (8) و (10) خاڵ ـ فەرهەنگی خاڵ.
2 ـ پەندی پێشینان لە شیعری كوردیدا. كریم شارەزا.
2 ـ زێوەر شاعیر.
3 ـ پیرەمێرد.
4 ـ ئەوەی خۆم بە درێژی كات و توانا كۆم كردوونەتەوە لە قسـەی ئەم و ئەو، لێـرەو لەوێ كە تێكـرا زمـانی كوردی دەگـرێتـەوە، كە خۆی بۆ خۆی گەورەتـرین فەرهەنگی زمانە.

# جیاوازی نێوان فۆنیم و مۆرفیم



● غازی فاتح وەیس ●

**پێشەکی:**

هەر زانستێك کۆمەڵێك زاراوەی تایبەتی خۆی هەیەو ئەو زاراوانەش لە بنەڕەتدا موڵکی ئەو زمانەن کە ئەو زانستەی پێ شی‌کراوەتەوە، واتە زاراوەی زانستی بە چی زمانێك داهێنرابێت موڵکی ئەو زمانەیە. ئەمجا ئەگەر هەر زمانێکی تر ئەو زاراوانەی وەرگرت، دەبێ واتاو مەبەستەکانیشیان لەگەڵدا وەربگرێ، بەڵام زمان لە خۆیەوە زاراوەی زانستی لە زمانێکی ترەوە وەرناگرێ، بەڵکو لە ڕێگەی ئەو کەسانەوە وەردەگیررێت کە ئەو زمانە دەزانن و لە بنەڕەتدا زاراوەکانی پێ داهێنراوە. . هەروەها دەبێ ئەو کەسانە پسپۆریش بن لەو زانستەدا کە زاراوەکانی بۆ داهێنراوە. لە ئەنجامدا ئەو پسپۆرانە لە زمانەکەی خۆیاندا

ئەو زاراوانە بەکاردەهێنن بۆ هەمان مەبەست و دوا بەدوای ئەوان خوێنەری ئاسایش لە ڕێگەی لاسایی کردنەوەوە بەکاریان دەهێنن، بەلام هەروا بە ئاسانی ناتوانن ئەو زاراوانە لە شوێنی تایبەتی خۆیاندا بەکاریان بهێنن و نازانن بە شێوەیەکی دروست بۆ هەمان مەبەست مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن. لە ئاکامدا دەکەونە گێژاوی هەڵەکردنەوەو لەوانەشە تا ڕادەیەك زاراوەکان تێك بدەن و زانستەکەش بەرەو قوژبنێکی تەسك بەرن.

زانستی زمانیش وەکو هەر زانستێکیتر مەودای فراوانەو کۆمەڵێك زاراوەی تایبەتی خۆی هەیە. کە وابوو دەبێ زمانەوانی دەست پێکەرو خوێنەری ئاسایی بە تەواوەتی دڵنیا بن لەوەی کە بە چاکی لە زانستەکە گەیشتوون بە ئاسانی بتوانن زاراوەکانی ئەم زانستە وەکو هەر وشەیەکیتری ئاسایی نێو زمانەکەیان بەکارهێنن، بەلام بەداخەوە زۆر جار دەبینین زمانەوانی دەست پێکەر هێشتا لە ئەلف و بێی زانستی زمان نەگەیشتووە کەچی خۆی دەهاوێتە نێو ئەم زانستەوەو تووشی گەلێ هەڵەی سەیر دەبێو بگرە تا ڕادەیەکیش لە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زمانەوانیش لادەدات و ووتارەکەی لە حیکایەت گێرانەوەیەکی پەتی دەچێو زانستەکەش تێکەڵ و پێکەڵ دەکات.

لێرەدا ئێمە نامانەوێ باسی ئەو جۆرە ووتارانە بکەین چونکە زانستی زمان لە نێو ئێمەی کورددا تازەیەو هێشتا پەلی نەهاویشتووە. لەبەر ئەمە بە چاکمان زانی بە شێوەیەکی سادە جیاوازی نێوان فۆنیم و مۆرفیم دەستنیشان بکەین بۆ ئەوەی لە جێگەی دروستی خۆیاندا بەکاربهێنرێن.

## لێکۆڵینەوە

فۆنیم (Phoneme) و مۆرفیم (Morpheme) دوو زاراوەی زانستی زمانن و بە گشتی بە زمانی ئینگلیزی داهێنراون. ئەم دوو زاراوەیەش لە دوو ئاستی جیاوازی زانستی زماندا بەکار دەهێنرێن، واتە فۆنیم لە ئاستی فۆنۆلۆژیدا (Phonology) و مۆرفیم لە ئاستی مۆرفۆلۆژیداو هەر تێکەڵ کردنێکی ئەم دوو زاراوەیە، وەیا دەرهێنانیان لە ئاستە تایبەتیەکەی خۆیان هەڵەیەو زمانەوانی پێگەیشتوو بە زەقی دەبینرێ:

## کورتە مێژوویەکی زاراوەی فۆنیم:

فۆنیم وەکو فیکرەیەك کۆنەو ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە مرۆڤ بۆ یەکەم جار ئەلف و بێی لە باتی وێنە بەکارهێناوە بۆ نووسینەوەی زمان، بەلام هەست پێکردن بە هەبوونی فۆنیم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (1450)ی زاین. لەم ساڵەدا شای کۆریا دەرکی بە هەبوونی فۆنیم کردووە، چونکە دەنگی [پ] (تۆزێك قورس] لە دەنگی [ب] جیاکردووەتەوە، ئەگەرچی هەردووکیان بە تاقە پیتێك دەنووسرانەوە لە زمانی کۆریدا. واتە شای کۆریا، وەکو دوو دەنگ مامەڵەی لەگەڵ دەنگی [پ]ی قورس و دەنگی [ب]دا کردووە، **ئەگەرچی هەردووکیان سەربەیەك فۆنیم بوون.** هەر لەبەر ئەم هۆیەش (دانیال جۆنز) شای کۆریایی بە زانایەکی زانستی دەنگ داناوە. لە ساڵی (1845ز)دا (دیکۆرتنی) (B. de Courtnoy) بنەمای تیۆری فۆنیمی دامەزراندووە.

(کۆرتنی) زانایەکی فیلۆلۆژی پۆڵەندی بووەو لە ڕووسیادا پێگەیشتوو و زاراوەی (Zvuk) ی بۆ دەنگ بەکارهێناوەو زاراوەی (Fonema) شی بۆ فۆنیم داناوە. کە وابوو بنەڕەتی زاراوەی فۆنیم لە زمانی ڕووسییەوە هاتووە. لە ساڵی (1870ز)دا (پاسی) (Passy) ئەوەی پێشنیارکردووە کە دەبێ بۆ **هەر دەنگێك فۆنیمێکی جیاواز** دابنرێو ئەگەر لە وشەیەکدا فۆنیمێك بە فۆنیمێکیتر جێگیرکرا، ئەوا دەبێ

واتای ئەو وشەیە بگۆڕێ. ساپیر (Sapir) یەکێك بوو لەو زانایانەی کە هیندییە ئەمریکاییەکانی فێری خوێندن و نووسین دەکردو هەوڵی دیراسەکردنی زمانەکەیانی دەدا، لە کاتی فێرکردنیاندا، ساپیر هەستی بەوە کرد کە گۆڕانی هەندێ دەنگیان لە لا گرنگ نییەو گۆڕانی هەندێکی تریان لەلا گرنگە، چونکە دەبوونە هۆی تێکدانی تێگەیشتنیان.

ئەو دەنگانەی کە گۆڕانیان دەبووە هۆی تێك دانی تێگەیشتنی هیندییەکان، ساپیر نرخی سایکۆلۆژی بۆ دانان و مامەڵەی فۆنیمی لەگەڵدا کردن و ئەوانەی گۆڕانیان هیچ گرنگییەکی نەبوو مامەڵەی دەنگی لەگەڵدا کردن چونکە نرخی سایکۆلۆژییان نەبوو.

فیکرەی فۆنیم لای (جان باودۆین دیکورتنی) لەسەر ئەساسی دەنگ دامەزرا، بەڵام هینری سویت (Hinry Sweet) و پاسی گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ئەتوانرێ لە دوو ڕووەوە سەیری فۆنیم بکرێ: یەکەم لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە کە وێنەی دەنگەو دووەم لە ڕووی فیزیکییەوە کە شێوەی ڕاستەقینەی درکاندنی دەنگە. جۆری یەکەم ناوی «سایکۆفۆنەتیك»ی لێ نرا (Psychophonetics) کە فۆنیمەو ئەوی دی ناوی (فیزیۆفۆنەتیك) (Physiophonetics) کە دەنگە. دانیاڵ جۆنزیش لە ساڵی (1917)دا زاراوەی فۆنیمی بە تەواوەتی هێنایە مەزرای زانستی زمانەوەو لە ساڵی (1930)بەرەوژوور تیۆریی فۆنیم لە گەلێ وولاتدا بڵاوبووەوە، بە تایبەتی لە ئەمریکادا. بلۆم فیلدیش لەو زانا ئەمریکاییانە بوو کە بە تەواوەتی فۆنیم و خوێنی لەیەکدی جیاکردەوە. ئەوەی شایانی باسە زانستگای لەندەن دەورێکی هەرە گەورەی گێڕا لە بڵاوکردنەوەی تیۆریی فۆنیم دا. لە ئەنجامدا ئەم دوو خەتەراستە بۆ دەستیشان کردنی فۆنیم بەکارهێنرا. هەر لەو ماوەیەدا (D. M. Beach) «بیچ» فۆنیمی عەرووزی [2] داهێنا، وەکو کورت و درێژی دەنگ و ستریس... هتد.

وە زاراوەی (کرۆنیم)ی [3]، (Chroneme) بۆ درێژیو کورتی ڤاوڵ بەکارهێنا. بۆ نموونە [ی] ووشەی «دیت» و «دین» دوو ئەلۆکرۆنی کرۆنیمی ڤاوڵی درێژن لە زمانی کوردیدا.

## فۆنیم

بە گوێرەی مێژووی باس کردن و بەکارهێنانی زاراوەی فۆنیم، دەبێ فۆنیم دوو تایبەتی هەبێ: یەکەم دەبێ واتای ووشە بگۆڕێو دووەم دەبێ ڕاستی سایکۆلۆژی تێدا هەبێ. هەروەها دەبێ فۆنیم بێواتا بێ، ئەم تایبەتییەش لە یەك لایەنەوە گرنگە چونکە بە هۆیەوە فۆنیم لە مۆرفیم جیادەکرێتەوە.

لە سەرەتادا فۆنیم بە بچووکترین لەتە دەنگ ئەژمێردرا لە زماندا، بەڵام لە دواییدا دەرکەوت کە فۆنیم گەلێ دوورە لە ڕاستی دەنگەوە. لەبەر ئەمە ناساندنی زاراوەی فۆنیم گۆڕاو کرا بەوەی کە فۆنیم بچووکترین کەرتی ووشەیەو بەرگێکی ڕووتی دەنگەو لە هەندێ زماندا بەرانبەر بە پیت ڕادەوەستێ. کە وابوو فۆنیم بەرگێکی نەگۆڕاوی دەنگە لە زمانداو دەنگیش بەرگێکی هەمیشە گۆڕاوی هەیە لە ئاخاوتندا. بۆ نموونە دەنگی [د] لەم ووشانەی خوارەوەدا وەکو یەکدی نین:

دەست، سەد، هەڵدان.. هتد بەڵام هەموویان سەر بە تاقە فۆنیمێکن چونکە لە ڕووی شکڵەوە یەکن.

ئەوەی شایانی باسە فۆنیم لە دوو ڕووەوە دەناسێنرێ (بەپێی بۆچوونی کۆن)، یەکەمیان لە ڕوویەکی وەسفییەوە، کە دەڵێ فۆنیم بنەڕەتی کۆمەڵە دەنگێکە، واتە چەند دەنگێك سەر بە یەك فۆنیم دەبن، بۆ نموونە [ك]ی ئووشەی «کێ»و [ك]ی ووشەی «کۆ» سەر بە فۆنیمی ك ن.

دووەمیان لە ڕووی سیمای جیاکەرەوە دەناسێنرێو ڕابەری ئەم ناساندنەش «ترۆبتزکۆی»یە بە پێی ئەم ناساندنە فۆنیم بریتییە لە کۆمەڵێك سیمای جیاکەرەوە

(Distinctive Features) ، [4] بۆ نموونە فۆنیمی پ بریتییە لەم سیمایانەی خوارەوە:

+ لیوی
+ گیر (وەستاو)
+ کپ
+ قورس.. هتد.

لەبەر ئەوەی زاراوەی فۆنیم و فۆن (Phone) لە زۆر شوێندا تێکەڵ بە یەکدی دەکران، زۆربەی زمانەوانە تازەکەرەوەکانی زانستی زمان زاراوەی فۆنیمیان لە مەزرای بەکارهێنان وەدەرکردو زاراوەی سیگمێنتیان (Segment) لە باتی بەکارهێنا، بۆ ئەوەی زمانەوانەکان لە سەرئێشەی ناساندنی ناتەواوی فۆنیم رزگار بکەن و چی دی تێکەڵی دەنگی نەکەن.

فۆنیم، یان سیگمێنت،[5] زاراوەیەکی هەرە گرنگە لە سنووری فۆنۆلۆژیداو گۆڕانی دەبێتە هۆی گۆڕانی واتای وشەو ڕستە. بۆ نموونە ئەم دوو ڕستەیەی خوارەوە تەنیا لە ڕووی تاقە فۆنیمێکەوە جیاوازن:

1 - کەرێك خۆی کرد بە ژووردا. (وشەی کەر، بەرێ سووك).

2 - کەرێك خۆی کرد بە ژووردا. (وشە کەر بە ڕێی قورس).

هەروەها لە زماندا، لە ئاستی فۆنۆلۆژیدا، بە پێی ڕیزکردنی فۆنێم چەند یاسایەك دادەنرێ، بۆ نموونە ئەم یاسا فۆنۆلۆژییە لە زمانی ئینگلیزیدا دادەنرێ:[6]

[P L]...
S [t r]...
[k y]...
W]...

ئەم یاسا فۆنۆلۆژیە دەڵێ: ئەگەر هەروشە یەکی ئینگلیزی بەسێ کۆنسنانت دەست پێبکات و ڤاوڵیان لەنێواندا نەبێ، ئەوا ئەبێ ئەو وشەیە بە (S) دەست پێبکات و دەبێ دووەم فۆنیم یەکێك لەم سێ فۆنیم نەبێ: /P/ /t/ /K/ وە سێیەم فۆنیمیش ئەبێ یەکێك بێ لەم چوار فۆنیمە: /L/ /r/ /y/ /W/ بەم جۆرە ئەگەر هەر وشەیەکی ئاوهای ئینگلیزی بە فۆنیمی /s/ دەست پێبکات و دووەم و سێیەم فۆنیم ئەو فۆنیمانە نەبن، ئەوا ئەو وشەیە بە وشەی زمانی ئینگلیزی دانانرێ.. هەروەها، بۆ نموونە، ئەگەر هەر وشەیەکی کوردی بە (لام) دەست پێبکات، ئەوا دەبێ لامەکە لامێکی (وەیا فۆنیمی /L/ ی)سووك بێ، ئەگەر لامی سووك نەبێ ئەوا ئەو وشەیە بە وشەی زمانی کوردی دانانرێ:

→ ◆ (لامی سووك) L .......... ....

مۆرفیم:

---

زاراوەی مۆرفیم لە ئاستی مۆرفۆلۆژیدا بەکار دەهێنرێت. مۆرفیم بچووکترین دانەی جیاکەرەوەیە لە ڕێزماندا، واتە لە نزمترین ئاستی ڕێزماندا، مۆرفیم وەکو بچووکترین دانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ و ئەگەر گەردان بکرێ واتای دەگۆڕێ. بۆ نموونە ئەگەر وشەی «مامۆستا» کەرت بکرێ ئەوا واتا بنەرەتییەکەی تێك دەچێ، چونکە ئەم وشەیە بریتیە لە یەك مۆرفیم.

مۆرفیم لە ڕووی پێك هاتنەوە دوو جۆرە:

1 - مۆرفیمی سەربەست.
2 - مۆرفیمی بەند.

مۆرفیمی سەربەست ئەو مۆرفیمەیە کە بە تەنیا بەکار دەهێنرێت، وەکو منداڵ، ژن، کور.. هتد. بەڵام مۆرفیمی بەند ئەو مۆرفیمەیە کە هەرگیز وەکو دانەیەکی سەربەست بەکارناهێنرێت.

لە ڕووی وەزیفەوە مۆرفیم دەکرێت بە دووبەبە شەوە:

1 - مۆرفیمی دارشتن.
2 - مۆرفیمی ڕێزمانی.

مۆرفیمی دارشتن لەگەڵ مۆرفیمێکی دیکەدا ووشەیەکی تازە دروست ئەکات، وەکو: هەڵ، ڕا، لێ. . هتد. هەڵ خستن، ڕاکردن، لێبوردن. بەڵام مۆرفیمی ڕێزمانی ئەو مۆرفیمانەن کە تەنیا دەوری ڕێزمانی دەبینن، وەکو: م، ن، ین. . هتد.

ئەوەی شایانی باسە هەرچی ڕاناوی لکاو هەیە لە زمانی کوردیدا دەتوانرێ بە مۆرفیمی ڕێزمانی دابنرێن، چی ڕاناوی تەمەلوك بێو چی ڕاناوی گونجاندنی نێوان فرمان و بکەر بێ، چونکە **ڕاناوەکانی تەمەلوکیش دەوری گونجاندن دەبینین** لە نێوان بکەرو بەرکارداو **جارجاریش** لەگەڵ فرماندا دێن، وەکو: خواردمان، خواردیان. . هتد. تەنیا جیاوازی لە نێوان ڕاناوی تەمەلوك و **ڕاناوی گونجاندنی نێوان بکەرو بەرکاردا ئەوەیە** کە ڕاناوی تەمەلوك بەرکاری دەوێو لەگەڵ فرمانی تێپەڕدا دەردەکەوێو ڕاناوی گونجاندنی نێوان بکەرو فرمان لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕدا دەردەکەوێو هەردووکیانیش داخراون و ڕێگا نادەن هیتر بێتە نێوانیانەوە هەرچی پاشگرو پێشگرو ناوگریش هەیە بە مۆرفیمی دارشتن دادەنرێن.

جگە لەوەی کە دەبێ زمانەوان بە چاکی لەم جۆرە زاراوانە بگات، ئەبێ ئاستەکانی زمانیش بە ووردی بزانێو شارەزای سنووری هەموویان بێ. چونکە ئەگەر هەر زاراوەیەك لە ئاستە تایبەتییەکەی خۆیدا بەکار نەهێنرا، ئەوا دەبێتە هۆی تێکدانی زانستەکە. بۆ نموونە هەندێ زمانەوانی دەست پێکەری کورد «ت»ی ووشەی «ناووت» و «م»ی ووشەی «دایکم» بە فۆنیم دادەنێن و نازانن کە (ت)و (م) لە سنووری فۆنۆلۆژی دەرچوون و چوونەتە سنووری مۆرفۆلۆژییەوە. ئا ئەم جۆرە نەزانینەیە کە دەبێتە هۆی دروست بوونی هەڵەی لە ئەندازە بەدەرو هەر ئەم جۆرە هەڵەیشە وا لە خوێنەر دەکات زانستی زمانی لەلا ووشك و برنگە بێ. بۆ جیاکردنەوەی ئاستی فۆنۆلۆژیو مۆرفۆلۆژی ئەم نموونە ساکارەی خوارەوە دەهێنینەوە.

/م/ = لە ووتەی «مالم»دا دەبێتە فۆنیم، ئەگەر ئەم ووشەیە بەسەر فۆنیمەکانیدا گەردان بکەین: «م + ا + ل + م».

(م)ی دووەم لە ووشەی «مالم»دا دەبێتە مۆرفیم ئەگەر ئەم ووشەیە بەسەر مۆرفیمەکانیدا گەردان بکەین: ماڵ + م. بەم جۆرە ووشەی «ماڵم» بریتییە لە دوو مۆرفیم: یەکێکیان مۆرفیمێکی سەربەستە، کە (ماڵ)ەو ئەوی تریان (م)ە، کە مۆرفیمێکی ڕێزمانیی بەندە. هەروەها ئەگەر بڵێین: (ماڵەکەم) ئەوا دەبێتە سێ مۆرفیم:

دارشتن

ماڵ + ەکە + م

مۆرفیمی سەربەست مۆرفیمی ڕێزمانی

کە وابوو مۆرفیم بەم جۆرە دابەش ئەکرێت:

مۆرفیم

مۆرفیمی سەربەست مۆرفیمی بەند

مۆرفیمی دارێژان مۆرفیمی ڕێزمانی

بەڵام دیسان لە نێو مۆرفیمی دارشتن دا چەند مۆرفیمێك هەیەو دەوری ڕێزمانی دەبینن، وەکو:

ەکە، یەك (ێك)، ان، چونکە ـ ەکە یان (کە) ووشە دەکاتە ناسراوو ێك (یەك) ووشە دەکاتە نەناسراوو «ان» نیش نیشانەی کۆیە.

**ئەنجام:**

لە ئەنجامدا، لەم چەند خاڵەدا فۆنیم و مۆرفیم لە یەکدی جیادەکەینەوە:

| فۆنیم | مۆرفیم ١ |
| --- | --- |
| 1 ـ قاڵبێکی سایکۆلۆژی هەیە نەك فیزیاوی، | 1 ـ قاڵبی سایکۆلۆژی لە فۆنیمەکانییەوە وەردەگرێ |

| | |
|---|---|
| چونکە قاڵبی فیزیاوی لە دەنگدا پەیدا دەبێ. | چونکە مۆرفیم لە تاقە فۆنیمێك وەیا زیاتر پێك دێت. |
| 2 ـ بە تەنیا واتا نابەخشێ، بەڵام دەتوانێ واتای وشە بگۆڕێ. | 2 ـ تەنیا مۆرفیمی سەربەست واتا ئەبەخشێ و بەشێك لە مۆرفیمە بەندەکانیش دەوری ڕێزمانی دەبینن و ئەو بەشەکەی تریان یاریدەدەرن. |
| 3 ـ بە هیچ شێوەیەك لەت ناکرێ. | 3 ـ هەندێ مۆرفیم لەت دەکرێ و لەتەکان واتا ئەبەخشن بەڵام هیچ پێوەندیان بە واتا بنەرەتییەکەوە نامێنێ. |
| 4 ـ قاڵبی فیزیاوی بۆ دروست ئەبێ ئەگەر لە زنجیرەی ئاخاوتندا مامەڵەی لەگەڵدا کرا، واتە ئەگەر وەکو دەنگ تەماشابکرێ. | 4 ـ قاڵبی فیزیاوی لە دەنگەکانیەوە وەرئەگرێ لەزنجیرەی ئاخاوتندا. |

**پەراوێزەکان:**

1 ـ مەبەست لە داهێنانی زاراوەی فۆنیم ومۆرفیم ئەوەیە کە لەزمانی ئینگلیزدا ئەم دوو زاراوەیە بەڕادەیەکی فراوان بەکار هێنراون و بەزۆری لەم زمانەوە بڵاوبوونەتەوە، ئەگەرچی ئەم دووزاراوەیە لەبنەڕەتدا موڵکی گریکن..

2 ـ فۆنیمی عەرووزی بریتیە لە سترێس و ئاوازەو گۆڕانی نەغمە.. هتد. بۆ نموونە سترێس لە چەند زمانێکدا دەوری فۆنیم ئەبینێ، چونکە ئەبێتە هۆی گۆڕانی واتای وشە بێ ئەوەی فۆنیمەکانی ئەو وشەیە بگۆڕێن، یان زیادوکەم بکرێن.. لەزمانی کوردیشدا گۆڕانی سترێسی سەر برگەی چەند وشەیەك ئەبێتە هۆی گۆڕانی واتای ئەو وشەیە:

هەمانە. سترێس لەسەر برگەی یەکەمە.
هەمانە. سترێس لەسەر برگەی دووەمە.

هەروەها ئاوازەش هەمان دەور ئەبینێ:

ئازاد ڕۆشت بۆ بازاڕ؟ ئاوازە لە نزمەوە بۆ بەرز.
ئازاد ڕۆشت بۆ بازاڕ. ئاوازە لە بەرزەوە بۆ نزم.

3 ـ کرۆنیم سیمایەکە، یان زاراوەیەکە بۆ درێژی ڤاوڵ بەکار ئەهێنرێ لەئاخاوتندا. بۆ نموونە ڤاوڵی کورتی /و/ لەووشەی (کور)دا وڤاوڵی /وو/ لە ووشەی (کوور)دا دوو کرۆنیمن و /ی/ ووشەی (پیت)و /ی/ ووشەی «دین» دوو ئەلۆکرۆنی کرۆنیمی /ی/ن.

4 ـ بڕوانە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ: ژمارە (106) لاپەرە (60 ـ 71). 1985. لەم وتارەدا بە دووروودرێژی باسی سیمای جیاکەرەوەمان کردووە.

5 ـ فۆنیم و سیگمێنت بۆ یەك مەبەست بەکار ئەهێنرێن زاراوەی فۆنیم لە مێژەوە بەکار هێنراوە، بەڵام زاراوەی سیگمێنت تازەیە.

6 ـ مەبەست لەم یاسایە ئەوەیە کە نابێ ئەو سێ کۆنسنانتە ڤاوڵیان لەنێواندا هەبێ.

کەوابوو ئەگەر هەر وشەیەکی زمانی ئینگلیزی بە سێ کۆنسنانت دەست پێبکات ئەوا ئەبێ یەکەم کۆنسنانت (s) بێ. بۆ نموونە:

**Spleen, Screen**

**Street, Spring** ... هتد.

سەرچاوەکان:


ـ وریا عومەر ئەمین. نووسەری کورد. ژمارە (9). لاپەرە (83 ـ 89) (1982).

- Jones, W. E and Laver, J - Phonetics in Linguistics - London Group Ltd. London 1973.

- Hartman, R. R. and Stork, F. Dictionary of Language and Linguistics. London 1973.

## تێنەپەر

# فرمانێکی بکەرنادیارە

وریا عمر امین
بەشی کوردی ـ دانشگای بەغا

بە پێی ئەو پێناسینانەی باون. . فرمانی تێپەڕ ئەوەیە کە ئەتوانێ بەرکار وەرگرێ وەك لە رستەی (من ئەخۆم) فرمانی (ئەخۆم) تێپەڕە چونکە ئەتوانێ بەرکارێکی وەك (سێو) وەرگرێو ڕستەکە ببێ بە من سێو ئەخۆم.

فرمانی تێنەپەڕیش ئەوەیە کە بەرکار وەرناگرێ وەك لە ڕستەی (ئێمە نووستین)دا. ئەوەی ئەم پێناسینانە هەڵئەوەشێنێتەوە و کەلەبەریان تیا پەیا ئەکات پێناسینی (بکەر)و (بەرکار)ە وسروشت پەیوەندیی سیمانتیکیانە بەفرمانا لەناو چوارچێوەی رستەدا.

بکەر ئەو کەسەیە یا ئەو شتەیە کە کارەکە ئەکات و بەرکارئەو کەسەیە یا ئەو شتەیە کە پێشوازیی کارەکە ئەکات. .واتا کارەکەی ئەکەوێتە سەر. بەپێ ئەم پێناسینانە لەرستەی:

ئاهەنگ گوڵ ئەچنێ.

(ئاهەنگ) بکەرە چونکە ئیشەکە ئەکات. . (گوڵ) یش بەرکارە چونکە ئەوئیشەی کە ئاهەنگ ئەیکات کار لە گوڵەکە ئەکات کە (چنین) یەتی. لەرووی کاتەوەش بکەر

پێش دەسخەری ئەکات.

ئیستە بە پێی ئەم پێناسین و مەنتیقە رستەی:

**ئاهەنگە دەنگی رزگار ئەبیستێ.**

شی‌بکەرەوەو بزانە بکەر وبەرکار کامانەن؟

گەر بکەر ئەوە بێ کە کارەکە ئەکات و بەرکار ئەوە بێ کە کارەکــەی ئەکــەوێتــە سەر و پێش دەسخــەریش لەلایــەن بکــەرەوە بێ... لەم رستــەیـەدا ئەبێ (رزگــار) بکەر بێ و (ئــاهــەنـگ) بەرکــار بێ. چونکــە یەکــەم (رزگــار)ە ئیشێ ئەکات کە (قسە کردن)ە ئەنجا کار لە (ئاهەنگ) ئەکات کە (بیستن)ەکەیە. گەر رزگار قسە نەکات ئاهەنگ نابیبــستێ.

هەمان شت لەگەڵ فرمانی (بینین) لە رستەی (من تۆ ئەبینم).. ئەبێ (من) بەرکــار و (تــۆ) بکــەر بێ.. چونکە (تۆ)ی کارت لە (من) کردووە.. (تۆ) نەبی (من) نابینم..

لە ژێــر تیشکی لێکـدانــەوەی مانــای ئەم دوو رستــەیـە (بکەر)و (بەرکار) چۆن پێ ئەناسرێ؟

1 ـ ئازاد کتێبێکی لە شێرکۆ وەرگرت.

2 ـ شێرکۆ کتێبێکی دا بە ئازاد.

لە هەردووکیــانــدا پەیــوەنـدی‌ی سیمــانتیکی‌ی نێـوان (شێــرکــۆ) و (ئــازاد) بەتــەواوی وەك یەك وایــە.. کەچی لەرووی پەیـوەنـدی‌ی رێـزمانی‌یەوە لەرستەی یەکەما (ئازاد) بکــەرە و (شێــرکــۆ) بەرکــاری ناراستــەوخــۆیــە.. لەرستەی دووەما (شێرکۆ) بکەرەو (ئازاد) بەرکاری ناراستەو خۆیە..

گەلێ نموونەی تری لەم بابەتە ئەدۆزرێتەوە لەزمانا تیایانا چەمکی بکــەر و بەرکــار و پەیـوەنـدی‌ی سیمــانتیکی‌یــان بە فرمانەوە بە پێچەوانەی ئەو پێناسینانە بێ بۆیان دانراوە.

گوایا فرمانی تێنەپەڕ ئەوەیە کە بکەر وەرئەگرێ و بەرکار وەرناگرێ.. بۆ ئەمەش نموونەی لەم بابەتە ئەهێنرێتەوە:

داروەکە شکا.

دارەکە : بکەرە

شکا : فرمانە.

گەر بە وورد‌ی لەرووی ماناوە لەم رستەیە بکۆڵینەوەو و شی‌بکــەینــەوە ئەبینین ئەوەی کە تیــایــا بە بکــەر لەقــەڵەم ئەدرێ لە راستیــدا چەمکی بەرکــاری‌ی بەرئــەکەوێ چونکە دار یا هەچ شتێکی تر هەرگیــز لە خۆیــەوە ناشکێ. ئەبێ هێــزێ کاری تێ‌کــردبێ وشکــانــدبێتی... ئەو هێــزە ئەبێ بکەرەکە بێ.

بۆ زیــاتــر روون کردنــەوەی ئەم لایــەنــە ئەم رستــانــەی خوارەوە لە رووی مانــاو پەیــوەنـدی‌ی نێـوان ووشــەکانیانەوە بەراوورد بکە.

1 ـ دارەکە شکا.

2 ـ با دارەکەی شکاند.

3 ـ ئازاد بە تەور دارەکەی شکاند.

ئاشکــرایــە کە پەیـوەنـدی‌ی مەنتیقی‌ی نێوان (دارەکە) و (شکان)دا لە هەرسێ حاڵەتدا یەکە.. (دارە و شکاوە)..

لەکاتێکا بە پێی شی‌کردنەوەی رێزمانی ـ کەباوە ـ دارەکە لە رستــەی یەکــەما بکــەرە و لەرستــەی دووەمــا بەرکــاری راستــەوخــۆیــە و لە رستەی سێ‌یەما بەرکاری ناراستەوخۆیە (چونکە ئازاد یەکەم دەستی لە تەورەکە داوە واتا تەور ئەبێ بەرکاری راستەوخۆ بێ).

بە پێی ئەم لێکدانەوەیە دەرئەکەوێ، کە بکەری هەموو فرمــانێکی تێنــەپــەڕ لە بینــاغــەدا بەرکــارە.. چونکــە هیــچ گیانلەبەرێ یاشتێ نی‌یە بکەوێ یا بجووڵێتەوە یابخەوێ بێ هۆ (دەری بێ یا ناوی).. ئەم هۆیە بکەرە راستەقینەکەیە.

هەنــدێ دیــاردە هەیــە روودانیــان لە ژوور دەســەڵاتی مرۆڤ دایــە.. وەك (مــردن ـ خزیــن ـ کەوتــن ـ پژمــین ..هتــد).. بکــەری ئەم رووداوانــە (فــرمــانانە) لەژێر کار تێ‌کــردنی هێــزێکی نادیــار هەڵس وکــەوتێ ئەنوێنن.. ئەم هێزە نادیارە بکەرە سیمانتیکی‌یەکەیە و ئەوەی لە رێزمانا بە بکەری تێنەپەڕ ناو ئەبرێ لە راستی‌دا چەمکی بەرکاری‌ی بەرئــەکــەوێ. کەی هێــزەکــە زانــرا چی‌یــە.. بە پاسایەکی رێزمانی تێپەری فرمانەکە دائەرێژرێ و بکەرە راستەوزخۆکە

پێشان ئەدرێ[1] وەك:

منداڵەکە نووست. (لەخۆیەوە ـ سروشت نواندی)

ئاواز منداڵەکەی نوواند. (گەر ئاواز نەبا منداڵەکە لەو ساتە تایبەتی‌یە نەئەنووست... واتا ئاواز بوو بە هۆی نووستنی)

گەر ئەم دیاردەیە بەراوورد بکرێت لە گەڵ فرمانی (بکەر نادیار)دا.. دەرئەکەوێ کە فرمانی بکەر نادیار تێپەڕە ئەکرێ بەتێنەپەڕ لەبەر نەزانینی یا شاردنەوەی بکەرە راستەقینەکە یا ئەوەی بەسەر بەرکارا دێت لەژوور دەسەڵاتی‌یا ئەبێ. ئەمە بەڵگەی سیمانتیکی..

بەڵگەی (رێزمانی)یش ئەوەیە ـ کە فرمانی تێپەڕ ئەکرێ بە بکەر نادیار. خۆی وەك فرمانێکی تێنەپەڕ پێشان ئەدات لەڕووی پەیوەندی‌ی بە راناوی لکاوەوە. لە رابردوودا کۆمەڵی

(م ـ یت ـ ە ـ ین ـ ن ـ ن) وەرئەگرێ..

| | | |
|---|---|---|
| من | | م |
| تۆ | | یت |
| ئەو | نووست | — |
| ئێمە | کوژرا | ین |
| ئێوە | | ن |
| ئەوان | | ن |

بەمە دەرکەوت کە فرمانی تێنەپەڕ لەڕووی پەیوەندی‌ی سیمانتیکی‌یەوە بە بکەرە رێزمانی‌یەکەیەوە فرمانێکی بکەر نادیارە.

بە بەراوورد کردنی یاسای کردنی رستەی فرمان تێنەپەڕ بە هی تێپەڕ لەگەڵ یاسای کردنی رستەی بکەر دیار بەهی بکەر نادیار دەرئەکەوێ کە ئەم دوو دیاردەیە پێچەوانەی یەکترن..

1 ـ یاسای گۆڕینی رستەی فرمان تێنەپەڕ بە هی تێپەڕ




واتا

1 ـ راناوی لکاو لائەبرێ.

2 ـ بکەر شوێنی بەرکار ئەگرێ.

3 ـ بکەر زیاد ئەکرێ.

4 ـ رەگی داهاتووی فرمانەکە وەرئەگیرێ.

5 ـ گەر کاتی فرمانەکە رابردوو بێ (اند)و داهاتوو بێ (ێن)ی ئەخرێتە سەر.[2]

6 ـ نیشانەی جۆری کات (ئە ـ بوو ـ ووە.. هتد) شوێنی خۆی ئەگرێ.

7 ـ بەپێی کەس وژمارەی بکەرە زیاد کراوەکە راناوێکی لکاو ئەخرێتە سەر فرمانەکەو بەپێی یاساکانی راناوی لکاو شوێنی خۆی ئەگرێ.

نموونە: گەر بمانەوێ رستەی:

منداڵەکان نوستبوون.

بکەین بە رستەیەکی فرمان تێپەڕ.. بەپێی یاساکان ئەبێ:

1 ـ راناوی لکاو لابرێ

منداڵەکان نوستبوو

2 و 3 ـ بکەر شوێنی بەرکار بگرێو بکەرێکی تازەی بخرێتە سەر

ئەو منداڵەكان نووستبوو

4 ـ ڕەگی داهاتووی فرمانەكە وەربگیرێ

ئەو منداڵەكان نوو

5 ـ فرمانەكە ڕابردووە (اند)ی بخرێتە سەر

ئەو منداڵەكان نوواند

6 ـ نیشانەی جۆری كات شوێنی خۆی بگرێ، لێرە (بوو)ە نیشانەی ڕابردووی دوور.

ئەو منداڵەكان نوواندبوو

7 ـ بەپێی كەس وژمارەی بكەرە زیاد كراوەكە ڕاناوێكی لكاوی ئەخرێتە سەر و بە پێی یاساكانی ڕاناوی لكاو شوێنی خۆی لە ڕستەدا ئەگرێ:

بۆ كەسی سێیەمی تاك لەگەل فرمانی ڕابردوو (ی) دەرئەكەوێ . .گەر بەركار هەبێ پێیەوە ئەلكێ . . ڕستەكە لە ئەنجاما ئەبێ بە

ئەو منداڵەكان ـ ی نوواندبوو

**2 ـ یاسای گۆڕینی ڕستەی بكەر دیار بە هی بكەر نادیار.**




واتا

1 ـ بكەر و ڕاناوی لكاو لائەبرێن.

2 ـ بەركار شوێنی بكەر ئەگرێ . . (بەڵام چەمكی بەركاریی خۆی لەڕووی واتاوە نادۆڕێنێ).

3 ـ ڕەگی داهاتووی فرمانەكە وەرئەگیرێ.

4 ـ گەر كاتی فرمانەكە ڕابردوو بێ (را) و داهاتوو بێ (رێ)ی ئەخرێتە سەر.[3]

5 ـ نیشانەی جۆری كات (ئە ـ بوو ـ . . هتد) شوێنی خۆی ئەگرێ . .

6 ـ بە پێی كەس وژمارەی بكەرە تازەكە ڕاناوێكی لكاو ئەخرێتە سەر فرمانەكە وەك فرمانێكی تێنەپەر.




تۆ ئەبینرێیت.

**بە بەراوورد كردنی یاسای گۆڕینی ڕستەی فرمان تێنەپەر بە هی تێپەر لەگەڵ یاسای گۆڕینی ڕستەی بكەر دیار بەهی بكەر نادیار** دەرئەكەوێ كە **ئەم دوو دیاردەیە پێچوانەی** یەكترین . .

| كردنی تێنەپەر بەتێپەر | كردنی بكەر دیار بە بكەر نادیار |
|---|---|
| 1 ـ بكەری سیمانتێكی نییە . ئەخرێتە ڕستەكەوە وبەیاسایەكی مۆرفۆلۆجی فرمانەكە ئەكرێ بە تێپەر. | 1 ـ بكەری سیمانتێكی هەیە لائەبرێ و بەیاسایەكی مۆرفۆلۆجی فرمانەكە ئەكرێ بە تێنەپەر. |
| 2 ـ لەڕووی ڕێكەوتنەوە فرمانەكە ئەو كۆمەڵە ڕاناوە | 2 ـ لەڕووی ڕێكەوتنەوە فرمانەكە ئەو كۆمەڵە ڕاناوە |

وەرئەگرێ کە تایبەتە به تێپەڕ.

وەرئەگرێ کە تاًیبەتە بە تێنەپەر.

پەراوێزەکان

1 - فرمانە تێنەپەڕەکانی کوردی لە رووی بوونیان بە تێپەڕ ئەکرێن بە چوار بەش

أ - ئە وانـەی ناکـرێن بە تێپـەر چونکـە تێپەری بەرامبەریان هەیە وەك

کەوتن - خستن

هاتن - هێنان

بوون - کردن

ب - ئەوانەی ئەشێ بکرێن بە تێپەڕ سەرەرای هەبوونی تێپەری بەرامبەریان. لەم حاڵەتەدا مانای تێپەری بەرامبەر و بە تێپـەر کراوەکـە وەك یەك نابن. وەك(مـردن) تێپـەری بەرامبـەری (کـوشتن)ە و ئەکـرێ بە (مـرانـدن). بەڵام لە رووی ماناوە (مراندن) و(کوشتن) جیان.

پیاوەکە خۆی کوشت - لێرەمردووە.

پیاوەکە خۆی مراند - لێرەنەمردووە.

هەمان شت لە گەڵ (چوون) و (چوواندن)دا

ئەو سکی چوو.

ئەو سکی چوواند.

ح - ئەوانـەی کە ناکـرێـن بە تێپـەر وەك (گـەنین - پشکوتن - زان.. هتد) لێکدانەوەی مەنتقی بۆ ئەمە ئەوەیە روودانیـان لە ژوور ئارەزوو و دەسـەڵاتی مرۆڤـدایـە. هیچ هێزێکی دیار دەست نیشان ناکرێت بکرێ بە بکەری ئەم جۆرە فرمـانـانـە.. دارێ ئەشکێ منیش ئەتـوانم بیشکێنم ..منالێ لە خۆیەوە ئەنوێ منیش ئەتوانم بنوینم..

بەڵام هەرگیـز ناتـوانم ودەسـەڵاتی ئەوەم نی‌یـە گوڵێ بپشکـوینم.. کەسێ بزێنم.. هتـد. بۆیـە (پشکـواندن و زاندن و گەناندن..) نی‌یە.

د - ئەوانەی ئەکرێن بە تێپەڕ هەموو ئەوانەن کە بەر سێ بەشەکەی تر ناکەون.

2 - گەر رەگی داهاتووی فرمانە تێنەپەڕەکە بە (ێ) یا (ۆ) کۆتایی هاتبێ، بە خستنە سەری (اند) و (ێن)، (ێ) ئەتـووێتـەوە و (ۆ) ئەبێ بە (ۆ)ی کپ. وەك (شکـان و رۆیشتن)دا رەگی داهاتوویان (شکێ) و (رۆ) یە کە (اند) و (ێن)یان ئەچێتە سەر ئەبن بە (شکاند - شکێن) و (رواند - روێن).

3 - لە کردنی فرمانی بکەر دیار بە هی بکەر نادیار. . گەر رەگی داهـاتـووی فرمـانی تێپـەر بە (ە) یا (ۆ) کۆتـایی هاتـبـێ... بە خسـتـنـە سەری (را) و (رێ)...(ە) ئەتوێتەوە و (ۆ) ئەبێ بە (و) .وەك لە

کردن - کە ئیشەکە کرا / ئەکرێ

خواردن - خۆ نانەکە خورا / ئەخورێ

سەرچاوەکان


1 - و.ع امین - تێپەڕ و تێنەپەر - رۆژنامەی عیراق ژ (2534).م 1984/5/30

2 - و.ع. امین - رستەی بکەر نادیار. گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژ (95) - 1982

3 - نووسـینـەکـانـی د. ئاورەحـمـانـی حاجی‌مـارف و د.کوردستان موکریانی و مامۆستا نوری علی امین

4 - کۆری زانیاریی کورد - رێزمانی ئاخاوتنی کوردی 1976.

5 - Fillmore C.J (1968) «The case for case» in Bach and Harms.

6 - Smith , N amd D - wilsom (1979) «Modern lingLinguistcs» Penguin Books.

● نوری عەلی ئەمین ●




لە بەشی یەکەمی ئەم باسەدا، لە نیشانەکانی ڕێژە لەگەڵ فرمانی سادەدا دواین و شوێنەکانمان دیاریکردن. لە بەشی دووەمی هەمان باسدا لە نیشانەکانی ڕێژە لەگەڵ فرمانی ناسادە (دارڕژاو)دا، دەدوێین.

لە بەشی یەکەمی باسەکەدا، فرمانە سادەکانمان لە قەدو ڕەگی چاووگی سادە دارشت، ئەمجا نیشانەکانی ڕێژەمان لەگەڵدا بەکارهێنان، وە لەم بەشەشدا فرمانە ناسادەکان (دارڕژاوەکان) یش لە قەدو ڕەگی چاووگی ناسادە دادەڕێژین و ئەنجا نیشانەکانی ڕێژەیان لەگەڵدا بەکار دەهێنین. بابزانین قەدو ڕەگی چاووگی ناسادە چۆن پێك دێن؟ چونکە پەیوەندی بە باسەکەوە هەیە:

1 ـ چاووگی ناسادە (دارڕژاو) ـ تێپەڕ بێت، یان تێنەپەڕ ـ ئەگەر نوونی چاوگیەکەی لێفڕێدرا، ئەوەی دەمێنێتەوە پێیدەگوترێت (قەدی فرمانی ناسادە)، وەك:

| چاووگی ناسادە (دارڕژاو) | قەدی فرمانی ناسادە (دارڕژاو) |
|---|---|
| ڕاوەستان | ڕاوەستا |
| دانیشتن | دانیشت |

تێك دان		تێك دا
وەرگرتن		وەرگرت

2 ـ چاوگی ناسادە ـ تێپەڕ بێت، یان تێنەپەڕ ـ ئەگەر نوونی چاوگیەکەو پیتەکەی پێش نوونەکەی لێ فڕێدرا، ئەوەی دەمێنێتەوە پێی دەگوترێت (ڕەگی فرمانی ناسادە ـ داڕژاو)، وەك:

| چاووگی ناسادە (داڕژاو) | ڕەگی فرمانی ناسادە (داڕژاو) |
|---|---|
| هەڵ برین | هەڵ بر |
| دانیشتن | دانیش |
| هەڵ گلۆفین | هەڵ گلۆف |
| وەرگرتن | وەرگر |

ئەوا یەکە یەکە لە نیشانەکانی ڕێژەی فرمان دەدوێین لەگەڵ فرمانی ناسادە (داڕژاو)دا:

**نیشانەی ڕێژەی (دە)**

ـ 1 ـ

**لە فرمانی رابوردووی ئیستیمراری ناسادە (داڕژاو)دا:**

**1 ـ فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی تێنەپەڕی کارادیاری ئیستیمراری:**

بۆ دروست کردنی ئەم فرمانەو دیاریکردنی شوێنی نیشانەی ڕێژەی (دە) لە ڕشتەی فرمانەکەدا:

ـ قەدی فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی[3] تێنەپەڕی کارادیار دەهێنین.

ـ نیشانەی ڕێژەی (دە)[4] دەخەینە نێوان پێشگرەکەو فرمانەڕووتەکە.

ـ ڕاناوی لکاوی ك B بەدوای فرمانە ڕووتەکەدا دەهێنین.

بۆ وێنە:

لە چاووگی ناسادە (داڕژاو)ی ـ هەڵ توتان، قەدی ناسادەی ـ هەڵ توتا ـ وەردەگرین و بەپێی یاساکەی سەرەوە گەردانی دەکەین:

هەڵ ـ دە ـ تووتا ـ م ← هەڵ دەتووتام
هەڵ ـ دە ـ تووتا ـ ین ← هەڵ دەتووتاین
هەڵ ـ دە ـ تووتا ـ یت ← هەڵ دەتووتایت
هەڵ ـ دە ـ تووتا ـ ن[5] ← هەڵ دەتووتان
هەڵ ـ دە تووتا . . . ← هەڵ دەتووتا
هەڵ ـ دە ـ تووتا ـ ن[6] ← هەڵ دەتووتان

لەم فرمانەدا دەتوانرێت ئامرازی (ش) عەتف:

أ ـ بەدوای نیشانەی ڕێژەی (دە)دا بهێنرێت، وەك:

هەڵ ـ دە ـ ش ـ زنا ← هەڵ دەش زنا

ب ـ بەدوای پێشگری فرمانەکەدا بهێنرێت، وەك:

ڕۆ ـ ش ـ دە ـ چوو ← ڕۆش دەچوو.

2 ـ فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی ڕابووردووی تێنەپەڕی کارانادیاری بەردەوامی:

بۆ دروست کردنی ئەم فرمانەش، لەگەڵ دیاریکردنی شوێنی نیشانەی ڕێژە (دە) لە ڕستەی فرمانەکەدا:

ـ قەدی فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی تێپەڕی کارانادیار یەکسەر دەهێنین، یان قەدی تێپەڕی کارادیار دەهێنین.

ـ نیشانەی ڕێژەی (دە) دەخەینە نێوان پێشگرەکەو فرمانەڕووتەکە.

ـ ڕاناوی کۆمەڵەی B لە قەدی کارادیارداو کارانادیاردا

دەشێت بخرێتەدوای نیشانەی (را)ی کاراناداپار.

بۆ وێنە: -

لە چاووگــی نــاســادە (دارِژاو)ی کارانــادیــار (هەڵ کێشران)ەوە، قەدی ناسادە (دارِژاو)ی (هەڵ کێشرا) دەهێنین و بەپێی ئەو یاســایــەی سەرەوە فرمــانــە نــاســادەکــە گەردان دەکەین:

هەڵ - دە - کێش - را - م ← هەڵ دەکێشرام[7]

هەڵ - دە - کێش - را - ین ← هەڵ دەکێشراین

لەم فرمانەشدا. دەتوانرێت ئامرازی (ش)ی عەتف:

أ - بەدوای نیشانەی رێژە (دە)دا، بهێنرێت، وەك:

دا - دە - ش (بەزێن) را - م ← دادەش بەزێنرام

ب - بەدوای پێشگری فرمانەکەدا، بهێنرێت، وەك:

هەڵ - یش - دە (خەڵەتێن) را - ین ← هەڵیش دەخەڵەتێنراین

3 - فرمــانی نــاســادە (دارِژاو)ی رابــوردووی تێپــەڕی کارادیاری ئیستیمراری:

بۆ دروست کردنی ئەم فرمــانــەو دەست نیشــان کردنی شوێنی نیشــانــەی رێـژەی (دە)و رانـاوی لکـاوی ك A لە رشتەی فرمانە نسادەکەدا:

- قەدی فرمانی ناسادە (دارِژاو)ی تێپەڕی کارادیار دەهێنین.

- نیشانەی رێژەی (دە) دەخەینە نێوان پێشگرەکەو فرمانەرووتەکە.

- راناوی لکاوی ك A دەخەینە دوای پێشگرەکەوە.[8]

بۆ وێنە: -

چاووگـی نــاســادە (دارِژاو)ی تێپــەڕی (دابــەسـتـن) دەهــێــنــیــن و قەدی نــاســادە (دارِژاو)ی (دابــەســت)ی لێوەردەگــریــن و بەپێی ئەو یاســایــەی سەرەوە گەردانی دەکەین، وەك:

دا - م - دە - بەست ← دام دەبەست

دا - مان - دە - بەست ← دامان دەبەست

دا - ت - دە - بەست ← دات دەبەست

دا - تان - دە - بەست ← داتان دەبەست

دا - ی - دە - بەست ← دایدەبەست

دا - یان - دە - بەست ← دایان دەبەست

لەم فرمانە تێپەڕەشدا دەتوانرێت:

1 - ئامرازی (ش)ی عەتف:

أ - بەدوای نیشانەی رێژە (دە)دا، بهێنرێت، وەك:

هەڵ - دە - ش - گیرساند ← هەڵ دەش گیرساند.

ب - بەدوای پێشگری فرمانەکەدا، بهێنرێت، وەك:

دا - ش - دە - وەشاند ← داش دەوە شاند.

2 - راناوی لکاوی ك A بەدوای پێشگرەکەدا بهێنرێت نەك نیشانەی رێژە (دە) وەك لە فرمانی سادەدا، لوا:

دا - تان - دە - خست ← داتان دەخست

3 - ئامرازی (ش)ی عەتف و راناوی لکاوی ك. A ،[9]

دەتـوانن پێکـەوە بەدوای پێشگـری فرمـانـەکـەدا بێن، نەك نیشانەی رێژەی (دە) وە لە هاتنەکەیاندا بۆیان هەیە پاش و پێش بکەوون:

أ - وێنە بۆ پێش کەوتنی راناوەکە، وەك:

هەڵ - م - یش - دە - بژارد ← هەڵمیش دەبژارد

ب ـ وێنە بۆ پێش کەوتنی ئامرازی (ش)، وەك:
هەڵ ـ یش ـ تان ـ دە ـ سەنگاند ← هەڵیشتان دەسەنگاند

(2)

**لە فرمانی ڕانەبوردووی ناسادە (داڕژاو)ی ئیخباریدا:**

**1 ـ فرمانی ڕانەبوردووی سادەی تێنەپەڕی کارادیاری ئیخباری:**

بۆ دروست کردنی ئەم فرمانەو دیاریکردنی شوێنی نیشانەی (دە)و ڕاناوی لکاوی ك A لە ڕشتەی فرمانە سادەکەدا:

- ڕەگی فرمانی سادە (داڕژاو)ی تێنەپەڕ دەهێنین
- نیشانەی ڕێژەی (دە) دەخەینە نێوان پێشگری فرمانەکەو ڕەگەکەی.
- ڕاناوی لکاوی ك B دەخرێتە دوایی ڕەگی فرمانەکە.

بۆ وێنە: ـ

لە چاوگی ناسادە (داڕژاو)ی (دانیشتن)ەوە، ڕەگی فرمانی سادە (دانیش) وەردەگرین و بەپێی یاساکەی لای‌سەرەوە گەردانی دەکەین:

دا ـ دە ـ نیش ـ م ← دادەنیشم
دا ـ دە ـ نیش ـ ین ← دادەنیشین
دا ـ دە ـ نیش ـ یت ← دادەنیشیت
دا ـ دە ـ نیش ـ ن ← دادەنیشن
دا ـ دە ـ نیش ـ ێت ← دادەنیشێت
دا ـ دە ـ نیش ـ ن ← دادەنیشن

هەروەك لەم دێڕە شیعرانەدا، فرمانی ڕانەبوردووی (ڕائەوەستن) بەپێی ئەو یاسایەی سەرەوە دروست کراوە:

هەموو دەم کۆمەڵ دەبەستن
ڕوو بە شەقام (ڕائەوەستن)
توانج ئەگرن، لە کچ، لە ژن
لە ڕێبواری ووردو مەزن

**(بەرهەمی خاوێن)**

**لەم فرمانەدا دەتوانرێت ئامرازی (ش)ی هەتف:**

**أ ـ بەدوای پێشگری فرمانەکەدابهێنرێت، وەك:**
**لێك ـ یش ـ دە ـ ب[10] ـ ین ← لێکیش دەبین**

ب ـ بەدوای نیشانەی ڕێژەی (دە)دا بهێنرێت، وەك:
تێك ـ دە ـ ش ـ چ[11] ـ ن ← تێك دەش چن

**2 ـ فرمانی ڕانەبوردووی ناسادە (داڕژاو)ی تێپەڕی کاراناديارى ئیخباری:**

بۆ دروست کردنی ئەم فرمانەو دیارکردنی شوێنی نیشانەی ڕێژەو ڕاناوی ك A لە ڕشتەی فرمانە ناسادەکەدا:

- ڕەگی فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی تێپەڕی کارادیار دەهێنین.
- نیشانەی ڕێژەی (دە) دەخەینە نێوان پێشگرەکەو ڕەگەکە
- نیشانەی (ڕێ)ی کاراناديار دەخەینە دوای ڕەگی فرمانەکە.
- ڕاناوی لکاوی ك B بەدوای نیشانەی (ڕێ) کاراناديارداو دەهێنین.

بۆ وێنە: ـ

چاوگی تێپەڕی ناسادەی (هەڵ لوشین) دەهێنین و ڕەگی فرمانی ناسادە (هەڵ لوش)ی لێ وەردەگرین و بەپێی یاسای سەرەوە گەردانی دەکەین:

هەڵ ـ دە (لوش)ڕێ ـ م ← هەڵ دەلوشرێم.
هەڵ ـ دە (لوش)ڕێ ـ ین ← هەڵ دەلوشرێین.
هەڵ ـ دە (لوش)ڕێ ـ یت ← هەڵ دەلوشرێیت.

هەڵ ـ دە (لوش)ڕێ ـ ن ← هەڵ دەلوشرێن.
هەڵ ـ دە (لوش)ڕێ ـ ت ← هەڵ دەلوشرێت.
هەڵ ـ دە (لوش)ڕێ ـ ن ← هەڵ دەلوشرێن.

**لەم فرمانەدا دەتوانرێت تەنیا ئامرازی (ش) عەتف:**

أ ـ بەدوای نیشانەی ڕێژەدا بهێنرێت، وەك:
هەڵ ـ دە ـ ش (واس)ڕێ ـ م ← هەڵ دەش واسرێم

ب ـ بەدوای پێشگری فرمانەکەدا بهێنرێت، وەك:
دا ـ ش ـ دە (دۆش)ڕێ ـ ین ← داش دەدۆشرێین

**3 ـ فرمانی ناسادەی (دارِژاو) ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری ئیخباری:**

بۆ دروست کردنی ئەم فرمانەو دیاری‌کردنی شوێنی نیشانەی (دە)و ڕاناوی لـ B لە ڕشتەی فرمانە ناسادەکەدا:
ـ ڕەگی فرمانی ناسادە (دارِژاو)ی تێپەڕ دەهێنین.
ـ نیشانەی ڕێژەی (دە) دەخەینە نێوان پێشگری فرمانەکەو ڕەگەکەی.
ـ ڕاناوی لکاوی لـ B بەدوای ڕەگەکەدا دەهێنین، وەك:

کۆلارەکە ـ هەڵ ـ دە ـ دە[12] | م
| ین
| یت
| ن
| ات
| ن

**لەم فرمانەشدا دەتوانرێت:**
**1 ـ ئامرازی (ش)ی عەتف:**
أ ـ بەدوای نیشانەی ڕێژە (دە)دا بهێنرێت، وەك:
ڕا ـ دە ـ ش ـ هێن ـ م ← ڕادەش هێنم.

ب ـ بەدوای پێشگری فرمانەکەدا بهێنرێت، وەك:
وەر ـ یش ـ دە ـ گەڕێن ـ ین ← وەریش دەگەڕێنین
2 ـ ڕاناوی لـ A بەدوای پێشگری فرمانەکەدا بهێنرێت، وەك:
هەڵ ـ م ـ دە ـ خەڵەتێن ـ ن ← هەڵم دەخەڵەتێنن
3 ـ ڕاناوی لـ A و ئامرازی (ش) عەتف بەدوای یەکدا بهێنرێن لە فرمانەکەدا، وە لە هاتنەکەیاندا پێکەوە، دەتوانن پاش وپێش بکەوون، وەك:

أ ـ وێنە بۆ پێش کەوتنی ڕاناوی لـ. A :
هەڵ ـ ت ـ یش ـ دە ـ بوێر ـ م ← هەڵتیش دەبوێرم
ب ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی (ش)ی عەتف:
دا ـ ش ـ ت ـ دە ـ پاچ ـ ن ← داشت دەپاچن

**نیشانەی (ب... ایە) یان (ب... یە)**

---

لە چاووگی ناسادە (دارِژاو)ی تێپەڕ و تێنەپەڕی کارادیارو کارانادیار، ئەگەر قەدی فرمانە ناسادەی (دارِژاو)مان وەرگرت:

1 ـ لە قەدە ناسادە (دارِژاوەکە)دا، فرمانە ڕووتەکە ـ تێپەڕ، بێت، یان تێنەپەڕی کارادیار کۆتایی بە پیتەبزوێنی (ا) نەهاتبوو، فرمانەکە دەخرێتەنێوان نیشانەی (ب.. ایە)ی ئینشائیەوە، وەك:

(1)

| چاووگی ناسادە (دارِژاو) | قەدی فرمانی ناسادە (دارِژاو) |
| --- | --- |
| هەڵ بژاردن | هەڵ بژارد[13] |

(3)

هەڵ ـ بـ (بژارد) ایە ← هەڵ بژاردایە
هەڵ ـ بـ (چوو) ایە ← هەڵ بچووایە

دا ـ بـ (كەوت) ایە ← دابكەوتایە

2 ـ لە قەدە ناسادە دارِژاوەكەدا، فرمانە رِووتەكە ـ تێپەرِ بێت، یان تێنەپەرِی كارادیارو كاراناديار بێت ـ ئەگەر كۆتایی بە پیتەبزوێنی (أ) هاتبوو، فرمانەكە دەخرێتە نێوان نیشانەی رِێژەی (بـ‌ـیە)ی ئینشائییەوە، وەك :

| چاووگی نادە (دارِژاو) | قەدی فرمانی نادە (دارِژاو) |
|---|---|
| **هەڵ تووتان** | **هەڵ تووتا** |
| **داهێنان** | **داهێنا** |
| **هەڵ كێشران** | **هەڵ كێشرا** |

هەڵ ـ بـ (تووتا)یە ← هەڵ بتووتایە

دا ـ بـ (هێنا)یە ← دابهێنایە

هەڵ ـ بـ (كێشرا)یە ← هەڵ بكێشرایە

ئەو فرمانە نادە رِابوردووانەی كە بەپێی ئەو بنواشانە دەتوانرێت لە قەدی نادە (دارِژاو) دروست بكرێن، ئەمانەن :

**1 ـ فرمانی نادەی (دارِژاو)ی رِابوردووی تێنەپەرِی ناتەواوی ئینشائی :**

بۆ دارِشتنی ئەم فرمانەو دیاریكردنی شوێنی رِێژەی (بـ . . ایە) یان (بـ . . یە)و رِاناوی لكاوی كۆ B لە رِشتەی فرمانە نادەكەدا :

ـ قەدی فرمانی نادە (دارِژاو)ی تێنەپەرِ دەهێنین .

ـ فرمانە رِووتەكە لە قەدە نادەكە دەخەینە نێوان نیشانەی رِێژەكەوە .

ـ رِاناوی لكاوی كۆ B بەدوای فرمانە رِووتەكەدا دەهێنین، وەك :

لە چاووگی نادە (دارِژاو)ی تێنەپەرِی (هەڵ هاتن)، قەدەكەی كە (هەڵ هات)ە، وەردەگرین و بەپێی یاسای سەرەوە گەردانی دەكەین .

هەڵ ـ بـ (هات)[14] م ـ ایە ← هەڵ بهاتمایە

هەڵ ـ بـ (هات) ـ ین ـ ایە ← هەڵ بهاتینایە

هەڵ ـ بـ (هات) ـ یت ـ ایە ← هەڵ بهاتیتایە

هەڵ ـ بـ (هات) ـ ن ـ ایە ← هەڵ بهاتنایە

**لەم فرمانەدا دەتوانرێت، ئامرازی (ش)ی عەتف :**

أ ـ بەدوای پێشگرەكەدا، بهێنرێت، وەك :

وەر ـ یش ـ بـ (گەرا)یە ← وەریش بگەرایە

ب ـ بەدوای نیشانەی رِێژە (ب)دا، بهێنرێت، وەك :

دا ـ بـ ـ ش (خورپا)یە ← دابش خورپایە

**2 ـ فرمانی نادەی (دارِژاو)ی رِابوردووی تێنەپەرِی ناتەواوی كاراناديارى ئینشائی :**

بۆ دارِشتنی ئەم فرمانەو دیاركردنی شوێنی نیشانەی رِێژەی (بـ . . ایە) یان (بـ . . . یە)و رِاناوی لكاوی كۆ B لە رِشتەی فرمانە نادەكەدا :

ـ قەدی فرمانی نادە (دارِژاو) تێنەپەرِی كاراناديار دەهێنین .

ـ فرمانە رِووتەكە لە قەدە نادەكەدا، ئەگەر كۆتایی :

أ ـ بە پیتەبزوێنی (أ) هاتبوو دەخەینە نێوان نیشانەی رِێژەی (بـ . . یە) .

ب ـ بە پیتەبزوێنی (أ) نەهاتبوو دەخەینە نێوان نیشانەی (بـ . . ایە) .

ـ رِاناوی لكاوی كۆ B ئەگەر هێنرا ـ دەخرێتە كۆتایی نیشانەی (را)ی كاراناديارى فرمانە رِووتەكەوە بۆ وێنە :

لە چاووگی نادەی (دارِژاو)ی تێنەپەرِی كارانادياردا (داپلۆسێنران)، قەدەكەی كە (داپلۆسێنرا)یە وەردەگرین و بەپێی یاسای سەرەوە گەردانی دەكەین :

دا ـ بـ ـ (پلۆسێن ـ را)م ـ ایه ← داپلۆسێنرامایه[15]
دا ـ بـ ـ (پلۆسێن ـ را)ین ـ ایه ← داپلۆسێنراینایه
دا ـ بـ ـ (پلۆسێن ـ را)یت ـ ایه ← داپلۆسێنرایتایه.
دا ـ بـ ـ (پلۆسێن ـ را)ن ـ ایه ← داپلۆسێنرانایه.
دا ـ بـ ـ (پلۆسێن ـ را) . . . یه ← داپلۆسێنرایه.
دا ـ بـ ـ (پلۆسێن ـ را)ن ـ ایه ← داپلۆسێنرانایه.

**لەم فرمانەشدا دەتوانرێت ئامرازی (ش)ی عەتف:**

أ ـ بەدوای نیشانەی ڕێژەی (ب)دا، بهێنرێت، وەك:

**هەڵ ـ بـ ـ ش (گیرسێن)را ـ یه ← هەڵ بش گیرسێنرایه**

ب ـ بەدوای پێشگری فرمانەکەدا بهێنرایە، وەك:

دا ـ ش ـ بـ ـ (خ)را ـ یه ← داش بخرایه[16]

**3 ـ فرمـانی نـاسـاده (دارڕژاو)ی ڕابـوردووی تێپـەڕی کارادیاری ناتەواوی ئینشائی:**

بۆ دارشتنی ئەم فرمـانـەو دیـاریکردنی شوێنی نیشانەی ڕێژەی (ب . . ایه) یان (ب . . یه)و ڕاناوی لکاوی ك A له ڕشتەی فرمانە ناسادە (دارڕژاو)ەکەدا:

ـ قەدی فرمانی ناسادە (دارڕژاو)ی تێپەڕی کارادیار دەهێنین.

ـ فرمانە ڕووتەکە لە قەدە ناسادەکەدا دەخەینە نێوان نیشانەی ڕێژەکە.

ـ ڕانـاوی لکـاوی ك A ـ ئەگـەر هێنـرا ـ دەخـرێتـە دوای پێشگری فرمانەکە.

**بۆ وێنە:**

لە چاووگـی نـاسـادە (دارڕژاو)ی تێپـەڕی وەك (هـەڵ پاچـین)دا، کە قەدەکـەی (هـەڵ پاچـی)یـە، وەردەگرین و بەپێی یاسای سەرەوە گەردانی دەکەین:

هەڵ ـ م ـ بـ ـ (پاچی)ایه ← هەڵم بپاچیایه.

هەڵ ـ مان ـ بـ ـ (پاچی)ایه ← هەڵمان بپاچیایه.
هەڵ ـ ت ـ بـ ـ (پاچی)ایه ← هەڵت بپاچیایه.
هەڵ ـ تان ـ بـ ـ (پاچی)ایه ← هەڵتان بپاچیایه.
هەڵ ـ ی ـ بـ ـ (پاچی)ایه ← هەڵی بپاچیایه.
هەڵ ـ یان ـ بـ ـ (پاچی)ایه ← هەڵیان بپاچیایه.

**لەم فرمانە ناسادەیەشدا دەتوانرێت:**

**1 ـ ئامرازی (ش)ی عەتف: ـ**

**أ ـ بەدوای نیشانەی ڕێژە (ب)دا، بهێنرێت، وەك:**

**هەڵ ـ ت ـ بـ ـ ش (سەنگاند)ایه ← هەڵت بش سەنگاندایه.**

ب ـ بەدوای پێشگری فرمانەکەدا، بهێنرێت، وەك:

را ـ ش ـ ت ـ بـ ـ (ژەنی)ایه ← ڕاشت بژەنیایه.

2 ـ ڕاناوی لکاوی ك A بەدوای پێشگرەکەدا، بهێنرێت، وەك:

هەڵ ـ تان ـ بـ(خست) ایه ← هەڵتان بخستایه.

3 ـ ڕاناوی لکاوی ك A و ئامرازی (ش) پێکەوە لە ڕشتەی فرمـانـە نـاسـادەکـەدا بێن، بەڵام لە هاتنـەکەیاندا، دەتوانن پێش و پاش بکەوون، نموونە:

**أ ـ بۆ پێش کەوتنی ڕاناوەکە، وەك:**

**هەڵ ـ م ـ یش ـ بـ ـ (دا)یه ← هەڵمیش بدایه.**

بـ بۆ پێش کەوتنی ئامرازی (ش)، وەك:

دا ـ ش ـ تان ـ بـ ـ گرت)ایه ← داشتان بگرتایه.

## نیشانەی ڕێژەی (ایه)

نیشـانـەی ڕێـژە (ایـه) لەتەك فرمانی ناسادە (دارڕژاو)دا بەکار دەهێنرێت بۆ پێك هێنانی فرمانی ناسادەی ڕابوردووی دووری ئینشـائی. بۆ ئەمـە قەدی فرمـانی نـاسـادە (دارڕژاو) وەردەگـرین و فرمـانی (بوون)ی تێنەپەڕی دەخەینە دواوە، لەپاشا ڕاناوی لکاو ـ ئەگەر ویستر ڕانای لکاو بەکاربهێنرێت

ـ دەخەینە دوای فرمانی بوونەوە، لە دوا دوای هەموویاندا نیشــانـەی ڕێـژەی (ایـە) دادەنێین، بەم شێـوەیـە فرمـانی سادەی ڕابوردووی دووری ئینشائی دروست دەکەین، بۆ نموونە:

**چاووگی ناسادە (داڕژاو) قەدی فرمانی ناسادە (داڕژاو)**

| **تێ وورووکان** | **تێ وورووکا** |
|---|---|

**فرمانی ڕابوردووی ناسادەی دووری ئینشائی**

**تێوورووکا ـ بوو ـ ایە ← تێوورووکابوایە**

ئەو فرمانە ناسادە ڕابوردووە دوورانەی ئینشائی کە بەم جۆرە پێك دەهێنرێن ئەمانەن:

**1 ـ فرمــانــی ناســادە (داڕژاو)ی ڕابــوردووی دووری تێنەپەڕی کارادیاری ئینشائی:**

بۆ دارشتنی ئەم فرمانەو دیاریکردنی ڕێژەو ڕاناوی لك B و فرمانی بوون و قەدی ناسادە لە ڕشتەی فرمانە ناسادەکەدا:

ـ قەدی فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی تێنەپەڕی کارادیار دەهێنین:

ـ فرمانی (بوون)ی تێنەپەڕ.

ـ ڕاناوی لکاوی لك B

ـ نیشانەی ڕێژەی (ایە).

**بۆ وێنە:**

لە چاووگی ناسـادە (داڕژاو)ی تێـنـەپەڕ (هەڵ نیشتن)، کە قەدەکـەی (هـەڵ نیشت)ە، وەردەگـرین و بەپێی یاسـای سەرەوە گەردانی دەکەین:

هەڵ ـ نیشت ـ بوو ـ م ـ ایە ← هەڵ نیشتبومایە.

**هەڵ ـ نیشت ـ بوو ـ ین ـ ایە ← هەڵ نیشتبووینایە.**

**هەڵ ـ نیشت ـ بوو ـ یت ـ ایە ← هەڵ نیشتبوویتایە.**

**هەڵ ـ نیشت ـ بوو ـ ن ـ ایە ← هەڵ نیشتبوونایە.**

**هەڵ ـ نیشت ـ بوو. ایە ← هەڵ نیشتبوایە.**

**هەڵ ـ نیشت ـ بوو ـ ن ـ ایە ← هەڵ نیشتبوونایە.**

لەم فرمانەدا دەتوانرێت ئامرازی (ش)ی عەتف بەدوای پێشگری فرمانەکەدا بهێنرێت، وەك:

**تێ ـ ش ـ (پەڕی ـ بوو)ایە ← تێش پەڕیبوایە**

**دا ـ ش (مەزرا ـ بوو)ایە ← داش مەزرابووایە**

**2 ـ فرمــانــی ناســادە (داڕژاو)ی ڕابــوردووی دووری تێنەپەڕی کاراناداری ئینشائی:**

بۆ داڕشتنی ئەم فرمانەو دیارکردنی ڕێژەو ڕاناوی لکاوی لك B و فرمانی (بوون)ی تێنەپەڕو قەدی ناسادەو نیشانەی (را)ی کاراناديار لە ڕشتەی فرمانەکەدا:

ـ قەدی فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی تێنەپەڕی کاراناديار دەهێنین.

ـ فرمانی (بوون)ی یاریدەدەر.

ـ ڕاناوی لکاوی لك B

ـ نیشانەی ڕێژەی (ایە).

**بۆ نموونە:**

لە چاووگی ناسـادە (داڕژاو)ی تێـنـەپـەڕی کارانـادیاردا وەك (داخــورپێنــران) قەدەکــەی کە (داخــورپێنـرا)یـە، وەردەگرین و بەپێی یاسای سەرەوە گەردانی دەکەین:

دا ـ خورپێن ـ را ـ بوو ـ م ـ ایە ← **داخورپێنرابوومایە.**

دا ـ خورپێن ـ را ـ بوو ـ ین ـ ایە ← **داخورپێنرابووینایە.**

دا ـ خورپێن ـ را ـ بوو ـ یت ـ ایە ← **داخورپێنرابوویتایە.**

دا - خورێن - را - بوو - ن - ایە ← داخورپێنرابوونایە.
دا - خورێن - را - بوو. . ایە ← داخورپێنرابووایە.
دا - خورێن - را - بوو - ن-ایە ← داخورپێنرابوونایە.

**لەم فرمانە ناسادەیەدا، دەتوانرێت ئامرازی (ش) عەتف:**

**أ - بەدوای پێشگری فرمانەکەدا بهێنرێت، وەك:**
**ڕا - ش - وەستێن - را - بوو - م - ایە ← ڕاش وەستێنرابوومایە.**
ب - بەدوای نیشانەی (ڕا)ی کارانادیاردا بهێنرێت، وەك:
ڕا - وەستێن - را - ش - بوو - م - ایە ← ڕاوەستێنراش بوومایە.

**3 - فرمانی ناسادە (دارژاو)ی ڕابوردووی دووری تێپەری کارادیاری ئینشائی:**

بۆ دارشتنی ئەم فرمانەو دیارکردنی شوێنی نیشانەی ڕێژەو ڕاناوی لکاوی ك A و فرمانی (بوون)ی یاریدەدەرو قەدی ناسادە لە ڕشتەی فرمانە ناسادەکەدا:
- قەدی فرمانی ناسادە (دارژاو)ی تێنەپەری کارادیار دەهێنین.
- فرمانی (بوون)ی یاریدەری تێنەپەر.
- ڕاناوی لکاوی ك A بەدوای پێشگری فرمانەکەدا.
- نیشانەی ڕێژەی (ایە).

بۆ وێنە:

**قەدی ناسادە (دارژاو)ی (هەڵ بژارد) لە چاووگی ناسادەی (هەڵ بژاردن) وەردەگرین و بەپێی یاسای سەرەوە گەردانی دەکەین.**

**تێ - م - گوشی - بوو - ایە ← تێم گوشی بووایە.**
تێ - مان - گوشی - بوو - ایە ← تێمان گوشی بووایە.
تێ - ت - گوشی - بو - ایە ← تێت گوشی بووایە.
تێ - تان - گوشی - بوو - ایە ← تێتان گوشی بووایە.
تێ - ی - گوشی - بوو - ایە ← تێی گوشی بووایە.
تێ - یان - گوشی - بوو - ایە ← تێیان گوشی بووایە.

**لەم فرمانەدا دەتوانرێت:**
**1 - ئامرازی (ش)ی عەتف:**
أ - بەدوای پێشگری فرمانەکەدا بهێنرێت، وەك:
دا - ش - م - ماڵی - بوو - ایە ← داشم ماڵی بووایە.
ب - بەدوای فرمانە ڕووتەکەدا بهێنرێت، وەك:
دا - م - ماڵی - یش - بوو - ایە ← دام ماڵیش بوایە.
2 - ڕاناوی لك. A بەدوای پێشگری فرمانەکەدا بهێنرێت، وەك:
لێ - تان - خواست - بوو - ایە ← لێتان خواستبوایە.
3 - ڕاناوی لکاوی ك. A و ئامرازی (ش) عەتف دەتوانن پێکەوە بەدوای پێشگری فرمانەکەدا بهێنرێن. دەشێت لە هاتنەکەدا پێش وپاش بکەوون:

أ - وێنە بۆ پێش کەوتنی ڕاناوی لك A، وەك:
تێ - م - یش - گرت - بوو - ایە ← تێمیش گرتبووایە.
ب - وێنە بۆ پێش کەوتنی ئامرازی (ش)ی عەتف، وەك:
هەڵ - یش - م - وەشاند - بوو - ایە ← هەڵیشم وەشاند بووایە.

### نیشانەی ڕێژەی (ب)

**بۆ وەکو کەو لەسای دەوەن بە خوێندن**
**هاو تیرەمان، ڕابکێشین بۆ مردن**
**(دیلان)**

لەم دێرە شیعرەدا فرمانی (ڕابکێشین) فرمانێکی ناسادە (دارژاو)ەو لە چاووگی ناسادەی (ڕاکێشان) بەم شێوەیەی خوارەوە پێك هێنراوە.:
1 - چاووگی ناسادە (دارژاو)ی (ڕاکێشان) هێنراوە.

2 ـ نوونی چاوگیەکەو پیتەکەی پێشی لیٚ فرێدراوەو ڕەگی ناسادەی (ڕاکێش) ماوەتەوە.

3 ـ نیشانەی ڕێژەی (ب) خراوەتە نێوان پێشگرەکەو ڕەگی فرمانەکە.

4 ـ ڕاناوی لکاوی ك. B بەدوای ڕەگی فرمانە ناسادەکەدا. هێنراوەو بەم شێوەیەی خوارەوە گەردان کراوە.

ڕابکێشم - ڕابکێشین
ڕابکێشیت - ڕابکێشن
ڕابکێشێت - ڕابکێشن

نیشانەی ڕێژەی (ب) لە ئاخاوتنی کوردیدا، دوو ڕێژەی لیٚ پێك دەهێنرێت:

1 ـ ڕانەبوردووی ئینشائی.

2 ـ فرمانی داخوازی.

ئەوا یەکەیەکە لە هەریەکیٚ لەم فرمانانە دەدوێین:

**(٢)**

**فرمانی ڕانەبوردووی ناسادە (دارِژاو)ی ئینشائی**

**1 ـ فرمانی ڕانەبوردووی ناسادە (دارِژاو)ی تیٚنەپەڕی کارادیاری ئینشائی:**

بۆ دارِشتنی ئەم فرمانەو دیاریکردنی شوێنی نیشانەی ڕێژەو ڕاناوی لکاوی ك B ڕەگی ناسادە لە ڕشتەی فرمانە ناسادەکەدا:

ـ ڕەگی فرمانی ناسادەی تیٚنەپەڕی کارادیار دەهێنین.
ـ نیشانەی ڕێژەی (ب) دەخەینە نێوان پێشگری فرمانەکەو ڕەگەکەی.
ـ ڕاناوی لکاوی ك B بەدوای ڕەگەکەدا دەهێنین.

**بۆ وێنە:**

چاووگی ناسادە (دارِژاو)ی (دەرکەوتن) دەهێنین، ڕەگەکەی کە (دەرکەو)ە، لیٚ وەردەگرین و بەپێی یاسای سەرەوە گەردانی دەکەین:

**لە هەموو ژینما هەر تاقە شەویٚ**
**ئەستێرەی تالع ویستی دەرکەویٚ** [17]
**(بەرهەمی خاوێن)**

**لەم دێرە شیعرە فرمانی (دەربکەویٚ) وەردەگرین و گەردانی دەکەین:**

**دەر ـ ب ـ کەو ـ یت ← دەربکەویت.**
دەر ـ ب ـ کەو ـ ن ← دەربکەوون.
دەر ـ ب ـ کەو ـ ێت ← دەربکەوێت.
دەر ـ ب ـ کەو ـ ن ← دەربکەوون.
دەر ـ ب ـ کەو ـ م ← دەربکەوم.
دەر ـ ب ـ کەو ـ ین ← دەربکەوین.

**2 ـ فرمانی ڕانەبوردووی ناسادە (دارِژاو)ی تیٚنەپەڕی کارانادیاری ئینشائی:**

بۆ دارِشتن و پێك هێنانی ئەم فرمانەو دەست نیشان کردنی شوێنی نیشانەی ڕێژەی (ب)و نیشانەی کارانادیاری (ریٚ)و ڕاناوی لکاوی ك B و ڕەگی ناسادەی فرمانەکە لە ڕشتەی فرمانە ناسادە دایرژاوەکەدا:

ـ ڕەگی فرمانی ناسادە (دارِژاو)ی تیٚپەڕی کارادیار دەهێنین.
ـ نیشانەی ڕێژەی (ب) دەخەینە نێوان پێشگری فرمانەکەو ڕەگەکەی.
ـ نیشانەی (ریٚ)ی کارانادیار بەدوای ڕەگی فرمانەکەدا دەهێنین.
ـ ڕاناوی ك B دەخەینە دوای نیشانەی (ریٚ) کارانادیارەوە.

**بۆ وێنە: ـ**

ڕەگی سادە (دارِژا)ی ـ هەڵ مژ ـ لە چاووگی ناسادەی کارادیاری تیٚپەڕی (هەڵ مژین) وەردەگرین و بەپێی یاسای

سەرەوە فرمانە رانەبوردووە ناسادە تێنەپەڕە کاراناديارە ئینشائی‌یە پێك هاتووەکە، گەردان دەکەین:

هەڵ - بـ - (مژ)ڕێ - م ← هەڵ بمژێرم.
هەڵ - بـ - (مژ)ڕێ - ین ← هەڵ بمژرێین.
هەڵ - بـ - (مژ)ڕێ - یت ← هەڵ بمژرێیت.
هەڵ - بـ - (مژ)ڕێ - ن ← هەڵ بمژرێن.
هەڵ - بـ - (مژ)ڕێ - ت ← هەڵ بمژرێت.
هەڵ - بـ - (مژ)ڕێ - ن ← هەڵ بمژرێن.

**لەم فرمانە دەتوانرێت، تەنیا ئامرازی (ش) عەتف:**

أ - بەدوای پێشگرەکەدا بهێنرێت، وەك:

هەڵ - یش - بـ(مژ)ڕێ - م ← هەڵیش بمژرێم

ب - بەدوای نیشانەی ڕێژەی (ب)دا بهێنرێت، وەك:

دا - ب - ش - ماڵ - ڕێ - م ← دابش ماڵرێم

**3 - فرمانی ڕانەبوردووی نسادە (داڕژاو)ی تێپەڕی کارا دیاری ئینشائی:**

سەختی ناخەمە پێشم
نابم بە کۆسپی خوێشم
پەیمانم داوە بە قەد
بەرەی خۆم پێ (ڕاکێشم)

**(بەرهەمی خاوین)**

لەم دێــرە هۆنــراوەیــەدا فرمــانــی (ڕاکـێـشـم)[18] یان (ڕابکێشم)، فرمــانێکی رانـەبـوردووی نـاسـادە (داڕژاو)ی تێپەڕی کارادیاری ئینشائی‌یە. بۆ دارشتنی:

- چاووگی ناسادەی داڕژاوی تێپەڕی (ڕاکێشان) هێنراوە.
- لە چاووگەکە ڕەگی ناسادەی (ڕاکێش)[19] وەرگیراوە.
- نیشانەی ڕێژەی (ب) خراوەتە نێوان پێشگرەکەو ڕەگی فرمانەکە.
- ڕاناوی لکاوی ك B بەدوای ڕەگی فرمانە ناسادەکەدا هێنراوە.

وە بەپێی ئەم هاتن و یاسایەش وەها گەردان دەکرێت:

ڕا - بـ - (کێش) - م ← ڕابکێشم.
ڕا - بـ - (کێش) - ین ← ڕابکێشین.
ڕا - بـ - (کێش) - یت ← ڕابکێشیت.
ڕا - بـ - (کێش) - ن ← ڕابکێشن.
ڕا - بـ - (کێش) - ێت ← ڕابکێشێت.
ڕا بـ (کێش) - ن ← ڕابکێشن.

**لەم فرمانەدا دەتوانرێت:**

**1 - ئامرازی (ش)ی عەتف بەدوای:**

أ - پێشگری فرمانەکەدا بهێنرێت، وەك:

دا - ش - بـ(مەزرێن) - م ← داش بمەزرێنم

ب - نیشانەی ڕێژەی (ب)دا بهێنرێت، وەك:

دا - بـ - ش(مەزرێن) - ین ← دابش مەزرێنین.

**2 - ڕاناوی ك A بەدوای پێشگری فرمانەکەدا دەهێنرێت، نەك نیشانەی ڕێژەی (ب) وەك لە فرمانی سادەدا لوا:**

**ڕا - تان - بـ - ژەن - ین ← ڕاتان بژەنین.**

ناتوانین بڵێین:

(ڕا - بـ - تان - ژەن - ین ← ڕابتان ژەنین) **چونکە ئەمە لە** کوردزمان نەبیستراوە.

3 - ڕانــاوی ك A و ئامــرازی (ش) عەتـف دەتــوانــرێت هەردووکیـان پێکـەوە بەدوای پێشگـری فرمـانـە ناسادەکەدا بهێنرێن، بەڵام لە هاتنەکەیاندا پێش وپاش دەکەوون:

أ - وێنە بۆ پێش کەوتنی ڕاناوەکە لەتەك ئامرازی (ش)ی عەتفدا:

هەڵ - م - یش - بـ(واس) - ن ← هەڵمیش بواسن.

ب - وێنە بۆ پێش کەوتنی ئامرازی (ش)ی عەتف لەگەڵ ڕاناوی (ك A) دا، وەك:

هەڵ ـ یش ـ مان ـ بـ(واس)یت ← هەڵیشمان بواسیت..

(2)

**فرمانی ناسادە (دارِژاو)ی داخوازی**

**بنــوو لە باوەش دایـکـی دڵـســۆزا**
**بۆی (هــەڵ برِێــژە) دەردو هیــجــرانــت**
**(دیلان)**

لەم دێـرە شیعــرەدا فرمــانی (هـەڵ برِێـژە) فرمـانێکی ناسادەی دارِژاوەو لە چاووگی (هەڵ رِشتن)ەوە بەم شێوەیەی خوارەوە پێك هاتووە:

- لە چاووگی ناســادەی دارِژاوی (هــەڵ رِشتن)ەوە، رەگی فرمانی ناسادە (هەڵ رِش)[20] وەرگیراوە.
- نیشـانـەی رِێـژەی (ب) خراوەتـە نێـوان پێشـگـری فرمانە ناسادەکەو رەگەکەی.
- رانـاوی لکـاوی ك B خراوەتـە دوای رەگی فرمـانـەکـەوە.

ئەگــەر ویستمــان گەردانی بکــەین بەپێی یاســای سەرەوە گەردانی دەکەین:

هەڵ ـ بـ(رِێژ) ـ ە ← هەڵ برِێژە
هەڵ ـ بـ(رِێژ) ـ ن ← هەڵ برِێژ ن

فرمانی نادەی (دارِژاو)ی داخوازیش دوو جۆرە:
1 ـ فرمانی ناسادە (دارِژاو)ی داخوازی تێپەر:

**گلۆپی مەمکی کوژاوەی دایکەکانمان،**
**هەڵ گیرسێنە..**
**پشکۆی نووستووی، ژێر خۆڵەمێشی مێژوومان،**
**هەڵ بسێنە..**
**(من تینوێتیم بەگرِ ئەشکێ)**

لەم پارچـە هۆنـراوەیـەدا دوو فرمـانی نـاسـادە (دارِژاو)ی داخوازی تێپەرِ هەیە:

1 ـ فرمانی (هەڵ بگیرسێنە)[21]
2 ـ فرمانی (هەڵ بسێنە).

ئەم دوو فرمانە بەپێی یاسا:
- چاووگی نـاســادە (دارِژاو)ی (هــەڵ گیـرساندن)و چاووگی نـاســادەی (هــەڵ سانــدن)ی تێپــەرِ هێنــراوون و رەگـە ناسادەکانی فرمانەکانیان لێوەرگیراوە.
- لە چاووگــی (هــەڵ گیـرســانــدن) رەگـی نـاســادەی (هەڵ گیرسان)وەرگیراوەو ئەلفەکەی کراوە بە (ێ)و بۆتە (هەڵ گیرسێن).
- لە چاووگی (هــەڵ سانـدن) رەگی ناســادەی (هەڵ سان) وەرگیراوەو ئەلفەکەی کراوە بە (ێ)و بۆتە (هەڵ سێن).
- نیشانەی رِێژەی (ب) خراوەتە نێوان پێشگری فرمانەکەو رەگەکەی، بوونەتە (هەڵ بگیرسێن)و (هەڵ بسێن).
- لەپاشا راناوی لکاوی ك B خراوەتە دوایی رەگی فرمانەکەو بەم شێوەیەی خوارەوە گەردان کراوون:

1 ـ هەڵ ـ ب ـ گیرسێن ـ ە ← هەڵ بگیرسێنە.
هەڵ ـ ب ـ گیرسێن ـ ن ← هەڵ بگیرسێنن.

2 ـ هەڵ ـ بـ(سین) ـ ە ← هەڵ بسێنە.
هەڵ ـ بـ(سێن) ـ ن ← هەڵ بسێنن.

لەم فرمانە ناسادە داخوازییە تێپەرەدا دەتوانرێت.

1 ـ **ئامرازی (ش)ی عەتف:**
أ ـ بەدوای پێشگرەکەدا بهێنرێت، وەك:
هەڵ ـ یش ـ بـ (هێنج)ە ← هەڵیش بهێنجە.
بـ بەدوای نیشانەی رِێژەی (ب)دا، بهێنرێت، وەك:
هەڵ ـ بـ ـ ش (هێنج) ـ ە ← هەڵ بش هێنجە.

2 ـ رانــاوی لکــاوی ك A بەدوای پێشـگـری فرمـانـەکـەدا بهێنرێت، نەك نیشانەی رِێژەی (ب)، وەك:

ڕۆ ـ مان ـ بـ(کە)ن ← ڕۆمان بکەن.
دا ـ یان ـ بـ(دۆش)ە ← دایان بدۆشە.

3 ـ ڕاناوی لکاوی ك. A و ئامرازی (ش)ی عەتف دەتوانن هەردووکیان پێکەوە لە ئاخاوتندا بەدوای ئەم فرمانە ناسادە داخـوازییـەدا بێن، بەڵام لە هاتنـەکـەیـانـدا، بۆیان هەیە پاش وپێش بکەوون:

أ ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی ڕاناوەکە، وەك:
دا ـ مان ـ یش ـ بـ(گر)ە ← دامانیش بگرە.
ب ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی ئامرازی (ش)، وەك:
دا ـ ش ـ مان ـ بـ(گر)ن ← داشمان بگرن.

2 ـ فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی داخوازی تێنەپەڕ:
بۆ دارشتن و پێـك هێنـانی ئەم فرمـانـەو دیـاریکـردنی شوێنی نیشـانـەی ڕێـژەی (ب)و ڕەگی ناسـادەی فرمانەکەو ڕاناوی لکاوی ك A و ك B لە فرمانە ناسادەکەدا:
ـ لە چاووگی ناسـادە (داڕژاو)ی تێنـەپـەڕ ڕەگی ناسـادەی تێنەپەڕ وەردەگرین.
ـ نیشـانـەی ڕێـژەی (ب)ی داخـوازی دەخـەینـە نێـوان فرمانەکەو ڕەگەکەی.
ـ ڕاناوی لکاوی ك B دەخەینە دوای ڕەگی فرمانەکە.

بۆ وێنە: ـ
لە چاووگی ناسـادەی داڕژاوی تێنـەپەڕی (دانیشتن)، ڕەگی ناسـادە (دانیش) وەردەگـرین و بەپێی یاسـای سەرەوە گەردانی دەکەین:
دا ـ بـ(نیش) ـ ە ← دابنیشە.
دا ـ بـ(نیش) ـ ن ← دابنیشن.

لەم فرمـانـە ناسـادە تێنـەپـەڕەدا دەتـوانرێت تەنیا ئامرازی

(ش)ی عەتف:
1 ـ بەدوای پێشگری فرمانەکەدا بهێنرێت، وەك:
هەڵ ـ یش ـ بـ(فڕ) ـ ە ← هەڵیش بفڕە.
ب ـ بەدوای نیشانەی ڕێژەی (ب)دا، بهێنرێت، وەك:
هەڵ ـ بـ ـ ش (پەڕ)ن ← هەڵبش پەڕن.

★ ★ ★

## یاسـای نیـشـانـەکـانـی ڕێـژە لەگـەڵ فرمـانـی ناسـادە (داڕژاو)دا

1 ـ نیشانەی (دە):
أ ـ لەتەك فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی ڕابوردووی بەردەوامی تێپـەڕو تێنـەپـەڕی کارادیارو کاراناديارداا بەکاردەهێنرێت و دەخرێتە نێوان پێشگری فرمانەکەو فرمانە ڕووتەکەی قەدە ناسادەکە.
ب ـ لەتـەك فرمـانی ناسـادە (داڕژاو)ی ڕانـەبـوردووی ئیخبـاری تێپـەڕو تێنـەپـەڕی کارادیارو کارانـادیـاردا بەکاردەهێنرێت و دەخرێتە نێوان پێشگری فرمانەکەو ڕەگەکەی.
2 ـ نیشانەی (ب.. ایە)و (ب.. یە):
ئەم نیشانەیە لەتەك فرمانی ڕابوردووی ناتەواوی سادەی (داڕژاو)ی تێپـەڕو تێنـەپـەڕی کارادیـارو کارانـادیـار ی ئینشائیدا، بەکار دەهێنرێت، بەڵام:
أ ـ ئەگـەر فرمـانـەکـە کۆتـایی بە پیتەبزوێنی (أ) نەهاتبوو، فرمانە ڕووتەکە لە قەدەکەدا دەخرێتە نێوان نیشانەی (ب.. ایە).
ب ـ ئەگـەر فرمـانـەکـە کۆتـایی بە پیتەبزوێنی (أ) هاتبوو، فرمـانـە ڕووتـەکـە لە قەدەکـەدا، دەخـرێتـە نێوان نیشانەی (ب.. یە).
3 ـ نیشانەی (ایە) یان (یە):
ئەم نیشـانـەیـە دەکرێت بە پاشکۆی فرمانی ڕابوردووی

دووری ئینشائی‌ی تێ‌پەڕو تێنەپەڕی کارادیارو کاراناديار، بەڵام ئەگەر فرمانە رووتەکە لە قەدە ناسادەکەدا:

أ - کۆتایی بە پیتەبزوێنی (أ) نەهاتبوو، ئەوا نیشانەی (ایە) دەکرێت بە پاشکۆی فرمانەکە.

ب - کۆتایی بە پیتەبزوێنی (أ) هاتبوو، ئەوا نیشانەی (یە) دەکرێت بە پاشکۆی فرمانەکە.

4 - نیشانەی (ب):

ئەم نیشانەیە، دەخرێتە بەرایی:[22]

أ - رەگی فرمانی ناسادە (دارِژاو)ی رانەبوردووی تێ‌پەڕو تێنەپەڕی کارادیارو کاراناديارى ئینشائی.[23]

ب - رەگی فرمانی ناسادە (دارِژاو)ی داخوازی[24] تێ‌پەڕو تێنەپەڕ.

5 - ئامرازی (ش)ی عەتف لە فرمانی ناسادەدا، دەتوانرێت:

أ - بەدوای رێژەی (دە)و (ب)ی فرمانی تێ‌پەڕو تێنەپەڕی کارادیارو کاراناديارى رابوردوو، رانەبوردووی ئیخباری وئینشائی‌دا، بهێنرێت.

ب - بەدوای پێشگری فرمانی تێ‌پەڕو تێنەپەڕی کارادیارو کاراناديارى رابوردوو، رانەبوردوودا بهێنرێت.

جـ - بەدوای راناوی لکاوی (ك A)دا لە فرمانی ناسادە (دارِژاو)ی تێ‌پەڕدا، بهێنرێت.

6 - راناوی لکاوی ك A لەتەك فرمانی ناسادەدا:

أ - بەدوای نیشانەی رێژەی هیچ فرمانێکدا نایەت، ئەگەر فرمانەکە ناسادەبوو.

ب - دەتوانرێت:

1 - بەدوای پێشگری فرمانی ناسادەدا بهێنرێت.

2 - بەدوای ئامرازی (ش)ی عەتف دا بهێنرێت.

7 - ئامرازی (ش)ی عەتف و راناوی لکاوی ك A دەتوانن هەردووکیان پێکەوە بەدوای پێشگری فرمانی ناسادەی تێ‌پەڕدا بێن، لە هاتنەکەیاندا بۆیان هەیە پاش وپێش بکەوون.

پەراوێزەکان : -

(1) چاووگی ناسادە (دارِژاو) دەتوانرێت لە چاووگی سادەو پێشگری (هەڵ، وەر، دەر، دا، رۆ، تێك، تێ، لێ، لێك، پێ، پێك..) دروست بکرێت، وەك:

دەر - کەوتن ← دەرکەوتن.

(2) هەشە بەر ئەم یاسایە ناکەوێت، بۆ وێنە چاووگی ناسادە - دارِژاوی (هەڵ خستن) کە رەگی ناسادەی لێ‌دروست دەکرێت بەپێی یاسا نابێتە (هەڵ خس) بەڵکو دەبێتە (هەڵ خە)یان (هەڵ خ) وەك لە گەردانەکەی‌دا دەردەکەوێت:

هەڵ - دە - خە - م ← هەڵ دەخەم.

هەڵ - دە - خە - ین ← هەڵ دەخەین.

هەڵ - دە - خە - یت ← هەڵ دەخەیت.

هەڵ - دە - خە - ن ← هەڵ دەخەن.

هەڵ - دە - خ - ات ← هەڵ دەخات.

هەڵ - دە - خە - ن ← هەڵ دەخەن.

(3) قەدی فرمانی ناسادە وەك گوتمان لە (پێشگرو فرمانی رووت) پێك دێت.

(4) نیشانەی (دە) لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا بە (ئە) گۆدەکرێت، واتە لەبری (هەڵ - دە - وەرا ← هەڵ دەوەرا) دەڵێن (هەڵ - ئە - وەرا ← هەڵ ئەوەرا).

(5) لەبری راناوی کەسی دوومی کۆی جودا بەکارهێنراوە.

(6) لەبری راناوی کەسی سێیەمی کۆی جودا بەکارهێنراوە.

(7) لەم فرمانەدا:

هەڵ: پێشگری فرمانە رووتەکەیە.

دە: نیشانەی رێژەی بەردەوامە.

کێش: رەگی سادەی فرمانە.

را: نیشانەی کاراناديارە.

م: راناوی لکاوی ك B بەڵام (هەڵ کێشرا) بەسەریەکەوە قەدی ناسادە (دارِژاو)ی چاووگی (هەڵ کێشان)ە.

(8) لە فرمانی سادەدا راناوی لکاوی ك. A دەخرێتە دوای نیشانەی رێژەی (دە)وە، بەڵام لە فرمانی ناسادەدا دەخرێتە دوای

پێشگرەکەوە، واتە:
ناتوانین بڵێین (دا ـ دە ـ م ـ بەست ← دادەم بەست) چونکە لە کورد وەها نەبیستراوە، مەگەر ئەوانەی کورد زمان نین و تازە فێری کوردی بوون بە هەڵە ئەمە بڵێن.

(9) ناتوانرێت ئامرازی (ش)و ڕاناوی ك. A پێکەوە بەدوای نیشانەی ڕێژەی (دە)دا لە فرمانی نادسادەدا بهێنرێت و بگوترێت:
هەڵ ـ دە ـ یان ـ یش ـ خست ← هەڵ دەیانیش خست.
وەر ـ دە ـ ش ـ یان ـ خست ← وەردەشیان خست.

(10) (ب) بەتەنیا ڕەگی فرمانی سادەی (بوون)ە، بەڵام (لێك بـ) ڕەگی فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی تێنەپەڕی کارادیارە.

(11) چ بەتەنیا ڕەگی فرمانی سادەی (چوون)ە، بەڵام (تێك چ) ڕەگی فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی تێنەپەڕی کارادیارە.

(12) لە شێوەی کەسی سێیەمی تاکدا، ڕەگی فرمانەکە دەبێت بە (هەڵ د)و ڕاناوەکە دەبێت بە (ات).

(13) قەدی فرمانی ناسادە (داڕژاو) لە پێشگرو فرمانی رووت پێك دێت.

(14) فرمانی (هات) خۆی بە تەنیا پێی دەگوترێت (فرمانی ڕووت) هەروەها پێشی دەگوترێت (قەدی فرمانی سادە).

(15) هەندێ نیشانەی (ب)ی ڕێژە لە فرمانی ناسادەدا گۆناکەن و دەڵێن:
خۆزگە داپڵۆسێنرامایە.

(16) (دا ـ خ) قەدی فرمانی ناسادە (داڕژاو)ی چاووگی ناسادەی (داخستن)ە. بەپێی دەستوور دەبوو قەدەکە (دا ـ خست) بوایەو فرمانە ناسادە (داڕژاوە) کاراناديارەکە لە شێوەی رابوردووی تێنەپەڕ کاراناديارى ئینشائیدا (هەڵ ـ بـ ـ خست ـ را ـ یە = هەڵ بخسترایە) بوایە.

(17) نیشانەی ڕێژەی (ب) لە فرمانی ناسادەی داڕژاودا، بەداخەوە، نە دەنووسرێت و نەگۆ دەکرێت، ئەمە لە ڕووی یاساوە نەنگی یە، بەم پێیە فرمانی (دەرکەوێ) دەبێت (دەربکەوێ ـ ت) بێت.

(18) نیشانەی ڕێژەی (ب) کرتێنراوە.

(19) نوونی چاووگیەکەو پیتەکەی پێشی چاووگە ناسادەکە فڕێدراوە.

(20) بەڵام ڕەگی ناسادەی (هەڵ ڕش) کە گەردان دەکرێت، پیتی (ش) دەگۆردرێت، بە (ژ)و (ی) کرتێنراوی نێوان پیتی (ڕ)و (ش) دێتەوەو ڕەگە ناسادەکە وەهای لێ دێت (هەڵ ڕێژ).

(21) نیشانەی ڕێژەی (ب)ی نێو (هەڵ بگیرسێنە) لە شیعرەکەدا کرتێنراوەو (هەڵ گیرسێنە) نووسراوە، چونکە ئارەزوو بەلای فڕێدانیدا لە شێوەی ناسادەدا زۆرباوە (حەقیش نی یە فڕێبدرێت).

(22) واتە نێوان پێشگری فرمانە ناسادەکەو ڕەگەکەی.

(23) هەندێ بەم فرمانە دەڵێن ڕانەبوردووی ئەمری نائاشکرا (غیر صریح).

(24) لە هەندێ سەرچاوەدا ئەم فرمانە بە فرمانی داخوازی ئاشکرا (صریح) ناوبراوە.

## سەرچاوە


1 ـ مختصری صرف و نحوی کوردی ـ سعید صدقی بەغدا/ 1928.

2 ـ دەستووری زمانی کوردی ـ توفیق وەهبی جیزمی یەکەم/ 1929.

3 ـ قواعدی زمانی کوردی ـ بەرگی دووەم ـ نوری علی ئەمین ـ بەغدا/ 1958.

4 ـ گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی ـ نوری علی ئەمین ـ بەغدا/ 1958.

5 ـ ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ـ لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد/ 1976.

6 ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری بەرگی نۆهەم 1982 (ڕێنووس).

7 ـ چۆنیەتی نووسینی چاووگەی نەسادە ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری ـ بەرگی نۆهەم 1982 (د. کوردستان موکریانی).

8 ـ لایەنێکی جیاوازی ـ د. ووریا عمر أمین ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری بەرگی دەیەم. بەغدا/ 1983 ـ لاپەڕە 254 ـ 276.

9 ـ دیوانی دیلان ـ 1969 ـ چاپخانەی (ئەسعد) ـ بەغداد.

10 ـ بەرهەمی خاوێن ـ علی عارف آغا (شاری) 1984/ بەغداد.

11 ـ من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ شێرکۆ بێکەس ـ بەغداد/ 1973.


★ ★ ★

مؤلف هجری دەدە کرکوك

# توحفەی سلێمانی

مصطفی نەریمان

هجری دەدە[1] (1877 ـ 1952) شاعیری گەورەی نیوەی یەکەمی ئەم چەرخەی شاری کەرکوکە، زۆربەی شیعرەکانی بە تورکمـانی و فارسین لەو پارچـە شیعـرەی بەو لاوە کە لە چلەی ماتـەمی پیرەمێرددا خوێنـدویـەتی یـەوە ئیتـر بە کوردی هیچی بلاونـەکـردوەتـەوە، هەر رۆژنـامـەیـەك لە کەرکـوکدا دەرهێنرابێ هجری دەدە شیعری بە تورکمانی تێدا بلاو کردوەتەوەو دەوری خۆی تێداگێراوە وەك:

(1) رۆژنـامـەی (حـوادث) کە لە زەمـانی عوسمانی یەکان دا نێـوان سالانی 1911 ـ 1918دا سەدو سی و هەشت ژمـارەی لێ دەرچـووە نووسـەرانی ئەم رۆژنـامـەیـە: هجـری دەدەو زین العابدین و کەرکوکلی رەفیق حلمی بووە.

(2) رۆژنامەی (نەجمە) نووسەرانی ئەم رۆژنامەیە دیسانەوە هجری دەدەو رەفیق حلمی بوون و عبدالقادر خلوصی کفریلیش تێدا نووسـەر بووە ئەم رۆژنـامـەیـە سوپای بەریتانیاوەداگیرکەر لە کەرکوك دەری‌دەکرد، لەپێشدا (شکری عبدالاحد)ی بەسەرەوەبوو.


نام کتاب

تحفهٔ سلیمانی

مؤلف هجری دده کرکوك

طبعش
در مطبعهٔ سریانی بغداد
١٩٣٥

سالآنـەدا هجـری پێنـج کتێبی چاپکـردووە، (یـادگـار هجـری‌و تەرکیـب بەنـد) یان بە تورکـی‌و (گـڵدەسـتـەی خزعلیـە،[3] ربـاعیـات و تحفـهٔ سلێمـانی) یان بە فارسی بوون، هەر پێنـج کتێبەکەش دیوانی شیعربوون.

(دەدە) پیـاوێکی کەڵـەگـەتی چاورەشی برۆ ئەستـور بوو، دەنـگێکی گری هەبـوو، داردەستێکی جوانی بەدەستـەوە بوو، سمێڵی پڕو بەم لاو بەو لای دەمیا شۆڕەوە بووبوو، لە کەرکوك بەیـانیـان لە جووت قاوەو ئێـوارانیش لە چاخـانـەی مەجیـدیە[4] دادەنیشت و لە هەر قاوەخـانـەیەکداشوێنی دیاری خۆی هەبوو، هەر کە دادەنیشت قاوەچی قاوەی دەدایەو نێرگەلەچی نێرگەلەی بۆ پڕ دەکرد کە مژی بە نێرگەلەکەوە دەناو دەیڕوانیە ئاسۆی دوور ئەوەنلەئیتر چاوەکانی زەق دەیانڕوانیە ئەم لاو ئەو لا، لە هەر دوو قاوەخانەکەدا ئەدیب و رۆشنبیرو ناسیاوانی لە دەوری کۆدەبونەوەو چەند جارێك منیش وەك ئەو خەڵکە لەو دەورەدا دانیشتوم و من بە کوردی دەمدوواندو ئەو بە تورکمانی وەڵامی دەدایەوە.

(هجـری دەدە) خاوەن هەستێکی ناسـك و دڵ و دەرونێکی فراوان و عزەت نەفسـێکـی بەرز بوو، چاوی لە دەسـتی کەس نەبوو، گەرچی نەداراو بێ‌دەرامەت بوو و هەمیشە نیشانەی ئەو حاڵەی لە نێوچاواندا بە ئاشکرا هاواری دەکرد بەڵام رۆژێ لە رۆژان لە کەس داوای یارمەتێکی نەکردبوو.

لە نێـوان (هجـری دەدە)ی شاعیـری کەرکـوك و (پیرەمێرد)ی شاعیـری سلێمـانی‌دا پەیـوەنـدی‌یـەکی زۆر بەهێـز هەبـوو ئەم پەیـوەنـدی‌یـەش نەئـەگـەڕایـەوە بۆ سەر کورسی قوتابخانە چونکـە (پیـرەمێـرد) لە سلێمـانی رشـدیەی تەواو کردبوو چوبووە



صاحب هژدە تألیفات هجری دده کرکوك

(3) رۆژنـامـەی (کـەرکـوك) رۆژنـامـەیەکی هەفتەیی بوو لە سالآنـی 1926 ەوە تا سالـی 1972 دوو هەزارو سی‌و شەش ژمـارەی لێ‌دەرچـوو تا چلەکـان هجـری دەدە، شاعیـر محمـد صادق، رەشید عاکف هورمزی، فەهمی عەرەب ئاغا[2] شتیان تێدابڵاودەکردەوە.

هجـری دەدە لەم سێ رۆژنـامـەی کەرکـوکـدا پایـەو مەقامی خۆی هەبـوو شیعـری تورکمـانی تیایاندا بڵاودەکردەوە، هەر لەو

ئەستەمول و لەوێ قوتابخانەی حقوقی بریبو و بوبووە ئەفسەرو ئنجا لە فەرمانبەریدا بەرز بوبووەوە تا پلەی (محافظ ـ پارێزگار) بەڵام هجری دەدە پاش خوێندنی سەرەتایی مزگەوت لای مامۆستایان (علی حکمت ئەفەندیو مەلا رەزای واعظ) خوێندنی تەواوکردبوو، پیرەمێرد لە بیستەکاندا گەڕایەوە سلێمانیو دەستیدایە رۆژنامەگەریو ژین و ژیانی بلاوکردەوەو چەند کتێبێکی خۆی وەك (مەولەوی، کەمانچەژەن ،مەم وزین، دوانزدە سوارەی مەریوان و گاڵتەوگەپ)ی چاپکرد، ناسیاری نێوان ئەم دوو کەڵە شاعیرە دەگەڕێتەوەسەر ئەوەی هەردوکیان تورکیزان و فارسیزان بوون و شاعیرو رۆژنامەنووس بوون، لە خوو رەوشتیشدا لەیەك دەچوون، لە سەرەتای سییەکانەوە کە رێگای نێوان کەرکوك و سلێمانی بوو بە ئوتومۆبیلەرێ هاورێتی نێوان ئەم دوو شاعیرە پتەوتربوو، کە هەواڵی پیرەمێردت لە هیجری پرسایە دەیوت (پیرەمرد بنم صیق ارقداشمدر ـ واتە ـ پیرەمێرد هاورێی تەواوی منە). بابزانین ئەم هاورێتیی نێوانیان چ کارێکی لە پیرەمێرد کردووە؟ کە لە رۆژنامەی ژیانی ژمارە (344)ی رێکەوتی حەوتی تشرینی دووەمی ساڵی 1932دا لەم بارەیەوە ووتویە (ئەم جارە لە کەرکوك بووم، لە تەئبینی ماتەمی عزەت پاشادا هجری دەدەم دی بێ رەنگی تێدا دەبینرا، پرسیم گوزەرانی ئەم شاعیرە یەگانەیە چۆنە؟ ووتیان: مەپرسە؟. . . من هجری بە شاعرێکی بڵندو هونەرمەند دەزانم، دەبوایە کەرکوك قەدری بزانیایە، ئنجا من چی بڵێم خوا رەوای بینی سلێمانی قەدری فائق بێکەس دەزانێ، کەرکوك بۆچی لە هیجری هجرایە:

بزدەکی شاعرلری صایسە(دەدە): یجلرندەچیقمیور برتك (دەدە)

واتە ئەگەر بێتو (دەدە) یەعنی برایەك شاعرانمان بژمێرێت بە هومویانەوە دەدەیەکی دیکەی وەك (دەدە) یان لێ هەڵ ناکەوێت.

رۆژبەرۆژ هاورێتی، نێوان ئەم دوو شاعیرە بلیمەتە پتەوتر. دەبوو. ئەوەبوو پاش دوو ساڵ واتە لە ساڵی 1934دا هجری دەدە چووە سلێمانیو بوو بە میوانی پیرەمێردو ئەمیش خزمەتێکی زۆری دەکاو بە سلێمانیو دەورو پشتیدا گەشت و گوزاری دەکەن و دەچێتەناو خەڵکەوە لە نزیکەوە لەگەڵ دانیشتوانی شاردا ئاشنایی پەیدادەکات، لە رۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە (408)ی رۆژی 25ی ئابی 1934 پیرەمێرد ئەم دوو بەیتەشیعرە بۆ (هجری دەدە) دەنووسێت:

هجری دەدە هات بۆ سلێمانی
نشئەو نشیدەو سمێڵی هانی
خۆی زوو رۆیەوە شیعری جێماوە
خۆیشیو شیعریشی بەناوداوە؟

هجری دەدەش بە چوار دێری شیعری فارسی وەڵامی دەداتەوە لە ژمارەی داهاتوودا بەم ناونیشانە پێشکەش دەکات کە دەڵێت (هەڵبەستراوی ئەقدەم شوعەرا جەناب هجری دەدەی فاضل کەرکوکی بە فارسی) دەدە پاش ئەم سەفەرەی کە گەڕایەوە کەرکوك ساڵی 1935 هات ئەوگەشت و گوزارەی کرد، بە چامەیەك لە (242) دێرە شیعردا و ناوی لێناوە (توحفەی سلێمانی)و کتوپڕ ناردی لە بەغداد لە چاپخانەی (سریانی) لەتۆو لۆی (52) لاپەرەدا لە چاپ داو زۆربەی ژمارەکانی نارده سلێمانیو خوێندەوارو زاناو ناودارەکانی سلێمانی پێشوازیەکی تەواویان لە توحفەکەیان کرد ئەمەش لەم نوسینەی (پیرەمێرد)ەوە دەردەکەوێت کە لە رۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە (4304)ی رۆژینۆی شوباتی ساڵی 1935 بلاوکراوەتەوە کەدەڵێت: (تحفەی سلێمانی):ـ شاعر هجری دەدە تحفەی سلێمانی بە فارسی نظم و طبع کردوە، بۆی ناردوین، بەراستی تحفەیەکی تحف و یادگارێکی ئەلطەفە، ئەجدادی سلێمانی زیندووکردوەتەوە، ئەشخاص حاضرەشی دەژێنێ، حەقێکی وای خستوەتە سەرمان بە هەر چەندێ دەبێ بێ کرین، لە مطبعەی ژیان و لە دوکانی ئوستا ئەحمەد خەیاط و لای مەلاعەلی صەحاف دەفرۆشرێ، شاعیر خۆشی تیایەتی[5] بە شیوەی شیرین بۆمان دەخوێنێتەوە).

ئنجا وەختی ئەوەمان هاتووە بزانین ئاخۆ ئەو توحفەیە چ توحفەیەکە کەوا مێژووی سلێمانی تێدا زیندووکردوەتەوەو پیاوە ناودارەکانمانی پێ دەناسێنێت و مافێکی ئەو تۆی خستوەتەسەر شارەکەمان کە پێیان نەدرێتەوە، مەگەر بەوەی کە پاش پەنجا ساڵ دوای دەرچوونی کتێبەکە لە لاپەرەی گۆڤارێکی کوردیدا. ، یان لە کۆڕو ئاهەنگی دوو سەد ساڵەی سلێمانیدا بخرێتەروو

یادی بکرێت و ڕێزی بگیرێت، هجری دەدە لە چامەکەیدا چی بینیوە شیعری پێدا هەڵداوەو وێنەی بە هەڵبەست بۆ کێشاوەو هەر دێرە شیعرێکی بە ووشەی (دیدەم) واتە (بینیم) دوایی پێ هێناوە، ئەوی بینیوە بە شیعر نوسیویەتەوەو ئەوەشی مێژ وو بێت وەك بینین بۆیان گێراوەتەوەو ئەویشی هەر هۆنیوەتەوە، لە چامەی (تحفەی سلێمانی)دا هجری دەدە بۆ هەر مەوزوعێك ناونیشانێکی تایبەتی دانـاوە، ئەگـەز ناوەرۆکی ئەو مەوزوعـە شوێن، بنـەمـاڵـەیێکی بەنـاوبـانـگ و نیشـانـەی زانست و ڕۆشنبیـری بێت ئەوا زیاتری لەسەر نووسیوە و زۆرتری لەسەر هۆنیوە تەوە ئەگەر بۆ تاقەکەسێك بێت ئەوا بەیەك دوو دێرە شیعر پێشکەشی کردووە.

بۆ نمـوونـە: بۆ (مـەشهـودات) 24 دێـرە شیعـرو بۆ (مناظر سلێمـانی) 26 دێـرو بۆ بنـەمـاڵـەی بابـان و دامەزراندنی شاری سلێمانی (21) دێرو بۆ (سادات کرام) واتە شێخانی سلێمانی (20) دێرو بۆ کتێبخانەکەی (قادر ئاغای عەتار) 31 دێرە شیعرو بۆ (زانـایـانی سلێمـانی) دە دێـرو بۆ (سـەرقـەبـران) 12 دێـر بۆ (جاف) حەوت دێری تەرخان کردوە، هەروەها بۆ هەریەکە لەم ناودارو بنـەمـاڵـە بەنـاوبـانگانەی ئەو سەردەمە سەرو یەك یا دوو دێـری پێشکـەش کردوون، وەك (زەعیم ئەمین زەکی، بکـر صدقی پاشـای عەسکـری، عەلی کەمـال، ماجـد، حاجی رمضـان، شێخ لطیف، عەلـەکـە، سعیـدپاشا، مصرف زادە، شاڵی زادە، شەریف زادە، قەزاز زادە، کرکوکلی زادە، حاجی ابراهیم خفاف، هتد...).

یەکەم مەوزوعی (تحفەی سلێمانی) لە (مەشهودات) ەوە واتا بەرچـاوکـەتـووە دەست پێ‌دەکـات. ئەوا بەشێك لەچامەکە وەك خۆی دەنوسینەوە ئنجا لێکی دەدەینەوە.

شدم مورسلیمانی بسی مهرووفا دیدم
به بیماری سفرکردم که درمنزل شفادیدم
رسیدم چون بپرسیدم ز أمیدم گهر چیدم.
ترنجیدم بگنجیدم پسند دیدم صفادیدم
که بامهماننوازی صلحسازی سربر أفرازی
چوبهتر از برادر خوبتر از أقربا دیدم
همه حاضر جواب و خوش سخن و روخوش خطاب اور
لطایفگو بشاشتر، سحرلب خندها دیدم

هزاران چون ارسطو نشته بهر شربت صافش
کسی نوسیده شد از دست علها رهادیدم
خورد گر طفل شیرئاموز ازوشیر ژیان گردد
شرابش قوت جانست و یاقوت و بهادیدم
بیرون ئاید ز هر برج دریش صد شمس استعداد
نگاکردم بەهرفردی مجسم یك زکادیدم
بشب درمکتب (زانستن)ش حیّ سحربیدار
چوبلبل صنف طلاب از گلستان با صدا دیدم

واتـە (بـووم بە مێـروولـەی سلێمانی و[6] زۆر دۆستی وەفادارم تێدادی... بە نەخۆشی سەفەرم کردو کە گەیشتمە منزڵ شیفام دی، گەیشتم کە پرسیم لە هومێد گەوهەرم چنی‌یەوە...

ئەزیـەتم نەبـوو، سوودم وەرگـرت خۆشیم تێـدادی...، لە میهمانداریو صوڵحـسازیو سەربەرزیدا لە برا چاکتر لە خزم و خوێش بە کەڵك ترم دی...، هەموو حازر وەڵام، خۆش قسە رووخـۆش بەگفت و لفت نوکتـەگـۆ، رووگەش، دەم بەپێکەنینم دی.. هەزاری وەك ئەرەسطـو چاوەڕێی شـەربـەتی صافی‌یـە، هەرکـەس بیخـواتـەوە لە دەست نەخـۆشی رزگار دەبێ... گەر شیـرەخـۆر لێی‌بخـواتـەوە دەبێتە شێری مەیدان... شەرابی ئەو هێـزی گیـانـە، وەك یاقـووت بەنـرخـە لە هەر بورجێکـەوە صەد خۆری لێ‌هـەڵ دێ سەیـری هەر کەسێکم دەکـرد پارچـەیـەك زیرەگیم تێدادەدی...، شەو لە مەکتەبی زانستن دا هەمتا بەیان بێدارن...، قوتابی‌یەکانم وەك بولبولی خۆش ئاوازی گوڵـستان دی).

لە پارچـە شیعـری (منـاظـر سلێمـانی) واتـە (دیمـەنـەکـانی سلێمـانی)دا سلێمـانی دەکـاتـە بەهـەشتێـك و یەکـە.. ناو چیاو دێهـات و شارەکـانی دەهێنێت و بەسـەریـانـدا هەڵ دەدات وەك (پیـرەمـەگـرون، ئەزمـر، گۆیـژە، زێـویـە، لەغـاوگیر، تاریەر، پیرمەلەك، کەمۆ، پێنجوین) ئنجا بەرەو باشور دەروات و باسی (هـەڵـەبجـەو هاوارو عەبـابـەیلێ و تەوێڵەو بیارە)مان بۆ دەکات و ناوی پایە بەرزان شێخ عومەری ضیاءالدین و شێخ علاءالدین و شێخ حسام الدین زۆر بەرێزەوە دەهێنێت، ئنجا دەگەرێتەوە شارو دەچێـتـە سەرچنـار، لەدوای ژمـاردنـی ئەو شوێنـە خۆش و بەناوبانگانە دەڵێت (هیچ خۆش ویستنێك لە جیهاندا بێ‌رەقیب

نەبووە، رەقیبی ئەم شارەش رەشەبایە بەڵام رەشەبای سلێمانی بێدەردو بەڵایــە، ئەویش بزانــە لەم شارەدا لە گەزۆی تاڵ حەڵـوایـەکی شیـرینت دەرخوارد دەدەن) هجری دەدە کە دەچێتە سەرقـەبـران و سەردەکـەوێتە سەر گردی سەیوان یادی مردووەکان بەم جۆرە دەکاتەوە (کە چاوی دڵم کردەوە خودایا چیم دی لەم جێیــەدا؟ ناوی شاری بێدەنـگــان بوو، بەڵام دڵ رفێن بوو، سەیـوانی سەرقـەبـران بەڵکـو ئێرە جێی ژیانە لەبن هەردارێکیدا بولبولێکی ژیانی ئەبەدیم دی).

دامـەزرانـدنی سلێمـانیو بابـانەکانی بەیەکدا جەمـەر داوەو دەڵێت (روانیمـە شەرەفنـامـە بینیم بابـانـەکـان خاوەن شەرەفن و ئەوان دامـەزرێنـەرو گەورەی ئەم شارەبـوون و دەچنـەوەسـەر میر ئەبـداڵ و لەوێشـەوە دەچنـەوەسـەر پیـربـوداق) یەك بە یەك دێت میـرەکـانی بابـانمـان بۆ دەژمێـرێت وەك (بـەکرەسوور، خانە، ئەحمـەدپـاشـا، سلێمـان پاشـا، محەمـد پاشا محمود پاشا) کە دەگـاتـەسـەر (ابـراهیم پاشـا) دەڵێت (چـۆن حەزرەتی ئیبراهیم بنـاغـەی کەعبـەی دامەزراند ئەم ئیبراهیمەش سەدو پەنجا ساڵ لەمـەوبـەو لەم شوێنـەدا بنـاغـەی سلێمانی دانا) لەدواییدا ناوی وەچەکانی دوای ئەوان دەژمێرێ وەك (حەمدی، صلاح الدین، جمــال، جەلال، توفیق، شوکت، قادر، اسمــاعیــل حقی، مصطـفـیذهنی، اسمــاعیــل، مجیــد پاشــا)و ناوی هەردوو کورەکانیشی دەهێنێت (جەمیل و بەهجەت)و کورەزاکانیشیان کە ئەوســا منــداڵی ساوابـوون وەك (خـورشیـد، قادر، محمـود، محمد) دەبات، ئەو دوایییان لە ژیاندان، هەروەها ناوی (شەمسە)[7] دەهێنێت و دەیباتەوە سەر میرەبەگ.

کە دەچێتـەسـەر باسی (شێخانی سلێمانی) بە(سادات کرام) ناویـان دەبـات و دەڵێت (ئـەم بنـەمـاڵـە پیرۆزە دەچنەوە سەر مەعـروفـی نودێییو نوری ئەم شێخـەش وەك رۆژ سـلێمــانی روونــاك کردوەتــەوەو بنـەمـاڵـەکـەشی وەك مانگ لە ئاسمـانی سلێمـانیـدا دەدرەوشێتـەوە) ناوی (کـاك ئەحمـەدی شێخ و شێخ مصطـفـی وشێــخ سەعیــد) دەهێنێو دەڵێت (شێــخ سەعیـد وکورەکەی هەر دووك لە نەینەوا شەهیدکران) ئنجا دێتەسەر پایە بەرزیو دلێری (شێخ مەحمود)و[8] دەڵێت (شێخ مەحمود لەم وولاتـەدا وەك مەحمـودی غەزنـەوی وەهـایـە بگـرە لەویش پایـە بەرزتــرە چونکــە لە نەسلی پاکی ئەحمــەدە)و ناوی هەر سێ کورەکــانیشی دەهێنێت (رؤوف، عەلی، لطیف)... هجـری (دەدە) لە ئافرەتانی ئەم بنەماڵەیە باسی (عائشەخان)[9] دەکات و بە (ام المسلمین) ناوی دەبات دەڵێت (ئەم ئافرەتە چ ئافرەتێکە وەك شێر نەبەردە ،دیوەخانەی جەمەی دێت، ئەم دوختەرە (کچ) چ حەکیمێکە کە لە حیکمەتدا شیفای عەقڵ دەکات).[10] دوای ئەوە باسی شێخـەکــانی (سـەرگـەڵـۆ) دەکـات و دیسـان دەگـەرێتـەوە سەر سلێمـانیو زانـاکـانی ناوی (مـەلامـە حمودی چاومــارو زەهــاویو مەلای پێنجــوێنیو شێـخ عومـەرو مەلای مەریوانی) دەهێنێت.

ئینجا دەچێتە کتێبخانەکەی قادر ئاغای عەتارو بە (قـراءةتخـانـە)[11] ناوی دەبات و لەوێ شاعیرە کۆن و تازەکانی ئەو حەلەی سلێمانی یاد دەکاتەدەو دەڵێت (گوڵ و گوڵزاری ئەم شارە شاعیر، مەلی شاعیر ،پیاوی شاعیر، ژنی هەم شاعیر) جا دێت ناوی ئەم زانـاو شاعیـرانـە تێهـەڵکیش بە شیعـر دەکـات هەریـەکـەیـان بە یەك دوو دێـرە شیعـر، یان بە یەك دوو ووشـە ستــایش دەکــات (مــەولــەوی، نالی، مەلاخـدری رودواری ،بێسارانی، خانای قوبادی، ئەختەری کۆیی، شکری فضلی، شێـخ رضــا، حەمـدون، ئەحمـەد بەگی فتاح بەگ، مەحوی، ئەمین یمنی ،ئەمین زەکی، مەستی، طاهر بەگی جاف، أحمد مختــار جاف، سالـم، بێخـود، گۆران، موجـرم، زێــوەر، توفیق وهبی، بێکەس، پیرەمێرد،حوزنی) بۆ شکریو شێخ رضا دەڵێت (ئەگەرچی شکری فضلی موعارض شیخ رضا بوو بەڵام زبانی شێخ رضا وەك شمشێری قەضا تیژە) بۆ حەمدون دەڵێت (حەزرەتی حەمدون بەدڵ چاوی دنیا بینی هەیە، من ئەوم لە سلیمـانیـدا بە ئوبـوعـەلا[12] دانـاوە) بۆ هەردوو برا طاهـربەگ و ئەحمــەد بەگی جاف دەڵێت (لـەنــاو هۆزی جافــدا طاهـری خۆش رەوشت ظاهر بوو زوو جوانە مەرگ بوو ئەحمەد موختاری برای ئەدیب و نەجیب و وەك عوسمانیش[13] بە حەیایە) بۆ تۆفیق وهبی دەڵێت (توفیق لەخواوە تەوفیقی پێدراوەو مەوهبەشی پێ بەخشراوە) بۆ ئەمین زەکی بەگ دەڵێت (ئەمین زەکی بەراستی پیــاوێکی زەکییـەو بێگـومـان مامـۆستـایە هەموو تەئلیفێکی ئەو دەدرەوشێتەوەو قەڵەمەکەشی هەمیشە لە کاردایە بەش بە حاڵم من

زۆر سوپـاسی ئەو زاتە دەکەم) بۆ بێخود دەڵێ (بێخود بەروو بێخودە بەڵام بەدڵ ئاگادارە)و دەڵێت ئەمین یومنی خاوەنی هەفت پەیکەرەو[14] (گۆرانیش) دوو گەشتی بەسوودی بۆ هەورامان و قەرەداغ هۆنیوەتەوە ،لەدواییدا دەگەڕێتەوە سەر رۆژنامەی (ژیان)و ئەوسا ناوی (پیرەمێردو حوزنیموکریانی)[15] دەهێنێت و دەڵێت (پیرەمێرد مامۆستای سەردەستەی شاعیرانە وەك لاوێكی بەهیمەت و بەچاوێكی نوێوە بناغەی بۆ كوردی نووسین داناوە، لە رۆژنامەی ژیاندا حوزنیم دی هەرچەندە ناوی حوزنییە بەڵام خۆی زۆر بەزەوق و خۆش صوحبەتە)

باش ئەوەی باسی هەرێمی پژدەرو ناودارەكانی هۆزی پژدەر دەكات وەك (عەبباسی مەحمودو بابەكری سەلیم ئاغا) دەگەڕێتەوەو دەچێتە ناوجەلی و ستایشی (بەگزادەكان دەكات)و دەڵێت (بە رەگەز دەچنەوە سەر میرەبەگ و ناوی حەمەپاشا دەهێنێت) دەڵێت پێنج كوڕی هەبوە (عثمان، محمود، حسن، محمدعلی، فتاح)و دەڵێت هەر یەكێك لەم كوڕانە وەك دانەی گەوهەر بەنرخەو دەڵێت جافەكان لەگەڵ سەیدەكانی دۆڵپەمو لە حەسەندا یەك دەگرنەوە.

هجری یەك بەیەك بنەماڵەكانی سلێمانی دەژمێرێت و ناویان تێهەڵكێش بە شیعر دەكات وەك ئەوەی حاجی سعید ئاغا لە ناودارەكانی شارە چاوم بە جەلال و مستەفای كوڕی كەوت زۆر زیرەگە و هوشیارن و لە بنەماڵەی (كەركوكلی زادە)كان ناوی حاجی مەلا سەعیدو ئەحمەد ئاغاو كەریم صالح و فەتاح دەبات و دەڵێت (حاجی مەلا سەعید پیاوێكی خواپەرستە، عیراق هەقیە گەر شانازی بە مەردی كەركوكییەوە[16] بكات چونكە ئەمان وەك مانگی چواردە وەهانە)و لە باسی قەزازەكاندا دەڵێت (قەزازەكان لە ئاوریشم كاڵا دروست دەكەن، رۆحی قەزازەكان سەعیدەو خۆشیان بە تەوفیقن)[17].. دەربارەی شێخ لەطیفی دانساز دەڵێت (شێخ لەتیفی دانساز لە نەسلی كەریمە بەعەقڵ و حكمەت لە پیشەسازیدا هونەرێكی تەواوی پیشانداوە) لە گۆرانیبێژەكان ناوی (حەمەشێرو حەمە مەعروف) دەبات و دەڵێت دەنگ و ئاوازیان زۆر خۆش بوو. ، ئێوارانێ هجری دەدە دەچێتە (بانە ـ نادی) لەگەڵ كۆڕێكدا یەك دەگرێت و دەڵێت (شاعیران لە هەزار یەكیان دڵشاد نین هەریەكەیان گیرەوەی دەردێكن وەیان زبانیان براوەو سەریان لەسەر داناوەو دوور خروانەتەوە هەندێكیشیان بێكفن سەریان ناوەتەوە).

ئەمە گوڵدەستەیەك بوو لە گوڵزاری پان و بەرینی ئەو شاعیرە پایە بڵندە كە بە زمان توركمان بووەو لەئایین دا پەیرەوی كاكەیی كردووەو بوەتە (دەدە)[18] جا ئەگەر شاعیرێكی توركمان پێش پەنجا ساڵ ئەم ستایشەی سلێمانی كردبێت ئێمەش بۆ بەرێزەوە پاش پەنجا ساڵ لەمەیانەی یادی ٢٠٠ ساڵەی سلێمانیدا سەری ستایشی بۆ دائەنوێنین؟

**پەراوێزەكان.**

---

1 ـ هجریدەدە ـ ناوی مەلامە مەحمودی كوڕی مەلا عەلی كوڕی دەدە نەظەرە ساڵی 1877 لە كەركوك لەدایك بووە، لە ساڵەكانی شەڕی یەكەمی جیهانیدا مامۆستای قوتابخانەی (سلطانیە) بووە و لە ساڵی 927 دا بووەتە نووسەر لە رۆژنامەی (كەركوك)دا و ئەوەندەی پێنەچوە لەسەر ئیش نەماوەو ژیانی بە كوێرەوەریو نەدارایی بردوەتەسەر بۆیە وتویەتی:

نیجەبین (شیعر)ی دیدیم، ایتمەدی برجبە (شیعر)
آخری ملتزم ـ كیل ـ (شیعر) اولدم بن

واتە هەزاران شیعرم نووسی بایی دەنكەجۆیی سودیان بۆم نەبوو ئا ئەوەتا لەدوایی تەمەنمدا بووم بەقەواڵەچی پێوانی جۆ. فروشتندا، پێوانەی جۆی دەكرد. هجری لە یانزدەی كانونی یەكەمی ساڵ 1952دا كۆچی دوایی كرد، چلەی ماتەمینی لە قوتابخانەی ئامادەییدا بەسترا و ئێمەش بەشداریمان تێداكرد بۆئەوەی داوامان لێبكرێت شتێك پێشكەش بكەین.

2 ـ ئەم گوڵدەستە شیعرەی پێشكەش بە شێخ خەزعەلی شێخی عەرەبستانی ئێران كردبوو.

3 ـ محمد صادق یەكێك بووە لە شاعیرە ناودارەكانی كەركوك مامۆستای ناڵەكانی سەید ئەحمەدی خانەقا بوو لەم دواییەدا، ئەویش هەر بە توركمانی شیعری ئەنووسی ،شیعری كوردی بڵاوكراوەش هەبوو لەپێشدا مامۆستابوو ،ئنجا لە رۆژنامەی كەركوكدا كاریدەكرد.

(رشید عاكف هورمزی) ئەدیب و نووسەری توركمانی كەركوك بوو، مامۆستاو بەڕێوەبەری قوتابخانەیوو برای ناجی بەگی هورمزیبە، چوار پێنج ساڵ مودیر ناحیە بووە.

(فەهمی عەرەب ئاغا) یەكێكە لە نووسەرە بەناوبانگەكانی كەركوك، لەعەرەبیدا دەستێكی باڵای هەبوو پارچەیەك لە (مەقبەر)ی عبدالحق حامدی لە توركییەوە كردووبە عەرەبی لە سەرەتای پەنجاكان دا لەقوتابخانەی قەڵا پێكەوە مامۆستا بووین زۆر ئازاو نەبەردو بەگفت و لفت بوو بەڵام داخەكەم مەیخواردن كاری تێكردو كوشتی،

(عبدالقادر خلوصی) كوری موبارەك ئەفەندی برای عبدالكریم مبارەك و مەدحەت موبارەكی ئەهلی كفرییە بەعەرەبی چەند كتێبێكی داناوە لە چلەكاندا كۆچی دوایی كرد.

4 ـ جووت قاوە ـ دوو قاوەخانە بوون بە تەنیشت یەكەوە لە بەری قەڵادا، لەناو بازارەكەدا بووە، ئودەباو شوعەراو پیاوماقوڵانی كەركوك تیایدا دادەنیشتن و كۆڕیان تیادا دەبەست (مەجیدیە) ش لەبەری قۆریە لە سەر دوو ڕێگایەكەی بەرامبەر پردەكۆنەكەدا بوو ئێستاش هەر لەو شوێنە ماوە بەڵام ناوو سەروسیمای گۆڕاوە.

5 ـ مەبەستی ئەوەیە وێنەیەكی شاعیر لە لاپەرەییەكەمیدا بڵاوكراوەتەوە.

6 ـ مەبەستی ئەوەیە: بووم بە مێرولەی حەزرەتی سلێمان پێغەمبەر كە لە قورئاندا باس كراوە، تەعبیرەكەی تەوریەی تێدایە، چونكە ئەم بووتە. مێروولەو بە سلێمانیدا گەڕاوە نەك بە مێژوولەی چەرخی حەزرتی سلێمان

7 ـ شەمسەخان خوشكی حاجی برایم بەگی جافەو خێزانی جەمیل بەگی مەجید پاشا بوو، ئافرەتێكی خوێندەوارو بەقەدربوو جەمیل بەگ لەم ژنە سێ كوڕو سێ كچی هەبوو كوڕەكانی (محمد، أحمد، مخمود) ئەحمەدیان (بینا) بوو ساڵی 1975 كۆچی دوایی كرد، شەمسەخان خۆشی لە چلەكاندا كۆچی كرد.

8 ـ دەبێ ئەوەش بزانین لە وەختێكدا ستایشی شێخ مەحمودی كردووە كە شێخ بۆ خوارووی وڵات دوورخرابووەوە ئەمەش ئینصافی ئەو شاعیرەمان بۆ دەردەخات.

9 ـ (عائشەخان) خێزانی شێخ مەحمود بوو ئەو خێزانەكەیتری (بەهیەخان) بوو

10 ـ مەبەستی لەم ووشەیە (ئافرەتە) دووەمیانە (حەكیمە)

11 ـ بە یەكەم كتێبخانەی بازرگانیی سلێمانی دادەنرێت ،لەسەر شەقامی صابون كەران بوو، هەم كتێب و ڕۆژنامەی تیادادەفرۆشراو لەویش هەرچی بیویستایە دادەنیشت و بە عانەیەك ڕۆژنامەو گۆڤاری تیادادەخوێندەوە جا هجری دەدە هەقی بووە ناویلێناوە (قراءەتخانە)

12 ـ مەبەستی ئەوەیە (حەمدون) وەك (ابوالعلاء المعري) هەردووك شاعیربوون و كوێربوون، ئەمیش وەك ئەو بلیمەت و هەڵكەوتوو بووە، ئەو لە مەعەرەی نەعمان و ئەمیش لە سلێمانی.

13 ـ مەبەستی هەم حەزرەتی (عثمان بن عفان) كە بە (زیالحیا) ناویدەركردبوو هەم (عثمان پاشا)ی باوكی ئەحمەد مختار بەگە.

14 ـ ئەم بەرهەمەم چاوپێنەكەوتووە.

15 ـ دیارە لەو كاتەدا بووە كە حوزنی موكریانی لە سلێمانی یارمەتی پیرەمێردی داوە بۆ دەركردنی ڕۆژنامەی (ژیان).

16 ـ لێرەدا مەبەستی هەم بنەماڵەی كەركوكیزادەوهەم هەموو فەردێكی كەركوكییە

17 ـ مەبەستی (توفیق قەزاز)ە.

18 ـ (دەدە): لەناو توركماندا بە برای گەورە دەڵێن (دەدە) بەرامبەر (كاكەی) كوردییە، بەڵام لەناو كاكەییەكاندا (دەدە) پایەیێكە لە خوار (باوە)و (سەید)ەوە، كاكەیی وەك هۆزێك هەموو كوردن، بەڵام كاكەیی وەك ئایینێك توركمانیشیان تێداهەیە، لە كەركوك دا لە گەڕەكی (چای) برێك لە دەدەكانی كاكەیی مەزهەب هەیە، لە كفریدا لەناو گەڕەكی (ئیسماعیل بەگ) كۆڵانێك هەیە بە (كۆڵانی دەدە) ناوبانگی دەركردووە، كە جاران مەڵبەندی دەدەكان بووەو ئێستا وەچیان لێماوەتەوە (هجری دەدە)ش یەكێكە لە دەدەكانی گەڕەكی چای لە شاری كەركوكدا ،نازناوی شیعری (هجری) بۆ خۆی هەڵبژاردووەو پایەشی لە كاكەیەتیدا (دەدە) بووە.

# شێوازی ئاخاوتن لە ناو ئافرەتی سلێمانیدا

● محمد معروف فتاح ●
کۆلێجی ئەدەبیات - زانکۆی سەلاحەدین

1 - سەرەتا: -

شێواز لەو زاراوانەیە کە لەبەر زۆری بەکارهێنان سواوە. لەبەر ئەوەی زاراوەکە لە زمانەوانیدا بەزۆر واتای جیا جیا بەکار هاتووەو لە ئەدەبیشدا هەر زۆر لەمێژەوە شوێنێکی تایبەتی هەیە، شتێکی زۆر ئاساییە کە لەتەم و مژدا بێت و گەردی مێژوویی لێ نیشتبێ و لەلێکۆڵینەوەیەکی وادا پێویستی بە روون کردنەوەو سنوور دیاریکردن بێت.

لە رەخنەی ئەدەبیدا زۆر جار شێواز بەو بەرگە رازاوەیە دەوترێ کە بەبەر بیردا دەکرێ.[1]

لەزمانەوانیشدا، هەندێ جار وەك دەرچوون یان لادان لەرێگای دەربڕینی ئاسایی و[2] هەندێ جاری تریش وەك هەڵبژاردن لەنێوان چەند دەربڕێکی هاوشان دا سەیر کراوە.[3] مەبەست لەشێواز لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەو کۆمەڵە تەکنیکەیە کە ئاخاوتنی کۆمەڵە کەسێك لەئاخاوتنی کۆمەڵێکی تر جیا دەکاتەوە.

یەکێك لە بیرە سەرەکیەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەوەیە کە ئەو کەسانەی سەر بەکۆمەڵێکی تایبەتین وا چاوەڕوان دەکرێن وەك ئەندامێکی ئەو کۆمەڵە رەفتار بکەن و شێوازی ئاخاوتنی ئەوان بەکار بێنن. لەبەر ئەوەی شێواز بەپێی باری گوتن و بابەتی گوتن و نێوانی گوتن و پلەو پایەی هاوبەشەکانی قسەو تەمەن و جنسیان دەگۆڕێ،[4] ئاساییە کە ئافرەت بە شێوازێکی تایبەتی خۆی قسە بکات، بە واتای ئەوەی چەند تەکنێکی تایبەتی خۆی بەکار بێنێ لەئاخاوتن دا کە رەنگدانەوەی باری کۆمەلایەتی خۆی بێ و پەیوەندی بە کەسێتی خۆیەوە هەبێت.

بەڵگە نەویستە کە ئەندامانی کۆمەڵەکە خۆیان (بۆنموونە، ئافرەتان) مەرج نیە لە ناو خۆیاندا هەست بەوە بکەن کە لە کۆمەڵەکانی تری کۆمەڵ جیاوازن یان شێوازێکی ئاخاوتنی جودایان هەیە. بەزۆری ئەوانەی لەدەرەوەی کۆمەڵەکەن، واتا ئەندامانی کۆمەلانی تر، بۆ نموونە پیاو، هەست بەم جیاوازییەی ئەو کۆمەڵە دەکەن لەهەڵس و کەوت و رەفتارو شێوازی گوتن دا هەر لەبەر ئەمەیە کەزیاتر پیاو هەست بەوە دەکەن کە ئافرەتان شێوازێکی ئاخاوتنی جودایان هەیە لە بەر ئەوەی شێوازی ئاخاوتن دەبێتە بەشێك لەخوو لەمرۆڤدا، ئافرەت هەست بەوە ناکات کەشێوازێکی جیاواز لە پیاو بەکاردێنێ تەنیا لەو کاتانەدا نەبێ کە ئافرەتەکەی بەرامبەری شێوازێکی نامۆ یان نائاسایی بەکار دێنێ، بەواتایەکی تر تەنیا لەوکاتانەدا هەست بە بوونی شێوازە تایبەتیەکەی خۆیان دەکەن کە یەکێکیان لێی دەردەچێ.

کەواتە مەبەست لە شێوازی ئافرەتی سلێمانی ئەو شێوازە کۆمەلایەتیەی کوردییە کە ئافرەتانی ناوچەکە وا چاوەڕوان دەکرێن بەکاری بێنن. ئەم شێوازەش بریتییە لە چەند تایبەتیەك کە ئافرەتان لەم کەلچەرەدا لەگوتندا پەیرەوی دەکەن و بەلایانەوە گرنگە لێی لانەدەن و لەسەری برۆن چونکە مۆری تایبەتی خۆیانی پێوەیەو لادان و دەرچوون لێیپشت کردنە لە کۆمەڵەکەیان و تێکدانی یەکێتی کۆمەڵەکەیەو بگرە هەڵگەڕانەوەیەکە کە بەتوندی ئەندامەکانی تری کۆمەڵەکە بەرهەڵستی دەکەن و بەرەنگاری دەوەستن یان بەلای کەمەوە بەدڵیان نابێت و دەی دەنە بەر تانەو توانج و پلار.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا تەنیا لە شێوازی قسەکردنی ئافرەتی سلێمانی دەکۆڵینەوە. هەرچەندە شێوازی نووسینی ئافرەتی سلێمانیوا چاوەڕوان دەکرێ جیاواز بێت لە شێوازی نووسینی پیاوەکانی ناوچەکە[5] (هەر لەبەر ئەوەی هەر لایەکیان سەر بە کۆمەڵێکی جیاوازن) لێرەدا گرنگیمان نەداوە بە شێوازی نووسین لەبەر دوو هۆی تایبەتی:

1): (شێوازی نووسین بە ئارەزووی نووسەر دەتوانرێ ئاراستە بکرێ)، بە واتایەکی تر، نووسەر دەتوانێ بەسەریدا بچێتەوەو بیگۆڕێو چاکی بکات و ڕێکی بخات و بە ئارەزووی دڵی خۆی چۆنی بوێ وای هەڵسوڕێنێ.

هەرچی گوتنە، بە پێچەوانەوە، چاك ناکرێو ڕێك ناخرێو تا ڕادەیەکیش بە ئارەزوو وئیرادەی قسەکەر هەڵناسووڕێ، چونکە ئەوەی دەوترێ هەڵناگیرێتەوەو ناگەڕێتە دواوەو قسەکەر ناتوانێ پاکژی بکات و بەسەریدا بچێتەوە.

جا ئەگەر وەك لێکۆڵینەوەکانی (لابۆڤ) دەری خستووە،[6] ئافرەت بەشێوەیەکی گشتی لەپیاو گوێ ڕایەڵ ترین بۆ یاساو حەز لەسەرکەشی و لادان و دەرچوون لە یاسا نەکەن، ئەوا نووسین لەبەر ئەوەی زۆرتر لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندایەو مەودای پێداچوونەوەی تێدایە، کەمتر ئافرەت دەردەخات. بە واتایەکی تر، بەهۆی گوتنەوە دەتوانین ڕاستەوخۆ لە ڕاستی ئافرەت و هەستی بەرامبەر خۆیو کۆمەڵەکەی بگەین. هەرچی نووسینە، مەرج نیە ڕاستی ئافرەتمان بۆ دەربخات چونکە زۆر ئافرەت حەز دەکات وەك پیاو بنووسێت و هەندێ جاریش زۆری پێ خۆشە کە نووسینەکەی لە هی پیاو جیا نەکرێتەوە لە بەر ئەمە لە وانەیە بە ئارەزووی خۆی لاسایی شێوازی پیاوان بکاتەوە.

2): ژمارەیەکی زۆر کەم لە ئافرەتانی سلێمانی دەنووسن، ئەمانەش بەرهەمیان هێندە کەمە کەرەسەیەکی ئەو تۆمان ناداتێ کە بتوانین یاسای گشتی لێ دەرکەین و بەسەر نووسینی ئافرەتانی سلێمانیدا بەگشتی بیان سەپێنین و دڵنیابین لە دروستی کارەکە، بە تایبەتی چونکە، تەنانەت ئەم بەرهەمە کەمەشیان لەیەك بابەت نیە، (هەندێکی شیعرە، هەندێکی چیرۆکی کورت و کەرەسەی وەرگیراوە) تا بۆ لێکۆڵینەوەکەمان بشێ.

### 2 ـ کۆمەڵەی ئافرەت و پێویستی بەشێوازی تایبەتی: ـ

پێش ئەوەی بێینە سەر دیاریکردنی تایبەتیەکانی شێوازی ئافرەتی سلێمانی دەبێ بیسەلمێنین کە ئافرەت کۆمەڵێکی کۆمەڵایەتی جیاوازە. بۆ ئەم مەبەستەش پێویستمان بەوە دەبێ لە ڕوانگەیەکی مێژووییەوە لە پەیوەندی نێوان ئافرەت و پیاو بکۆڵینەوە لە سەرەتای پەیدابوونیانەوە.

ئەگەر ئافرەت کۆمەڵێکی جیاواز پێك نەهێنێو لە بارێکی جیاوازدا نەژێو هیواو ئامانجێکی جیاوازی نەبێ، ئەوا پێویستی بەوە نابێتا شێواز لەپیاو جیاکاتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئافرەت لە ژمارەدا نیوەی مرۆڤ پێك دێنن، لەوەتەی مرۆڤ لەم سەر زەوییە سەری هەڵداوە، ئافرەت هەر لە دوای پیاوەوە بووەو هەر شوێنی دوەمی دراوەتێ. ئەم ڕاستیەش وەنەبێ هەر لەبەر هەڵکەوتی ئافرەت خۆی بووبێ، بەڵکو لەبەر ئەوە بووە کە هۆکاری پەروەردەیی و کۆمەڵایەتیش کە دیسان هەر لەژێر دەسەڵاتی پیاودابووە هەربەرەو ئەم شوێن و پلەیەی بردووە.

ئەم گێتییە هەمیشە هەر پیاو خاوەنی بووە. بەڵگە شێ ناوێ بیسەلمێنین کە گێتی هەر وا بە ئاسانی دەست پیاو نەکەوتووە بەڵکو لەدوای سەرکەوتن بەسەر دەیان کۆسپ و تەگەرەدا کە یەکێکیان ئافرەت بووە پیاو توانیویەتی بەسەر سروشتدا زاڵ بێو دەست بەسەر زەویدا بگرێ.

لە چەرخی بەردین دا کە زەوی هەموو کەسێ خاوەنی بوو، کە چەکی دەستی مرۆڤ زۆر سادە بوو، هەردوو کۆمەڵەکە نێرو مێ یەکسان بوون. کە پیاو خەریکی ڕاوبوو، ژن لە ماڵەوە دەمایەوە، بەڵام ئەمیش خاوەنی بەرهەمی خۆی بوو، شتی دەچنیو شتی لە قوڕ دروست دەکردو بەرەنجی شانی خۆی دەژیا، لەبەر ئەمە لەگەڵ پیاودا یەکسان بوو.

لەگەڵ دۆزینەوەی ئاسن و مس و برۆنزدا، لەگەڵ دروست بوونی گاسن و بڵاوبوونەوەی کشتوکاڵدا، کە هێزی شان و بازوو گرنگیەکی تایبەتی وەرگرت، کار جارێکی تر دابەش کرایەوەو ئیشی ماڵەوە بەر ئافرەت کەوت. بۆ یەکەم جار لە مێژوودا، ئافرەت هەندێ لەدەست کەوتەکانی قۆناغی پێشووی خۆی لە کیس چوو دوای پیاو کەوت لەپلەوپایەدا. لە قۆناغی کشتوکاڵدا دەسەڵاتی پیاو زیاتر چەسپا. ئافرەت لەم قۆناغەدا ناچار بوو لەڕووی ئابووریو تەنانەت بۆمانەوەشی لەسەر زەوی زیاتر پشت بە پیاو ببەستێ چونکە کۆتی منداڵ بوون و سك پڕبوون و منداڵ بەخێوکردن زیاتر لەماڵدا بەستیەوە بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کە سروشت وەك شیردەرەکانی تر زۆربوونی کاتیشی پێ نەبەخشیوەو منداڵ بەدوای منداڵ دا هاتوون. پیاو لەم قۆناغەدا لەو پەڕی دەسەڵاتیدا بووە. نەك هەر

توانیـوێتی خۆی بپـارێـزێو بژینێ بەڵکـو کۆمـەڵی ئافـرەتیشی پاراستـووەو ژیـانــدوونی پیــاو هەر تەنیــا دەوری هەنگی نێـری نەبـووە، بەڵکـو بە پێچـەوانـەی هەمـوو گیـانـەوەرەوە، داهێنەریش بووە. هەر ئەو گورزەی کە گیانەوەری درندەی پێ لەخۆی دوور خستۆتەوەو میوەی پێ داگرتووە، بۆتە ئامێرێك لە دەستیدا بۆ فراوان کردنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر سروشت و دەورو بەریــدا. بەم جۆرە دەبیـنین کە باری ئابــووریو بایلۆجی مرۆڤی سادەبــوو بە هۆی دروســت بوون و کۆ بوونــەوەی دەســەڵات بەدەســت پیـاوەوە، بەڵام لەم قۆنـاغـەدا باری ئافـرەت هەر باش بوو چونکـە هێشتـا یاسانەبوو کە کۆت و زنجیریان بکات و هیچ ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتیش نەبوو کە جیایان بکاتەوە لە پیاو.[7]

کاتێ مرۆڤ گەیشتە قۆناغی کشتوکاڵی بەربڵاو، ڕێکخراوو یاسا کەوتنــە کۆت کردنی ئافــرەت، کە پیـاو دەستی بەسـەر زەویو زاردا کێشا، دەستی بەسەر منداڵ و ئافرەتیشا کێشا. لەبەر ئەوەی ئافرەت بە هۆی مێردانەوە لەباوك و دایکی خۆی جیا دەبووەوە.

منداڵەکانیشی هەر دەبوونە پشت بۆ مێردەکەیو منداڵ نە بۆ دایك دەبـوون و نەبـەنـاوی دایکـەوە بانگ دەکران، مێرد وای لێ هات وەك هەموو کەل و پەلێکی‌تر سەیری ئافرەت بکا.

لەسەدەکانی ناوەڕاستیشدا باری ئافرەت هەروا مایەوە. هەر لووت شکــاو و بێ بەش بوون وەك مشــەخـۆر سەیـر دەکـران. داستـان و چیــرۆکی ئەو سەردەمـە ئافـرەتیـان بەتـەمـەڵ و بێ‌هێـزو داوێن پیس دادەنــا. هەرچــەنــدە لە قۆنـاغی ووریـابـوونـەوەدا ئافـرەتی چینـە سەرمایەدارەکان کەمێك باریان باشتربوو، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ڕووکاری پیاو بەرامبەر ئافرەت هەر وەك خۆی بوو. ئەوەتە تەنانەت لەســەدەی هەژدەهــەمین دا ڕوونـاکبیـرێکی وەك ڕۆسۆ هەستی خۆی بەم جۆرە بەرامبــەر ئافــرەت دەردەبــڕێ «ئــافــرەت دەبێ لەپیــاو خوێنــدەواری کەمتــر بێـت. ژن دەبـێ وا دروست بێت کە پیــاو بەسەریدا زاڵ بێت. دەبێت بەرگەی ستەمی پیاو بگرێت».[8]

تەنیــا لەدوای بەرپــابـوونی شۆڕشی پیشـەســازی ئافـرەت توانی کەمێك لەو مافانەی کە لەسەرەتای ژیانییەوە دۆڕانبوونی هەرگیز دژی

بیان گێڕێتەوە دەست خوی. داهێنانی مەکینەو بەکارهێنانی لە بەرهەمدا بە شێـوەیـەکی بەربـڵاو، لەلایـەکـەوە جیـاوازی نێوان پیاوو ئافرەتی لە هێزی شان و بازوودا لابردو لەلایەکی تریشەوە، لەبەر ئەوەی پیاو خۆی بە تەنیا کارەکەی پێ بەڕێوە نەدەبرا، ناچار بوو جارێکی‌تر ئافرەت بێنێتەوە کۆڕی بەرهەم هێنان.

بەم جۆرە، شۆڕشی پیشەسازی دەرگای گێتی‌یەکی نوێی بۆ ئافرەت خستـە سەرپشت و بووە سەرەتـایـەك بۆ ژیـانێکی نوێو ڕزگـار بوونیان لە ستەمی پیاو.

ئەم چاو پێداخشاندنە خێراییە بەسەر مێژووی پەیوەندی ئافرەت و پیاودا لە سەرەتـای پەیـدابـوونیـانـەوە تا ئەمـڕۆ چەند ڕاستی‌یەکی سەرەکیمان بۆ دەخاتە ڕوو، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە دروست بوونی شێوازی ئافرەتەوە هەیە: -

1): هەموو مێژووی ئافرەت و کێشەی ئافرەت لەداهێنانی پیاوە. پیاو هەر لەسەرەتای پەیدابوونیەوە بەزۆری لەبەر هێزی شان و بازووی خاوەنی زەویو کۆمـەڵ بووە، خۆی ئایین و بەهـاو ڕەوشت و پێـوانـەی کۆمەڵایەتی داهێنـاوە. ئافـرەت بەشێـوەیکی هەرگیـز دژی ئەم ئیمپـراتـۆریـەتـەی پیاو نەوەستاوە، ئەگەر ناوبەناویش نارەزایی خۆی بەرامبەر ترش و تاڵی بەشی خۆی دەربـڕیبێ بۆ ئەم مەبـەستـەش خۆی گەیـانـدبێتە سەر شەقامەکان و درووشمی تایبەتی خۆی دابەزاندبێ، ئەم نارەزاییە نەی گەیاندۆتە ئامانجی خۆی بەڵکـو هەر پیـاو بڕیـاری لە سەر بەشی ئافـرەت داوەو ئەگـەر جاربە جاریش بە پێی بەرژەوەندیو پێویستی یان لە ترسی خۆی کۆتێکیشی بۆ شکاندبێ یان لە ستەمێك ڕزگاری کردبێ، هەر خۆی ڕزگاری کردووە.

ئافـرەت هەر لە سەرەتـای مێـژووەوە تا ئەمـڕۆ کۆمـەڵێکی کۆمـەڵایەتی سەربەخۆی پێك هێناوە کە لە پیاو جیاوازبووە.

لەبەرئەوە وا چاوەڕوان دەکرێ کە هەڵس و کەوتی تایبەتیشی هەبێت و خاوەنی شێوازێکی تایبەتیش بێ لە قسەکردندا کە ڕەنگ دانەوەی واقیعی کۆمەڵەکەی خۆیان بێت.

2): هەر چەندە هۆکاری وانی‌یە کە زمانی ئافرەت و پیاو یان نێرو مێ یان کاربــەدەست و بێ‌دەســەڵاتـان بە شێـوەیـەکی سروشتیو هەمیشـەیی لەیـەکتـری جیـا بکـاتەوە یان تەواو بیان ترازێنێ،[9] ئافرەت لەبەر ئەوەی خزێنراوەتە ماڵەوەو بەزۆری کاری ماڵی پێ سپێراوەو لەبەر ئەوەی پیاو بەدەســەڵات ترەو تەنـانـەت بڕیارو پێوانەکانی ئەم کەنارەشی هەر پیاو دایان دەنێ، ئافرەت پێویستی بە شێوازێکی تایبەتیە لە قسەکردندا تا

بتوانێ لەگەڵ پیاودا رێك بكەوێ. بە واتایەكی‌تر، ئافرەت دەبێ نەخشەی خۆی هەبێ لە قسەكردندا یان تەكنیكی تایبەتی خۆی هەبێ لەو چوارچێوە تەسكەدا كە تێیدا دەژی.

هەر ئەم پیلانە تایبەتیەی ئافرەتە یان ئەم ستراتیجیەتەی قسەیە كە وای لێ كردووین باوەڕمان هەبێت كە ئافرەت لە قسەكردندا شێوازێكی تایبەتی هەیە.

3): ئەو تەكنیكە قسەیانەی كە ئافرەت بۆ خۆی دادەنێ بۆ ئەوەی بگاتە ئامانجی تایبەتی خۆی نەك هەربارى مێژوویی و پەیوەندی لەگەڵ پیاودا تێیدا دروست كردووە بەڵكو ژیانی ڕۆژانەی ئەمڕۆو پەروەردەیماڵەوەو قوتابخانەو دەرگاكانی ڕاگەیاندن گەشەی پێ‌دەدەن تێداو زیاتری تیژی دەكەنەوە كە فێری ئەم نەخشە قسەیانە بێت و پەیرەوییان بكات.

4): تەكنیكی قسەیی ئافرەت یان ئەو نەخشانەی لە قسەدا بەكاری دێنن بۆ ئەوەیە كە بگەنە مەبەستەكانی خۆیان، ئەم مەبەستانەش بریتین لە چەند تایبەتیەك كە پەیوەندییان لەگەڵ پیاودا تیایاندا دروستی كردوون و بوون بە بەشێك لە كەسێتی ئافرەت.

هەموو ئەو كەرەسانەی، كە بۆ ئەم لێكۆڵینەوەیە كۆمان كردۆتەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات، كە ئافرەت لە ئاخاوتندا شێواز بۆ ئەم مەبەستانەی خوارەوە بەكار دێنێ، بەواتایەكی تر كە ئافرەت نەخشە بۆ قسەكردن دەكێشێ دەیەوێ یەكێك لەم مەبەستانەی خوارەوە بێنێتە دی: -

أ - بنەمای بەزەق دەرنەبرین:

ئافرەت لە قسەكردن دا هەرگیز نایەوێ بەزەقی بیری خۆی دەربڕێ. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارە كۆمەڵایەتیەی كە تێیدا دەژی و پێچەوانەشە لەگەڵ ڕادەی سەربەستی و باوەڕ بەخۆكردنێدا. بە واتای ئەوەی كە تا سەربەستی زیاتر بێت و باوەڕی بە خۆی زۆرتر بێت كەمتر (نازەقی) لە شێوازی ئاخاوتنی‌دا بەدی دەكرێ و بە پێچەوانەشەوە.

ب: بنەمای ناسكی: -

لە قسەكردندا ئافرەت بە شێوەیەكی گشتی دەیەوێ بیرەكانی بە ناسكی دەربڕێ و ئەگەر بەسەر زاریش بێت نایەوێ ووشەكانی خەڵكی تر ڕاستەوخۆ بریندار بكات.

لەبەر ئەوە دەبینین لەو كاتانەشدا كە بەڕاستی دەیەوێ پلارو توانج و تانەش بهاوێ ووشەكان سەرزاری بێ‌گوناح و ناسكن.

ئەگەر بەووردی‌یەكی تەواو لەم دوو مەبەستەش ووردبینەوە دەبینین كە هەموویان بۆهێنانەدی ئامانجێكی گەورەترە، كە بەشێكی زۆر گرنگە لە كەسیەتی ئافرەت لەم كەلچەرەی ئێمەداو مێژووی بەسەرهاتی لەسەر ئەم زەمینەو پەیوەندی لەگەڵ پیاودا تێیدا دروست كردووەو قووڵی كردۆتەوەو ژیانی ڕۆژانەشی زیاتر لەناخیدا دەیچەسپێنێ ئەم مەبەستە گەورەیەش ئەوەیە كە ئافرەت لەبەر ئەوەی لەو شوێنە ناسكەوە كە هەیەتی ناتوانێ خۆی بەرامبەر پیاو لێ‌پرسراو بكات، دەیەوێ تادەتوانێ لە بۆڵەی پیاو بەدوور بێت. هەر لەبەر ئەمەشە، كە لەكۆمەڵی ئێمەدا ئافرەت، بە تایبەتی ئەوانەی كە سەربەخۆیی ئابووریان نیە، كەم و زۆر خۆیان لەبڕیاری گرنگ دوور دەخەنەوەو هەمووی بۆ پیاو بەجێ دێڵن، چونكە ئەگەر لە بڕیارەكەدا بەشدار نەبن، ئەوا لێ پرسراویش نابن بەرامبەری، بێ گومان ئەم خۆ دوورخستنەوەیە لە بڕیاردان یان ئەم دوورەو پەرێزی‌یە شتێكی زۆر ئاساییە لە شێوازی ئاخاوتنی ئافرەتدا ڕەنگی دابێتەوە.

بەڕای ئێمە، ئەو دوو بنەمایەی سەرەوە كە ئافرەت بە شێوەیەكی گشتی لە ئاخاوتندا پەیرەویان دەكات بۆ ئەوەیە كە «گۆناوی» بڕیار نەخاتە ئەستۆی خۆی.

4): بێ گومان دەبێ بزانین كە ئەم نەخشەو پیلانە قسەیانەی كە دەوترێ ئافرەت لە قسەكردنیدا بەكاری دێنێ و كەڵكیان لێ وەردەگرێ وە نەبێ بەئاگاداری خۆی بێ یان لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا بێت، بەڵكو بەپێچەوانەوە، ئەم «نەخشە كێشانە» بەشێك، لە ڕەوشتی ڕۆژانەی ئافرەت یان خوویەك كە خۆنەكردەو هەروەك لەمەوپێش ووتمان مێژووی ژیانی و بەسەرهاتی لەسەر زەوی و ستەمی پیاو تێیدا

پەیداکردووەو کەم و زۆر لە ئافرەتی هەموو گێتیدا هەیەو ڕاستەوانەشە لەگەڵ ڕادەی سەربەستیو مافی ئافرەتدا.

بەواتای ئەوەی تا ئافرەت سەربەستی زیاتربێو مافی بڕیاردانی زۆرتر بێت لەکۆمەڵگەیەکدا، کەمتر پێویستی بەم نەخشە دانانە بێئاگایە دەبێو زۆرتر شێوازی قسەکردنی، بەتایبەتی لە ئاستی ڕستە سازیو پراگماتیکدا لە شێوازی پیاو نزیك دەبێتەوە.

**3 ـ تایبەتییەکانی شێوازی ئافرەتی سلێمانی: ـ**

**أ ـ تایبەتی فەرهەنگی یان لێکسیکی:**

فەرهەنگی ئافرەت لە هەندێ بابەتدا تەواو دەوڵەمەندو تێرەو لە هەندێ لایەنی ترەوە لاوازو بێ پیتە. ئەم دەوڵەمەندیو بێ پیتیەش یان دابەش بوونە نابەکسانە، ڕەنگدانەوەی ئەو ڕۆڵەیە، کە ئافرەت لە کەلچەری ئێمەدا دەیبینێو پەیوەندییەکی پتەوی بەو ئەرکەوە هەیە کە کۆمەڵەکەمان بە ئافرەتی سپاردووە.

بۆ نموونە، ئافرەتی سلێمانی واچاوەڕوان دەکرێ کە فەرهەنگی ماڵداری (چێشت لێنان و جل بڕین و جل دروون و منداڵ بوون و ژن هێنان و میوانداریو نەخۆشی منداڵ و، دوعاو سوێندو جنێوو تانەو پلار.... هتد) زۆر بەپیت و تێربێت. بەپێچەوانەی پیاویشەوە، وا لە ئافرەتی سلێمانی ڕادەبینرێ کە فەرهەنگەکەی زۆر پەڕپووت و لاوازبێت، کەدێتە سەر هەندێ باس کە پیاو شارەزایی تیایاندا زیاترە وەك بازرگانی، فیتەری بەهەموو جۆرەکانیەوە، وەرزش، لێخوڕین، پارچەی مەکینەو هەموو ئەو وشەو زاراوانەی کە پەیوەندی بە باری ڕامیاریو ئابووریو سەربازیو شەڕەوە هەیە.

ئەم دیاردەیە لە خۆیدا زیان بەخش نییە، بە واتای ئەوەی هیچی تێدا نیە ئەگەر ئافرەت لە هەندێ لایەنەوە فەرهەنگەکەی وشەی زیاتر بێت و زاراوەی پتر تێدا بێت، بەڵام کێشەکە ئەوەیە، لە هەندێ شوێنداو لای هەندێ کۆمەڵ زانینی ئەم وشەو زاراوانە بە «عەیبە» دادەنرێ چونکە بە چاوێکی بەرزەوە سەیری ئەو کارانە ناکەن کە بە ئافرەت سپێردراون.

وا لە خوارەوە هەندێ وشەو زاراوی بەشێك لە فەرهەنگی ئافرەتی سلێمانی[10] دەخەینە بەر چاوو هەوڵ دەدەین بەپێی بابەت بەشیان بکەین.

بێگومان ئەم وشەو زاراوانەی خوارەوە هەموو شتێك نین تەنیا مشتێکن لەخەرواری:

1 ـ ئەو وشەو زاراوانەی پەیوەندییان بە ماڵدارییەوە هەیە بە گشتی:

**أ ـ وشە: ـ**

کاسەو کەوچك، قاپ وقاجاغ، سەر هەویر، زەوا (د)، خەست وخۆل، قەرەبرووت، قاوەڵتی، حاجەت،[11] پەڵوڵە، جل بڕین، پاشتیلانە، حەوتە حەمام...

**ب ـ زاراوە: ـ**

وانان تەڕ دەکات،... دەست وەمی پێوە ئەخورێ،... دەمی نەکێشاوە، ساردوسڕە (وەك دەمی مردوو)، دایکی بمرێ نانەکەی بەدڵەوە نەنووسا، جگەرە کێشێ دانیشتم....

**2 ـ چاك وچۆنی: ـ**

وابلاوە کەژن زیاتر درێژە بە چاك و چۆنی دەدات لە پیاو. لە کاتێکا کە چاك وچۆنی پیاو لەدووسێ ڕستەدا دوایی دێت، چاك وچۆنی ژن زیاتر درێژە دەکێشێو وشەو زاراوەیان بۆ ئەم دیاردەیە زۆر زیاترە لەپیاو.

با بەراوردێکی ئەم دوو ئاخافتنە بکەین (1): لە نێوان دوو پیاوداو (2) لە نێوان دوو ئافرەتدا، تا چاکتر کێشەکەمان بۆ ڕوون بێتەوە:

(1): دوو پیاو:
یەکەم: ڕۆژ باش
دووەم: ڕۆژ باش
یەکەم: چۆنی، چاکی؟

دووەم: باشم، سەلامەت بی، تۆ چۆنی؟
یەکەم: زۆر باشم، خۆش بی.

(2): دوو ئافرەت:

یەکەم چۆنی؟ چاکی؟ باشی شکور، منالەکان چۆنن؟

باشن؟ ئەرێ ئەوە دیارنین، عەیب ناکەن خۆتان شاردۆتەوە، هەر ئێمە باشترین، هەر هەواڵتان ئەپرسین، ئێوە دەرگاشمان نا قلێشێننەوە باوکم، بێزتانْ نایە.

دووەم: (ئینجا دووەم دەست دەکات بەوەرام دانەوە).

3 ـ دوعا: ـ

فەرهەنگی ئافرەت پڕە لە دوعا هەندێ لەمانە داوای سزادانە بۆ کەسەکەو هەندێکیشی بۆ پاداشتە. هەردوو جۆرەکە پڕە لەو ووشانەی کە بەزۆری ئافرەت بەکاری دێنن و ئەوانەی نیشانەیان لەسەرە هەرگیز لەفەرهەنگی پیاودا نابینرێن:

أ ـ بۆ سزادان: باوانت شێوێ (لە منالْ دەکرێ)، ڕووت ڕەش بێ، بە ملی شکاو، بە ئەستۆی وورد، زمانت مووی لێ بێ، سەری زمانت بەبڕین چێ، کۆستت کەوێ.

ب: ـ بۆ پاداشت دانەوە (دوعای خێر):

(*)خوا چاکتان بۆ بکات، بێوەی بن، (*)لە قەزاو بەلا بە دوور بن، (*)لە شەڕی شەیتان و لە بەڵای ناگەهان و لە فتنەی ئاخر زەمان بە دوور بن، ڕوو سووربی (بۆ کچ) ڕووسپی بیت (بۆ ژن)، عەمرت درێژ بێت (بۆ منالْ)، (*)خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ، (*)قەزات لە ماڵم، ڕەحمەت لە شیرت، (*)سکت نەسووتێ (بۆ ژن)، (*)کزەت لێ نەکەوێ، کوڕت نەمرێ، (*)ماڵ وێران نەبی، (*)برات نەمرێ، بێ قەزا بی، (*)جەرگە براو نەبی، (*)جەرگت نەسووتێ، سەرفراز بی، کاك ئەحمەدی شێخ دەست بەباڵتەوە گرێ، لەش بەبار نەبی، کەنەفتی سەرجێگا نەبی، لە دەورت گەڕێم، بە ساقەت بم، بە ساقەکەت بم، خوا بە دڵی خۆتت لەگەڵ بکات، خوا ئاگادارت بێ..

4 ـ منالْ لەدایك بوون و ژن هێنان و بووك گواستنەوە لە ژیانی ئافرەتدا گرنگیەکی یەکجار زیاتری هەیە. هەر لەبەر ئەمەشە، کە لەم لایەنەشدا، فەرهەنگی ئافرەت دەوڵەمەندەو هەندێ زاراوەی تێدایە کە لە فەرهەنگی پیاودا نی‌یە:

(*) خوا لێتان موبارەك کات، (*) بە کوڕو کچ، (*) سەر بەڕزق، (*) نوخشەتان لێ بێ، پێو قەدەمی خێر بێ، (*) بە دایك و باوك گەورەبێ، (*) خوا مرادم با خۆم ژنی بۆ بێنم، (*) بەشادی دۆست، بە کوێرایی دوژمن.

5 ـ دیسانەوە ژن لە پەیوەندییاندا لەگەڵ یەکتریدا زۆر گەرم و گوڕترن و زیاتر یەکتری بەسەر دەکەنەوەو هەستی بەزەیی زیاتر دەردەبڕن و پۆزش گەرم تر وناسکتر بۆ یەکتری دەهێننەوە هەروەك ئەم زاراوانەی خوارەوە کە هەر ئافرەت بەکاریان دێنێ بۆمان دەردەخەن:

أ: میوانداری: (*) ماڵەکەتان ڕووناك کردینەوە! ئەبوایە مەڕێکمان لەبەر پێتان سەر بڕیایە، پایەتان لێ نایین، (*) چاومان ڕەوشن، چاومان ڕوون بووەوە.

ب: دڵنەوایی لەکاتی مردنی کەسێکدا:

(*) دەستم شکێ!، (*) مەرگی عەزیزت نەبینی!، (*) گەردنی خۆش و ئازا(د)بێ، (*) کوێرایم دایە، خوا سەبووریان بدا!

خوا خرا پترمان پیشان نەدا.

جـ: پۆزش هێنانەوە:

(*) لەگوڵ کاڵترت پێ ناڵێم (*) هەزار مناوڵ ئەکەم بە ساقەت، هەر تۆ دڵت نەیەشێ!، بۆ تۆ نەبێ بۆکێ باشە!، هەر دوو چاوم کوێر بێ ئاگاو عیلم و خەبەرم نی‌یە، هەر (*) ... منالەکەم بەدەستی خۆت کفن کەی شتی وا بە دەمما نەهاتووە!، (*) کوڕم بمرێ نەم زانیوە نەخۆشی.

د: سوێند خواردن:

بە 44 هەزار پێغەمبەر...، بەکاك ئەحمە(د)ی شێخ.. بەغەوسی بەغا.. بەو (*) کەسەی کەس لەڕەنگی نی‌یە، بەو خوایەی خوایەتی هەموومان ئەکات، بەو گۆڕەی (ڕەحمەتی.. جوانەمەرگی) تێ چووە..

6 ـ لە جنێـو دانیشـدا ئافـرەت کەمتـر لە پیـاو جڵەوی خۆی بۆ دەگیرێ، هەر لەبەر ئەمەشە کە لەم لایانەشەوە فەرهەنگەکەی تەواو دەوڵەمەندەو زۆر زاراوە هەیە کە هەر ئافرەت بەکاریان دێنێ:

(*) دەڵـە قوڕ..!، هەر(*) خۆت بەخـۆت بی، بەرمـاوەی هەمووکەس، دەم ناخەمە دەمی تۆ هەی وا لێکـاوی وایێ کراوا، (*)

فلقە کۆن (بە پیاو)، سەرت لەقوڕ نێیت (بە منداڵ)، بە پەنگە بی، شار بەدەر کرێـیـت، سەرت تاشـن سەرت بە تاشـین چێ، ڕەبی چوونت هەبێ و هاتنـەوەت نەبێ، گلاراوگـری (بـە منـاڵ)، خێـر لە خۆت نەبینی، بەر گولە کەوی، بە پەنگی ڕۆژگار بی، دەردێ بگری دەرمانت نەبێ، بێ باوك بی، بێ باوك گەورە کرێی، ماڵانگەڕی، سەرسواڵکەری، هەتیو چەی نەدیو بدی! ڕەبی هەرشەوەی قەبرێ بناسێ، ئەو باوکە سواڵکەرەت! بە پەنگی دنیاوقیامەت بن، خێر لە دنیاو قیامەتت نەبینی، چەنە چەن، شاتە شات، کچە تیوی بەرەڵای کۆڵانـان، عیبـرەت، شکڵت خواتـەوە، ئەیـەرۆ چەنـد بێشـەرمـە، دارزێی! بێ ئسووڵ، وەك لەوەلا تر چێ! ڕەبی کلۆوکۆت دامرێ! ئاگـرێ گری کوژانـەوەی نەبێ، پێچکت بە قەبـری مردووم ئەگـەر بیەڵم ئەمەت بەسەرەوە بڕوات! ئایین و ئۆین کەر.

ب: دەرکاندنی ناڕاستەو خۆ: ـ

تایبـەتیـەکـانی تری شێـوازی قسـەی ئافـرەتی سلێمـانی لەئاستی فەرهـەنگیـدا زۆری و بڵاوی ئەو ووشـەو زاراوانـەیـە کە خۆی دەیـان هێنێتـە شێـوازەکـەیـەوە بۆ ئەوەی لەژێـر پەردەی شەرمـەوەو لەودیـو پەرژینێکی قایمەوە بیرەکانی بدرکێنێ.

یەکێك لەو تەکتیکـە گرنگـانـەی کە پیـاو لەژن لەئاخـاوتندا جیا دەکـاتـەوە ئەوەیـە کە پیـاو، بە پێچـەوانـەی ژنـەوە، زۆر بێ پەردەتـر مەبەستەکانی خۆی دەدرکێنێ و ڕاستەوخۆو بێ پێچ و پەنا لەناسکترین کێشـە دەدوێ، ئەمـەش دیسـانـەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پیاو نەك خاوەنی خۆیـەتی بەڵکـو خاوەنی کۆمـەڵیشـەو پێوانەی ئاکارو بەهاش هەر خۆی داینـاوەو پێویستی بە شەرم و شکۆ نیە لەکەس. لەلایەکی تریشەوە ئافرەت زیاتر باوەڕی بەهێزی شاراوەو خێرو شەڕ هەیە، لەبەر ئەوە بە پێویستی دەزانێ لەبەر پیرۆزی یان لەترسیدا خۆی لە هەندێ باس نەدا بەشێـوەیـەکی ڕاستـەو خۆو مشت ومـڕ بەهیـچ جۆرێ دەربارەی هەندێ کێشە ناکات.

ئەو باسانەی کەژن ڕاستەو خۆ بێ پەردە لێیان ناکۆڵێتەوە دەبن بە چەند بەشێکەوە: ئەوانەی پەیوەندییان بە شەرمەوە هەیەو (وەك باسی جینسی و جنێو) ئەوانەی ترس یان پیرۆزی قەدەغەیان دەکات (وەك نەخـۆشی و مردن) بۆ نمـوونـە، ئافـرەت لەتـاو شەرم دەیـان زاراوەی ناڕاستەوخۆ دادەهێنێ تاوەکو بێپەردە ووشەیەکی وەك خۆشەویستی لە ئاخـاوتنـدا بەکـار نەهێنێ بەتـایبەتی کەبەرامبەرەکانی پیاوبن. ئەوەتە کوڕو کچانی دراوسێکانی «دڵیان بەیەکترەوەیە»و «حەزیان لەیەکتری کردووە»و «هەتیوەکە دڵی بەچەتیوەکەوەیە»و «شێت و شەیدای بووە»و «ئەیەوێ بیهێنێ»و «بەدڵیا چووە» و «داوای ئەکات». بەڵام هەرگیز «خـۆشی ئەوێ» بەکـار ناهێنێ چونکـە قەدەغـەیـە بەلای ئەمـەوە. دیسـانـەوە لەتـرسـدا، لە جیـاتی ئەوەی ڕاستـەوخـۆ ڕوونی کاتەوە کە مێردەکەی مردووە، دەیان ڕێگای ناڕاستەوخۆ دەگرێ هەر بۆ ئەوەی ووشـەی مردن بەکـار نەهێنێ. ئەوەتـە «بـاوکی منـاڵـەکـانی کۆچی (دوایی) کردووە»و «لەدنیا دەرچووە»و «نەماوە»و «ئەمری خوای کردووە «فەرمانی خوای بەجێ هێناوە»و «قەزاو بەلای ئێوەی بردووە» هەروەها نەخۆشیش بەلای ئافرەتەوە هێزێکی ڕەشی تێدایە لەبەر ئەوە بەئاسانی نابێت ناوی ببـرێت، بە تایبـەتی ئەو نەخـۆشیـانـەی کەسـەخت و کوشنـدەن. هەر لەبـەر ئەمـەیە سیلی جاران و سەرەتانی ئەم سەردەمە هەر بە «دەعبـاکـە»و «دوابـراوەکـە»و «دەردە پیسـەکـە»و «هـەرامـەکە» پەنجـەیـان بۆ ڕادەکێشـرێ بێ گومـان ناوی پیـروزیش لەشـوێنی نەگـونجـاو وپیسـدا نایـەت، لەبـەر ئەوە لەم شوێنـانـەدا ئافـرەت سوێنـدەکـەی بە «گـوڵێکی پاك» دەخـوات. هەروەها لەجنێو دانیشدا بۆئەوەی لەووشەی بێپەردە دووردەکەوێتەوە زۆر جار پەنا دەباتە بەر «ئەو چەتیوە والێکراوەی وا پێکراوە» و «ئەو شار بەدەر کراوەو «ئەو بەپەنگە بووەو ماڵانگەڕە»... هتد.

بەکارهێنانی ئەم تەکنیکە لەقسەی ئافرەتدا زۆر جار (سەرزاری) ناسکی یەکی تەواو دەدات بە قسەکانی و وامان لێ دەکات وابزانین کە

ئافرەت زۆر بە تەنگ بەرامبەرەکانیەوەیەتی و دەستی ڕێزیان دەنێتە سەرو تەنانەت لەناخۆشی و تووڕەیشدا «لەگوڵ کەمتر بەخەڵکی ناڵێ» و لەوانەشە وامان لێبکات باوەڕمان بەوە نەمێنێ کە ئافرەت قسەی ڕەق و ناخۆش دەزانێ. بەڵام لەڕاستیدا وەك لەباسی تایبەتیەکانی ڕستەی ئافرەتدا زیاتر بۆمان دەردەکەوێ ئەم تەکنیکە بە شێوەیەکی گشتی بەشێکە لەو هەموو نەخشە قسەییانەی کە ئافرەت بۆ دوورخستنەوەی خۆی لە «گوتاو ڕۆی» دوای بڕیار دەیان نەخشێنێ. بە واتایەکی‌تر، ئەم تەکنیکە بەشێکە لە «هێڵی خۆ پاراستن» ئافرەت لەبەر ئەوەی گوێ ڕایەڵترە لە پیاو بۆ یاسا کۆمەڵایەتیەکان بەلایەوە گرنگە کە ئەم یەکەم کەس نەبێ لەو پێوانەو بەهاو ئاکارانە دەرچێ کە لە کۆمەڵەکەیدا هەیەو پەیرەوی دەکرێ نەوەکو هەموو تاوانەکە بخرێتە ملی ئەم.

ب: تایبەتی فۆنەتیکی: ـ

لەڕووی دەنگەوە جیاوازیەکی زۆر لە نێوان شێوازی ئافرەت و شێوازی تردانیە. لێرەدا دوو دیاردە بەرچاو دەکەوێ کە شایانی لێکۆڵینەوە بن:

1 ـ هەندێ جار ئافرەت بەزۆری بۆ خۆ دەرخستن تەکنیکێکی تایبەتی بەکار دێنن، کە کار دەکاتە سەر زۆربەی فۆنیمەکانی گوتن.

پیاو کە زیاتر لەژن خۆیان هەست بەم تەکنیکە دەکەن پێی دەڵێن «خۆناسك کردنەوە»یان «دەنگ باریك کردنەوە».

لە دەنگ باریك کردنەوەدا ئەم گۆڕانانە بەسەر دەنگدا دێ: ـ

أ: لەگەڵ هەموو ڕێچکەی گوتنەکەدا ئافرەتەکە لێو پان دەکاتەوە (ئاسایی لێو پان کردنەوە لەگەڵ بزوێنەکانی پێشەوەی کوردیدا (و/ێ/ ی/ ن) لەگەڵ هەندێ نەبزوێنی وەك (ف، ڤ)دا دەروات نەك هەموو فۆنیمەکان).

ب: هەموو وشەکانی گوتنەکە زۆر بەئاشکرا دان پیا دەنێ و کەمێك زیاتر لە نێوانیاندا دەوەستێ، بە واتایەکی‌تر، ئافرەت دەبێ لەسەرخۆو بێ‌هەڵەشەیی قسە بکات.

جـ: بێ دەنگێکی زیاتر لەئاسایی دەخاتە پێش گوتن (سەرەتای قسە) ودوای گوتنەوە (کۆتایی قسە).

د: زۆربەی یاساکانی دەنگ لابردن (دەنگ قووت دان) دەخاتە پشت گوێ.

بۆ نموونە لە جیاتی (باس ناکەم)و (شێ محی‌الدین) و (کا عەلی)، هەر (باست ناکەم)و (شێخ محی‌الدین)و (کاك عەلی) بەکار دێنێ. بە واتایەکی تر بە شێوازێکی ڕەسمی دەدوێ.

هـ: هەندێ لە دیاردە دەنگیە ناوەندییەکان (وەك بەرمەڵاشوو دان) کە دیاردەیەکی زۆر بڵاوە لە زاری سلێمانی‌داو بە تایبەتی کاتێ دروست دەبێ کە بزوێنەکانی پێشەوە بەدوای دەنگی (ك، ف، پ)دا بێن لەناو دەربڕین دا. بۆ نموونە لە جیاتی ئەوەی (ك) یەکی نزیك چ لە ووشەی (کێ)دا بەکار بێنێ، ئافرەتەکە لەسەر خۆ ماوەیەك لە دەنگی ك دا دەوەستێ و ئینجا بەرەو ێ دەڕوات، بەم پێیە ك بە ئاسایی وەك ك ی ووشەی (کاو، کەی، کاروان)دا دەر دەکات.

و: بەدرێژایی گوتنەکە دەم و چاوو لێوو دەست بزواندنێکی تەواو بەدی دەکرێ شایانی سەرنجە کە ئەم دیاردەی خۆ ناسك کردنەوەیە (خۆ بەناز فرۆشتنیشی پێ دەڵێن) هەموو ئافرەتێ بەکاری ناهێنێ و ئەوانەی بەکاری دێنن لەوانەیە پێ ئاگابن و لەوانەشە ئەندامەکانی کۆمەڵەکەی خۆیان هەستی پێ نەکەن ئەگەر زۆر خەست نەکرێتەوە.

هەموو دیاردەکەو دەست نیشان کردن و ناونانی کاری پیاوە، هەرچەندە بەکارهێنانی تەکنیکەکە پەیوەندی بە جینسی قسەکەرانەوە نیە، بەوا تایەکی‌تر، ژنان لەناو خۆیانداو لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکی تریشدا بەکاری دێنن. دیسانەوە وەك دەردەکەوێ بەکار هێنانی تەکنیکەکە پەیوەندی بە تەمەنی ئافرەتیشەوە کەمە چونکە لە زۆر تەمەندا هەر بەکاردێ. زیاتر لەوە دەچێ کە «خۆ بە ناز فرۆشتن بەند بێت بە جۆری باسەوە نەك کەسانی ئاخاوتن و تەمەنیان بەوەدا کە دیاردەکە بەزۆری لەو کاتانەدا بەکار دێ کە ئافرەتەکە باسی خۆی دەکات یان شانازی بەشتێکەوە دەکات و خۆی پێوە بادەدات.

تایبەتی‌یەکی تری دەنگی هەیە کە زیاتر نەوەی پێشوتری ئافرەتانی سلێمانی لەنەوەی ئێستاو پیاوان جیادەکاتەوە، ئەویش گۆڕینی دەنگی

لْ ه بۆ /ر/ له هه‌موو ووشه‌یه‌کدا، به واتایه‌کی تر، نه‌هێشتنی فۆنیمی ڵ له کوردیدا. دیارده‌که وه‌ك پاشماوه هه‌ر له قسه‌ی ئافره‌ته به‌ساڵا چووه‌کاندا ماوه‌و نه‌وه‌ی نوێی ئافره‌ت له‌م یاسایه لای داوه. بۆ نموونه، زۆر له ئافره‌ته به ته‌مه‌نه‌کان به «خوڵ»و «رۆڵه» ده‌ڵێن «خور» و «رۆره». به باوه‌ری هه‌ندێ شاره‌زا،[12] ئه‌م دیارده‌یه له‌ژێر کاری دایلێکته ناوچه‌ییه‌کانی تری کوردیدا هاتۆته ناو شێوازی ئاخاوتنی ئافره‌تی سلێمانییه‌وه، به تایبه‌تی له ژێرکاری دایلێکتی کۆیه‌و موکریان دا که هه‌ردووکیان له بنه‌ڕه‌تدا له‌گه‌ڵ دایلێکتی سلێمانیدا ئاشناو نزیکن له یه‌کتریه‌وه. به‌لای لێکۆڵه‌ره‌وه ئه‌م بیره له شوێنی خۆیدا نی‌یه‌و به‌ئاسانی ره‌ت ده‌کرێته‌وه له‌به‌ر دوو هۆی سه‌ره‌کی:

1 ـ ئه‌گه‌ر دیارده‌که له‌ژێر کاری دایلێکتی تردا بوایه، ده‌بوایه کاری له شێوازه‌کانی تریش بکردایه‌و فۆنیمی ڵ یش له‌وانیشدا له‌ناو ببردایه. ئاشکراشه که شێوازی پیاو ئه‌م دیارده‌ی ڵ گۆڕینه‌ی تێدا نی‌یه.

2 ـ زۆربه‌ی ئه‌و ئافره‌تانه‌ی که ڵ ده‌گۆڕن به ر نه‌ك هه‌ر له‌و ناوچانه‌وه نه‌هاتوون، به‌ڵکو وه‌ك خۆیان روونیان کردۆته‌وه په‌یوه‌ندیشیان به خه‌ڵکی ئه‌و ناوچانه‌وه هه‌ر نه‌بووه یان زۆر که‌م بووه، له‌به‌ر ئه‌وه رێی تێ ناچێ که که‌وتبنه ژێر کاری دایلێکتی تره‌وه.

هه‌موو ئه‌و که‌ره‌سه قسه‌ییانه‌ی که لێکۆڵه‌ر کۆی کردوونه‌ته‌وه‌و هه‌موو ئه‌و زانیاریانه‌ی ده‌رباره‌ی ئه‌و ئافره‌تانه ده‌ستی که‌وتووه په‌نجه بۆ راستیه‌ك راده‌کێشن که دیارده‌که‌مان بۆ لێك ده‌داته‌وه ئه‌ویش ئه‌وه‌یه، که ئه‌م تایبه‌تی‌یه به‌شێك بووه له چه‌ند تایبه‌تی‌یه‌کی تر، که کاتی خۆی شێوازی ئاخاوتنی چینه خانه‌دانه‌کانی کوردی له شێوازی گوتنی چینه هه‌ژاره‌کان جیا کردۆته‌وه‌و له‌وانه‌شه، له بنه‌ڕه‌تدا هه‌ر تایبه‌تیه‌کی شێوازی ئافره‌تانی ئه‌م چینه بوو بێت نه‌ك هه‌موو چینه‌که. ئه‌مه‌ش به‌وه‌دا ده‌رده‌که‌وێ ئه‌و ئافره‌ته که‌مانه‌ی که تائێستا ئه‌م دیارده‌یه له قسه‌کانیاندا به‌کار دێنن، هه‌موویان له کۆندا له چینێکی ده‌وڵه‌مه‌ندو فه‌رمان ره‌وا بوون.

## جـ: تایبه‌تی نا زمانی[13]

جگه له تایبه‌تیه زمانیه‌کان (تایبه‌تی فۆنه‌تیکی و فه‌رهه‌نگی و رسته‌یی چه‌ند تایبه‌تیه‌کی نازمانی هه‌یه که شێوازی ئاخاوتنی ئافره‌ت له شێوازه‌کانی تر جیا ده‌کاته‌وه. ئه‌م تایبه‌تیه نازمانیانه بریتین له ئاوازو دوورو نزیکی قسه‌که‌ران و چۆنیه‌تی دانیشتنیان و بزاوتنی له‌ش و جۆری وه‌ستان و چاوتێبرین و بزاوتنی ده‌م و لێو له کاتی ئاخاوتندا.[*14] ره‌وشت له ئاخاوتندا له چه‌ند که‌ره‌سه‌یه‌کی تێکچرژاو به ناویه‌ك چوودا پێك هاتووه. گرنگترینی ئه‌م که‌ره‌سانه بێ گومان زمانه چونکه ئه‌و هۆکاره‌یه که هه‌موو زانیاری (واتا) ده‌گه‌یه‌نێ. به‌ڵام زمان به ته‌نیا هه‌ر خۆی ئه‌م کاره ناکات به‌ڵکو له ئاخاوتندا له‌گه‌ڵ هۆکاره نازمانیه‌کاندا تێکه‌ڵ ده‌بێت و به هه‌موویان ئاخاوتن پێك دێنن.

به شێوه‌یه‌کی گشتی هۆکاره نازمانیه‌کان ده‌کرێن به دوو به‌شه‌وه:[15]

هۆکاری گوێی (ئه‌وانه‌ی ده‌بیسرێن)، هۆکاری چاوی (ئه‌وانه‌ی ده‌بینرێن) ئاواز نموونه‌یه‌کی کۆمه‌ڵه‌ی یه‌که‌مه، جۆری دانیشتن و ماوه‌ی نێوان قسه‌که‌ران ده‌ست و ده‌م و لێو بزاوتنیش له‌کۆمه‌ڵه‌ی دووه‌من. هه‌ندێ له‌م هۆکارانه به‌ندن به زمانه‌وه، به واتای ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ زماندا به‌کار دێن و بێ زمان هیچ واتایه‌ك ناده‌ن به‌ده‌سته‌وه. وه‌ك لێو هه‌ڵ قورتاندن و ده‌ست راوه‌شاندن. هه‌ندێکی تر له‌م هۆکارانه سه‌ربه‌خۆن، به‌واتای ئه‌وه‌ی به بێ زمانیش کاره‌ده‌که‌ن و واتا ده‌گه‌یه‌نن وه‌ك سه‌رله‌قاندن بۆ خواره‌وه (سه‌ردانه‌واندن)و سه‌ره‌وه (سه‌ربه رزکردنه‌وه) که زۆر جار له جیاتی «به‌ڵێ»و «نه‌ء» زمانی به‌کاردێن. بێ گومان، له‌م لێکۆڵینه‌وه‌یه‌دا ئێمه هه‌روه‌ك هۆکاری به‌ند لێیان ده‌کۆڵینه‌وه چونکه زیاتر ده‌مانه‌وێ ده‌ست نیشانی رۆڵیان بکه‌ین له ئاخاوتنی ئافره‌تی سلێمانیدا.

هه‌موو ئه‌و که‌ره‌سانه‌ی کۆمان کردوونه‌ته‌وه ده‌رباره‌ی ره‌وشتی ئافره‌ت له کاتی ئاخاوتندا ئه‌م راستیانه‌ی خواره‌وه‌مان بۆ ده‌رده‌خه‌ن:

1 : ئافره‌ت زۆر زیاتر له پیاو که‌ڵك له ئاوازی ده‌نگ وه‌رده‌گرێ‌و

ئەوەتە لە کەم ڕستەی ئافرەتدا ناواختێك (ئاخ، ئۆف، ئەیەرۆ، . . . هتد). نەبێت ئەمەش لە وانەیە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئافرەت کەمتر لە پیاو دان بەخۆیدا دەگرێو زیاتر جڵەو بۆ هەستی خۆی بەرامبەر ڕووداو وباس و کات و شوێن و کەسانی ئاخاوتنی شل دەکات.

2: دوورو نزیکی کەسانی ئاخاوتن لەیەکتریەوە، بەتایبەتی کە یەکێك لە کەسەکان ژن بێت بە پێی چەند هۆکارێك دەگۆڕێ: (أ) جۆری پەیوەندی کەسەکان، (ب) جینسی کەسەکان و (حـ) قۆناغی ئاخاوتن. کە ژنان لەناو خۆیاندا قسە دەکەن زۆر لە پیاو زیاتر لەیەکتری نزیك دەبنەوە.

بەپێچەوانەوە کە یەکێك لە کەسەکان پیاو بێت، دوورتر لە پیاو دەوەستن. هەروەها تا هاوبەشەکان پەیوەندیان خۆشتربێت و پلەو پایەی کۆمەڵایەتیان نزیکتر بێ لەیەکتر، زیاتر لەیەکتر نزیك دەبنەوەو بەپێچەوانەوە. دیسان بە درێژایی ئاخاوتن ئافرەت لە پیاو زیاتر دەجوولێ و بە شێوەیەکی گشتی ماوەی نێوان کەسانی ئاخاوتن لە سەرەتاوە زۆرترە وەك لە ناوەڕاست و کۆتایی ئاخاوتندا.

3: جۆری دانیشتن پەیوەندی لەگەڵ بەرژەوەندی کاتیدا هەیە. بۆ نموونە کە دوو ژن کاریان بە یەکتری بێ یەکسەر دەچنە لای یەکەوە. کە لەپێش برکێ‌دا بن، زیاتر بەرامبەر یەك دادەنیشن و چاودێری یەکتری دەکەن بە پێچەوانەوە پیاو لەپێش برکێ‌دا لە یەکتر دوور دەکەونەوە.

4: ئافرەت زیاتر لە پیاو دەم و چاو دەبزوێنێ و لێو هەڵدەقورتێنێ و لەش دەجوولێنێ و دەست ڕادەوەشێنێ و هەروەها لە پیاویش زۆر وورياترە لە بەکار هێنانیاندا.

ئەوەی پیاو لە چەند ڕستەیەکدا لە بەرامبەرەکەی دەگەیەنێ، ئافرەت بە لێو هەڵ قورتاندنێك یان بە تیلەیەکی چاو دەیکات. هەروەها ئافرەت زیاتر لە پیاو دەبزوێ لەگەڵ کات و شوێن و کەس دا. بۆ نموونە، ئیشارەتی دوور لەگەڵ «ئەو، ئەوان، ئەوێ، ئەوسا» بەکار دێنێ. لەگەڵ «من و ئێمەو ئێرە، ئێستا» بە زۆری دەست لە خۆی نزیك دەکاتەوە.

5: چاوتێ برین لە هەموو جۆرە ئاخاوتنێکدا گرنگە چونکە نیشانەی ئەوەیە کە قەناتەکە کراوەتەوە، بە واتای ئەوەی خەڵکەکان ئامادەن لەگەڵ یەکتریدا بدوێن.

دیسانەوە چاوتێ برین بەندە بە پەیوەندی نێوان کەسانی ئاخاوتنەوە. تا هاوڕێیەتی زیاتر بێت کەسەکان زیاتر سەیری یەکتری دەکەن لە کاتی ئاخاوتنداو بە پێچەوانەشەوە. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ لێرەدا ئەوەیە کە ژن بە شێوەیەکی گشتی زیاتر سەیری بەرامبەرەکەی دەکات لە کاتی ئاخاوتنداو تا کەسەکانیش تێکەڵ بن، زیاتر کات بۆ سەیرکردن و چاودێری تەرخان دەکات. بە پێچەوانەوە کە شوێنی قسە تەسك بێت (وەك لە ناو پاسدا بۆ نموونە) ئافرەت کەمتر چاودێری بەرامبەرەکەی دەکات. هەروەها ئافرەت چاوتێ برین بۆ «نۆبە» وەرگرتن لە قسەدا زۆر بەکار دێنێ. ئەگەر بیەوێ مەودا نەدات بە بەرامبەرەکەی کە وەڵامی بداتەوەو نۆبە بری لێ بکات، ئەوا بەردەوام سەیری ناکات.

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە بەشێوەیەکی گشتی ئافرەت زیاتر لە پیاو کەڵك لە هۆکاری نازمانی وەردەگرێ لە ئاخاوتندا نەك هەر بۆ گەیاندنی مەبەست بە تەنیا بەڵکو بۆ زامن کردنی ڕۆڵ گۆڕینەوەو ڕوون کردنەوەو دەربڕینی هەست و دووپات کردنەوەی بیروڕاو دەم کوت کردنی بەرامبەرەکەیو درێژەدان بە ئاخاوتن.

***د: تایبەتی ڕستەیی:***

*بۆ شیکردنەوەی هەندێ لەو ڕستانەی کە لە کاتی ئاخاوتندا لە زاری ئافرەت دەردەچێ پێویستمان بەوە دەبێت کە لەدوو ئاستدا لێیان بکۆڵینەوە:[16] ئاستی سەرەوە کە فۆرم و واتای ئاسایی ووشەکان دەگرێتەوەو ئاستی ژێرەوە، کە پەیوەندی بە مەبەستی ئافرەتەکەوە هەیەو ئەو ئەرکەمان بۆ دەست نیشان دەکات کە دەیەوێ ووشەکانی پێی هەڵسێ.*

*بێگومان دان نان بە بوونی ئەم دوو ئاستەدا کارێکی گرنگ و پێویستە چونکە باری کۆمەڵایەتی ژن وای لێ کردووە کە نەتوانێ ئەو بیرەی هەیەتی و ئەو کارەی دەیەوێ بە ئازادی دەری بڕێ لەبەر ئەمەیە*

که ئاستی سەرەوەو ژێرەوەی ڕستەکانی زۆربەی کات واتاکانیان وەك یەك نیەو هەردووکیان یەك شت ناگرنەوە. بۆ نموونە، ئەو ڕستەیەی کە لە سەرەوە یان لە سیمادا پڕە لە ڕێزگرتن و سادەیی لەوانەیە لە ژێرەوە پڕبێت لە گلەیی و سەرزەنشت و پلار. بۆ ئەوەی چاکتر لە کێشەی سەرەوەو ژێرەوەی ڕستەی ئافرەت بگەین وا لەخوارەوە ڕستەیەك شی دەکەینەوە:

لە یەکێك لەو ئاخاوتنانەی تۆمارمان کردووە، ژنێك لە مێردەکەی دەپرسێ: سەعات چوار بەی بەشوێنما بۆ ماڵی باوکم؟

هەر چەندە ڕستەکە لە شێوەی پرسیار دایەو بەمە مافی بڕیاردانەکەی داوە بە مێردەکەی لە سیمادا پڕە لە ڕێزگرتن، بەڵام بارو شوێنی قسەکە چەند ڕاستیەکی ترمان دەداتێ:

(1) قسەکە هەر چەند لە شێوەی پرسیار دایە ژنەکە وای لە مێردەکەی دەوێ بە پرسیاریدا نەنێ چونکە زۆر بە تەنگەوەیە کە بچێت بە شوێنیاو بە لایەوە چاکترەو واشی لێ‌ی دەوێ کە وەك «فەرمان» سەیری بکات.

شێوەی دەربڕینەکە (پرسیارەکە) لە ژێر کاری هۆکاری تردایەو «بوونی خەڵکی تر لەوێدا» ئەمە نابێ لە کێشە سەرەکیکە بگۆڕێ کە مێردەکەی دەبێت و پێویستە (یان ئەرکی سەرشانێتی) کە بڕوات بە شوێنیا.

ئافرەتەکە مەبەستی لە ڕستەکە دووپات کردنەوەو چەسپاندنی کاتەکەیە (سەعات چوار) نەك ڕوودان یان ڕوونەدانی کارەکە.

کەواتە ڕستەکە هەر «وەرە بە شوێنما سەعات چوار»ە بەو پەڕی ناسکی و ڕێز لێنانەوە دەربڕاوە. چونکە باری کۆمەڵایەتی ئافرەتە وای لێ کردووە کە نەتوانێ بە زەقی ئەوەی دەیەوێ دەری بڕێ، ناچار دەیەوێ قسەکەی خۆی بخاتە زاری مێردەکەیەوەو بڕیارەکەش بکات بە بڕیاری مێردەکەی خۆی بەمەش «گۆتاو ڕۆی» بڕیارەکە لە ئەستۆی ئەودا نابێت.

(2) بۆ گەیاندنی ئەم مەبەستە شاراوەیەی ژێر ڕستەکە ئافرەت پێویستی بەوە دەبێ پشت بەهۆکاری نازمانی و زمانی ببەستێ وەك لێوجوڵاندن و دەم قووچاندن و تیلە سەیرکردن. گرنگ ئەوەیە کە دوای ماوەیەك هەڵسان و دانیشتن لەگەڵ ئافرەتدا، پیاو بە هەموو ئەم هۆکارانە ڕادێت و فێری واتاکانیان دەبێ.

(3) گومان لەوەدا نیە کە مێردەکەشی چاك لە واتا شاراوەکە دەگات چونکە ئەگەر کارەکەشی بۆ جێ بەجێ نەکرێ ناڵێت «خۆ تۆ داوات لێ نەکردم بێم بە شوێنتا، بەڵکو ووتت ئەگەر پێت کرا». کەواتە مێردەکەش دەزانێ کە بڕیارەکە ژنەکە داوێتی بە ناوی ئەمەوەو ئەم تەنیا جێ‌بەجێ‌کردنی لەسەر بووە.

کەواتە بۆ لێکدانەوەو شی‌کردنەوەی هەندێ ڕستەی ئاخاوتنی ئافرەت دەبێت نەك هەرگوێ بدەینە واتای ووشە فەرهەنگیەکان بەڵکوو دەبێ لەمەبەستی ژێرەوەی ئافرەتەکەش بگەین و سەرنجێکی چاك لە ئاوازی دەنگی و بەکارهێنانی هێزو بزاوتنی لەش و جوڵاندنی دەم و لێوو بڕۆو چاویشی بدەین چونکە ئەمانەش بۆ ژن زمانێکی تایبەتین.

بە شێوەیەکی گشتی ڕێز لێ گرتن لە ئاخاوتنی ئافرەتدا تەکنیکێکی زۆر گرنگ و کاریگەرو بڵاوە. ئەم ڕێز لێ گرتنەش کە تێیدا ئافرەت خۆی بە کەمتر لە بەرامبەرەکەی دادەنێ (ئەگەر بۆ گاڵتەش بێت) بەزۆر ڕێگە خۆی دەکات بەناو ئاخاوتنی ئافرەتدا. هەندێ لەم ڕێگایانە ئەمانەن:

(1) زۆر بەکار هێنانی ئەو ووشەو زاراوانەی کە گومان دەردەبڕن وەك: وابزانم، لام وایە، دەنگە وایە، ئەبێ، ئەڵێن، ڕەنگە، لەوانەیە، «وا» قاوە.. دەنگە وابڵاوە.. هتد. بە بەکار هێنانی ئەمانە لە ئاخاوتندا ئافرەت دەتوانێ ئۆباڵی کارەکە لە ئەستۆی خۆی بکاتەوەو لە هەمان کاتیشدا ڕێزی خۆی پێشانی بەرامبەرەکەی بدات.

(2) بەکارهێنانی شێوەی پرسیار لە جیاتی یان لەو شوێنانەدا کە لە شێوازەکانی تردا فەرمان بەکار دێ. بۆ نموونە، ئافرەت زیاتر دەڵێ «بڕۆین؟». لە جیاتی «با بڕۆین»، ئەگەر فەرمانیش بەکاربێنێ ئەوا زیاتر لە پیاو هەوڵی ناوەخنی بۆ دەدات تا کەمتر کاریگەر بێ و

بەرامبەرەکەی نەتەزێنێ.

یەکێك لە نیشانەکانی تری خۆ بەرپرسیار نەکردن لە ئافرەتدا لەوەدا دەردەکەوێ کە بەدرێژایی تەمەنی ڕێگەی ئەوە دەدات کە خەڵکی بەکورتەی ناوەکەیەوە بانگی بکات. بەم کارە تەمەنی خۆی ڕادەگرێو نایەڵێ هەرگیز بە ساڵدا بچێت و ئەو کاتانەی خۆی دێنێتەوە یاد کە منداڵێکی بێ دەسەڵات بووەو بۆ هەموو کارێکی پشتی بە خەڵکی تر بەستووە. بۆ نموونە، شتێکی زۆر ئاساییە کە تەنانەت ئافرەتێکی زۆر بەساڵا چووش بە «گوڵە خان»و «نەسە خان»و «ئاتە خان» بانگ بکەین لە جیاتی گوڵاڵە گوڵزار خان یان نەسرین خان..

بە پێچەوانەوە، بەکارهێنانی کورتە ناو لە پیاوا بۆ بانگ کردن زۆر درێژە ناکێشێو کە پیاو چووە ساڵەوەو تەنانەت گەیشتە (30) ساڵ و کەمتریش ڕێگە نادات بەکەس (بە تایبەتی نەناسیار) کە بەناوە کورتەکەیەوە بانگی بکات تەنانەت ئەگەر ناز ناویشی لە گەڵدا بێ. لەبەر ئەمە دەبینین کە «کاك دڵە»و «وەستا قالە»و «حاجی عەلە»و «خاڵە عوسە»و «مامە فەرە» لە چوار چێوەیەکی زۆر تەسکدا نەبێت لە جیاتی «کاك دڵشاد»و «وەستا قادر»و «حاجی عەلی».. بەکار نایەن.[17]

## (4): کاکڵەی لێکۆڵینەوەکە: -

کە دەڵێین ئافرەت شێوازێکی جیاوازو سەربەخۆی هەیە لە ئاخاوتندا مەبەستمان ئەوە نییە کە کوردییەکەی جیاوازەو پیاوان تێی ناگەن بەڵکو دەمانەوێ بڵێین کۆمەڵی پیاو کە ئافرەتی بە زۆرە ملی لەماڵەوە خزاندووەو خۆی کردووە بە خاوەنی کۆمەڵ و پێوانەو بەهاو ئاکاری خۆی بەسەر کەسانی تردا سەپاندووە بەمە ئافرەتی ناچار کردووە پەنا بەرێتە بەر هەندێ تەکنیك لە ئاخاوتندا کە ڕەنگدانەوەی ئەم بارەی ژیان و کەسێتی خۆیەتی.

بڵاوترین شێوەی ئەم تەکنیکە بۆیەیەکی ڕێزلێ گرتن و ناسکییە کە لە سیما یان لە دیوی دەرەوەی هەموو ئاستێکی قسەی ئافرەتدا هەستی پێ دەکرێ بەم ناسکیو دەستی ڕێز لێنانە کە بەهۆی چەند هۆکارێکی زمانیو نازمانییەوە دەستی دەخات دەتوانێ دیوی دەرەوە داپۆشێو ئەو ڕاستیە بشارێتەوە کە ئەم لەبەر ئەو بارە ناسکەی تێیدا دەژی ناتوانێ خۆی بەرامبەر زۆر شت لێ پرسراو بکات و وای بەباشتر دەزانێ کە بڕیاری ڕاستەو خۆ نەدات و بڕیاری سەرزاری بۆ پیاو بەجێ بهێڵێ بەڵام ناو بەناو خۆی بڕیارەکانی فێر بکات و وای لێ بکات ئەم بێتە دەم ڕاستی. بەم جۆرە خۆی هەر گوڵە خان و ئاتە خانەو تا دەگاتە حەفتا ساڵەش هەر سەرزاری بێ گوناح و بێ دەسەڵاتە.

بەڵام کەسێتی خۆشی هەر پاراستووەو هەر خۆی لەو دیوی پەردەوە فەرمانڕەوایی دەکات.[18]

کە دەڵێین ئافرەت لەم کەلچەرەی ئێمەدا ئەم تەکنیکانە بەکار دێنێ مەبەستمان ئەوەیە کە وایان لێ چاوەڕێ دەکرێ بەم جۆرە بکەونە ئاخاوتنەوە. بێ گومان ئافرەت هەیە کە ئەم تەکنیکانە بەکار ناهێنن، بەڵام ئافرەتێکی ئازاو بە جەرگی دەوێ کە لە کۆمەڵەکەی خۆی هەڵگەڕێتەوەو وەك هەموو ئافرەتێکی تر هەڵس و کەوت نەکات و جێی ڕەزامەندی ئافرەتیش بێ.

ئەم تەکنیکانەش وە نەبێ تەنیا لە ئەنجامی ئەوەوە هاتبێت کە ئافرەت و پیاو هەڵکەوتێکی بایەلۆجی جیاوازیان هەیە، بەڵکو ڕەوشتێکی زمانییەو وەك هەموو ڕەوشتێکی تر لە ژێر کاری ڕاهێنان و پەروەردەدا لە منداڵیەوە لە ئافرەتدا دروست بووە، بە واتایەکی تر، بۆیە ئافرەت ئەم تەکنیکانە لە ئاخاوتندا بەکاردێنێ چونکە لە منداڵیەوەو بێ ئاگایی خۆی لە کۆمەڵی پیاودا فێر کراوەو ناو بەناو پاداشتی لەسەر ئەم ڕەوشتەی وەرگرتووەو ئەگەر لە سەریشی نەڕۆشتبێ سزای خۆی وەرگرتووە.

بەوەی بە ئافرەتێکی نائاساییان داناوە. تەنانەت لەو کۆمەڵانەشدا کە بە ئاشکرا دان بە مافی ئافرەتدا دەنرێ قوتابخانەو ماڵ و دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەر فێری ئەم ناسکیو بە ئابڕوویە سەر زارییەیان دەکات لە ئاخاوتنداو هەر ئەمەشیان تێدا دروست دەکات.

## پەراوێزەکان: -

1 - بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی شێواز بڕوانە.

Enkvist, N. E, etal, 1965 Linguistics and Style, London, Oup, P. 12.

زۆر نووسەر (لەمانە ,Stendha) شێواز بەو بەرگە دادەنێن کە دەکرێتە بەر کارێك و جوانی پێ دەبەخشێ. مەترسی و کورتەی باوەری وا لەوە دایە کە تەنیا ئەو کارانەی بە جوان دادەنرێن بەخاوەن شێواز دەناسرێن. بە پێچەوانەشەوە، بە پێی ئەم بیرە، کار زۆرە کە شێوازیان نی‌یە.

2 - هەمان سەرچاوەی پێشوو ل 23 ـ 27.

بۆ نموونە، ئی، ڤیلانلەر لەو باوەڕەدایە کە شێواز بریتی‌یە لە شێوەی پێش کەش کردنی باسێك کە لە ئاسایی نەچێت و جۆری بابەتەکەو مەبەست و کەسێتی نووسەرەکە بچەسپێنێ. کێشەی ئەم جۆرە پێناسانەی شێواز لەوەدایە کە «ئاسایی» و «لادان» بە ئاسانی لەزماندا دیاری ناکرێن.

3ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل 15 ـ 21.

بەڕای پەسەندکەرانی ئەم جۆرە پێناسەیەی شێواز، شێواز بریتی دەبی لە هەلبـژاردنی ڕێگایەکی تایبەتی لە نێوان چەند ڕێگایەکی دەربڕین دا کە هەموویان بۆ گەیاندنی هەمان مەبەست بەکار دێن.

بەم پێیە، کێشەی شێواز دێتە کایەوە دەمانەوێ بڕیار بدەین لەبەر چی نووسەرێك لە نێوان چەند وشەیەکی هاوواتا یان نزیك لەیەکتری یەکێکیانی هەڵبژاردووەو ئەوانیتری بەکار نەهێناوە.

4 - بڕوانە.Wilkinson, A, The Foundation of Language, 1970, London, Oup, PP

17 - 23.

5 - بڕوانە:

Hiatt, M. P. «The Sexology of

Style» in Language and Style

VL. IX, No. 2, Spring 1976.

PP. 17 - 23

6 - بڕوانە:

Laloov, W., 1969, «The Logic of

Non - Standard English,» in Language and Social Context" Gi Gloli (ed),

London, Penguin, PP. 179 - 218.

7 - بڕوانە:

Simme de Beauvoir, The Second Sex, 1976, London, Penguin, PP. 93 - 139.

8 - هەمان سەرچاوە ل (139).

9 - بڕوانە:

Elgin's Review of Kramarae's «Women and Men Speaking» in Language V. 58.

No. 4, December 1982 PP. 940 - 943.

لێرەدا ئەم باوەڕەی ئێمە پێچەوانەی باوەڕی هەندێ زمانەوانە کە ئافرەت بە کۆمەڵێکی دەم کوت کراو دادەنێن و لایان وایە ئەو شێوازەی ئافرەت پێی دەدوێن شێوازێکە پڕە لەکەم وکورتی لەبەر ئەوەی لە داهێنانی پیاوەو ئەوان بۆ خۆیان دروست کردووە.

ئەم زمانەوانانە، دیسان باوەڕیان بە «نیسبیەت» هەیە لە کەلچەردا، بە واتای ئەوەی کە زمان تەواو دەکەوێتە ژێر کاری کەلچەرەوە. بەلای ئێمەوە ئەمانە بە نارەوا (باری ئافرەت وا بەم خراپی‌یە دەبینین و دروست نی‌یە بڵێین لەبەر ئەوەی ئافرەت «ژێر دەستەیە» بەچاوێکی ترەوە لە دنیا دەگەن و هەستیان بەرامبەر دەوروبە، جیاوازەو لەبەر ئەمە پێویستیان بە شێوازێکی نوێ‌یە کە لەگەڵ ئاواتیاندا بگونجێت.

10 - شایانی باسە کەزۆربەی ئەم نموونانەم لە ڕاپۆرتێکی قوتابی «پەروین یارەوە» وەرگرتوە، هەرچەندە دابەشکردنەکەو لێکدانەوەوە بەستنەوەیان بە باسەکەوە هی خۆمەو خۆم بەرامبەر هەڵەیان لێ‌پرساراو دەبم. پەروین یارە یەکێکە لە قوتابیانی پۆلی چواری بەشی زمانی کوردی زانکۆی سەلاحەدین (1984)و لەراپۆرتی باسکراودا سەرکەوتووانە پەنجەی بۆ تایبەتی فەرهەنگی ئافرەت ڕاکێشاوە.

11 - جورتە وشەی وەك «نان و مان»و «کاسەو ماسە» کە پارچەی دووەمیان لەسەر کێش و پێوانەی یەکەمیانە، زۆر بلاوە لە قسەی ئافرەتانی سلێمانیداو بۆ هەموو ناوێك، بە مەرجێك بە دەنگی م دەست پێ نەکات، دەست دەدات. (خەڵك و مەڵك)، ماڵ و ماڵ یان منداڵ و منداڵ). بڵاوی‌و زۆری بەکارهێنانی ئەم دیاردەیە لە ئاخاوتنی ئافرەتی سلیمانیدا لەو نوکتەیەدا ڕەنگی داوەتەوە کە تێیدا ئافرەتێك دەچێتە لای قازی وشکات لە مێردەکەی دەکات کە گوایا زۆری دەچەسێنێتەوەو ئەم لە ماڵەوە بەم ڕۆژگارە خەریکی ئیشە: «حاجەت و ماجەت دەشۆم، نان و مان ئەکەم، خواردن و مواردن ئامادە ئەکەم، چێشت و مێشت لێ ئەنێم... «ژنەکە دەڵی. قازیش بڕیار دەدات کە لەوەو دووا ئافرەتەکە» حاجەت بشواو ماجەت نەشوا، نان بکات و مان بۆ مێردەکەی دانێ،. خواردن بکات و واز لەمواردن بێنێ..

12 ـ بە باوەری م. کامەران ئەم گۆڕانەی ڵ پەیوەندی بە زارەکانی تری کوردییەوە هەیە، بە تایبەتی زاری موکریان. دیسان هەر ئەویش نی یە کە بەم جۆرە بۆ کێشەکە دەچێ.

13 ـ بۆیە بەم هۆکارانە دەوترێ نازمانی یان زمان ئاسا چونکە تەنیا لە هەندێ تایبەتێیدا لە زمان دەچن. بۆ نموونە، ئەم هۆکارانە وەك زمان لە خۆوەن و بڕیاری کۆمەڵیان پێویستە، بە واتای ئەوەی پەیوەندی نیە لە نێوان فۆرم و واتایاندا. هەر وەك نازانین بۆچی کورد «بە سەگ» دەڵی «سەگ» وعەرەب پێی دەڵی «کلب» هەروەها ناشزانین بۆ سەر لەقاندن بۆ سەرەوە بۆ رەت کردنەوە بێ وبۆ خوارەوە رەزامەندی پیشان بدات.

(بێ گومان لە هەندێ کەلچەردا ئەمەش بە پێچەوانەوەیە). دیسانەوە لە لایەکی تریشەوە ئەم هۆکارانە لە زمان ناچن چونکە زۆربەیان وەك مشەخۆر وان بەسەر ورگی زمانەوە دەژین، بە واتای ئەوەی تەنیا لەگەڵ زماندا گرنگی پەیدا دەکەن و لە کاتی قسە کردندا نەبێت هیچ واتایەك نابەخشن. شایانی باسە هەموو زمانەوانەکان لەسەر پیناسەی ئەم هۆکارانە رێك ناکەون. هەندیکیان (وەك کریستەڵ) تەنیا بە وانە دەڵی نازمانی کە لەگەڵ زماندا بەکاردێن بەلای هەندێکی ترەوە (وەك ئابەر کرۆمبی) زاراوەکە هەموو هۆکارێك دەگرێتەوە چاوپی بێت یان دەنگی لەگەڵ زماندا بڕوات یان بەتەنیا بەکاربێ. بۆ زانیاری‌تر دەربارەی ئیشارەو پەیوەندی بە کەلچەرەوە. بڕوانە:

1 . Hall, E, T. The Silent Language, Newyork Doubleday, 1959.

2 . Laver, John, «Language and Non - Verbl Communication» in Handbook of Perception, ed. Carterette and Freidman, Newyork, Academic Press, PP 345 - 58.

14 ـ لەم بارەیەوە نووسەرێکی بریتانی ئی، مەکۆرمیك دەڵی:

بلاوترین زمان لە جیهاندا ئەو زمانەیە کە نە ناوو نە فەرهەنگی هەیە. ئەگەر ئافرەت بێت، ئەوە هەر لە منالییەوە فێری بوێت، ئەگەر پیاو بێت، ئەوە هەرگیز فێری نابێت تەنانەت ئەگەر پەنجا ساڵیش پێوەی خەریك بێت. (ریدرز دایجیست مانگی 9، 1956 ل 43). بێ گومان نووسەر لێرەدا مەبەستی لە بەکارهێنانی ئاواز وبزاوتنی برۆو دەست و چاوو دەمە بەیەکەوە کە زۆر جار ئافرەت لەناو خۆیاندا پلاور وتانە وگلەیی و رەزامەندی پێ دەگۆرنەوە، بێ ئەوەی پیاو هەست بەوە بکات کە جەوی نێوانیان ناخۆشە. بۆ نموونە، کە ئافرەتێك بە هاورییەکانی دەڵێ: «نافەرموون بێنەوە ماڵەوە؟» لە برێتی «فەرموون وەرنە ماڵەوە» یان «ئەبێ بێنە ماڵەوە»، هاورێ ئافرەتەکەی چاك لە مەبەستی دەگات وسارد و سری بانگەکە هەست پێ دەکان نەك هەر لە وشەکات و جۆری رستەکەوە (پرسیار نەك داوا) بەڵکو بە هۆی تەماشاکردن و چاودێری کردنی بزاوتنی دەم و لێوو ئاوازی گوتنەکەشەوە. پیاو، بە پیچەوانەوە، زۆربەی کات لە نیازی ئافرەتەکە ناگات لە باری واداو گوتنەکە لەوانەیە بە بانگێکی گەرم و گوڕ لێك بداتەوە.

15 ـ بڕوانە ل 352 1976 , Laver, John

16 ـ دان نان بەبوونی دوو ئاستدا، ئاستی ژێرەوە ئاستی سەرەوە لە شیکردنەوەی وشەدا لەم سەردەمەی زمانەوانیدا شتێکی زۆر ئاسایی وبلاوە وبنەمایەکی گرنگی رێزمانی «تەحلویلیەکانە»و بوونی ئەم دوو ئاستە لە زۆر دیاردەی تریشدا هەستی پێ دەکرێ.

17 ـ ئاگەداری ئەوەین کە هەندێ ناو وەك (حەمە، خولە، قالە . . .) لەگەڵ هەندێ نازناو داتا دوا ساڵەکانی ژیانیش ئاسایی بۆ بانگ کردن بەکار دێ بۆ نموونە، زۆر ئاساییە لە تەمەنی 70 شدا بە یەکێك بوترێ: کاکە حەمە، مامە قالە، بابە خولە . . هتد (ئەم ناوانە زۆر ئاساین و لە سلیمانیا ئیستە بەکار دێن). ئەمە بێ گومان، نموونە نین کە دژی بیرەکەی ئیمە بوەستێ، چونکە لە راستیدا، بە باوەری ئیمە، ئەم ناوانە لەوە دەرچوون کە کورتە ناوبن، بەڵکە ناوە درێژەکەی بەرامبەریان لە بیرچوتەوەو خۆیان بوون بە ناوی بنەرەت. لە بەر ئەمەیە کە بە یەکێکی بەسالا چوو دەڵیین «خاڵە قالە» هەست ناکەین کە نزرتە ناومان بەکار هێنا بێت.

18 ـ بێ گومان بەکارهێنانی ئەم تەکنیکانە نیشانەی ئەوەیە کە ئافرەتی سلێمانی زیرەك و وریاو ژیرن و خاوەنی بیریکی مەنتیقین. بەمە لێکولینەوەکەمان پێچەوانەی ئەو بیرانە دەوەستی کە ئافرەت بە گشتی بە ساویلکەو ناشی و گێل دادەنێن (بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە، د. کردستان کوکریانی. دەنگی ئافرەتی کورد لە هۆنراوەکانیدا، بەیان ژمارە 63 حوزیرانی 1974 یان Sexology of Style کە لەسەروو ترەوە ناومان هێناوە). ئەم بیرەی لێکۆلینەوەکەمان (کە ئافرەت ژیرو هۆشیارن) لەگەڵ بیروڕای هەندێ لە خاوەن کارگەو کاربەدەستەکانی هەندێ لە کارگەکانی ناو سلیمانیدا رێکن ـ بە بیروڕای زۆربەیان (دیداری کەسی) ئافرەتی کریکاری سلیمانی نەك هەر ژیرو وریان بەڵکو لە زۆر کاریشدا لە پیاو سەرکەوتووترن، بەتایبەتی لە هەست کردن (Perception) ورەنگە ناسینەوەدا بە بیروڕای ئەمانە ئافرەت وێنەی نی یە.

# کێشە هەرزەکارەکانمان

ئەم هەڵسەنگاندنە لە لایەن مامۆستا ئیبراهیم ئەمین باڵدارەوە سەبارەت بە گرنگی بابەتەکە نووسراوە.

نووسینی: پزیشك سۆزان برۆنێە
وەرگێرانی: شاکر فتاح

ئەم باسە ،کە (دکتۆرە سۆزان برۆنێە) نووسیویتی‌و مامۆستا شاکر فتاح وەری‌گێراوە بۆ کوردی ڕەفتاری - بیرو ئەندیشەو هەست و کرداری سەرزاری‌و ژێرزاری - ئەو کێشە تازە پێ‌گەیشتوانە پیشان دەدات، کە گەیشتوونەتە هەرەتی هەرزەکاری.

باسەکە گەلێك پڕ بایەخ و بەنرخە، نووسەرە سەرەتایی‌یەکەی زۆر بەشارەزایی‌و وەستایی ،بەقووڵی‌و فراوانی چۆتە بنج و [illegible] بناونی هۆی ڕەفتارەکانی کچە هەرزەکارەکانەوە بە شێوەیەکی زانستی‌یانەی ساکاری روون و ڕەوانی دیاری‌کراو، پیشانمان دەدات، کە کچۆڵان لەو دەمەی تەمەنیانا بیردەکەنەوە، دڵیان بەچی‌یەوە خەریك دەبێت، شوێن کام خولیا دەکەون و ،چۆن هەمە چەشنە خۆزگەو، تاسەو تەزووی جۆرجۆر ڕایان دەژەنن و ڕایان دەپسکێنن و ئەیانخەنە گێژاوێکی پڕ لە هەمە ڕەنگە هەست و سۆزو قوڵپ و تاسەوە.. پڕ لە مووچڕك و ڕاچەنین و خوتوکەو تەزووەوە.. پڕ لە تاوتاوی ئاوای‌و، سەرسامی ،حەپەسان و بێ‌باکی‌یەوە.

نووسەری بەنرخی بەڕێزیش مامۆستا شاکر فتاح ،زۆر بە جوانی، خۆمانە، بە هونەرمەندی‌یەکی هەڵکەوتوانەوە، وەری‌گێراوەتە سەرکوردی ،بە چابوکی‌یانەو ڕەوان بێژی‌یەکی بێ‌هاوتایی‌یانە، بە ووشەی بەئاوی پڕ بەپێستی ئەو بیروباوەڕانە، ئەوەندەی‌تر ووتەکانی دکتۆرە سۆزانی بەهاداڕو دلگیرترو کاریگەرترکردووە.

ئێمەی کوردەواری ،لەم پلەیەدا پێویستیمان یەکجار زۆرە بەم جۆرە وێژەی پەروەردەیی‌یانە، کە ڕێی ژیانی ئەمڕومان بۆ روون بکەنەوە - ئەو ژیانەی ،کە زۆر بەگوڕو فراوانی لە گۆڕانێکی بێ‌ووچانی ڕۆژبەرۆژدایە.

نووسینەکەی دکتورە سۆزان هەرچەند بۆ ناوچەیەك و جۆرە شارستانی‌یەکی جیاواز لەهی ئێمە نووسراوە، بەڵام لەڕووی سروشت و مرۆڤایەتی‌و ژیانی کۆمەڵایەتی ئەمڕۆی ئێمەوە بەدوورنی‌یە. کچانی ئێمەش هەروەك هی ئەوان هەمان بیرو تاسەو قوڵپیان تیا دێتە جوولە، بەڵام ماکەکەیان ڕەنگە لە هەندێك ڕووەوە بەجۆریکی جیاوازتر دەرکەوێت.

بۆ بەرەنگار بوون و چارەسەرکردنی ئەو کارەسات و ،بەسەرهات و ڕووداوانەی بەهۆیانەوە بەرپادەبن..وە بۆ دەست پێش کەری کردن و خۆپاراستن لێیان، دەبێت بزانین چۆن بچینە بنج وبناوانی هۆیەکانیانەوە.. چونیش بتوانین، ئەو تەوژم و قوڵپ و گێژەلووکانە بۆ دامرکاندنیانە، بەلایەکی بێ‌مەترسیا دەربازیان بکەین، بێ‌ئەوەی بهێڵین کاریکی ناپەسند بکەنە سەر ئەندیشەو دڵ و دەروون و کرداری کچەکانمان.

ئیبراهیم ئەمین باڵدار

# پێشەکی

ئەم نووسـراوە نایـابـەی کە ئیـمـڕۆ پێشکـەشی (خـوێنـدەوارانی کوردی) بەڕێـزی دەکـەم ،لـەلایـەن خاوەن لێکـۆڵینـەوەی فەڕەنسـەیی‌یـەوە، (پـەزیشـك سۆزان بڕۆنێـە) بە زمـانی فەڕەنسـزی، لە ساڵـە پەنجایی‌یەکاندا، وەك ووتـارێـك لە (خـوێنـدنگـای دایـك و باوك)دا، کە لە (زانـکـۆی سۆربـۆن)ی شاری (پـاریس)لـە خاکـی (فـەڕەنسـە)دا دامـەزرابـوو، خوێنـدرابـووەوە. نووسـەری میسري یش کە ناوی (كليم أبوسيف)ە لە گۆڤاری (کتابی) لە (قـاهـرە)لـە میسـردا کە خاوەنـەکەی (حلمی‌مراد)ە، لە ژمـارە (44)و (45)ی ساڵـی 1955دا بە کورت کراوەیی پەرچڤەی کردبوو بە عەرەبی‌و بڵاوی کردبووەوە. جێی داخە کە نووسراوە فەڕەنسزي یەکەم دەست نەکەوت تا بزانم لە چ ساڵێکدا چاپ کراوە.

بەڵام چونکـە خاوەنی گۆڤـاری (کتـابی) پیشەی ئەوەبوو کورت کراوەی نووسـراوەکـانـی جیـهـانـی‌ی بە عەرەبـی بڵاودەکـردەوە، زۆرتـر بیـر بۆ ئەوە دەچـێ کە لە ساڵـە پەنجایی‌یەکاندا نووسراوەکە بە فەڕەنسزی بڵاوکرابێتەوە. لە ڕاستیدا ئەو (خوێندنگای دایك و باوك)ەی کە لە زانکۆی (سـۆربـۆن)دا دامەزرابوو گەلێك پسپۆڕانی تریش ووتارانی تری بەنـرخیـان تێـدابـوو، بۆ دایـك و باوکەکان ،یاخود بۆ ئەوانـەی خەریکن دەبن بە خاوەن خێـزان، خۆش بەختـانە منیش هەندێك لەو ووتارانەم هەر لەو گۆڤارەوە، بە زمانی عەرەبی دەست کەوت و کردمن بە کوردی. لەوانە سیانیانم لە گۆڤـاری (ئـۆتـۆنـۆمی)ی سەربە (ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی کوردستان)دا کە لە شاری (هەولێر)دا دەردەچێ بڵاوکردەوە.

پەروەردەکـردنی منـداڵ لەدەست هەموو دایك و باوکێك نایەت. چونکە شارەزایی‌یەکی زۆری دەوێ لە (زانست)و (هـونـەری پەروەردەکـردن)و (زرنـگە کاری)دا. هەروەهـا ڕەووشت و خوویـەکی دادپـەروەرانـەو، تیکـۆشـانێکی بێووچـانـی دڵسـۆزانـەی دەوێ، کە پڕ بێ لە پاکی‌و بڵندیی‌و، ئارام و، دۆستایەتی‌و، دڵتەڕی. لەبەرئەوە زۆر لە زانکۆکانی ئەورووپاو ئەمەریکا ،(خوێندنگا)یان کردۆتەوە بۆ دایـك و باوکـەکـان، تا تیێـدا فێـری زانست و هونـەری پەروەردەکردن ببن و لە شێوەیەکی پاك و ڕاست و دوروستدا بتـوانن منـداڵەکانیان پەروەدەبکەن. جا هەروەك لەمەوپێش پیشانم دا، یەکێك لەو زانکۆیانە (زانکۆی سۆربۆن)ە کە لە شاری (پـاریس)دایـە، لە خاکـی (فـەڕەنـسـە)دا خوێندنگایەکی لەم جۆرەی بۆ دایك و باوکەکان کردۆتەوە. پێویستە ئەوەیش بڵێم:

هەرچـەنـدە (کۆمەڵایەتی‌ی کوردەواری)و (کۆمەڵایەتی‌ی فەڕەنسەیی) زۆر لە یەکتر جیاوازن ،بەڵام ئەو گیروگرفتانەی (پـەزیشـك سۆزان بڕۆنێـە) لی‌یـان دەدوێ‌و چارەیـان بۆ دەدۆزێتـەوە، هەنـدێکیـان لە ناوچەی کوردستانیشدا باون، هەنـدێکی تریشیـان وا خەریکن سەر هەڵـدەدەن لەناوماندا بێجگەلەوەیش هۆش و دڵ و دەروونی کچۆڵە کانی ئێمەیش ،بـە چەشنی کچـۆڵـە فەڕەنسـەیی‌یەکان ،بە بیرو هەست و تاسەو تەزوو و جۆش و خرۆش لە تەمەنی هەرزەکاری‌یاندا دێنە جۆش. ئەوەندە هەیە لە شێوەیەکی تایبەتی‌ي خۆمانەدا دەریاندەبڕن ودەردەکەون و ماکەکەیان بەرچاومان دەکەوێت.

لە (17 ـ 30)ی مانگی میوەخۆش (تەمووز)ی 1968 بە دواوە (ئافرەتانی کورد) وەك هەموو خوشکەکانی تریان لە عیـراقـدا، بەپێی یاسـایەکی تایبەتی. (پارت)و (شۆڕش)، ئەو مافـانـەی کە پیـاوان هەیانبوو پی‌یان بەخشین لەبەرئەوە لەوسـاکـەوە تا ئێستـا، ڕۆژ بـەڕۆژ، باری ئافـرەتـانمـان لە گۆڕران و گەشـەکـردنـدایـە لەبەرئەوە پێویستە باوك و دایکە بەڕێزەکانمان هەر لە ئێستـاکـەوە خۆیـان ئـامـادەبـکـەن و بـکـەونـە جـم وجـۆڵ بـۆ ئـەمـەی بـە شێنەیی‌و بەزرنگانە چارەسەری هۆی ئەو کارەسات و، بەسـەرهـات و، ڕووداوانـەبکـەن کە دوورینـە بقـەومێن لە

کچـەکـانیـان، ئەگـەر هۆیـەکـانیـان نەدۆزنـەوەو دەست ـ پێشکەری نەکەن لە چارەسەرکردنیاندا پێویستە بزانن چۆن دەچنە بنج وبنـاوانی هۆیـەکـانی ئەو کارەسـاتـانـەوە. کە چاوەروان دەکرێ بقەومێن. هەروەها پێویستە ئەوەیش بزانن چۆن ئەو تەووژم و جۆش و خرۆش و گێژەڵووکانە، کە دێنە ناو هۆش و دڵ و دەروونـی کچـەکـانـیـانـەو، بـۆ دامـراکـانـدنـەوەیـان، بە لایەکی بێ‌مەترسیدا دەرباز بکەن ، بێ ئەوەی بهێڵن کارێکی ناپەسەند بکەنە سەر ئەندێشەو دڵ و دەروون و کرداری کچەکانیان.

ئیتـر ئەمـەنـدەو هیـوادارم دایك و باوکە بەڕێزەکانمان لە خوێنـدنـەوەی ئەم نووسـراوە ناوازە و نایـابـە، کەڵـك و فەر وەربگرن و، کەڵك و فەریش بە کچەکانیان ببەخشن.

**شاکر فتاح**
**«خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد»**

## ئاگاتان لە خۆتان بێ کچەکەتان گۆڕراوە

گەلێـك جار ئەم قسـەیـەمـان گوێ‌لێ‌دەبێ، کە باوك و دایکەکان بە کچەکانی خۆیان دەڵێن: «کەس لە توانایی‌یدا نیە لەم کچانە تێبگات، ئەمانە بە تەواوەتی گۆڕراون» کەچی کە گوێـمـان لە کچـەکـانیش دەبێ، بە نیـوە مل کەچی و نیـوە سەرکێشی‌یـەکـەوە سکـالا لە دەست باوك و دایکـەکـانی خۆیان دەکـەن، وەرامی ئەو بۆڵـەبۆڵـەیـان دەدەنـەوە دەڵێن: «بـاوك و دایکەکانمان تێمان ناگەن»..

ئێـمـەیش پێـی لێ دەنێـین کە پەی‌بـردن بەو گۆڕرانـە بنچینەیی‌یەی کە لە کچەکانماندا دیاری دەدات کارێکی ئاسان نیە. ئەو دەمە تەمەنیان لە ناوەند دوانزەساڵی و بیست ساڵیدایە. بەڵام دەمـانـەوێ ئەوە بپرسین: «ئـەی دایکەکان خۆیشیان لەم تەمـەنـەوە تێ‌نـەپەڕیون؟.. کەواتە بۆچ ناتوانن لەم تەمەنەدا لە کچـەکـەی خۆیـان تێ‌بگەن؟!» زۆری‌پێ‌ناچێ هەست بەوەیش دەکەین کە بیرەوەری کارێکی ئاسان نیە چونکە کارەساتی ژیان بیـرو هۆشی دایکـەکـانی گۆڕیوە.! ئەوەندە هەیە خۆش بەختانە پسـپـۆڕانـی وا پەیـدابـوون کە بە ساڵان تەمـەنـی خۆیـان بەخت کردووە لە لێکـۆڵینـەوەی گیـروگـرفتـەکـانی هەرزەکـاری‌و هەرزەکـارانـدا. لەبـەرئـەوە لە توانـایی‌یـانـدا هەیە کە بەرهەمی لێکۆڵینەوەو تێگەیشتنەکانی خۆیان پێشکەش بە باوك و دایکەکان بکەن..

..خـانمـەکەم!.. کچەکەت لە ساوایی دەرچووە..کەواتە ناتـوانیت لەسـەر بنچینـەی ئەو بیـرە هەڵـەیـەی خۆت لەگـەڵیدا بجـووڵێیتـەوە باش تەمـاشـای بکـە.. تەواو سەرنجی لێ‌بـدە.. دەم وچـاوی گۆڕراوە.. شێـوەیـشی هەر گۆڕراوە.. ئێـوەیش باوك و دایکەکان خۆتان بە هەڵەدا دەبەن، ئەگەر وا بزانن کە کچ پێگەیشت، پێگەیشتنەکەی هەر کار لە لەشی دەکات. لەڕاستیدا هەروەك کار لە لەشی دەکات، کار لە هۆشیشی دەکات، کار لە دڵ و دەروونیشی دەکـات بێجگـەلـەوە، کچەکە ،خۆی لە پێش هەمـوو کەسێکـدا چاوی بەو گۆڕرانـە دەکـەوێ. لەپێش هەموو کەسێکیشدا هەست بە بوونی‌دەکات.

باوکـەکـان!.. دایکـەکـان!. تەمـاشـایـەکی بکـەن. لێشی ووردببنەوە!. ئێوەیش واتان نایەتە پێش چاو کە حەز لە تەنیایی دەکـات؟. ئەی نابـیـنـن سەری کز کردووەو بیـر لە خۆی دەکاتەوە، ئاگای لەو هەست بزووتنەوانە هەیە کە تازە لە دڵیدا پەیدابوون. هەستیان پێ‌دەکات و ئاگای لێ‌یانە؟..

## خەوی هەرزەکاران

کچـەکـە هەتـا نەگـەیشتبـووە تەمـەنی هەرزەکـاری هەتـا پێ‌نـەگـەیشتبـوو ،بـابـەتی دڵ ـ خۆش کردنی خۆی هەبـوو. هەروەهـا بابـەتی دڵتـەنگە بوونی خۆیشی هەبوو. بەڵام زوو بە زوو ئەوانەی لەبیر دەچووەوە. ئەو کارەساتانە هەر وەك گیایەك وا بوون، کە لە لەوەڕگـەی منـداڵیـدا دەرهـاتبـوون. بەڵام کچەکە ئێستای لە دوێنێی ناکات. چونکە هەستی ئێستاکەی جیایە. لە

هەستی منداڵی ی ناکات.

سەریشی لێ شێواوە هەموو ڕەنگە هەست و تەزوو، تاسەیەك بە دڵیدا دێت. تەواو بۆی ڕوون نابێتەوە کە چین. هەندێکیشیان پێچەوانەی هەندێکی تریانن. جاری وا هەیە کچەکە لە پڕ دڵتەنگ دەبێت، بەڵام هەرچەند دەکات نازانێ بۆچ دڵتەنگ دەبێت جاری وایش هەیە دڵخۆش دەبێ کەچی هەرچەند دەکات هۆی دڵخۆشی یەکەی خۆی نازانێ!.. بەڵام ئەو لە هەر دوو بارەکەدا وەك یەك بە جۆش و خرۆشێکەوە دڵتەنگ دەبێ و بە جۆش و خرۆشێکیشەوە دڵخۆش دەبێ. هەر دوو بارەکەیشی پێ خۆش دێ. ئەگەر بتانتوانیایە تەماشایەکی پێچ وپەناکانی ژیانی دەروونی ی تازەی کچەتان بکردایە، ئەگەر تەماشایەکی لاپەڕەکانی ناو دڵیتان بکردایە کە تۆمارێکی تازەی لێ پەیدابووە، دەتانبینی چۆن هەست و تاسەو تەزوو پەیتا پەیتا بە دڵیدا دێت ،کە هەریەکەیان جۆێیە لەوانی تریان ڕۆژێکیان وای لێ دێ دەکەوێتە بیرکردنەوەو خەوبینینەوەو شت دەهێنێتە پێش چاوی خۆیەوە. لە ئاسمانی ئەندێشەدا گەشت و گوزار دەکات.

دڵی خۆشە بە بیرەوەری یەکانی خۆی ڕۆژێکیش وای لێ دێ، هۆشی لە لای خۆی نامێنێ ،بیرەکانی پەرش وبڵاو دەبنەوە، هیچیان ناچنەوە سەریەك خەم وپەژارەیش دڵی دادەگرێ!..

وا (جانین) بیری بەم لاو بەو لادا ڕۆیشتووە. ئاخۆ لەچ زرێیەکدا مەلە دەکات؟ ئاخۆ لە چ ئاسمانێکدا دەفرێ؟ ئەو جیهانی وا دێتەپێش چاو، کە پڕە لە ژیانێکی خۆش، پڕە لە بەزم وڕەزم ،بۆ هەرکوێیەك ئاوڕ دەداتەوە بە جوانی دێتە پێش چاو. ئەو خۆی وا دێتەپێش چاو کە لەگەڵ کوڕێکی جوان دایەو پێکەوە سواری بەلەمێك بوون، بە ناو ئاودا گەشت دەکەن. کوڕەکە هەر وەکو شەنگ و شۆخە ،ئازا و بێباکیشە، بە دەست و بازووە ،سڵ لە کەس ناکات..

هەردووکیان لە ناو تیشکی مانگەشەودا کە وەك زیو دەدرەوشێتەوەو پرشنگ بۆ لەشیان دەهاوێژێ دەستیان کردووە بە مەلەکردن. شەپۆلەکانی ڕووبارەکە خوتوکەی ئەو لۆتکەیە دەدات کە لە ناوی دان، هەر لە خوتوکەدانی دڵێك دەکات کە بە خۆشەویستی یەکەوە یاری لەگەڵ منداڵە ساواکەی خۆی دەکات!..

ئەمیش (دانیێل)ە، دەڕوات و نایشزانێت ڕوو دەکاتە کوێ دوا ڕۆژی خۆی لا تاریکە نازانێ چیی تێدا ڕوو دەدات. بەڵام بە لای خۆیەوە پڕە لەشتی سەیر سەیر!.. ئەم کچە خۆی وا دێتەپێش چاو کە لەناو ژوورێکدایە، کە بەردەکانی پەمەیی، یان بنەوشەیی ،یاخود ڕەنگی گوڵەباخیان هەیە. درەنگ لە خەو هەستاوەو ،لەناو جێگاکەی خۆیدا باوێشك دەداو خۆی دەکێشێتەوە.

لەشیشی خاوبۆتەوە، بە سستی یەکەوە دەجوولێتەوە. بەڵام بە هێواشی و لەسەرخۆ لە ناو پێخەفەکەی خۆی دێتە دەرەوەو دەچێتە بەر ئاوێنە، دەوەستێ!.. بەڵام چی دەبینێ لەناو ئاوێنەکەدا؟.

خۆی جوان و شەنگ و شۆخ دێتەپێش چاو خۆی وا دێتەبەرچاو کە وێنەکێشی هەرە گەورە ،پەرێکی چاوبەستکەرانەی گرتووە بە دەستەوەو لە لەش و ڕووی ئەودا وێنەیەکی بێ وێنە لە جوانی و شەنگ و شۆخیدا دێنێتە بەرهەم!.. ئاخۆ ئەم خەوو ئەندێشانە کە لە ناو ئەو دڵە بچکۆلەیەدا وەك گوڵ دەپشکوێن لەناو ئەو دەروونە نەوجوانەدا کە دەگەشێنەوە چ ڕازێك پیشان دەدەن؟!. ئەم نیشانانە، هەموویان، هەر یەك شت پیشان دەدەن ئەویش ئەوەیە کە گەورەکچ ئارەزووی ئەوە دەکات کە سەرنجی کەسانی تر ڕابکێشێ بۆ خۆی، کە کەسانی تر جوانی یەکەی پەسەندبکەن کە خۆی بچەسپێنێتە دڵی ئەم و ئەوەوە. واتا کەسانی تر لەم تافی کچێنی یە تازەیەدا دڵیان پێدابچێ، بە جوانی بزانن، خۆشیشیان بوێ!. ئەندیشە، یان شت هێنانەرچاویش ،هەر لەچاو ئەندازی سەر ئاو دەکات کە لە چۆڵ و بیاباندا دێتەبەرچاو هیچ ئەندازەیەکی بۆ نیە. هیچ شتێك بە گران نازانێ!.. کەواتە کچە هەرزەکارەکەم، هەر چیت بوێ، لە شت هێنانە بەرچاودا، بۆت دووروست دەبێ: بەلەمی زێڕت بوێ کە سەوڵەکانی لە زمرووت دووروست کرابن، یاخود کۆشك و باڵاخانانت بوێ، کە

بە کۆڵەکەی ئەڵماسەوە بەندکرابن: بنمیچەکانیان بە زوبەرجەد نەخش ونیگار کرابن: کە زەوی‌یەکانیان بە یاقووت داڕێژ رابن ئەمانە هەموویان لە جیهانی شت هێنانەبەرچاودا، بۆت دووروست دەکرێن ،بۆت دەچنەسەرا! . .

جا لەمەوەیە کە کچە هەرزەکارەکان زۆر دڵناسك دەبن، کە هەر تۆزە ناخۆشی‌یەکیان تووش هات، دوو ئەوەندەی جارانیان دڵیان دەشکێ‌و هەست بە خەم و خەفەت و سەرگەردانی دەکەن! . .

دیسانەوە هەر لەمەوەیە کە لە ناکاو، لەم بارەوە دەگوێزنەوە بۆ ئەو بار یان ئەوەندە خەمبار دەبن کە لە داخان خۆیان بکوژن. یاخود ئەوەندەیش دڵ ـ خۆش دەبن کە لە خۆشیاندا گەشکەدار بین یان ئەوەندە دڵ پڕ لە هیوا دەبن کە هەموو جیهانیان بە جوانی بێتەپێش چاو، یاخود ئەوەندەیش بێزار دەبن کە جیهانیان لێ بێتەوەیەك! . .

## کچی ئەمڕۆو کچی دوێنێ! . .

گەورەکچی هەرزەکار، لە توندوتیژی‌ی دڵ وورووژانیدا ،لە هەڵقوڵینی هەستەکانیدا، لە گرتێبەربوونی گیاندا، لەگەڵ کوری هەرزەکاردا، یەجگار جیاوازە لەبەرئەوە گەورەکچ لەم تافەیدا، کە تەماشای کوری هەرزەکار دەکات ،سووکی دێتە پێش چاو ئەوە ناهێنێ کەس خۆی تێبگەیێنێ ،کەس گوێی بداتی کێ چوزانێ چی دەکات؟! . دوورنیە کچەکمان ،وەك زۆر جار روودەدات، لە ناوەند تەمەنی چواردەسالان و هەژدەسالاندا، یادنامەکانی بنووسێتەوە.

تا چەند مانگێك لەسەریەك، بە تەواوەتی خۆی بەو نووسینەوە خەریك بکات.

لەناو ئەو یادنامەیەیشدا بیرەوەری‌ی ناسك و نازدار تۆمار بکات. وەك دۆستایەتی‌یەکی گەرم وگورو، دۆزینەوەیەکی بەهادارو، دەرکەوتنی سەرەتای دڵداری! . . بەڵام کەس ئەوە نەکات ئەو یادگارانە بخوێنێتەوە. ئەو هەر بۆ خۆی نووسیوەتەوە.

نایەوێ کەسی‌تر بیخوێنێتەوە. ئەو بۆ ئەوەی نەنووسیوەتەوە کە سەرچڵەکان شارەزاری ببن. بۆ ئەوەی نووسیوەتەوە کە پێچ وپەنای ناو دەروونی خۆی ڕۆشن بکاتەوە. تا بتوانێ لە دڵ داخورپان و دڵ وورووژانەکانی خۆی تێ‌بگات. تا بتوانێ لە رازی هەست و تاسەو تەزووەکانی دڵ و دەروون و لەشی خۆی تێ‌بگات! . . پاش ئەوە، ئەو تەنگە و چەڵەمەیە تێدەپەڕێ .ئەو گێژەڵووکە بچکۆلەیە دادەمرکێتەوە. ئەو پشکۆی ئاگرە دەکوژێتەوە.

جا نابێ ئێمە لەوە سەرمان سوڕبمێنێ، کە پاش ماوەیەك ،کچەکە ئەو یادنامانەی لەبیربچێتەوە. چونکە هەر بۆ ئەوەی دەنووسێتەوە کە گڕی دەروونی خۆی پێ‌بکوژێنێتەوە، هەست و ئارەزووی دڵی خۆی پێ دەربڕێ، تا گیانی بسرەوێ‌و ئارام بە دڵی بگات. دیسانەوە نابێ لەوەیش سەرمان سوڕبمێنێ، کە کچەکە ببینین یادنامەکەی خۆی پارچە پارچە بکات. چونکە شتی وای تێدا نابینێ کە هەڵبگرێ بیهێڵێتەوەو پارێزگاری‌ی بکات! . .

بەڵام کچە هەرزەکارەکمان، ئەوەندەی پێ ناچێ ،گوێ هەڵدەخات بۆ ئاوازی دڵداری! . . ئەمەیش لەو کاتەدا ڕوودەدات باوك ك دایکە بەرێزەکان !کە ئێوە بە کچێکی ساوای تێ‌دەگەن و بەو پێ‌یە لەگەڵیدا دەجوولێنەوە کە کچەکە هەستێکی تازە لە دڵ و دەروونیدا وورژاوەو، هەموو لەشی هێناوەتە لەرزین وەك هەست کردنی بە دۆستایەتی‌یەك بەرامبەر سەرۆکە ئافرەتەکەی خۆی یاخود بەرامبەر یەکێك لە مامۆستاکانی خۆی. لە ناکاو گرفتاری خۆشەویستی‌ی یەکێك دەبێ کە بە تەمەن لە خۆی گەورەترە. ئەو دەکات بە نموونەیەکی بێ‌هاوتای خۆی، کە گەردێك کەم و کووڕی‌ی پێوە نیە. ئیتر هەر لە بیرکردنەوەی خۆیدا دەمێنێتەوە بەرامبەر ئەو کەسە، کە جار بە جارێك بەربەرەکانێ‌ی تێکەڵاو دەبێ‌و، جاربەجارێکیش هەناسەساردی! . .

جا ئەم گڕی دڵداری‌یە، ئەم چرای خۆشەویستی‌یە، بە لای کچەکانی ئەم سەردەمەوە بە بابەتێکی کۆن دادەنرێ، ئەو

کچانەی کە سەربەست و بێباکن و کۆ لە کەس ناکەنەوە، کە وەرزشکارن خۆیان بە نیمچە رووتی دەردەخەن و قژەکانی سەریان بەرەڵلادەکەن بۆ کزەبا، تا پەخشان و پەرێشانی بکات! . ئەم کچانە لەگەڵ ئەو کچانەدا زۆر جیاوازییان هەیە، کە کەمەرەو هەیاسەیان دەبەست و کراسی ئاودامانیان دەپۆشی، کە تا کەڵەموستی پێی دادەپۆشین! . . لەگەڵ ئەوەیشدا کچە سەربەستەکەی ئیمڕۆ هێشتا لەوەدا ماوە کە لە دۆستایەتیی سەربەخۆ تێبگات و چەشەی بکات و خۆشیشی لێوەربگرێ. جیاوازییش لە ناوەند کچی ئیمڕۆ و کچی دوێنێدا لەم ڕووەوە ئەوەیە، کە هەست کردنی زوو بە دڵداری بە لای کچی دوێنێوە (تاقی کردنەوەیەکی ناچاری) بوو بەڵام بە لای کچی ئیمڕۆوە، بە «پەروەردە کردنێکی تاسەو هەست» دادەنرێ! . .

## خۆرشتی تاسەو هەست ئاو دەزێنێتە ناو دەمی مرۆڤەوە! . .

برسێتیی هەست و تاسەی کچی هەرزەکار ، گرێکی بەتینی لێدەبێتەوە! . . چونکە لەو دەمەدا ، کچەکە هیچ کۆ ناکاتەوە لەوەی کە هەر خۆرشتێکی دەست بکەوێ قووتی بدات، بۆ ئەوەی برسێتیی هەست و تاسەکانی خۆی پێبشکێنێ! . .

جاری وا هەیە دەچێتەسەر خوانێك کە هەر کەسێ لەگەڵیدا دانیشتووە، چیرۆکی دڵداریو جەربەزەیی دەگێڕێتەوە! . . جار وایش هەیە دەچێتە سینەما سەری ئەو فیلمانە دەکات کە سەرگوروشتەی شۆڕەسواران و سوارچاکی دەگێڕنەوە! .

ئەمانەو بۆ لای گەلێك خۆرشتی هەست و تاسەو تەزووی تریش خۆی دەکوتێ کە هەتا لێیان بخوات زۆرتر ئارەزووی دەبزوێ بۆ خواردن. برسێتییەکەی توندترو تیژتری لێدێ. ئەگەر ئێوە لاپەڕەکانی هەندێ لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەتان کردەوە کە لە بابەت کاروباری ئافرەتانەوە دەدوێن ئەوەتان بۆ دەردەکەوێ، کە ئەو بابەتانەی سەرنجی کچ ڕادەکێشن لەم تەمەنەیدا، زۆرتر ئەوانەن کە دەربارەی کەینەوبەینەی جەربەزەییی دڵداری نووسراونەتەوە. کچەکە کاتێ ئەم پرسانەی بەرچاو دەکەوێ لێیان ووردەبێتەوە : «ئایا ئەوە دەشێ کچێك حەز لە پیاوێکی خاوەن ژن بکات؟ . . ئەو، لەوساکەوە کە بۆ دوامین جار چاومان بە یەکتر کەوت، هیچ نامەیەکی بۆ نەناردووم. ئاخۆ باشە کە من دەست بە نامەکاری بکەم لەگەڵیدا؟ . . من حەز لە پیاوێك دەکەم کە زۆر لە خۆم، بە تەمەن، گەورەتربێ. کەچی باوك و دایکم ناهێڵن لەم ڕۆ بە دواوە تێکەڵیی لەگەڵدا بکەم ئەو هەناسە ساردو خەفەتبارە. منیش هەروەك ئەو ڕەنجەڕۆو دڵ پڕ لە خەمم نازانم چیبکەم؟! . .

کچەهەرزەکارەکە دەکەوێتە جم و جۆڵ و دەست دەکات بە گەڕان بە دوای ئەو دەستوورانەدا کە بۆ زمانی هەست و تاسە دانراون ،تا لەسەریان بڕوات بە ڕێوە. دەگەڕێ بۆ دۆزینەوەی هونەری دڵداری تا لە ژیانی دڵداریی خۆیدا سەربکەوێ . . . ئەویش وەك ئافرەتێك! . جا لەو تەمەنەدا لە نووسینەکانی ناو ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەدا وێنەیەکی زیندووی ئەندێشەکانی خۆی دەدۆزێتەوە کچەکە چیرۆکی ئەو کوڕە جەربەزەیە دەخوێنێتەوە کە ئەوەندە ئازاو بێباك بوو توانی دڵی ئافرەتێك داگیربکات بۆ خۆی نە لە دەروونیخۆی شەرمیکرد، نە لە ڕووشت و کرداری خۆی! . . ڕۆژنامەکەیش چیرۆکی دڵدارێکی بێپەروای وای دەخاتە بەرچاو کە ئەمەندە گڕی دڵداریی تینی سەندووە هەر دەسووڕێتەوە بە چوار لای خانووی یارە نازدارەکەیدا شەویش تا بەیانی لەبن پەنجەرەی ژووری نوستنەکەی ئەودا دەمێنێتەوە، خەو ناچێتە چاوی . . . پاش ئەوە چیرۆکی ژیانی ئەو کچە دەخوێنێتەوە کە کوڕێکی خستبووە داوی دڵداریی خۆیەوە تا وای لێکردبوو لەتاو دڵدارییەکەی بەوەوە خەریك بووە شێت بێ و بداتە کێو کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا لەپڕ کوڕەکە بەرەڵلادەکات و خۆی ڕێك دەخات لەگەڵ کوڕێکی تردا ئەو بەسەزمانەیش لەناو گێژاوی خەم وخەفەتدا دەهێڵێتەوە بە دەردی دڵدارییە سەرنەگرتووەکەیەوە بتلێتەوە! . .

هەروەها کچە هەرزە کارەکە ئەو چیرۆکانەیش دەخوێنێتەوە کە

تا چ رادەیەك خۆپەرستی و ئاڵۆش و خرۆش کاری خراپ و ناپەسەند دەکەنە کردەوەو کاری ژ ن و پیاو! . . لێ‌دووانەکان جوێ جوێ دەبن لە یەکتری ،وێنەکانیش لە یەکتری ناکەن. بەڵام ئەنجامی هەموو چیرۆکەکان هەر لە یەك شت دەکەن. چیرۆکەکانیش هەر وەك یەك دوایی‌یان دێت: یان ئەوەتا خۆشەویستی کوڕوکچەکە بۆ یەکتری بە هێزو هەرەتەوە دێتەکایەوەو، هەموو کەندو کۆسپێکیش لە ڕێگای خۆیدا رادەدات و، بەسەر هەموو گیروگرفتێکدا زاڵ دەبێ . . یاخود ئەوەتا خۆشەویستی‌یەکەیان بە هێزو هەرەتەوە دێتەکایەوە. بەڵام هەر دوو لا وەك یەك ئەو خۆشەویستی‌یە ڕاناگرن. دوایی دۆستە بەرەڵڵاکراوە هەناسە ساردەکە کێش دەکات بۆ لەناوچوون! . . چاوتان لێ‌یە، دەبێ ئەو کچە چەند بەسەزمان بێ، کە باوەڕ بەو هەموو قسە پڕوپووچانە بکات؟ . جا ئێستا تێگەیشتن کە هۆی فرۆشتنی ئەو هەموو ڕۆژنامانە چی‌یە؟ . کە هۆی برەوی ئەو هەموو چیرۆکانە چی‌یە کە بووەتە کەرەستەیەکی بنچینەیی بۆ خوێندنەوە لای ئەو کچەهەرزەکارانە ،بە هەموو چین و دەستەیەکیانەوە، هەر لە کرێکارە ئافرەتەکانەوە تا دەگاتە کچەلادێ‌یەکان، تا کچەشاگردەکانی خوێندنگاکان؟! .

## وازهێنان لە دڵداری وازهێنان لە پیاوان!

کچ لەو تەمەنەدا، دڵداریی بە چاو بەستێك دێتەپێش چاو ،کە داردەستەکەی خۆی وەشاند ،لە هەر شتێك کەوت، دەم ودەست دەیکوژێ . هەر گیرو ـ گرفتێکی هاتەبەر، هەرچەندێ گەورەبێ، ئەوەندەی شاخێکی بەرز وپان، کە ئەو داردەستەی لێ‌درا، دەم ودەست دەرووخێ و، هەپروون بەهەپروون دەبێ! . هەموو دەمێکیش هەر ئەوە لە کچەکەمان ڕوودەدات، کە ئەو خۆشەویستیی و دڵدارییەی لە جیهانی ڕاستەقینەدا تووشی دێ، لەگەڵ ئەو خۆشەویستیی‌یە بێ‌هاوتایەدا، کە لە خەوو ئاواتەکانیدا دەهاتنە پێش چاوی، یەك ناگرێ ! . . ئەم [ئیفۆن]ە، کە لە یەکێك لە کارخانە گەورەکاندا فرمان دەکات. گوێی لە دەستە خۆشکەکانێتی کە بە تەمەن لە خۆی گەورەترن، لەبابەت دڵداری‌یەوە زۆر دەدوێن. . ڕۆژی وا هەیە گوێی لە پێداهەڵدانی دڵداری‌یە. ڕۆژی وایش هەیە گوێی لە داشۆریی دڵداری‌یە کەوا لەمرۆڤ دەکات بێزی لێ‌بکاتەوە. . ئیتر ئەویش وای لێ‌دێ، دەکەوێتە سەرلێ‌شێوانەوە. هەستیش وا بە خۆی دەکات کە کەوتۆتە ناوەند دوو هۆی بەهێزەوە : هۆیەکیان دڵداری وا پیشان دەدات کە شتێکی نەنگە و ناشیرینە، مرۆڤ حەزی لێ‌ناکات. هۆیەکیشیان دڵداری وا پیشان دەدات کە بابەتێکی بێ‌هاوتایەو لە هی ڕاستەقینەو ڕووداویش یەکجار جیاوازە! . .

● ئەمیش [جینیت]ە وا دەزانێ کە چارە نووسی خۆی بڕیوەتەوەو، کاری خۆی تەواوکردووە، نیازی وایە دەست بکات بە ژیان دەیەوێ بچێتە ژیانەوەو تێروپڕ خۆشی لە ژیان ببینێ لەدوای ئەوە چی دەبێ بام بێ! . ئەوەی کە هانەیشی دەداتە سەر کردنی ئەو شتانەی بڕیاری لەسەر داون بیانکات ،ئەو قسانەیە کە لە ڕادیۆوە گوێ‌ی‌لێ‌دەبێ، کە لە کچێکی هەرزەکاری وەك خۆی ناوەشێتەوە، گوێ لەو قسانە بگرێ! . . هەروەها ئەو نووسینانە هانەی دەداتە سەر کردنیان کە لە نووسراواندا دەیانخوێنێتەوە کە ئافرەتێك لەو تەمەنەی ئەودایێ، نابێ بیانخوێنێتەوە. لەدوای ئەوە، بێ‌باکانە دەست دەکات بە جەربەزەیی ،دڵی دانالەرزێ ،سڵیش لە کەس ناکات! . . جا ئەو کچە هەرزەکارە لەم تافە سامناکەی ژیانەیدا، خۆی وا دێتەپێش چاو ،کە دەسەڵاتی هەیەو دەتوانێ هەموو شتێك بکات، هەموو کارێکیش بباتەسەر! . .

بەڵام (سیمون) تەواو بە پێچەوانەی (جینیت) دەجووڵێتەوە. چونکە بڕیاری داوە کە ئیتر خۆی لە کەینەوبەینەی دڵداری نەگەیێنێ تادەیشمێنێ، هەرگیز بە لایدا نەچێ! . چونکە! . چونکە ئەو خۆشەویستی‌یەی دێتەپێش چاوی لە دڵداریدا دەستی‌بکەوێت لە جیهانی ڕاستەقینەدا سەروشوێنی نیە! . . ئەو دەیەوێ دڵی خۆی بداتە دەست پیاوێکی بێ‌هاوتا پیاوێکی یەکجار پەسەند، کە هەرگیز وێنەی لە ناو پیاواندا نەدۆزرێتەوە! .

جا که ئەم جۆرە دڵداري یە بیٚهاوتایە دەست نەکەویٚت، ئیتر خۆشەویستیی بۆچ دابمەرزیٚنیٚ لە دڵی خۆیدا؟. . کەواتە نە خۆشەویستیو نەدیداری پیاوان!.

تا بمیٚنیٚ لە ژیاندا، خۆی لەو داوانە ناگەیٚنیٚ!. . جا ئەو جیاوازی وپیٚچەوانەیی یەی کەوتوونەتە ناوەند ئەندیٚشەو راستیی یەوە، کە دڵ و دەروونی کچەکانمان پیٚیانەوە خەریك دەمیٚننەوە لە تەمەنی هەرزەکاریدا، زۆر جاری وا هەیە ئەنجامی خراپ خراپیان لیٚ پەیدادەبیٚ. چونکە لەنگەری ژیانیان لیٚ تیٚك دەدەن دەیشیان خەنە پشیٚوی‌و گلاراوی‌یەکی یەکجار سەختەوە!. . کەواتە کچ لەو تەمەنەدا، دەمیٚنیٚ لەسەر رابەریٚك کە ئامۆژگاریی بکات و، ریٚگایشی پیشان بدات، کە لە تاریکیی ئەو هەست و تاسەو تەزوو، و، ئەندیشە ـ شیٚواوو جۆیٚجۆیٚیانەوە دەری‌بهیٚنیٚتەدەرەوەو، لەو

تافی ژیانەیدا رزگاری بکات، کە ژیانی هەست و تاسەو تەزووی، خەریك دەبیٚ لەم بەری دەستەراستەوە بۆ ئەو بەری دەستەچەپ بگویٚزریٚتەوە!. .

## تیز بە کچە هەرزەکارەکانتان مەکەن!

بام ئیٚستا ئەوە بپرسین: ئاخۆ باوك و دایکەکان، لەم تافی تەمەنەی کچەکانیاندا چی‌یان بۆ بکەن؟. .

دەتوانن زۆر بە کەڵکیان بیٚن، بە مەرجیٚ: لە شیٚوەیەکی راست و دوروست و بیٚوەیدا ئامۆژگاری‌یەکانی خۆیان پیٚشکەش بکەن. ئەگەر بیٚتو باوك و دایکەکان بە تەواوەتی لەو پشیٚویی دەروونی‌یەی کچەکانیان ئاگادار بن و، بە شیٚنەیی‌و لەسەرخۆ ،لە شیٚوەیەکی دووربینانەدا، چارەی ئەو پشیٚوی‌یەی بکەن.

دەتوانن بە کامی خۆیان بگەن و، کچەکانیشیان لەدەست بیٚ وەی‌و ئازاری ئەو تەنگە و چەڵەمەسامناکە رزگاربکەن!. .

بەڵام ئەگەر هاتو باوك و دایکەکان لەجیاتی‌ی ئەوە ،وەك زۆر جار روودەدات تیزیان کرد بە کچەکانیان و، توانج و پلاریان تیٚگرتن، قسەی پیٚناویٚ ،سەرئەنجامی کچەکانیان دەبیٚتە سەرگەردانی!. .

بام بۆ ئەوە ویٚنەیەك بهیٚنینەوە: ئەمە کچیٚکە کەوتۆتە گیٚژاوی ئەو تەنگە و چەڵەمەی دەروونی‌یەوە. باوك و دایکەکەیشی هەستیان بەوە کردووە. بەم رەنگە قسەی بۆ دەکەن: «واز لەم بیرە پروپووچانە بهیٚنەو، خوو بدەرە خویٚندنەکانت. . چونکە گەلیٚك کاروباری‌تر هەن، کە دەبیٚ کچیٚکی هاوتەمەنی تۆ خۆیانی پیٚوە خەریك بکەن بەڵام ئەو کەینەوبەینەیەی کە پیٚی دەڵیٚن:

(دڵداری)، لەناو ئەو کاروبارانەدا نیە!».

پاش ئەوە زۆری پیٚناچیٚ ،دایکیشی پیٚی دەڵیٚ:

«کچی خۆم! رۆژیٚك دیٚ ئەم ئەندیٚشەو بیرە پرپووچانەت نامیٚنن. کاتیٚ کە گەورە بوویت و شووت کرد، هەرئەوەندە هەفتەیەکت لەگەڵ میٚردەکەتدا رابووارد، تیٚدەگەیت کە پیاو ئەوە ناهیٚنیٚ ئەمەندە بیری‌لیٚ‌بکەیتەوە، یاخود ئەوەندە بیهیٚنیتە پیٚش چاوی خۆت و ، ئەم ئاوات ونیازە پرپووچانەیش بخەیتە دڵ و میٚشکی خۆتەوە، لەبابەت پیاوانەوە!».

باشە، ئەنجام بە چی دەگات؟. . ئەنجامی تەواوی ئەم کردەوە ناشیی‌یانە بەوە دەگات کە کچەکە خۆی کز بکات و هەموو کاتیٚکی خۆی بە بیرکردنەوە لە خۆی‌و دوارۆژی خۆی بەخت بکات. ئنجا زمانی خۆی بگریٚ‌و، رازی دڵی خۆی بە باوکی‌و دایکی خۆی نەڵیٚ ئەوانیش هەرچەند بکەن نەتوانن لە هەست و تاسەو ئارەزووی ئەو تیٚبگەن. ئەمەیش دیاربوو کە وای لیٚدەهات چونکە کچەکە لە سەرەتای ژیانیدا بوو دڵی پربوو: لە ئاواتی خۆش خۆش میٚشکی پربوو: لە ئەندیٚشەو بیرکردنەوەو لە ژیانیٚکی رازاوەو ناوازەی بیٚهاوتا پر بەدڵ خۆشی‌ی لەو ئاوات و بیرکردنەوانە دەبینیی کە باوك و دایکی دایان لە کەللەی‌و دڵیان شکاند، ژیانی لیٚ تاڵ بوو. بۆیەکا ئەویش کەوتە خەم وپەژارەوە.

هەر بیری لە خۆی دەکردەوەو، هیچ رازیٚکی دڵی خۆیشی لای باوك و دایکی ئاشکرانەدەکرد. بەڵام دایکی تیٚگەیشتوو، بە

جۆرێکی وا گفتوگۆ لەگەڵ کچەکەی خۆیدا دەکات کە کچەکە تێ‌بگەیەنێ‌و دڵی دابمرکێنێتەوە بۆ وێنە وای پێ‌دەڵێ: «نەء! کچە بچکۆلەکەی خۆم.. وانیە.. چونکە کارە بێ‌هاوتاکانی دڵداری، هەر لە خۆیانەوە پێك نایەن و نایەنەدی.. چونکە ئەو دڵداری‌یەی بە مێشکدا دێت ئەوەندە گەورەیە، ئەویش مەرجی خۆی هەیە، کەبەبێ ئەو مەرجانە پەیدانابێ. یەکێك لەو مەرجانە ئەوەیە، کە ئەو خۆشەویستی‌یە دەبێ لە دڵی هەردوولادا هەڵبقوڵێ. دەبێ هەردوولا یەکتری‌یان بەجگار خۆش بوێ. ئەگینا ناتوانن زاڵ بین بەسەر ئەو شەرو ئاژاوانەدا کە لە ناوەند هەموو ژن و پیاوێکدا دەقەومێن!. جا ئەگەر بتەوێ پایەی ئەو ئارەزووەی لە دڵتدایە بەرز بکەیتەوە، پێویستە خۆشەویستی‌یەکی بەجگار گەورەی تێکەڵ بکەیت!..».

## باری هەرە گران بەسەر دایکەوەیە

کچی هەرزەکار بە دڵ ئارەزووی ئەوە دەکات، کە هەموو شتێك بخوێنێتەوە. کە لە هەموو شتێك ئاگاداربێت. ئەو قسەیە دانامرکێ کە شتی وا هەیە نابێ ئەو بیخوێنێتەوە، یاخود ئەو تێی‌بگات. چونکە ئەو شتانە ئارەزوو دەبزوێنن ئەو دەزانێ هەرچی لە خۆی گەورەتر بێ راستی‌ی ژیانی لێ دەشارێتەوە. کەچی خۆیشی بڕوای وایە، کە لەو تەمەنەدایە مافی زانینی هەموو شتێکی هەبێ!..

جا لەبەرئەوە، ئەوەی پێ‌خۆش نیەو ماوەیش بەوە نادات کە وەك کچێکی کزی بێ‌دەسەلاتی داماو لەسەر پاراستن تەماشای بکرێ‌و لەگەڵیدا بجوولێنەوە!..

جا لەم بارەدا فرمانی سەر شانی ئێمە هەر ئەوەیە کە بە شێنەیی هۆی ئەوەی تێ ـ بگەیێنین کە بۆچی هەندێ کەس، تەنانەت گەورەکانیش ،خۆیان دەپارێزن لە خوێندنەوەی هەندێ نووسراو، یاخود لە بینینی هەندێ چیرۆکی ناو سینەما..

ئەوانەی خۆیان لەو خوێندنەوەو تەماشاکردنە دەپارێزن لەبەرئەوە نیە کە کەم وکووری‌یان هەیەو ،خۆیان بە کزو بێ‌دەسەلات و داماو دەزانن بەلام لەبەرئەوە ئارەزوودەکەن خۆیانیان لێ دووربخەنەوە کە بیرو هۆشیان لە کەڵك نەکەون و تێك نەچن. کە دەروونیان بە پاکی بمێنێتەوە ویپس نەبێ کە لەنگەری گیانیان وەك خۆی بمێنێتەوەو تێك نەچێ. کە لە رێزگرتنی خۆیشیان بەرامبەر خۆیان کەم نەبێتەوە!.

جا بە هۆی شی‌کردنەوەیەکی واوە، بە هۆی هۆ دەرخستنێکی واوە، دەتوانین کچەکە وا لێ‌بکەین کە لە خوێندنەوەی نووسراوە کاڵ وکرچەکان ،لە تەماشاکردنی فیلمە خراپەکان کە لەگەڵ دڵتەری‌و کردەوەی شیریندا رێك ناکەون، دوور بکەوێتەوە. لێرەدا دەمانەوێ بپرسین: «ئاخۆ ئەو ئافرەتانەی کە سەرپەرشتی‌ی پەروەردەکردنی کچان دەکەن، پێیان دەکرێ رێگە بۆ ئەو کچانە رۆشن بکەنەوە لەم تافەیاندا؟..». ئەوانەی سەرپەرشتی‌ی پەروەردە کردنی کچان دەکەن، هەر دایکەکانیانن بێ‌گومان ئەوانە لەم رووەوە زۆر شتیان پێ‌دەکرێ. جا ئەگەر دایکەکە تێکۆشا کچەکەی خۆی بخاتە سەر ئەوەی کە جم وجۆڵە کەی خۆی لەوەدا بەخت بکات کە نووسراوانی وێژەی تازە بخوێنێتەوە ئەو لێکۆڵینەوانە بخوێنێتەوە ،کە لە بارەی هەستە گەورەکانی مرۆڤایەتی‌یەوە نووسراونەتەوە. کە ئەو دۆستایەتی‌یانە بگرێت کە گیانین و پاك و بێ‌گەردن و دوورن لە خۆپەرستی یەوە. کە ئەو دڵداری‌یە بکات، کە پڕی بێ لە سەربەرزی‌و داوێن پاکی‌و کردەوەی پەسەند.. ئەگەر دایکەکە توانی کچەکەی خۆی بخاتەسەر ئەم شتانە بێ‌گومان ئەرکەکەی بە خۆرایی ناڕوات، چاکترین بەرهەمی لێ پەیدادەبێ.. ئەمەیش لەبەرئەوەیە، کە کچ ئەوەی پێ‌خۆشە دایکی دڵنەرمی لەگەڵدابکات، باوکی چاودێری‌ی بکات، هەروەها ئەوەیشی پێ‌خۆشە کە، گوێی لە ئامۆژگاریی دایك و باوکی وا نەرم ونیان و خۆشەویستی‌بێ. حەزدەکات خۆیشی بخاتە ناو باوەشیانەوە!..

ئەوەی لێرەدا بە گرنگی بزانین ئەوەیە ،کە باوك و دایکەکان راستی‌ی هەست و تاسەو ئارەزووەکانی سوروشتی مرۆڤایەتی ،بۆ کچەکانیان رۆشن بکەنەوە.

واتاکانی ئەو بابەتانەیشیان بە تەواوەتی تێ‌بگەیێنن کە

هەست و تاسەو تەزوو چۆن پەیدادەبن؟. . چۆن بە هێزیش دەبن؟. .

کۆمەڵەکانی ئافرەت لە جیهاندا لەم هەموو گیروگرفتانەیان کۆڵیوەتەوە.

نووسراوانیشیان دەربارەیان بلاوکردۆتەوە ئێمەش ئەگەر ڕێگامان بۆ کچەکانمان تەخت کرد، کە ئەو نووسراوانە بخوێننەوە، بێ گومان لەدەست ئەو ئەندێشەو بیرە پروپووچانە ڕزگاریان دەکەین، کە مێشکیان داگیر کردوون و ڕاستی ی ژیانی مرۆڤایەتی یان لێ گۆڕیون!. .

## پەیدابوونی بیری سەربەخۆیی لای کچ!. .

ئەمە شتێکی ئاشکرایە کە ئەوە ئاسان نیە بۆ ئێمە، کچەکە بگەیێنینە پایەیەکی دڵداریی وا بێهاوتا کە ژیان و زیندوێتی و جموجۆڵی خۆی بە ناو هەموو توانایی یەکی مرۆڤەواریی خۆیدا تەواو بلاوبکاتەوە بەلام تەنیا ڕێگایەك کە هەبێ بۆ ئەوەی کچەکە بخاتەوە سەر دۆخی جاران و لەنگەریشی پێ ڕاست بکاتەوە، هەر ئەوویە کەدەروونی کچەکە بخاتە سەر هەست کردن بەوەی کە ژیان پڕە لە کردەوە بڵندیو جوامێریو بەرزی جا لەبەر ئەمەی کچەکە ئامادەیە بۆ ئەو گۆڕرانە گەورەیەی کە بەسەریداهاتووە، هەروەها بە تەواوەتیش ئاگای لێیەتی، ئەم بارەی پاڵی پێوە دەنێ بۆ ئارەزووکردنی بڕیاردان لەسەر سەربەخۆیی ،چونکە کچەکە هەست وا دەکات، کە هەر کچەبچکۆلەکەی جاران نیە، کچی ئەمڕۆیە جا هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە لە باوك و دایکی خۆی هەڵدەگەڕێتەوەو، سەرکێشی دەکات و، هەر فەرمانێکیشی بەسەردادەدەن بەرپەچی دەداتەوەو چەقەچەقیشیان لەگەڵدا دەکات کچەکە بۆیەکا دەڵێ: (نەء) تا خۆی وا پیشان بدات هەر خۆی گەورەی خۆیەتی، خاوەن بیری سەربەخۆیش هەر خۆیەتی!. .

بام نموونەیەك بۆ ئەمە بهێنینەوە:

ئەمە (فرانسواز)ە. خەریکی سنووقی نووسراوەکانیەتی، ڕێکیان دەخات ،چونکە پشووی هاوینەی خوێندنگە تەواوبووەو خوێندنگاکان دەستیان کردۆتەوە بە پێخوێندن. دایکەکەیشی ڕاوەستاو سەیری دەکات، بزانێ چی دەکات. کە تەماشا دەکات: کچەکەی شتی وا دەخاتە ناو سنووقەکەیەوە کە هیچ فرێکیان بە سەر خوێندنەوە نیە. کەچی گوێ ناداتە ئەوەی کە نووسراوە کانی و کەلوپەلەکانی خوێندنگای لەناو ئەو سنووقەدا دابنێ. (فرانسواز) سنووقەکە دادەخات . . لێرەدا دایکەکەی هەڵدەداتێ ،هەر بۆ ئەمەی ئەوەی تێبگەیێنێ کە نووسراوەکانی و کەلوپەلە گرنگە کانی لەو دیو سنووقەکەیەوە، داناوە.

کەچی سنووقەکەی پڕکردووە لە شتی پروپووچ کە هەر لە سەبەتەی پووش وپەلاش دەکات!. . کەواتە پێویستە سەرلەنوێ سنووقەکەی بکاتەوەو بە جوانی دای بمەزرێنێتەوە. بەلام (فرانسواز)یش وا وەرامی دەداتەوە، دەڵێ: «من خۆم باش دەزانم کە چیم پێویستەو چیم پێویست نیە» لەڕاستیدا (فرانسواز) دەیەوێ ئەوە بنوێنێ کە هەرچی دایکی دەیەوێ بیکات، ئەوەناکات!.

بۆچی تۆ ئەگەر (فرانسواز) بپرسیت: بۆچ وا دەکەیت؟. . ڕەنگە نەزانێت چۆن وەرامت بداتەوە. بەلام لەڕاستیدا ئەو لە کانگای دڵیدا ئارەزووی ئەوە دەکات کە هەرچییەکی کرد، بە ئارەزووی خۆی بیکات، بە ئارەزووی کەسیتر نەیکات. حەز دەکات لە دەربڕینی بیروباوەڕی خۆیدا سەربەست بێ، ئازاد بێ، سەربەخۆ بێ کەس فەرمانی بە سەردا نەدا. ئەو وا هەست دەکات هەر کەسێ بە زۆر شتی پێبکات، سەربەستی ی لێ باردەکات. چەند جار گوێت لێ بووە کە پێی گوتوویت: «من سەربەستم هەرشتێ ئارەزوو بکەم، بیکەم ،دەیکەم». جا ئەگەر ویستت ئەوەی تێبگەیێنێ کە ئەگەر پێرەویی چەند دەستوورێکی هەڵسان و دانیشتن نەکات لەگەڵ کەسانیتردا، تووشی تیزپێکردن و توانج وپلاری ئەم و ئەو دێت بەدناوی دەکەن.

بەندوباوی بۆ دەدۆزنەوە، گوێی خوێت لێ دەخەفێنێ و لە هیچ ئامۆژگاریو ڕێپیشاندانێکت گوێ ناگرێت!. . کەواتە

بۆچ ئەم کچــە بەرەڵــڵابکــەین و بهێڵین بە هەوەس و ئارەزووی خۆی بجووڵێتەوە؟. . بۆچ واز لە هێزو دەسەڵاتی خۆمان بهێنین بەسەریدا؟. . ئێمە ئەگەر ئەوەمان لەگەڵ کرد بێگومان هەڵەیەکی مەزن دەکــەین. دەبینــە هۆی ئەوەیش کە ئەرك و ئازاری زۆرتـر بیێ چونکە کچەکە هێشتا ناشیو نەزانە پێویستیی بە ئامۆژگاریو ڕێپیشاندان هەیە. . گەلێك ڕێگاو زۆر شێوە هەیە کە لە گەڵیدا ڕێك بکەوین و لەیەکتر تێ بگەین، بیێ ئەمەی قینی هەڵبسێنین و بیکــەین بە گژ خۆمــانــدا. جا ئەگــەر ویستمان فەرمانی بەسەردا بلەیــن، هیچی پیێ نــاوێ ئەوە نەبیێ کە لە شێــوەیــەکی تازەدا (فــەرمــان)ەکــەمــانی بەسەردابدەین. ئەو شێوە توندوتیژەی کە بۆ [فــەرمــانــدان] بەکــارمــان دەهێنا لەگەڵیدا، هەروەها قیژاندن بە سەریدا، هەرەشەلیێ کردنی، ددان ـ لیێ ڕیچ کردنەوە. . ئەمانە هەموویان کاتیێ بەکار دەهاتن کە منداڵ بوو. بەڵام ئێستاکە کە گەورە بووە ،کچەکـە لەو سزایــانــەمــان پەروای نیــەو ناتـرسیێ. تەنــانــەت شێــرگیــرتـریش دەبیێ پیێ یــان لەســەر کردەوە کانی خۆی! . . ئەوەی پێویست بیێ لەم کاتەدا، پەیرەویی بکریێ، ئەوەیــە کە یەك قســە بین بەرامبــەری بەڵام دڵــرەقیو قســەرەقی نەنــوێنین هەروەهــا ئامــۆژگــاریــیەکی وایشی بکــەین ،کــە بە دەنگێکی بە هێزەوە بیێ ،بەڵام دوور بیێ لەو توندوتیژیو توورەو ترۆیی یەوە، کە بیخانە شەرم و ڕیسوای یەوە! . .

بەڵام گەلێك جار گوێمان لە یەکێك لە دایکەکان دەبێت کە بە توورەیــیــیــەکــەوە دەڵیێ: «ئــەم کچــە توورەم دەکــات و تێکم دەدات! . . کەواتــە ئێــوە چۆن ئەمــە لە من داوادەکــەن کە هەروەك کچەشاهێکی بچووك بیێ قسەی لەگەڵدا بکەم؟! . . ». ئەم دایکــە توورەیــە ئەوەی لەبیــرچــوّتەوە کە کچەکەی لە تافێکی هەرە سەختی ژیانی خۆیدایە. ئێمەیش لەم دایکە بۆڵەبۆڵکەرە دەپــرسین: «ئــەگــەر کچــەکــەت نەخــۆش کەوت و پەزیشــك فەرمــانی دا کە زۆر بە ووردییــەوە چارەی نەخــۆشییــەکــەی بکــەیت، تا چاك دەبێتــەوەو، دێتــەوەســەرخــۆی، ئاخــۆ خۆت پیێ دەگیــریێ توخنی نەکــەویت و، دەرمــانی نەکەیت، بام ئەرك و ئازاریــشــت زۆر بیێو خۆیــەخت کردنیشت تووش بیێ؟ . . جا ئەگەر تۆ بە هەموو دڵێکتەوە ئەوە لەبەر تەندورستیی کچەکەت بگــریتــە ئەستــۆی خۆت، ئەی چۆن ئەوەی بۆ ناکــەیت لەبــەر هۆش دوروستی یەکەی؟! . . لە ژیانی خێزانیدا چەند تاوێکی وا هەڵــدەکــەوێت، کە بە کاری ئەوە بێــن باوکــەکــان لەگــەڵ کچەکانیاندا ووردە، ووردە گفتوگۆ بکەن، کە پربن لە تێگەیشتن لەیــەکتــریو لە بیێ دەنــگی و سەنگیی. کە بە هۆی ئەوانــەوە کچەکان بەرە بەرە دێنەسەر بیروباوەڕەکانی باوکیان کە لەوەپێش لەســەر ئەوانــە تێــك چووبــوون. ئەوەی لێرەدا بە گرنگ بزانریێ ئەوەیە کە باوکەکان ئەوەندەی پەیوەندی بە خۆیانەوە هەبیێ، دەبیێ کردەوەی وا بنــوێنن کە لەســەر بنچینــەیەکی تێگەیشتووانەو ڕێگەیەکی دیاردیکراوەوە دامەزرابیێ، نە سەرچڵیی تێدا بنوێنن و نە سەرکێشی.

## هەندیێ سەربەستییان بدەنیێ!

واچاکــە ماوەیــەك بە کچــەکە ببەخشین کە تێیدا سەربەست بیێ. دەست بکات بە تاقیکردنەوە سەرەتاییەکانی خۆی، کە تۆباڵیان بە ئەستۆی خۆی بیێ!.

،چــونکــە سەرزەنشت کردنی هەموودەمی ،ئامۆژگاریکردنی دووبــارەکــراوە، هەر لە بەیــانییــەوە تا ئێــوارە، بۆڵەبۆڵ کردن لە هەموو هەڵسان و دانیشتنێکی کچەکە، لە هەموو بزووتنەوەیەکی ،لە هەموو نووسراوێك کە دەیخوێنێتەوە، توانج و پلار تێگرتن لە شێــوەی قژداهێنــان و خۆئــارایش کردنیــاندا. . . ئەمانە هەموویان لەوانەن کە کچۆڵەکان بئاڵۆزێنن توورەیان بکەن کە بیانخەنە سەر ئەوەیش کە گویێ لە هیچ ئامۆژگارییەك نەگرن. کە بایەخ بە هیچ ڕێگاپیشاندانێکیش نەدەن. کچ لەم تافی تەمەنەیدا حەز لە بەرەنگاریکردن دەکات، هەر لەبەر بەرەنگاری کردن. بەڵام ئەم بەرەنگــاریکــردنــە تەنیــا بریتیــیــە لە نەخــۆشییــەکی بچــووکی دەروونی کە زۆری پیێ ناچیێ لادەچیێ. هەر لەوەیشەوە پەیدابووە کە لەسەرەتای کار گوزاریی هۆشە بچووکەکەیدا چەند بیرێك بە مێشکیــدا هاتــووە، کە لەو کاتــەدا هۆشــەکــەی خەریکی ئەوە

نیه که لەوان باشتر بێ . هیچ کەسایەتی‌یەکی سەربەخۆیشی نیه که لەوان جیاواز بێ! . . ئنجا ئەو ئارەزووی [خۆ جوێ کردنەوە] و [نازو جیاز]ەی کچەکە هەیەتی، لە زۆر شێوەدا دەردەکەوێ، وەك ئەو شێــوەیـەی لە کاتی قســەکـردن و هەڵسـان و دانیشتن و بزووتنــــەوەو دەســت و دەم و چاو جوولاّنـــدنـــەوەو جل و بەرگ لەبــەرکــردن و خۆرێــك خســـتــن و بڕۆەنــگ کردن و نینۆك دەرمۆشـانـدنـەوەو لووس کردنیـدا دەنوێنێ جا هەتا گومان بەرێتــە جوانیو خوێن گەرمیی خۆی زۆرتــر خوو دەداتــە خۆ جوان کردنی خۆیو، خۆرێــك خستنی خۆی. کچــەکــە هەر لەسەر ئەم رێگەیە دەڕوات. بەلاّم که زانی ئەو هەموو ڕەنجەی داوێتی لەپێنــاوی خۆجــوان کردن و خۆرازانـدنـەوەی خۆیــدا، بەبــاچــووەو کەس خۆی تێ ناگــەیێنێو کەس ددان بە جوانی یەکـەیـدا نانێ ،ئیتـر واز لەو هەمـوو کەلـوپـەل و خۆرازاندنەوەو خۆجـوان کردنـە دەهێنێو پەنـادەبـاتـەبـەر چەنـد ڕێگەیەکی‌تر بۆ گەیشتن بەو مەبــەسـانــە که هیـچ فرێکیـان بەسـەر ڕێگـاکـانی پێشووەوە نیه هەموو هەر بەئاواتی ئەوەیشەوەیە ،کە بەکامی دڵی خۆی بگــات و ئەو نازداریـیـــەی دەست بکـەوێ کە لە هەمـوو کچەکانی‌تر جیاوازبێ لەسەروو هەموویشیانەوە دابنرێ ئەوەی لە هەمـوو شتێـك زۆرتـر دڵی کچـەکـە برینـدار دەکـات و دەیخاتە شەرمـــەوە، ئەوەیـــە، کە هەســـت بە خۆی بکـــات کردەوەو ڕەووشت و خوو و هێـزو توانـایو بلیمـەتی‌یـەکی وای نیه کە بە ئارەزووی خۆی سەرنـــجی کەســـانـیـتــر ڕابـکـێـشــێ. نه لە خوێندنگەدا، نه لە کارخانەدا، نه لە کاتی کاروفرماندا، نانوێنێ تا سەرنجی کەسانی‌تر ڕابکێشێ تا پەنجەی بۆ بکێشن و ناوی لەنـاو ناوانـدا ببـرێ. لەبـەرئـەوە وەك دەردەکـەوێ ژمارەی کچە دواکـەوتـووەکـان و کچـە نیـوە سەرکەوتووەکان زۆرترە لە ژمارەی کچەسەرکەوتووەکان و کچەبەناوبانگەکان. ئەمەیش هەموو دەم، بە جۆرێکی تێکــرایی، لە هەمـــوو شوێنێکـــدا وایـــە .بـــەلاّم هەســت کردنـی کچــەبـچـکــۆڵــەکــان بە تاڵیو ناخــۆشی‌ی سەرنەکەوتن، لە هی کچەگەورەکان زۆرتر توندوتیژترە! . .

ئەوەیش سەبــارەت بەوەیــە کە ئارەزووی خۆ نووانـــدن و کەش وفش کردن لای بچکۆلەکان بە . هێزترە تا لای گەورەکان! . .

(ثانی) لە یادنامە نهێنی‌یەکەی خوێدا نووسیویەتی:

«چـەنـد حەز دەکـەم خۆم لەدەست هەمـوو بەنـدەیـەتی‌یـەك ڕزگاربکەم و هەموو پێوەندێك بپچرێنم، تا لەپاش ئەوەخۆم ئەو پێـوەنـدانـە بۆ خۆم دابنێمـەوە، تاوا لە هەمـوو کەسێك بکەم کە بزانـــن من هەم! . . بەلاّم داخــەکــەم لەم ڕووەوە زۆر بێ دەسەلاّتم! . . هەرچەند دەکەم نازانم چۆن بچمە دڵی کەسانی ترەوە، تا لەناو ئەوانەدا منیش جێگایەك بۆ خۆم بکەمەوە . بەلاّم بە هەموو ڕەنگ ئەمە ئەوە ناگەیێنێ کە من بە کامی خۆم ناگەم. چونکە من هێشتانە گەیشتوومەتە تەمەنی حەڤدە ساڵی!».

ئەم کچـە داخی زۆر چۆتـە دڵـەوە. خەفـەت زۆر دەخـوات چونکە خۆی وا دێتە پێش چاو کە لە جێگایەکی وادایە کە پایەی ئەو جێگایە نزمترە کە ئاواتی بۆ دەخوازێو ئارەزوو دەکات دەستی بکـەوێ. هەروەهـا بۆیـە خەمگین و دڵ بەئـازارە، چونکـە هیچ کەسێك نادۆزێتەوە کە ئەوەندەی هەڵدەگرێ، ڕێزی لێ‌بگرێو ئەوەندەی مافی هەیە نازی بکێشێ! . . جا ئەگەر بمانەوێ ئەم کچـە بگێـرینـەوە لە هەڵـەکـردن و لە ئەنـدازە نەگـرتن، فرمانی سەرشـانمـان ئەوەیـە کە نرخی ڕاسـتـەقینـەی خۆی تێبگـەیێنین. چونکە ئەو ئەوەندە بە خۆی دەنازێو ئەوەندە لە خۆی بایی‌یە، لە ئەندازە بەدەر نرخ دەدات بە خۆی. پێویستە لەسەرمان بیری ڕۆشن بکەینەوەو چاوەکانی بکەینەوە تا ڕاستیش بە ڕووتی ببینێ ،تـا زۆر ڕووکـەشی سەوزو سووری پێـوە نەنووساوە! . پێویستە ئەوەیش بخەینە مێشکی‌یەوە کە ئەوە هیچ نەنگی‌یەکی تێدا نیه کە بەشی ئەو لە (سەرکەوتن)و (جیاوازی)دا کەم بێ. چونکە هەمـوو مرۆڤێـك هەر ئەو بەشـە دیـاردیکـراوەی هەیە . هەروەها هەموو مرۆڤێکیش بەشی خۆی چاکەو خراپەی هەیە، جوانیو ناشیرینی هەیە، تەواویو ناتەواوی هەیە. مرۆڤیش هەرچەندە لە هەندێ ڕووەوە کەم وکووڕی هەبێ، بەلاّم دەسەلاّتێکی سەیرو بێ‌ئەندازەی هەیە لە گەشەکردن و پێشکەوتن و گۆڕان و گەورە بوون دا! . .

ـوەوە. ڕێگـایـەك بكـاتـەوە بۆ خۆی، لە ژیـانی ڕوودواودا ئەگـەر کچەکە بیروباوڕی خۆی دەربڕی، بە هەموو هێزو هەڕەتیەکیەوە ـســەری دەڕوات چونکـە ئەو بڕوای وایـە کە بیـروبـاوەڕەکانی، هەمـوو تازەن، هەمـوو پێگـەیشتـوون!. ئەوەندەیش هوگری ئەو ـیـروبــاوەڕانـەی خۆی دەبێ، مەگـەر هەر باو داهێنـەرێـك ئەو هوگرییە بنوێنێ بۆ نوخشەی دۆزراوەکانی خۆی!. دڵیشی بەوە ـۆر خۆشە، هەست بە خۆی دەکات کە لە توانایی‌یدا هەیە کە هەر خۆبەخۆی ،بیروباوەڕی خۆی دەربڕێ، بەرامبەر بە ژیان و ـنـداری‌و کۆمـەڵایـەتی ،بـە هەمـوو گیروگرفتێکیشەوە کە پیاوان پێیەوە خەریکن.

هەروەهـا بە تەواوەتی لەو باوەڕەیشـدایـە کە دەتـوانێ هەمـوو شـتێـك فێـربێ، کە ئەو بیـروباوەڕانەیش دەریاندەبڕێ دەربارەی کاروبـارو بابـەتی ژیـان، لەو بیـروبـاوەڕانـە گەلێـك باشتـرە کە پیــاوەگـەورەکـان دەری‌دەبـڕن. چونکـە ئەوانـە تازە پیـر بوون، بەکەڵکی ئەوە نایەن کە بیروباوەڕ دەرببڕن. ئەوانە لەم چەرخەدا کە تیـێــدا دەژین لەدوای هەمــوو کەسـەوەن، هەروەك تێیشیـدا نەژین وایــە!. . کەچی لەگـەڵ ئەوەیشـدا، بیـرەکـانی زووزوو دەگــۆڕڕێن. هەرگیـز وەکـو خۆیـان نامێنن .جـا ئەگـەر بیـەوێ هەنــدێ بیــروبــاوەڕ بخــاتــە کەڵــلەی خۆیــەوە، لەم لاوە: بیـروبـاوەڕێـك و، لەولا یشـەوە بیـرو باوەڕێکی‌تر وەردەگرێ، بێ ئەمــەی گوێ بداتــە ئەوەی کە ئەو بیــروبـاوەڕانـە پێچـەوانـەی یەکتـرن و لەگـەڵ یەکتـریشـدا ناسـازێن. کچـەکە ئیمڕۆ لەسەر بیروباوەڕێك دەکاتەوە. کەچی ڕۆژێکی‌تر لەسەر بیروباوەڕێکی‌تر دەکاتەوە کە پێچەوانەی بیروباوەڕەکەی پێشوویەتی. هەر هەفتەیە بە شێوەیەك دەگۆڕڕێ.

هەرمانگە دەچێتە ڕەنگێکی‌ترەوە. کچەکەیش لەمەدا هەر لە هەرزەکـاری‌یـەکـەی خۆی دەکات کە بیروباوەڕەکانی خۆی ،لە شێـوەیـەکی بڕیـارلـەسەردراو و، دیاردی‌کراودا دەردەبڕێ، هەرگیز گوێ ناداتـە ئەوەی بیـروبـاوەڕەکـانی ڕاستی‌یـان تێـدایە یان نا. چونکـە لە توانـایی‌یـدا نیـە لەو ڕاستی‌یانە تێبگات!. . ئامانجی کچی هەرزەکــار ئەوەیـە کە بکـەوێتـە پێش چاو کە کەسـانی‌تـر بایەخی پێبدەن!.

زۆر لەوە دەتۆقێ کە خۆی وابێتە پێش چاو، گوێی نادرێتی‌و کەنـەفت کراوە. چونکـە ئەو بەپێی تێگـەیشتنـە کەمەکەی خۆی‌و بەپێی بیـروبـاوەڕەکـانی خۆی، بەلایەوە وایە کە دەبێ کەسانی‌تر گەشکــەداری جوانی‌و ناوازەیی‌ی جل وبــەرگــەکـانی ببن. کە بشڕوات بە ڕێگادا سەرنجی هەموو کەسێك ڕابکێشێ بۆ خۆی .هەروەك پێیدا هەڵبدەن و بڵێن: «پەککوو کە جوانیت!. .

پەکـکــوو کە خوێن گەرمیت و دڵ کێش دەکــەیت!. ». چاو دەبـڕێتـە ئافـرەتێـك لە ئافـرەتـە لاسایی کەرەوە بە ناوبانگەکانی سینەما. خۆی خەریك دەکات بەوەوە کە خۆی وەك ئەو جوان بکات و بڕازێنێتەوە. ئەمجا کە هەستی بەوە کرد کەس گوێی ناداتێ‌و سەرنجی کەس ڕاناکێشێ، خەم و خەفەت دایدەگرێ‌و دڵیشی پڕدەبێ لە ڕەنجەڕۆیی‌و هەناسە ساردی!. .

(ئـەنـدرێـە) دڵی‌چوویوو بە خۆیدا پشتی بە زیرەکی‌ی خۆی ئەستوور بوو.

ئەو خۆی وا دەهــاتــەپێش چاو کە لە ناو هەمــوو دەستــە خوشکەکانی خۆیدا دیارە، چونکە لە زوو هەست کردن بە شتدا کەسیــان نایگـەنێ لە قووڵی‌ی هەست و تاسـەو تەزوویشـدا لە هەموویان پێشکەوتووترە. لە فراوانی‌ی تێگەیشتنیشدا لەڕاستی‌ی کارویـارو بابـەتی ژیـانـدا کەسیـان هاوتـای نین. جا ئەم بیـرە هیـچ وپـووچانە ،چاوبەستیان دەکرد ،تا ئەندازەیەکی گەورەیش دەبوون بە هۆی کامەرانی‌ی!. . جا لەو کاتەدا کە ئەو کچە لەناو گێـژاوی ئەم خوتـوکـەو خۆشی‌یـەدا نوقم بووبوو، لەپڕ ووتارێك کەوتــە بەرچــاوی ،کــە لە بابــەت هەرزەکـاری‌و کوڕوکچی هەرزەکارەوە دووابوو. کە خوێندیەوە، لەناکاو ئەوەی بۆ دەرکەوت کە ئەو هەست و تاسانەی بە دڵیدا دێن و ئەو بیرو ئەندێشانەیش ،کــە بە مێشکیــدا دێن، بابــەتێکی گشتین ،بـە سەر هەمـوو کەسێکدا دێن و کە لە تەمەنی خۆیدا بن و لەو ڕێگایەوە بڕۆن خۆی پییدا دەڕوات!. .

جا کچەکە هەست بە ڕەنجەڕۆیی‌یەکی گەورە دەکات، کە دەبینێ خۆیشی وەك هەمـوو کچێکی ترەو، هیـچ نازوجیـازێکی

## کچ وکورەکان کەم وکووڕیی دایك و باوکەکانیان گەورە دەکەن!.

کچە هەرزەکارەکەیشمان ،ئیمڕۆکە گەیشتۆتە ڕادەیەکی وەها، کە دەتوانێ دەربارەی ڕاستیی کۆمەلایەتیو ژیان بیروباوەڕی خۆی دەرببڕێو بڕیاریشیان بەسەردابدات. کچەکەمان تا ساوا بوو ،بە ژیانێکی ڕەنگاوڕەنگ و گەش وخۆشی پاك وخاوێنەوە ڕاهاتبوو بەلام ئێستاکە بەرە بەرە خەریکە پەردە لە ڕووی ڕاستیی ڕووتی بێڕەنگ و بێنەخش و نیگارەوە ،لادەچێ لەپڕ، لەناکاو کچەکە ئەوەی بۆ دەردەکەوێ، کە مرۆڤەکان کردەوەو ڕەووشتیان پڕە لە گەنگیو نەنگی، لەکەم وکووڕیو ناشیرینی لەناویاندا زۆرو ستەم دەبینێو پشم وقین و ڕقەبەریی چاو پێدەکەوێ.

خۆپەرستییو ئالۆش و خرۆش و ناپاکیو لووت بەرزیو کەللەشەقیو دەست قووچاوییانی دێتەپێش چاو!..

بەلام لە هەموو شتێك ناخۆشتر بۆ دلی کچەکە ئەوەیە، کە لەم تەمەنەیدا نەنگیو کەم و کووڕی باوك و دایکی خۆی بۆ دەردەکەوێ .کچەکە ئەو کەم و کووڕییانە لەپێش چاویدا گەورە دەنوێنن. چونکە کوڕان و کچان سوروشتیان وایە، کەم و کووڕی باوك ودایکەکانی خۆیان، گەورە دێتە پێش چاو، لە ئەندازە بەدەر هەلیاندەسەنگێنن. چونکە ئەوانە بە لایانەوە وایە کە باوك و دایکەکانیان لە هەموو هێزو دەسەلات و کردەوەو ڕەووشتێکی جواندا بێهاوتان، کەس لەوان بەرەوژوور نیە!.

ئنجا کە ئەوەیان بۆ دەرکەوت:

باوك و دایکەکانیان نەنگیو کەم و کووڕییان هەیە، یەجگار پێ دلتەنگ دەبن. جا ئەو هیوا نەمانەیان ،ئەو ڕەنجەڕۆیییەیان ،وایان لێدەکەن، کە ئەو خەوشەو ئەو کەم وکووڕییانەیان گەورەتر بێتەپێش چاو!..

ئەمە (ماریکلۆد)ە. نیشانەی هەناسەساردیو ڕەنجەڕۆیی پێوە دیارە. جاری وایش هەیە، لە تاو ئێش و ئازاری دلی خۆی، هەستێکی نەناسراو دێ بە دلێداو کێشی دەکات بۆ ئەو کارەساتە نەناسراوەی کە پێی دەلێن: «مردن»!. هۆی ئەوەیش ئەوەیە کە لە بێبەختیی خۆی ئەوەی لێ ئاشکرابوو: کە باوکی لەدەرەوە خەریکی کردەوەی نەنگە، کە لە سەرخۆیو لەسەر خێزانەکەیشی زۆر گران دەکەوێ!.. کە سەرنجیدا دایکیشی لەوە زۆر پیش دەخواتەوە، کچەکە زۆر شتی پێچەوانەی یەکتریی بە دلدا دێ. جارێکیان ئەوەی بە دلدا دێ کە واز بهێنێ وبێ دەنگ بێ لەوبارە.

جاری وایش هەیە دەیەوێ بە گژ ئەو بارەدا بچێ. لەبەرئەوە (ماری کلۆد) لەکانگای دلیەوە ئاوات بۆ ئەو ڕۆژە دەخوازێ کە باوکی پەشیمان بێتەوە لە کردەوەی خۆیو وەك خۆی لێبێتەوە. بەلام کچەکە وەڕس دەبێ لەوەی کە ئاواتەکەی نایەتەدی هەناسەساردیو ڕەنجەڕۆییەکەی دەبێتە هۆی پەیدابوونی هەستێکی سەیر لەناو دەروونیدا. کچەکە خۆیشی بە گوناهبار دێتەپێش چاو!.

ئەمیش ناوی [هێلین]ە کچی پیاوێکیترە بەلام ژن و پیاوێك کردوویانە بە کچیخۆیان کە زۆر نازی دەکێشن و بە تەنگیەوەن. کەچی لەگەل ئەوەیشدا ئەم بیرانە بە مێشکیدادێن:ـ «بۆچ خۆیشی باوك و دایکی ڕاستەقینەی نەبێ وەك مندالانیتر؟.. ئەی باوك و دایکەکەی خۆی چۆن توانییان وا بەرەلالای بکەن؟!.». بێگومان ئەم جۆرە بیرانە کە چرپە دەکەن بە لای مێشکیدا، لە ئەنجامدا وایلێدەکەن کە هەست وا بکات بە خۆی پایەکەی لە پایەی هاوڕێکانی و دۆستە خوشکەکانی نزمترە!. لەو هەستەیشەوە تووشی ئەوە دێ کە لە دوارۆژی خۆی دوودل بمێنێتەوە!.

(هەنریێت)یش هێشتا مندالێکی ساوابوو کە (بازارە ڕەشە) لە

نەوی جیهانەوە تازە دەرکەوتبوو پاشان کە گەورەبوو، و بووە کچێکی پێگەیشتوو ناچاربوو ئەویش فێری فروفێڵ بێ، تا بتوانی لەناو ئەو بازارە ڕەشەدا پێویستی‌ی ژیانی خۆی بکڕێ!.. پاش ئەوەی کچەکە ئەوەی دی گەورەکان چۆن لەو فروفێڵبازی‌یەدا شارەزایی‌یان پەیدا کردووەو دەست وبردی دەنوێنن ئیتر پێی نەکرا، لە شوێنێکی‌وادا کە تێیدا گەورەبوویوو، دەست بەرداری بیروباوەڕەکانی کردەوەو ڕەووشتە باشەکان نەبێ ... بۆیەکا ئەویش بەدخوو دەرچوو!..

## کچە هەرزەکارەکان حەزدەکەن زوو بگەنە تافی لاوێتی

کچەکانمان حەزدەکەن زوو بگەنە تافی لاوێنی‌و تافی ژنێتی. ئەمەندە پەلەپەل دەکەن بۆ ئەوە ئارامیان لەبەر دەبڕێ.

ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە هەتا منداڵ بن هیچ ئاواتێکیان بۆ نایەتەدی. کچەکە لەکانگای دڵییەوە ـ

ئارەزووی ئەوە دەکات کە تەمەنی زوو تێپەڕ بکات. چونکە ئەو لە دوارۆژدا ئەمانەی دێتەپێش چاو: مێرد، منداڵ، کاروپیشەیەکی وایش کە بە دڵی خۆی بێ‌و کە لە دەستی بێت بە باشی هەڵی‌بسووڕێنێ!.. هەرچی کچە کرێکارە کانیشن لەگەڵ کچەلادێی‌یە بچووکەکاندا ساڵانی داهاتوویان بە جۆرێکی ناخۆشتر وسەختتر دێتەپێش چاو لەچاو ساڵانی ئێستاکەیاندا. جا لەبەرئەوە ئەو کچانە لە هەمووکچەکانی‌تر زۆرتر بە دوای ژیانی پڕ تاسەو تەزوودا دەگەڕێن. زۆرتریش لەوان ڕادەکەن بە دوای بیرکردنەوەی بۆش و ئاواتە خەودا!. گەلێك جاری وایش هەیە کە تۆ بە سەرسوڕمانێکەوە لە خۆت دەپرسیت: «کچەکەم لەم چوار پێنج ساڵەی دوایی‌یەدا چەند گۆڕراوە؟!..». لەڕاستیدا تۆ لەوەدا بیانووت هەیە کە بەو چەشنە سەرت سوڕماوە لەو گۆڕانە گەورەیەی کە بە سەر کچەکەتدا هاتووە.

چونکە تۆ لەوەپێش وا ڕاهاتبووی، کە کچەکەی خۆتت دەدی، بریتی بوو لە یەکێك کە ڕۆژ بەڕۆژ دەژیا. نە گلاراوی‌ی هەبوو، نە گوێ‌ی دەدایە هیچ شتێك مل کەچ بوو، هەرچی‌یەکی پێ‌دەگوترا بەجێ‌ی‌دەهێنا دڵنیابوو لە هەموو کەسێك، باوەڕی پێ‌دەکردن زوربەی جاران تۆی بە دڵدا دەچوو. ڕێزیشی لە بیروباوەڕەکانت دەگرت. دەمەقاڵێی لەسەر نەدەکرد لەگەڵتدا.

کەچی ئێستاکە کچێکی بچووکی تازە پێگەیشتوو دەبینیت لەبەردەمتدا:

سەرکێشی دەکات، خۆی لە ڕاستی دەربازدەکات، بەرەو ئەندێشەو ئاواتەخەو دەچێت کە تەماشای ژیانی ئێستای خۆی دەکات، هیچ وپووچی دێتەپێش چاو. لەبەرئەوە وای لێ‌دێ کە بە هەموو کوڵی دڵیەوە چاوەڕوانی‌ی دوا ڕۆژی خۆی بکات. دڵیشی تەنگە، پڕە لە خەم و خەفەت، پڕە لە گلاراوی ئەو خەم و خەفەتەیش پاڵی‌پێوەدەنێ بگەڕێ بە دوای (دڵداری)دا.

ئەی چۆن وا نابێ؟.. ئەوێك کە لە دایك بوونی هەست کردن بە ڕەگەز بازی‌ی خۆی، بە چاوی خۆی ببینێ، کارەساتی هەستی ئەو ڕەگەزبازی یەیشی وەك تەماشاگاهێك بێتە پێش چاو کە چیرۆکی تێدا لاسایی دەکەنەوە! تەنانەت ئێستاکە تۆ لە بەرامبەر کچێکدای کە دەیەوی جێگای خۆی بکاتەوە لەناو کەسانی‌تردا کە دەیەوێ خۆی بنوێنی بەسەر کەسانی‌تردا.

هەموو ژیانیشی پڕبووە لە شتی پێچەوانە!. هەر لەو کاتەدا کە وات دێتەبەرچاو:

کەلـلەڕەق و لووت بەرزو لەخۆبایی‌بوو، و، پشت بەخۆبەستە، کەچی زۆری پێ‌ناچێ دەبینی بە خۆیدا ڕاناپەڕموێ هیچ شتێك بکات. دوو دڵە لە خۆی، دڵنیایش نیە لە بیروباوەڕەکانی خۆی!. هەرزەکارەکان، بە کوڕ وکچەوە، هەموویان لەم تەنگە و چەڵەمەی ژیانەوە تێدەپەڕن. جا لێرەوەیە کە گۆڕرانێکی زۆر بەسەر گەشەکردنی گیانیاندا دێ لەگەڵ ئەوەیشدا بۆ باوکەکان ئاسانە کە لەگەڵ کوڕەکان و کچەکانی خۆیاندا ڕێك بکەون. ئەوەیش کاتێك دەبێ کە ئەو کوڕو کچانە گەورەبووبن. کە کچەکانت گەورەبوون لێت نزیکتر

دەبنەوە، لەو دەمەی کە منداڵ بوون. ئەوساکە لە توانایی‌یاندا هەیە کە هەستیان وەك هەستی تۆی لێ بێ. ئەوانیش لە خۆشەویستیدا بەرامبەریت بکەن بە واتایەکی‌تر دڵت ڕابگرن. بەڵام بە مەرجێ کە تۆیش پشتیان پێ ببەستیت و باوەڕیشیان پێ بکەیت.

ئەی باوك و دایکەکان! ئەوەتان لەبیرنەچێت کە ئێوە دەتوانن زۆر کار لە کچەکانتان بکەن، دەسەڵاتتان زۆرە بەسەریاندا کە هێزی کەسا یەتیتان و، بیرکردنەوەی ڕاست و دوروستتان و بیروباوەڕەکانتانن، کە کردەوەی کچەکانتان بەرامبەرتان دیاردی دەکەن. زۆر جاری وا هەیە کچەبچکۆلەکان خۆیان بەوە دەنوێنن کە گەورەکچەکان سووك و ڕیسوا بکەن! لەگەڵ ئەمەیشدا، ئەو کارەی گەورەکچەکان دەیکەن لە کچە بچکۆلەکان، هەر لە کاری چاوبەست دەکات. چونکە کچی هەرزەکار پێویستی‌ی بە خۆرشتێك هەیە بۆ دڵ ناسکی‌یەکەی خۆی جا ئەگەر توانیت ئاراستەی بکەیت بۆ لای هونەرەجوانە ڕەنگاورەنگەکان، وەك : سازو ئاوازو گۆرانی‌و وێنەکێشان و پەیکەرتاشین. . لەڕاستیدا یارمەتی‌یەکی گەورەی دەدەیت، لە بەکارهێنانی‌و ئەو هێزو تینە شارراوەیەیدا کە لە دڵ ناسکی‌یەکەیەوە پەیدابووەو پەنگیشی خواردۆتەوە لە دڵ و دەروون و مێشکیدا ئەوساکە کچەکە لەنگەری خۆی دەگرێتەوە. ئەگەر توانیشت لە شێوەیەکی ژیرانەو بەئەندازەدا یارمەتی‌ی بدەیت لە بیرکردنەوەدا لەبابەت ڕەووشت و کرداری خۆیەوە، لە ڕاستیدا یارمەتی‌یەکی باشی دەدەیت کە لە دەست بەندەیی‌ی سوروشتی خۆی‌و لەدەست پێوەندی هەوەس و ئارەزوو و دەمار بزووتنەوەی خۆی ڕزگاری ببێ چونکە هەر ئەو هەست و تاسەو دڵ بزووتنەوانە بوون کە ووروژاون و، هوروژمیان بردۆتە سەری وگەلێك جاریش بڕیاری خراپ خراپیان پێداوە! . . جم وجۆڵ وبزووتنەوە، نەخۆشی‌ی ئاواتەخەو چاك دەکەنەوە تاقی کردنەوەی ڕاستەقینەیش وا لە کچەکە دەکات کە خۆی ڕابگرێت کە بڕیاربدات بە سەر توانایی‌ی مرۆڤدا ،کە ئەویش تێبگات، مرۆڤ تا چ ئەندازەیەك دەتوانێ پێشکەوێ وسەرکەوێ کەواتە بێویستە لەسەرمان چەند کاروفرمانێك دیاردی بکەین بۆ کچەکانمان کە لە ناو ماڵدا خۆیانی پێوە خەریك بکەن هەروەها لە دەریشەوە بیانخەینە سەر کارگوزاری‌یەك لە کۆڕی کۆمەڵایەتیدا، وەك ئەوەی کە بیانکەین بە ئەندامێك لە کۆمەڵە چاکە بەخشەکاندا کە یارمەتی‌ی پیاوی پیرو منداڵ دەدەن، کە سەرپەرشتی‌ی ئەو فرمانە دەکەن.

دیارە لێرەدا مەبەسمان ئەوەنیە کە کچەکە بخرێتە ناو ئەو کۆمەڵانەوە کە ئەندامەکانی حەز بە هاوبەش بوون دەکەن لە گرەو و بەربەرەکانێ‌ی زانستی‌ی پڕ لە گیروگرفتدا چونکە لە بارێکی‌وادا دەبێ ئەمەندە بە تەنگ کچەکانمانەوە بین کە هەر ڕێگایەکمان پیشان دان پێیدا بڕۆن دەبێ لە پێشەوە لەسەر بنچینەیەکی زانستی‌و لێکۆڵینەوەیەکی تەواومان تێدا کردبێ ئنجا بڕیارمان لە سەر ئەو ڕێگایە دابێ. کچەکان لە تەمەنی هەرزەکاریدا، لە ڕێگایەکی گرنگی ژیانیانەوە تێدەپەڕن زۆر هەستی بە هێز هوروژم دەبەنە سەر دڵ و دەروونیان تووشی زۆر ڕەووشت و خووی بەدو تونـدو تیژ دەبن. کردەوەی زۆر نابەجێ‌یان لێ ڕوو دەدات وایان لێ دێ تووشی دوو دڵی دێن لەگیانی خۆیان وەڕس دەبن بۆڵەبۆڵ دەکەن دڵیان تەنگ دەبێ هەست و تاسەو تەزوویان زوو گردەسێنێ زوویش دەژاکێن و کزو سیس دەبن! . ئەو ڕەنج و کۆششەیش کە باوك و دایکەکان بەختی دەکەن لە پێناوی ئەوەدا ،کە لەگەڵ کچە هەرزەکارەکەیاندا هەڵ بکەن و بە پێی بیرو هۆشی ئەو بڕۆن بە ڕێوە بێگومان یارمەتی‌یان دەدات کە چارەیەکی بە کەڵکی بۆ بدۆزنەوە لەو چەند تاوە ناسکەدا ،کە لەم بەشە پڕتەنگ و چەڵەمەی ژیانەیدا، لە ڕێگا پیشاندانی کچەکەیاندا کاریان سەربگرێ پێویستە لەسەریان هەندێ ڕەووشت و خووی لاوان بگرن وەك: دڵسۆزی‌و کارگوزاری‌و خوێن گەرمیی‌و، خواستێکی بەهێزو هەڕەت و بە خۆدا ڕاپەڕموون. جا بە هۆی ئەم ڕەووشت و کردارانەوەیە کە بتوانن فرمانی خۆیان بەجێ بهێنن بەرامبەر کوڕەکان و کچەکانی خۆیان لە شێوەیەکی (یەکسانی)دا! . .

# ئاوردانەوەیەک لە فەلسەفەی هیندی

● محمد کمال - کەراچی ●

لە سەردەمە کۆنەکانی پێش شارستانیەتی ڕۆژئاواوە، زەمینەی پان وبەرینی بەر ڕۆخانەکانی کەنگا و جەمنا[1] بوە بەلانکەی بیرو ئەندێشەو سۆفی گەرێتی و گەشت وگوزار بە جیهانی میتافیزیکدا.

گەنجینەی کەلەپوری ئەم دوو ڕۆخانەیە ئەوەندە دەوڵەمەندو چڕە کەم لە ئێمە دەتوانێ لە ژیانیا بە هەموو کوچەو کەلەبەرێکیا بگەڕێت.

ئەم نووسراوەی منیش ئاوردانەوەیەکی سەرپێی یە لە کەلەپوری فەلسەفی ئەم ولاتەو بە پێویستم زانی خوێندەواری کورد شارەزایی زیاتری لەبارەوە بزانێت.

دەشێ لە خۆمان بپرسین کە بۆچی مێژوونووسان مێژووی لەدایک بوونی فەلسەفە دەگەڕێننەوە بۆ یۆنان و ولاتی هیندیان فەرامۆش کردوە بە مەرجێک فەلسەفەی هیندی دە هەزار ساڵ لەمەوبەر پەیدابوەو فەلسەفەی یۆنانی تەمەنی دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە. لەوانەیە هەندێ لە مێژوونووسە ڕۆژئاوایی یەکان ئەوەندە بایەخیان بە ڕۆژهەلات نەدابێت و لە ئاستی ئەم ڕاستی یەدا بیر تەسک بن، بەلام ئەمە تەنیا هۆنی یەو ناتوانین هەموو مێژوونووسانی فەلسەفە بە بیر تەسک و شوڤینست دابنێین. هۆی سەرەکی ئەم بۆچوونە مێژوویی یە دەگەڕێتەوە سەر چۆنیەتی و خاسیەتەکانی فەلسەفەی هیندی. ئەم فەلسەفەیە ئەوەندە خۆی تێکەڵی ئەندێشەو ئەفسانەو بیروباوەڕە ئایینی یەکان کردوە، بە دەگمەن ڕەنگ و بۆنە فەلسەفی یەکەی دەبینرێت و هەرگیز لە ئایینی هیندوسی یەکان جیانابێتەوە. فەلسەفەی هیندی ئایینی هیندیشە. بەلام ئەم خاسیەتە گەلێک لە فەلسەفەی یۆنانی یەوە دوورە.

با ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە فەلسەفەی هیندی کارێکی زۆری کردوتە سەر ڕۆشنبیران و فەیلەسوفەکانی

ڕۆژئاوا. بۆ نموونە ئایینی ئۆرفی یۆنانی‌یەکان و ڕارەوەکەی فیتاگۆراس جێگا پەنجەی فەلسەفەی هیندی زۆر پێوەدیارە. وەکو ئاشکراشە ئەفلاتون بڕوای بە گیان گۆڕین (تناسخ الارواح) هەبـووەو وەکـو هینـدی‌یـەکـانیش لە سستـەمـە ڕامیـاری‌یـەکـەیدا چینە کۆمەلایەتی‌یەکانی جیاکردۆتەوە.[2] ئەفلوتین لە سەدەی یەکـەمی زایینییـدا ژیـاوەو فێرگەکەی بە (ئەفلاتونیەتی نوێ) ناسراوە، بیردۆزەی (الفیض Emanation) - ی لە هیندی‌یەکانەوە وەرگرتوە.

لە فەلسەفەی نوێشدا دەبینین (شوپنهاور) لەدوا ڕۆژی تەمەنیا، بوو بە شاگردێکی بواداو بڕوای بە (نیرڤانا) هەبوو، سستـەمـە میتـافیـزیکی یەکـەی (هیگـل)یش گەلێـك لە فەلسەفەی هیندی‌و فێرگەکەی (شەنگارا)وە نزیکە. هەروەها زۆر لە نووسـەران و ئەدیبـانی گەورەی جیهـانیش بە ڕێزەوە تەماشای ئەم کەلەپورەیان کردووەو سودیان لێ‌وەرگرتوە.

فەلســفــەی هیـنـدی دەورێکی گرنگی لە ژیــان و بەرهـەمـەکـانی تۆلستـۆی‌و گویتـەو ئالیوتی شاعیردا گێڕاوە. کەمیش لە سۆفی‌یـە موسلمـانـەکان هەن کە ئەم فەلسەفەیە کاری تێ‌نەکردبێتن.

## سەرچاوەکانی فەلسەفەی هیندی

بیـروبـاوەڕەکـانی ئەم فەلسـەفـەیە دەگەڕێنەوە سەر چوار سەرچـاوەی گەورە کە نزیکـەی دە هەزار ساڵ لەمـەوبـەر بە شیعر نوسراونەتەوە.

ئەمڕۆ کەس نازانێ کێ خاوەنی بەرهەمە شاکارا ئەدەبی‌و فەلسەفی‌یەیە بەلام بە بڕوای هیندی‌یەکان قسەی خواوەندن کە لە، ڕێگای ئیلهامەوە گەیشتۆتە فەیلەسوفەکان.

ئەم سەرچـاوانـە پێیـان دەوترێ (ڤیـدا)و چوار بەشن: (ڕەگ ڤیدا ـ یاجورڤیدا ـ ساماڤیدا ـ ئاسەرڤیدا) هەر یەکێك لەم ڤیدایانە زیاد لە هەزار بەیتی شیعری تێدایە کە باسی خواوەنـدو سروشت و مرۆڤ دەکـەن. زانیـاری‌یـەکـانی ناو ڤیــداکـان بەزانیـاری‌یـەکی هەمیشـەیی ناسـراون کە چاوو مێشکی مرۆڤـە نامـۆو ئالـۆزەکـان ڕونـاك دەکەنەوەو ڕێگای ژیانی جاویدانی‌یان پیشان دەدەن. لە پەرتوکی (گیتا)[3]دا واباس کراوە کە ئەم زانیاری‌یانە زۆر جار ڕاستەوخۆ دەگەنە سوفی‌و فەیلەسـوفـەکـان. خواوەنـد ڕووبـەڕوو لەگـەڵیـاندا دادەنیشێ‌و فێری زانستی (یۆگا)و خواناسی‌یان دەکات. لەم پەرتـوکـەی هیندی‌یەکاندا خواوەند خۆی پیشانی یەکێك لە سوفی‌یەکانی دەدات کە ناوی (ئەرجۆنا)یەو سستەمی یۆگای بۆ ڕوون دەکـاتـەوە بەلام خواوەنـد لە شێـوەی مرۆڤێکـدا دێتـەلای ئەرجـۆنـا، کە ئەرجـۆنا خوداوەند دەناسێتەوە وەکو موسـا داوای لێ دەکـات، شێـوە ڕاستـەقینـەکـەی خۆی پیشان دات، خواوەند لە وەلامدا دەڵێ:

ئەی ئەرجــۆنــا بەم چاوە فیــزیکی یانـەوە ناتـوانی ئەو ڕووخســارەی من ببـینـیـت ئەوا من دڵت ناشکێنم، دوو چاوی گیـانـەکیت دەدەمێ‌و ئەگـەر ناتـرسیت تەمـاشای ئەو ڕووخســارەم بکــە. ئەرجــۆنــا هەر کە چاوی بەشـێــوە ڕاستـەقینـەکـەی خوداوەنـد دەکـەوێت لە ترس و لە خۆشی یانـدا خۆی فڕێ دەداتـە بەرقـاچی‌و لە خوداوەند دەپاڕێتەوە کە لەمە زیاتر بەرگە ناگرێت و ناتوانێ تەماشای بکات.[5]

لەبـەر ئەم هۆیـەشـە، ڤیـداکـان بە بەرهەمێکی ئەدەبی ڕووت وەکو ئەلیاذەو ئۆذیسەی هۆمر دانانرێن و زۆر لەگەڵ ئایین و بڕوا ئایینی‌یەکاندا تێکەڵاوبوون.

زۆر لە فەیلەسـوفـە هینـدی‌یـەکـان بڕوایان وایە ژمارەی ڤیداکان پێنجەو (ئیتیاساس) دەخەنە ڕیزی ئەم چوار پەرتـوکـەوە[6]. بەلام شەنکاراو ڕامانوجاو مەهاڤا لەگەڵ ئەم ڕایەدانین. ئەوەی ڕاستیش بێت (ئیتیاساس) زانیاری‌یەکی نوێ‌و مەسەلەیەکی فەلسەفی جیاواز باس ناکات، بە ڕای من شکـۆی ڤیـداکـانـەو تەنیـا بیـروبـاوەڕی ڤیداکانمان بە شێوەی داستان و چیرۆك بۆ باس دەکات.

ووشـەی (ڤیـدا) لە زمـانی سەنسکریتی هیندی‌دا واتەی (زانــیــن) دەدات، با ئەوەش بزانیـن ئەم جۆرە زانـینــە میتـافیـزیکی‌یـانـەیـەو بە ڕای هیندی‌یەکان گۆڕانی بەسەردا نایــەت. (ڕەگ ڤیــدا) لە هەزارو هەڤــدە بەیتی شیعـری پێك هاتووە لە دە بەرگدا تەفسیرکراوە. ئەم دە بەرگە باسی

پەیوەندی نێوان خواوەندو مرۆڤ و خۆبەخت کردن و قوربانی دانی ئایینی دەکات. (یاجورڤیدا) باسی چۆنیەتی ئامادەکردن و گەیاندنی ئەم قوربانیانە بەخوا دەکات. ئەم قوربانی‌دان و خۆبەخت کردنانە شەهیدبوون و چوونە (جیهاد) ناگرێتەوە، چونکە بیروباوەڕی ناو ڤیداکان زۆر دژی جەنگ و یەکتری کوشتنن ،جا ئەو کوشتنە کوشتنی مرۆڤێك بێت، یا مێشولەیەك، بە ڕای هیندی‌یەکان لە هەموو زیندەوەرێکدا وەیا هەموو شتێکی زیندوو (گیانی) تیدایەوە نابێ ئازار بدرێت. لە بەندی سێ‌هەمی (ئیشو - ئوپانیشادا) نوسراوە «ئەوانەی چرای ژیانی کەسانی ترو زیندەوەرەکان دەکوژێننەوە، جێگەیان لەسەر ئەستێرەی نەزانی‌و تاریکی بۆ ئامادەکراوە».

لەبەر ئەم هۆیە هیندی‌یەکان گۆشت ناخۆن و حەیوان سەرنابرن.

جۆری قوربانی‌دان و خۆبەخت کردنیان وازهێنان و دوورکەوتنەوە لە خۆشی‌یەکانی جیهانی ماتریالی‌یەو نوقم بونیانە لە دەریای عەشقی خواوەند پەرستی‌و تەسەوف (یوگا)دا.

بەشی دوانزەهەمی پەرتوکی (گیتا) زۆر بە قوڵی باسی ئەم ڕێگا دوورو درێژەی یوگای کردوە، هەر لەم ڕوانگەیەوە دوو جۆر مرۆڤی باوەڕکەریان دەست نیشان کردوە. جۆری یەکەمیان ئەو مرۆڤانەی دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردەگارو خۆیان لەناو زاتیا نوقم بکەن ،هەروەکو چۆن ڕووبارەکان دەگەن بە دەریاکان و دەریاکانیش دەگەن بە ئۆکیانوس. جۆری دووەمیش چاوەڕێی پاداشت و ژیانی جاویدانی ناو بەهەشت دەکەن. خواوەند بۆ ئەم مرۆڤانە جێگایەکی تایبەتی تەرخان کردووە هەموو بەزم و ڕابواردنێکی تێدایە.

ئایینی هیندوسی لەپێش ئایینە سامی‌یەکانەوە باسی دۆزەخ و بەهەشتی کردوە.

هەروەها مانەوەی مرۆڤ لەم دوو جێگایەشدا مەرج نی‌یە هەمیشەگی بێت و پەیوەندی بە دەفتەری کردەوەکانی مرۆڤەوە هەیەو خواوەندبریار دەدات کە چەند ساڵ مرۆڤ لەسەر ئەو دوو ئەستێرە یە بمێنێتەوە، دەشێ دوای تەواوکردنی ئەو ماوەیە جارێکی‌تر ئەو مرۆڤە وەیا ئەو گیانە جارێکی‌تر بگەڕێتەوە سەر ئەم ئەستێرەیەو توشی کلۆڵی‌و نەگبەتی ژیانی پڕ کوێرەوەری‌و ناخۆشی بێتەوە. لەبەر ئەم هۆیە دەبینین کە جەوهەری فەلسەفەی هیندی ڕێگا دۆزینەوەیە بۆ دەربازبوون و ڕزگار بوون لەم کلۆڵی‌و کوێرەوەری‌یەی سەر ئەم ئەستێرەیە.

(ئاسەرڤیدا) بریتی‌یە لە دوعاو وەعز بۆ چاکردنەوەی نەخۆشی‌یەکانی لەش و دەروون.

بە شێوەیەکی گشتی، ناوەڕۆکی ڤیداکان لە چوارچێوەی خواوەندپەرستی‌و تەقەلاکردنی مرۆڤ بۆ گەڕانەوەی نیشتمان و بارەگای یەکەمی ناچێتە دەرەوە، ئەم پەرتوکانە ڕەنگ و بۆنی ئایینی‌و میتافیزیکی ڕووتیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتوە.

## ئوپانیشاد

ئەو کاتەی شاگردەکان بە شەوقێکی زۆرو سەرێکی گێژو پڕ لە پرسیارەوە لە چوار دەوری مامۆستایەکی یوگیدا کۆدەبوونەوە بە ترسەوە دەستیان بۆ سەکۆ بەرزەکەی مامۆستا درێژ دەکردو بە ئاستەم لێواری کراسە زەردەکەیان ماچ دەکردو پاشەوپاش دەگەڕانە دواوەو لە نزیکەوە دادەنیشتن. مامۆستاش کە چەندان ساڵ لەژێر دەستی مامۆستایەکی‌تردا ڤیداکانی خوێندوەو بوە بە یۆگی زانیاری‌یە فەلسەفی‌و میتافیزیکی‌یەکانی دەدا بە شاگردەکان و مێشکیانی پڕدەکردو فێری ژیانی تەسەوفی دەکردن. لەم حاڵەتەدا بە ڕێگایەکی کلاسیکی هەموو دەقە فەلسەفی‌یەکانی ناو ڤیداکان کە بە شێوەیەکی ڕێك وپێك هەڵبژێردرا بوون لە نەوەیەکەوە دەگەیشت بە نەوەیەکی‌ترو تاکو ئەمڕۆ وەکو خۆیان ماونەتەوە. ئەم دەقە فەلسەفی‌یانە لە (108) پەرتوکدا نووسراونەتەوەو ئەمڕۆ بە (ئوپانیشادەکان) ناسراون. وشەی ئوپانیشاد لە بنەڕەتدا واتە (لەنزیکەوە)، ئەم زاراوەیەش لەوەوە پەیدابوە کە شاگردەکان لەنزیکەوە گوێ لە مۆستاکەیان دەگرن و ڤیداکان فێردەبن.

ئوپانیشادەکان لە بنەڕەتدا بۆچوونە فەلسەفی‌یەکانی ناوڤیداکان و بە جەوهەرو کاکڵەی ڤیداکان دەژمێردرێن.

جۆری سێ‌هەمی پەرتوکی هیندی‌یەکان کە بە هەمان شێوە

لەناو ڤیداکانەوە دەرهێنراون پەیوەندییان هەیە بە باری ژیانی کۆمەلآیەتی و رامیاری و ئابووری هیندییەکان و پێیان ئەوترێ (ڤیدەنتا ـ سوترا - Vedanta - Sutra ) یاسەکانی دەولەت و خێزان و بازرگانیەت لەناو ڤیدەنتا سوترادا باس کراون.

## خواوەند لەناو بیرو باوەری ڤیداکاندا.

ئەگەر تەماشای فەلسەفەی هیندی بەگشتی بکەین. سێ هەلوێستی جیاوازو بۆچوونی تایبەتی بەرامبەر مەسەلەی بوون و مانای خواوەند روون کراوەتەوە.

ڤیداکانیش لەم سێ بۆچوونە بەولاوە رێگایەکی تریان نەدۆزیوەتەوەو بە هەمان شێوە بوونی خواوەندو پەیوەندی سروشت و زیندەوەرەکان و خواوەند دەکەنەوە. ئەگەر خوێنەر هەموو ئوپانیشادەکانی دەست کەوێت و بە قولی بیان خوێنێتەوە ئەم سێ بۆچونانە بە ئاسانی دەست نیشان دەکات. لە بۆچوونی یەکەمدا خواوەند بە (براهمەن - Brahman) باس کراوە، لە سستەمی یۆگیشدا خواوەند (پاراماتما - Paramatma) یەو لەناو گیتادا خواوەند (بە گوان - Bhagvan ).

براهمەن خاوەنی هیچ فۆرم و سفاتێك نییە. تەنیا هۆشێکی رەوانە، وەیا راستەقینەیەکی رووتەو ناخرێتە ژێر پێوانەی لۆجیکەوەو هیچ کاتگۆرییەکیش ناگرێتە خۆی. لەلایەکی ترەوە سپینوزاو هیگل لەگەلْ جیهاندا یەکیان گرتووەو خۆی جیهانەو پەرش و بلاوبۆتەوەو ژیانی بە هەموو زیندەوەرو گیان داران بەخشیوە. راداکریشنا کە فەیلەسوفێکی هیندی سەردەمە دەلێ: براهمەن ناخرێتە ژێر رۆشنایی هۆشی مرۆڤەوەو هیچ زمانێکی فەلسەفی و ئەدەبیش ناتوانێ باسی بکات، چونکە بێ روخسارەو سفاتەکانی لەگەلْ خۆیدا هەلْنەگرتوە.

پاراماتما، لە دوو وشە پێك هاتوە، (پاراما) واتە (مەزن وەیا گەورە)، (ئەتما)واتە گیان. ئەگەر ئەم دوو وشەیە لەیەك بدەین لە زمانی کوردیدا بە واتای (گیانی مەزن) دێت کە مەبەست لە گیانی خواوەندە ـ The Supreme SouL) . پاراما ئەتما لە سستەمی یۆگادا سەرچاوەی هەموو بابەتێکی ماتریالی و گیانەکییە. گیانی هەموو زیندەوەرەکان ئەتۆمی بچکۆلەن وەکو (موناد) کە لەم گیانە مەزنەوە دەرچوون و جیابوونەتەوەو لە دلْی هەموو گیان لەبەرێکسدا جێ نیشین بوون. لەم بۆچوونەوە، یۆگییەکان دلْی مرۆڤ بە سەرچاوەی برواو سۆزو عەشق دادەنێن و لە کاتی خەلْوەتیشدا پەنا دەبەنەبەر ئەم لایەنەو دەیانەوێ، ئەو رووناکییە بدۆزنەوە و لەوێوە بگەنە پاراماتا. گیانی زیندەوەرەکانی تریش ئەتۆمی گیانەکین کە بەهەمان رێگا لە گیانی خواوەندەوە دەرچوون، لەبەر ئەم هۆیەشە هیندییەکان وەیا باشتر وایە بلێین یۆگییەکان بەیەك چاو لە روانگەیەکی ئەنتۆلۆجیانەوە تەماشای پادشاو پشیلەیەك و کرمێك دەکەن هەموویان بە بەشی بچکۆلە لە گیانی خوداوەند دادەنێن

«ئەوەی هەموو زیندەوەرەکان بە بەشێك لە زاتی من دادەنێ و منیش لەناو هەموو شتێکا دەبینێ ،هەرگیز رقی لە هیچ شتێك نابێتەوە»[8].!

جیاوازی نێوان براهمەن و پاراماتما لەوەدایە کە براهمەن لە گەردوون جیانابێتەوەو خۆی گەردوونە، بەلآم پاراماتما کە دیسانەوە سەرچاوەی گەردوون و زیندەوەرەکانە لەناو جیهاندا نازێ و لەو دیوو جیهانی ماتریالییەوە فەرمان رەوایی دەکات. جیهانیش بە هەر دوو بابەتەکانیەوە (گیانەکی و ماتریالی) لەم گیانە مەزنەوە دەردەچن، هەروەکو چۆن تیشکی خۆر لە رۆژەوە دێتە دەرێ. پاراماتماو سستەمی یۆگای هیندییەکان کارێکی زۆریشی کردۆتە سەر رارەوە فەلسەفەیەکەی ئەفلوتین و (اخوان الصفا)و فارابی و ابن سینا، بیردۆزەی (الفیض) کە لەلای ئەم فەیلەسوفانەو زۆر لە سۆفییە موسولْمانەکانیش باسکراوە بیروباوەرێکی هیندییەو جەوهەری سستەمی یۆگاشە.

بۆچوونی سێهەم لە فەلسەفەی هیندیدا کە لە هەموویان زیاتر لەم سەردەمەدا بووە بە خالی لێکۆلْینەوەو سەرنجی زۆر لە رۆشنبیرانی رۆژهەلآتیشی راکێشاوە لە پەرتوکی (گیتا)دا بەووردی باسکراوە.

ئەم بۆچوونە کە خواوەندمان بە (بەگوان) پێ دەناسێنێ بە

هەمان شێوە وەکو بۆچوونی دووەم خوداوەندو گەردوونی لەیەکتر جیاکردۆتەوەو هەموو سفاتە ڕەهاکانیشی داوە بە خوداوەند، هەروەها بەبیرو باوەڕی (گیتا)و (ئیشو ـ ئوپانیشا) ویش خواوەندو مرۆڤ لە چۆنیەتی ئەم سفاتانەدا یەکن و جیاوازییان نی‌یە، تەنیا زیادیو کەمی مقداری سفاتەکان، خوداوەندو مرۆڤ لەیەکتر جیادەکاتەوە، بۆ نموونە ئەگەر گیانی مرۆڤ و زیندەوەرە کانی‌تر ئەتۆمی بچکۆلە بن لە گیانی خوداوەندا دەبێت لە هەموو سفاتەکاندا لەیەکتری بچن، بەڵام لەبەر ئەوەی گیانی زیندەوەرەکان زۆر بچکۆلەن بەشێکی کەمیان لەو سفاتانە لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتوە. بۆ نموونە دڵۆپێك ئاوی دەریا هەمان تام و ڕەنگ و توخمی کیمیاوی دەریای هەیە، دڵۆپەکە سوێرەو دەریاش سوێرە،.. هتد بەڵام خوێی ناو زەریاکە گەلێك لە خوێی ناو دڵۆپەکە زۆرترە.

مرۆڤیش وەکو خوداوەند زانیاری هەیە، بەڵام ئەندازەی زانیاری خوداوەند ڕەهایە، خواوەند وەکو ئێمە دەبینێ بەڵام توانایی بینینی خواوەند لە توانایی ئێمە زیاترە.

لە هەمان کاتدا (بەگوان) وەکو مرۆڤ خاوەنی کەسایەتی‌یەو (شەخسە)ە ،بەڵام کەسایەتی‌یەکەی مەزنەو ڕەهایە، لە شیشی هەیە، بەڵام وەکو لەشی مرۆڤ لە خوێن و گۆشت پێك نەهاتوەو گیانەکی‌یە.

جیهانیش بە هەر دوو بابەتەکانیەوە (گیانەکی‌و ماتریالی) دوو جۆر وزەن لە گیانی بەگوانەوە وەکو تیشکی خۆر دەردەچن. بەگوانیش لەو دیو هەموو بابەتەکانەو تێکەڵیان نەبوەو سەرپەرشتی هەمووشیان دەکات.

«ئەم زاتە گەورەیە سەرچاوەی هەموو هەستەکانە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی خاوەنی هەست کردن نی‌یە هەموو فۆرمە ماتریالی‌یەکان لەمەوە پەیدابوون، خۆشی لەسەروو هەموویانەوەیە.»[9].

«ئەم ڕاستەقینە هەمیشەیی‌یە لە هەموو بابەتێکەوە دوورەو لە هەموو شیانەوە نزیکە. لەناو هەموو شتێکدایەو لە هەموو شیانەوە جیاوازە.»[10]

**«من ڕووناکیم لە دڵی هەموو زیندەوەرێکدا، من سەرەتاو کوتایی هەموو شیانم.»[11]**

**«من سەرەتاو کۆتایی هەموو شتێکم، بۆ خاوەن لۆجیکەکانیش ئەو ڕاستەقینەیەم کە هەمیشە ناشاردرێتەوە.»[12]**

جگە لەم سێ بۆچوونە، بۆچوونێکی‌تر لە فەلسەفەی هیندی‌دا نی‌یە، با ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە خوداوەند لەلای هیندی‌یەکان بەپێی زانیاری ناوڤیداکان یەك خواوەندە زۆر ناو و شێوەی هەیەو بەم سێ جۆرە باس کراوە بۆ نموونە (کریشنا ـ ڤیشنو ـ ڕام براهمن ـ بەگوان ـ پارامائەتما ... هتد) ناون بۆ یەك پەروەردگار، تەنیا جۆری پەیوەندی‌و سفاتەکانی دەگۆڕێت. ئەگەر یەکێك شارەزایی لە زمانی هیندی نەبێت و ئەم فەلسەفەیەش بە باشی دەراسە نەکات تۆمەی پۆلیێزم ئەخاتە پاڵ هیندی‌یەکان و واتێ‌دەگات کە برِوایان بە چەند خوداوەندێك هەبێت. ئەمرۆ زۆر لە کۆمەڵەو گروپی هیندی‌یەکانیش بە باشی لە ڤیداکان نەگەیشتون و فریشتەکانیش وەکو شیڤا ـ ئەندێراو ـ گەنی شاو ... هتد) بەخواوەند دادەنێن. لە وڵاتی خۆشڤان بە مانگا پەرست و ڕووبار پەرست و مارپەرست ناسراون. لە ڕاستیدا هیندی‌یەکان مانگا پەرست نین، بەڵکو مانگا حەیوانێکی پیرۆزە لەلایان و بوەو بە (تابو) بە ڕای منیش هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ باری ژیانی ئابووری کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵی وەکو هیند. مانگایەك سەرچاوەیەکی گەورەیە بۆ ژیان و گوزەرانی خێزانی جوتیارێکی هیند. تەنانەت لە لادێکانی کوردستانیشدا مردنی مانگایەك زۆر جار لە مردنی منداڵی جوتیارێك سەخت ترە بەهەمان شێوەش ڕووباری (کەنگا) سامانێکی ئاوی گەورەیە بۆ خەڵکی‌و زۆر لە کشتوکاڵی ئەو ناوچەیە پشت بەم ڕووبارە پان و درێژە دەبەستێت. هیندی‌یەکان زۆر باش ئاگادارن، کە مانگا خواوەند نی‌یە، بەڵام بەپێی پەرتووکە ئایینی‌یەکانیان ئەم حەیوانەبەکەڵکە پاداشتی خواوەندەو دراوە بە مرۆڤ و پێویستە، ڕێزی لێ‌بگرێت.

لە پەرتوکی (گیتا)دا وا باسکراوە کە دوو جۆر ووزە لە خوداوەندەوە یا لە کریشناوە دەردەچن، دەرچوونی ئەم ووزانە تۆزێك لە بوونی کریشتا کەم ناکەنەوە. ووزەی

گیـانـەکی لە گیـانی مرۆڤ و زینـدەوەرەکـان و هەمـوو ئەو بابـەتـانـەی ژیانیان تێدایە پێك هاتوە ئەم جۆرە وزەیە پێی ئەوترێ (جیڤێ) واتە ژیان. گیانی مرۆڤ و زیندەوەرەکان بچـوکن و لە شێـوەی ئەتـۆمـدان. وەکو باسیشمان کرد ئەم ئەتۆمە گیانەکی‌یانە لە سفاتەکانیاندا وەکو گیانی خوداوەندو تەنیـا لە زۆری‌و کەمی ئەنـدازەی سفـاتـەکاندا جیاوازی‌یان هەیـە. ئەم ئەتـۆمـە گیـانـەکی یانـە کەوتوونەتە ناو جیهانی ماتـریـالی‌یـەوەو لەگـەڵیدا هەڵس و کەوت دەکەن، جوانی‌و ڕابواردان و خۆشی جیهانی ماتریالی زۆر جار سەرنجی ئەم ئەتـۆمـانـە بەلای خۆیـدا ڕادەکێشی‌و توشی داوای عەشقی جیهـان پەرستیـان دەکـات و دەیـان خاتـە ناو ژیـانێکی هیـدۆنستی‌یـەوە، کە بەرای هینـدی‌یـەکـان ژیـانێکی پڕ (وەهم)و ناموّیی‌یە.

بە ڕای من ئەم مەسەلەیە بەرەو ئاڵۆزیمان دەبات و زۆر پرسیـاریش لەبـەردەممـانـدا دادەنێت بۆچی خوداوەنـد ئەم ئەتـۆمـە گیـانـەکیـانە لە خۆی دەپچڕێ‌و فڕێیان دەداتە ناو جیهـانی ماتـریـالی‌یـەوە؟ لە هەمـان کاتیشـدا بۆچی سزای هەڵـەکـانیـان دەداو دۆزەخیـان بۆ ئامادە دەکات؟ ئەگەر ئەم ئەتـۆمـانـە پارچـەی بچوك بن لە گیانی خوداوەند.. بۆچی دەیـەوێت ئەم پارچـانـەی خۆی بە ئاگری دۆزەخ بسوتێنێ‌و ئازار بە خۆی بگەیەنێ؟ ئەگەر سەرپەرشتی هەموو شتێك بکات و لەناو هەموو زیندەوەرێکدا بێت ئایا خۆی لێ‌پرسراو نی‌یـە بەرامبـەر هەڵـوێستی باشی‌و چەوتی ئەم ئەتـۆمـانـە؟ ئەوەی ڕاستـی بێـت فەلسـەفـەی هینـدی لە ئاستی ئەم پرسیارانەدا دەستی کورتەو هیچ وەڵامێکمان ناداتێ.

لەلایـەکی‌تـریشـەوە دەتـوانین بڵێین کە ئەگەر جیهانی ماتریالی بەشێکی‌تر بێت لە ووزەی خوداوەند لەوەوە دەرچوبێت، چۆن دەبێت بەسـەرچـاوەی خراپـەو گونـاهـ و (وەهم)؟ بەرای زۆر فەیلەسـوفی هینـدی لەبـەر ئەوەی جیهـانی ماتریالی بەشێکە لە خوداوەنـد نابێت بەسـەرچـاوەی وەهم و خراپـەکـاری، بەڵام خراپـەکـاری لە ئەنجـامی هەڵـوێستی ناڵـەبـاری ئەم ئەم ئەتۆمە گیـانـەکی‌یـانـەوە پەیـدادەبن چونکـە نازانن چۆن بابـەتـە ماتـریـالی‌یـەکـان بەکـاربهێنن و سوودیـان لێ‌وەربگـرن. هەموو دەزانین مرۆڤ بەبێ خۆراك ناژی، بەڵام زۆرخواردن زیانێکی زۆر بە تەندروستی دەگەیەنێ.

بەم جۆرە خراپـەو ئاژاوە کۆمـەڵایـەتی‌یـەکـان بەرای ئەم فەیلەسوفانە لەو ڕۆژەوە پەیدابوون کە مرۆڤ دەستی تەماعی بۆ جیهـان درێـژکـردو زەویـە باشەکەی بۆخۆی داگیرکردوو زەوی‌یە ڕەق و بەردەڵانی‌یـەکـەشی، دا بە کەسـانی‌تـر. ئەگـەر مرۆڤ بەماقوڵانە جیهانی ماتریالی بەکاربهێنایە ئاژاوەو خراپە نەدەهاتە کایەوە. ئەم روون کردنەوەیە لەلای هیندی‌یەکان زۆر نزیکە لە بۆچوونە ئابووری‌یەکەی مارکسەوە، بەڵام بڕوایان بە سۆشیالیزم نی‌یەو دیوارێکی ئەستوریان لە نێوان چینەکاندا بەرز کردۆتەوە.

گیـانـە ئەتۆمی‌یەکان هەر چەندە لەناو لەشدان و پەیوەندی‌یان بە جیهانی ماتریالی‌یەوە هەیە، گۆڕانەکانی لەش و ئەو جیهانە کاریان تێناکات لەو کاتەدا کە مرۆڤ دەمرێ، گیان لەو لاشەیە جیادەبێتەوەو ئەچێتەناو لاشەیەکی‌ترەوەو سەرلەنوێ ژیانی لەسەر ئەم ئەستێرەیە دەست پێ دەکاتەوە ،ئەم لاشە گۆڕینە بە زمانی سانسکـریتی پێی ئەوتـرێ (سـەمسـارا ـ samaara) ،(تناسـخ الأرواح)و یەکێکـە لە بنچینـەکـانی بیروباوەڕی هیندی‌یەکان. بە پێی ئەم یاسـایـە، مەرج نی‌یـە گیـانی مرۆڤ لە کاتی لاشـە گۆڕیندا بگەڕێتەوە لاشەی مرۆڤێکی تر بەڵکو کردەوەکانی ژیانی ڕابوردووی بڕیار لەسەر ئەم فۆرمە نوێ‌یە دەدا ،گریمان مرۆڤ لە ژیـانیـا زاڵم و بێ بەزەیی‌یـە، لە کاتی مردنیـا گیـانی دەچێتە لاشـەی گورگێکـەوە مرۆڤـە ساکـارو بێ گوناهەکانیش لە شێوەی مرۆڤـدا دەگـەڕێنـەوە بۆ ناو جیهـانی ماتـریالی. پیاوچاکەکانیش بەرەو ئەستێرەی ڕووناکی‌و بەختەوەری دەکەونەڕێ، ئەوانەی کە زۆر گوناهیان کردووەو لاشەگۆڕینیش ئەم گوناهانەیان ناشواتەوە لە ناو دۆزەخ دا، دەمێننەوە.

سۆفی‌و عاشقەکانی کریشناش لەگەڵ کریشنادا تێکەڵ دەبن و هەتاهەتایە دەژین.

ژمـارەی ئەم بازنـەی لەدایـك بوون و لاشـەگۆڕینانە بە پێی ژمارەی زیندەوەرەکان لە ڤیداکاندا دانراوە هەشت ملیون و چوار سەد هەزارە. بەڵام مەرج نی‌یـە گیـانـێـك ئەم هەمـوو لاشەگۆڕینانەی بەسەردا بێت هەروەکو لە گیتادا نووسراوە[11] ئەو گیـانـانـەی لە ناموێی ڕزگاربوون و خۆیان دەناسن، یاسای

سەمساراپان بەسەردا ساغ ناکرێتەوە[13].

مەبەست لە نامۆیی، نزیک بوونەوەو خۆبەستنەوەی گیانە ئەتۆمی‌یەکانە بە ڕابواردن و خۆشی بەماتریالی‌یەکانەوە.

• لەم نامۆیی‌یەدا بە ڕای هیندی‌یەکان مرۆڤ واهەست دەکات کە خۆی بە تەنیا بوونێکی ڕاستەقینەی هەیەو هیچ هێزێک داگیرناکات و لەدوای ئەم جیهانەش هیچ جیهانێکی تر نی‌یە.

جا سستەمی یۆگا بە تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە دامەزراوەو مرۆڤ لەم نامۆیی‌یە ڕزگاردەکات و سەرەتای گەشتە گیانەکی‌یەکەی بەرەو نیشتیمانی ڕەسەنی ئەتۆمە گیانەکیەکان دەست پێ‌دەکات.

لەم حاڵەتەدا مرۆڤ لەگەڵ هەموو لەش گۆڕانێکیا هەنگاوێك لە کریشنا نزیک دەبێتەوەو هەنگاوێکیش لە سەمسارا دوور دەکەوێتەوە. ئەم گۆڕانانەش وەکو باسم کرد کار ناکەنەسەر ئەتۆمی‌یەکان و نایان گۆڕن، چونکە گیان هەمیشە وەکو خۆی دەمێنێتەوە، [11] هیچ هێزێك گیان ناشکێنێ، هیچ ئاگرێك نایسوتێنێ، هیچ ئاوێك نوقمی ناکات، هیچ بایەکیش لەگەڵ خۆیدا هەڵی ناگرێت.[14]

ئەم یاسای سەمسارایەو بیروباوەری لاشەگۆڕینە لە خۆیدا کەمێك ئاڵۆزەو سەنجمان بەلای زۆر خاڵی تردا ڕادەکێشێ. لە شاری بۆمبای لە کۆڕێکی (بەکتی‌پادا) فەیلەسوفێکی هیندی و ڕابەری بزوتنەوەی هاریٚ کریشنایە ئامادەبووم و لە کۆتایی کۆڕەکەدا ئەو پرسیارەم کرد کە ئایا بۆچی هیندی‌یەکان گۆشت ناخۆن وەیا حەیوان ناکوژن لە کاتێکا بروایان بەمردن و تێك شکاندنی (گیان) نی‌یە؟ لەلایەکی‌ترەوە حەیوان کوشتن دەبێتە هۆی ڕزگارکردنی ئەو گیانە لەناو ئەو لاشەیەداو قۆناغێك زووتر بەرەو تەواوکردنی زنجیرەی لەدایك بوون و لاشەگۆڕین دەبرێ. ئەگەر گۆشتی ئەو زیندەوەرەش بخۆین گیانەکەی ناخۆین و ناکەوێتە ژێر کەڵبەدانمان.

ئەم پرسیارەی من زیاتر فۆرمێکی میتافیزیکیانەی هەیەو پەیوەندی بە خاسیەت و چۆنیەتی گیانە ئەتۆمی‌یەکان و ناکۆکی‌یەکانی ناو بیروباوەری فەلسەفەی هیندی‌یەوە هەیە بەڵام وەڵامەکەی بەکتی‌پادا شێوەیەکی جیاوازی وەرگرت و لە ڕوانگەیەکی ڕەوشتی‌و یا زیاتر قانونی‌یەوە ویستی ڕازیم بکات. بەڕای بەکتی‌پادا، هەروەکو چۆن ناتوانین هەڵمەت بەرینە سەر خەڵکی‌و خانۆکانیان بەسەردا بڕوخێنین چونکە کارێکی نارەوشتانەیەو یاساو دادگا تاوانبارمان دەکات، بەهەمان شێوەش لاشەی زیندەوەرەکانی موڵکی ئەو گیانە ئەتۆمی‌یانەو بۆ ئێمە نەهاتووە بیان ڕوخێنین و ماڵوێرانیان بکەین.

ئەم بیروباوەرە لەلای گروپی جانی‌یەکان ئەوەندە بەهێزە تەنانەت کە هەناسە ئەدەن پەڕۆیەکی تەنك بەدەم و لوتیانەوە دەبەستن تاکو ئەو زیندەوەرە بچکۆلانەی لەناو هەوادا دەژین و بەچاو نابینرێن نەچنە ناو هەناسەیانەوەو نەکوژرێن.

خۆ ئەگەر سوفی‌یەکی ئەم فێرگەیە سێ ڕۆژ لەژێر دار سێوێکا دانیشی‌و چاوەڕێی سێوێك بکات تا لە دارەکە بکەوێتە خوارەوەو بیخوات، بەلاتەوە سەیر نەبێت بڕوای وایە کە ئەو میوەیە موڵکی ئەو دارەیەو ویژدانی ڕێگەی نادات بیرنێتەوە.

پرسیارێکی تر کە لێرەدا لەبەردەمماندا قوت دەبێتەوەو ئەوەیە کە بۆچی ژیانی ڕابردوومان نایەتەوە یاد؟ لە بەشی چوارەمی (گیتا) بەندی پێنجەم نووسراوە: کریشنا بە ئەرجونا دەڵێ: «ئەی ئەرجونا تۆ زۆر جار لەدایك بوویت و لاشەت گۆڕیوە، بەڵام هیچت نایەتەوە یاد من هەموویانم لە یادە.» مەبەستی کریشنا (خوداوەند) لەم بەندەدا ئەوەیە کە کارەساتی لەدایك بوون لە بنەڕەتدا کارەساتێکی ناخۆش و جەرگ برەو گیانە ئەتۆمی‌یەکەی پیادا دەگەڕێتەوە بۆ ناو ژیانی پڕ لە کوێرەوەری‌و کڵۆڵی‌و هەژاری‌و نەخۆشی.

ئەم کڵۆڵی‌و ناخۆشی‌یانەی ژیان هەموو یادگارو تاقی کردنە - وەکانی ژیانی ڕابردوومان لە بیر دەباتەوەو وادەزانین بۆ یەکەم جار لەدایك دەبین. هۆی دووەمیش دەگەڕێتەوە بۆ بچووکی‌و بێ‌توانایی گیانە ئەتۆمی‌یەکان بەڵام گیانی کریشنا لەبەر ئەوەی ڕەهایە هەموو زانیاریەکی ڕابردوو ئەمڕۆو داهاتووی هەیە. هەروەها لە هەمان پەرتوکدا باس کراوە، کە تەنیا سوفی‌یە سەرگەرمەکان وە، یا عاشقەکانی کریشنا دەتوانن ژیانی ڕابردوویان بهێننەوە یاد.

هۆی سێ هەمیش پەیوەندی بەباری سایكۆلۆجی مرۆڤەوە هەیە. بابڵێین یەكێك لە ژیانی رابردوویدا ئەسكەندەری مەكدونی بووە ئێستاش بوە بە سواڵكەرێكی رووت و برسی سەرشەقامە گەرمەكانی (بۆمبای)و رۆژی نانێكی دەست ناكەوێت و بەتەواوی ژیانی رابردووی خۆی دێتەوە یادو ئەگەر سەر لە مۆزەخانەش بدات پەیكەرە گەورەكەی خۆی دەبینێت و خەڵكی بەسەربەرزییەوە باسی مێژووی جەنگەكانی دەكەن، بەڵام ئێستا لەم فۆرمە تازەیەدا وەكو سواڵكەر رێگای نادەن بە شەو لەژێر چیغی دوكانێكیشا، بخەوێت.

ئایا ئەم مرۆڤە نەگبەتە وەیا ئەسكەندەری مەكدۆنی لە چی بارو دۆخێكی دەروونیدا دەژی؟ لەوانەیە لە یەكەم رۆژەوە بخرێتە یەكێك لە شێتخانەكانەوەو بە زنجیریش قاچ و دەستی ببەستنەوە تا رانەكات.

جگە لەم سێ هۆیە، هیندییەكان هۆیەكی تریان بۆ لە بیر چوونەوەی ژیانی رابردووی ئەتۆمەكان نەداوە بەدەستەوە. هەرچەندە هۆیەكی زانستیانە نین و ئێمەش رازی ناكەین.
حەزەكەم وەكو خۆی بەكاڵ و كرچی بۆ خوێنەری بەجێ بهێڵم.

## فەلسەفەی كۆمەڵایەتی

كێشەو مەسەلە كۆمەڵایەتییەكان لە كۆنەوە لێكۆڵینەوەیان لەسەر كراوە. بۆ نموونە هیندییەكان وەكو یۆنانییەكان زۆر لایەنی ئەم كێشانەیان روون كردۆتەوە. بەڵام ئەم روون كردنەوانە میتافیزیكیانەن و لەبەر تیشكی زانستدا تەماشا نەكراون.

حەزدەكەم پێش ئەوەی باسی ئەم لایەنەی فەلسەفەی هیندی بكەم پەیوەندی نێوان ئەفلاتون و ئوپانیشادەكان روون بكەمەوە تاكو خوێنەر زیاتر تێگەیشتنێكی فراوان و فەلسەفییانەی دەست كەوێت.

ئەفلاتون لە (تیماوس)دا دەروونی مرۆڤی كردوە بە سێ بەشەوە. بەشی یەكەم كە دەكەوێتە ناو سەرەوە (هۆش) خاوەن و سەرچاوەی زانیاری شێوە بەرزەكانەو لە هەموویان پیرۆزترە. ئەوانەی بەشێكی زۆری هۆشیان بەركەوتووەو خاوەنی ئەم زانیاریانەن فەیلەسوفەكانن و لە كۆمارەكەیدا فەرمان رەوایی دەكەن.

بەشی دووەم (دەروون) دەكەوێتە سنگەوەو سەرچاوەی ئازایەتی و مەردایەتییە، سەربازەكان و جەنگاوەرەكان خاوەنی ئەم بەشەن. بەشی سێیەم (غەریزە) دەكەوێتە سكەوە، بووە بە سەرچاوەی كارە غەریزەییەكان وەكو زاووزێ كردن و گەشەكردن و كارەكانی تر. لەم بۆچوونە میتار بایلۆجییەوە ئەفلاتون لەناو (كۆمارەكەیدا)، كۆمەڵی كردوە بەسێ بەشەوە (فەرمانبەران)، (سەربازەكان) هەروەها (كاركەران و جوتیاران و بازرگانان) كە سەرچاوەی بەرهەم هێنان و بازرگانین جا لێرەدا باسی ئەم بیردۆزە رامیارییەی ئەفلاتون ناكەم چونكە باسێكی دوورو درێژەو روون كردنەوەی زیاتری پێویستە مەبەستم تەنیا دەست نیشان كردنی نزیكی فەلسەفەكەی ئەفلاتونە لە فەلسەفەی هیندییەوە، ئەفلاتونیش وەكو هیندییەكان باری كۆمەڵایەتی و رامیاری و كێشە سیاسییەكانی لەسەر بنچینەیەكی میتافیزیكی لێكداوەتەوە.

بە رای ڤیداكان هەروەكو چۆن لەشی مرۆڤ لە چوار بەشی سەرەكی پێك هاتووە (سەر، سنگ، سك، قاچ) كۆمەڵیش بەسەر چوار چیندا دابەش بووە. بەرزترین چینی كۆمەڵ چینی (براهمن - Brahman)، جێگەو گرنگی ئەم چینە لە كۆمەڵدا وەكو جێگەی سەر وایە لە لەشدا ،ئەم چینە خاوەنی زانیاری ناو ڤیداكانن و لەبەر ئەم هۆیەش كارناكەن تەنیا نان خۆرن و بیرو باوەڕی ڤیداكان بە خەڵكی رادەگەیەنن و خەڵكی دەخەنە سەر رێگای خوداوەند پەرستی. ئەم چینە هەرگیز تێكەڵی چینەكانی تر نابن، ژن لە چینەكانی تر ناهێنن و كەسیش لە چینەكانی تر ناتوانێ ژنیان لێ بهێنێ، تەنانەت كەس ناتوانێ لە قاپێكا نانیان لەگەڵدا بخوات وەیا لە خانوویەكدا لە گەڵیانا بژین بە هەموو جۆرێك لە چینەكانی تر دابراون، فەرمان رەواكانیش وەیا یادشاكان بەبێ ئامۆژگاری براهمەنییەكان بڕیار لەسەر هیچ كارێك نادەن.

با ئەوەش بزانین كە هەموو فەیلەسوفە هیندییەكان بڕوایان بە هەڵوێستی و خاسیەتی چینە نییە. بودا بە هیچ شێوەیەك جێگەی

برهمـەنی یـەكـانی لە سستـەمـە كۆمـەڵایـەتیەكەیدا نەكردۆتەوە، بزوتنـەوەی (هـاریكـریشنا) كە پەیرەوی پەرتوكی (گیتا) دەكات كۆمـەڵی بەم شێـوەیـە نەخستـۆتـە ناو بلۆكی كۆنكـرێتی یـەوەو گۆرانـەكـانی كۆمـەڵی نەخنكاندوە، لەلای ئەم بزوتنەوەیە هەموو براهمـەنێـك مەزن و پیـرۆز نی یـە و كەسـانی چینـەكانی تریش دەتوانن لە ڕێگای سستەمی یۆگاوە ببن بە براهمەن هەڵوێستی بزوتنـەوەی (هـاریكـریشنـا) لەدوای ئاینـەكـەی بودا گۆڕان و بۆچوونێكی تازەی هێناوەتە ناو فەلسەفەی هیندیەوە ،لەهەمان كاتیشـدا هەڵـوەشـانـدنـەوەو رەفـزكـردنی بیـردۆزە ـ میتـا ـ بایلۆجی یـەكـەیـە كە لە ڤیـداكـاندا باسكراوەو چینەكانی كۆمەڵی لەسـەر دابـەش كراوە. بەڵام هێشتیـا ئەم بزوتنـەوەیـە نەیتـوانیوە بنـاخـەی میتـافیـزیـك هەڵ وەشێنێتەوەو بە زانستیانە چارەسەری كێشـە كۆمـەڵایـەتی یـەكـان بكـات، چونكـە وەكو بزوتنەوەیەكی ئایدیالیستی یانە لەو بناخەیە جیانابێتەوە.

لە هەمـان كاتیشـدا ژیـانی براهمـەنی یەكان ژیانێكی سادەو كۆچـەریـە، ئەوانـەی كە پەیـرەوی سستـەمی یۆگـا دەكەن ماڵ و سامـان و ژن و منـداڵیـان جێدەهێڵن و دوای زمـانی عەشق و ئاگری دلیان دەكەون و بە گۆچانێك و جلێكی زەردەوە شارەوشار دەسـوڕێنـەوە، ئەوانـەی لەم گەشتـە سوفیگەریەدا سەركەوتون و بەتـەواوی خۆیـان لە جیهـانی ماتـریـالیو خۆشی یـەكـانی دوور دەخەنەوەو چاوی دڵیان دەكرێتەوەو دەتوانن خوابیبنن بۆیان هەیە ئەم ئەستێـرەیـە جێبهێڵن و بگـەڕێنـەوە ناو ئەتۆمە مەزنەكە. ئەم یۆگـی یـانـە زۆر جارلەبـەر چاوی خەڵـكی لە یەكـێـك لە پەرستگاكاندا گیانی خۆیان لە لەشیان جیادەكەنەوە. ئەم ڕووداوە لەگـەڵ ئاهـەنگێكی بچكۆلانەدا ڕێك دەخریو یۆگی یەكە لەسـەر سەكۆیەكی بەرز بەرامبەر خەڵكی لە شێوەی یۆگادا دادەنیشی، چاوەكـانی بە ئەسپـایی دەنـوقێنیو بۆ دوا جار هەنـاسەیەكی قوڵ هەڵ دەكێشێ. بەڵام ئەم چاونوقاندن و هەناسە هەڵكێشانەی بۆ دوا جارەو پاش چەند دەقیقەیەك دەمرێ وەیا وەكو خۆیان دەڵێن گیانی ئەو لاشەیە جێ دەهێڵیو دەگەڕێتەوە لای كریشنا.

دوای ئەم ڕووداوە خەڵكی بەرێزە گۆرانی بۆ گیانی دەڵێن و لاشەكەی دەسوتێنن:

**وەیا ئەم لاشەیەم ببێت بە خوڵەمێش**

**رەشەباش تۆزی بەرێ بە ئاسماندا**

**ئەی كریشنا.. ژیانم بۆ تۆیە..**

**تۆ تەنیا ڕاستەقینەیەكی لە پێناویدا دەژیم..**

**پەلم بگرەو بەرزم بكەرەوە..**

**ـانـە پاكـەوە دەمـەوێ بگـەڕێـمـەوە لات.)[15]**

**بەم گیانە پاكەوە دەمەوێ بگەڕێمەوە لات.)[15]**

براهمـەنی یـەكان بەپێچەوانەی فەیلەسوفەكانەوە لە كۆمارەكەی ئەفـلاتـونـدا فەرمـان ڕەوایی ناكـەن و دەستـەڵاتی ڕامیـاریشیـان نەدراوەتێ تەنیا مامۆستا و ڕێبەری ئایینین.

دووەم چینی كۆمەڵ لەدوای براهمەنی یەكان فەرمان بەرەكانی دەوڵـەتن و پلەیـەك لە خوار چینی براهمـەنن، ئەم چینـە جڵەوو دەستـەڵاتی دەوڵـەتیـان گرتۆتە دەست و پێیان ئەوترێ شاترياس، چیـنـی سێـیـەم ڤیشیـاس ـ (VaisYas) خاوەن زەویـەكـان و بازرگانەكانن، هەروەها ئەو جوتیارانەش دەگرێتەوە كە چەند سەر مەڕو ماڵاتیان هەیەو زەوی یەكی بچكۆلانەشیان دراوەتێ .چینی چوارەمـیش (شـودراس ـ - Sudras ) ، چیـنـی كرێـكـاران و ڕەنجبـەرانـەو لە خوار هەمـوو چینـەكانەوەیە، مەبەست لە چینی كرێكاران لێرەدا ئەو چینە نی یە كە لە كۆمەڵگایەكی بورجوازیدا پەیـدادەبێت، چونكـە ڤیـداكـان ئایـدیـۆلـۆژ یەتی كۆمەڵگایەكی كشتـوكـاڵین و هەرگیـز پەنجەیان بۆ ئەم چینە ڕانەكێشاوە. بەپێی ڤیـداكـان نۆكـەرو خزمـەت كارو كەنـاس و جل شۆرو ئەو كرێكارانەی كاری دەستی دەكەن خراونەتە ڕیزی ئەم چینەوە، ئەمـرۆش چینی كرێكـارانی شارە پیشـە سازی یـەكانی هیند بەم چاوە تەماشا دەكرێن. ئەم كێشە چینایەتی یە لە كۆنەوە تاكو ئەمرۆ وەكـو خۆی ماوەتـەوە كۆمـەڵگـای هینـدی لەم سەردەمەدا هێشتا ڕەنگ و بۆی كویلایەتی پێوە دیارە. لە دێهاتەكاندا بیروباوەڕی دەربەگایەتی بەجارێ پێش خستنی كۆمەڵایەتی گۆج كردوە.

## چەند فەیلەسوفێكی هیندی

**(1) شەنكارا**

ئەم فەیلەسـوفـە لە ساڵی (788) زایینی لە خوارووی هینـد

لەناو خێزانێكی براهمن لەدایك بوە، لە گەنجی یەوە دەستی داوەتە خوێندن و دەراسەكردنی ڤیداكان ـ لە ساڵی 820 زانیین دا لە تەمەنی چل و دوو ساڵیدا لە خەڵوەتدا لەسەر چیا بەرزەكانی (هیمالایا) ئەم دنیایەی بەجێ هێشت.

ئەو سەردەمەی شەنكارای تیادەژیا گەرمەی بڵاوكردنەوەی بیرو باوەڕەكانی، ئایینە تازەكەی بودا بوو. ئەم فەیلەسوفە لاوە بەپێچەوانەی ڕۆشنبیرانی سەردەمەكەیەوە دژی فێرگەی بودیزم ڕاوەستاو بیرو باوەڕەكانی بوداشی بەلادانێكی گەورە دەزانی كە هەرگیز پەیرەوی ڤیداكانی نەكردوە. لێرەدا شەنكارا هەوڵی دا فۆرمێكی نوێتر بدات بە فەلسەفەی هیندیو بنچینەیەكی بەهێزتر بۆ ڤیداكان دروست بكات و لەم گۆڕانە ڕادیكالی یەی بودا ڕزگاری بكات ئەم فۆرمە نوێیەش ئەمڕۆ بە (مۆنیزم ـ monism ) ناسراوە.

بەرای شەنكارا تەنیا ڕاستەقینەیەك كە لە جیهاندا هەبێت، ڕاستەقینەیەكی گیانەكی یە نەك ماتریالی. ئەم ڕاستەقینەش خواوەندەو خواوەندیش یەكێكەو هەموویان لەم ڕاستەقینەیەوە دەرچوون و بەشێكن لەو.

بیرو باوەڕی شەنكارا گەلێك لە بیرو باوەڕە مۆنیزمەكەی (هیگل)ەوە نزیكە، ئەو فەیلەسوفانەی پەیرەوی پەرتوكی (گیتا) دەكەن بڕوایان وایە شەنكارا فەیلەسوفێكی ماتریالیستی یە چونكە خواوەندو سروشتی لەیەك جیانەكردۆتەوە.

دووەم خاڵ لەلای شەنكارا شێوەو سفاتەكانی خوداوەندە. هەروەكو شەنكارا دەڵێ: مرۆڤ بەم چاوە كزانەو مێشكە بچكۆڵەیەوە ناتوانێ پۆرترێتی خوداوەند دروست بكات. خوداوەند لەناو قاڵبی ڕووخسارو سفاتدا توند ناكرێت و ناخرێتە ژێر ڕووناكی زانستەكانی مرۆڤەوە.

تەنیا ئەوەندەی لەبارەوە دەزانین كە یەك خوداوەندەو هێزێكی مەزنەو خۆی ژیان و سروشتیشە. خوداوەند گیانەو لاشەشە، ژیان و ماتریالیشە ئێمەو هەموو بابەتەكانی تر لەناو سستەمە ماتریالی یەكەی گەردووندا بەشێكن لە خوداوەند.

ئەم ڕاڕەوەی شەنكارا وەكو ڕاڕەوە پانتیزمەكەی ئیبن عەرەبی و سپینوزاو هیگڵە. هەروەها وەكو (كانت)یش باسی خوداوەندو سفاتەكانی دەكات.

هەروەكو چۆن لای هێگڵ جوڵانە دیالیكتی یەكان گۆڕانی كاتیگۆریە هەمەكیەكانن و ئەم گۆڕانانە باسی وجودی تاكەكانمان بۆ ناكەن بەرای شەنكاراش ئەگەر ڕاستەقینە هەبێت ئەو ڕاستەقینەیە هەمەكی یەو بابەتە تاكەكانیش وەهمن.

بەم جۆرە لەلای شەنكارا خوداوەند جیهانی دروست نەكردوە بەڵكو خۆی جیهانە وەیا خۆی زاتەو بابەتیشە.

بەڵگەی شەنكارا بۆ قایم كردنی ئەم بیرو باوەڕەی ئەوەیە ئەگەر خوداوەند هەبێت نابێ گۆڕانی بەسەردا بێت، جا ئەگەر گریمان (هەروەكو لە گیتادا باس كراوە) بابەتە ماتریالی یەكان و گیانە ئەتۆمی یەكان لە خوداوەندەوە دەرچوون و جیابوونەتەوە، هەروەكو چۆن تیشكەكان لە خۆرەوە دەردەچن ئەوا ئەم دەرچوون و گۆڕانە دەبنە هۆی خوڵقاندنی گۆڕان و كەم كردنەوە لە زاتی خوداوەند. لەبەر ئەم هۆیەشە شەنكارا بڕوای بە بیردۆزەی (الفیض) نی یە.

هەروەها لە (ئیشو ـ ئوپانیشاد)یشا ڕوون كراوەتەوە كە دەرچوونی گیانە ئەتۆمی یەكان و بابەتە ماتریالی یەكان تۆزوكەیەك لە زاتی كریشنا كەم ناكاتەوە، چونكە ئەم زاتە هەمیشە پڕە.[16]

**(2) ڕامانوجا**

ـــــــ ڕامانوجا وەكو شەنكارا لە خواری هیند لە ساڵی (1016)ی زایین لەدایك بووەو لە ساڵی (1137)دا مردوە. ئەم فەیلەسوفە سێ شاكاری گەورەی فەلسەفی لەدوای خۆی جێ هێشتوە.

ڕامانوجا بەپێچەوانەی شەنكاراوە بڕوای بە فێرگەی دوولیزم هەیە. خوداوەندو جیهانی لەیەك جیاكردۆتەوەو بە دوو ڕاستەقینەی جیاوازیان دادەنێ لەهەمان كاتیشدا بڕوای بە گەورەیی و دەسەڵات دارێتی كریشنا بەسەر ماتریالدا هەیە. بۆ ڕوون كردنەوەی ئەم بیروباوەڕەش ڕامانوجا پەنای بردۆتەبەر پەیوەندیو جیاوازی نێوان (گیان و لەش) لە مرۆڤدا . با ئەوەشمان لەبیر نەچێت كە ڕامانۆجا وەكو شەنكاراو كانت باسی ڕووخسارو سفەتەكانی خوداوەندمان بۆ ناكات و تەنیا بە هێزێكی گیانەكی دادەنێ كە لە دەرەوەی جیهانی ماتریالیدا دەژی.

**(3) چیتانیا:**

ـــــــ لە سەدەی شانزەهەمی

زایین دا لە ساڵی (1616) لە بەنگاڵ لەدایك بوە.

لە گەنجی یەوە بیروباوەرە فەلسەفی یەکانی خۆی دارشتوەو بلاوی کردونەتەوەو خەڵکێکی زۆریش دوای کەوتون. دوای مردنیشی زۆر لە شاگردەکانی لەو بروایەدا بوون کە چیتانیا خوداوەندەو لە شێوەی مرۆڤدا هاتۆتەسەر زەوی ئەم بیروباوەری (حلول Incarnation) لە فەلسەفەی هیندیدا بۆ یەکەم جار لای قوتابی یەکانی چیتانیا باس نەکراوە. ڤیداکان لە کۆنەوە ئەم

خاڵەیان روون کردۆتەوە باسی ئەوەیان کردوە کە کریشنا (خوداوەند) زۆر جار دابەزیوەتەسەر ئەم ئەستێرەیە و ڤیداکانی بەپاکیو دروستی بۆ شاگردو عاشقەکانی شیٚ کردۆتەوە لەبەر ئەم هۆیەشە خوداوەند لەلای هیندی یەکان زۆر ناوی دراوەتێ چونکە هەر جارەی بە ناوێك وەیا لە شێوەی کەسێکدا خۆی بە خەڵکی ناساندوە.

جارێکی تر ئەوەش دووبارە دەکەمەوە لەناو ڤیداکاندا یەك خوداوەند هەیەو هیندی یەکان بروایان بە پۆلیتزم نی یە، «ئەوانەی بروایان بە دوو خوداوەند هەیە لەسەر ئەستێرەی نەزانیو تاریکی جێگەیان بۆ ئامادە کراوە.»[17]

جەوهەری فەلسەفەکەی چیتانیا لە پەرتوکی (گیتا)وە دەرهێنراوە. بەرای ئەم فەیلەسوفە خوداوەند وەکو خوداوەندەکەی شەنکاراو رامانوجا بیٚ رەنگە و بیٚ بۆن نی یەو خاوەنی هەموو سفاتێکی جوانیو چاکەیە.

وەکو مرۆڤیش خاوەنی کەسایەتی یەو (Person) شێوەشی هەیە، بەڵام شێوەی خوداوەند شێوەیەکی گیانەکی یەو لە گۆشت و ئیسقان دروست نەبوە گەردوونیش بە هەر دوو شێوەکەیەوە گیانەکی و ماتریالی لە زاتی ئەم کەسە مەزنەوە دەردەچن.

ئەم بۆچوونە میتافیزیکی یە بۆ زاتی خوداوەند لە داستانە هیندی یەکاندا جێگایەکی تایبەتیو دیاریکراوی هەیەو (کریشنا) بوە بە پاڵەوانی زۆر رووداوو کارەساتی مەزن لە ژیانی هیندی یەکاندا. وێنەو پەیکەری کریشناش لە زۆر پەرستگاو شوێنە گرنگەکاندا دانراوە. لەم وێنەنانەدا کریشنا لاوێکی جوان و گەنجەو رەنگی لەشی وەکو رەنگی هەور وایە خۆشترین کاتی کریشناش ئەو کاتەیە کە شمشاڵ بۆ (رادا)ی کچە دەستگیرانی لیٚدەدات و راداش جوانترین سەمای بۆدەکات یەکێك لە سەما بەناوبانگەکانی رادا لەژێر تیشکی مانگە شەوێکی رووناکدا سەمای (راسا)یەکە تاکو ئەمرۆ بەناوبانگە.

بەم شێوەیە مۆسیقاو سەماو گۆرانی لە ژیانی هیندی یەکاندا بوە بە فەلسەفەو ئایین، خوداوەند (کریشنا) هونەرمەندەو مۆسیقارە. ئەوانەی دوای ئەم رارەوە کەوتون لە پەرستگاکانیاندا لە کاتی نوێژکردندا گۆرانی دەڵێن و سەما بۆ کریشنا دەکەن.

1984/8/16 کەراچی.

## سەرچاوەکان


1 ـ کەنگاو جەمنا دوو رووبارن لەولاتی هیند.

2 ـ the, Upaaishads., 1977 In dia

Vitsaxis, Plate and 1984/8/16 کەراچی.

3 ـ گیتا یەکێکە لە ئوپانیشادەکان.

4 ـ3/ ز 11و Gita

5 ـ 4 ز 11 و Gita

6 ـ S. Dasa Gosvami, Reading in Vedic Literature, 1934, P. S

7 ـ الشهرستانی، الملل والنحل ـ الجزء الاول ـ لاپەرە 93.

8 ـ Sriupanishad (A. 6)

9 ـ 6/ ز 13و Gita

10 ـ 15 ز 13 Gita

11 ـ 20ز 15 Gita

12 ـ 32 ز 10 Gita

13 ـ 13ز 2 Gita,

14 ـ 23 ز 2 Gita,

15 ـ Sriusfipanishad (A . 16)

16 ـ Sri apunishad . 1)

17 ـ Sri Upanishad (A 12

# تیشكێك لەسەر گۆڤاری «روناكی»

سەرەتا 1935 ـ 1936/ هەولێر

ـ د. كوردستان موكریانی ـ

«بە بۆنەی رۆژی رۆژنامەگەری كوردیدا لە 1985/4/22دا لە كۆڕێكی فراوان دا لە بەغدا پێشكێش كرا، كە لە لایەن دەزگەی رۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كوردیدا سازكرابوو.»

بە بیروڕای من، ئێستە باری رۆژنامەگەری كوردی گەیشتۆتە ئەو پلەیەی، كە هەر گۆڤارو رۆژنامەیەكی لە قۆناخێكی مێژوویی‌دا دەوری رۆشنبیری خۆی لە نێو كۆمەڵ دا بینیوە، پێویستە تیشكی لێكۆڵینەوەی زانستانەو بابەتانەی بخرێتە سەر، هەر بۆیە بوو رۆژی یادكردنەوەی رۆژنامەگەری دوو ساڵ لەمەوبەرم بە هەل زانی بۆ ئەوەی لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی نۆبەرەی رۆژنامەگەریمان، كە گۆڤاری كوردستان بوو، پێشكێش بكەم، وا یادی بیرەوەری ئەمساڵیشم بە دەرفەت زانی بۆ ئەوەی لێكۆڵینەوەیەكی سەربەخۆ سەبارەت بە یەكەمین چاپەمەنی شاری هەولێر بخەمە بەردەست، ئەم چاپەمەنییە گۆڤاری (روناكی)یە، كە (50) ساڵ لەمەوبەر یەكەمین ژمارەی لێ بڵاوبۆتەوە، ئەم قۆناخە مێژوویی‌ەو یەكەمین چاپەمەنی چاكترین كەرەستەن بۆ روون كردنەوەی باری ئەوسای رۆژنامەگەری لە رووی دەرهێنانی و شوێنی، چاپخانەی، كارگێرانی لە پاڵ ئەوانەش دا بابەتەكان جۆری بیركردنەوەی نووسەرانی كوردمان نیو سەدە لەمەوبەر بۆ ئاشكرا دەكات، ئەم هۆیانە پاڵیان پێوە نام، تیشكێك بخەمە سەر بابەتێكی رۆژنامەگەری پەنجا ساڵ لەمەوبەر.

درەوشانەوەی تیشكی روناكی لە نێو ئاسمانی رۆژنامە ـ گەری كوردی‌دا بە قۆناخێكی مێژوویی پیرۆز دەدرێتە قەڵەم لە كاتێك دا، كە كورد پێویستی بە گەشەسەندن و خزمەت كردنی ووشەی پیرۆزی كوردی هەبووە.

پەخش بوونەوەی گۆڤاری (روناكی) لە شاری هەولێردا وای‌كرد، كەوا بۆ یەكەمین جار شاری هەولێر هاوبەشی كاروانی رۆژنامەگەری كوردی بكات، هەڵ هاتنی خۆری گۆڤاری (روناكی)و خێرا ئاوابوونی بوونە هۆی داواكردن و پێویستی هەبوونی رۆژنامە وەیا گۆڤارێك بە زمانی كوردی لە شاری هەولێردا، ئەوە بوو ناو ناوە گۆڤارێك وەیا رۆژنامەیەك لەم شارەدا دەردەچوو وەك رۆژنامەی هەولێر (1950 ـ 1953)، گۆڤاری هەتاو (1954 ـ 1961)، رۆژنامەی هەولێر لە شێوەی پەخشنامەیەك دا بوو (1962 ـ 1963)، گۆڤاری تیشك (1969 ـ 1970)، گۆڤاری چیا (1970 ـ 1971)، گۆڤاری بیری نوێ (1972)و گۆڤاری نووسەری نوێ (1972)و گۆڤاری بۆ پێشەوە (1973) گۆڤاری رۆشنبیر (1973)، گۆڤاری خانزاد (1982 ـ 1983)، ئێستەش گۆڤاری كاروان و گۆڤاری ئۆتۆنۆمی لێ دەردەچێت.

ژمارە یەكی گۆڤاری (روناكی) لە رۆژی پێنج شەممە 24ی تشرینی یەكەمی ساڵی 1935دا دوا ژمارەی لە 16ی مایسی ساڵی 1936 دەرچووەو ژمارەكانی (11) یازدە ژمارە بوون.

ژمارەی یەكەم و دووەمی گۆڤارەكە لە چاپخانەی (موصل حدیثە) چاپكراوە، ژمارە (3و 4و 5و6)ی لە چاپخانەی زاری كرمانجی لە رەواندز، بەڵام ژمارەكانی دوای ئەوانە لە چاپی زاری كرمانجی لە هەولێر[1] چاپكراون.

مامۆستا حسین حزنی بۆنەی گواستنەوەی چاپخانەی زاری كرمانجی لە رەواندزەوە بۆ هەولێرو دامەزراندنی یەكەمین چاپخانە لەم شارەدا بە هەل زانیوە، بۆ ئەوەی بەرهەمێكی وێژەی ومێژووی، كە رووداوەكەی پێوەندی بەو خاكەوە هەبووە پێشكێش بە دانیشتووانی هەولێر بكات و لە باسی (یەزدان ئوخت شەنگێكی پاكیزەی دلبەری




# فهرست



موصل له چاپخانه ی موصل حدیثه چاپ کرا

٢٤ تشرین یکه م ١٩٣٥

هەولێری)دا وتوویەتی: -

[کتێبی- یەزدان دوخت الشریفة الاربیلیة - تألیفی استاذ فاضـــل مێـژوونـووسی بە ناوبـانگ قس سلیمـان صایـغ موصـــلی، کە سالّـی 1934 لە چاپ دراوە کەوتــە بەر چاوەمـان سەربـهــوردی اجـتـمــاعـیو ملی ئەو شریـفــە هەولێـریـەمـان بە کورتی نوسیـوە، چونکـو ئەمـە یەکـەمین مجلەیـەو یەکـەمین مطبعـەیـە لە وطنی ئەو شەنگە و شوخە هەولیریەدا چاپ و بە کاربراوە، ویستم بە ناویو رەوشت و رەگـەزی ئەو نازەنینـە هەولێـریـە چەنـد دیـریـك تقـدیم بە خوێندەوارانی محترم بکەم و لە شکلی روایەتێکی کورت دا بیخەمە بەرچاوان..].

لە سەر بەرگـی دەرەوەی هەر یازدە ژمـــارەدا دیـمـــەنـی رۆژێك، کە تیشکەکانی دەدرەوشێنەوەو رووناکی دەبەخشن کێشـراوە، لەسەر دیمـەنـەکـە نێـوی گۆڤـارەکە (رووناکی) نووســـراوە، هەر لە سەر بەرگی دەرەوەی فهــرستی بابـەتـە بلاوکـراوەکـان و لاپـەرەکـانیـان تۆمـار کراوە، کە هیچی لە 12و13 بابەتی جۆراو جۆر کەمتر نەبوون. رەنگی بەرگی هەموو ژمارەکان سەوز وەیا نارنجی بوون.

لە ژمارە (1 - 6) لە ژێر پێرست دا شوێن و کاتی لە چاپدانی گۆڤارەکە بلاوکراوەتەوە، بەلاّم هەمان کلیشەش لە دێری یەکەمی لاپەرەی یەکەم دا دووپات بۆتەوە. بەرپەری ناوەوەی بەرگی یەکـــەم لە هەمـــوو ژمـــارەکـــانیدا هیچی لێ نـــەنـــوســـراوە، بەلاّم بەرگی دووەمی دەرەوەی دروشمی هەمیشـەیی رووناکی تێـدا چاپکـراوە کە برێتیـە لەمـانـەی خوارەوە: -

رووناکی رەوشت و دەستـورێکی بەرزی هەیـە رابـردوو ئێستە بە ناسین دەدا بە رەهبەرێکی باش.

رووناکی بە دلێکی خاوێن بۆ یەکێتی عراق تێ دەکۆشێ.

رووناکی ئەدەبیات و زانستی کورد کۆدەکاتەوە.

رووناکی بیرەوەری بۆ کورد دەکات.

رووناکی رەوشت و خوی کورد تازە دەکاتەوە

رووناکی ناوی ناودارانی کورد بەخیودەکا

رووناکی گۆڤارێکە لە ژمارەکانیدا دیوانی ئێستەو رابردووو فەرهەنگ و شێوەی کوردو زانستی اجتماعیات نەشردەکا.

بەلاّم بەرپەری ناوەوەی بەرگی دووەمی لە ژمارە 1 - 5 هیچی تێدا چاپ نەکراوە، لە ژمارە (6 - 11) تکایەکی هەڤالانـەو دۆستـانـەی تێدا پەخش کراوە، بۆ ئەو کەسانەی لاپەرەی گۆڤارەکە بە ووتار بەرز دەکەنەوە کەوا ووتارەکانیان تەنیا زانستیو وێژەیی وکۆمەلاّیەتی بێت.

بەشی سەرەوەی لاپـەرەی یەکـەمی هەمـوو ژمـارەکـانی گۆڤارەکە بۆ ناساندنی تەرخان کراوەو کراوەتە سێ خانە، لە خانەی یەکەم دا ئەمە نوسراوە: -

[مدیری مسؤول - محامی - شیت مصطفی

بۆ هەموو چتێك مخابەرە بە ناوی هەولێر ئیدارەخانەی رووناکی

هەر نسخەیەك بە دە فلسە.].

لە خانەی نێوەراست دا نێوی گۆڤارەکە (رووناکی): نووسراوەو لە ژێرەوەشی بەم جۆرە پێناسەکراوە: -

[کووارێکی هەفتەی علمی اجتماعی ادبی کوردیە]

لە خانەی سێیەم دا.

چۆنیەتی هاوبەشیو کرێی ئیعلانات روون کراوەتەوە. هەر ژمـارەیـەی شازدە لاپـەرەی قەوارەی لاپـەرەکـانی سێ ستـوونی بووە، کە هەر ستـوونـەی پێنـج (سم)ە، هیـچ مونتیڤ و وێنەی تێدا نییە، هەتا نێونیشانی ووتارەکانیش هەر بە پیتی گەورەی چاپ لێدراون.

گۆڤـاری رووناکی لە هێنـدیـك ژمـارەیدا هەفتانە بووە وەکو (1و2و3و8و9) وەیا لە نێوان دوو هەفتەو سێ هەفتەدا دەرچووە وەکو ژمارە (4و5و 6و10 و11)، تەنیا ژمارە (7) زۆری خایاندووە، ئەویش لەبەر گواستنەوەی چاپخانەکە لە رەواندزەوە بۆ هەولێر بووە.

**بابەتەکانی بڵاوبووی گۆڤارەکە: ـ**

مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، زمانەوانی، زانستی لەگەڵ گۆشەی ئەدەبیات و هۆنراوەی بڵاونەکراوەی شاعیران وبە سەرهاتیان، وەك ئەحمەدی خانی، مەلا عبدالرحیم مەولەوی‌و عەلی بەردەشانی، جمیل صدقی زەهاوی‌و هی تی هەروا باسی جۆراو جۆری رۆشنبیری دی وەك باسی چاپ و فرۆکەو کەشتی کراوە.

ئەو نووسەرانەی هاوبەشی نووسینی ئەم یازدە ژمارەیان کردووە، بە شێوەیەکی سەرەکی مامۆستا حسین حزنی نەمر، کە لە ژمارەکانی سەرەتای‌دا دوو لەسێی بەشی بابەتەکان خۆی نووسیویەتی، جا نووسەرانی دی هاوکاریان لەگەڵ دا کردووە، لەوانە محمد علی کوردی نەمر، شیت مصطفی، محمود فهمی، محمد جمیل رۆژبەیانی، کانی، گیوموکریانی، سعید ناکام، رەشۆ، اسماعیل حەقی، یونس مصطفی ویونس (دڵدار)، جمال احمدو هەوری وفؤاد وهی دی.

باوەکو تەمەنی گۆڤاری رووناکی لە بواری رۆژنامەگەری‌دا هەر هەشت مانگێك بووەو کورت بووە، بەڵام وەکو دەبینن کێشەیەکی زۆری باس کردووەو نووسەرێکی باشیشی لە خۆی کۆکردۆتەوە، چونکە ئاوێنەی راستەقینەی، ئەوان بووە، خواست و ئارەزووو هیڤی ئەوانی دەربریوە دروشمی خزمەت کردنی ووشەی پیرۆزی کوردی بووە، هۆی ئاوابوونی ئەم ئەستێرەیەش لە ئاسمانی رۆژنامەگەریمان‌دا هەروەکو لە مامۆستا گیوو هێندێك شارەزایانی ئەوسام بیستووە، داواکردنی گۆڤارەکە بوو، بۆ پەیدا کردنی ئاو بۆ شاری هەولێر، بەڵام لەم رۆژنەدا لە مامۆستا مستەفا نەریمانم بیست، کەوا لەو کاتەدا مامۆستا شیت مصطفی، کە (مدیری مسؤول)ی بووە، کراوە بە حاکم و لە هەولێر دوورکەوتۆتەوە.

من لەو باوەرەم ئەگەر هۆیەکەی ئەمە بوو بێت، ئەوە کردنی مامۆستا شیت بە حاکم هەر بۆ مەبەستی داخستنی گۆڤارەکە بووە، چونکە هەر لە سەرەتاوە بەر لە دایك بوونی ئەم گۆڤارەدا مامۆستا حسین حزنی زۆری هەوڵ داوە ئیجازەی دەرهێنانی گۆڤارێکی دی بدەنێ لە برێتی گۆڤاری زاری کرمانجی، بەڵام بە هیچ جۆر هەوڵەکانی سەری نەگرتووە، بۆیە مامۆستا (شیت)ی رازی‌کردووە، بەوەی ئەو ئیجازەکە وەربگرێت و لێ‌پرسراوێکەی هەر بە ناو بە ناوی ئەووەوە بێت و هەموو ئەرك و هەڵ ـ سوورانەنەکەش بە ئەستۆی (حزنی) یەوە بێت، بەم جۆرە ئاواتەکەی حزنی هاتە دی، بەڵام زۆری نەخایاندوو خۆشی لە هەولێر دوورخرایەوەو بە دەست بە سەری هێنرایە بەغداو هەر لە بەغدادا دوا ماڵ ئاوایی لە جیهانی رۆشن کرد.

گۆڤاری (رووناکی) وەکو هەر گۆڤارو رۆژنامەیەکی کوردی لە لایەن رۆژنامە نووسانەوە بایەخی دراوەتێ‌و هێندێك جار لە چەند لایەنێکەوە باسی‌کراوە.

بۆ وێنە کاك عبدالجبار محمد جەباری لە (مێژووی رۆژنامەگەری کوردی)دا[2] بە کورتی باسی کات و شوێنی دەرچوونی گۆڤارەکە دەکات و لە کۆتایی‌دا دەڵێت: ـ

[.. گۆڤارەکە باسی مێژوو، کۆمەڵایەتی‌و ئەدەبیات و سەرگوشتەی شاعیران و ئافرەتانی کوردی ئەکردوە هەر وەها گۆشەی زانیاری دەرون و هەوال و باسی ناوخۆو دەرەوەی فەرامۆش نەکردبووە مامۆستا جەمیل رۆژبەیانی‌و حسین حزنی موکریانی بە هەموو جۆرێك نوسراو ووتاریان تێدا بڵاونەکردەوە، گەشەیان دابووە گۆڤارەکە، ل ـ 90 ـ 91).

کاك جەمال خەزنەداریش لە نێو بەرهەمی (رابەری رۆژنامەگەری کوردی)دا[3] بەم چەند دێرانەی خوارەوەو یادی ئەم گۆڤارەی کردۆتەوەو دەڵێت: ـ

[روناکی ـ گۆڤارێکی هەفتەیی علمی واجتماعی‌و ئەدەبی بووە، لە شاری هەولێر دەرچووە، خاوەن سەر نووسەرو بەرپرسیاری پارێزەر شیت مستەفابووە، ژمارە یەکی لە رۆژی پێنج شەممە 24ی تشرینی یەکەمی ساڵی

1935 دەرچــووە، دوا ژمــارەی لە ڕۆژی 16ی مایــسی ساڵی 1936 دەرچووەو پەکی کەوتووە.
ئەوەی پێویستە بوترێ ئەوەیە، کە لە ڕاستیدا حوسین حوزنی موکـریـانی ئەم گۆڤارەی دەردەکردو بەڕێوەی دەبرد، لاپەرە 37].

**دەنـگ دانـەوەی بڵاوبـوونـەوەی گۆڤـاری ڕووناکی لە نێو ڕۆشنبیرانی کورددا**

لەبەر ئەوەی لە ساڵانی سی‌دا، بەرهەمی ڕۆژنامەگەری کوردی، لەچــاو ساڵانــی بیــست دا لە ڕووی ژمــارەوە کەم بووە، بە تایبەتی لەو کاتەی، کە گۆڤاری ڕووناکی تێدا بڵاوبوٚتەوە، هەر تاکە ڕۆژنامەیەکی کوردی هەبووە، کە بە بەردەوامی پەخش دەبــۆوە، ئەویش ڕۆژنـامـەی ژیـان بوو (1926 ـ 1938)، بۆیە دەرچوونی گۆڤاری ڕووناکی لە نێــو ڕۆشـنـبـیـرانـی کورددا دەنـگـی داوەتــەوەو لە نێــو بەرهـەمـەکـانیان دا چ هۆنراوە بوو بێ‌و چ پەخشان هەستی خۆشی خۆیـان دەربـڕیـوە، بۆ وێنـە دڵداری نەمر بە بۆنەی بڵاوبــوونــەوەی گۆڤـاری ڕوونـاکی هۆنـراوەیـەکی نایـابی هۆنیوەتەوەو لە ژمارە دووی لاپەرە دوازدەی‌دا بڵاوکراوەتەوەو وتوویەتی: ـ

**ڕووناکی ناوت چەندە لام خۆشە**
**عالەم بە سایەت ژیرو بە هۆشە**
**وا زوڵمەت ڕۆیی دەرهات ڕووناکی**
**بە عیلم و فەن و ڕووخساری پاکی**
**بە سایەی ڕووناکی هەڵستاین لە خەو**
**بە ڕێمان ێنخست نەحسی شومی شەو**
**مژدە بێ وەتەن خاکت ڕووناك بوو**
**بە سایەی شەوقت لاوت چالاك بوو**
**ڕەشی شەو ڕۆیی لەسەر کێوانت**
**ڕووناکی جێی گرت لە ڕووی جوانت**

**ئومێد پەیدا بوو، بڵاوبێتن فەن**
**بنوێنین خزمەت گوزاری وەتەن**
**مللەت! ڕووناکی مایەی ژیانە**
**نەوبەی چالاکی لاوی جەوانە**
**ئەوجا سەیرکەن هونەری قەلەم**
**تاکو بەرزکەن عیراق و عەلەم**
**خودا! ڕووناکی دوورکەی لە شقاق**
**شعلە بەخشی‌کەی لە خاکی عراق**
**هەولێر: ی، دڵدار**

ژمارە (2)، لاپەرە (12)
هەر سەبارەت بە دەرچوونی ڕووناکی ڕۆشنبیرێکی دی لە ژێر نازنێوی (ڕزگاربوو)دا بەرهەمێکی بە پەخشان، لە ژمـارە (3)ی لاپـەرە (8و9)دا بڵاوکـردوٚتەوەو لەم ووتارەی‌دا کە بە نێوی (بە ڕووناکی سۆران ڕووناك بوو)، ، ووشەی وا واتـادارو ئاگـریـنـاوی بە کار دێنێت، بەڵگەی تینوێتی لاوی کورد بۆ ڕۆژنامەیەك، گۆڤارێك وەیا هەر پەخش نامەیەئ کوردی دەدات و و لە سەرەتادا دەڵێت: ـ
[لە مێژەوە بوو، باسی دەرکەوتنی گۆڤارێکم بیستبوو، لە ناوچەی لیوای هەولێر بە ناوی (ڕوناکی)و لە زووەکەوە بوو چاوەڕێی هەڵاتنی ئەو گۆڤـارەم ئەکـرد، کە وولاتـەکـەم پێ ڕوناك بێت و مێشکم پێ ڕون بێت.
سوپـاس بۆ خودا وا ئەو گەلاوێـژە هەڵات و برینێـك لە برینەکانم سارێژ بوو و گوڵی هیوام گەشایەوە..].
(ڕزگاربوو) هەر لەم ووتارەی‌دا هانی ڕۆشنبیرانی کورد دەدات، بۆ ئەوەی پشتگیری ئەو گۆڤارە بکەن و بە بەرهەمی بیریان دەوڵەمەندی بکەن و بە هەموو هۆیەك دەستی‌بگرن و یارمەتی بدەن و دەڵێت: ـ
[.. ئەم گۆڤــارە بۆ کێ دەرئــەچــێ؟ بۆ هەمــوو کورد

ـمـن و کوردی زان. بەڵێ ئەم گۆڤـارە راستـەو راست بۆ ـەون دەرئەچێت و بۆ خزمەت و پێش خستنی ئەوانە..

ئیتـر لەمـەولا ئەوانـەی، کە خۆیـان بە کورد خواهـ ـ ئەنێن و بە وەتەنی ئەژمێرن، بێت و خزمەتی ئەم گۆڤارە ـکـەن، ئیتـر لای عالـەم مەعلوم ئەبێ، کە هیچن و بۆ حزمەتی ئەم خاك و مللەتە نین..].

وا دیارە ئەم ووتارەی (رزگاربوو) کاریگەر بووەو بابەتانە ـمە کێشـەیـە دواوە، بۆیـە دەنگێـك لە بەغـداوە بە هاواری هـتـووەو پشتگیـری داواکـارییە رەواکەی‌کردووە، ئەم دەنگە ـەنگی دلێـری محـەمـەد عەلی کوردی بووەو[4] لە لاپەرەی ـۆیەم و دەیەمی ژمارە پێنج دا ووتویەتی: -

[ژمارەی سێیەم لە مجلەی روناکی چاوپی‌کەوت، دیتم ـرە لە مەقالەی تاریخی‌و ئەدەبی‌و ئیجتماعی، ئینجا ئەبێ ـۆر تەشـەکـوری مودیـرو موحـەریرەکانی بکرێت لەبەر ئەم خزمەتە چاکە، کە بۆ هاوزمانی خۆیان کردویانە.

لە لاپـەرەی هەشتـەم و نۆیـەم، مەقـالـەیەك نوسرابوو، خاوەنەکەی سوپاسی رووناکی ئەکات، و غیرەتی نیشتمانی کورد ئەبـزوێنی بۆ ئەمـە بە ماڵ و دڵ یاریـدەی رونـاکی بدەن، هەتا گەورە بێت.

ئەزانم قسـەکـەی حەقـە، بۆیە منیش تصدیقی ئەکەم و ئەم چەند ووشەیە بۆ هاوزمان و هاو وولاتی خۆم ئەنێرم، هەتا - روناکیان - لە بیر نەچێتەوە..].

دیسـانـەوە لە بەغـداوە (هـەوری) هۆنـراوەیـەك بە نێوی (شەماڵ) بۆ کارگێرانی گۆڤاری رووناکی دەنێریت و تکای لێ‌دەکـات بەرەو بارەگـەی پیـرۆزی روونـاکی هەڵ بکات و نامـەکـەی بگـەیەنێتە نووسەرانی‌و بەم جۆرە دەخیلی دەبێ‌و دەڵێت: -

شەماڵ دەخیلتم وەك شێری دلێر
راپەرەو بچۆ بۆ شاری هەولێر
مەترسەو برۆ زۆر بە چالاکی
رێگە ون ناکەیت تیشکی (روناکی)
ئەدرەوشێتەوە لە نزیك لە دوور
رووناکە وەك رۆژ هەتا شارەزوور
کاتێ گەیشتیە (کۆنە شارمان)
روناکی روونی نیشتمانمان

★ ★ ★

کە دیتت گەنجێ لە تەك پیریکا
دانیشتبوون هەریەك، بوو لە بیرێکا
خۆیانن دەخیل وەك گەدا سەد جار
داوێنیان بگرەو جا بڵێ بە زار
(هەوری) ئەی‌ناڵان وێنەی کەبوتەر
زوخاو نۆشی بو سیپالی لەبەر
کاتێ گەیشتیە گوڤار رووناکی
خاڵی بوو لە غەم دڵەی غەمناکی
تکاوا ئەکا لە یەزدانی پاك
گەش بێ، تا مردن وەك رۆژی روناك

ژمارە (8)، لاپەرە (6)

هەروا رۆژنـامـەی (ژیـان)یش خۆشی خۆی بەرامبەر بە دەرچـوونـی گۆڤـاری (روونـاکـی) بەم جۆرەی خوارەوە دەردەبرێت: -

[چـاوەروانـی رونـاکـی) بویـن خوا بیـهـیـلی چاوی رون کردینەوە لە ژیان دا نوسی‌بومان کە شەوێکی بەهار لە هەلـەبجـە دوو بولبـول بەرابـەری یەکـدی دەیان خویند من ئاواتی دوو رۆژنـامـەم لێ‌خـواستن وا رونـاکیمـان دانـا بەو بولبولە کە لە هەولێرەوە رووبەرووی ژیان بخوینی بەلام لە پەردەی مللی‌و کوردی‌دا واز لە شکسپیرو لیرج و هارتمان و وایسباخ بێنێ چاری دروست لە چاپدانی بکا چونکو ئەوی سەرپەرشتی دەکا دەزانین هیندە بە هونەرە دەتوانی صنعتی چاپ ایجـاد بکـا کەوابی بوچ غلط طبعی ببێ. ژمـارە )46، ل - 5].

## زمانی کوردی لە گۆڤاری رووناکیدا

بڵاوبوونەوەی بەرپەرێکی چاپ کراوی کوردی، خزمەتی زمانەکە دەکات، جا ئەگەر گۆڤارێك بێت و پەنجا ساڵ لەمەوبەر پەخش کرابێت، ئەوا دەورێکی گەلێك باڵای لە پێش خستن و پەرەسەندن و پێشکەوتنی زمانەکەمانی دیوە، چونکە بە هۆیەوە بابەتی جۆراو جۆر بە کوردی نوسراوەو مێشکی لاوانی پێ زاخاو دراوەو لەگەڵ ئەوەش دا هەر لەسەر لاپەرەی ئەم گۆڤارەدا نووسەران خۆیان هانی یەکتریان داوە، بۆ ئەوەی بە زمانی کوردی بابەتی هەمەرەنگ بنوسن، وەنەبێت ئەم گۆڤارە هەر بۆ ئەو کەسانە بووبێت، کە لە کۆنەوە بە زمانی کوردی نووسیویانەو بەڵکو هانی خوێندکارانی داوە بۆ ئەوەی ئەوانیش بە زمانی کوردی بەرهەمی بیریان بڵاوبکەنەوەو بۆیە دەبینین لە ژمارە (9)و (10)دا لاپەرەیەك بە ناوی (لاپەرەی قوتابی) تەرخان کراوە وبە شێوەیەکی سەرەکی یونس مصطفى بە بەرهەمی بەپێزی خۆی پری کردوتەوە.

لەگەڵ ئەوانەش دا هەر چ چاپەمەنێك، کە بە زمانی کوردی لەو کاتەدا بڵاوبوتەوە، لە ژێر ناوی (مطبوعاتی تازە)دا بە خوێنەران ناساندراوە، بۆ وێنە لە ژمارە (2)دا باسی سێ کتێبی تازە چاپکراو کراوە، کە (میرانی سۆرانی حسین حزنیو بەرهەمێکی قوتابخانەی شاکر فتاح و ئەلف و بێی سعید فهیم)، [5] و لە ژمارە حەوت دا باسی کتێبی حسابی پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی دەکات، کە لە لایەن مامۆستا رەفیق حلمی نەمرەوە داندراوە کتێبی چل فەرموودەی پێغەمبەر، کە لە لایەن مەلا محەمەدی نزلچی چاپکراوە.

گۆڤاری (رووناکی) بابەتی زانستی زمانەوانیشی پەخش کردووە، کە سەبارەت بە زمانانی گێتی (عالم)دا بووەو ئەو زمانانەی سەر بە کامە خێزانن روونی کردوتەوەو تیشکێکیشی خستۆتە سەر زمانی کوردی.

لەپاڵ ئەوانەش دا گۆڤاری (رووناکی) هەوڵیداوە بابەتی وەرگێراویش بە زمانێکی کوردی پاراو پەخش بکات، وەك ووتاری (ناپلیۆنی رەش) لە ژمارە (4)داو ئاگر پەرست لە ژمارە (5)و (6)داو یەزدان دوخت لە ژمارە (7)ەوە تا (11).

رێنووسی گۆڤارەکە هەروەکو رێنووسی چاپەمەنی ساڵانی بیستە، راستە گۆران بە سەر شێوەی نووسینی هێندێك دەنگی وەك (پ، چ، ژ، ڤ وگ)ی دا هاتووەو لە ساڵانی سیدا بایەخ، بە سەرو ژێرو بۆر دراوە، بەڵام هێژ چارەسەری ئۆو یێ کراوەو کورت و درێژنەکراوە (ل)و (ر)ێی سووك وگران هەروەکو یەك نووسراون، ئەمەش چەند دێریك لە بەرهەمی چاپکراوی گۆڤارەکە: -

**مطبوعات تازەی کوردی**

[لە لاین جنابی رفیق حلمی بگ مامۆستای مکتب متوسطە بغداوە کتێبیکی حساب لە سەر نفقەی خوی چاپ کردووە. بۆ شاگردانی ریزی پێنجەم وشەشەم گەلیك باس و سودمەندە اومید ئەکەین بە هەوس و خوشی زوو بیکرن تاکو یك دو تألیفاتی دیکەش بە دەستەوەیە زو بیخاتە چاپەوە. (رووناکی، ژمارە 7، لاپەرە 16].

بابەتەکانی بڵاوبووی گۆڤارەکە شەقڵ و تایبەتێتی زمانەکەمان لە نیو سەدە لەمەوبەر پێشان دەدەن، نووسەرانی بابەتەکان هەوڵیان داوە بە کوردیێکی سادەو رەوان بنووسن، بۆ ئەوەی خوێنەران تێیان بگەن، لەگەڵ ئەوەش دا چەند ژمارەیەکی ووشەی عەرەبی تێدا بەدی دەکرێت وەك [مطبوعات، اجتماعیات، اقتصادیات، ادبیات، اخلاق، کلمة، تاریخ، مستقبل، اعلان، تأثیر، وطن، تجدد وهی دی].

لە پاڵ ئەوەش دا هەوڵ دراوە ووشەی کۆنی کوردی و ووشەی تازە دارێژراوی وەك (فرۆك) نیشتمان، پێرست، دێریك، مێژوو، زانست، شێوە، وێنەکێشان وهتد بە

ـێ ـهێنرێت.

ـه ژمارەکانی سەرەتای گۆڤارەکەدا (بۆزانین) اعلان بە ـمنی تورکیو عەرەبی بڵاوکراوەتەوە، بەڵام لە ژمارەکانی ـوی‌دا بە زمانی کوردیش پەخش کراوە.

## وێژە لە گۆڤاری رووناکی‌دا

---

گۆڤاری (رووناکی) بایەخێکی زۆری بە هەموو لایەنی وێژە، لە چیرۆك، هۆنراوە، پەخشان، رۆمان داوە لە پاڵ ئەوانەش دا لە سەر لاپەرەی هێندێك ژمارەکانی‌دا ووتاری سەبــارەت بە مێـژ ووی ئەدەبیاتی کوردی بڵاوکـردۆتـەوە، هەروا هێنـــدێــك جار بە سەر هات و لێکـدانـەوەی ژیـانی شاعیــرو ئەدیبـانی کوردی، وەك عەلی بەردەشـانی، مەلا عبــدالــرحیم مەولــەوی‌و عبـدالله بەگ مصبـاح الـدیـوان (ئەدەب) ئەحمەدی خانی وهی دی. بڵاوکردۆتەوە.

ژمارەی ئەو چیرۆکە کورتانەی لەم (11)یازدە ژمارەیەی گۆڤـارەکـەدا بڵاوبـوونـەتـەوە، کە من، بیـری سەرەکییـان رووداوو بە سەرهــاتی کەلــەپــوورین، بەڵام لە شێــوەی چیـرۆکێکی هونـەری‌دا دارێـژ راون، لە پاڵ چیـرۆکیش دا پارچە پەخشانی هونەری ناسك بڵاوکراونەتەوە.

لە ژمــارە (7و9و11)ی گۆڤـاری روونـاکی‌دا لە لایـەن محەمەد عەلی کوردی نەمرەوە بەشێك لە رۆمانی (نازدار) ویـا (ژنی کورد لە لادێ)دا[6] بڵاوکـراوەتـەوە، مامـۆستـای نێوبراو لە ژێر نێونیشانی‌دا نووسیویەتی (رۆمانێکی کوردییە لە (100) لاپەرە نووسراوە).

نووســەر رۆمـانـەکـەی کردۆتـە چەنـد بەشێـك، بەشی یەکەمیان چووار وێنەی بۆ کێشاوە.

1 - (مەنزەرەی لادێ هندێ جار)

2 - (شەو رابواردن) (شەوچەلە).

3 - زۆرەبانی).

4 - رۆژێ لە بەهار، بەڵام بەشی دووەمی هەر یەك وێنەی لێ بـڵاوکـراوەتـەوە ئەویش (شـەرو تاڵانـە)و بە بەرنەچوونی گۆڤارەکە، رۆمانەکە هەروا تا ئەمرۆ بە نیوەچڵی ماوەتەوە.

محمد علی کوردی لەپێشەکی رۆمانەکەی‌دا دیمەنێکی دڵگیـری دێـەکـەمـان بۆ دەکێشیت، کە ژمـارەی ماڵەکانی نێــزیکــەی سی - چل ماڵ دەبێـت، هەروا تابلۆیــەکی نەخشینی لادێیکــان لە کاتی پێشــوازی کردنی مێگــەڵــە مەریان و مەر دۆشین لە دەمی ئێواران دا بۆ دەنوێنێت.

پاڵــەوانی چیـرۆکەکە نازداری کچی میرزەینەدینی ئاغای دێــەکــە، گەنــج و لاوانی دێــەکـە شەوان نەدەچـوونـە دیوەخانە، بەڵکو خۆیان لە نێو خۆیان دا کۆ دەبوونەوەو بە یاری‌کـردن و پێکـەنین شەویـان دەبردە سەرو کچ و کورانی لادێ وایان کرد دینۆو نازدار زۆرانبازێ بکەن و لە ئەنجام دا نازدار بە فێڵێك سەرکەوت و بۆ ئەوەی ببێتە میری لاوان، لەگـەڵ ئەوانـەش دا دیمـەنی دی لادێ دەکێشێت و لەوانـە چوونە دەشت و دەرو دەڵێت: -

[.. سبـەینێ پێش رۆژهـەڵاتی دیتمـان - دینـۆ - میری لاوان بە ناو گوندی‌دا دەگەرێ‌و یەك بە یەك کوررو کچان بە ناوی خۆیــان بانـگ ئەکـات. حەمـوومـان لە یەك جێگـە کۆبــووینـــەوەو گەیشتینـە (30) کەس، هەرە بچـووکمـان عومری لە (12) ساڵی کەمتر نەبوو، بەڵام کەسی بە ژن و ماڵمان تێدا نەبوو، یەکسەر حەمووومان رۆیشتین بۆ (دۆڵی ژیان) وەکو شەو قەرارمان دابوو.

هەر کەســە نیــو رۆژی خۆی: دوو نانــی گەنـــمــی تەنـدووری لەگـەڵ نەختێ رۆنی‌کـەرە، یان نەختێ پەنیری زستان پیچاوە، خستیە ناو (تورەکەی) ملان.

لەو دەرودەشتــە بڵاوبــووینــەوە دەستمـان کرد بە کنگـر هەڵ کەنـدن، دوسـاعتی پی‌نـەچـوو حەمـوومان تورەکەمان پرکرد، وەختی رۆژ لە چاوی چەپ لای‌دا بۆ چاوی راست. حەمــــومـــان لە دەشـتێکی سەوزو شینی ئاوداردا، لە سەر سەرچاوەی ئاوێکی سپی بۆ نیوەرۆژ خواردن کۆ

بووینەوە. . ].

ئەلبەت ئەم دیمەنە هێورو هێمنەی لادێکە، هەروا بەردەوام نەبووە، چونکە خەسرەو خانی ئاغای دێیەکی نێزیکیان هاتبوو دەوروبەری گوندەکەیان و خەریکی پەلاماردان و تالان کردنیان بوو، بەلام دانیشتوانی دێ بە ژن و پیاوەوە هەموو لە زینەدینی ئاغای خۆیان کۆبوونەوەو توانیان خەسرەوخان بەزێنن.

ئەوەی لەم بەشە بڵاوکراوەی ئەم رۆمانەدا سەرنج راکێشە، پاڵەوان هەر ئاغاو ئاغازن و کچی ئاغان، بە دەگمەن باسی لادێیەکان دەکرێت و رۆڵی هەرە گەورە هەر بەوان دراوە، بەلام مسکین و هەژار ورەنجدەر ئەوەندە بایەخی نەدراوەتی و دەوری پاڵەوانی ئەوتۆشیان پێ نەسپێردراوە دوور نییە لەو بەشەی، کە هێژ چاپی نەدیوە دەوری بە جووتیارانیش دابێت.

گۆڤاری (رووناکی) هەوڵی داوە، ئەو پارچە هۆنراوانە بڵاوبکاتەوە، کەتا ئەوسا چاپ نەکراون، بۆ وێنە لە ژمارە (11)دا لە لاپەرە (6)دا لە پێشەکی پارچە هۆنراوەیەکی حاجی قادری کۆیی‌دا ئەم چەند دێرانە تۆمارکراون: -

[حاجی قادر لە دەوری جەوانی‌دا شعری عاشقانەی زۆر گوتووە، ئەو شیعرانە، کە لە دیوانە چاپ کراوەکەی دا نیە، ئەمەیە لەم گوارەدا دیوان بە دیوان پەرتی دەکەین و ئەمە غەزەلێکی خۆش و شیرین و پڕ مەعنایەتی: -

سەبارەت بە عەلی بەردەشانیش لە ژمارە (8)دا نووسیویەتی: -

[عەلی هەر دێریك و سەر بهوردێکی گەورەکانی کوردی بیستبێتوو زانی بیتەوە، بە شیعر هەڵی بەستووە، بەلام هەرچەند نەش نوسرابێتەوە لە زبانان دا بەخێوکراوەو لە مەجلسان دا بە دەنگ و ئاوازە خوانی بێژراوە].

بایەخ دانی گۆڤاری (رووناکی) بە بەسەرهات و هۆنراوەی مەلا عبدالرحیم (مەولەوی) بۆتە هۆی سەخلەتی و نیگەرانی پیرەمێردی نەمر، چونکە پیرەمێرد ماوەی سێ ساڵێك بووە خەریکی ساخ کردنەوەی هۆنراوەو بە سەرهاتی مەولەوی بووەو حەزی نەکردووە یەکێکی دیش خۆی پێوە خەریك بکات. مامۆستای نێوبراو ئەم هەڵوێستەی لە سەر ووتاری رۆژنامەی ژیانی (25)ی نەیسانی ساڵی 1936ی ژمارە (476)دا بڵاوکردۆتەوە، بە نێوی (بۆ جەنابی حسین خوزنی ئەفەندی مکریانی محترم]و دەڵێت: -

[لە ژمارە (7)ی رووناکی‌دا (سەربەهوورد)ی مەولەوی‌و چەند شعرێکی ئەوتان نوسیوەو دەفەرموون دیوانی مەولەوی ئامادەی طبع کردنە.

جارێ با ئەمەتان لە پێشەوە پێدا رابگەیەنم، کە بەندە سێ ساڵە خەریکی دیوانی مەولەویم، کە تێی‌بگەم.

ئینجا لە چاپی بدەم بە سێ ساڵ. ئینجا روحی مەولەویم بۆ کەشف بوو لەگەڵ ئەمەیش دا، کە بە زبانی هەورامی شعرم هەیە.

دووەم بە دەستووروو ئارەزووی سەید محەمەدی نەوەی مەولەوی، دیوانی مەولەویم بەشی زۆری چاپ کردووەو دەفەرمویش بڵاوکراوەتەوە زۆریشی لێ فرۆشراوە راوەستاوم بە سەر یەکەوە بڵاوی بکەمەوە.

سەیەم: - جەنابتان شارەزای (مێژوو - چیرۆکن) مەولەوی شاعیرە، ئەو چەند دێرەی، کە بۆ سەر بە هوردی مەولەویتان نوسیوە هەونییە، تەرجەمەی حاڵی مەولەوی کە لە کورەزاکەیم وەرگرتووەو نەشرم کردووە، ئەمەی تیا نییە. . .

هەروا مامۆستا پیرەمێرد بەردەوام دەبێت و لە کۆتایی‌دا دەڵێت: -

. . . . بەلام رەنجی زۆرم لەگەڵ مەولەوی داوە ورووحی مەولەوی لە ژیان شادە، ئەو شێوەیە هەر بۆ ژیان رێدەکەوێ، هەموو شێوەی موکریان وهەموو مێژوو سەربەهوردو چیرۆك و تاریخ بۆ جەنابتان].

مامۆستا حوزنیش لە ژمارە (11) لاپەرە (10)دا لە ژێری نێوی (راستەکەی)دا بەم جۆرە وەڵامی مامۆستا

پیرەمێرد دەداتەوە: ـ

[استاذی فاضل، ئەدیبی عاقل، فەیلەسوفی گەورە، پیرەمێردی کامل، رەئیسی جەمعیەتی زانست و رەهبەری لاوان، خاوەنـد نان و خوان، هەم شانـی ماقـول، بە عزەت و شان، تاقانەی سلێمانی، عالی زەمان، بە پشت و بەهێـز، مدیـری (ژیـان) جەنـابی حاجی توفیق بەگ.

ویستم بەم دو کەلیمەیە دڵ رەنجی خومتان عەرزکەم: ـ

[. . . ئێمـە بە ناشـوکـر بێ هێشتا نەبـووینەتە خاوەند مطبعـەو رۆژنـامـەیـەك، کە وەکـەمتـرین رۆژنامەو پیسترین مطبعـەی مللەتـە بێجێو رێگـاکـان بچێ. وبێنینە وجود، وهێشتا نەبـوینـەتـە صاحبی لاپەرەیەك کە سودی تێدابێ. لەبەر نیفاق و خۆخۆریو نەکێشان و حەسودی، مطبعەکەی ئێـوە هێشتـا ئەو مطبعـەیـە کە مێجـەرسـۆن لە سلێمـانی دایمـەزرانـدوومـاوە. ومطبعـەکـەی منیش لەوە پتر، کە بە نووکی قەلەمی حەکاکی لە حەلەب رێکم خستبوو، هیچم لەسـەر زیـاد نەکـردو وەهەر پەرێشان وبێ ئەسبابەو رووت و قوتەو بێ حروفات!

لەبـەر یەکتـر خستن و پاڵ پێکـەوەنـان و ئەزیـەت دانی یەکتری نەپەرژاوینە سەر تالیفات و مطبوعاتێکی وا بەخیلی بە یەك ببەین و. .].

## مێژووی کورد لە گۆڤاری رووناکیدا

(رووناکی) هەر لە یەکەم ژمارەیەوە، بایەخێکی زۆری بە مێـژووی کورد داوە، لەو روانگـەوەی، کە زانستی مێژوو زانستی هەمـوو زانستـانـە. ئەو بابـەتـە مێژووییەی بڵاوکراوەتەو مێژووی کەسان وپاڵەوانان و میران نییە، بەڵکو مێـژووی گەلـەکـەیـە هەمـوو. بە شێـوەیـەکی سەرەکیش تیشـك خراوەتـە سەر مێـژووی کۆنـی کوردو بە نێـوی (کـۆمـەڵـەی نەژادو بنەچەکەی کورد) پەخش کراوە، ئەوەی شایەنی باسە لە خاکی کوردەواریدا هەر کۆمەڵێکی تێیدا نیشتـەجێ بوویێت، تا رادەیـەك هاوبـەشی دروست بوونی نەتەوەی کوردی کردووەو لە سەردەمێکی مێژوویی‌دا دەوری کەلچەری خۆی تێدا بینیوە، بۆیە دەبینین لە باسی کاردا وەیا کاردو، خالدیو کیرتی وەیا کارتوایە یان کرتاوپە دەست بە مێژوونووسین کراوە، لەگەڵ ئەوەش دا رووناکی تیشکی خستـوتـە سەرهێنـدیـك رووداوانی مێـژوویی سەردەمـانی دیش، لەو ژمارانەی، کە باسی بابەتی مێژووی تێدا بەدی ناکـرێت، بابـەتی کۆمەڵایەتی جۆراو جۆری پێویستی تێدا پەخش کراوە وەك (پێویستانی ئادەمیزاد چییە لە سەردەمانی دێرینەوە، تا ئەمرۆ) لەو، رووداوە گرنگە کۆمەڵایەتیانەی، کە ئەوسا کێشەیەکی ئاشکراو دیار بووە، کێشەی رەوەندان بووە، لە ژمـارە (9) لاپـەرەی (1)ی‌دا ووتـارێـك سەبـارەت بەو بابـەتـە بڵاوکـراوەتـەوە بە نێـوی (عشـایـری رەوەندی کورد اسکان بن چاکترە، یان بە رەوەندی (رحالە) بمێننەوە؟!] لە دوای روون کردنەوەی زۆر لایەنی خراپەی رەوەنـدایـەتی بۆ رەوەنـدان و نیشتـەجێ بووان خاوەن ووتـار دەگـاتـە ئەو بریـارەی، کە پێـویستـە رەوەنـدەکان نیشتەجێ بکرێن و دەڵێت: ـ

**[بـۆ مصلحت و منفعتی عامـە اسکـان کردنیـان و لەو خاکـانـەی کە هی (میـری)و خالین دامـەزرانـدنیان زۆر بە کەلك تر دێتە بەرچاوان لەوە کەوا گەرمین وکوێستان بکەن. چونکو نەخۆیان لەو ژیانەو هات و چوونە خێر دەبینن و نە بوکـەسیش بە کاردین و نەبـو رۆژێـك دەبنـە مال و دەکەونە مەیدانی سەرکەوتن وبەرز بونەوەو مەدەنیەتدا هەروا بێ رێو جێ وبێ ملك و خاك و وطن گەران و سوراندنەوەیکی بی سودە جیکای ئەسفە. .].**

ئەوەی شایـەنـی باسـە ئەو ووتـارە مێـژوویـیو کۆمەڵایەتییانەی بڵاوکراونەتەوە، هەمووی لە لایەن مامۆستا حسین حزنی نەمرەوە نووسراون و بۆ نووسینەکانی سوودی لە دەیـان سەرچـاوەی خۆمـانیو بێگـانـە وەرگـرتـوە، وەك

ئلیرچ، مینورسکی، هەرتمان و نولدکەو وایسباخ و سەرجان مالکم وهی‌دی. . .

## بایەخ دان بە منداڵ و بە لاوان

منـداڵ وەکـو خونچـە گوڵێکی کەژی بەهـارە، ئەگـەر باخەوانەکەی شارەزاو کارامە بوو، ئەوا چالاکانە ئاوی دەداو هەموو پێویستێکی بووژانەوەو گەشانەوەی بۆ ئامادە دەکات، ئەگـەر باخـەوانـەکـە خۆی بە تەنگـەوەی خۆی نەبوو، ئەوا خونچـە گوڵـەکـەی سیس دەبێت، هەر لەم بیـرکردنەوەیەوە رووناکی بایـەخی بە منـداڵ داوەو بابـەتی جۆراو جۆری سەبارەت بە منداڵ و بە لاوان بڵاوکردۆتەوە.

ووتاری بڵاوبووی نیوگۆڤارەکە، ئەوە دەسەلمێنێت، کەوا کێشەی نێو دایك و باوك لە خێزان دا، کە بنکەی کۆمەڵی لەســەر بنیـات نراوە کاریگـەرێکی زۆری بۆ سەر منـداڵ و لاوانی نێو خێزانەکە هەیە. رۆشنبیریکی نیو سەدە لەمەوبەر بە نێوی (جەمشید) هۆنراوەیەکی نایابی سەبارەت بە باری ناهـەمـوارو ناکـۆکی نێـو خێزان و بایەخ نەدانیان بە منداڵی خسـتـۆتـە رووو ژیـرانـە لە ژمـارە 3 ـ دا بە نێـوی (شینی منـداڵی) گلەیی خۆی ئاراستـەی دایـك و باوکان دەکات و دەڵێت: ـ

**کوانێ قسەی خۆش، کوا گاڵتەو گەمە؟**
**کەی خوێندوتانەوە شعرێکی ئاودار؟**
**بۆ چیروکێك لام سەد لیرە کەمە**
**پەندی پێشینان، مەتەڵی ناودار**
**کوا دیاری‌و داهات، کوانێ خەلاتت**
**سزای پێشەنگیم، لە امتحان دا**
**کەی هێشتت بابە (یاری)یەك بکەم؟**
**یان بچمە سەیران لەگەڵ دۆستاندا؟**
**دایکم لاسارو تۆش بە تورەیی**
**دەرو ژورتان پرکرد لە قیژە**
**دایکم نەزان و تۆش هەر پرو پووچ**
**لە گەڵتا نەکرد کاری جوامێری**

هەر سەبــارەت بە منــداڵ گرنگتــرین باس دەربـارەی بارێـکـی سەردەمـی منـداڵـی خراوەتـە روو، کە ئەویش ترسنۆکی منداڵانەو قوتابییەك لە ژێر پیتی (ف. م.)دا لە ژمارە (6)دا باسێکی زۆر گرنگ و بە نرخی نووسیوە، تێیدا هۆی سەرەکـی ترسـی منـداڵان بۆ دایـك و باوکـان دەگـەرێنێتـەوەو لەم پێنج خاڵانەدا کۆیانی کردۆتەوەو روونیان دەکـاتـەوە، تاریکی، پزیشـك، مامـۆستـا، دێـوو درنـج و شەولەبانەو پۆلیس.

نووســەر سەرەتــای ووتــارەکــەی بەم جۆرە دەســت پێ‌دەکات: ـ

[ترسنۆکی لە کوێوە بۆ منداڵ دێت؟ آخوبەترسنۆکی لە دایکی بووە، ئەگەر بە ترسنۆکی لە دایکی نەبووە ئەی لە کوێ ئەم ترسنۆکییەی هێناوە؟ زۆر لە ترسنۆکی منال پیدا نابیت ئیلا لە نەتیجـەی ئەمـرو نەهی دایـك و باوکیـانـەوە نەبێت، کە ئەوانیش ئەو ئەمــرو نەهیــانـە لەبـەر چاکێتی‌و مەنفەعەتی منالەکەیان نەبێ نایکەن، بەڵام راستەو راست بە پێچەوانەی مەرامیان دێتە بەرهەم]، رووناکی، ژمارە 6، لاپەرە ـ 7.

لە پاڵ ئەوانەش دا گۆڤاری (رووناکی) پویتەی بە لاوان داوە، باوەکـو لە هێنـدیـك ژمارەیدا گۆشەیەکی بۆ قوتابیان تەرخان کردووە، لە هەمان کات دا لە ژێر نێوی دەستوری ئەخلاق بۆ نەوجەوانەکان ئامۆژگاری بۆ لاوانمان پێشکێش کردووە، ئامــۆژگــارێــکــان دەربــارەی جل و بەرگ و خوورەوشــت و خواردن و قســەکــردن و باری دەروونــی‌و چاکـەکـردن نرخی بەڵێن دان و هێـنـانەدی‌و دوورکەوتنەوە لە فێـڵبــازی، خۆشـی‌و شادی‌و بێ‌وەیی بۆ گشـت ویـستن و ئاگــاداربــوونــی ئەرك و رك و کیـنــە لە دژی کەســان

همێ نەگرتن و راست بوون بەرامبەر بە مرۆڤایەتیو وولات و ـحۆك و دایك و یاساو. . . (ژمارە 7).

## ناواکاریکانی رووناکی بۆ پێش خستنی. شاری هەولێر

پیشەو ئەرکی هەرە گرنگی رۆژنامەگەری (راگەیاندنە)، هەر لەم روانگـەوە، گۆڤـاری (روونـاکی) پێـویستیو کەم و کورتـی ئەو شارەی، کە تێـیـدا پەخش دەبـوّوە، بە ئاگادارکردن و پەیتا پەیتا لێدووان لێی، دەیخستە بەرچاوی لێپرسراوانی میری شاری هەولێر، یەکێك لەو بارانەی، کە دانیشتـووانی شار لە دەستیـان دەنـالاند، نەبوونی ئاو بوو، ئەو ئاوەی سەرچاوەی ژیانە، هەر لەبەرگرنگی ئەم کێشەیە، لە سەر لاپـەرەکـانی گۆڤـاری روونـاکیدا بۆ چەند جارێك تەنـگە و چەڵـمـەی ئاو باسکـراوە، بۆ وێنە لە ژمارە (2)ی لاپەرە (6)دا بە پێنووسی (ح. ح.) بە واتا حسین حزنی نەمـر بەم جۆرە سەرنـجی.لێپـرســراوان بۆ هەبــوونی ئاو راکێشــراوەو لە ژێــر سەردێـری (ئـاوو کاریـزی هەولێـر)دا نووسیویەتی: -

(بـەراستی لیـواکـەمان یعنی مەرکەزی قەسەبەی هەولێر لەبەر بێئاوی جێگەی ترس و ئەندێشەو جێگەی ئەوە بوو لە بیـر نەکـرێو هەمـوو دەمێـك خەریکی بین، چونکو هەولێر تەنهـا کارێـزیکی هەیـە، کە بە کارێزی میری دەناسرێت، ئەو کارێزەش گەیشتووە ئەوە کە ئەهالی بترسن. . .

ئەمــە هیــچ شایـانی حیـرەت و تەعـەجـوب نییـە، کە شارێکی وشکەدێم و بێ ئاوی خاوەند تەنها کارێزیك تینوو بمێنێت و لەبــەر نەبــوونی ئاو نیگــەرانی بکێشێت، بەلام جێگـەی ئەســەف و حیـرەتـە باغچـەی بەلـەدیەی شارێکی خاوەند 16 کارێزی وکانی لە تینووان وشك بێوماڵەکانی نێـو شار تەنگـانی بێ ئاوی بکێشن و دارو درەختـەکـانیـان گەلارێزانی تێکەوێو قرچ هەڵیو ووشك بێ).

وا دیـارە ئەم بانگـەوازەی مامـۆستـا خوزنی کاریگـەری هەبـووەو خواستی کۆمـەڵگـەی هەولێـر خراوەتـە بەرچـاوی لێپــرســراوان و بە هاواری تینــوێتی دانیشتــوان و ووشـك هەڵگەرانی دارو درەختانەوە چوون، بۆیە لە ژمارە (8)ی لاپـەرە (16)ی گۆڤـاری (روونـاکی)دا لە ژێـر سەر دێـری (چـالاوی ئیـرتیـوازی لە هەولێر)دا دەنگوباسی هەڵکەندنی چەند بیریکی ئیرتیوازی بەرچاو دەکەوێت، کە کۆمەڵێك لە ئەندازیاران و خاك ناسان سەرپەرشتی دەکەن و هەواڵەکەش بەم جۆرە بلاوکراوەتەوە: -

(ئـەمـە چەنـدێکـە مهنـدسی بە تایبەتی خاك ناس، لە لایەن ئەشغالەوە ناردراوەتە هەولێر لە شەرقی شمالی قەلای هەولێــر چالاوێکی سەدو سی فوت قوولی هەڵقــەنــدووەو گەیشتۆتە ئاوێکی باش. .

وەنــەبێت گۆڤــاری (روونــاکی) هەر گلەیی و گازانـدەو داواکــاری کم و کورتیو نەبـوونی شاری هەولێـری لە سەر لاپـەرەکـانی خستبێتـە روو، بەڵکـو پلە بەپلە ئاگـاداری ئەو کارانە بووە، کە بۆ پێش خستنی شارەکە هەوڵی بۆ دراوە، وەیـا جێ بە جێ کراوەو بە چەنـد ووشــەیـەکی شایستـە ستـایش کراوە، بۆ وێنـە باسی دەوری دایـرەی (اشغال) بۆ قیرتاو کردنی رێگەوبان دەخاتە روو ولەسەرەتادا دەڵێت.

(دایـرەی اشغـالی لیـواکـەمـان بۆ قیرەتاوو رێك خستنی رێگـاوبـان تێ دەکـۆشێو لە هەمـوو لایـەکەوە خەریکە. . ژمارە - 8، لاپەرە - 14).

گۆڤـاری (روونـاکی) زۆر بایـەخی بە زانست و زانیاری داوە، هانی دانیشتوانی داوە، کە روویکەنە خوێندنگە، وا لێیانەوە نێزیك بۆتەوە، ئاگاداری ئەو بابەتانە بووە، کە لە قوتابخانەدا مامۆستای پسپۆری بۆ ئامادە نەکراوە، بۆ وێنە لە ژمــارە - 2 ـی لاپــەرە (15)دا بە نێــوی (مـعلمیــك بۆ مدرسەی متوسطە)دا نووسراوە: -

ئەم ساڵ، کە تەدریســات دەستی پێکــرا، وا معلمی فەرعێکی زۆر موهیم، کە تەبیعیــاتــە، هێشتــا لە لایـەن

مەعاریفەوە تەعیین نەکراوە، و شاگردەکان لەو فەرعە موهیمە مەحرووم ماونەتەوە).

نەخوێندەواری دەردێکی کوشندەی کۆمەڵگەکەمان بووە، هەر لە کۆنەوە هەوڵی نەهێشتنی دراوە، بەڵام ئەوسا ئەوەندە پویتەی پێ نەدراوە، جا بە تایبەتی لە شاری هەولێری دێرین، بۆیە گۆڤاری (رووناکی) تکا لە لێپرسراوان دەکات بە گەرمی بیری لێ بکەنەوەو دەڵێت: -

(هەر وەکو لە هەموو شارەکانی عیراق دا بۆ مکافحەی امی لجنە داندراوەو بە گەرمە تەقەلا دەدرێ. شارەکەی ایمە تاکو ئێستا چتێکی وای بۆ نەکراوەو ئەگەر ئارەزووش کرابێ موهمیل ماوەتەوە. لەم رۆژانە لە لایەن ئەهالی هەولێرەوە زۆر بە دڵسۆزێکی تەواو لەکۆشەوە دان کە مراجعت بە گەورەکان بکەن کە زانستیان بۆ دابمزرێندرێو...).

## بەراوردێك لە نێوان گۆڤاری رووناکیو گۆڤارانی دیدا

ئەگەر بەراوردێك لە نێوان هێندیك رۆژنامەو گۆڤاری ئەو سەردەمەی، کە گۆڤاری (رووناکی)تێدا بڵاوبۆتەوە لە رووی دەرهێنانێوەی بکەین، دەبینیین تاکە رۆژنامەیەکی کوردی ئەوسا دەرچوویێت رۆژنامەی (ژیان) بووە، کە بە چوار لاپەرەیی بڵاودەبۆوەو هەفتانە بووە. لە رووی دەرهێنانی هونەرێوەی هیچ جیاوازێکی لەگەڵ گۆڤاری رووناکیدا نەبوو، ئەویش بەشی سەرەوەی لاپەرەی یەکەمی دابەش کردبۆ سەر سێ بەش و لە نێوەراستیدا نێوی رۆژنامەکەی تێدا نوسیبوو، لاپەرەکانی سێ ستوونی بوون هیچ وێنەو مۆنتیڤێکی تێدا بەدی ناکرێت، هەر لە هێندیك شوێن دا نێوی ووتارەکان بە خۆش نوسی نووسراوان. بابەتەکانی هەروەکو (رووناکی) اقتصادی، اجتماعی، دەنگ و باس، اعلانات، هۆنراوە، گاڵتەو گەپ بە سەرهاتی شاعیران بووە.

هەردوو چاپەمەنیکە هەتا لە هەوڵی تاکە کەسیش دا بەشدارن، هەولی مامۆستا پیرەمێردی نەمر لە (ژیان)دا وهەوڵی مامۆستا حوزنی نەمر لە (رووناکی)دا.

ئەگەر ئەم چاپەمەنییە کوردییانە لەگەڵ چاپەمەنی دەورو بەر بەراورد بکرێت، دەبینین لەرووی دەرهێنانەوە جیاوازی هەیە، بەشی سەرەوەی لاپەرەی یەکەمی گۆڤارەکان یان دووخانەیین وەیا هەر تەنیا نێوی گۆڤارەکەی لەسەر تۆمارکراوە دەنگ و باسی جیهانی بە خۆش نوسی لە سەر لاپەرەی یەکەم دا نووسراوە، هەتا نێونیشانە ناسەرەکێکانیش هەر بە خۆش نووسی نووسراون.

وێنەی فۆتۆگرافی کەسیو سروشتیو نەخشەش بڵاوکراوەتەوە، هەروا وێنەی کارێکاتیریش جاربەجار بەرچاو دەکەوێت، وێنەی بەرگەکان وەکو (رووناکی) یەك وێنەی چەسپیوی نەگۆراونەبووە، بەڵکو هەر جارەی وێنەیەك وەیا چەند وێنەیەك بووە، کە پێوەندی بە نێوەرۆکی ژمارەکەوە هەبووە، تا نامەی (دەسنوسیش بڵاوکراوەتەوە، هۆی سەرەکی ئەم جیاوازییەش بۆ کادێرو پسپۆرو دارایی و چاپخانە دەگەرێتەوە نەك بۆ سەر نووسەرانی ئەوسامان.

لە ئەنجام دا ئەوە روون دەبێتەوە کەوا گۆڤاری رووناکی بایەخی بە زۆر لایەنی کێشەو ناهەمواریو گیروگرفتی هەموو چینێکی کۆمەڵگەی کوردەواریداوە بە هۆی زادەی بیری نووسەرانێوەو هەوڵی تاکە کەسی کارگێرانی، ئەم گۆڤارە هەشت مانگ لە بواری رۆژنامەگەریمان بە گرفەی تیشکەکانێوەی کتێبخانەی کوردی گەشاندۆتەوەو دەنگی زولالی خۆی گەیاندۆتە زۆر لایەنەوەو لە نێو ئەو دەسنووسانەی، کە بە جێ ماون نامەیەکە لە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، ئەوە روون دەکاتەوە کەوا دوو ژمارەی لە گۆڤاری رووناکیپێ گەیشتووە، جگە لەو هەموو کوردناس و رۆژهەڵات ناسانەی، کە پۆەندی راستەو خۆیان بە سەرنووسەرا نێوەی هەبووە.

م . . .

نەیسانی 1985

بەغدا

سەرچاوەو تێبینی

1) بۆ ئەوەی گۆڤـاری روونـاکی لە هەولێـر چاپ بکـرێت و مەڵبەندی هەولێر خاوەن چاپخانەیەك بێت، مامۆستا گیوی موکریانی بە پارەی وێنەگری چاپێکی گەورەتر لە چاپەکەی رەواندز لە مووسڵ لە فەزیل عیسا مەحفوزکری‌و لە ساڵی 1935دا. لە هەولێـردا یەکـەمین چاپخـانەی دامەزراندو لە ساڵانی شەست دا بە چاپـەکـە پەکی کەوتبـوو ئاسنگـەران پارچــە پارچــەیــان کردو هەر یەکــەی بە پارەیــەکی کەم بەشێکیان بۆ خۆیان کری.

2) عبـدالجبـار محمـد جەبـاری، مێـژووی رۆژنامەگەری کوردی، سلێمانی، 1970، لاپەرە 90 ـ 91.

3) جمال خەزنەدار، رابەری رۆژنامەگەری کوردی، (ـ)، 1973، لاپەرە ـ 37.

4) مامۆستا محەمەد عەلی کوردی نەمر لە دێی سیدەلان، کە کەوتــۆتــە سەر شاخی سپیلك سەر بە قەزای رانیــە لە ساڵی 1905دا هاتــۆتـە دنیـاوەو لە ساڵی 1956دا کۆچی دوایـی کردووە. مامــۆستــا کوردی بە باوەرێکی پتــەوەوە خزمـەتی زمـان و وێـژەو مێـژووی کوردی کردووە بە زمانی کوردی‌و عەرەبی بابەتی جۆراو جۆری بە نێوی (الفلاح، رجل الشارع أبو هند، محمد علی پژدەری، محمد علی کوردی، المؤرخ، سیــاسی جاهــل المحـاری، اعظمی، عطشان، ام العلا، نسرین الکردیة وهی دی) بڵاوکردۆتەوە لە بەرهەمە چاپکراوەکانی.

1 ـ حکایەتی زادیج لە نووسینی ڤۆلتێرو وەرگێرانی بۆ سەر زمــانی عەرەبی (طــە حسین) کردوویــەتی‌و محمـد علی کوردی لە عەرەبیــەوە کردویــەتی بە کوردی‌و لە بەغــدا لە ساڵی 1954 داچاپکراوە.

2 ـ رســالــة معلم الی اخــوانی المعلمین والمـدرسین، بەغدا، 1956.

3 ـ اشیاء والصحة، للصف السادس الابتدائی بە زمانی کوردی لەو دەسنووسانەی، لە لە دوای خۆی بە جێ‌ماون و چاوەرێی چاپ کردنن.

1 ـ محاضرة عن اللغة الکردیة وادابها.

2 ـ المصایف المهملة والجمیلة في شمال العراق.

3 ـ تمثیلیة ابو زهر الأعرابی.

4 ـ مەرۆکەو بزنۆکە.

5 ـ مامە خەمە.

ئەوەی شایەنی باسە مامۆستا محمد علی کتێبی تاریخ و جغرافیەی بۆ پۆلی شەشەمی سەرەتایی داناوە، بەڵام هەروا لە وزارەتی مەعاریف) بێ‌چاپ کردن ماوەتەوە.

بە هۆنراوەش نامەی بۆ توفیق وەهبی، سعید قزاز وشیخ عەلادینی نەقشبەندی زینوی‌و دۆستانی ناردووە.

ئەم زانیـاریـانـەم لە مامـۆستا مستەفا نەریمان و مامۆستا هیندخان کچی خوالێخۆشبوو مامۆستا محمد علی کوردی وەرگرتووە.

5 ـ بەرهــەمــەکــەی مامــۆستــا سعیــد فهیم هەر بە چاپ نەکراوەیی ماوەتەوە.

6 ـ بەشێکی ئەم رۆمـانـەی مامـۆستـا محمـد علی کوردی چاپ نەکراوە ولە نێو دەسنووسەکانی بە جێ‌ماوی خۆشی‌دا نییـە، بەڵام وەرگێـرانـەکـەی بۆ سەر زمانی عەرەبی لە لای هیندخانی کچێتی، کە دەڵێت (102) لاپەرەیە، دوور نییە مامــۆستــای نێــوبــراو هەر بە عەرەبی نوسیبێتی‌و گۆڤـاری روونـاکی بۆی وەرگێــرابێتـە سەر زمـانی کوردی، چونکـە شێوەی دارشتنی ئەم رۆمانە لەگەڵ بەرهەمە بڵاوبۆکانی دی‌دا جیــاوازی هەیــە، وەیــا هەر خۆی بە کوردی نوســیــوەو زمانەوانێك پێدا چۆتەوە.

# خەلەف شەوقی

كلافـەی ژیـانی ـ بەرهـەمـەكـانی ـ دەوری باڵای لە جوڵانەوەی ڕۆشنبیرانی عیراقیدا .. تیشكێكیش لەسەر كتێبەكەی

(یادكردنەوەی سەعد زەغلول لە عیراقدا).

غفور میرزا كریم

لەگـەشت كردن بەنـاو هەردەوێڵی ژیـان و گوزەران و پەروەردەكردن وەپێگەیاند هاتنە كایەی خەڵەف شەوقی بۆ سەر شانۆو كۆڕی خەباتی جوڵانەوەی ڕۆشنبیران بە كوردو عەرەبـەوە كتـومت وێنـەی تایبەتی بنەماڵە كوردێكی ئاوارەی دەوری دەوڵەتی عوسمانی یان دەوری پاشایەتی دوابراو تێدا، بەدی دەكرێ.

ئەوەی ڕاستی بێ لەسـەر بنـەچـەی خەڵف شەوقی هەر ئەوەندە دەزانین، كە باوكی ناوی ئەمین بووەو لە لەشكری عوسمـانیـدا لە دیوانیـە ئەفسـەر بووە جالـەبـەر ئەوەی بە ڕەچەڵەك دەچێتەوە سەر هۆزی داودەی كورد بۆیە بەئەمین داودە ناوی دەركردووەو ناسراوە.

ئەمیـن داودی سێ زمـانی زانیـوەو شارەزایی قوڵی لە عەرەبی‌و توركی‌و فارسیـدا بووە ،پیـاوێكی خوێنـدەواری زیـرەك بوە خەڵـەف لەدوای حەوت خوشـك ساڵی 1898 چاوی بە دنیا هەڵهێناوەو تاكانە كوڕی دایك و باوك بووە. هەر لە سەرەتای ژیانی‌یەوە زیرەكی‌و بلیمەتی لە مێشك و چاویدا ئەدرەوشایەوە كورد واتەنی هەر ئەڵێی زانایی‌و دانایی بەشیـرەوە خواردبـوو، هەر لە منداڵیـەوە لە هەڵسـوكەو تیدا یاخی‌بوون و هەڵشاخان بەرامبەر كۆمەڵ و دیاردە نارەواكانی دەبینرا بۆیە لە ماڵەوە لەگەڵ باوكیدا ناكۆك بوو هەمیشە لە مشت مرو تێك چوون و بەیەكا دانابوو كە لە ئەنجامدا بە گاڵتـەو گاڵتـەجاری داخی دڵی بەرامبـەر باری نالـەباری كۆمەڵ دەردەبڕی كە لە دواییدا ئەم ڕەوشتە تایبەتی‌یەی لە نوسینـەكـانیـدا بە زەقی ڕەنگی‌دە دایـەوە كە بوو بە هۆی ئەوەی هەنـدێ لە ڕۆشنبیـرانی هاوچـەرخی بە ڕۆشنبیرێكی گاڵتە چی‌و گەمەبازی ناوی بەرن.

باوك و دایك مردنی خەڵەف و بەسەربردنی ماوەیەك لە ژیانی لای زاوایەكی بازرگانی لە صوێرەی سەر بە شاری كوت یا گوزەرانی بۆ ماوەیـەكی تـر لای زاوایـەكی‌تـری لە حیللە لەدواییدا چۆتە قوتابخانەی ڕۆشدیە لە بەغدا پاشان چۆتـە دار المعلمین ی توركی، ئیتـر ئەم هەڵسـوكـەوت و هەڵبـەزو دابـەزە جۆراوجـورە كارێكی تایبەتی‌یان كردە سەر ژیانی لەوەبەدوای ، وە كەرەسەیەكی پڕ سوودو دەرسێكی بایـەخ دار و تاقی‌كـردنـەوەیـەكی بە كەڵكی بۆ ڕەخسـان هەروەهـا ئاگری شەڕی یەكـەمینی جیهـانی (سـەفـەربەر) خەڵـەفی لەگـەڵ هەزاران كەسـانی كەسـاس و داماوی‌تری دانیشتـوانی عیـراقـدا بۆ ناوجـەرگـەی دۆزەخی جەنـگ ڕاپێـچ كردو لول دا كە لە ئەنجـامـدا پاش شكستی هێنانی دەوڵـەتی عوسمـانی خەڵف لەگـەڵ زۆری‌تـر لە لایـەن ئینگلیزەكانەوە بەدیل ڕەوانەی هندستان كران ئەم ماوەیەش دەرفـەتێكی گونجـاوی بۆ ڕەخسـان، بۆ فێـربـوونی زمـانی ئینگلیـزی‌و هینـدی بەم چەشنـە چەنـد هۆیـەكی تایبـەتی دەستی باڵای هەبـو لە پەروەردەكـردن و پێ گەیـاندن و قاڵ كردن و ناودەركـردنی خەڵف شەوقیـدا كە لە ئاكـامـدا وەكو شاسـوارێكی بێ‌هـاوتـا ئەسپی لە ناو جوڵانەوەی ڕۆشنبیری

کوردو عەرەبـدا بە ئارەزووی خۆی ئاودەداو ئەسـتێـرەی بەرزی لە ئاسمـانی چیـرۆك نوسیی و رۆژنـامـەگـەریی و پەخشانی گرنگ لە گۆڤارە ناودارەکان بە دانانی کتێبی هەمە جۆرەی رۆشنبیری بەسـەرکـەوتـوییـەوە بدرەو شێتـەوە ئیتر زمـان پزانی خەڵـەف بە زیرەکیی و دانایی، هەڵکـەوتن و گووش کردنی لە ئامێـزی بنـەمـاڵـەیـەکی خوێنـدەواری چاوکراوەدا . . سەر کردنە خوێندن و فێربوون لە فێرگەکانی حلله بەغـدا، دەردو مەینـەتی رۆژکـارو کۆمـەلایـەتی . . . تاڵ و تفـتـی رۆژانی دیلیـەتیی و هاتنـەوەی بۆ عیـراق ئەم هەڵسـوکەوتانە بەتێکرایی کەرەسەیەی کەڵەکەبووی بەپیت و دەروویـەکی گونجـاوی تەقینـەوەی کانیـاوی بەهـرەوەریی و کارامەیی لە خەڵەف شەوقیدا کردەوە کە وەك شاسوارێکی رۆشـنـبـیـری خۆی هاویـشـتـە ناو کۆری جولانـەوەی رۆشنبیـریـیـەوە .خـەڵەف شەوقی پاش رزگـاربـوونی لە دیلیـەتیی و هاتنـەوەی بۆ عیـراق لەدوای فێـربـوون و شارەزاو قاڵ بوونی لە چەنـد زمـانێکی بێگـانـەی وەکـو ئینگلیـزی وهینـدی و فرنسی، ئەلمـانی ،تـورکی ،فـارسی سەرەتای ئەرکی رۆشـنـبـیـری خۆی بە رۆژنـامـەگـەری کردەوە نوخشـەجـاری لەم مەیدانەدا دەرهێنانی یەکەمین و کۆنترین گۆڤاری عیراقی سەردەمی دەوری داگیرکەری ئینگلیز بوو.

لە کانونی دووەمی سالی 1923 خەڵەف لە شاری بەسرە بە ناوی (شط العرب)ەوە گۆڤارێکی نیشتمانیی و رۆشنبیری دەرهینـا کە سەرنـوسەرو هەڵسورێنەری هەرخۆی بوو بەلام دبـاربـوو کار بەدەسـتـانـی ئیـنگلیـز نە خاوەنـەکـەی ئەنوسینەنیشتمانیەکانی دژ بە داگیرکەر وەنە بانگە راهێشتنی بۆ یەکیەتی کوردو عەرەب بەدڵ نەبوو جێگای رەزامەندبیان نەبـوو بۆیـە هەر تەنهـا ژمـارەیـەکی لێ دەرچوو وە فەرمانی داخستنی بۆ دەرکرا[1] کە لە ئەنجامدا خەڵەف هەوارگەی خۆی بۆ بەغـدا گواسـتـەوە . . وە لە پاتیـەخت لە ئازاری سالی 1923 دەستی بەدەرهێنـانی رۆژنـامـەیەکی رۆژانەی رۆشنبیری و کۆمەلایەتیتر کرد کە دروشمی بلاوکردنەوەی راستیی و خزمـەتی نیشتمـان بوو کە بەداخـەوە ئەمیش تەنهـا شەش مانـگ دەرچـوو[2] . بەم چەشنـە خەڵـەف شەوقی لەسەر رەوشتی باوکیی و شانازی کردن بە هۆزو رەچەڵەکی کوردییـەوە نازنـاوی داودی خستـەسەر ناوەکەی بەم چەشنە خەڵـەف لە ریـزی جولانـەدەی روشنبیـرانی کوردو عەرەبدا وەکـو شاسـوارێکی لیهـاتـو هاتـە مەیـدانی نوسین و بلاوکـردنـەوەی کتیب بو وێنـەلە سالانی بیستدا لاپەرەکانی گۆڤاری (دیاری کوردستان) کە لە بەغدا لە لایەن صالح زکی صاحقبـرانـەوە بەکـوردیی و عەرەبیی و تورکی دەرئـەچوو هەمیشـە بە نوسینی بە پیـزی خەڵـەف ئەرازایـەوە، وەبـە گەرمەوە بەشداری لەم گۆڤارەدا کردوە وەکو زاناو مێژوونوسی کورد، جمیل روژبەیانی دەلیت:

لە ژمارەکانی (3 ـ 6)ی گۆڤاری (دیاری کوردستان) کە لە سالی 1925 لە بەغدا لە لایەن صاحبقرانەوە دەردەچو خەڵەف وتارەکانی (ف ـ استیفانی) دەربارەی (کرمانجی کرد) لە ئینگلیـزیـەوە وەریئـەگیـرایە سەر عەرەبی وەبلاوی ئەکـردەوە وەلـە ژمـارەی (8) وتـاری زوروئـاغـا ـ شیخ المعمرین ـ بە عەرەبی بلاو کردوتەوە هەروەها بە ئاشکرا دەبینین کاتێ کە گۆڤـارێ (اعتـدال) لە سالی 1933 لە شاری نەجـف دەسـتی بە دەرچـوون کرد لەنـاو ئەو شۆرە سوارانـەو کەڵـە شاعیـرانـەی عیـراق دا وەکـو محمـد رضـا الشبيبي علی شرقی، محمد جواد الجزائري، محمد علي اليعقـوبي احمـد الصـافي، محمود الحبوبی ،عبدالرزاق محي الـدين، مصطفیٰ جواد، عبـدالحميـد الـدجيلی، محمـود المـلاح ،نـاوی خەڵـەف شەوقی داودیش وەکـو ئەستێرەیەکی پرشنگدار دەرەوشایەوە.

بەهێزیی و پرتوانایی لە زمانی عەرەبیدا وە فرە شارەزایی لە بەشـەکـانی رۆشنبیـری گشتیدا گەیاندبوویە پلەیەکی ئەوتۆ کە بە نوسـەرێکی ناودارو سەرکـەوتـوی نوسـەرانی گۆڤاری (اللغـة العرب) دابنـرێ ئەم گۆڤـارە زانیـاریـیـە گرنگـەیکە ئەنستاش ماری الکرملي سەرپەرشتی دەرکردنی دەکرد.

توانـای بێ ئەنـدازەیی لێهـاتـووی خەڵـەف شەوقی لە رێك خستن و هەڵبەستنی گاڵتەو تیرو توانج گرتن لەسەر

باری کەموکوڕی و دەردی کوشندەی کۆمەڵ کردبوی بە یەکێکی ناودار لەم مەیدانە ڕۆشنبیریە کە لە ئەنجامدا ناوی بە ڕۆشنبیرێکی هاوچەرخی گاڵتەو گاڵتەجاری ڕەخنەگری بەرز دەرکرد وە لە ئەرشیفی ڕۆشنبیرانی گاڵتەجاری عیراقدا ناوی لەگەڵ ناوی ئەم ڕۆشنبیرانەی خوارەوەدا دێ کە هەریەکەیان یا ڕۆژنامە یا گۆڤارێکی بە ناوەوە ناسراوە .

نوری ثابت «حبزبوز»
میخائیل تیسی «کناس الشوارع»
عبدالقادر المميز «ابو احمد»
صادق الأزدي «قرندل»
خالد الدره «الوادي»
حميد المحل «الفكاهه»

ئیتر هەمیشە بە نوسینی بە هێزو سوودبەخش و پڕ پێزو یە تۆیکڵ بەتیرو توانج گرتن پڕ لە مانا بۆ سەرباری ناکۆکی کۆمەڵ کە بریتی بوو لە ڕەخنەگرتن لە سەرباری ژیانی کۆن داخی دڵی پڕ ناسوری هەڵ دەرشت و دووتووی لاپەڕەکانی ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانەی خوارەوەی ناو وولات و یا دەرەوەی وولات پڕدەکردەوە دەرازاندەوە.

الأوقات العربية
مجلة المعلمين
لغة العرب
الاعتدال
الكرخ ..هتد

پیرەمێرد بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی (ژیان) بەم نوسینەی خوارەوە ڕۆژنامەی (الدفاع) بەغدادی وە دەوری بەرزی خەڵف شەوقی لە مەیدانی گاڵتە وگەمەدا هەڵ دە سەنگێنێ ،هەروەها لە دوو توێی ئەم نوسینەدا ,دەردەکەوێ کە خەڵەف شەوقی وەکو کوردێکی ڕۆشنبیری لەلای پیرەمێرد ناسراو ناوبانگ دارە.

ژیان ژمارە 533 5تەموز 1937

## الدفاع

(غەزەتەیەکی تازە بەناوی (الدفاع)وە لە بەغدا دەرچووە دوو ڕۆژ دوو نوسین یمان بۆ هات من کە لە غەزەتە تەجربە کۆنەکانم وە ئەم مودەتە غەزەتەی خۆمان دە بینم تا ئێستا غەزەتەی وارێکوێک و لە هەموو بابەتێکم نەدیوە سیاسی ،ئەدەبی ،فەنی، عیلمی اقتصادیو فکاهی. . . نەخوازەلا گاڵتەو گەپی ئەدەبیی لبیب خەڵەف شەوقی زینەتێکی تری پەیداکردوە وە بە هێندی شێوەی بەیاناتیا لەگەڵ خۆمان دا دوستی ئەنوێنێ ئومێد ئەکەین پایەدارو پەسندی یارو ئەغیاربێ). بەم ڕەنگە لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان چ ناوخۆیی یا دەرەوەیو وولات بێ، بێ سێو دوو بەڵکو بە شانازیەوە بۆ ووتار نوسینی برشت و بە پێزەکانی خەڵەف شەوقی کرابوەوە ئیتر هەندێ جار بە ناوی ئاشکرای خۆیەوە وتاری ئەنوسی وە هەندێ جاری تریش لەژێر ناوی (ملا نصرالدین) (مەلای مەزبورە) نوسینی بلاوئەکردەوە سەیرتر هەندێ جاریتر لەژێر ناوی (بابوچترنارجی) کە گوایا هندیەکە لەو هندیانەی کە لەگەڵ لەشکری داگیرکەری ئینگلیزدا هاتونەتە عیراقەوە نوسینی بلاوئەکردەوە کە لەم بابەتەوە بەڕێز صادق الازدي هاورێ دەڵێت پاش پێنج ساڵ سکرتیری نوسینی ڕۆژنامەی (الدفاع) «مهدي وفي» پێی ووتم کە ئەو (بابو) هندیە هەر خەڵەف شەوقی بوە کە مووچەخۆرێك بوو لە وەزارەتی مالیە.

گوروگوژمی خەڵەف شەوقی لە مەیدانی ڕۆژنامە گەریدا ڕێکەوتی سەردەمی حکومەتی بەکر صدقی ساڵی 1936 دەکا جا لەبەر پەیوەندی بەتینی نوسەر بە بەکر صدقی یەوە خەڵەف شەوقی بە چالاکانە لە ڕۆژنامەی (الدفاع) کە سرکیس سورانی بەڕێوەی دەبرد کە بە ژمانی حاڵی حکومەتی بکر صدقی ناسرابوو ووتارو نوسینی سیاسی کە زۆر جار لەژێر ناوی (سفینەی نوح)دا دەینوس بلاوی دەکردەوە. بەڕێز صادق الأزدي کە خۆی لەم ڕۆژنامەیەدا کاری دەکرد دەڵێت: لەپێشدا لە ڕێگەی نوسینیو خوێندنەوەی ووتارەکانیەوە خەڵەف شەوقیم ناسیو ڕێزم

ی تەگرت بەلأم بەهۆی کاروباری ڕۆژنامەی (الدفاع)وە بۆ یەکەم جار بینیم و لە تەکیا دانیشتم وە ئاشنایەتیم لەگەڵ دا ـەست. بەم چەشنە خەڵـەف شەوقی بەسـەرکـەوتـوییـەوە یـەی بەرزی ڕۆژنـامـەگیـری لەناو جولأنەوەی ڕۆشنبیرانی عیـراقـدا وەرگـرت بۆیـە بەڕێز صادق الأزدي ڕۆژنامەگیری عیراقی کۆن بەدروستی ئەم دەورە گرنگەی خەڵەف شەوقی ـەرخێنێ وەدەڵێت:

بە گوزەرکـردن بەنـاو ژیـانی خەڵـەف شەوقی‌دا مرۆڤ ـەری سوڕ دەمێنێ کە چۆن کوردێکی ڕەسەن لە سالأنی ـیـتدا دەرهێنانی گۆڤاری بەناوی (شط العرب) لە شاری ـەـرە دەگـرێتـە ئەستـۆ کە بێ‌گومان ئەم هەڵوێستە بەڵگە ـویستە عیراقی ڕەسەنی خەڵەف شەوقی دەردەخاو پیشان ـەدا.

## شاسواری چیرۆك نوسێ عیراقی خەڵەف شەوقی

خەڵـەف شەوقـی نەك تەنـهـا ناوی بە ڕۆشنبیـرێکی ڕۆژنامەگەری بە نوسینی‌و ووتاری هەمە چەشنە لە ڕۆژنامەو گۆڤـارەکـانی عیـراق وەدەرەوە ی وولأت بلأویـوەوەو بەس ، بـەڵکـو لە هەمـان کاتـدا توانیـوێتی بەسـەرکـەوتـوییـەوە ـەردوکێشـەی کۆمـەلأیـەتی ئاوات و خۆزگـەی کۆمـەلأنی خەڵکی بە چیـرۆکی بەرزو جوان تۆمـار کاو نایـاب ترین و چێژترین چیرۆکی بیگانە لە زمانە بیگانەکانەوە بە تایبەتی لە زمانی تورکیەوە بگۆڕێتە سەر عەرەبی وە لە ڕۆژنامەو گۆڤار یابـەشێـوەیکـتێـب بلأوی بکـاتـەوە وە پێش کەش بە خۆیندەواری عیراقی بکات، جا با کەمێ جڵەوی ئەم باسە بدەینـە دەست خەڵـەف شەوقی، کە خەڵـەف شەوقی لە کتێبـەکـەیدا بەناوی (قصص المختاره من الأدب التركي) کە لە ساڵی 1934 لە میسـر دەرچـووە کە دوو ڕۆشنبیـری گەورەی عەرەبی محمـد محمـود وعبـدالـوهـاب امین دوو پێشـەکی بەنـرخیـان بۆ نوسیـوە تیـایدا دەڵێت: لەبەر ئەوەی سەرچـاوەی ڕۆشنبیـریم تورکی بووە بۆیـە کە سەرم کردبـوە سەر خوێندنەوەی ئەو چیرەوکانەی کە بەناوبانگترین چیرۆك نوسی تورکی دەیـان نوسی وەکـو رشـادنـوری . ارجمنـد اکـرم. . . هتـد وە دوایی ئەوەی ئاسـەو ئارەزووی گەرمتـرو بەهێزتر کردم کە ئەم بینی لەناو ئەدەبی عەرەبی‌دا دەربارەی ئەدەبی تورکی وە بەرهـەمی ڕۆشنبیـرانی تورکی بۆشـایەکی گەورە هەبـوو جگـە لەمـەش خاوەن دەزگای چاپ کردنیش پاڵیـان پێـوە دەنـام، هەر ئەوەنـدە چیرۆکێکم بلأو دەبوەوە، خاوەن ڕۆژنـامـەکـان هانیـان دەدام بۆ چیرۆکی‌تر بەم جۆرە سووربـونی خوێنـدەواران لەسـەر خوێندنەوەی چیرۆکەکانم خستمیـە سەر ڕێڕەوی چیـرۆك نوسین شیـاوی باسـە ئەم کتێبـە جارێکی‌تـر لەسـەر داواو خواستی خوێنـدەواران لە ساڵـی 1936 لە میسـر لە چاپ درایـەوە، وە کەوتـەوە بەردەستی خوێنـەر کە ئەمـە بەڵگـەی نەویستـە ،تـوانـایی‌و سەرکـەوتـوویی وە ناوداریـەتی خەڵـەف شەوقی لە ڕیـزی جولأنەوەی ڕۆشنبیرانی عیراق وەدەرەوەدا پیشان دەداو دەنوێنێ.

لێرەدا پرسیارێك دێتەپێشەوە!!

ئایا بۆچی ڕۆشنبیرانی عیراقی لەو ڕۆژەدا چاویان بڕیبوە بەرهـەمی شیلەو بیـری ڕۆشنبیـرانی تورکی؟ وە بەکڵچیۆی دەستکەوت و سەرکەوتنەکانی چاویان ئەڕشت؟

ئەوەی ڕاستی‌بێت لەدایك بوونی جمهوریەتی تورکیائی سەربەخۆد لەسەر کەلاوە کۆنی ڕووخاوی پێنج سەد ساڵەی دەستـەلأت داری دەوڵـەتی عوسمـانی بە یەکێ لە ڕووداوە گرنگەکانی ئەم ڕۆژهەلأتی ناوەڕاستە دادەنرێ کە لەدواییدا کەوتـە بەرچـاوو سەرنجی جولأنەوەی نیشتمانی‌و ڕۆشنبیری عیـراقی بۆ لای خۆی ڕادەکێشـا. . ڕۆژنامە نیشتمانیەکانی بەغدا ئیستقلال و ئەهالی . . هەر بەردەوام بە سەرکەوتن و دەستکەوتەکانی جمهوریەتی تورکیای کەمالییان هەڵ دەدا، لەگـەڵ باری ژێـردەستـەیی پیـلان و نەخشـە گلأوەکـانی ئینگلیـزەکـان بۆ چەسپـانـدنی پەیمـانی دیلیـەتی 1930 بەراوردیان دەکرد وە بۆ چاولێکردن لە جولأنەوەی نیشتمانی‌و ڕۆشنبیـری تورکیـا کۆمـەلأنی خەڵکی‌یـان ڕادەکێشـا بۆیـە ڕۆشنبیـرانی عیـراق تامەزرۆوی چێشتنی بەرەوپومی تازەی

ڕۆشنبیرانی تورك بوون بەتایبەتیش ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە لەبەر ئەوەی سەرچاوەی خوێندنیان تورکی بوو بۆیە تامو چێژی تایبەتییان لە ئەدەبی تورکی و لە وەرگێرانی بەرهەمەکانی ڕۆشنبیرانی پێشکەوتووخوازی تورکی بۆ عەرەبی وەردەگرت ئیتر ئەم هۆیانە بوونە مایەی ڕاکێشانی سەرنجی خوێندەواری عیراق بۆ لای ئەدەبی تورکی کە تیایدا خەلەف شەوقی پایەو پلەی بەرزی لەم مەیدانەدا وەرگرت بۆیە ڕۆشنبیری بەناوبانگ جعفر خلیلی لەکێتەکەیدا کە لە ساڵی 1962 بەناوی (القصة العراقية قديماً وحديثاً) دەرچوە بە دروستی دەوری خەلەف شەوقی هەڵ دە سەنگێنێ و مافی سروشتی ڕەوای خۆی ئەداتێ وە دەڵێت.

لەو ڕۆشنبیرانەی کە لە عیراقدا بەپێشرەوی چیرۆك نوسی تازە دادەنرێتین لەم چوار ڕۆشنبیرانەی خوارەوە.

1 ـ سليمان فيضى

2 ـ محمود احمد سيد

3 ـ انور شاووڵ

4 ـ خەلەف شوقی

بەم چەشنە خەلەف شەوقی بەتوانای لێهاتووی لە بوارێکی مێژوویی بە بەرهەمی زۆری بایەخ داری بەسەر کەوتوییەوە پایەی چوارەمین چیرۆك نوسی لەناو چیرۆك ناسانی عیراقدا وەرگرت.

## خەلەف شوقی کورد پەروەر

هەرچەندە خەلەف شەوقی بەتێکرا تواناو بلیمەتی خۆی خستبوە بەردەستی جوڵانەوەی ڕۆشنبیری عیراقی وە بەرهەمە جۆراو جۆرەکانی و شیلەی بیری بە زمانی عەرەبی ئەکردە گەردانە بۆ گەنجینەی سامانی ڕۆشنبیری بەڵام لە هەمان کاتدا وەکو ڕۆشنبیرێکی کورد بیری دە کردەوە و بە پێی بارو ڕۆژگاری ئەو سەردەمە ئەسپی لە مەیدانی جوڵانەوەی کوردیدا تاودەدا. باری دواکەوتنی و داماوی گەلی کورد بازارای کزو کەساسی جوڵانەوەی ڕۆشنبیری دڵ و مێشکی هێنایە هەژان بۆیە وەکو هاودەردێ هاتە کۆڕی ڕۆشنبیرانی کوردەوە لە بەغدا وەقوڵێ بە قۆڵاکردن کە لە ئەنجامدا جێگەی بەرزی خۆی لە ڕیزی ڕۆشنبیراندا کردەوە وەکو لێهاتویەکی ناودار لەم مەیدانەدا ناسرا.

لە 5/30 ساڵی 1930 لەژێر پاڵەپەشتۆی جوڵانەوەی ڕۆشنبیری کوردیدا دەزگای میری ڕێگەی بە کردنەوەی یانەی سەرکەوتن دا کە کردنەوەی بە سەرکەوتنێکی گرنگ و دەستکەوتێکی ڕۆشنبیری دیاری کراو دادەنرێ.

لە کۆبوونەوەیەکی دیاری کراوی تایبەتیدا لەناو کۆڕی سەدان ڕۆشنبیری کوردا بە هەڵبژاردنێکی سەربەستانە چەند ڕۆشنبیرێکی هەڵکەوتوو لەگەڵ چەند پیاوێکی پایەبەرزی کوردپەروەر کە یە دامەزرێنەری ئەم دەزگای ڕۆشنبیریە دانرابوون هەڵبژێران ، بەم چەشنە خەلەف شەوقی بەلێهاتوویی خۆی لەگەڵ بەرێزان ئەمین زەکی بەگ وە مارف جیاوك، ئیبراهیم حیدری ، محمد علی افندی توبچی، محمود جودت، پارێزەر محمد عارف افندی پشدەری وەکو شاسوارێك لە مەیدانی ڕۆشنبیری کوردی ناوبانگی دەرکرد.

دوکتور محسن جمال الدين لە نووسینێکدا بەناوی (الأكراد خدموا اللغة العربية کە لە 1984/10/1 لە ڕۆژنامەی عیراقدا بڵاوی کردۆتەوە دەربارەی خەلەف شەوقی دەڵێت: (خەلەف شەوقی بەزوویی پەی بە زمانی نەتەوەکەی برد هەمیشە لە ڕیزی ئەو پێشەنگانە دادەنرێ کە بەرهەمی ئەو ڕۆژهەڵات ناسانەی کە هاتوونەتە سەرەوەو خوارەوەی عیراق کە لە سەرباری گەلی عیراق لە عەرەب و کوردو کەمایەتیە نەتەوایەتیەکان نوسیوەو گۆڕیوەتە سەر عەرەبی هەروەها دەڵێت: خەلەف شەوقی زۆر بەتەنگ زمانی کوردییەوە بووە لەسەر لێکۆڵینەوەو مێژوو شارەزایی بەشەکانی و یەکگرتنی و کۆکردنەوەی ئەدەبی گرنگیەکی تەواوی پێدا وە هەروەکو لەو پێشرەوانە دەژمێرێ کە داوای بژارکردنی ئەم زمانەیان کردوە لەسەر کوزەر. . جگە لەمە بە شارەزابییەوە لە باری ئەم زمانەو ناوچە دابەش کراوەکانی جوگرافی لە سەرووی وخوارووی وڵات دەدوا.

خەڵـەف شەوقی پەیـوەنـدی‌یەکی بەتینی لەگەڵ مامۆستا ئەمین زەکی بەگـدا پەیـداکـردبـوو تەنـانـەت لە پاشەرۆکی کتێـبەکـەیـدا (قصص مختـاره من الادب الترکی)بە وێنەی ئاگاداری‌یەك کە بەڵگە نەویستە بۆ هەستی نەتەوایەتی ئەم بەتگەوازەی خوارەوەی دەربارەی کتێبی کوردو کوردستان . . . بلاوکردەوە.

میژووی کوردو کوردستان

خاوەن پایەبڵند محمد ئەمین زەکی بەگ

وەزیری ئابووری‌و هاتوچۆ

نەبوونی شوێنە وارێکی بەنرخ و نوسراوێکی سەربەخۆی تایبەتی لەسەر مێژوویی کوردو کوردستان، تا ئەم سەردەمە نزیکـەش سەرنجی مامـۆستـا محمـد ئەمین زەکی بەگ وەزیـری ئابـووری‌و هاتـووچو بۆ پرکردنەوەی ئەم کەلەبەرەی راکێشـا ،بـۆیە دەستی دایە خوێندنەوەی کتێبی مێژوویی، گەڕان بە شوێن شوێنەواری کۆن تاووتوێ‌و ساغ کردنەوەی بەڵگەنامەکان تا توانی لە ماوەی 15 ساڵا ئەم کتێبە بەنرخە بهـاوێـژێتـە بازاڕەوە لەدواییـدا دێتـە سەرباسی کتێبەکەو. دەڵێت ئەم کتێبە بەنرخ و گرانە، لە رووی بابەتەوە تاکە، لەباسەوە تایبەتیە بەسەرچاوە دەوڵەمەندە بە بەڵگەی مێژوویی ریشـەی کورد، پەیـدا بوونی، بەسـەرهـاتی جوگـرافیـای نیشتمـانیـەکـەی لە چەرخی کۆن و تازەدا دینێتـە پێش چاو تەنهـا بەهـۆی ئەم کتێبـەوە دەتوانین خێڵ و هۆزە کوردەکان ژمـارەیـان و تیـرەی هەمـە جۆریـان بزانیت دوایی درێژە بە ئاگاداری‌یەکە دەداوە دەڵێت.

لە ئێستاوە بارو دۆخی سازکراوە بۆ گۆڕینی ئەو کتێبە بۆ زمانی عەرەبی وتـورکی تا سوودی زۆرتـرو فراوانتـریێ کە بی گـومـان وەرگێـرانی بۆ سەر زمـانی تورکی تەواو بووە هەروەکو گۆڕانی بۆ زمانی عەرەبیش بەم زوانە تەواو دەبێ.

شیاوی باسە بیرکردنەوە لە وەرگێرانی ئەم کتێبە بۆ زمانی تورکـی بەڵـگـەی بەهـێـزە بۆ ئاسـۆی بەرفـراوانـی بیـری تیـژی رۆشنبیـرانی کورد کە ویستـویانە ئەم کتێبە بگـەیـەنـە بەردەستی چەنـد ملیـونی کورد کە حکـومـەتی تورکیای کەمالی بە تورکی شاخاوی دادەنان وە زمانەکەیانی بە زمانی دایکی‌دا دەناو وە لە هەموو مافێکی نەتەوایەتی بێ بەش کرابـوون . دیـارە هەر بەدەست و نەقـامی خەڵـەف شەوقی بەشارەزاوو بەتواناى لە زمانی تورکیدا ئەم کتێبەش وەرگێـراوەتـە سەر تورکی کە هۆی چاپ نەکـردنیشی دوور نیـە، کە نەگـەڕێتـەوە بۆ سەرسیـاسەتی ئەو دەورەی دەزگای میری عیراق کە نەیویستەوە جولانەوەی رۆشنبیری کورد لە سنووری سروشتی خۆی تێ‌پەڕیکا و لە بازنەی دانراو بۆی دەرچێ بەتایبەتی لەو سەردەمەدا دەوڵەتانی ناوچە. تورکیاو ئێـران و عێـراق و ئەفغـانستان بەرەو نزیك بوونەوە لەیەکتری دەرویشتن وە خۆیـان بۆ بەستنی پەیمـانی (سعـد ئاباد) 8تمـوزی لە ساڵی 1937 ئامـادە دەکـرد ئەم پەیمانەی کە دروشـمی بریتی بو لە دژایـەتی کردن بەرامبـەر جولانـەوەی گەلاتی ناوچـەکـەو بە تایبەتیش سەرکوت کردنی بزوتنەوەی کورد بوو.

لی‌خستنی وەزارەتی یاسین پاشا هاشمی وەپیچانەوەی دەورو دوکانی بە زەبرو هێزی راپەرینی لەشکری عیراقیەوە لە ساڵی 1936 وەهـاتنی بکـر صدقی‌و دامـەزرانـدنی وەزارەتی حیکمت سلیمـان بەویست و پشتگیـریـو یارمـەتی لەشکـر لە دوایی‌دا بەشـداربـوونی هەنـدی لە نیشتمـان پەروەرانی ناسـراوو بەنـاوبـانگ و خەبات کەر وەکو بەریزان کامل چادرچی‌و جعفر ابو تمن لەم وەزارەتەدا ئەم بزوتنەوەو ئاڵوگۆڕەو باروودۆخە تازەیە ،بوژاندنەوەو چالاکی‌یەکی نوێ بگـرە گۆڕووگـۆ ژمیکی تازەیی خستـە ناوجـولانـەوەی نشتیـمـانی ورۆشـنبیـری عیـراقی هیـواو ئومنیـدکی سەرکـەوتـن وە پێش کەوتـنـێکـی تازەی لە دڵ و دەرونـی کۆمـەلانی خەڵکـدا بوژانـدەوە بۆیـە نیشتمـان پەروەران وە رۆشنبیرانی کوردیش دەم و دەست بەدەم ئەم بارو دۆخە تازە تایبە تییەوە چوون وە ویستیان بەڵێن و بریارەکانی وەزارەتی تازە دەربـارەی باری گشتی‌ی وولات و جێ‌بـەجێ‌کـردنی ئاواتەکانی گەل بدەنە بەر شەن و کەوی تاقی‌کردنەوە بۆیە مامۆستای بەرێز رەفیق حیلمی بانگەوازێکی بەناوی خۆیەوە

له ڕۆژنامەی ژیاندا بۆ دانیشتوانی شاری سلێمانی بڵاوکردەوە تێیدا باری تازەی حکومەتی ڕوون کردەوەو هەڵی سەنگاندو نرخاندی. ...وە داوا لە کۆمەڵانی خەڵکی دەکا کە چەند نیشتمان پەروەرێك و ڕۆشنبیرێکی ناودارو دیاریکراو بۆ ئەم ئەنجومەتی نوێنەرانەی تازە داهاتوو هەڵبژێرن بەڵکو لەم بوارەدا ئەم نیشتمان پەروەرانە بتوانن بەردێ بخەنە سەر دارێك لە خزمەت کردنی گەل و نیشتمان.

جا نیشانەکردن و ناوهێنانی خەڵەف شەوقی لەگەڵ بەڕێزان توفیق وەهبی بەگ و محمود جەودەت، وە پێش نیازی کردنی ڕەفیق حیلمی بۆ کۆمەڵاتی خەڵکی بۆ هەڵبژاردنیان جارێکی تر پایەی خەڵەف و ناوداریەتی لە مەیدانی کوردایە تیدابەرز دەکاتەوە وا لە خوارەوەش دەقی ئەم بانگەوازەش بڵاودەکەینەوە.

ژیان ژمارە 507

گانونی یەکەم 1936

ئەصلی شێوەی ئینتخابات و نامزردیو ئەدەبی بۆ ئەهالی محترمی لیوای سلێمانی

لەبەر ئەوەی کە ئەزانم رجالی حکومەتی حازرە لە ڕێگایەکی بەشەرەفەوە گەیشتون بە کورسی حکومەت وە نیازیان خزمەت و چاك کردنە لەگەڵ هەموو عیراقیەکاندا بە صورەتێکی مساوات و لەبەر ئەوەی منیش بە خۆما ڕائەپەرموم لەم حوسنی نیەتی حکومەتە استفادەو بتوانم خزمەتێکتان بکەم خۆم و تۆفیق وەهبی بەگ و میرزا تۆفیق و خەلەف شەوقیو محمود جودەت تەرشیح ئەکەم بۆ نیابەتی لواکەتان، تائێستا زۆر کەستان تەرجربەکرد ئێمەش تجربەیەك بفەرمون.

ڕەفیق حلمی

بایەخ ترین هەڵوێست بۆ نرخاندنی خەڵەف شەوقی لە هەموو ڕوویەکەوە بریتییە لە وتەی بەنرخی پیرەمێردی زاناو دانا کە ڕۆشنبیری بەڕێز ئیبراهیم ئەحمەدی تازە دەرچویی کۆلیجی حقوق ساڵی 1937 کە جاران بەناوی نەقاب پۆشەوە بۆ ڕۆژنامەی ژیانی دەی نوسی.. بەجێگری خەڵەف شەوقی دادەنێ بەم چەشنە لە چەند دێرێکدا پیرەمێرد بە تیری چەند نیشانێك دەشکێنێ وە پایەی خەڵەف شەوقی لە مەیدانی ڕۆشنبیریدا بەرز دەکاتەوە ئەمەش دەقی ئەو نوسینەی کە پیرەمێرد لە گۆشەیەکی بچوکی ڕۆژنامەکەیدا بڵاوی کردوتەوە.

ژیان ژمارە 538 1937 30 اغسطوس

**نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب**

لە خوێندەوارە هەڵبژێراوەکانمان ئیبراهیم ئەحمەد کۆلیچی حقوقی تەواوکردووە، وە سەودایی وەزیفەی نەکەوتوتە کە لە وە هاتووە ئەوقاتی دەکا. ئەم کوڕەئێمە، دەیناسین، لە هەرچی زمان هەیە شێوەیەکی زۆر پەسندی بۆ خۆی داناوە.

خەڵەفی خەڵەف شەوقی بەزەوقێکی عیلمی جەزبەیەکی شاعیری هەیە، ئەتوانێ دەعوا لە پەردەیەکی جوان دا تەسویر بکا وە بیباتە زهنی گوێگرانەوە خوا وێنەیان زیاد بکات.

بەم چەشنە پاش کوشتنی بکر دقی ساڵی 1937 ئەوەندەی پیی نەچوو کە دامودەزگای میری ئەو پەیوەندیەر برایەتیەی کە لەنیوان خەلەف و بکر صدقی دا دروست بوبو بیکەن بەبەهانە وەفەرمانی خانەنشینی بو دەرکەن کە دوایی‌یش ماوەیەکی ئەو تووی نەخایاند کە ڕوژگاری چەپ گەردیش پەلپی پی بگری وەچەیوکی زۆرداری بدا بەسەریدا وەچنگێ ستەم لە دڵی بگری کلاڤەی ژیانی بپیچێتەوە بویە لە ساڵی 1939 دڵێ گەورەی شاسواری کوردو عەرەب لە لێدان وەستا وبیرو میشکی برشتی لە بەخشندە کەوت وەگیانی پاکی بە خاکی نشیتمان سپارد،

ڕاستی‌بی زۆرمان ئەویست شتیکمان دەربارەی ژیانی وەچالاکیەکانی لەم بوارە مێژوییە تایبەتی‌یەدا بزانیایە بەڵام بەداخەوە هیچ زانینیکمان دەست نەکەوت.

کۆچ کردنی خەڵەف شەوقی دڵ و دەرونی جوڵانەوەی ڕۆشنبیرانی کوردی هەژان بۆیە شاعیری بەرزی کورد شیخ

سەلام بەم هۆنراوە بەرزەی خوارەوە کۆڕی شین و شەپۆڕی
بۆ خەلەف شەوقی گرت.. وە داخی پرناسۆری بۆ ئەم
شۆرە سوارەی کورد هەڵرشت وە ناوی بە نەمری هێشتەوە

**شیوەن بۆ خەلەف شەوقی داوودی**

هەورەکەی مەینەت جۆشاو خرۆشا
تەمی ماتەمی ڕووی دڵی پووشا
گڕەی بروسکەی چەخماخەی بەکوڵ
ڕووناکی بڕی لەسەر هەردەی دڵ
کورەی دڵ دیسان کەوتە جۆش و تاو
خوێ بوو بە سکڵ جەرگ بوو بە زووخاو
ئەدیبی نازدار خوش زویانم ڕۆ
ئەبیبی شیرین نوکتە زانم ڕۆ
وەسیەتت وابوو من بگریم بۆ تۆ
هەرەس بە ماڵم (خەلەف شەوقی) ڕۆ
ئەدیبی شیرین کۆمەڵی ئەدەب
نازداری کوردو مەحبوبی عەرەب
لای فارس سەعدی لای عەرەب لبید
لەلای تورك وەکو (عبدالحق حمید)
نوکتەو لەتیفەو تەشبیهو بەیان
وەك (سەبیح) بێکەس، بەبێ باوك مان
بگرین برێژن فرمێسك وەکو من
برا بە باڵای داودی کفن
وەك بولبول وابوو لە شەش زماندا
تاقە گوڵێ بوو لە کوردستاندا
دڵ بۆ تەئریخی وەها هاتەگۆ
لەگەڵ داودە خەلەف شەوقی ڕۆ

**خەلەف شەوقی لە کۆڕی نێشتمان پەروەریدا.**

لە چاوگێران بەناو لیستەو تاوو تویکردنی بەرهەمەکانی خەلەف شەوقی‌دا لە پاڵ بابەتی کومەلایەتی وروشنبیری گشتی کتیبی سیاسی زوق دەربارەی کێشەی فەلەستین (القضیە الفلسطینیە)یا کتیبی (وساوس السلطان عبدالحمید) دیتە بەرچاوی مرۆڤ وسەرنجی خوینەر رادەکیشی کە بەداخەوە لەبەر کەمتەرخەمی جولانەوەی روشنبیرانی عیراقی، وەنەبوونی ئارشیفی لەو کاتەدا زۆربەی نوسین و کتیبەکانی لە کونی هەتێتەش دا دەست گییر نابی بویە بە هەزار حال وە بەریکەوت توانیمان کتیبی وون بو (ذکری سعد زغلول فی العراق) بدوزینەوە تا بیکەین بە دەستکەلای دەستمان بەهویەوە دەوری خەلەف شەوقی هەلسەنگینین بویە بەباش مان زانی بو نرخاندنی و کیشانی دەوری لە مەیدانی. ووتارو نوسینی نیشتمانیدا لەو کتێبە بکۆڵینەوە.

گوواتەنی مشتێ نموونەی خەروارێکەی. ئەمە جگە لەوەی کە سەرووتاری ڕۆژنامەی ژیان سالی 1927 کە بەریز شیدنجیب بەناوی ڕۆشنبیرانی کوردەوە بەشداری گەلی کورد بەرامبەر قەومەاوی جەرگ بڕو کۆچ کردنی سەرەکی گەورەی میسر (سعد زغلول) بە یەکجاری سەرنجی بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم باسە ڕاکیشام. ئیتر ئەم هۆیانە بوو کە کەلکەلەی ئەم لێکۆڵینەوەیەی خستە مێشکمەوە.. وە ئیتر ئێوەو کتێبی (یادکردنەوەی سەعد زەغلول لە عیراقدا).

هەر لەبەری بەیانی مێژووەوە، مێژوونوسان لەسەر دۆلی (نیل) وە دووزێی عیراق دەدوێین بێ‌ووچان دوو پاتی دەکەنەوە کە هەر دوو وولات مەلبەندی شارستانی و ئاوەدانی و بێشکەی چاو هەلهێنانی خونچەی ژیان، کانگەی خێروبێرو دەغلودان بووە هەروەهاش وولاتی عیراقیش لە ئەنجاما خێروبێری ڕووباری دیجلەو فورات هاتۆتەکایەوەو دروست بووە. ئەوەی ئاشکراو ڕوونە بە درێژایی مێژوو هەرگیز پەیوەندی هەردوولا لەبەك نەپچڕاوەو نەپساوە بەلکو تا هاتووە پێویستی ڕۆژگارو خواستی مێژوو ئەم پردی دۆستایەتی و برایەتی و هاوکۆییەی توندتر پتەوترو بەهێزتر کردووە. لە کاتی تێکەڵ بوون و باوەش بەیەك کردندا هەر لایە بە ڕەنگی کاری لەوی‌تر کردووە لە خەرمانی شارستانی و ئاوەدانی و بیروڕادا یەکتریان بێ‌بەش نەکردووە. ئاڵ وگۆڕیان بە تاقی کردنەوەی‌یەك کردووەو کەلك و سودیان بە یەك گەیاندووە لە چەرخی ئیسلام و

عەرەبدا شیرازەی برایەتی و دۆستایەتیان یەکجار بەتین و بەهێز بوو کە لە ئاکامدا ڕیشەی چارەنووسی دوا ڕۆژیان و ئاوات و ئامانجیان لەیەکەوە ئالا لەپێناوی پێش کەوتن و شارستانی و دژی داگیرکەرانی مەغول و چاخ دارەکان شان بەشانی یەك تێ دەکۆشان وە قوربانی بێ وێنەیان دەدا بەم چەشنە ڕۆژکار هاتوو ڕۆژگار چوو تا دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان شەڕی یەکەمی جیهانیان بەرپاکرد وە دەرگای دۆزەخی کاول کردن، گرانی، مردنیان لەم ئادەمیزادی سەر زەمینە کردەوە ئیژ هەرچەندە گەلان لەم گەردەلولی شەڕی مردن و تالان بروێ ئەمانی ئەسوتان و دەبرژان، بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەم قەوماوە مەزنە دەرگایەکی گەورەی لە گەلاتی خەبات کەر کردەوە لە هەموو گۆشەو کون و قوژبنێکی ئەم سەر زەمینەدا ژیلەمۆی ڕاپەڕین گەشایەوە تێ کۆشەران ئالای ڕزگاری سەربەخۆیان بەرزەدکردەوە و لە پێناوی چارەنووسی دوارۆژی گەلەکانیاندا قوربانییان دەداو خوێنیان ئەڕێژرا ،لەم چەرخە مێژووییەدا شۆڕشی گەلان هەریەکە بە ڕەنگێ کاری دەکردە سەر ئەوی‌تر هەر هەلقە بە چەشنێ هەڵقەکەی‌تری ڕادەوەشاند و بەتین دەکرد ،واتە شەپۆلی ئەم ڕووبارە دەهاتە سەر ئەو ڕووبارە وە تێکرا گشتی دەرژایە ناو دەریایی بێ بنی جولانەوەی شورشگێری جیهانەوە. جولانەوەی نیشتمانی میسری شۆڕشی 1919 میسری دەوری بالاو کاریگەری خۆی لەسەر بزوتنەوەی نیشتمانی عیراقی و شۆڕشەکانی نواندووە بۆیە محمد مهدي بەسیری نیشتمان پەروەری بەناوبانگی عیراقی لە پێشەکی ئەم کتێبەدا بەڵگەی زیندو و بەهێز بۆ ئەم دیاردەیە دەهێنێتەوە وە دەڵێت:

ئێمە لە جولانەوەی نیشتمانی عیراقیدا هەمیشە شوێن پێی تێکۆشەرانی میسرمان هەڵ دەگرت لەتێکڕا قوناغ و پلە جۆراوجۆرەکاندا هەمیشە بانگەوازو ووتە پرسۆزەکانی سەعدمان دەخستە بەرچاوو پەیتا دەمان خوێندەوە وە مێشکی زاخاو دەدایەنەوە هەستی ڕاپەڕینی تیدا دەبزوانین هەروەکو لە گفتوگۆماندا بە شان و بالای خەباتی گەلی میسردا هەڵمان دەدا، پاڵەوانێتی سەعد زەغلول مان، باس دەکرد، دواتر دەهاتینە سەرباس و خواستی بارو دۆخی خۆمان چی‌پێویستە بیکەین بۆ چارەسەرکردنی ئەم بارەی تییدادەژین؟. من لێرەدا تەنها هەر چیرۆکێکی کورت، دەهێنمەوە بە نموونە کەنیایا ڕوون دەبێتەوە کە تێ کۆشانی گەلی میسروە خۆبەخت کردنی سەرۆکەکەی تاچی ڕادەیەك کاری کردۆتە سەر ڕۆڵەکانی عیراق.

لە ناوەراستی نیسانی 1919 چەند ژمارەیەکم لە ڕۆژنامەی (العقاب) کە لە شام دەردەچوو دەست کەوت کە تێیدا باسی گرتنی سەعدو هاوڕێکانی و ناردنیان بۆ (مالتە) وە باسی خەبات و قوربانی دانی گەلی میسر دەکات. پاش خوێندنەوەی ئەم باسانەی ڕۆژنامەکەم دایەدەست چەند خوێندەوارێکی‌تر بەم چەشنە ئەم ڕۆژنامەیە دەستاو دەست گەڕا تا لەدواییدا هاتەوە لای خۆم کە لەگەڵ نامەیەکدا بۆ برادەرێکم نارد لە نەجەف وە تێیدا نوسیم: ئەگەر میسری بێ‌دەرەتان بتوانێت لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆییدا ئەم کارە ڕاپەڕینێ کە لەم ڕۆژنامەیەدا نوسراوە گوایا ئیتر ئێمە بۆچی لە پاڵەوە دەستەوئەژنۆ دانیشین. ؟ ،لە کاتێکدا کە ئەگەر ئێمە بکەوینەخۆو ئالای خەبات بەرزکەینەوە، دەتوانین زیاتر لە سێ سەد (300) هەزار چەکدار بخەینە کۆڕی خەباتەوە، هاوڕێیەکم لەوەرامدا ووتی: ئێستا هەست دەکەم کە ئەمە تەنها دەرەفەتە کە مرۆڤ دەتوانێ بەو پەڕی شەرەفەوە بەرەومەردن بچێ ئەمە، بەڵگەیەکی زیندووە لە کارتێکردنی شۆڕشی میسرو سەرکردەی کە سەعد لەسەر هەژانی گیانی ڕاپەڕین لەناو ڕۆڵەکانی عیراقدا، بەم چەشنە جولانەوەی نیشتمانی عیراقی لە قەوماوە جەرگ بڕەکەی میسر لە کۆچ کردنی سەرۆکی جولانەوەی میسر سەعد زەغلول لە 23 ئاب 1927 دڵی داخورپاو هەوری ماتەمی بەرچاوی گرت هەست و هۆشی هێنایە بزوانن.

کۆچ کردنی سەعد لەجیهاندا دەنگی‌دایەوە پێشکەوتووخوازان لە هەر چوار گۆشەی ئەم گێتی‌یەدا بە پەخشان، بە هۆنراوە، بە ڕێگەی تر هاوبەشی خۆیان

لەگەڵ گەلی میسردا دەربڕی وە ڕۆشنبیرانی عیراقیش لەم رووەوە ئەرکی سەر شانی خۆیـان بەجێ‌هێنـا، ئەوە بوو لە ڕۆژی کۆچ کردنی سەعـدا تا چلەی ڕۆژنـامەو گۆڤارەکانی ئەو وەختە، العراق، النهضة، اوقات البغدادية، استقلال، لغة العرب، الزمان العالم العربي، الأخاء البصري. . . هتـد تێکـڕا ڕازابـووە بەهـەڵبـەستی ئاگراوی شاعیرەکان بە نوسینی بەپێز نوسەران هەرلایە لە گۆشەیەکی تایبە تییەوە لە سەعد دەدوان باسی پاڵەوانیەتی وسەرکردایەتی بێ‌وێنەیان دەکرد.

ڕۆشنبیـران ڕۆژی حەوتی نشـرینی یەکـەمی 1927 بۆ کۆبوونەوەیەکی گشتی بانگەوازێکیان ڕاهێشت کە بەدەم ئەم هاوارەوە نزیکەی 3 هەزار لە پیاو و ژن لە سینەمای ڕویاڵ ئامـادەی کۆبـوونـەوە بوون کە تێیـدا پیـاوی گەورە هەر لە وەکیـلی سەرەکـی وەزیـرانــەوە هاشـمـی تا نوێنــەرانی نەنجـومـەن، نوێنـەری حیـزبەکان، ڕۆژنامەگەران شاعیرو نوسەرە بەناوبانگەکان سەرجەم هاوبەشیان تێیداکرد پارێزەر سلیمـان فيضي، نوێنـەری پارێـزەرانی بەسـرە سعيد چلبی سابیت نوێنـەری حزبی شەعب لە موصـل، پارێـزەر عمـر ئەفنـدی حاجی علوان، نوێنــەری حیـزبی نهضـە دکتـور محفوظ نوێنەری حیزبی وطنی ابراهيم افندی عطارباشی ،لەم چلڵەیەدا بەشداریان کرد.

پاش ئەوەی شاعیری گەورەی عیراق عبدالحسين چلبی ئەرزی هۆنـراوەیـەکی بە نرخی خوێنـدەوە، بەڕێـز ڕوفائیل بطي وتەیەکی جوانی دا ،دوایی مامۆستا جميل صدقی زەهاوی بە هۆنراوەیەکی بەرزی دڵگیر دوایی بە کۆبوونەوەکە هێنـا، بەدەنگــەوە چوونی جوڵانــەوەی ڕۆشنبیـری بۆ ئەم ڕووداوە جەرگ‌بڕە نیـشتمـا نیـەوە پیشـانـدانی دەوری باڵایان و بەجێ‌هێنانی ئەرکی پیرۆزیان وەدەرخستنی بیروڕاو هەڵـوێستی خۆیـان بێ‌گـومـان بەکـارێکی شۆڕشگێڕیو خۆ نیشاندانیکی میللی لە قەڵەم دەدرێ دژ بە دەزگای میری ئینگلیـزی داگیـرکــەر لەو ڕۆژەدا ڕاستی بێ ڕۆشنبیـرانی عیـراقی لەو ڕۆژەدا کاربــەدەستـان و دەستـەپـەیـوەنـدانی بیگـانـەیـان بەمـەریـەك ڕسواو سوك کرد کە هەر ئەوەندەیان بێ‌کــرا تۆڵـەی خۆیـان لە ڕەفـائیـل بطی بکـەنـەوە، وە بە فەرمانی وەزیری ناوخۆی دەستی لە ئیش بکێشێنەوە.

شیـاوی باســە خەڵـەف شەوقی لەم مەیـدانـەدا وەکـو شۆڕەســواری ئەسـپـی خۆی تاو دەدا و دەوری باڵای لەم بوارەدا بە دروسـتـی دەنــوانــد ئیـتــر چی بەنــوسـیـن لە ڕۆژنامەکاندا بێ یا لە ئامادەکردنیو کۆکردنەوەی ڕۆشنبیران یا گوڵ بژێری ئەم وتەو پوخنەکردنی ئەو توسراو پەخشان وە هۆنراوانەدا کە بەمناسەیەتی ئەم ڕۆژە مێژووییەوە وترابوو. ئەوەی سەرنج ڕاکێشەرە ڕۆشنبیرانی میسر هەرچی لە سەر کۆچ کردنـی سەعــد زەغلول وتــراوەو نوســراوە لەپــاش بژارکــردنی لە کتێبێکی تایبــەتیــدا بڵاویــان کردوتـەوە لە عێرافیشدا خەڵەف شەوقی بەناوی ڕۆشنبیرانەوە ئەم ئەرکە پیرۆزەی گرتە ئەستۆی خۆی بۆیە کە محمد مهدی بەسیر لە پێشــەکی ئەم کتێبــەدا زۆر سوپـاسی خەڵـەف شەوقیو خاوەنی کتێبخـانـەی نیشتمـانی حمیـد ئەفندی زاهد دەکاو داوای سەرکـەوتنیو بەرزیـان بۆ دەکـا، یەکـەمیـان چونکـە ئەرکی بژارکـردن و کوکـردنـەوەی هەلگـرتـوەو بەجی‌هینـاوە دووەمیـان چونکـە چاپ کردنی کتێبـەکەی لە کیسەی خۆی گرتۆتە ئەستۆ.

خەڵـەف شەوقی لەم کتێبـەدا کە بریتـە لە 182 لاپەڕە وەکـو ڕۆشنبیـرێکی سیـاسی هەڵکەوتوانە دێتە مەیدانەوە ئەو وتارانەی کە لەسەر سەعد زەغلول نوسیویەتی ،سوارچاکی بی وێنەی خەڵەف شەوقی دەنوێنێ زۆربەی وتەکانی ئەم کتێبە بریتیە لە هێرش بردن بۆ سەر ئیستعمارو بیلانەکانیو ستـایش و پیـاهـەڵـدانـە یەدەوری سەعـد وسەرکردایە تی‌یە بێ‌وێنـەی لە مەیـدانی سیـاسـەتی ناوخـۆیی ،یـەکیـەتی نیشتمانی، پشت بەستن بە گەل و خزمەت کردنیەتی، داوا لە وەزیـرەکـانی عێـراق وە نوێنەران و پارێزەرو مامۆستایان و لاوان دەکا وەکو سەعدبن و شوێن پێی لە خزمەت کردن و خۆبەخت کردنیدا هەڵگرن، وەکو سەعد پلەو پایەیان بکەن بە قوربانی ئاوات و ئامانجی گەل نەك بۆ مەبەستی تایبەتی

هەروەهــا داوای سەرکــردەیەکی وەکـو سەعـد دەکـات بۆ عیراق و جولانەوەی نیشتمانی.

ئەوەی ڕاستی بێت کتێبەکـە بریتیـە لە سەرگـوزەشتـەی پوخت و جوانی مێژوویی خەباتی گەلی میسر کە بێگومان بلاوکـردنـەوەی لەو ڕۆژەدا کەلـێـنێکی گەورەی لەبــاسی بێئـاگـایی و چاونـەکـردنەوە پرکردۆتەوەو کەلکێکی باشی بە خوێندەواران بەخشیوە چونکە مێژووی ژیانی سەعد هەر لە دەوری منـالیـەوە تا کاتی پارێـزەری، وەزیـری و تا دەگـاتە شۆڕشی 1919 تا کۆچ کردنی تێکڕا خاڵی گرنگ و دیارە کە پێویستە خەبات کەران دەرسی لەسەر وەرگرن و مەشقی لەسـەر بکـەن، منـداڵی سەعد وە خوێندن و دەرچوونی لە ئەزهەر ئاشنایەتی و دۆستایەتی بەستنی لەگەڵ محمد عبدەو ویـەجـووتە دەرس خوێندن لە قوتابخانەی نیشتمانی جمال الـدین ئەفغـانی داو بەشـداربوونی لە شۆڕشی عەرابی پاشا ساڵی 1882، گرتنی سەعد، وە دەرچوونی لە بەندیخانەو سەرکردایەتی کردنی شۆڕشی 1919 نیشتمانی ئەم ژیانی پرگۆیەندو هەڵبەزو دابەزە دەرسێکی بەنرخ دەدا بە خەبات کەرانی عیـراق بۆیـە کە جولانـەوەی نیشتمـانی میسـر هەر چەندە ئامانجی نەپێکاو نەگەیشتە پلەی تورکیا، وە سەعد هەرچەندە نەگەیشتە پلەی مصطفی کمال بەلام هەرچۆنی بێت جولانــەوەی نیشتمـانی عیـرءاقی ئەم تاقی کـردنـەوەی دەکردە تویشو بۆ هەنگاو نان بۆ ڕزگاری و سەربەستی پاش پێشـەکی کتێبـەکـە کەبـریتیـە لە نوسینی محمد مهد بصیر قســەو ووتـەی خەڵـەف شەوقی کە دوایی دێتـە سەر ووتـەو هۆنــراوەو پەخـشــان تێ هەڵـکێش کراوەکــان و هۆنــراوە گرنگـەکـانی کە بریتی یـە لە هۆنراوەی مصطفی جوادو سێ هۆنــراوەی درێـژی جمیـل صدقی زهـاوی و هۆنـراوەکـەی حسین علي الأعظمي، محمد علي الشیخ یعقوب محمد بهجت الاسەری، ابراهیم ادهم الزهاوی جگە لە ووتەی یەکـەمی خەڵـەف شەوقی دوانی تـرو، وتـەی تر دێ کەناوی بەسەرەوە نیە دوایی دێتە سەر ووتاری روفائیل بطی پاشان مظفر زهاوی، عبدالرزاق ناصری یەك دوانی تر کە بریتین لە نوسـەرانی بەسـرەو نەجـەف جاوا بۆ نمـوونـە ووتازەکەی خەڵـەف شەوقی دەنـوسین کە (سـەعـد)ی بەمیرابوی میسر داناوە چوارەمین جارە میسر دڵی دا دەخورپێ.

یەکــەمین جار میســر لە قەومـاوی (دنیش وای)دا دڵی داخـورپـا، دووەم جار ڕۆژی ناشتنی تەرمـەکـەی مصطفی کامـل بوو، ڕۆژی 11 شبـاتی 1908 سێهـەم جار ڕۆژی کۆچ کردنـی پاڵــەوان محمــد فریــد بوو ئەم جارەش کە چوارەمـیــن جارە ڕۆژی ماڵ ئاوایـی سەعــد ڕۆژی 23 اغسطوس 1927. بەڵێ میسر دڵی بۆ ئەو ڕۆڵەیە داخورپا کە پەیمانی بەگەلەکەی دابو کە تامردن تێبکۆشێ لە پێناوی سەربەخۆیی و ئازادیدا.

دڵی میسـر داخـورپـا چونکە سەعدبوو کە بە شانازییەوە بێ ووچــان دەیگــوت (من گە لم گەلیش منـە) کە ژیـانی تەرخان کردبوو بۆ گەل وە نوێنەرێکی ڕاستەقینەی گەل بوو.

دڵی میسر داخورپا بۆ ئەو ڕۆڵەیە کە چواردە ملیۆن بە ناوی یەوە هاواریان دەکرد، یا سەعد، یان شۆڕش.

بەم چەشنـە لەم بوارە مێـژوویـەدا خەڵـەف شەوقی وەکو نوســەرێکی سیــاسی خاوەن بیــرێکی نیشتمــانی دژی داگیــرکـردنی ئینگلیـز وە دەزگـای میـری ناوی دێ، کە بۆ هۆزەکــەی و گەلــی کورد دەبـێــت بە مایــەی شانازی و سەربەرزی، بۆیە پێویستە جولانەوەی کورد بە چاوێکی گرنگەوە بروانێتە ئەو ڕۆشنبیریە گەورەیەو دەورێکی بالای لە مەیـدانـەکانی ڕۆشنبیریدا هەڵسەنگێنێ و بنرخێنێ و نازنـاوی شۆڕە سواری ڕۆشنبیـری بە یەخـەیـدا دادورێ و، بەشـانـازیـیـەوە بەرهـەمـەکـانی کۆکـاتەوە وە چاپی کاتەوە وە بیخاتە ناوکتبخانەی ڕۆشنبری کوردییەوە.

جێگای خۆیەتی کە گوڵێنەی چاوگێڕان و لێکۆڵینەوەمان لەســەر ئەم کتێبـە گرنگـە بە تۆیـەوانـەی ئەم چەنـد دێڕەی خوارەوە کە لە پێشکەیەکەیدا نوسراوە بئاخنێن:

ئەم کتێبە خەلات بێ
بۆ گەلی میسری جوامێر

بۆ حیزبە یەکگرتوەکانی میسر
بۆ پایەبڵند مصطفیٰ پاشانحاس جێگیری سەعد
ئەمە یادگارێکە هاوبەشی ڕووڵەی دووزێ عیراق بۆ ڕۆڵەی نیلی بەشەرەف پیشان دەدا.

پەراوێز

1 ـ لە کاتیکدا جولانەوەی نیشتمانی کورد بە سەرکردایەتی شێخ محمودی نەمر لەبارو دۆخێکی ناهەمواردا دوو دوچاری هەڵدێری مان و نەمان و ژێرکەوتن نائومێدی بوبوو لەم هەلویستە نالەبارەدا جولانەوەی ڕۆشنبیریی کورد بەم سەر ووتارەی خوارەوە کە لەلایەن ڕۆشنبیرێکی کوردەوە ڕەشید نجیب نوسراوە توانی بیروڕای خۆی و دەنگی پر ناسوری بەرامبەر کۆچی دوایی سەعد زەغلول سەرۆکی میسر دەربڕێ وە ئەرکی هاوکوێی هاو سیایەتی دۆستایەتی لە ئاستی میسری خەبات کەردا بەجێ بهێنێ.

ژیان ساڵی 2 ژمارە (84) 4تشرین ئەوڵی 1927

سەعدی میسر نا سەعدی دنیا مرد

تەقریبەن مانگێك لەمەوپێش یەکێ لە ئەعازیمی شەرەق بەڵکە لە ئەعازیمی دونیا وەفاتیکرد. نەماتی ئەم پیاوە بۆ میسر هەرچەند خەسارەتێکی گەورەیە فەقەت وون بوونی ناوی سەعد لە سیجل و دەفتەری وەتەن پەروەرانی دونیادا زیانێکە کە تەلافی قابل نیە.

ئینسان کەخەباتی ئەم پیاوە گەورە بە شەرەفە لێك ئەداتەوەو ئەیهێنێتە بەرچاو و بەلا ئیختیار هەروەکو بەرامبەر بەمە عبود وەتەن پەروەری وویان ئیلاهی (دیگراندندیشی) وەستابێ وە زەدەو لەرزە ناك ئەبێ.

سەعد هەرچەندە وەتەن پەروەرێك و ئازاد خواهێکی میسر بوو فەقەت لە عەینی زەماندا میسال وێنەیەکی شەرافەت و حەق پەرستیبوو، ئەم زاتە وەتەن پەروەرەو شەریفە لە جیهادی میللی وە جیهادی وەتەنیشدا توشی ئەنواعی مەوانیع وە مەهالیك بووە فەقەت بە مەتانەتێکی مەردانەو عەقیدەو مەفکورە وە مەیلی خۆی تەبدیل نەکرد ئەوەڵ و ئاخری وەك یەك وابوو هیچ قودرەتێك وە قوەتێك بەسەریا ئەجرای نفوذی نەئەکرد بەلای ئەووەوە یەك حەق یەك حەقیقەت هەبوو. ئازادیو ئیستقلالی میسر بۆگەیشتن بەم غایەیە لە داخیل وە هەتا خاریج تاقەتی بۆ جەهدو کۆششی کرد.

موحەقەق ئەو ڕۆژەی جەمیعی مەخلوقات لەلای مەعبودی ئەعزەم موحاکەمە ئەبن سەعد وەکو شاسوارێکیتری حەمیەت و حەماسەت لە صەفی ئەوەڵ مجاهدین حوریەت و ئیستقلال دا عەرزی مهابت ئەکات سەعد تەنها لە میسر نەمرد سەعد بە شەریەت و بیلخاسە وەتەن پەروەران وە حەق جۆیاتی بە شەریەتی بەجێهێشت نیل لە مەودوا لەجیاتی فەیەزانێکی ساڵانە لازمە لە هەیەجانێکی دائیمی ڕەوید دابێ. بۆ سەعد نەك تەنها میسر هەتا نەکو هەموو زێ حەیاتی بەڵکە هەموو عەناسری کائینات لازمە گریان وە تەعزیەدار بێ. تەلاقی ئەم ئەفولە موحزنە وە عالەم شمولە تەنها بەیەك شت مومکنە ئەویش هەموو خەطەیەکی شەرق بۆ پێگەیاندنی سەعدی بۆ خۆی هەوڵ بدا کە ئەمەش لەغەیر مومکناتە. لەم خصوصەوە ئێمەش لەگەڵ میللەتی نەجیب یمیسردا تەشریکی هەموو حەسرەت و ئەلەمێك ئەکەین.

سەرچاوەکان:


1 کتیبی قصص مختاره من الأدب الترکی قاهره.. ساڵی 1936

2 ـ ذکریٰ سعد زغلول في العراق بغداد 1927

3 ـ نوسینی لەڕۆژنامەی عیراق بەناوی (أکرادخدموا اللغة العربیة) 1984/10/1 بەناوی دکتور محسن جمال الدین.

نوسینی لە ڕۆژنامەی عیراق بەناوی أکراد خدموا اللغة العربیة 1985/1/26 بەناوی صادق الأزدي

4 ـ دانیشتن لەگەڵ بەرێز سبیح کوری خەلەف شەوقی کە ئیستا (عەرزوحاڵ چییە) لە دائرەی طابو لە ئەعظمیە.

# « سوند و نفرین »

نزار محمد سعید



ئەف کۆمەڵێن جیهانێ، هەر ژکەڤن و کەڤنار، سوندێ دژیانا خومدا دناسن و دئاخڤتنێ خوە یێن رۆژانەدا ب کار دئینن.

چاخێ هێڤدکەینێ دێ بینین کو سوند دگەلەك هەلکەڤتن و دەلیڤادا سەری هلددەت و دەورێ خوە دبینیت . ژ وان، دەما کو هندەك گومانا کریارەکا پوچ و نەمروڤانە،

دبنە دەڤ کەسەکی و شلتاخ و گونەهبار دکەن، بەری هەر رەنگەکێ دی یێ بەرەڤانیێ ،ئەو کەس دێ سوند خوت و چهاریکاریا سوندی بۆ یێن لهەمبەری خوە خویاکەت، کو وی دەستلگەل نینە و ئەو خرابی نەکریە.

کو دیسـان چاخێ تشتـەك دناڤ برەکـا مروڤـادا هنـدا دبیت، هەر کەس دێ ژبەرێ خوەڤە سوند خوت کو های ژێ نینــە، علمــێ وی ناگــەهیتێ، یان ژی خوەیێ وی تشتی، گەر تشتێ بەرکەڤتی بیت، دێ وان دەتە سوندێ .ســونـد دکـوشتن و کوشتـاریـان دا دزیـانکـرن و بازارادا ،بدەورێ دادگەهێ رادبو، هەر دۆزەك، نیارەك، ئارێشەکا هەبا سوندێ خوە دکێشا ناڤ، ئو تا نهۆ ئەڤ چەندە مایە. گەلەك ژڤان رودانا بسوندێ بکوتایی دهاتن و خیش دبون. کەسێن جهێ گومانێ بسوندخارنێ ،گومان ژخوە دور دئێخست.

ل دادگەهان سوند دەورێ خوە دبینت و دکارێن خوەدا خەلکی د دەنــە سونـدێ، ژ بەر کو راستیێ بێـژن و درەوا نەکــەن. ژ ئالــەکـێ دن، تا ئیــرو تەڤ وەلات، چاخێ کاربـدەستـا رادکـەن، کارەکی د دەنـە دەستی، ئوبـالەکێ بستـۆیی‌ڤـە دگـرن، بەری هەمی تشتـا د دەنـە سوندێ کو براست و درستیی‌و دلسوزیی‌و دلپاکی، بکارێ خوە رابیت.

ل با کوردان و تەڤ ملەتێن بوسلمـان، سونـد تشتەکێ پیــروزە، ل ئەردی نادەن، نەوێــرن زو بزو ژدرەو سونــد بخون. واسی دمێشکێ وان دا هاتیە چەسپاندن، کو ئەگەر هات و ژدرەو سونــد خار، دێ دەمــلدەســت، یان لپاشەرۆژێ، کارەساتەکا مەزن هێتە سەری.

ژ لەو مروڤ هەنە ل با وان ژ بنی سوند ناخوت، نە ژدرەو نەژارست، نەمازە گەلەك بوسلمان.

خودایێ مەزن و میهرەبان دگەلەك سورەتادا ژ سورەتێن قورئـانـا پیـروز سونـد خاریـە ب وارێن پیـروز، بچاخی، بشەڤ و رۆژا، ب ئەردو ئاسمانا... ژ وان سورەتێن کو دقــورئــانێدا هاتین: سورة البلد، سورة الشمس ،سورة الضحیٰ سورة العــادیــات، سورة العصـر، سورة التین، سورة اللیل.

خونـدڤـانێ هێـژا، بشتی ڤێ پێشەکیێ، ئەم دێ هێین سەحکەینێ ،کا کورد ب چی سوند دخون، ب تایبەتی لناڤ بادینان، چەند نمونەکا بەرچاڤ کەین:

(1) سوند ب خودایێ مەزن و میهرەبان:

.ب خودێ
.ب ناڤێ خودێ
.ب ئسمو ناڤێت خودێ
.ب ئەوێ ئەردو ئاسمان دانایں.
.ب هەر سێ ناڤێت خودێ
ئەز یێ خودێ بم
.ب خودانێ عالەمێ کەمە.
.ب خالقێ بێ شریك.
.وللا وبلا وەتلا.
.ب وی خودێ یێ خودینیێ دکەت.
.ب حەقێ خودێ

(2) سوند ب قورئانا پیروز:

.ب قورئانێ
.ب قورئانا بابێ لێ خانذی
.ب کەلامێ قەدیم
.ب جزیك
.ب هەمی قورئانا
.ب سەد قورئانا
.ب سەد تایێت قورئانا
. بهزار قورئانا
.ب چل هزار قورئانا
.ب «مسحەڤ»
.ب سیهـ جزی قورئانا
.ب قورئانا خودێ بۆ پێغەمبەری هنارتی
.ب قورئانا پغەمبەری لێ خاندی

(3) سوند ب پێغەمبەرا:
.ب سەرێ پێغەمبەری
.ب پێغەمبەر
.ب پێغەمبەرێ خودێ
.ب پێغەمبەرێ ژ نك خودێ هاتی
.ب سەد پێغەمبەرا
.ب پێغەمبەری
.ب چل هزار پێغەمبەرا
.ب هەمی پێغەمبەرا
ب نەبی ئینس
.ب ئینس پێغەمبەر
.ب مەحەمەد پێغەمبەر
.ب محەمەدل مستەفا
(4) سوند ب قەنج و چاکا:
.ب غەوسێ ل بەغدا
.ب غەوس ل گەیلانی
.ب مەزارێ بریفکا
.ب هەرسێ مەزارا
.ب شێخ ێ ل کولەکا
.ب شێخ عەلی
ب شێخ مصطفێ
.ب شێخ ئادی ،مەلك تاوس. ئێزدی پێ سوند دخون. .
.ب پیرێ حەلانی
. ب شێخ ل ئیسلام
. بغەوسێ هیزانی. ئەڤی‌و یا ژێری، ل کوردستانا تورکی پێ سوند دخون،
.ب شێخ موسێ عنزەلی
.ب پیر. هەمەد . .ب زیارەتێ ل چیایی هندەك ل دەڤەرا مزوریا پێ سوند دخون.
.ب شێخ عبدالعزیز .ب هەردوو مەزارا . هۆزا سورچیا پێ سوند دخون.
.ب شێخ ئیسلامێ بەرێ گارێ .ل دەڤەرا بەرێ گارەی ل رەخێ ئامێدیێ پێ سوند دخون.
.ب سەیدو قاس هندەك ل دەڤەرا مزوریا پێ سوند دخون.
. بشێخ ئەحمەد .ب شێخ ئیسف.
دبێژن ئەڤ هەردوو شێخە برا بون، کافرا کوشتن ل گەل زەیتونا خوشکا وان. ل گوندێ باسەوا ل ناڤ مزوریا پێ سوند دخون. کەس نە دوێریا ب زەیتونێ سوند بخوت. ب بو دارەك ل ناڤ بەرا هەردوو برایێن خوەدا، دارەکا زەیتونێ. گەر ئێکی ڤیابا سوندەکا مەزن ب دەتە بەر ئێکی دا بێژیتی «بۆ من ب زەیتوینێ سوند بخو»،
.ب مەزارێ شێخ عەلی جیران .ل زاخو پێ سوند دخون.
.ب مەزارێ هرورێ هرورێ گوندەکە ل دەڤەرا بەرواری بالا.
.ب شێخ بهاء الدین. ل گوندێ بامەرنێ‌یە.
.ب شێخ پیرامیس .ل گوندێ زێوێ، نێزیکی بامەرنێ.
(5) سوند ب سەرێ خوە کەسێن هێژا و گورێن مریا.
.ب سەرێ خو.
.ب سەرێ خو ب سەرێ تە
ب سەرێ بابێ خو
.ب سەرێ برایی
.ب سەرێ کوری
.ب گورا بابێ
.ب گورا دەیکا
.ب گورا برایی
(6) .ب حەجێ
.ب بەرێ بەیتێ
.ب شەڤێ

. ب شەڤا ئەینی
. ب تعامی
. ب نانی
. ب قیبلێ
. ب هەمی سوندا
. م چ دینو ئیمان نەبن
. ئەز ژ ئولا خوە دەرکەتی بم. ئێزدی دبێژن.
. ژنا من ژ من چویی بیت.
. ب تەلاق
. ب تەلاق و مسحەف
. مەهر کریێ دەیکا خو بیت
. ب حەلال و حەرام
. هەرسێ تەلاقێت من ژ من دچویی بن
. ب شەرەف
. ب شەرەف و نامیس
. ب شەرەفا خو
. ب شەرەفا بابێ خو
. ب شەرەفا براینیێ
. ب ڤێ رۆژێ
. ب ڤی ئاگری
. ب ڤی روناهیێ
. ئەڤ سمبێلە ب من ڤە نە بن
. پا بدین و ئیمان
. ب بەرعەت
. ب غیرەت . ب غیرەت و نامیس.
. ب چل و پێنج شەهیدێت ئەدنی ئەدنێ گوندەکە ل دەڤەرا بەرواری بالا . ل ڤێ دەڤەری دەما سەرا تشتەکی مەزن ئێکی ب دەنە سوندێ دێ بێژنی: راستیێ بێژە، هەکە دێ تە ب شهیدا دەمە سوندێ».
. ب ئێلم کوردێن سوریێ دبێژن
. ئەز عەیالێ خو د ئاخێ‌را کەم، هەکە خیلاف ژ دەڤێ من دەرکەڤیت.
. خودێ من ب کەتە (دوپشك ،بەراز).
. ئەزێ بێ ئیمان بم.

ئەڤە بون چەند نمونەك ژ سوندێن کورد دخون، دژیانا خوەیا رۆژانەدا، د تێکەلیێن خوە ئێێن جڤاکیدا، د خوەشی و نە خوەشێن خوەدا، دکرین و فروتنادا.

## «نفرین»

نفرین: ئاوات و داخاز و نیاز خواستنە ژ خودێ، یا پێغەمبەرا، یا قەنج و چاکا، کو نەخوەشیەك ب هێتە سەرێ کەسێ نفرین لێ دهێتە کرن.

ل با کوردان ژنکێ دەورەکێ مەزن هەیە دچێکرنا نفرینادا ،گەر هیڤکەینێ ژی، دێ ژ مەرا خویا بیت، کو ئەڤ نفرین لێ کرنە، ژ عەیالێ وێ دەست پێدکەت، پاشی مروڤێن دورو نزیکێن وێ، یێن کو دل ئێشیەکێ بۆ چێدکەن، واتە بەهرا پتر نفرینا ل عەیالێ خوە دکەن، د دیڤرا پلا دووێ ل بیانییا.

ژ نفرینێ مەرڤ دکاریت داخازا خوەیێ وێ ب زانت، ژ لەو ئەو گەلەك ل ڤێرێ ب نا ڤدا ناچینە خوارێ و دێ بۆ دەلیڤەکا دن هێلین. نهۆ ژی ئەز بڤەر دبینم ئەم ڤان نفرینێن ل بەر دەست ژ هەڤ پارڤە ب کەین ل دوی بابەتێ نفرینێ واتە ناڤەروکا هیڤی و داخازێ، یا کو خوەیێ نفرینێ دکەتە دلێ خوە و، پاش دەرتێخیت، چ بڤێت ب جهـ ب هێت، یان نە.

چی‌یا ژ دل بیت و چی‌یا ژ نەدل بیت.

(1) ئێشی و نەخوەشی و زیانا ئەندامێن لەشی:

. ئاڤا رەش هاتیە بن چاڤێت تە.
. ئیشەللا ژ ئاڤێ تیرتر نەری.
. هەی پەنجەشێرێ تو گرتی.

. ئێشا زراڤ تە ب گریت.

. ئیشەللا دەردەك تە ب گریت دەرمان نەبیت.

. ئیشەللا كولكا حەلەبێ دێ تەگریت.

. ئیشەللا مێلاكێت تە د دەڤێ تەدا ب هێن.

. ئیشەللا دێ سهو مێلاكێت تە د دەڤێ تەدا هێن.

. ئیشەللا گرێ «خوریان» حێشترا دێ بەربیتە تە.

. ئیشەللا دێ بابێ سۆر كەڤیتە هناڤێت تە.

. سیناهیێ ب چاڤێت خوهنبینی.

. پشتا تە ب شكێت.

.ب ئیشەللا سەرەجە دجەرك و مێلاكیت تەدا ب هێت.

. ئاگرێ سۆر تە ب گریت.

نێرك د چاڤێ تەرا بهێت،

. ستۆ شكەستی.

. تۆپ دل.

. چاڤێت تە ب رشن.

. ئیشەللا تو هلوەستی داوەستی ئاڤا رەش ژ مێلاكێت تە ب هێت.

. مێلاك كون.

ئیشەللا دێ دەیە بشرونقەو دانیە رانێت خو.

. ئیشەللا دێ دەیە ب هنار ترشك و دانیە بن سەرێ خو. دەمێ ئێك مالێ ئێكی ب خوت ڤان هەردوو نفرینێن ژوری لێ دكەن.

## (2) هیڤی و داخازیا نەمان و مرنێ:

. سەرێ تە بن بەر كەم.

. هیڤیا من خودێ یە نە گەهیە سوباهی.

. ئیشەللا دێ ب خو دەیە ب كفن. گەر ئێكی مالێ نێكی خاربیت.

. نەگەهی ب بیە زاڤا، نەچیە بن پەریێ.

. ئوهو داوۆ دارێ زاڤاینیێ نە بینی.

. هەی تویا عنزەلێ پ تە كەتی.

. دێ هەرە، چون هەبیت هاتن نەبیت.

. دێ هەرە ئیشەللا چونا حەجیكێ پتێ بیت، دیارە ئەڤەیێ چویە رێبارەكێ و نەزڤرییە.

. ئیشەللا تۆیا بلال لحەبەش ب تە ب كەڤیت.

. ئاها تە چوك ل بەر نەڤەدا .واتە نە گەهی ب بیە زاڤا.

## (3) چەند نفرینەكێن تێكەل.

. ئیشەللا خشێنا شەلی ل بن سەرێ تە نەهێت.

دایی دبێژتە كورێ هەتا دەهـ سالیێ، نفرینەكا بچوكایە، نەیا ژ دلە ئانكو ئەڤێ ڤێ نفرینێ دكەت نە گەهشتیە گلۆمتێ غەیدینێ و كەربێ.

. گیانی پێ نەكری.

. د دفنێت تەدا بێت.

. ئاها كەڤتە گهێت تە. چاخێ یەك نان و نمەكێ یەكی دخوت و خاپەكێ لێ دكەت ،ڤێ دبێژن.

.ب ها داوۆ ئیشەللا تو ب خویی و ڤەخویی و ل تە نەخێڤت. یان، نەكەیە گوشت و خوین.

. دێ هەرە هەی تە خوەلیا بنێ كوچكا ب سەرێ مە وەركری.

. من تو ب رەش كری.

. من تو ب شین كری.

. من تو ب گەر كری.

. خولی سەر، خولی نەیار، خولی دوژمن.

. شیرێ من دایە تە ل تە حەرام بیت.

. كەرافی بت: ئانكو د دفنێت تەدا ب هێت، ب تایبەتی زاخویی دبێژن. «كەرافی» گیایەكێ بێقام تەحلە.

. ئیشەللا تو ب جانیا خو شاهـ نەبی.

# ئەسپ و ...

## سەنگی زۆری لە شیعری فۆلکلۆری کوردیدا

● محسن ئاوارە ●

ـ هەر لەگەڵ شەبەنگی مێژووی مرۆڤی نشتەجێ بوو و دەستەمۆکردنی ئاژەڵ و باڵندەی کێوی‌و داکردنیان و ئاوەدان کردنەوەی ئێرەو ئەوێ چ بە کۆچەری‌و ڕەوەندایتی‌و هەڵدانی دەوارو ڕەشماڵان یان بە قوت کردنەوەی خانوچکەو پێکەوەنانی دێ‌و تا دەگاتە گوندو شارۆچکەو شاری گەورە گەورەو سەرهەڵدانی شارستانیەت و هەتا ئیمرۆی زێندەی رکێف لێدەرو دەستەبەندەی تەکنەلۆژیاو ئەتۆم و جورەها ئامێری هاوچەرخانەی تیژڕەو. . ئەسپ بە بەردەوامی سەدەکان لە گشت وولاتانی جیهاندا بایەخ و گرنگی‌و سودی لە ژمارە نەهاتووی هەبووەو ڕۆڵی کاریگەرانەی بینیوە لە ژیان و گوزەرانی مرۆڤدا جگە لەمانەیش سەنگە و نوداری‌و جوانی ئەسپ بە شێوەیێك کاری خۆی بینیوە هیچ بوێژ و هونەرمەندێك نەیتوانیوە خۆی لە دەستی رزگار بکات و باسی ڕەسەنایەتی‌و خورتی‌و جوانی‌و خۆشڕەوی سامناکی نەکات، چ بە فڵچەو بۆیەو پێنووس یان داتاشینی لەسەر تاوێرە بەردو درەختەکاندا.

هەروەها لەناو عێل و عەشیرەت و لە دیوەخان و لەژێر ڕەشماڵانیشدا وەختێ دێنەسەر باسی شۆڕەسوارو مێرچاکان بە شانازیەوە باسی ئەسپەکانیان دەکەن جا شایەرو بەندبێژ و حکایەت خوان و خۆش خوانان لە تێکستە فۆلکلۆریەکاندا وەدیار دەکەوێ چ بە ستران و بەندو لاوك و حەیران تۆمار اکرا بن یان بە داستان و حکایەت و بەیت و سەردولکەی ئافرەتان و گێرانەوەی دەماودەم. . هتد کە بۆمان ماوەتەوە، وە بۆ ئەوەی زیاتر بەرەو قوڵایی باسەکەمان شۆڕبینەوەو ڕوونتر مە بەستەکەمان بخەینە روو بە چەند خاڵێکی گرنگە دێینە سەر باس کردنی‌و لەپاشاندا نمونەی پێویست دێنینەوە.

### 1 ـ ئەسپ و جۆرەکانی:

ئەسپ گەلێ جۆری هەیەو بە چەندین ناوو خاسیەت و ڕەنگە و خوو ڕەوشت دەناسرێنەوە کە هەر یەکەیان لە سروشت و چاپوکی‌و خۆشبەزی‌و ڕەسەنایەتی‌و نارەسەنی و قەبارەو شێوەو دیمەنیدا. هتد، لێك جیا دەکرێنەوەو سەنگە و نرخی تایبەتی خۆیان هەیە لە کۆمەڵدا بەلام بە شێوەیێکی گشتی دوو جۆریان هەن ئەویش. . یەکەمیان (ئەسپی ڕەسەن) کە خەلکی ڕەشۆك بە (جسن) ناویان دەبەن، واتە بە وەچە ڕەسەن بووە، دووەمیان (ئەسپە ئاسیەکان) یان نارەسەن کە شێوە گشتیەکە وەردەگرێت، وە لەناو ئەو جورە ئەسپانەشدا هەن تەنیا بۆ بارهەڵگرتن و ڕاگوێزانو جووت و ڕاژەی‌تر بەکار دێن بە تایبەتی (بارگیر).

ئەمە ئاواو دێینە سەر ناوەکانیان وەك لە ناو کۆمەڵدا باوە ئەم جورە ئەسپانە زۆر ڕەسەنن «ئەسپی سەگلاوی ـ ئەسپی هوبێدجان ـ ئەسپی تەربوشی ـ ئەسپی کەوێتی ـ ئەسپی حدود» جگە لەمانەیش وەك لە پێشدا بە دیارمان خست بە ڕەنگە و شێوەو خاسیەت گەلێ جۆری‌تر ناویان دێت وەك «ئەسپی بۆرە، شێ، شینکەی شێخ غەزالی عارەبی، گوێدە گردەکی، لەیل و پەر، کەهێڵ، باڵەبانی، پۆرەی

خاڵ خاڵ، شینکی قەزوانی، شێی موتلەق، شێی ئاڵ، ئەسپەڕەش، کەوێتی قاپ ڕەش، ئەسپی سوور، ئەسپی سپی، ئەسپی ئاوی (ئەسپی دەریا، یان بەحری) ئەسپی شینکا شێ. . هتد».

## 2 ـ خوو ڕەوشتی ئەسپ و ڕاهاتنی لەگەڵ سروشتدا:

ئەسپ ئاژەڵێکی زۆر بە هەست و جەربەزەو بە سام و چاونەترسە، بە تایبەتی ڕەسەنەکانیان تا بڵێی بە وەفاو خاوەن ڕەوشتی بەرزو گوێڕایەڵ و خۆڕاگرن، گەلێك سەدبردەو یادگاری زۆریان هەیە لەگەڵ سوارچاکان و لە ناو دڵی میللەتدا، زۆر جار لە مەیدانی شەڕگەدا خاوەن ئەسپ کوژراوە یان زامدار بووە، ئەسپەکەی گەڕاوەتەوە سەری و جێی نەهێشتووەو بە دیاریەوە بە نامۆیی و کۆست کەوتوویی و موشەموشی گریانەوە لە پرمەی داوە یان لەگەڵ حیلەی توندی ئەم ناوەی وروژاندووە، جاری وایش بووە سوار لە شاخاندا هەڵدێراوە لەبەر ئەوە ئەسپەکەی لە داخان خۆی هەڵداوەتە خوار، یان لەگەڵ دوژمنی خاوەنەکەیدا کەوتۆتە شەڕو بە چەپۆکان دوژمنەکانی داپەڵۆسیون، ئەوەی شایانی باسە، ئەسپ زۆر چاو تیژ و گوێ موچ و هەستیارە، بۆیە لە شەواندا چاکترین پاسەوانەو لە دوورەوە غەریبەماڵ دەبینێ و دەحیلێنێ تا خاوەن ماڵ ئاگادار بێتەوە. . .

ئەسپ خاوەنەکەی خۆی دەناسێتەوەو لەگەڵ هەڵس و کەوت و میزاجی خاوەنەکەی کەیف خۆش و نیگەرانی دای‌دەگرێ، بۆیە دەبینین لە کوێستانان و سەر سنورەکاندا لە هۆبەو چۆڵ نشین و دێیەکانی ئەم دەورو بەرانەدا بە ڕەوە ئەسپ بەڕەڵڵا دەکرێن و لەناو بژوێن و مێرگە و پاوانی ئەم ناوەدا پێکەوە دەلەوەڕێن و هیچ ئاژەڵێکی کێوی و درندەیێك ناتوانێ لێیان نزیك ببێتەوە چونکە گشتیان پێکەوە هاوکاری لەگەڵ یەك دەکەن و لێك دانابڕێن تا زەفەریان پێ ببەن بە هیچ کەسێکی غەریب دەستگیر ناکرێن تەنیا بە خاوەنی خۆیان نەبێ.

ئەم خوو ڕەوشتە بەرزانەی ئەسپ وای لە مرۆڤ کردووە هەر لە کۆنەوە هەڵیسەنگێنێ و بە گەورەییەوە ناوی بێنێ، بە مردن و لە ناوچوونیشی داخی گرانی بۆ هەڵکێشێ بۆیە گەر سەیری ئەم پەندانەی پێشینان بکەین دەبینین بە تەواوی لەگەڵ ئاژەڵانی تر جوێ کراوەتەوەو بە چاوێکی بەرزترەوە تەماشای دەکەن کاتی دەڵێن:

**«ئەسپێکی لەڕ، چاکترە لە تەویلەیەکی پڕ لە کەر»**
**«ماین و مەیدان، تفەنگ و نیشان»**
**«ئەسپێك دەمرێ، سەگێکی خوێری پێی خەنی دەبێ».**
(1) *

دەگەڕێینەوە سەر ئەسپ و باس کردنی لە ڕووی ڕاهاتنی لەگەڵ سروشت و دەوروبەری و خۆشبەزینی، بێ‌شك ئەسپی ناو شاخان لەگەڵ ئەسپی بیابان و دەشتەکی لە ڕەوت و غارغارێن و بەزیندا جیاوازی تەواویان هەیە، وەك ئاشکرایە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، نەك هەر ئەسپ بگرە هەتا سوارەکەیش چالاکی و جوولانەوەی دەگۆڕێ هەروەکو لە ئەفسانەی کوێر ئوغلی نووسینی (یەشار کەماڵ)دا هاتووە ئەوە دەسەلمێنێ با بڵێین ئەسپێکی کەوێتی لە بیابانان ناوەستێ و دەشتی بەر فرەوان دەخاتە پێش خۆی و وەستانی بۆ نیە، بەڵام بە ناوچەیێکی شاخاویدا لە تولە ڕێی ڕێچکەو کوێرە ڕێ و دڕناڵەکاندا خۆشبەزینی نامینێ و دەوەستێ، هەروەها لەم داستانەدا ڕەسەنایەتی و خوو ڕەوشتی ئەسپمان زیاتر بۆ ڕوون دەکاتەوە، بۆیە دەیکەینە نمونەی ئەم خاڵەمان وەختی. .

«عەلی رووشەن ئاوڕدەداتەوەو بە باوکی دەڵێ».

ـ (بابە هەورێکی ڕەش ڕەشمان بە دوواوەیە، لەناو ئەو

هەورە رەشەدا هەر ناڵی ئەسپەو برووسکە دەدا، هەورەکە ئەوەندە گەورەیە ژمارەی ئەسپەکان نازاندرێ چەندە).

(پیـر یوسف لە مەسـەلـەکـە گەیشت، گووتی ئەوانـە سواری بەگی بۆلۆون، وەدووامان کەوتوون بمانکوژن، تا دێو دەڵێت:

(ئەسپ سەیری سەر پشتی دەکات، ئەسپ سوارەکەی سەر پشتی ئازاو بوێر بوو ئەسپەکەش ئازاو بوێر دەبێ، زۆر بە پەژارەو بیـر بڵاو بوو، ئەسپـەکـەشی بەو جۆرە دەبێ، دل خۆش و کەیـف ساز بوو ئەسـپـەکـەش دل خۆش و کەیف ساز دەبێ، سەرسام بوو، ئەویش سەرسام دەبێ.. هتد).

تا دەگاتە ئەوەی دەڵێت:

(ئـەسپە بۆرە باڵی گرتـەوەو فڕی، لە چاوان وون بوو، ئەسپی رەسەن ئەوها دەبێ.. هتد).

دووبارە عەلی رووشەن (بابە بابە تۆزەکەمان لێ نزیك بۆوە.. کە تۆزەکـەمـان لێ نزیـك بۆوە قڵیـشـایـەوەو جوانـووییەکی شێی لێ وەدەر کەوت، جوانـووە شێ لەبـەر تیشکی رۆژ وەکـوو پارچـە تیشکێکی سوور وابـوو، وەکـوو زمانەی بڵێسەییەك بە دوویاندا دەکشا...

(پیـر یوسف دەڵێ: لاوۆ گوێ مەدەیێ، ئەو جوانـووە شێی خۆمانە نامانگاتێ، سەری ئەسپە بۆرە بەرەو قومەڵان وەرگێـرا، دیـارە جوانـووە شێ وەك پیـر یوسف دەڵێ لەنـاو زیخ و قومەڵان ناڕواو دەوەستێ.

دیسانەوە دەگەڕێینەوە سەر جۆرێکی تر لە ئەسپەکان:

* (عـەلی رووشـەن (بـابـە دیسان تۆزێکی رەش دێ، دیسـان لە ئێمـە خێـراتر دێ دەمانگاتێ بابە.. هەر ئێستا، هەر ئێستـا.. بابـە ئەسپێکی (شێ ئـاڵ) دری بە تۆزەکەداو دووامان کەوت، وەکو بروسکە، وەکو تیر دێت.. هتد).

پیر یوسف دەڵێت:

«سەری ئەسپە بۆرە بەرەو بەردەڵانە رەقەنەکە هۆدەوە.. هۆی دەوە با چاوم بە مەشقی (جـوانـووە شێ ئـاڵ) بکەوێ بزانم چۆن وەکو تیر دێ».

جوانـووە شێ ئاڵیش لە کاتێ لە دایـك بوونیـدا لەسـەر بەردەڵانێك بە بەردان کەوتبوو نەك لە بەردەڵان غاری نەدەدا تەنـانـەت هەنگـاویشی هەڵنـەدەهێنـا، ئەویش گەیشتـە بەردەڵانەکە بۆ خۆی رەق راوەستا».

* عەلی رووشەن دەڵێت:

(بابە، ئەم جارە کوێتێکمان دوو کەوتووە..

باوکـی دەڵێ.. سەری ئەسپـە بۆرە بۆ سەر رێگـاکـە هۆدەوە کوێتیان نەگریسن.

عەلـی رووشـەن سەری ئەسـپـەکـەی هۆداوە، بەرەو رێگاکەی ئاژوا، ئەسپە کوێت هەر کە گەیشتە سەر رێگا بوو بە داری رەق و راوەستا.. هتد).

* (2)

## 3 ـ ئەسپ و بوێژو هونەرمەندان:

هەروەکو لە پێشدا وەدیارمان خست، کە ئەسپ چۆن لە بەرهـەمـەکـانی بوێـژو هونـەرمـەندان رەنگی داوەتەوە بە نووسین و وێنەو پەیکەر بگرە بەوەندەوەیش نەوەستاون هەتا زۆر لەو ئەدیب و هونەرمەندانە ناونیشانی بەرهەمەکان و سەر بەرگی کتێبەکانیان بە ناوی ئەسپەوە ناو ناوە.

هەر لە کۆنی کۆنەوە دەبینین وەکو هێماو رەمزێك بەکار دەهێنـدرێو دەکـرێتـە نمـونەی رەسەنایەتیو کاری مرۆڤانەو خورتیو سامناکیو خۆشبەزیو چالاکیو.. هتد.

دیارە نووسەرو شاعیران و گشت هونەرمەندان لە ستایش کردنی ئەسپـدا ئەم هەڵس و کەوتـانـەی ئەسپ دوو پات دەکـەنـەوە کە چۆن (چـەپـۆکـان دەوەشێنن، دەحیلێنن، لە کۆرژن دەدەن باڵ دەگـرن، تۆز دەکـەن، شۆرەسـواران بە هەواوە دەیەخن، بە نێسکەنێسك دەکەون، دەپەڕنەوە، بە رەوەزو بەرزایی هەڵـدەشـاخـێـن، دەپـرمێنن، گوریس

دەپسێنن، دەرەوونەوە، سەرانگرێ دەبن، یان چۆن نامۆیی و کۆست کەوتوویی و دۆش داماوی دایاندەگرێو. . هتد).

#### 4 ـ ئەسپ و وەرزش:

ئەسپ، شوێنی دیـارو رۆڵی کاریگـەرانـەی هەیـە لە پێشبرکێ و سوارسـوارێن و جلیتبـازیو تەرادانێ و بازبازێن و یاری تۆپ تۆپێن و گۆگۆێن و گەلێکی تر.

وەك لە زۆر مەیـدان و گۆرەپـانـە وەرزشیـەکـاندا بە دیار دەکەون و تۆز دەکەن هەر وەها لە فیستڤاڵە گەورە گەورەکانی جیهانیدا بەرچاومان دەکەوێ کە بەردەوام ئەسپ بەشداری کردووە بۆ نمـونـە چەنـد یاریـەك لەو یاریـانە دەست نیشان دەکەین وەك.

* یاری (گـۆگـۆێن): ئەویش لە ناوەراستی گۆرەپـانی یاریەکەدا تۆپێکی دارین بەقەد، گندۆرەیێك دادەندرێ، بە کتـوپـری دەهـۆڵ و زورنا لێدەدرێ، کە دەهۆڵەکە گرمەی لێـوە هات لە هەر لایـەکـەوە شورە سوارێـك جیـا دەبێتەوەو بەپـرتـاوی شاڵاو بۆ گۆیـەکـە دەهێنێ، وە کامە سوار زووتر بیگـاتێ ئەو سەرە گۆچـانێکی تێدەسـروێنێ و گۆیەکە بەرەو لای نیشانەکەی خۆی دەبات.

* یاری پێشـرکێ یان هاڤـرکێ. . کە چەنـد تیپێـك بەشـداری تێـدا دەکـەن دوای ئەوەی سوارەکـان لە ریز یەك ئامـادە بوون هەیـای لێدەکـرێو تا دەگـاتـە ئەو جێگایەی دەسـت نیشـان کراوە کام سوار زووتـر گەیشتێ ئەوە پلەی یەکـەم وەردەگـرێ، ئەوەش رادەوەستێتـە سەر خۆشبـەزینی ئەسپەکەیو سوارچاکی خۆی.

جگـە لەم یاریـە ئاسـاییـەو بازبـازێن و زۆریتر دەبینین ئێستاکە لە گۆرەپانی یاریگەکاندا یاری تۆپ تۆپێن دەکەن کە ئەوەش لە نێوانی دوو تیپدا دەست پێدەکات کە هەر یەکێك لە سوارەکان بەرچیغێکی درێژی بە دەستەوەیە روو بە رووی تۆپـەکـە دەبنـەوەو بەرەو گۆڵ کردن دەیـدەنـە بەر بەرچیغـان جا ئەسپـەکـانیش لەم هات و برۆیـەدا رۆڵی سەرەکی دەبینن.

#### 5 ـ ئەسپ و شانۆ:

هەر وەك لە فلیمـەکـانی سینـەماو تەلەفزیون دا زۆر جار بەرچـاومـان دەکـەوێت دەبینین لە گەلێ وڵاتـانی دونیـادا ئەسپ دێنـە سەر شانـۆو مەشقی تایبـەتی دراون بۆ ئەوەی یاری سەیر سەیرمان نیشان دەن وە ئەو دەورانەی ئەسپەکان دەینـوێنن دەبێتـە جێی سەرسـورمان و خۆشنودی جەماوەری ناو هۆڵەکەو بینەرانی ئەم جورە فلیمانە بە تایبەتی لە سێرکە کومیـدیـەکـانـدا کە وەك وشکـەرن (مهرج) رەنگ کراون و خەلکی دەهێننە پێکەنین.

#### 6 ـ ئەسپ و رەوەندو خێڵەسات:

مێژووی پەیوەندی نێوانی ئەسپ و رەوەندەکان تا بڵێی کۆنەو تاکو ئێستاش لەم هەوارو لەو زۆزان و لەوان هۆبەدا فلانـە رەوەنـدو فلانـە خێڵەسـات ئەسپی کەهێڵ و رەسەنی هەیەو تا بڵێی توکمەیەو جوانە، فلانە دەوارنشین ئەسپێکی هەیە لە بای غاردا دەست و پاشووی نابێنی هێندە جسن و رەسـەنـە کە خاوەنـەکەی دەیشـەتێنێ و زینی دەکـات بەو جلەوی زەردو سووری سورمەکراو هەر تەماشایەکی دونیایەك دەهێنێ هەر مەپرسە ئەم ستایشانەو زۆرتریش. . جا ئەسپی خۆشبەزو بەهێزو ساماناك لەلای ئەو رەوەندانە پەیدا دەبێ، کوێستـان و گەرمیـانیـان پێدەکـەن، لە زمەنـدو چێنکەو لەوەرگـاکـانـدا دەیانلەوەرێنن و ئازادو چاوکراوەو چاونەترسن جگە لەمەیش باریان دەکەن وەختێ خێوەتەکان دەپێچنەوەو

ـر و بنـە تێـك دەنێن و ڕێگـای دوورو درێـژ دەبـڕن و ئەو قۆنـاغ و ئەو قۆنـاغـان دەكـەن و تخـوب و كەوشـەنـەكانیش دەبەزێنن، جا ئەم حاڵەتە نەك هەر لە وڵاتی ئێمەدا بگرە لە هەموو جیهاندا بووەو هەیە بۆ نمونە شیعرێك دەهێنینەوە كە ە كتێبی (گــۆرانی قەرەجــە گەڕۆكــەكــانـدا) هاتـووە لە وەرگێـڕانی (هـانـزیگـون فویكت) بە ناونیشـانی (ئەسپ و سوارەكـەی) كە لە سربیـەوە بۆ زمـانی ئەڵمـانی وەرگێڕاوە ئەم ڕاستیەمان بۆ دەسەلمێنێ كە باسمان كرد.

## ئەسپ و سوارەكەی

سەفەرم كرد.. دوور دوور ڕۆیشتم
ئەسپەكەم ئاو نەدا بوو
ئەسپەكەم ماندوو ببوو
هێندە نەمابوو لەژێر زینەكەیدا بمرێ
«تا دێ‌و دەڵێت»
لێی پاڕامەوە تا ئارام بگرێ
پێم ووت: مل نێ ئەی ڕەسەن
هێندە نەماوە بگەینەوە ماڵ و دەوەن
ملی دەسوڕاندو پێی ڕادەگەیاندن بەو دوو چاوانەی
كە بە چاوی (دایك)م دەچوون
چاوانی خێر وا داماو بوون
دوور دوور ماینەوە.. ئەسپەكەم ئاو نەدا
مل نێ ئەی ڕەسەن،
ئێستا دەبینی لە پشتیەوەی چیادا
دەواری سپی، خێوەتی جوان جوان
مێرگی زێرین و كانیاو
بۆت هەڵدەكشێن تاكو نێو چەوان

* (3)

### 7 ـ ئەسپ بۆ دیاریو دەستەوایی:

لە بەر سەنگ و بەنرخی‌ی ئەسپ و ناودەنگی‌و گەورەیی لە ناو هەمـوو گەلانی جیهـانـدا هەر وەكـو لە حیكـایـەت و بەیت و شیعـرە فۆلكلوریـەكـاندا بۆمان روون دەبێتەوە لە نێو بەگ و سەرۆك عەشیـرەت و ئاغـاو كێخاو میـرانـدو هەتـا سەرۆكی وولاتـە میـرنشینـەكـان و پاشـاكـانـدا ئەسپ دیـاریـەكـی زۆر بەرچـاوو گرنـگ بووە بە نمـوونـە ناودەهێندرێ كە فلانە پادشا ئەسپێكی سەگلاوی بە دیاری ناردووە بۆ فلانە میرو لە یاد ناكرێ، یان ئەسپێكی كەویت قاپ ڕەش لە خوێنی فلان كوژراو دراوەو لە نێوانی ئەو دوو بەرە باوكە سوڵح كراوە خوێنیان لە بەین نەماوە.. هتد.

### 8 ـ ئەسپ و لەشكرو سوپا

ئێستایش لەگەڵ دابی لە سوپاكان و دایرەكانی پۆلیسدا كە لە پێشـدا بە (قشلە) ناویـان دەبـرد، ئاخـوری زۆرو تەویـلەی گەورە گەورە هەیـەو ولاخـێكی زۆریـان تێـدا داكـردووە، نالبـەنـدو سایزو مەیتەرو پاسەوانی خۆی هەیەو خزمەت دەكرێن.

لەگـەڵ دامـەزرانـدنی سوپـاو پێكهێنـانی هێـزی بەرپاو دابەش كردنیان لە سەرانسەری وڵاتدا كاربەدەستانی میری بە جەڵەب ئەسپیان كریوەو مەشقیان پێ‌كردوون و بەكاریان هێناوە لە كاتی شەڕو ئاشتی‌دا تا ئەم سالانەی دوایش بەر لەوەی ڕێگـاو بانـەكـان پەرەبسێنێ‌و قیـرتـاو بكرێ‌و جورەها ئوتومبیلی تیژڕەو بێتە مەیدان، ئەسپ سەرچاوەی سەرەكی بووە لە ڕاگـوێـزان و سواربـوون و بار هەڵگرتن و كاروباری سوپـایی، ئەمـەیش لە گشت جیهـانـدا هەروەكـو لە فلیمە كۆنـەكـانـدا بەدیـار دەكەوێ كە لرفەلرفی بەیداغان و ئالای لەشكرو سوپاكان چۆن بە ڕەوە ئەسپ سوار وەستاون بە زرێ پۆش و تیـرو شیـرو قامچی‌و تفـەنـگ وە. هتـد، كە چاوەڕوانی فەرمان دەكەن بو هێرش بردن و گورز وەشاندن یان بۆ گەڕانەوە.

## 9 ـ ئەسپ بۆ ڕاوشکار:

مەگەر هەر لە دیوەخانان و ژێر ڕەشماڵی چۆڵ نشینەکان باسی ئەسپ بکرێ چۆن شوڕەسوار تانجیو تولە بە پێشە خۆ داوەو کارمـامـزێکی سرکی لەنـاو زورگە و هەڵـەتـان هەستاندووە پێی دەرکیڤی ئەسپە بۆرە ناوە، تا نەگەیشتۆتە سەر ئاسکـە لە خڵت و خۆل وەردراوەکـە نەپـرینگـاوەتەوە، یەکێکیتر باسی ماینە شینکە قەزوانیەکەی خۆی دەکات، ئەوەی تریان دەڵێ ماینە ڕەسەنەکەی منیش ئاواو. . هتد.

سوار زۆر شانازی بەمە دەکات، کە لە ڕاو دەگەڕێتەوە ئەگـەر نێچیـرێکی بگـرتـایە، بە بن سکی ئەسپەکەی شۆڕ دەکردەوەو بەرەو ئاوایی دەگەڕاوە. . ئینجا ستایشی ئەسپ و تانجی دەکرد کە تا چ رادەیێك بەزیوەو جیفرکی لێ داوە.

## 10 ـ ئەسپ لە گەڕی شاییو داوەتاندا:

قرمـژنی تەقـەیـەو دەهـۆڵ و زورنـا دەکـوتـرێو نیشـانـە دەپێکـرێو ناپێکـرێ، شاییو زەمـاوەنـدەو بازنـەی گەڕی ڕەشبەڵەك بەقەد جۆخینێکی زۆر گەورە فرەوان بووە، هەراو زەنەو قاوقیژ ی منداڵان و شاباشی ماقوڵان و گۆرانی چڕین لەو ناوەدا ئەسـپـی خورت و کەشـم و نەشـم و باز بازێـنیو هەستـانــە سەر پاشـوویو لە کۆڕژ ن دانی لە ناو مێـرگ و مێرغوزاران جوانترین تابلو دەنەخشێنێ مەگەر ڕەنگەکانی لە پەلکە زێرینەی دەم کەل وەرگیرا بێ، جگە لەمەیش هەر لە کۆنەوە لە زۆر شوێن و گوندەکاندا تیپێك ئەسپ سوار لە بەر دەمی کەژاوەی بووك دەست بە تەڕادانێ دەکەن، وە ئەگەر ژ ن بە ژنی بێت ئەوە تیپێکیتریش لە بەرەکەیتر بە هەمان شێوە ڕوو بە ڕووی یەك دێن تا ئەو جێگایەی دەست نیشان کراوە بۆ بووك گۆڕینەوە، زۆر جاریش کە ئافرەت بیرەوەری خۆی دەگێـڕێتـەوە وەختێ بووك بووەو گواستـراوەتـەوە دەڵێ منـیـان لە سەر ئەسـپێکی تەڕبـوشی سوار کرد بوو، وەك ئێستای هەندێك لە ئافرەتان کە شانازی بەوە دەکەن گوایە بە ترومبێلی جامپو یان سوپر گوازراونەتەوە.

## 11 ـ ئەسپ لە پێناوی گەلێ ڕاژەیتردا:

ـ ئەو خاڵانەی کە باسمان کرد تیایدا بۆمان بەدیار کەوت کە ئەسـپ تا چ رادەیـێـك ڕاژەی کۆمـەڵانی چەنــد سود بەخشە، لێرەدا هەندێك سودیتری ئەم ئاژەڵە دەخەینە ڕوو کە دەبێتە دوا خاڵی باسەکەمان ئەویش ئەوەیە. . دەڵێن:

ئەم ئاژەڵە نرخی تەواو نابی بۆ بارهەڵگرتن و بار ڕاکێشد ن چ بە ئارەبـانــەو گالیسکــە یان ڕاگـوێـزانی هاوڵاتیـان لە شوێنێکــەوە بۆ شوێنێکی کە جگـە لەمـەیش بۆ کاروبـاری کشـتــوکـاڵیو هەوجــار ڕاکێشــان و کێـڵانی زەویوزارو گواستنـەوەی بەرو بوومی جوتیـاران هەروەهـا بۆ کاروبـاری بازرگـانـیو ئاڵ و گوڕ کزدنی کەل وپـەلی ناوچـەکـانی شاخ نشین و دەشتــەکیو دێــوەرە. . وە بۆ هەڵسـوڕانـدنی بەرداشی گەورە گەورەی هاڕینی ساوەرو برنج و. . هتد).

خوێنەرانی هێژا. . .

دێینە سەر ئەو تێکستە فۆلکلوریانەی کە ئەسپ سەنگی زۆری لە ناوەڕۆکی بابەتەکانیدا هەیە، بە تایبەتی لە شیعرە فۆلکلوریەکاندا.

* ئەسپی سەگلاوی کە ڕەسەن و خۆشبەزە، دەبینین لە تێکستـەکـەی (دم دم)دا ناوی دێت، هەر وەکـو لە تحفەی مظفـریـەدا هاتـووە کە خانی برادۆستـان بە خان ئابـدەڵی موکـریـیــە دەڵێت وا نیشــان دەدات کە هەمـوو ئەسپـان دەپسێنێ لە غارغارێندا بەڵام جوێ لە سەگلاوی هەروەکو لەپێشـدا باسی ئەسپی سەگـلاویمـان کرد لێـرەیـەشـدا ئەم ڕاستیەمان بۆ دەسەلمێنێ:

زرێیانت بۆ دەپسێنم، خانی خۆم، جوێ لە داودییە
ئەسپانت بۆ دەپسێنم، خانی خۆم، جوێ لە سەگلاویە
پیاوانت بۆ دەپسێنم، خانی خۆم، جوێ لە سی ساڵییە
(هتد...)

* (4)

لە (بەیتی لەشکری)دا کە لە دوو توێی ئەم نامیلکەیەدا هاتووە برای نووسەر (ئەسعەد عەدۆ) کۆی کردۆتەوەو ئامادەی کردووە دەبینین ناوی چەندین ئەسپ دەکەوێتە بەر چاو کە شانازی پێ دەکرێ‌و گەورەیی ئاغای خۆو مەزنی وەدیار دەخات لەو سەردەمەدا کە ئەو جورە ئەسپ سوارانەی بە دواوەیە وەختێ دەڵێت:

وەکی ئاوری خۆم دەداوە
ئاغای خۆم پێنج سەد سواری لەگەر بوو
هەموو ماین کەوێتی قاپ رەش
سەر زینێ گوراوو بە دوونیان لێ دەدە
وەکی ئاورێدکەم دەداوە، ئاغای خۆم
پێنج سەد سواری لە گەر دابوو هەموو ماین بۆرەیێ خارخار
سەر زینی مەخمەری کەسکیان لێ دەدە
وەکی ئاورێدکەم دەداوە ئاغای خۆم
پێنج سەد سواری لە گەردابوو هەموویان شینکی قەزوانی
سەر زینی مەخمەری زەردیان لێ دەدە
(هتد...)

* (5)

یان دەبینین لە بەیتی (شۆڕ مەحمود) لە کتێبی (لیرەیەك لە گەنجینەی نەتەوەی کورد) ئەویش هەر لە کۆکردنەوەی کاك ئەسعەد عەدۆ سوار بوونی عاشقێك وەك ئەحمەدی شەنگە لە سەر ئەسپێکی لەیل وپەر چەند شانازی بە خۆیەوە دەکات و سەنگی ئەسپ لێرەدا بە چ شێوەیێك رەنگ دەداتەوە کاتێ دەڵێت:

یان ئەحمەدی شەنگە
ئەگەر سوار دەبوو لە ولاخەکی لەیل وپەر
لەی وا بی هیچ کەسی لە دونیادا نییە
ئەوە ئاشقەو هیچ ئاگای لە خۆ نییە
چونکە بۆ خۆی لە سەرێیەو روحی لە کن
مەرزن گیان حەپسی
(هتد...)

* (6)

هەر لە هەمان کتێبدا ئەگەر سەیری هەقایەتی (ناسرو ماڵ ماڵ) بکەین دەبینین ئەسپ چۆن هەڵدەدرێتەوە شوێنی مەزنی خۆی هەیە بۆ ئەوەی شۆرەسوار هەڵداتەوەو بە گەورەییەوە نیشانی بدات کە دەڵێت:

ئەمما با بە چاوێکی سووکەڵە نەچێتەوە پێش چاوی مامییە چونکە مامەمان زۆر ئینسانێکی بێ روحم و بێ لوتف و بێ ئینیتفانە چ قاعدەو قانوون و ئوسولی نییە.

با بچینەوە ئەوێ تەویلەو تەویلەخانی ببینە دەرێ دوو گوێدە گردەکییە لە پشتیان بکوتین زینێکی موعتەبەرو بە تەنیشتیاندا. بەروەدەین جوتێك گاوزەنگی لەوی دەمورساییە (هتد...).

* (7)

دێنەوە سەر تێکستێکی تراژیدی لە فۆلکلوری کوردیدا ئەویش (سورمێ خان و قورشیدی چاو بەخار)ەکەی کاك تاریق جامباز ئامادەی کردووەو چەند دێری لێ هەڵدەبژێرین کە لە دوو توێی نامیلکەکەیدا هاتووەو ناوی ئەسپان دووپات دەکاتەوەو دەوری گرنگی تیایدا بە دیار دەکەوێت کە دەڵێت:

سورمێ ئەیگۆ (قورشید ئەز خولامێ)
وەی لێ..

ئینجا برا چەند رۆژا بەرێوە بوون
هاتنە سەرێ چیایێ هێستوونێ
ئەو هەسپێ سوورم لێ سوار بیوو
لە سەر چیایێ هێستوونێ
رێیێ راوکەرا ئێ نێچیروانا
مقەدەر لێ مێوان بوو
لێ نێزیك بوو لە سەرێ چیایێ هێستوونێو. .
ئەو هەسپێ شینکا شێ تاری
رەبێ خودێ مارا توو خەرا بکا
هەسپێ شین ئەتوو لۆ نسکۆ برد

(هتد. . .)

* (8)

* با ئاورێك لە فۆلكلۆری ناوچەی دەشتی هەولێریش بدەینـەوە کە خوشکـە (ئـاوازی لـە حـمـەدی حەمـەدەمینی دزەی) کۆی کردۆتـەوە وە لەم کتێبـەیدا گە لێـك شیعـری فۆلـکـلـۆری دەسـت تیشـان کردووە لە زۆر رووەوەو نووسیویەتەوە بە ناو نیشانی(فۆلكلۆری کوردی لە ناوچەی دزەییـانـدا) وە لەم تێکستـانـەدا نووسینـەکـەی ئێمـەی دەسەلمێنێ کە ئەسپ چەند بە سەنگەو فەرامۆش ناکرێ، ئەوەتا لە ناو گەڕی شایی‌و زەماوندا چۆن ناوی دێت:

«بووکانە بووکێ»
گەردەن سوسنی زەردە بووکێ
لێت پیرۆز بێ پەردە بووکێ
ماینی بوکێ شێیە بووکێ
سەر زینی ڕێ ڕێیە بووکێ
قوناغ لە پردێیە بووکێ
بووکانە بووکانە بووکێ

(هتد. . .)

* (9)

هەر وەهـا لە پرسـەو شیـن و شەپـۆردا کە ئەسپ بێ سوارەکەی ماوەتەوە کەس و کارەکەی سوار لە خۆ دەدەن و دەگرین و یان بە سەردولکەی ئافرەتانە دەیلێنەوە هەروەکو لە هەمان کتێبدا هاتووە:

کەسم نما هەولێر گردە
ئەسپی بردە
نسکۆی بردە
سواری مەردە
کەسم نما ئەسپی شێیە
لە حەوشییە
لاو لە کێیە
کەسم نما ئەسپی بۆرە
ماری زۆرە
شوونی کۆرە

(هتد. . .)

* (10)

یان باسی ئەسپ سوار لە ڕاوشکـاردا لە هەمـان کتێبـدا هاتووە دەڵێت:

هەی ڕاوە ڕاوە ڕاو لە گردی باقرتی
ئەسپان زین و لغاو کەن تاژییان بەردەنە ڕستی
کیژ بووی لە مارە بابانێ چەند جارم مەمك گرتی
(تا دێو دەڵێت)
هەی ڕاوە ڕاوە ڕاو ڕۆیی‌و نەگەڕاوە
ئەسپان زین و لغاو کەن تاژییان مامز گێڕاوە

(هتد. . .)

* (11)

دوا نمـونـەمـان مەقـامـە بە ناوبـانگـەکـەی سێـوەی هونـەرمـەنـدی نەمـرە کە شیعـرێکی فۆلکلۆرییەو مامۆستا

کەریم شارەزا لە کتێبەکەیدا بە ناوی (مەقامەکانی شێوەی هونەرمەندی کورد لە تەرازووی رەسەنایەتیدا) دەست نیشانی کردووە، بە ناوی عایشە گور لێرەدا ناوی ئەسپ دەدروشێتەوە وەختێ سوارەکەی بەرەو ڕاوشکار پێ دەرکیفی دەنێ کە دەڵێت:

ئەگەر عایشە گور دەرێ
هەر کەسانەکی سوارە چووکەلانەکەی م ناناسێ
ئەوەتانێ سواری جوانییە ماینەکی
بۆری ئەسعەد بەگی کەوێتە
لە لایەکی دەڕۆن جووتەکی تولەو لەوی دیکەشی
جووتە تاژی مل بە قەرێتە

(هتد....)

* (12)

سەرچاوەکان:

* (1) چەند پەندێکی پێشینان
* (2) لە ل80 تاکو ل86 (ئەفسانەی کوێر ئۆغلی) نووسینی (یەشار کەماڵ) وەرگێڕانی (شکور مستەفا).
* (3) کتێبی (أغانی الغجر) هانزیگون فویکت - وەرگێڕانی بۆ عارەبی (نامق کامل●) - ل18 -
* (4) ل3:2/ تحفەی مظفریە/ ئۆسکارمان/ بەشی یەکەم/ هێمن
* (5) ل27 - 28/ بەیتی ئایشە گول/ کۆکردنەوەو ئامادە کردنی ئەسعەد عەدۆ.
* (6) ل27/ لیرەیەك لە گەنجینەی نەتەوەی کورد/ کۆکردنەوەی ئەسعەد عەدۆ. لە بەیتی (شۆڕ مەحمود).
* (7) ل63 هەمان سەرچاوە/ لە هەقایەتی ناسرو ماڵ ماڵ.
* (8) ل96 - 97/ لە کتێبی محەمەدو سێوێو سورمێ خان و قورشیدی چاو بەخار/ کۆکردنەوەو ئامادەکردنی/ تاریق جامباز/ لە بەیتی سورمێ خان و قورشیدی چاو بەخار.
* (9) ل55/ کتێبی (فۆلکلوری کوردی لە ناوچەی دزەییاندا) کۆکردنەوەی (ئاوازی ئەحمەدی حەمەدەمینی دزەیی) لە شیعری فۆلکلۆری کوردیدا
* (10) هەمان سەرچاوە (لە شیعری شین و پرسەدا) ل57
* (11) هەمان سەرچاوە (لە شیعری ڕاوووشکاردا) ل78 - 79
* (12) ل32 کتێبی (مەقامەکانی شێوەی هونەرمەندی کوردی لە تەرازووی رەسەنایەتیدا) نووسینی (کریم شارەزا).

## پەراوێز:

زەمەند = لەوەری زۆر وزەبەند.
درناڵ = خاکێکە گرنج گرنج و بەردو کەل وبەری زۆرو شەقار شەقار بێ مرۆڤ نەتوانی بە ئاسانی بە سەریا بڕوات.
وەچە = نەوە یان (ذریة).
توکمە = مەحکەم - کە ئەسپێك مکووم و توکمە دەبێت.
نێسکە نێسك = کە ئەسپ دەست بە نازو عیشوەو لەنجەو لار دەکات.
دەبێژن ئەسپەکە بە نێسکە نێسك کەوت.
پڕینگانەوە = وەختێ ئەسپ دەرەوێتەوە - یان بڵێین سڵەمینەوە.
چێنکە = ئەو جێگا شین و تەڕەی کە هەر دەم چیاوە شینە.
سەرانگرێ = هەلبەزینەوەی ئەسپ و ساتمە کردنی.
بەرچیغ = ئەو دارەیەدەدرێتە پاڵ چیغ یان دەخرێتە بەر بنمیچی خانوو.

# داب و نەریتی زیندی ئاژەڵداری و کشتوکاڵ لە دەشتی گەرمیان دا

نووسینی: محمد حمه صالح توفیق

ناوچـەی گەرمیـانـی کوردستـان داب و نەریـتێکی ئاژەڵداریو کشتوکاڵی تایبەتی تێدا باوە، کە لە زۆر ڕووەوە لەگـەڵ ناوچـەکانی دیکـەی کوردەواریدا لێـك دەچن و بەتایبەتی ناوچە دەشت نشینەکانی وەکو شارەزوورو دەشتی هەولێر، لەم ناوچەیەدا کەلەپوورێکی کوردانەی ڕەسەن لە نێـو خەڵکدا چەسپیوە لە ئەنجامی چەنـدان سباڵ ساڵی ڕەنج و تەقەلای بێووچانی دانیشتوانی. لە بواری گۆرانیی میللیو پەنـدی پێشینـان و حەکایـەتی جۆراو جۆرو ڕێو ڕەسمی شین و شاییو پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەدا بە خەروار گەوهەری نایابی کەلەپووری نەتەوایەتی لێوەدەس دێنی.

ئەوەی کە لێرەدا من مەبەستمە تیشکی بهاومەسەر، نەریتی ئاژەڵ بەخێوکردنە بە هەموو کەڵێن و قوژبنێکیەوە لە ڕێو ڕەسمی شوان ڕاگـرتن و مەڕومـاڵات لە بێـرگە دان و مەشکـەو مەڵان و هەمـوو پێوەنـدییـەکی کۆمـەڵایـەتی بە ئاژەڵدارییەوە. هەروەهاش لە داب و دەستووری کشتوکاڵ کردن بەتـایبـەتی گەنـم و جۆ کە دەشتی گەرمیـان پێی بەنـاویـانگـە دەکـۆڵمەوە، هەر لە جووتیارو وەرزێر [سەپان] ڕاگرتنەوە، تا کۆتایی کێشەو گێرەو خەلەو خەرمان هێنانە ناو و ئەو کەرەسەو تفاقانەی تێیدا بە کاردەهاتن، ئەوانەی کە لە دێر زەمانەوە لە برەودا بوون تا ئەم سەردەمەی، کە ڕەوتی شارستـانێتی دەیـان پێچێتـەوەو، لە بزی ئەوانـە ئامێـری

کشتوکاڵی نوێ لە چەشنی تراکتۆرو کەمباین (مەکینەی درەو) جێگەیان دەگرێتەوە.

ئەمەی من لێرەدا تۆماری دەکەم ئەزموونی چەند ساڵەی ژیانی خۆم بووە لە دەشتی گەرمیانداو بۆ زۆر شتی ووردیش چەندان پرسیارم لە فرە ژن و پیاوی بەساڵدا چووی ئەو ناوە کردووەو تا لەتوانامدا بووە هەوڵم داوە کارەکەم وورد بێت.

أ ـ ئاژەڵداری: ـ زۆربەی خەڵک لێرە خاوەنی ئاژەڵ و پاتاڵ بوون و، لە زۆر شوێنیشدا مەرو ماڵات و گاو گۆتاڵ پلەی یەکەمیان بووە لە سەرچاوەی داهات و بژێویداو، لە پاش ئەم ئەو ساکشتوکاڵ هاتووە. تا ئەم دواییەش خێڵە کۆچەرییەکانی جاف تا نیشتەجێ بوون هەر تەنیا خەریکی ئاژەڵداری بوون و بۆ ئەم مەبەستەش گشت ساڵێک لە بەهاردا بەرەو کوێستان دەچوون و لە پایزدا بەرەو خوار دەبوونەوە بۆ گەرمیان. ئێمە لێرەدا هەر لەسەر گوندنشینەکان دەدوێین و مەسەلەی کۆچی گەرمیان و کوێستانی هۆزی جافی ئەو سەردەمە باسی تایبەتی خۆی دەوێت. لە گەرمیاندا ساڵانی گرانیو قات و قڕی لێ دەرکەین دەبینین مەرو ماڵات بەخێوکردن پیشەی هەموو ماڵێك بووەو هەمیشە هەژاریو دەوڵەمەندیی خەڵك بەوە ژمێردراوە، کە چەند سەر مەرو بزن و مانگای بووە، لەسەردەمی زووتریشدا ڕەوە ئەسپ و ماینیش بەشێکی هەرە گرنگی سامانو دەوڵەمەندان بووە.

● شوان و شەرتی شوانی: ـ لە ئاواییەکدا هەر کەسێك کۆك و دەوڵەمەند بوایەو ڕانەمەڕو بزنی ببوایە ئەوەیان کوڕی خۆی دەنارده‌کن ڕانەمەرەکە یان شوانی بۆ ڕادەگرت. شەرت یان کرێی شوانیی زوو بە حیسابی شەش مانگە بوو. خاوەن ڕان بۆ هەر سەد سەر مەڕو بزن لە ماوەی شەرتە شوانییەکەدا شەش گیسکی دەدا بە شوان، بەڵام ئەگەر ژمارەی ڕان لەوە زیاتر، یان کەمتر بوایە ئەوە کرێکەش بەو پێیە زۆر یان کەم دەبووەوە. شیاوی باسە کە تەنیا شەرتە شوانیی شەش مانگی زستان و بەهار بە گیسك بوو و، شەرتی هاوین و پایز بە پارە بوو کە وەختی خۆی 3 ـ 5 دینار بوو بۆ هەر سەد سەرێك بەڵام لەمەو دوا تا هات گرانتر بوو. وەکو لە پێشەوە ووتمان هەموو کەس خاوەنی مەرو ماڵاتی زۆر نەبوو، لە دێیەکدا هەر سێ و چوار کەس وا دەوڵەمەند بوون و ماڵەکانی تر بیست و سی و چل سەر مەرو بزنی دەبوو، هی واش بوو هەر هیچی نەبوو. بۆ ئەم ژمارەیەش شوان نەدەگیرا، لەبەر ئەوە دەکرایە لای شوانی ئەو ماڵانەی کە ڕان و مێگەلی زۆریان هەبوو، ئەمانەش پێیان دەوترا ماڵەچەو بە پێی سەری ئاژەڵەکانیان کرێیان دەدا، ئەم کرێیە کاتی خۆی دە فلس بوو پاشان بوو بە بیست و پەنجاو ئێستاش لەوە زیاترە. کرێی ماڵەچەکان دەدرا بە خاوەن ڕانەکە ئەگەر لە شەرتدا گیسکی بریار دابایە بۆ شوان. بەڵام ئەگەر پارەی بدایە ئەوە بەپێی داب و ڕەسمی باو ماڵەچەکان کرێکەیان دەدا بە شوانەکە خۆی. جا ئەگەر شوانی ماڵەکە سەڵت بوایە ئەوا لەسەر خاوەن ماڵ دەبوو، ئەگەر خاوەن ژن و ماڵیش بوایە ئەوا لە جیاتی نانانە باراشێ دوان گەنم و جۆی دەدایە چونکە شوانەکە لەم حاڵەتەدا لە ماڵی خۆی دەبوو، هەروەها شەکرو چاو ڕۆنیشی دەدرایە کە بەزۆری شەش کەللە شەکرو دوو هۆقە چاو دوو هۆقە ڕۆن بوو، [هۆقەی گەرمیان هۆقەی ئەستەموولی بوو کە دەیکردە کیلۆو چارەکێك]، هەروەها یارمەتیو دەستگرۆیی دیکەش دەکرا. بە پێی شەرتەکەش خاوەن ڕان کراس و دەرپێیەکی خام و جامانەیەکی بۆ دەکری. بەڵام کڵاش چەندی بدرایە لەو شەش مانگەدا ئەوە هەر دەبوو خاوەن ڕان بیکرێ. هەروەها فەرەنجیو کوڵەباڵ و کەچە (کەرەك) وکڵاو بۆرە ئەوانە هەموو خاوەن ڕان دابینی دەکردن.

1 ـ کڵاش: ـ ئەوسا جووتێ لاستیکی ئەستوور بوو و کشتەکی دەزوویان بە بزمار یان بە دوورین بە سەر

لێوارەکەیدا دەچەسپاندو لەسەر ئەوەوە بە پەرگە کڵاش دەچنرا [پەرگ بەنێکە لە خوری دەڕیسرێ] پاشان لە لای وەستای پینەچی بە چەرم دەورەی دەگیرا تاوەکو بۆ ماوەیەکی زۆرتر بەرگە بگرێ.

**2 - فەرەنجی:** - جۆرە بەرگێکی شوانە تا سەر ئەژنۆ دێت و هەلاج لە بەرگن[1] دروستی دەکات.

**3 - کوڵەباڵ:** - دیسان لە بەرگن دروست دەکرێو ئەمیش بابەتی فەرەنجییە، بەڵام تا پشتێنە دێت و زیاتر لە بەردا چەسپ دەبێ قۆڵی نییەو لەسەر هەردوو شانیەوە دوو گوێچکەی قوتی بۆ دەکەن ئەمیش هەر هەلاج دەیکات.

**4 - کەچە، یان کەڕەك:** - ئەمیشیان بابەتی فەرەنجییە بەڵام ئاودامانەو قۆڵی نییەو زیاتر شوان بۆ شەوانی سەرماو بارانی شەوەکەژ[2] بەکاری دێنێ، ئەو دەمە لەسەر کوڵەباڵ و فەرەنجییەوە لە بەری دەکات. زۆر گەرم و گوڕەو هیچ سەرماو بارانێ کاری تێ ناکات. ئەمیش هەر لە بەرگنەو هەلاج دروستی دەکات.

**5 - کڵاوبۆرە:** -

ـــــــــ کڵاوێکی سێ سووچە شوان لە کاتی باراندا دەیدا بە سەریداو تا ناوشانی دەگرێتەوە. ئەمیش هەر لە بەرگن دروست دەکرێ لە لایەن هەلاجەوە.

شوانی لە کوردەواریدا پیشەیەکی زۆر بەڕێزو پیرۆز بووەو هەمیشە بە چاوی بەرز تەماشای دەکراو زۆر جار کچی خاوەن ڕان دڵی خۆی دەدا بە شوانەکەیان وئەوینێکی پاك دەهاتە کایەوە، بەڵام داخەکەم لە کاتی خوازبێنی کردندا کێشەی چینایەتی خۆی بە زەقی دەنواندو زۆر بەدەگمەن هەڵدەکەوت کە کچەی بدرێتێ مەگەر شوانە تەواو خۆی بگرتایەو دەوڵەمەند ببوایە.

شوانی ڕەسەن و دڵسۆز هەمیشە شانازی بەوەوە دەکات کە ڕانەکەی بە چاکی دەلەوەڕێنێو زۆر بە باشی مەڕومالاتی خۆی دەناسێتەوە. ئاژەڵەکەش هەر بە پێی خۆشەویستی ئەو ئالوودەی دەبن، فرە جاریش شوان شمشاڵ ژەنێکی کارامە دەبێو هەر بە ئاوازی دڵتەزێن و جۆراو جۆری شمشاڵەکەی ڕان هێمن دەکاتەوەو لە مێرگ و پاوەندا دەیلەوەڕێنێو بە جۆرە ئاوازێکی دیکەش خڕی دەکاتەوەو نایەڵێ لە خۆی دوور بکەونەوەو بڵاوەی لێ بکەن و گورگ و دەعبا زەپەریان پێ ببەن.

**● ناسینەوەی مەڕومالات لە کوردەواریدا:** -

شوان و خاوەن مەڕومالات مەڕو بزن بە ڕەنگ و ڕواڵەتی دەم و چاوو گوێچکە دەناسنەوەو بە سەریان دەگرنەوە، هی وا هەیە ئاژەڵی خۆی لەناو هەزار سەردا دەناسێتەوە. بۆ مەڕ ئەم شێوەو سیفەتانە دەبنە نیشانەی ناسینەوە.

**1 - مەڕی تەو:** - لەسەر سینگەوە بەرەو دەم وچاوو گوێ بۆرێکی سوورباوە یان قاوەییە.

**2 - مەڕی چار:** - دەم و چاوو گوێی مەیلەو سپی یەکی کاڵە. کونەلووت و دەم ولێوی سوورباوە. چاوی ڕەشە.

**3 - مەڕی پەر:** - گوێچکەو دەم وچاوو ملی ڕەشە.

**4 - مەڕی جافی:** - پان وپۆڕو تیسك شۆڕە، هەروەها دووگ و کلێنچکەشی[3] شۆڕە.

**5 - مەڕی زراری:** - دووگی پان و خڕە، کلێنچکەی کورتە، لەشی توندوپڕە. [بێگومان لەم دوو جۆرەشدا تەوو پەرو چاریش هەیە].

**6 - مەڕی ڕەش:** - خورییەکەی ڕەشە.

**7 - مەڕی سوورکەوە:** - گوێو دەم وچاوی شینباوە، بن گوێو لای دەم و لای چاوی سوورباوە.

**8 - مەڕی بۆر:** - خورییەکەی بۆرو قاوەیی باوە.

هەروەها مەڕی گوێ کورت [کەڕی]و گوێ لوول و گوێ پانیش زۆر جار بە شێوەی گوێیاندا دەناسرێنەوە.

ناونیشانەکانی بزنیش ئەم جۆرانەن:

1 - بزنی ڕەش: - هەموو گیانی ڕەشە.
2 - بزنی هوول: - گوێی پانە. هەروەها گوێچکەو دەم وچاوی سووربا‌و یان قاوەییەکی تۆخە.
3 - بزنی هەمس: - گوێچکەو دەم وچاوی تا دەوری شان وملی سووربا‌وێکی کاڵە.
4 - بزنی پۆش: - گوێچکەو دەم وچاوی بۆزە.
5 - بزنی مارۆ: - ناوچەوانی سپی یە.
6 - بزنی بەل: - گوێی کورت و لوولە. بە پێی شێوەی گوێیدا دەوترێ بزنی [بەلەمارۆ، بەلەهوول، بەلەپۆش، بەلەڕەش و گوێ‌پان].
7 - بزنی کۆل: - ئەو بزنانەن کە شاخیان کورت و بچووکە، یان بێ‌شاخن.

● ناوی مەڕو بزن لە کوردەواریدا بە پێی تەمەن: -
أ - مەڕ: -
1 - بەرخ: - لەو کاتەوە لەدایك دەبێ تا ساڵێکی بە سەردا تێپەڕ دەبێ هەر پێی دەڵێن بەرخ.
2 - کاوڕ: - لە تەمەنی دوو ساڵییەوە تا پێ دەنێتە سێ ساڵی پێی دەڵێن کاوڕ. [کاوڕەنێرو کاوڕەمێ].
3 - شەك: - کاوڕ کە پێی نایە تەمەنی سێ ساڵی پێی دەڵێن شەك. بەزۆری مێیەکان لەم تەمەنەدا بەران دەگرن و، شەك کە بەرخێکی هێنا، پێی دەڵێن شەك مەڕ. شەکەنێریش خاوەنی یان دەیفرۆشێ یان هەڵیدەگرێ بۆ بەران.
4 - مەڕ: - شەك کە پێی نایە چوار ساڵ پێی دەڵێن مەڕ.
5 - بەران: - شەکەنێر کە پێی نایە چوار ساڵ دەبێ بە شەك بەران لەوەوپاشیش دەبێ بە بەرانی کامڵ.

ب - بزن: -
1 - کار: - لەو کاتەوە لەدایك دەبێ تا تەمەنی ساڵێك هەر پێی دەڵێن کار.
2 - گیسك: - کار کە پێی نایە دووەم ساڵ بۆ ماوەی ساڵێك پێی دەڵێن گیسك.
3 - چێبەر: - گیسك کە پێی نایە سێیەم ساڵ تا ماوەی ساڵێك پێی دەڵێن چێبەر. چێبەرە مێ لەم تەمەنەدا تەگە دەگرێ‌و دەزێ ئەوکاتە پێی دەڵێن چێبەربزن.
4 - بزن: - چێبەر کە پێی نایە چوارەم ساڵ پێ دەڵێن بزن.
5 - سابرێن: - چێبەرەنێر کە پێ نایە چوارەم ساڵ دەبێ بە خرت، لەوەوپاشیش دەبێ بە سابرێن.

● تەگەو بەران گرتنی بزن و مەڕ: -
هاوین لەپاش دوورینەوەی گەنم و جۆو کێشەکردنی گەلەباوەش و شاراکان و کاتێ کە جارو پەرێز[4] چۆل دەبن، مەڕوماڵاتی تێدەکرێ‌و پاش ماوەیەك بە تەواوی تێر لە گوڵەگەنم و گوڵەجۆی بەجێماو دەخۆن، ئەوجا گۆشتێکی باش دەگرن و دەماخ پەیدادەکەن و فرەی پێ‌ناچێ مەڕ دێتە بەران و بزنیش دێتە تەگە، خاوەن مەڕ وای پێ خۆشە مەڕەکانی زوو بەران بگرن، چونکە لەوسەر [پاش پێنج مانگ لەدایك دەبن] بەرخەکانی هەراش دەبن و زوو لە خەم دەردەچن. بەڵام بۆ بزن حەز دەکات درەنگ تەگە بگرن [بۆ ئەم مەبەستەش سابرێنیان لێ قەدەغە دەکات و نایکات بەناو ڕاندا تا ماوەیەك لە پایز دەڕوات] تاوەکو لەوسەر دەمەوبەهار بزێن، بۆ ئەوەی لە کاتی زایینیدا نەکەونە بەر سەرماو سۆڵەی زستان چونکە بزن بە سەرما حیزەڵەیەو زوو بە لادا دێت. بەگشتی خاوەن ڕان حەز دەکان مانگێ هاوینی بمێنێ مەڕی بێنە بەران بەڵام مانگێ پایزی بچێ ئەوسا بزنەکانی بێنە تەگە.

● وەرزی زستان و زاوزێ کردنی مەڕوماڵات: -
خاوەن مەڕوماڵات هەر لە پایزەوە پاش خەڵەوخەرمان کۆکردنەوە کاودانی تەواو دەخات بۆ ئاژەڵ و پاتاڵی، ئاڵف و بروێش ئامادە دەکات، کەل و کۆمی‌و تەپین و داڕووخانی گەورو پشتیر چاك دەکاتەوە، کۆزی کارو بەرخی ساواش

هەر لەوکـاتـەوە ئامـادە دەکـاو کەیبـانـۆی ماڵ خرنـووك و[٥]
کەوولـەی بۆ دێـنـێ تێـیـدا ڕادەخـات. ساڵـی وا
دێتە پێشەوە کە زستانەکەی هێجگار سەخت دەبێو زۆربەی
ڕۆژانی باران و زوقم و زەلالـەت دەبێ. ئەو دەمـە خاوەن
ئاژەڵ خەم دایدەگرێو بە هەموو شێوەیەك پەلەقاژە دەکات
هەرچی کاو جۆی هەیە بیکات بە قورگی ماڵاتەکەیداو لە
وەیشوومەی زستان ڕزگاری بکات. بۆیە بە جیا کاو جۆ بۆ
مەڕو بزنی ئاوسی دادەکـات و گیسـك و کاوڕو مەڕو بزنی
قسریان لێجیادەکاتەوە.

هەروەهـا مەڕو بزنی زاویش بە جیـا خزمـەت دەکـات.
جاری وا هەیە زستان ئەوەندە ساردە زۆربەی ماڵات مردار
دەبنـەوە. بەڵام کە زستـان ئاسـایی بوو خاوەن ماڵات ئەم
دەردیسـەری و زیـانـەی تووش نابێو هەر لە سەرەتـای
زستانەوە مەڕی دەست دەکات بە زان و نزیکی بەهاریش
بزنـەکـانی بەرەکـەت دەکـەن. ساڵی واش ڕێدەکـەوێ
زستانی گەرمیان دەڵێی بەهارە، ئەوساڵە جەژنی مەڕوماڵات
دەبێ، مەڕو شەکی بە دەماخ دیسان بەران دەگرنەوە دوای
ئەوەی کە دەزێن، بزنیش ئەگەر لە سەرەتای پایزدا تەگەی
گرتبێت و ئەویش وەك مەڕ لە زستاندا بزێت ئەوا هەم تەگە
دەگـرێتـەوەو ئەوجـا هەمـوو لە سەرەتـای هاویندا دەزێنەوە،
بەمـەش دەوتـرێ دووبـارەزا کە بێگومان ئەگەر ساڵ خۆش
بێ قازانجێکی گەورەی خاوەن ماڵاتـە. هیـچ لەوە خۆشتـر
نییە لای خاوەن ئاژەڵ کە ئێواران دەچێ بە دەم ڕانەکەیەوە
دوو دوو و سێسـێ کارو بەرخ وان لە توێـی کەچـەو
فەرەنجی شوانەکەیدا.

ساوە کۆرپە [کارو بەرخ] لە زستاندا دەرناکرێنە دەرەوە،
مەگـەر هەوا زۆر خۆش بێو خۆرەتـاو بێت، بەیـانیان پێش
ڕان ڕادان و ئێـواران کەران دێتـەوە تێ بەردەدرێن و ئیـدی
لەوەودوا دەکرێنە کۆزەوە، بۆ ئەوەی لەوەڕی ببن [فێری گیا
خواردن ببن] هەندێ گورزە پووش و پەڵاشیان لە بنمیچەوە
بۆ شۆڕ دەکـرێتـەوە پاشـانیش کە لەوەڕی بوون ئاڵفیـان
دەدرێتی [ئالف = بڕێشی جۆ]. لە سەرەتای بەهاریشدا،
ئەگـەر ساڵ خۆش بێ زووتـر بەرە بەرە ساوە کۆرپـە
دەردەکـرێنـە دەرەوە بۆ نێـو قەرسیلی[٧] لای ماڵ بۆ ئەوەی
ڕابێـن بە دەرو دەشـت، پاشـانیش کە هەراشتـر بوون
ساوەڵـەوانیـان دەکـرێتـە لا کە بەزۆری منـداڵێ یان دوانی
خاوەن ماڵ دەبن.

**● وەرزی بەهارو بێرگە و بێرەوان..**
**ساوەی زاوماو.. شەوەکەڕی ڕان..**

سەرەتـای بەهـار کەش خۆش دەبێو پشتی سەرمـا
دەشـکـێ، ساوەش بۆ لەوەڕ دەردەکـرێو لە ئاوایـی دوور
دەخرێتەوە، شوانیش هەر کە خۆر دوو سێ ڕم بەرز بووەوە
ڕووی ڕان بەرەو ماڵ دەکـاتـەوەو بەرە بەرە بەدەم لەوەڕەوە
دەیئاژوێ. کە بوو بە چێشتەنگاو ئیدی ڕان دەگاتە پێشەوە
بۆ بێرگە (بێرە)[٩] لەوەپێش دەهێنرایە ماڵەوەو دەکرایە
بەهـاربـەنییەوە.[١٠] ژنان و کیژانیش بە تیانچەو پاتیلەی[١١]
مسەوە لەوێ ئامادە دەبوون و دەست وبردیان دەکرد لە مەڕو
بزن دۆشینـداو هەر یەکـە خوشێ دوانیـان لێ دەسـەنـدن،
چونـکـە لە سەرەتـای بەهـاردا شیـری زۆر لە ماڵات
ناسـەنـرێ، تاوەکو کارو بەرخە کۆرپەکان تێری پێبخۆن و
خۆیانی پێ بگرن و پشتی پێ پەیداکەن. شایانی باسە لە
کوردەواریـدا هەرگیـز مەنجـەڵی ڕەش [بـە دووکـەڵ ڕەش
بووەوە] ناخـرێتـە ژێـر گوانی ئاژەڵ بەڵکو بە جامێکی مسی
سپی دەدۆشـرێن و کەپـڕبـوو دەیکـەنە مەنجەڵەوە پاش بێرە
کردن (دۆشین) خێرا ساوە تێبەردەدراو دەبوو بە باعەباع و
تیرژانێك ئەوسەری نەبێتەوە، یەکێك لەولاوە مەڕو بزنی
نەبـانـی[١٢] دەگـرت و ئەوی دی بەرخێـك یان کارێکی
بەدەستـەوەبـوو کە دایکی نەدەدۆزییـەوەو بۆی دەگەڕا، ئەوە
کوا مەڕە پەڕ، بزنـە هوول چی لێهـات، بیخە بەڵـەمارۆ
کلکت ببرم! ئەوجا پاش دەمێك دایك و ساوا بە یەك شاد

دەبــوونــەوە تێــر شیــری دەدایــە. پاشــان لای نیوەڕۆ کە ڕان دووبارە ڕای‌بدایە، ساوەجیادەکرایەوەو شوانەش سەگە بازوو و بۆرەی دەخستە شوێن خۆی‌و مێگەلی پێ‌دەپێچایەوە بەرەو مێــرگ و لاپــاڵــەکان. پاشان کە هەوا خۆش دەبووو کەمێك هەراش دەبــوون نیــوەڕوان لە دایــك جیانەدەکرانەوە، بەڵکو لەگــەڵ ڕانــدا دەبــوون تا دەمــەو عەســرێکی درەنگ، بەمە دەوتــرا. **زاوەمــایــان سارەمــا**: ئەم زاوەمــایە زۆرتر لە کاتێکدا دەکــرا کە ڕان شەوەکــەژ بکــرایــەتەوە. لە شەوەکەژدا ئێوارە ڕان نەدەهێنــرایــەوە بۆ ماڵــەوە بەڵکــو بۆ شەو بە زاخــەو لێــژ یــیەکــەوە مۆڵ دەدرا، بەم شوێنــەیــان دەوت پەچــە. لە بەهــاردا زیــاتــر ڕان ئەو کاتــانە شەوەکەژ دەکرایەوە کە هورو باران بوایــە تاوەکــو ئاژەڵــەکــە لە حەوشــەی ماڵــدا قوڕاوی نەبێتَ و لە لایەکی دیکەشەوە بۆ ئەوەی لەوسەر دەمەوبەیان زوو ڕادرێ.

لە شەوەکــەژدا یەك دوو کەسی خاوەن ڕانــەکــە یان ئەو ماڵــەچــانــەی کە مەڕومــاڵاتیــان لەبــەر شوانەکەدا بوو، شەو لەگەڵ شوانەدا دەمانەوە.

بەڵام هەر کاتێــك کە ڕان شەوەکــەژ نەکــرایــەتــەوە ئەوە ئێــواران تا دوای بانگی خەوتنــان شوان ڕانی نەدەهێنــایــە ماڵــەوە بەڵکــو لە قەراخ دەغــڵ و شوێــنی خۆش لەوەڕدا دەیلەوەڕاند بەمەش دەوترێ. شەواژۆ.

● **مەشکەو مەڵان و.. کونەو کونەڵان**: -

وەختێ پێ دەنــرایــە نەورۆز گژ وگیــاو گاگــرۆو گوڵاڵــە سوورەو بەیبــوون دەیــانــدا بەیەکدا، پیشۆك سەلکی دەکردو کنگــر زۆر دەبــووو کەنیشگــەلی ئاوایی بۆ دادەکشاو هەر ئەوەنــدە بڵێی یەك و دوو چارۆکــەیــان لێ پردەکــردو بەدەم تریق و هووری پێکەنین و گۆرانییەوە دەیانهێنایەوە.

قارچك و دۆمەڵانیش لەملاو لەولا پەیدادەبوون. منداڵە ووردکــەی شوێن کارو بەرخــەل بە خۆیــان و بێڵەکــانی دەستیــانــەوە سەریــان بە زەوییــەوە هەڵدەکەنرا. دۆزە دۆزە خەریکی پیشــۆك و کنگــر هەڵکــەنــدن و ئەی ماشــەڵڵا لەم دۆمەڵانە دەبوون، ساوەکانیان ئامێتە دەبوون و سەریان دەنا دەغلی خەڵکەوەو، ئەمان هەر لە قریوە قریوەو بەزم و شادی خۆیــانــدا بوون.. تالــەپــر دەنگێکی دوور لە ئاواییــەوە دەهــات و ڕایــدەچڵەکاندن: هۆ منالْ.. هۆمناڵ بەچەوازی بگرن، ئەوە چی دەکەن بۆ ئاگاتان لە ساوەکانتان نییە.

ساوە لەم کاتەدا هەراشن و تەواو تێر گیا دەبن و بۆ ماوەیەکی کەم بەردەدرێنــە دایــك. مەڕومــاڵاتیش دوو تاق دەدۆشــرێن، لەبــەر ئەوە شوان چێشتــەنگــاو عەســر گەلە دەهێنێتەوە بێرگە. دەستــەی کیــژانی بێــرەوانیش بە تیــانچــەو پاتیلەی دەستیانەوە دەچنــە بێرگە و بۆنی سمڵ و مێخەکیان ڕۆژە ڕێیەك دەڕواو پیاو کاس دەکات. لەم کاتەدا کەمێك شیر دەهێڵنەوە بۆ ساوەکان لە گوانی ماڵاتەکەدا، ئیدی هەمووی دەدۆشن.

پاشان شیرەکە لە ماڵدا دەکرا بە شیرپاڵێوداو[13] لە مەنجەلی گەورەدا دەنرایە سەر ئاگرو کولێك دوانی دەداو ئەوجا دادەگیراو لە قوژ بنی ژووورەکــەدا دادەنــراو، پێش ئەوەی بە تەواوی سارد ببــوایــەتــەوە لە کاتێکدا هەندێ تینی گەرمی تێدا دەما هەوێن دەکــرا، هەوێن بریتی‌بــوو لە هەنــدێ ماست یان دۆی ڕۆژی پێشوو، ئەوسا بە چاکی دادەپۆشرا تا بەیانی ڕۆژی ئایندە.

بەیــانی زوو لە پێش خۆر کەوتنــدا کەیبــانــو سێهــای دەچــەسپــانــدو مەشکــەی لێ‌دەخستــەدارو دەستی دەکرد بە ژەنــدنی. کەیبــانــۆ ئاوی ساردی زۆر پێــویستــە بۆ مەشکــەژەنــدن، لەبــەر ئەوە ئەگــەر ئاوی کانی‌و کارێز سارد نەبــوایــە، ئەوا ڕۆژێ لەوەپێش کونــەیــەکی پڕ دەکرد لە ئاوو بەسەر کونەڵانەوە دایدەنا، بۆ بەیانی ئاوی پیرە کونە دەبوو بە تەرزە. ئەگەر ئاوەکە سارد نەبوایە بەرەمەشکە کەرەیێکی باش وەهەم نەدەهات.

کەیبــانۆ هەمــوو ڕۆژی پاش مەشکــە ژەنــدن کەرێکەی دەخستە کەرێدانیکەوەو[14] هەندێ خوێی پێوە دەکردو ئەوجا دەیبــردە کونــەڵانــەکــەو لە پاڵ کونــەیــەکدا دایدەنا بۆ فێنکی [ئەمە زۆرتر لەو کاتانەدا بوو کە بەڵای هاوینەوە

دەچووین].

ئەوسا کەیبانوو هەفتەیەك یان دوو هەفتە جارێك لە ڕۆژی هەینی‌دا کەرێی کەرێدانەکەی دەکردە مەنجەڵێکەوەو بەسەر ئاگــری دەخـست، کاتێ کە دەتــوایــەوە کەف و خەوشی کەرێکە سەر دەکەوت، ئەمیش دایدەگرت و نمێ ئاوی لە کەفەکە دەکرد تا بە تەواوی لە ڕۆنەکە جیا ببێتەوە، ئەمجار بە کەوچکی دارین کەفەکەی دەکردە قاپێکەوەو ڕۆنەکەش بە هیــزەوە، ئەو نمــە ئاوەش کە دەکــرا بە کەفــەکــەوە بن مەنجەڵەکە دەکەوت و بەمە دەوترا سەرڕدوو بن دۆ:
کەفەکە دەکردەوەو بەمە دەوترا سەرردوو بن دۆ:

کەیبــانــوو بە پێی کەم و زۆریی شیــرەکــەی مەشکــەی بچووك و گەورە بەکار دێنێ. مەشکە لە کوردەواریدا بە پێی بەکارهێنان ناو دەنرێ.

● مەشکەو جۆرەکانی: -

(1) ئەو مەشکــانــەی لە پێستی کارو بەرخی هەراش و گیسك و کاور دروست دەکرێن بە زۆری بچووکن و پێیان دەوترێت مەشکۆڵە. ئەمەش زۆرتر بۆ ئەوە بەکار دەهێنرێ کە دۆی تێدا ببرێ بۆ سەر پەرێزو خەرمان و بۆ ڕەنجبەرو دەشتەوانەکان.

(2) مەشکــەی مەڕەوەس و بزنــەوەس و گوێــرەوەس: - ئەو مەشکــانــەن، کە لە پێستی مەڕو بزن و گوێــرەکــە دروست دەکرێن. ئەمانەش بۆ ژەندنی شیری مام ناوەندی بەکاردێن.

(3) مەشکەی بەرانەوەس و گاوەس: لەپێستی بەران و گاو مانگــا دروست دەکــرێن و بۆ ژەنــدنی (کێزانی) شیری زۆر بەکــاردێن. ئەم مەشکــانــەش بەتــایبــەتی گاوەس بە هێــزو بازووی دوو ژن نەبێ ناژەنرێ.

● هیزە: -

تەنیــا لە پێــستی ئاژەڵی سپی دروست دەکــرێت وەك [بــەرخ و کاورو شەك و مەڕو بەران] هیــزە بۆ هەڵگــرتن و پاراستنی ڕۆنی خۆماڵی بەکاردێت و بۆ پارێزگاری هیزەڕۆن لە مشــك و سیســرك و مێروو لە کوردەواریــدا عەمــار یان سنــووقێکی قوڕینی کەنــوو ئاسایی بۆ دروست دەکــەن، ئەمەش پێی دەوترێ هیزەدان.

● کونە: -

[کـونـدە] ئەمیش چەشنی مەشکـەیە بەڵام تەنیا هەر لە پێستی ئاژەڵی ڕەش دروست دەکــرێ وەك کارو گیســك و چتیرو بزن. کونە تەنیا بۆ ئاو تێدا پاراستن و ئاو سارد کردن بەکاردێت و بە هیچ جۆرێك دۆی تێ‌نا کرێت.

● کونەڵان: -

دوو دیواری قوڕینی تەریبن پێش ئەوەی دیوارەکان تەواو بکـرێن لە ناوەڕاستــدا [لـە پشتێنــە بەرەو ژوور] بەینەکەیان دارەڕایــەکی چاك دەکــرێ. پاشــان بەرز دەکـرێتەوەو ئەوجا سێ و چوار کۆڵــەکـــەداری دەخــرێتــە سەرو بەلــەگە و پڵ و پووشێکی تەواوی پێدا دەدرێ بۆ ئەوەی سێبەرێکی خەست دروست بکات و دووسێ بەردی زلیشی دەخرێتە سەر تاوەکو ڕەشەبا نەیبات.

ناوەڕاستــەکــەشی سورنــاتکی[15] دەخرێتە سەر ئیدی لەوەودوا کونــەی پڕ لە ئاوو مەشــکـــەی پڕ لە دۆی دەخـرێتــەســەرو پاشــان بە چیخێــك دادەپۆشرێ. کونەڵان دەبێ هەمیشە ڕووی لە شەماڵ بێ بۆ فێنکی.

● چۆنـیـتـی دروست کردنی کونــەو مەشکـــەو هیــزە لە کوردەواریدا: -

1 - کونە: - یەکەمجار پێستەکە بەم جۆرە خۆشە دەکرێ: تووکــەکــەی دەڕنیتــەوەو خوێی پێوە دەکەیت و شەوو ڕۆژێك دایدەنێی. پاشان خوێ‌و ئاردی جۆی پێوە دەکەیت و سێ ڕۆژ لێ‌دەگــەرێی. ئەوجــا دەری دەکــەی‌و تێـلایــەکی بۆ دادەکوتی‌و پێستــەکـەی دەدەی بە سەرداو پاك پاك بە چەقـۆ

دایــدەتــاشی. ئەمجــارەش هەمــان کاری ئاردو خوێ پێـوە کردن و دوای سێ ڕۆژ داتــاشین دووبــارە دەکـرێتـەوە. بۆ سەری سێیەم جار هەندێ دۆی بۆ گەرم دەکەیت و دایدەنێی تا بن دەنێتـەوە ئەوسـا خەستی بنـەکـەی لەگەڵ ئاردی جۆو خوێـدا تێکـەڵ دەکـەیو پێستەکەی بە چاکی تێدا ئەم دیوو ئەودیو دەکەیو دەیخەیتە گونیەیەك و تا سێ ڕۆژ دەیکەی بە داردا.

لە پاش ئەو ماوەیە بە چەقۆ دایدەتاشیتەوە. هەمان کار جارێکی دیکەش دووبارە دەکرێتەوە. دوای ئەمانە هەمووی دێیت جەوتی کوتراوی بۆ دەکوڵێنیو دەیکەیتەناو پێستەکەوە. ئەم کاری خۆشـە کردنی پێستـەیە پێی دەوترێ خۆردەدان: پاش جەوت تێکــردن پێستــەکــە دەنێتــە نێــو خوڵـەمێش (خــوڵــەکــەوە)و باوەشێ لق و گەڵای تەرووی تەڕیشی لە سەرو ژێـــردا ڕادەخـــەیو، وازی لێ‌دێنی بۆ ماوەی شەش هەفتــە. بەڵام بە مەرجێ دەبێ هەردوو هەفتــە جارێ جەوتــەکـەی بگـۆڕیت و جەوتـاوی نوێی تێ‌بکـەیو، لەو ماوەیەشدا هەر دوو سێ ڕۆژ جارێ پێستەکە ئەم دیوو ئەودیو دەکـرێو ئاوی تێـدەکـرێو پتـر خوڵەمێشی پێوە دەکرێ. لە پاش شەش هەفتەکە کونەکە دەردێنیو ئەو جەوتەی کە سێ جار تێت کردبــوو وشــك دەکــەیتــەوەو ئەوجـا بە چاکی دەیسـووتێنی پاشـان خوڵـەمێشی جەوتـە سووتـاوەکە لەگەڵ هەنــدێ ئاودا دەکــەیتــە کونــەکــەوەو بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لێی‌دەگەڕێی، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە لە ناوەوە کونەکە زەردکاو نەداتــەوە لەوەوپــاش، شەش هەفتــە هێشتنــەوەش لە نێـو خوڵـەمێشـدا بۆ ئەوەیـە کە ڕووکـاری دەرەوەی کونەکە ڕەش ببێت و هەروەهــا ئەستــووریشی دەکـا. پاش ئەم هەمـوو سەرئێشـەیـە پاك و پوختـە دەشـۆردرێت و پڕ دەکرێ لە ئاوو دەنرێتەسەر کونەلانەوە!

2 ـ مەشکـە: ـ بە هەمـان جۆری کونـە پێستـەکـە خۆشـە دەکرێ. بەڵام ئەمیان وەکو کونە ناخرێتە نێو خوڵە مێشەوە، بەڵکو دوای خۆشە کردن یان خۆردەدان جەوتی کوتراوی لە مەنجەڵێکدا بۆ دەکوڵێنیو بە چاکی پێستەکەی تێدا ئەم دیوو ئەودیو دەکەیو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لێی‌دەگەڕێی.

پاشان دەری‌دەهێنیو بە چەقۆ دایدەتاشیو ئەمجارەش بۆ سێ ڕۆژی دیکە دەخرێتەوە نێو جەوتاو بەڵام ئەمجارەیان کە دەری دەهێنی داینــاتــاشی بەڵکــو بە تاڵ و جەوتــەکــەوە هەڵیدەخەی تا کزر دەبێتەوە، ئەوجا پڕ دەکرێ لە جۆ [یان خوڵ] وەــەمــوو هەنـگــڵ و قوژبـنــەکــانی جوان دەئاخنرێتەوەو دوو سێ ڕۆژ لەم بارەدا لێی دەگەڕێی. پاش ئەوەی کە ووشـك دەبێتـەوە جۆکـەی لێ بەتـاڵ دەکرێو بە ڕاسـەری ئاگـردانـدا هەڵدەواسرێ بۆ ماوەی یەك دوو مانگ تاوەکو دووکەڵی پێدا بچێ.

بەڵام بۆ مەشـکــەی گاوەس، بۆ ئەوەی مەشـکــەیـکی نەرمی لێ دەرچێ لە دوای خۆردەدان هەندێ زاخ لە گەڵ توێکڵەنارو جەوتی کوتراودا تێکەڵ دەکرێو پاش کولاندنیان پێستەکەی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ تێدەنرێ دوای ئەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژی دیکــە دووبــارە توێـکڵە هەنــاری کوتــراوی [نـەکـولاو]ی پێـوە دەکەی. ئەوجا ئیدی جۆی تێ دەکەیو لەوەو پاشیش دەدرێتە دووکەڵ، واتە (دووکەڵ دەدرێ).

3 ـ هێــزە: ـ بۆ خۆشــەکـردنی هێـزە هەرچی خوری یان بەرگن هەیــە لە پێستـەکـە دەرنـرێتـەوەو لە ڕووی ناوەوە بە داتــاشـینێکی چاك هەرچی پاشمــاوەی گۆشت هەیــە بە پێستــەکــەوە ناهێڵرێ، ئەمجـارە دەستێ ئاردو خوێی پێـوە دەکــەیو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ وازی لێ دێـنـی. دوای ئەوە دایدەتاشیو دیسان دەستێکی دیکە ئاردو خوێ [ئاردی جۆ] لەگــەڵ دوو جامـۆلکـە شیـری مەردا تێکـەڵ دەکـەیت و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ پێستەکەی دەخەیتە ناو، پاش ئەوە دەری دەهێنیو دایـدەتــاشیتــەوە، بۆ جاری سێـیـەم هەنـدێ جۆ [نــزیکـەی هۆقـەیێـك] دەکـەیتـە برێشکـە بە شێـوەیکی واکـە هەنـدێکیشی لێ بسـووتێ. پاشــان برێشکـە کە بە دەستار دەهاڕی وبەو ئاردە دەوترێ قاوت. دێیت قاوتەکە تێکەڵ بە ماستی مەڕ دەکـەیو لە دەفـرێکـدا پێستەکەی دەنێیتە ناو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ. دوای ئەم کارانە دێیت هێزە کۆنێکی بێ

کەڵك بۆ ماوەی دوو ڕۆژ دەخەیتە نێو مەنجەڵێك ئاووەو تا بە جوانی نەرم و خاو دەبێتــەوەو ئەوسـا هەڵیــدەفلیقێنی تا بە تەواوی دۆشــاوەکــەی دەداتــەوە، ئەمجـار ئەو دۆشـاوە لە مەنجـەڵـدا دەکـوڵێنی تا خەست دەبێتـەوەو ئینجـا دەیکەیتە پێستــەی هیـزەکـەوە بۆ ماوەی دوو سێ ڕۆژ هەمـوو ڕۆژێ فووی تێـدەکـەی‌و دەمی دەبـەستی‌و دەیکـەی بە داردا تا بە جوانی دۆشاوەکە هەڵدەمژێ. ئەم دۆشاوە کۆنە بۆ ئەوەیە کە ڕەنگی هیزەکە ڕەش بێت و ئەگەر وانەبێ هیزەکە سووریاو دەردەچێ کە لە کوردەواریــدا ڕەنگێکی مەقبــووڵ نییــە بۆ هیــزە. پاش ئەم کارانــە هەنــدێ توو یان خورمــای بۆ دەکـوڵێنی‌و دۆشـاوەکـەی دەگری‌و دەیکەیتە هیزەکەوەو فووی تێـدەکـەیت و دەیـدەیتـە هەوا تا بە تەواوی هەڵیـدەمـژێ. لەوەودوا ئیتر هیزەکە ئامادە دەبێ بۆ ڕۆن تێکردن.

● ئەو ئامرازانەی بۆ مەشکە ژەندن بەکاردەهاتن: -

بێجگــە لە مەشکــە خۆی هەنــدێ کەرەســەو تفـاقی تەواوکـەری دیکـەش هەن بۆ ئەوەی کاری مەشکـە ژەنـدن ئاسان بکەن، ئەمانەش:

1 - سێپا: - سێ کۆڵەکە داری چاك و ئەستوورە [بە زۆری دار بەڕووە] درێــژی هەر دارێـك دوو مەتـر زیـاتـرە، هەر یەکــەیـان لایـسـەرەوە کونێکی تێـدەکـری‌و ئەوجـا پەتێکی ئەستووریــان تێ‌هـەڵـدەکێشـری‌و هەر سێ کۆڵەکەکەی بە چاکی پێ شەتــەك دەدەن بە یەکــدا. لە سەر ئەوەشـــەوە گوریـسێکی شەش باڵی دوو قەد دەکــرێتــەوەو بە چەنــد ئەڵقـەیـەك ئەو جەمســەرەی پێ دەبـەسترێتەوەو هەردوولای گوریسەکەش لەم سەرو ئەوسەرەوە بە جووتە شۆڕ دەبنەوە بۆ ڕاگیرکردنی مەشکەکە.

2 - دەسەخورد (لۆڵەپ): - دوو داری ئەستووری بەڕوون بەزۆری، وەستــا [دارتــاش] بە جوانی تاشیــونی‌و لە هەر یەکەیان لە ناوەڕاستیدا کونێکی لاکێشەیی کردووە بۆ ئەوەی سەری ناونێرکەکەی پێدابچێت. ئەم سەرو ئەو سەریشیان خرە بۆ ئەوەی دەســت بە چاکــی بیـگــرێ لە کاتــی مەشکەژەندندا. درێژی دەسەخورد نزیکەی دوو بستەو بە کشتــەکێکی ئەستــوور هەر چوار هەنگڵی مەشکــەکـە بە سەری دەسەخوردەکانەوە شەتەك دەدرێن.

3 - ناونێــرك: - دارێکی بەڕووە، کەمێــك لە مەچــەکی دەست باریکتــرە درێــژییــەکــەی بە ئەنـدازەی درێــژیی مەشکەکەیە، هەردوو سەری بە پانی داتاشراون بۆ ئەوەی بچنە کونی دەسـەخـوردەکـانـەوەو، بە شێوەیەك کە بە قەد درێژیی پەنجەیەك لە کونەکانەوە زیادەی لێ دەرچێتە دەرەوە تاوەکـو گوریسـەکـەیان بە شێوەی [ئەڵقە] پێوە ببەسترێت. ناونێــرك لە سەربــاری درێــژیی مەشکــەکــە لە کونی دەسەخوردەکان گیردەکرێ.

● خزمەت کردنی مەشکەو مەڵان لە کوردەواریدا: -

لە کوردەواریدا ژنێك زۆر دەست ڕەنگین و بە سەلیقە نەبوایـە نەیـدەتـوانی ئەرکی پێستـە خۆشـەکردن و مەشکەو مەڵان بەڕێوە ببات.

ژنـانی کەم تەرخـەم و تەمـەڵ و تەوەزەل هەردەم پێستـەو مەشکەیان بۆگەن دەبوو پیسترین سەرکۆنە بۆ ژنێك ئەوەبوو تانـووتی دۆگەنیـو یان دۆ ترشـاوی لێ بدرایـە، لەبـەر ئەوە دایکان کیژی خۆیان لە سەر پاك و خاوێن ڕاگرتنی کونەو مەشکـە ڕادەهێنـا، تا لە ماڵ و مێرددا نەبنـە مایـەی گاڵتـە پێکردن و لێو لێهە ڵقورچاندن.

مەشــکــە دەبێ هەر سێ‌و چوار ڕۆژ جارێ پاك بە ئاو بشۆردرێ‌و مانگی جارێکیش لە پاش شوشتن تاڵ و خوێ بکرێتە دەرو ناویەوە. تاڵ بریتییە لە جەوت و توێکڵەناری هاراوە. پاش تاڵ و خوێ کردن دەدرێتە بەر هەتاوو ئەوجا هەر بە تاڵـەکـەوە هەڵـدەگیـرێ تا پێـویستییان پێ دەبێتەوە. شایانی باسە ماڵ دەبێ چەند مەشکەو مەشکۆڵەیەکی ببێ تاوەکو بە نۆرە تاڵ و خوێ بکرێن و ئەوانی دیکە بخرێنە جێگەیان.

کونــەش دەبێ ساڵـی جارێــك جەوتـی کوتــراوی بۆ

خوێنرێو تێی بکرێو بۆ ماوەی دوو هەفتە لە نێو خوڵەمێشدا بنرێ، پاش ئەوە پاك دەشۆردرێو دووبارە ئاوی تێەکرێتەوە.

بۆ هیزەش دەبێ ساڵی جارێك بۆ ماوەی سێ چوار ڕۆژ دۆشاوی توو، یان خورمای تێکرێو فوو بدرێو لە دوای ئەم بەستنی بکرێ بە داردا [هەڵواسرێ]، پاش ئەوە ئیدی ڕۆنی نوێی تێدەکرێ، چونکە ئەگەر وای لێ نەکرێ ئەوە ڕۆنەکەی لێدەچێ.

● وەرزی هاوین و مەڕو بزن بڕینەوە: ـ

خوریو بەرگن و موویەشێکی هەرە گرنگی داهاتی ئاژەڵدارین. سەرەتای هاوین دەست دەکرێ بە مەڕ بڕینەوەو پاشان بەرخ و بزنیش برینگە دەکرێن. لە کوردەواریدا ئاژەڵ بە ئامێرێك دەبڕرێتەوە پێی دەوترێ هەورێنگ یان چاری کە شێوەی لە مەقەست دەچێ بەڵام ئەم دەمی تیژترو درێژترە. خاوەن مەڕومالاَت لە خوریەکەی بەشی بەڕەو جاجم و قاڵیو بەنی پەرگە کلاش و لە بەرگنەکەی [تووکی بەرخ] بەشی لەبادو فەرەنجیو کەچەو کوڵە باڵ و مووی بزنەکانی بەشی هۆڕو هەگبەو گوریس و کەژوو و ڕەشکە جیادەکاتەوەو ئەوانی دیکە دەفرۆشێ. بێگومان خاوەن مەڕومالاَت ئەم شتانەی کە باسم کردن هەموو ساڵێ بە سەر یەکەوە نایانکات بەڵکو هەر ساڵەی هەندێك لەوانە دەدا بە کرد بە پێی پێداویستی ماڵ. خاوەن ئاژەڵ بە بۆنەی برینگەشەوە کارێ یان بەرخێك سەر دەبڕێ.

● ڕەشەوولاَخ بەخێوکردن لە گەرمیاندا: ـ

لە زۆر شوێنی ناوچەی گەرمیاندا شان بەشانی مەڕومالاَت [مەڕو بزن] گاوگوتاڵیش [مانگا] بەخێو دەکرێ، بەڵام بە قەد مەڕو بزن بایەخی پێ نادرێ. لە گوندێکدا ماڵی ئەو پەڕی هەر شەش حەوت سەر وولاَخی دەبوو، بێگومان دەوڵەمەندیوا بوو لەوە زیاتری هەبوو و خەڵکی هەژاری واش هەبوو هەر هیچی نەبوو. کاتی خۆی بۆ گاگەل لەوەڕاندن گاوان دەگیرا، بەڵام ئەم وەکو شوان نەبوو بە شەرتی شەش مانگ بچێتە لا بەڵکو بە مانگانە بوو و کرێی بە پێی سەر وەردەگرت.

ئێستاش ئەگەر دێیەك گاگەلی تێدا مابێ ئەوە بەدەگمەن گاوانی دەست دەکەوێت، [هەروەها شوانیش]. ناچار دەبێ هەر ماڵەو بە پێی سەری وولاَخەکان بچێتە لای گاگەلەکە یان کرێکارێکی بۆ بگرێ بۆ ئەو ڕۆژانەی کە نۆرەی دەکەوێ، بەمەش دەوترێ نۆرەگا.

ب ـ نەریتی کشتو کاڵ کردن لە گەرمیاندا: ـ

زۆربەی دەشت و سارایینەکانی ناوچەی گەرمیان دێمەکێڵن و کەم شوێنی ئاودێری دەکرێ [ئاوی کاڵە]، هەندێ شوێنی گوێچەم و کانیو ئاوی لێدەرچێ. لەبەر ئەوە زیاتر بایەخ بە چاندنی گەنم و جۆ دراوە بە شێوەیەکی فراوان. ساڵی بارانەساڵ کە بەری کەوتبێ چاکی هێناوەو فرە جاریش کە بێ بارانی دەبوو قات و قڕی دنیای دەتەندەوەو زۆر کەس دەسکورت و کەم دەرامەت دەبوون.

ئەم ناوچەیەش وەکو شوێن و مەڵبەندەکانی دیکەی کوردستان سەردەمێك زۆری کوێرەوەریو چەرمەسەری چەشت بە دەستی دەرەبەگەکانەوە. ئەو دەمە کەس خاوەنی زەوی نەبوو ئاغا نەبێ، ئەوەی بەرەجووتێکی هێستر یان گا یان گوێدرێژی بکێڵایەو پاش ڕەنج و تەقەلایەکی بێپایان کە خەڵەوخەرمانی بەرهەم بهێنایە دەبوو بەشێکی باشی ڕەوانەی عەماری ئەوان بکردایە، ئەو حەلەی کە جێز سوور دەکرا خاوەنی نەدەبوو بیباتە ماڵەوە تا جەنابی سەرکار [شەحنە] نەهاتایەو خەمڵی نەکردایەو، جاری وا بوو حەو قورئانی خاوەنەکەشی دەدا تاوەکو دڵنیابێ کە بە «دزییەوە!» لێی لانەداوە، ئەوجا بەشە موڵکانە [تاپۆ]ی ئاغای پێ جیا

دەکردەوەو بە کەر هۆری خۆیشی دەبوایە بیبردایە بۆ عەماری میر، ئەمە سەربـاری نیـو وەزنـە[16] گەنم و نیـویش جۆ بۆ خۆیو ئەوجا میواندارییەکی ڕەزا گرانیشی دەخستە ئەستۆ و خاوەن ماڵ دەبـوایـە ئەگـەر قەرزیشی بکـردایـە مریشـك و قەلـەمـوونی بۆ لێبنـایـە بێجگـە لەوەش کە توورەکـە زلـەی ئەسپەکەی دەبوو لێواولێو پڕ بکرایە لە جۆ. لەولاشەوە جوگەو کانیاوەکانی شوێنە ئاویکاڵەکان بە شەرتی «هەقم لە ناڵدارو باڵـدار لا نییـە»[17] دەدران بە ئیجـارەو ئەگـەر گوێلێك چەڵتوك یان دەنکە تەماتەیەکیشیان لێ وەبەرهەم نەهاتایە ئەوان هەر پارەی خۆیـان وەردەگـرت. بە کورتی ئەم باسـە زۆری تان و پۆ هەیـەو مەبـەستی ئێمـەش لێـرەدا تەنیا باس کردنی داب و نەریتی کۆنی زەوی کێڵان و داس و درەوە بە دەستـووری ڕابـوردوو. زۆربـەی ئەوکـارانـەو ئەو ئامێرانەی ئەوسـا بەکـاردەهێنـران ئێستـا لە کەڵك کەوتوون و چوونەتە خانەی فۆلکلۆرەوە.

**● جووتیارو کاری تۆوکردن و وەرد برین: -**

مانـای جووتیـار لێـرەدا ئەو کەسـەیە کە بە کرێ لە لای فەلاحی زەوی بە دەست ئیشی دەکـرد. ساڵانی ڕابـوردوو فەلاح و بەتایبەتی ئەوانەیان کە حاڵیان باش بوو و تارادەیێك دەوڵەمەند بوون بۆ جووت و تۆوکردن جووتیاریان دەگرت. ئەو دەمە باری گرانی هەژاریو نەداراییو بەردەوام بە کۆڵی خەڵکێکی فرەو فرەوانەوە بوو، بۆیە هەمیشە شوان و گاوان و جووتیارو وەرزێر وەك گەڵای دار زۆر بوون.

شەرتی جووتیـاریش وەکـو شوان شەش مانگ بوو. لە ناوەڕاستی پایـزدا جووتیـار دەگیـراو کرێکەی بە پێی جووتی فەلاحـەکـە دیـاری دەکـرا، ئەگەر هێستر بوایە ئەوە دەوری پانـزە دینـار بوو وگـوێدرێـژ و گاش دە دینـار بوو، ئەمـە لە ساڵانی چلەکـانـدا، بەڵام لەمـەودوا لە پەنجـاکـان ولـە هەنـدێشـوێنـدا تا بەشێکی شەستـەکانیش ئەم کرێیە بەرز بووەوە بوو بە 30 - 40 دینار بۆ جووتی هێسترو 20 - 30 دینار بۆ جووتی گاو گوێدرێژ. لەمەو پاشیش تراکتۆر هاتە ناوەوەو ئەو داب و دەستوورەی پێچایەوە.

خاوەن ماڵ کە جووتیـاری ڕادەگـرت سەرەڕای کرێکەی دەرپێیـەکی شۆڕو کراسێکی خام و جامـانـەیێـك و جووتێ کلاشی بۆ دەکڕی. شایانی ووتنە، کە کلاش تا کۆتایی شەرت هەر لە سەر خاوەن ماڵ بوو. ئەگـەر جووتیـارەکـە سەڵت بوایە ئەوە هەر لەوێ دەبوو، ئەگەریش خاوەن ژ ن و ماڵ بوایـە ئەوە لە ماڵی خۆی دەمـایـەوەو بە پێی شەرت شەش تەنـەکـە [وەزنـەیە] گەنم و دوو هۆقە ڕۆن و دووهۆقە چاو شەش کەللە شەکری دەدایە.

ئەگـەر خاوەن ماڵـەکـە دەوڵـەمەندو بەرچاو تێر بوایە ئەوە زیـاتـریشی دەدایەو دەستگرۆیی دیکەشی دەکرد. هەروەها بە پێی شەرتەکەش نیو وەزنە گەنم و نیو وەزنە جۆی دەدایە هەر لە زەوی خۆیدا بیکاتە شکارتە.

ئیدی جووتیار دەستی دەدایە تۆوکردن و زەوی کێڵان تا دەمەوزستان، بەم جۆرەی خوارەوە:

1 - تۆو دان و کێڵانی وەرد لە پێش بارانی پەڵەدا پێی دەوترێ داچاندنی ووشکە وەرد وبە دەغڵ یان خەلەکەشی دەوترێ خەلەی ووشکە وەرد.

2 - تۆو دان و کێـڵانـی وەرد لە پاش بارانی پەڵـە پێی دەوترێ داچاندنی مێوەردو بە خەلەکەیشی دەوترێ خەلەی مێوەرد.

3 - ئەگـەر بارانی پەڵـە باریو فەلاح بیـەوێ هەنـدێ پەرێزو جاری خۆی تۆودا، ئەو کاتە جووتیارەکەی هێشێك لە زەوییەکە دەدا، واتە جارێك دەیکێڵێ ئەوسا بۆ ماوەیەك لێی دەوەستێ تا بارانی دیکـە دەبـاریو دووبـارە گژ و گیای تێدادەڕوێتەوە. بەم هێشە [کێلانە] دەوترێ خەرتە. پاشان تۆوی دەداو دەیکێڵێتـەوەو بەمـەش دەوتـرێ خەرتـەو تۆو . ودەغڵەکەشی دەغڵی خەرتەو تۆوی پێ دەڵێن.

4 - جاری وا دەبێ فەلاح ئارەزوو دەکا کە لە زستاندا وسەرەتای چلەدا زەوییەکی جاڕ یان بەیار [بۆرە][18] خەرتەو

-و بکات بەمەش دەوترێ تەرەکاڵ یان دواکاڵ. فەلاح خۆیشی زۆر دڵی بە ئاکامی بەروبوومی ئەم دەغڵە خۆش بێــەو بۆ ئەم کارەشی پشت بە پەنـدێکی باو دەبەستێ کە دەڵێ «بوو بوو نەبوو کەرەپوو». هەروەها لەسەر ئەم دوا کێلییەش پەندێك هەیە دەڵێ: «چلە چ لە هۆر چ لە گۆر» وتە تۆوکردن لە چلەی زستاندا وەکو ئەوە وایە هەر لە هۆردا مبێتەوەو زیادی نەکردبێ یان بەبێ هوودە بیکەی بە گڵەوەو کامی نەبێت.

5 - ئەگەر ساڵێك پەڵەگەنم یا جۆێك باشی نەهێنی‌و بەکەڵکی درەوو دەسکەنە نەیەت ئەوە چانێك دەبەستنە شوێن جووتێ هێستریان کەرەوەو دەچن بە سەریدا بۆ ئەوەی گوڵە جۆ یان گەنمەکە بوەرێتەسەر زەوییەکەو ئیدی بەبێ کێڵان وازی لێ‌دێنن، بۆ ساڵی داهاتوو سەوز دەبێت و خاوەنی دەیپارێزێ جاریوا هەیە کە بارانە ساڵ بێت زۆر چاك دەردەچێت، بەمەش دەوترێ کات.

جووتیار لەدوای ئەوەی کە تۆوکردن تەواو دەکات دەست دەکا بە وەرد برین ئەمەش بۆ جووتیارێك، کە زەوی‌و زاری زۆری بەدەستەوە بێت ماوەیەکی زۆر دەخایەنی‌و رەنگە هەموو ماوەی زستان پێوەی خەریك بێ. بەهاریش جووتیار دەست دەکات بە وەرد دانەوە. وەرد برین بریتییە لەوەی کە زەوی بەیار یان شوێن پەرێزی پار لە زستاندا هێشێ یان گاسنێکی لێدرێ، وەردانەوەش ئەوەیە کە لە بەهاردا گاسنی دووەمی لێدرێ. زۆر جار وا هەڵدەکەوت کە جووتیار پێش ئەوەی وەردانەوە تەواو بکات شەرتی دەپەڕی، واتە مۆڵەتی شەش مانگەکەی تەواو دەبوو و یەکسەر وازی لە جووت کردن دەهێنا، ئەوساکە خاوەن ماڵ ناچار دەبوو کرێی دیکە بدا بە جووتیارەکە خۆی یان هەر کەسێکی تر بۆ ئەوەی وەردانەوەکەی تەواو کات. شەرتی جووتیار لە ئاردا دەپەڕی واتە دوو رۆژ دوای نەورۆز.

جووتیار لە ماوەی شەرتەکەیدا هەر رۆژێك قورو باران بوایەو نەچوایە بۆ جووت کردن ئەوە زۆر ئیش و کاری ماڵی خانەخوێی رادەپەڕاند وەکو دارو چیلکە هێنان و کاو جۆ داکردن بۆ مەرو ماڵات و باراش هارین و شتی دیکەی لەم بابەتە.

● **کەرەسەو تفاقی جووت کردن: -**

1 - **نیلە:** - بریتییە لە دوو بازنەی چەرم، کە پووشیان تێ‌ئاخنراوە، ئەمانە لە هەردوو سەری دارێکی ئەستوورەوە بە چاکی چەسپ دەکرێن و پێوەی دەبەسترێنەوە، دەمی لای خوارەوەیان کراوەیە. کاتێ کە دەخرێتە ملی جووتە هێستر یان گوێ درێژ ئەوسا هەردوو سەری بازنەکە توند پێکەوە دەبەسترێنەوە. ئەڵقەیێك [بازنەیێك]ی دار بەرووی چەماوەش بە داری نیلەکەوە بەستراوەو بە نێوان دوو بازنە چەرمەکەدا شۆڕبوەتەوە بۆ ئەوەی سەری مژانەکەی پێوە گرێ بدرێ. بەم ئەڵقەیەش دەڵێن «گاینجە».

2 - **مژان:** - دارێکی ئەستووری نێوان نیلەو هەوجارەکەیە، لە سەری نیلەکەوە کونێکی تێدایە کە بە دارێك لە گاینجەکەی دەچەسپێنن.

لە سەری هەوجارەکەشەوە دوو کونی تێدایە لەگەڵ هەوجارەکەدا لێك دەدرێ بە دوو تەختەداری پانەڵە کە پێیان دەڵێن هەپە.

3 - **هەوجار:** - بریتییە لە کۆڵەکە دارێکی ئەستوور [بە زۆری بەڕووە] سەرێکی بە مژانەکەوە دەبەسترێ، لای خوارەوەش زمانەیەکی دارینی پێوەیە بۆ ئەوەی گاسنەکەی تێ‌هەڵ بکێشرێت.

4 - **گاسن:** - ئامرازێکی ئاسنی نووك تیژە لە پشتەوە بە شێوەیێکی لوولەك ئاسایی چەماوەتەوە کە بە قەبارەی زمانە دارینەکە دەبێ‌و بە توندی لێی چەسپ دەکرێ‌و زەوییەکە ئەم ئاسنە دەیکێڵێ.

5 - **دەستەدوو:** - دارێکە درێژییەکەی مەتر ونیوێك دەبێ لە دواوەو شێوەیێکی ستوونی لە کونێکی سەر هەوجارەکە دەچەسپێ لە سەریشەوە دەسگرێکی دارینی پێوەیە. جووتیار بە هۆی دەستەدووەوە دەست لە گاسنەکە دادەگرێ‌و نایەڵێ هێڵی جووتەکە خوارو خێچ بێ.

● **وەرزێری‌و داس و درەو: -**

ئاخرو ئۆخری بەهار جۆ زەرد دەبێ‌و وەختی درەوکردنی دێت و خاوەنی دەکەوێتە مشوور خواردنی زوو دوورینەوەی، ئەو دەمە ئەگەر گەنم و باراشی لێ ببرایەتەوە ئەوە خێرا بەشی باراشێکیان جۆ دەدوورییەوەو هەرزوو دەکوتراو دەبرایە ئاش، بەمە دەوترا بەرکوت. [لە کاتی گەنم پێ گەیشتنیشدا هەمان کار دەکرا ئەگەر گەنم ساڵی رابوردوو تەواو ببوایە]. لەم کاتانەدا خاوەن خەلە دەچوو شارو داسەکانی لای ئاسنگەر دەمەزەرد[19] دەکردو ئەگەر پێویستی ببوایە داسی دیکەی دەکڕی. ئەوجا ئەگەر خۆی کەسی وای نەبوایە خەلەو خەرمانی ئەو ساڵەی بۆ بهێنایەتەناو ئەوا دەبوو وەرزێر [سەپان] بگرێ. ئەگەر ساڵەکەی نەهات بووایەو خەلەو دان زۆر بڕشتی نەبوایە ئەوا وەرزێر بە بێ سەرداس[20] وەرگرتن دەگیرا. بەڵام ئەگەر ساڵەکەی هات بوایەو چاوەڕێی خێرو بەرەکەتی باش بکرایە لە دەغڵ و دان ئەوا وەرزێر پەڵپی سەرداسی دەگرت کە وەختی خۆی دەوری پێنج دینار بووە پاشان بووە بە 10 - 15 دینار لە مەودوا، ئەم پارەیە پێشەکی دەدرایە وەرزێر. وەرزێر ئەگەر سەرداسی نەسەندایە ئەوە کراس و دەرپێیەکی خام و جووتێ کلاشی بۆ دەکڕدرا بەڵام ئەگەر بیسەندایە ئەوە خاوەن خەلە [دەغڵ] هەقی ئەمانەی نەبوو. لە هەردوو حاڵەتدا ئەگەر وەرزێر لە ماڵی خۆی بوایە ئەوا خاوەن خەلە لە بری نانانە وەزنەیە گەنم و پووشێ خورماو ڕۆن و شەکرو چای بە پێی پێویستی سەردەم بۆ دەنارده ماڵەوە.

فرە جار ئەو کەسانەی کە بنەتۆویان زۆر بوو، بەتایبەتی ئەگەر لە تەغارێ [20 وەزنە] زیاتر بوایە ئەوا بە وەرزێرێك نەدەهاتە ناو، ناچار دەبوون دوو یان سێ وەرزێریش بگرن.

بۆ دروێنەی جۆ دەبوایە خاوەن ماڵ خۆی مەڵۆنێری بناردایە یان بۆی بگرتایە بە کرێ. زۆر جاریش خێزانی وەرزێرەکە خۆی مەڵۆکەی دەنایەوە، کرێیش لەم حاڵەتەدا بە قەد بری بنەتۆوی دەغڵەکە دەبوو، واتە ئەگەر جێی وەزنەیێك جۆ بوایە ئەوا وەزنەیە جۆ دەدرا بە مەڵۆنێرەکە لە بری کرێ. مەڵۆ نانەوەی جۆ بریتی بوو لە کۆکردنەوەی مەڵۆکانی جۆ دووراوەکە لە چەند شوێنێکی پەرێزەکەدا بە شێوەیێك کە گوڵەجۆکە دەمەوخوار دادەنراو لاسکەکەشی دەکەوتە سەرەوە بەمەش دەوترا شارا.

ئەوەی، کە دەبوو وەرزێر بە تەواوی خۆی بۆ سازدایەو تفاقی بۆ بخستایە دروێنەی گەنم بوو چونکە یەکەم لە جۆ زۆرتری دەبرد دووەمیش دەکەوتە قرچەو گەرماکەی چلەی هاوینەوە. فەلاحی گەرمیان زیاتر پشتیان بە چاندنی گەنم دەبەست و زۆر جار هەر بەشی مەڕو ماڵاتی خۆیان جۆیان دەوەشاند، بێجگە لەوەی کە سەردەمی زوو هەمیشە جۆ لە تۆڵەکە هەرزانتر بوو. تفاقی پێویستی وەرزێر بۆ درەوی گەنم بریتی‌بوو لە داس و هەسان و[21] چەوری‌و قەیناخ[22] بۆ پەنجەکانی دەستی چەپی‌و کتریەك بۆ چا لێنان و فەرەنجییەك بۆ ئەوەی لە بەری بکات تاوەکو گڕەو گەرما کاری تێ نەکات و تەپڵەیێکی لە بەرگن دروست کراوی شەپقە ئاسایی بۆ ئەوەی لە سەری بکات و سێبەر بۆ دەم وچاوی بکات. هەروەها دەبوایە کونەیێکی چاك و مەشکۆڵەیێکیشی بۆ تەرخان بکرایە تاوەکو ئاوو دۆی پێ ببردایە بۆ سەر پەرێز.

جاران ڕێ‌و ڕەسم وا بوو کە وەرزێر پێش ئەوەی بچوایەتە درەوی گەنم ڕۆژێکی چوار شەممە لای عەسرەوە داسەکەی هەڵدەگرت و دەچوو بۆ سەر گەنمەکەو دووسێ باوەشی دەدوورییەوەو پاشان دەگەڕایەوە، بەم کارەش دەوترا سونەت. بۆ ڕۆژی ئایندە ئیدی بە تەواوی دەچووە درەوو شانی دەدایەبەر. وەرزێر پاش ئەوەی کە بەیانی نان و دۆو شەکرو چای لە ماڵەوە دەبرد ئیدی نیوەڕۆ نەدەگەڕایەوەو هەر لەسەر پەرێز نان و چای دەخوارد. لە دوای تەواوکردنی بەرێ دوان وەرزێر دەچوو تاوێکی کورت لێی دەحەوایەوە، بۆ ئەم مەبەستەش یەك دوو گونیەی دەدایەدەم یەك و بە

نووسێ دار ڕاگیری دەکرد تاوەکو سێبەری بۆ بکات، ئەمە پێی دەوترا چاتۆڵ. بەگشتی وەرزێر لە چێشتەنگاوەدا تاوێك بۆی دەحەسایەوەو نان و دۆیەکی دەخواردو ئەگەر داسەکەی کول ببوایە دەیدایەبەر هەسان پاش ئەوەی کە هەندێ چەوری پێدەداو وای تیژدەکرد موو بکات. ئەوجا هەڵدەسایە سەرئیش و تا نوێژی نیوەڕۆ دروێی دەکرد. نیوەڕۆ ئیدی داسەکەی دادەناو بۆ ماوەی نزیکەی سەعات و نیوێ پشووی دەداو نانی نیوەڕۆی دەخوارد، کە ئەویش هەر نان و دۆ بوو بەڵام جارجار کەیبانۆی ماڵ هەندێ کەرێشی لەگەڵ نانەکەدا بۆ دەپێچایەوە، پاشان کترییە ڕەشی دەخستە سەر ئاگرو هەشت نۆ چای دیشلەمەی خەستی لێدەخواردەوەو ئەگەر پێوستی بکردایە دیسانەوە داسەکەی تیژ دەکردەوەو پاش ماندوێتی ڕەوینەوەی هەڵدەستایەوە سەرکار. تاقی ئێوارانیش دوو جار پشووی دەدا.

هەر کاتێ کە دوو سێ وەرزێر پێکەوە بوونایە ئەوا بەری پان پانیان دەدا وەبەرخۆو ئەوەیان لە لای قایمەکەوە [23] بوایە بۆی بردەدان و لێیان دەبوو بە بۆربۆڕێن و کامیان بینی درێژترو بە تواناترە لە پشت بەرز نەکردنەوەداو، بە بەر قایمەدا دەهاتن و دەچوون و هۆرەو گۆرانییان دەچڕی‌و وەستایانە سواڵەی زل زلیان دەهۆنییەوە.

ئەو وەرزێرەی لە لای قایمەوە دەبوو بە پێ‌لێنانی هاوەڵەکانی لەوان کارامەو زیرەکتر بوو و پێیان دەوت پاڵە. جاری وا دەبوو بەتایبەتی لە گەلە دروەدا کە بۆ کوێخا، یان مەلای ئاوایی دەکرا بە زۆری، یەکێك پەکی دەکەوت و پشتی دەهاتە ژان و ئەوجا بە بەهانەی ئاو خواردن، یان دەست بە ئاو گەیاندنەوە [سەر ئاو چوون] داسەکەی دادەناو خۆی دەدزییەوەو ماوەیێك لەو ناوەدا خۆی گێل دەکرد تا ماندوویی دەردەچوو، بەڵام ئەمە لە نەریتی وەرزێراندا کارێکی پڕ شوورەییە لە بەر ئەوە بۆ سووکایەتی کردن بەو هاوەڵەیان دەچوون میزیان بە سەر داسەکەیدا دەکرد.

وەرزێر لە کاتی دروەدا کە چنگی پڕ دەبێ لە گورزە گەنمی دووراوە دایدەنێتە سەر زەوی بەمەش دەوترێ سواڵە، ئەوجا چەند سواڵەیەك بە شێوەی ڕاست و چەپ دەخاتە سەر یەك و بەمەش دەوترێ مەڵۆ.

بەڵام لە دروی جۆدا سەری سواڵەکان [گوڵە جۆکان] هەمووی یەك لادا دادەنرێ لە شاراشدا سەر بەرەوخوار دەکرێتەوە.

مەڵۆنانەوە لە دروی گەنمدا دەکەوێتە ئەستۆی وەرزێر خۆی، بۆیە دوای تەواو کردنی هەموو بەرێك مەڵۆکانی لە شوێنێکی پەرێزەکەدا بە سێ‌و چوار ڕیز دادەنا بە جۆرێك کە گوڵە گەنمەکان چۆن لە مەڵۆدا دادەنرێت لێرەش هەر لە لادا دایدەنا، بەمەش دەوترا شارا یان گەلەباوەش.

لە نەریتی وەرزێرانی گەرمیاندا خورماوڕۆن خۆراکێکی سەرەکی بوو. هەر سێ ئێوارە جارێك دەبوایە خورماوڕۆنێکی بۆ بکرایە. جاریوا بووە ئێوارەی نۆرە خورماوڕۆن خاوەن ماڵ گیسکێکی قەڵەوی سەر بڕیوەو گۆشت و برنجێکی خەست و خۆڵ لێنراوەو کەیبانۆ ئیدی خۆرماوڕۆنی پشت گوێ خستووەو نەیکردوە، بەڵام وەرزێرە ـ کەیان پێشی کردووەو لە داخا نانی نەخواردووە تاوەکو خورماوڕۆنە بۆریان بۆ نەهێناوە.

سێ مانگەی هاوین و بەشێکی پاییزیش وەرزێر بە بەر خۆرەوە دەبرژا، ئەوسا کە لێدەبووەوە شایەتمانێکی هەقی بۆ دەهێناو سێ چوار سڵاواتی لە دیاری پاکی پێغەمبەر دەدا، پاشان جل و جەواڵی کۆدەکردەوەو دەگەڕایەوە بۆ ماڵ. لە ڕێگا ئەگەر وەرزێرێکی هاوەڵی بە دی بکردایە لای دەدایە لای‌و بە پێی داب و دەستووری باو بەرێ دوانی لەگەڵدا دەدوورییەوە یان ئێوارە لەگەڵیدا دەمایەوە. خاوەن ماڵ بەم بۆنەیەوە گیسکێ یان کاوڕێکی دەدا بە زەویداو وەرزێریش تا سێ‌چوار ڕۆژ پشووی دەدا ئەوجا دەچووەوە سەر تەواوکردنی ئیش و کار.

● **کێشەو گێرەو.. خەرمان هەڵگرتن: ـ**

وەرزێر لە ماوەی ئەو سێ‌چوار ڕۆژەی پشوودانیدا

ڕۆژێـک دەچـێ دوو شوێـن خەرمـانـی گەنـم و جۆ پاك دەکاتەوە، کە بە زۆری نزیکی ئاوایی دەبن و بە تەنیشت شوێن خەرمانەکانی دیکەی خەڵکی ئاوایی دەبن. گەنم و جۆ پێش کوتـرانیـان لە شاراو خەرمـانـدا پێیان دەوترێ قرچ یان قرچە. یان کلۆش بۆ قرچە کێشانیش ئەگەر ماڵێ دوو وەرزێری بێ ئەوە هەر خۆیان دەیکێشن، ئەگەریش یەکێك بێ ئەوە دەستەوا [دەستیاو] دەکا لەگەڵ هاوەڵێکیدا. هێستر یان کەرو ڕەشکـە بۆ ئەم مەبـەستـە ئامـادە دەکرێ. ڕەشکە جەواڵێکی درێـژکـولـەی تۆڕئـاسـایە درێژ ییەکەی نزیکەی چوار باڵە، پەتێکی بە ئەستووری پەنجە لە مووی بزن بۆ ئامادە دەکەن و پێی دەچنن. لە کێشەکردندا هەر سەرێکی ڕەشکـەکـە دوو سێ باوەش قرچـەی تێـدەکـرێ ئەوجا دوو کۆڵـەکـەی لەم دیـوو لەو دیـوی ناوەڕاستی ڕەشکـەکـەوە دەدرێتـەبـەر. لەگـەڵ قرچـە تێکـردنـدا یەکێـك دەچێتە نێو ڕەشکـەکـەوەو دەیشێلێ تا پڕ دەبێت ئەوجـا بە گوریسێـك دەمی دەبـەسـترێ، و لە بارگیـر، یان کەر بار دەکـرێو یەککێیان دەست بە لایەکێوە دەگرێ تا سەر خەرمان.

دوای کێشەکردن گێرە دەهاتە پێشەوە. ئەو دەمە گێرە بە گا، یان بە کەر، یان بە چان و جەنجەڕ. دەکرا. گێرەکردن بە گا یان بە کەر ئەوەیە، کە 5 ـ 6 گا یان کەر بە پەتێك هاومـل دەکـرێن، لەم حاڵـەتـەدا ئەو وڵاخەی لە دەستەی خەرمـانـەکـەوەیـە پێی دەوتـرێ بنـە ئەوەش دەکەوێتە دیوی دەرەوە پێی دەوتــرێ سەرپـەڕ کە بێگـومـان لە بنـە زیـاتـر دەخولێتەوەو ماندوو دەبێ، بنەش ئەرکی ئەوەیە وڵاخەکانی دیکە بەرەو ناوەوە ڕاکێشێو لەوانی دیکە کەمتر دەجوولێ. کورد بۆ تەمـەڵیو سستی یەکێـك وتـوویـەتی: «ئەڵێی گای بنــەیــە». ڕۆڵی وەرزێـــر لەم جۆرە گێـرەیـەدا لێخـوڕینی وڵاخەکانە بە دەوری خەرمانەکەدا بە هۆی کوتەکێکی سەر بە نەقیزەوە. جاری وا هەیە کەرێك یان وڵاخێك دەداتە لایـەنی لاسـارێو سین و پیش دەکـات و لە شوێنی خۆیدا دەچـەقــێو چەنــدی کوتــەك دەن ناجــووڵـــێو گێرەکە تێك دەدا، بەم وڵاخە دەوترێ گێرەنەکەر. لەمەوە کورد بە پیـاوی تەمــەڵ و فێـڵبــاز لە ئیش و کاردا دەڵێ: «پیاوێك یان کابرایەکی گێرە نەکەرە». (چان)یش بریتییە لە سێ دار درێژ ی هەر یەکەیان دوو باڵ دەبێو بە شێوەیێکی هاوڕێـك (تـەریب) دادەکـوتـرێنەسەر دارێکی کورتترداو بە لق و پۆپی درەختی ژارمــاسی [گــایـەمـە]یـان مارگیـر[24] دەتەنرێو ئەوسا بە مژانێك دەخرێتە شوێن جووتێ کەر یان بارگیــر کە نیلەیــان لە مل کراوەو مژانــەکــە لە ئەڵقــەی ناوەڕاستی نیلەکــە دەچـەسپێنـرێ. پەتێکیش بە ناوەڕاستی چانـەکـەوە بەسـتـراوەتـەوە کە وەرزێـر لە کاتی گێـرەکـردندا دەیگـرێو نایـەڵێ ئەمپـەڕو ئەوپەڕ بکات. هەندێ جاریش دوو سێ بەردی زل دەخرایە سەر چانەکە بۆ قورسی.

جەنجەڕیش کە دارتاش دروستی دەکرد بریتییە لە دوو تەوەرەی دارینی ئەستوور کە چوار دەوریان باڵتە [تەور]ی ئاسنی بە شێـوەی ڕاست و چەپ پێـدا داکــوتـراوە. هەر تەوەرەیــەکیش لە ناوەڕاستـەوە شیشێکی ئاسنی ئەستـووری تێکــوتــراوەو لە هەردوو سەرەوە بستێکیــان زیـادەو لە ژێـر سنووقێکی تەختەداری کووڕی کیسەڵ ئاسایی‌دا دەچەسپێنرێن.

لە کاتی گێـرە کردنـدا ئەم تەوەرانـە دەسـووڕێنەوەو باڵتە ئاسنـــەکــانیش قرچـــەکــە دەشکێنن و ووردی دەکــەن. جەنجـەڕیش وەکـو چان دەخـرێتە شوێنی هێستر یان کەر، بەڵام بە زۆری لە هێستر دەبەسترێ، فرە جاریش لە کاتی گێــرەکــردنـــدا وەرزێـــر سواری دەبێو بە دارو نەقیــزەش وڵاخەکان لێدەخوڕێ.

لە گێـرەکـردنـدا یەکـەمجار بە دەوری خەرمانەکەدا قرچ دادەخــرێ بە هۆی شەنــێکــی ئاســـەوە کە لە چوار لق پێکهاتووەو لە دارێکی لووسی درێژ دەچە ـ سپێنرێ کە پێی دەوتـرێ کلکـەشـەن یان دەسکەشەن. پێشتر سێلك بەکار دەهێنرا کە لە سێ لقە داری کووڕی داربەڕوو یان توو پێك دەهات.

ئەم لقانە پاش تاشین و ڕێك خستنیان بە هۆی سیرمەو

جەرمەوە لە دەسکێکی داربی یان چنار دەبەستران. لە گێرەدا قرچی یەکەم کوترا قرچی دووەمی بە سەردا دادەخرێو کە وای لێهات بارستایی قرچە کوتراوەکان ئەستوور بوو ئەوا بەشێکی بە چواردەوری خەرمانەکەدا بە شێوەی بازنەیەك هەڵدەدرێتەوە بەم جۆرە بەردەوام دەبن تا گشت قرچەکە دەکوترێ، ئەمجارە ووردە کوت دەست پێدەکات، کوترانی جاری یەکەم پێی دەوترێ قرچەشکێن کە بە زبری گێرەکراوەو کاکەی ووردنەبووە، چونکە جووتیار چەندە پێویستی بە گەنم و جۆکەیە ئەوەندەش پێویستی بە کاکەیە بۆ مەڕو ماڵات و گاو گۆتاڵی.

لە ووردە کوتندا لە بازنەکەی دەوری خەرمانەکە دەهێنرێتە خوارەوەو دووبارە بە چاکیو بە ووردی گێرە دەکرێتەوە. پاشان بەرەبەرە لێی هەڵدەدرێتەوە بۆ شوێن خەرمانەکەو لە بازنەی قرچەشکێن کراوەکە دادەگیرێتە خوارەوە تا هەمووی بە ووردی دەکوترێتەوە. ئەوسا بە تەواوی لە شوێن خەرمانەکەدا کۆدەکرێتەوەو بە شێوەی لاکێشەیەکی لێدەکرێ کە سەرێکی ڕووەو قیبلە بێت و لایەکیشی لە بای شەماڵ بێت. بەمەش دەوترێ تارم.

لە کاتی گێرەکردندا بەجێهێنانی هەندێ فەرمان زۆر پێویستن بۆ چاك کوترانی دەغڵەکە، وەکو وەردو پەڕەوناو وبنملکەکردن. وەرد بریتی‌یە لە هەڵگێرانەوەی ئەو بەشەی لە ژێر گێرەکەدایە تاوەکو ئەو گوڵ و سرووتانەی نەکوتراون بکەونە سەرەوەو بە باشی بکوترێن. پەڕەوناویش هەڵدانەوەی ئەو بەشەیە کە لە کاتی گێرەکردندا بەرەو دەرەوە پەڕیوەو بڵاوبووەتەوە. بنملکەش هەڵدانەوەی ئەو بەشەیە کە بەرەو ناوەوە بە ڕووی خەرمان یان تارمەکەدا بڵاوبووەتەوە. ئەم کارانە هەموو بە شەنی ئاسن دەکرێن.

لەپێش شەن کردندا ئەو لایەی بن خەرمانەکە دەماڵرێ کە با کاکەی دێنێ بە ملداو بە دوو سێ کۆمەڵ لە لاوە دادەنرێ. هەندێ بەردی زلیش هەر لەو لایەوە دەخرێتە تەنیشتی تارمەکە تا لەگەڵ کاکەدا جیا بکرێتەوەو دانەکە تێکەڵ بە کا نەبێ.

بۆ شەن کردن خاوەن ماڵ دێتە یارمەتی وەرزێرەکەیو کە ئەماڵ هەڵیکرد پیرە تارم دەدەن بە دەم باوەو لە کۆتاییدا جێزی گەنم [یان جۆ] دەردەکرێو، کا دەکەوێتە لایەك و دانیش بە لایەك. بەمە دەوترێ جێز دەرکردن یان جێز سوور کردن یان پاك کردن. بۆ ئەم مەبەستەش شەنی دارین بەکاردێت کە لە شەش لقی کووڕی جوان تاشراوی داری توو یان بەڕوو پێکهاتووە، وەستای خۆی بە شێوەیێکی جوان دەیتاشێو ڕێکی دەخا بە سیرمەو چەرم و هەر بە چەرمیش لە دەسکێکی لووسی دارینی بەند دەکات. هەروەها چەند گسکێکی سوڕناتکیش ئامادە دەکرا بۆ ماڵینی جێزە پاك کراوەکە، بۆ هەر گسکێك چەند بنجێك سوڕتاتك هەڵدەکەنرا بە یەکەوە دەبەستران و بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك یەك دوو بەردی پانەڵەی دەخرایەسەر ئەوجا ووشك دەبوو ویەیەکدا دەنووسا. لە کاتی شەن کردن و جێز دەرکردندا یەکێك بەر جێزەکەدا دەهات و دەچوو بەو گسکە کۆزەرو چوکڵ و چێوی لە سەر دەماڵیو لەم سەرو لەوسەری جێزەکەوە کۆی دەکردەوە. ئەم کۆزەرە لەوەودوا لە کاتی بن خەرمان پاك کردندا بە تێڵا دەکوترایەوەو بە با دەکرا.

کە جێز سوور دەبوو دەستیان دەکرد بە پێوانە کردنی بە تەنەکە یان بە قزناخ،(25) [وەکو لە پێشەوە باسم کرد زەمانی دەرەبەگ خاوەنی نەیدەتوانی دەستی بۆ ببات تاوەکو سەرکاری ئاغا نەهاتایەتە سەری بۆ موڵکانە وەرگرتن].

ئەوجا بەشی وەرزێرەکە جیادەکرایەوە کە بە پێی داب و دەستووری باو دە یەکی دەکەوت. جاری واش دەبوو خاوەن ماڵ بەرچاوتێر بووو حەزی لە خێرو پیاوەتی دەکرد لە بەر ئەوە سەرەڕای هەقەکەی خۆی دوو سێ تەنەکە گەنم و جۆی زیادەیشی دەدایە.

بەڵام بۆ پاك کردنی بن خەرمانەکە وەرزێر ئەرك و ماندووبوونێکی زۆری دەکێشا لە کۆزەرکوتان و لە سەرەن [کەو] وبێژنگ دان و بە با کردنی بن خەرمانەکەدا، لە بەر ئەوە لەمەدا سێ یەکی پێ دەبڕرا واتە بەشێك بۆ وەرزێرو دوو بەش بۆ خاوەن ماڵ.

**● چاڵ و عەمارکردنی گەنم و جۆ: ـ**

پاش خەرمـــان هەڵگــرتن خاوەن خەڵـە بەشی باراش و ساوەرو دۆینـەی ئەو وەختـەی جیـا دەکـردەوەو، بەشـەکـەی تریشی بۆ تۆویساڵی داهاتوو و باراشی زستان و بەهارو بۆ فرۆشتن [ئەگەر دەم ودەس نەفرۆشرایە] دەکردە چاڵ، یان عەمـارەوەو، ئەگـەر ساڵ هات بووایـە ئەوە چاڵ و عەمـار پڕ دەکران. بۆ عەمار، لایێك لە هۆدەییێك بڕ دەدراو بە خشتی کاڵ لەســەر تیـك [لای باریکی] دیـوار دەکـراو ئەوجـا لە ڕووی ناوەوە بە قوڕ سواغــێـکــی باش دەدراو، بەرزی عەمـارەکـە باڵـە پیـاوێـك زیـاتر دەبوو. پاش ئەوەی قوڕی دایوارو بنەکەی چاك وشك دەبۆوە گەنم و جۆکەی تێدەکرا.

بۆ بە چاڵ کردنی گەنم و جۆیش یان شوێنێکی ڕەقەنی نزیك ئاوایی دیاری دەکراو خەڵك چاڵی تێدا هەڵدەکەند، یان هەر کەسە لە حەوشەی ماڵی خۆیدا چاڵی هەڵدەکەند. ئەم چاڵەش قووڵییەکەی نزیکەی باڵا پیاوێك زیاتر دەبێت و بە قەبارەی ئەوەی کە تەغارێ تا تەغارو نیوێ گەنم یان جۆ بگــرێ. پاش ئەوەی کە تەواو وشــك دەبــێـتــەوە بە ئەستوورایی نیو بست کا دەکەنە بنی ئەوجا هێواش هێواش لە سەر خۆ گەنم یان جۆکەی تێدەکەن بە جۆرێك کە نابێ لە گڵی قەراخ چاڵەکە بکەوێ، بۆ ئەم مەبەستەش لەگەڵ بەرز بوونەوەی دانەوێڵەکەدا بە مشت کا دەکرێتە نێوانیانەوە بەمـەش دەوتـرێ مشتـەکردن. کاتێکیش کە چاڵەکە پڕ بوو دەستێکی ئەستوور کا بە سەر دانەوێڵەکەدا دەکرێو پاشان بە چاکی قوڕ دەدرێ، سەری چاڵــەکــەش زۆر جار قۆقـز دەکرێ بۆ ئەوەی باراناو دانەداتە خوارەوە.

**● کاکێشـــان:** ـ کا هەڵگـرتن بۆ زستـانی ئاژەڵ و پاتـاڵ بە ئەنـدازەی زەخیـرەی دیکـە بایـەخ و گرنگی هەیـە. وەرزێر ئەگـەر بن خەرمـانـەکـە بە سێ یەك پاك بکـات ئەوە هەقی کاکـێشـــانی نییـــەو خاوەنی خۆی یان بە کرێ دەیکێشێ. بەڵام ئەگـەر بە نیـواو نیـو [نیـوە بە نیـوە] پاکی بکـات ئەوە دەبـێ کاکــەش بکـێشــێ. لەم ماوەیــەدا کادێـن ئامـــادە دەکـرێو[26] لەپشت ماڵـەوە کەلـەبـەرێکی تێدەکرێو ئەوجا بەڕەشکــە لە شوێن خەرمـــانــەوە کاکــە دەکێشـرێتـە نێـو کادێنــەکــەوە. پاش ئەوەی کادێـن پڕ دەبێو هێشتــا کای زۆریش لە شوێن خەرماندا مابێ، ئەوسا خاوەنی هەر لەو گوزەرەدا [نــزیکی شوێن خەرمـانـەکـان] چوار دیـواری بە شێـوەی لاکێشـە تاپشتێنـە بۆ بەرز دەکـاتەوەو ئەوجا کاکەیی تێدەکرێو بە چاکی دەشێلرێ تا بەرزو قۆقز دەبێتەوە وئیدی سواغێکی چاکی دەدەن و هەڵیـدەگـرن بۆ زستـان. بەمەش دەوتــرێ لۆدە. ئەگـــەر زستــانـەکـەی خۆش بوو خاوەنی دەیفرۆشێ، ئەگەریش سەرماو بۆڕفت بووو کای کادێنەکەی تەواو بوو ئەوە ناچار دەبێ بەکێشی بکات بۆ ماڵەوەو بیکات بە قوڕگی ئاژەڵەکەیدا.

**پەراوێزەکان**

1 ـ بەرگن = تووکی بەرخە.

2 ـ شەوەکەژ = لە شەوەکەژدا ڕان بە شەو لە دەرو دەشت دەهێڵنەوەو نایهێننە ماڵەوە.

3 ـ کلێنچکە: کلکێکی بچووکە بە سەر دووگی مەڕەوە، لە لای خوارەوە.

4 ـ جاڕو پەرێــز: شوێـن گەنـم و جۆ لە پاش دروێنــە پێی دەوترێ جاڕ یان پەرێز یان هەردوکی بەسەریەکەوە [جاڕو پەرێز].

5 ـ خڕنــووك و کەوڵــە: دوو درەختی (بنچکی) گژ و بژاڵ زۆرن بۆ نەرمی لە کۆزی کارو بەرخــدا ڕادەخــرێن. خڕنـووك دڕکێکی ووردی هەیە.

6 ـ قسر: ئەو ئاژەڵانەن کە ساوایان لەبەرنەبێ یان ئاوس نەبن.

7 ـ قەرسیل: خاوەن ئاژەڵ زۆر جار لای ماڵدا هەندێ جۆ

[دوو سیٚ تەنەکە] دەوەشیٚنیٚ تاوەکو لە زستان و سەرەتای بەهاردا کارو بەرخ و مەڕو بزنی زاو، یان نەخۆشی تیٚدا بلەوەڕیٚنیٚ.

8 ـ ساوەڵەوان: ئەو میٚرمنداڵەیە ساوە [کارو بەرخ] دەلەوەڕیٚنیٚ.

9 ـ بیٚرگە (بیٚرە): دۆشینی مەڕو بزنی زاو لە شویٚنیٚکی تایبەتیدا کە پیٚی دەوتریٚ بیٚرگە و کرداری دۆشینیشیان پیٚی دەوتری لەبیٚرگە(بیٚرە) دان.

10 ـ بەهاربەنی: تەیمان و پەرژینیٚکە لە حەوشەدا دەکریٚ بۆ ئەوەی لە بەهاردا بە شەو و بە نیوەڕوان کارو بەرخی تیٚکریٚ.

11 ـ تیانچەو پاتیلە: مەنجەڵی مسی مام ناوەندین [نە زۆر زل و نە زۆر بچووك]

12 ـ نەبان یان نەوان: ئەو ئاژەڵە زاوانەن کە نایەڵن ساوەکانیان بیانمژیٚ.

13 ـ شیرپالیٚو: دەوری نیو مەتر قوماشی کەتانە، بەسەر مەنجەڵەکەدا دەدریٚو شیرەکەی پیٚدادەکریٚ بۆ ئەوەی موو و خەوش و خاڵی شیرەکە گل بداتەوە.

14 ـ کەریٚدان: مەشکەییٚکی دووکەڵ نەدراوە، پاش ئەوەی کەریٚ تیٚدەکریٚ لە نیٚو لەتە مەشکەییٚکی دیکە دەکریٚ کە دۆی تیٚدابیٚو بەم جۆرە ئیدی کەریٚکە ناتویٚتەوە سەرەڕای ئەوەش دەخریٚتە پاڵ کونەییٚك لە کونەڵاندا.

15 ـ سوورناتك: ڕووەکیٚکە لە کۆتایی بەهارو سەرەتای هاویندا دەڕویٚ ،گەڵاو لاسکی ووردو نەرمن ،بۆن و بەرامیٚکی خۆشی هەیە.

پیٚش گوڵ کردن ئەگەر ئاژەڵی سپی وکارو بەرخ بیخوا دەم و لیٚوی دەبیٚتە برین، ئەو کاتە بەو ئاژەڵانە دەوتریٚ: سوورناتك لیٚیداون.

16 ـ وەزنە لە گەرمیاندا شەش باتمانە، گەنم شەش تەنەکەی دارماڵی ڕانەوەشاوی وەزنەیەك دەردەچیٚ ،جۆش شەش تەنەکەی قەڵاقەڵای ڕاوەشاوی وەزنەیەکە. باتمان دە هۆقەی ئەستەموڵە [کە دەکاتە کیلۆو چارەکیٚك]. تەغاریٚکیش بیست وەزنەیە. دوازدە وەزنەو نیویش دەکاتە تەنیٚك.

17 ـ شەرتی «هەقم لە ناڵدار و باڵدار نییە» لە بە ئیجارەدانی جوگەو ئاو و ڕەزو باخدا لە لایەن دەرەبەگەوە، لە زۆر شویٚنی کوردستاندا باوبووە. لەم حاڵەتەدا زەویو باخی بە ئیجارە گیراو بەرهەمی ببوایەو نەبوایە خاوەنی هەقی نەبوو هەر پارەی ئیجارەی خۆی وەردەگرت. ناڵدار لەوەوە هاتووە کە ئەو باخ و مەزرایە ببیٚتە ژیٚر پیٚی لەشکریٚکەوە کە بیٚگومان کاول و ویٚرانی دەکەن. باڵداریش لە کولەوە هاتووە کە ڕووی بکردایەتە هەر شویٚنیٚك خاپووری دەکرد.

18 ـ بەیار (بۆرە): زەوییەکی نەکیٚلڵراوە. یان کیٚلڵراو بووەو بۆ ماوەی دوو ساڵ و بەرەوژوور واز لە کیٚلانی هیٚنراوە.

19 ـ داس دەمە زەرد کردن واتە زاخاودان و تیژکردنی لە لایەن ئاسنگەرەوە.

20 ـ سەرداس: ئەو پارەیە بوو کە پیٚشەکی وەکو یارمەتییەك دەدرایە وەرزیٚر. ئەم پارەیە لە بری هیچ کریٚیەکدا دانەدەشکاو لەو سەریش لیٚی نەدەسەنرایەوە.

21 ـ هەسان: بەردیٚکی پانەڵەی مەڕمەڕ ئاساییە، وەرزیر داسی پیٚ تیژ دەکات پاش ئەوەی هەندیٚ چەوری [کەریٚ یان ڕۆن]ی دەخاتەسەر.

22 ـ قەیناخ: کیفی چەرم یان کانزا (مەعدەن) بوون و وەرزیٚر دەیکردنە سەر پەنجەکانی دەستی چەپی بۆ پاراستنیان لە دڕك و داڵ و زبری گوڵەگەنم.

23 ـ قایمە: ئەو بەشەی گەنم یان جۆکەیە کە هیٚشتا دروو نەکراوە.

24 ـ ژارماسی «گایەمە» ڕووەکیٚکی لق و پۆ جیرە ،گەڵاو سەوزیٚکی مەیلەو بۆرە. گوڵیٚکی زەرد دەکات. لە نیٚو چەم و گۆماودا بە لەقەپیٚ دەکوتریٚو ماسی پیٚ ووڕو گیٚژ دەبیٚو دەگیریٚ. مارگیریش دەوەنیٚکی لق و پۆ دڕکاوییە، وەکو قەرەقاج وایە بەڵام ئەم لقەکانی بە هەر چوار لای خۆیدا بە خشۆکی بڵاودەبنەوە. گەڵاکانی خڕن، بەریٚکی سوور دەگریٚ بە قەد هەنجیر دەبیٚ. بۆ پەردووی خانوویش بەکار دیٚت.

25 ـ قزناخ: ئامرازیٚکی پیٚوانە بوو زۆرتر لە دەورو بەری کەرکووك بەکار دەهات قزناخ دوازدە هۆقە دەگریٚو پیٚنجیشی وەزنەیەکە.

# ئەسپرین

## گرنگترین دەرمانی ئەم چەرخەیە

دوکتور زەنوون
محمەد پیریادی زانستگای زانست
زانکۆی بەغدا

پێشەکی:

بێگومان ئەسپرین دەرمانێکی زۆر کون و زۆر هەرزانە، هەمیشە لەهەموو دەرمانەکانیتر کەم زیانترەو سوودبەخش ترە بۆ مرۆڤ. هەروەها بەبێ ڕاچێنەی پزیشك دەتوانیت بەهەمیشەیی لە دەرمانخان و دووکانەکان بیکریت.

بێگومان ئەسپرین نەك هەر دەرمانی سەرئێشەیە، بەڵکو گەلێك نەخۆشی تریش چاك دەکاتەوە. بەراستی ئەسپرین یەکەم دەرمانی ئەم چەرخەیە. لەوساوە ئەسپرین دروست کراوە بەسەدان دەرمان ئامادەکراوە خراوەتەناو بازارەوە بۆ چەن ساڵێك، لەپاشان قەدەغە کراون لەبەر هەندێك زیانی لایەلای دەرمانەکە بۆ تەندروستی. تەنها ئەسپرین بەکەڵك مایەوە هەموو تاقی کردنەوەکان زیانیکی لابەلایی ئەم دەرمانەیان نەدۆزیەوە. بەراستی شای هەموو دەرمانەکانە. ئایا پێکهاتوی ئەم دەرمانە گرنگە چیە؟ سوودەکان چین؟ چۆن لەناو لەشی مرۆڤدا کاردەکات؟ کیمیای ئەم دەرمانە چیەو بۆچی باشە؟ ئەم پرسیارانەو گەلێك زانیاریتر مەبەستی ئەم ووتارەیە.

مێژوو: ئەوانەی ئیستا تەمەنیان لە چل ساڵ زیادەترە زۆر باش دەرمانێکی تاڵی ساڵەکانی پەنجاکانیان لە بیرە کە بۆ تاولەرز[1] بەکار دەهێنرا وە پێیان دەگوت «کنیین Qumine»

ئەم دەرمانە واتە کنیین لە دەرمانخاکانی ئیستا بەدەگمەن دەدۆزیتەوە چونکە دەرمانی باشتر لەمە دروست کراوە بۆ ئەم نەخۆشیە. مەبەستمان لە باس کردنی دەرمانی کنیین لێرەدا هەر ئەوە نیە بزانین بۆ چ نەخۆشیەك باشەوە چ کاریگی هەیە بەسەر نەخۆشا، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە باسی سەرچاوەو مەڵبەندی دەرمانەکە بکەین. مەڵبەندی دەرمانی کنیین درەختیکی تایبەتە بە ناوی «درەختی کینا» لە هیندستان و[2] جاوەدا دەروێت.

ئەم دارە مادرەی کنین دروست دەکات و کۆی دەکاتەوە لەناو قەدی دارەکە خەڵکی هیندستان فێربووبوون لە ئەنجامی تاقیکردنەوە کە هەندێك لەم دارە بدەن بە نەخۆشی تاولەرز بۆ چارەکردنی نەخۆشیەکەی[3].

هەروەها مێژوو پێمان دەڵیت کە داربی[4] هەمیشە لەلایەن مرۆڤەوە بۆ چارەسەرکردنی هەمان جۆرە نەخۆشی وە بۆ کەم کردنەوەی ئێش و ئازاری لەش بەکارهێنراوە.

لە ساڵی 1763 ریڤێند ئەدمۆندستۆن Reverend Edmond Stone لە بەریتانیا ماددەیەکی سپی لە داری بیی پوختەکردوە بەکاری هێنا بۆ چارەسەرکردنی تای گەلێك نەخۆش. دوکتور ستۆن هەواڵی ئەم دۆزینەوەی لە نامەیەکدا بۆ سەرۆکی کۆمەڵەی کیمیاکارەکانی بەریتانیا نووسی. لە نامەکەیدا گوتی کە ئەم ماددە سپیەی پوختەی کردوە لە قەدی داربیی تامێکی زۆر تاڵی هەیە وەکو ماددەی کینین کە باسمان کرد. ئەم ماددە سپیەی کە دوکتور ستۆن باسی کرد لە راستیدا بریتیە لە ماددەی «سالیسین Salicin»

لە ئەنجامی خواردنی ئەم ماددەیە لەلایەن نەخۆشەوە، ئاوگەکانی[5] دەسگای هەرس سالیسین شیدەکاتەوە بە یارمەتی ئاوەوە بەم جۆرە پێکهاتوەکەی دەگۆریت و دەبێت بە «ترشی سالیسیلیك Salicylic acid» . ترشی سالیسیلیك زۆر نزیکە لە پێکهاتووی ئەسپرینەوە. شایانی باسە لەم ساڵانەی دوواییەدا ماددەی «سالیسین» لە گەلێك درەختی تردا دۆزرایەوە.

لە ساڵی 1853 ز ئاوێتەی «ئەسیتیل سالیسیلیك ئەسید» Acetyl Salicylic acid لەلایەن دوکتور گێرهارت وە Gerhardt ئامادەکرا لە لابۆردا، بەڵام لەبەر چەن کۆسپێك بە شێوەی دەرمان هەتا ساڵی 1899 بەکارنەهێنرا[6]. لەم ساڵەدا دوکتور «درێسەر Dresser» ئەسپرینی پێش کەش کرد بەشێوەی دەرمان وە بریاردرا کە ماددەی «ئەسیتیل سالیسیلیك» (ئەسپرین) دەرمانێکی بەکارە بۆ چاك کردنەوەی نەخۆشی باداری و ئێشی جمگەکان.

لێرەدا پێویستە بزانین ئایا ناوی «ئەسپرین Aspirin» لە کۆیوە هاتوە؟. ئەسپرین ناویکیدا داریژ راوە لە ناوی ماددەکە بە زوبانی ئەڵمانی. بە ئەڵمانی ماددەکە پێی دەڵین:

Acetyl Spirsaeure

بەم جۆرە ئەسپرین بوو بە دەرمانێکی باو لەناو هاوولاتیەکان وە جێگای گەلێك لە دەرمانەکانی لادێییەکان گرتەوە چونکە ئەسپرین ماددەیەکی زۆر هەرزان و بەکارو سوود بەخش بوو.

شایانی باسە هەشتا ساڵ زیاترە مرۆڤ دەرمانی ئەسپرین بەکار دەهێنیت وە لەم ماوە درێژەدا هیچ زیانێکی لایەلای بۆ تەندروستی مرۆڤ نیشان نەداوە[7].

## کیمیای ئەسپرین و گۆرانی لە لەشی مرۆڤدا:

ئەسپرین ترشێکی ئۆرگانی کەم هێزە. رادەی کارکردنی بۆ چاك کردنەوەی ئێش و ئازار زیادەترە لە خوێی صودیومی ترشی سالیسیلیك Sodium Salicylate بە (50٪)، واتە ئەسپرین ئەوەندەو نیوێك بەسوودترەو بەکارترە بۆ دەرمان. بەڵام لەلایەکی ترەوە خوێی صودیومی ترشی سالیسلیك خۆماڵیکی بەسوودی هەیە کە لە ئەسپرینا نیە، ئەویش ئەوەیە کە خوێیەکە ئازاری دیوی ناوەوەی گەدە نادات چونکە ترش نیە کەچی ئەسپرین گەلێك جار ئەزێتی گەدە دەدات و رادەی ترشی زیاد دەکات. دەستوری کیمیایی ئەو ماددانەی باسمان کردن لە خوارەوە دەنووسین: -



خوێی صودیومی ترشی سالیسیلیک

Sodium Salicylate



ئەسپرین

Aspirin

Acetyl-salicylic acid



ترشی سالیسیلیک

Salicylic acid

پێش ئەوەی باسی چۆنیەتی کارکردنی ئەسپرین لەشی مرۆڤدا بکەین بە پێویستی دەزانین کورتە باسێکی

ئەسپرین دروست دەکات بەڵام ناوی ناوە «ئەسپین Aspin». کە چەپی ئەسپرین قووت دەدەیت ئایا چی بەسەر




چۆنیەتی دروست کردنی ئەم دەرمانە بکەین. ئەسپرین دروست کردن زۆر ئاسانە، قوتابیەکانمان لە

ماددەکە دێت؟ چۆن پێکهاتوەکەی دەگۆڕێت و لەکوێ کار دەکات؟ لە خوارەوە باسی ئەو گۆڕانانە دەکەین:




بەشی کیمیای کۆلێجی زانست هەموو دەزانن ئەسپرین لە لابۆردا ئامادە بکەن. لەم ئامادەکردنەدا ترشی سالیسلیک لەگەڵ ئەسیتیک ئەنهایدراید (ترشی سرکەی بێ ئاو) بەکار دەهێنرین بەگوێرەی هاوکێشەی خوارەوە: -

ترشی سالیسیلیک بەزۆری لە فینوڵ دروست دەکرێت بە گوێرەی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە:

لە عیراقدا کومپانیای پیشەسازی دەرمان لە سامرا حەپی

Metabolism

زۆربەی ئەسپرین کە قووت دەدرێت لەناو دەم و گەدەدا شی نابێتەوە، واتە بەبێ گۆڕانی کیمیایی دەگوزرێتەوە بۆ ناو خوێن. واتە ئەسپرین ویان «سالیسیلات»[8] هەردووک لە گەدەو ریخۆڵەی دوانزە گرێدا[9] هەڵ دەمژرێن و دەگوازرێنەوە بۆ ناو خوێن. لە خوارەوە نەخشەی ڕێگاکانی گۆڕانی[10] ئەسپرین ویا سالیسیلاتی صودیوم لە لەشی مرۆڤدا نیشان دەدەین




وێنەی ژمارە (1)

لەسەرەتای خواردنی ئەسپرینەوە هەتا هەڵمژینی و گوازتنەوەی بۆ ناو خوێن لە لەشدا سەعاتێك یان دوو سەعات دەخایەنێت. سالیسیلاتی صودیوم لە ئاودا زۆر باش دەتوێتەوە بەڵام کە دەچێتە ناو گەدەوە بەشێکی دەبێت




به ترشی سالیسیلیك به هۆی کارکردنی لەگەڵ ترشی هایدروکلوریك (HCL) ی ناوگەدە بەگۆیرەی ئەم هاوکیشەیەی خوارەوە :

ئەسپرین کە بریتیە لە «ئەستیل سالیسیلیك ئەسید» بەبێ شیبۆنەوەو گۆڕین ی پێکهاتوەکەی لە گەدەو ڕیخۆڵەی داونزەگرێدا هەڵ ئەمژرێت و تێکەڵ بە جوگای خوێن دەبێت».

لەناو شانەکانداو هەمیشە لەناو خوێن ئەنزیمێك[11] هەیە بەناوی ئەنزیمی «ئیستەرین Esterase» تایبەتە بە شی کردنەوەی ئاوێتەی ئیستەر Ester[12]. ئەسپرینیش یەکێکە لە ئیستەرەکان و بەگۆیرەی ئەم هاوکیشەیەی خوارەوە شی دەبێتەوە :







برێك لە ئایۆنەكانی سالیسیلات ئەنوسێت بە ماددەی ~~ئەلبومینا~~ Albumin ،[13] كە لە خوێنا هەیە. بەڵام كە خەستی ماددەی سالیسیلات بەرز دەبێت ئەوسا پیشەی خۆی دەبینێت بەبێ گومان. واتە ئێش و گەرمی (تا) نیشانەكان چارەسەر دەكات. لە ئەنجامدا ماددەی سالیسیلات بەیارمەتی خوێن دەگوازرێتەوە بۆ ناو گورچیلەكان و زیادەی ماددەكە لەگەڵ میزا فڕێ دەدرێت. شایانی باسە باری تفتی[14] میز یاریدەی تواندنەوەی ماددەی سالیسیلات دەدات و لەپاشان لە شێوەی شلاوێكدا فڕێی دەداتە دەرەوە.

پاشماوەی دەرمانی ئەسپرین لەناو شانەكانی مرۆڤ بۆ ماوەی حەفتەیەكیش هەر دەمینێت و لەناو میزدا دیاری دەدات.

**پیشەسازی ئەسپرین:**

هەروەكو لە سەرەوە باسمان كرد ئەسپرین لە كاركردنی ماددەی ترش سالیسیلیك لەگەڵ ترشی سركەی بێئاو Aete auly diel ،[15] ئامادە دەكرێت. لەم كارەدا ڕێژەی بەرهەمی ئەسپرین دەگاتە (90٪).

شایانی باسە ئەو كارگەیەی كە ئەشپرین دروست دەكات هەمیشە ترش سركەش دەفروشێت چونكە بەرهەمێكی لابەلایەو بەچەینەتیەكی زۆر پێك وێت.

**كەرەسەی پێویست بۆ دروست كردنی یەك تەن ئەسپرین و (750) پاون ترشی سركە:**

| | |
|---|---|
| ترشی سالیسلیك | 1700 پاون |
| ترشی سركەی بێئاو | 1300 پاون |

Acetic Anhydride

~~Aete awlydide~~

لە خوارەوە نەخشەیەكی[16] هێڵی كارگەی ئەسپرین نیشان دەدەین، لەم نەخشەیەدا ترشی سالیسلیك و ترشی سركەی بێئاو تێكەڵ دەكرێن بەیەكەوەو لە پاشكۆی نەخشەكەدا ئەسپرین دروست دەبێت. هەندێك لە ترشی سركەش پێك دێت لەم كارەدا، وەكو گوتمان كە یەكارێكی[17] لابەلایی پێك دێت.




ژمـارەیـەکی زۆر لە کارگـە کیمیـایی‌یـەکـان هەن کە هەریـەکـە دوو یا سێ وەیـا زیـادتـر لە ماددەکـانی کیمیایی دروست دەکەن. بۆ وێنە کارگەی دروست کردنی ئەسیتون هەمیشـە فینـول دروست دەکـات و دەی فرۆشێت. ناوی کارگـەکـە ناوی پیشـەسازی ماددە زۆرەکە هەڵ دەگریت بۆ نمونە کارگەی دروست کردنی ئەسپرین لەسەرەوە پێی دەڵێن «پیشەسازی ئەسپرین» نەك پیشەسازی ترشی سرکە چونکە چەنیەتی ئەسپرین زۆرترە لە ترشی سرکە.

ئەمجـا با هەنگـاوەکـانی دروست کردنی ئەسپرین باس بکەین: وەکو گوتمان ترش سالیسلیك و ترشی سرکەی بێ ئاو بەیەکەوە تێکەڵ دەکرێن لەناو تانکیەکی گەورەی تایبەتی پێی دەڵێن «مـەنجـەڵی کارکـەر». ئەم مەنجـەڵـە لە پۆلاَ دروست کراوە چونکـە ژەنـگ ناگـرێت و هەمیشـە بەهێزە. پلەی گەرمی ئەم مەنجـەڵـە نابێت لە 90می زیـادتر بێت.

هەروەهـا ماوەی کارکـردنی ~~کارکـردنی~~ ماددەکـان هەمیشە گرنگـە. لەپاش سێ سەعـات شلاوێکی تازە پێك دێت. ئەم شلاوە بە ترومپـای تایبـەتی پاڵ پێـوەدەنـرێت بەرەو ژووری پالاَوتـن. لە ژووری پالاَوتـن شلاوەکـە دەپاڵێورێت و چ ماددەی رەق و تڵپی تیادا هەیە جیا دەکرێتەوە.

ماددە شلەکـە بە شێـوەیێکی ئۆتوماتیکی دەگوازرێتەوە بۆ ژورێکی تەنیشتی کە پێی‌دەڵێن «ژووری بللوورکردن»[18]، لەم ژوورەدا شلەکە سارد دەکرێتەوە تا پلەی هیچ (50م) بۆ ئەوەی ئەسپرینەکەی ناوی بەشێوەی بللووری بنیشێت. واتـە لێـرەدا پاش ماوەیـەك ماددەی ئەسپـرین دەنیشێت و پێـویستـە بپاڵێـورێت. ئەم مەبـەستـەش واتـە پالاَوتن لە ژورێکی تایبـەتی تردا جێبـەجێ دەکـرێت کە پێی‌دەڵێن «ژووری خولاندن»[19] Ceutifuge

ئەمجـا ماددە رەقـەکـە کە ئەسپـرینـە دەگـوازرێتـەوە بۆ

ژوورێکی‌تر. لەم ژوورەدا ئەسپرینەکە ووشك دەکرێتەوە.
شایانی باسە ئەو شلاوەی دەمێنێتەوە لەم هەنگاوانەدا دووبارە دەگوازرێتەوە بۆ ناو مەنجەڵی کارەکە (تکایە سەیری نەخشەهێڵیەکە بکە) چونکە هەندێك ماددەی بەسوودی تیادا هەیە.

هەندێك لە کارگەکان توێنەر[20] بەکار دەهێنن لەم

بەرهەمی ئەسپرین لە ئەمەریکا[22].

بێ‌گومان ئەگەر هاتو چاوێك بە چەنیەتی بەرهەمی ئەسپرین دا بخشێنین لە ئەوروپاو ئەمەریکادا دەبینین چۆن هەمیشە لە زیادبوونایە.

هێڵی نیشاندەری خوارەوە چەنیەتی بەرهەمی ئەسپرین لە ئەمەریکادا نیشان دەدات:




وێنەی ژمارە (3)

پیشەسازیەدا بۆ نمونە توێنەری «چوارەم کلۆریدی کاربون»[21]، ترشی سرکە، بەنزین، ویا هایدرۆکاربۆنەکانی‌تر. هەندێك لە کارگەکانیش توێنەر بەکار دەهێنن تەنها بۆ شوشتنی ئەسپرینەکە لەدوا پلەدا. بەکارهێنانی توێنەر هەمیشە ئەسپرینەکە بێ‌گەردو خاوێن دەکات.

کەچی نرخی ئەسپرین لەوساوە کە داهێنراو دروست کرا لە ساڵی 1936 هەتا ئێستا زیادێکی وای نەکردوە، بەپێچەوانە لە نێوان ساڵانی 1938 ـ 1946دا نرخی دابەزی. هێڵی نیشاندەری خوارەوە بەرزو نزمی نرخی ئەسپرین لە نێوان ساڵانی 1936 هەتا 1959 نیشان دەدات.

Phospholipid
↓
Arachidonic acid
↓ ✗ ← Aspirin
Endoperoxidase



بەرزونزمی نرخی ئەسپرین لە ئەمریکا



وێنەی ژمارە (4)

وێنە ژمارە (٥)

هێڵەنیشاندەرەکانی سەرەوە گرنگی و باوێتی[23] ئەسپرین ئاشکرا دەکەن چ لە بارەی نرخەوە، چ لە بارەی چەنیەتی بەرهەم

دروست کراوە هەمیشە چەند دەرمانێکی هەمەجۆر[24] دروست کراوو خزاوەتە بازارەوە، بەڵام هیچیان جێگای ئەسپرینیان نەگرتۆتەوە. هەندێک لەم دەرمانانە ئەمانەی



سالیسیل ئەماید

Salicylamide



ن-ئەسیتیل پارا ئەمینوفینول

N-acetyl para-aminophenol

حەبی ئەسپرین کە لە دەرمانخانەکان دەبکرین ڕێژەی ئەسپرینی پەتی تیایاندا لە 30٪ زیالتر نیە، بەشەکانی تری نیشاستەو ماددەی تری پێویستە بۆ پارێزگاری ماددەکە.

ماددەی ئەسپرین هەر هەمیشە پەتی نیە بەڵکوو گەلێك دەرمانی تر هەیە کە ئەسپرین بەشداری لە پێکهاتوەکانی دا دەکات. بۆ وێنە ئەم دەرمانانەی خوارەوە بەشێك لە ئەسپرینیان تیادا هەیە.

| | |
|---|---|
| ئەنیرڤان | پاراسیتول |
| ئەنادین | سەردەرجین (دەرمانیکی فەرەنسیە) |
| ریڤانین | فلوئاوت |
| | کوریسیدین |

**ناوی چەن کومپانیایەکە ئەمەریکی کە ئەسپرین دروست ئەکەن:**

لەخوارەوە ناونیشانی چەن کارگەیەکی ئەمەریکی دەنوسین کە ئەسپرین دروست دەکەن: -

1 - کارگەی میدلاند - لە میشیگان. ئەم کارگەیە موڵکی کومپانیای (داوە)ە.

Dow Chemieal Compauy, Midlaud, Miehigan (U. S. A).

2 - کارگەی ئەسپرین لە ئیکهارت لە ئینیدیانا. ئەم کارگەیەش بەشێکە لە کومپانیای مایلز.

Miles Laboratories gne. Elkhast gndaia (U. S. A)

3 - کارگەی ئەسپرین لە شاری سانت لویس، لە میسوری. بەشێکە لە کومپانیای مونسانتو.

Monsonto Chemicol Cmpany St. Fouis, Mo, (U. S. A)

4 - کارگەیء ئەسپرین لە شاری نورویج لە نیویورك.

ئەمەش یەکێکە لە کارگەکانی کومپانیای نورویج بۆ دروست کردنی دەرمان.

Norwieh Pharm acal Co., Norwieh, New York. (U. S. A)

5 - کارگەی شاری ترینتون لە نیویورك - بەشێکی کومپانیای دەرمانی سیترلینغ (بەشێکە لە کومپانیای دەرمانی سیترلینغ (بەشێکە لە کومپانیای بایەر).

Stenling Pug Ine. (Bayes Comany Pim), Tremton, N. J, (U. S. A).

**سیفەتەکانی ئەسپرین:**

ئەسپرین ماددەیەکی سپی ڕەقە. پلەی تواندنەوەی (140 - 145ص)ە. دەرمانی ئەسپرین لەژێر گەلێك ناودا لە وڵاتەکاندا فرۆشرێت بۆ نمونە ئەم ناوانەی خوارەوە (25) تۆمار ئەکەین: -

| | |
|---|---|
| ئەسیتیسیل | Aeetyeyl |
| ئەسیتونین | Aeetophen |
| ئەسیتوسال | Aeetosal |
| ئەسیتوسالیسیلیك ئەسید | Aeetesleylie aeil |
| ئەسیتوسالین | Aeetosalin |
| ئەسیتایلین | Aeetylin |
| ئەسیتایلسال | Aeetylsal |
| ئەسیتیل پایرین | Aeetylpyin |
| ئەسپرو | Aspro |
| ئەستیریك | Asterie |
| کاپرین | Capsin |
| دۆرماکس | Duwax |
| ئیکوترین | Eeetsin |
| ئیمپرین | Empsiin |

| | |
|---|---|
| ئینتروفین | Enteopfeu |
| ئینتروسارین | Entrososine |
| هیلیکۆن | Helieon |
| نیورونیکا | Neuronika |
| رۆداین | Rhodule |
| سالاسیتین | Salaeetin |
| سالیتوجین | Saleetogeu |
| سالتین | Saltin |
| گزاکسا | Xaxa |

فورمیـولای ئەسپـرین بریتیـە لە CgH8 O4 کێشەی گەردی (180,15)یە. ڕێژەی توخمەکانی پێکهاتوی بەم جۆرەی خوارەوەیە: -

کاربون ٪60
هایدروجین ٪4,48
ئۆکسجین ٪35,53

ماددەی ئەسیتـۆن شلێکی زۆر یەکـەڵکـە بۆ بلووردکردنی ئەسپـریـن و پەتـی کردنـی. بەڵام تەکـنـیـکی تازەتــر بۆ پەتی‌کـردنی ئەسپـرین هاتۆتەکایەوە وەکو دڵۆپاندنی ماددەکە بە ئامێـری تایبـەتی. چری ئەسپـرین (1,35)ە. لە ئاوی ساردا زۆر بەکەمی دەتوێتەوە.

شایـانی باسـە کە ئەسپـرین بە هۆی گەرمی دەتوێتەوەوە دووبـارە سارد دەکـرێتــەوە، دەبینین لە پلەی (118ص) دەبەسترێت و ڕەق دەبێت.

ئەسپـرینی بێ‌گـەردو پەتی هیـچ بۆنێکی نیـە (بێ بۆنە) بەڵام ئەگـەر هاتـوو دەرمـانەکە بە بەتاکی مایەوە بۆ ماوەیەك ئەوا شێی هەوا کاردەکـات لەگـەڵیـاوە ئەنجـامی کارەکـە بریتیەلە بەرەڵابوونی ترشی سرکە. بۆنی سرکەکە زۆر باش هەستی پێ‌دەکرێت لەم جۆرە ئەسپرینە. ئەگەر هەوا شێی نەبـو واتـە وشـك بوو ئەوا مانەوەی ئەسپرین بە بەتاکی[25ب]

هیچ زیانی نیەوە هەرگیز ناچێت ـ گرامێك ئەسپرین لە (300)میل[26] ئاو دەتوێتەوە لە پلەی گەرمی ئاساییدا[27]. کەچـی ئاوی گەرم (لــە پلەی 37ص) هەر (100)میــل دەتـوانێت گرامێـك ئەسپـرین بتـوێنێتەوە. هەروەها گرامێك ئەسپرین لەنـاو (5)میـل کولـدا دەتـوێتـەوەو هەمیشە لەناو (17)میل کلوروفورمدا دەتوێتەوە وەیا لەناو (10 ـ 15 میل) ئیثەردا دەتوێتەوە.

کوڵاندنی ئەسپرین لە ئاودا شی ئەکاتەوە. هەروەها شلاوی کاربونات وەیاخود شلاوی هایدروکسید زیادتر دەکاتەوە.

ئەسپــرین ماددەیــەکیـ ترشــە[28] بەهـۆی کۆمـەڵـەی کاربوکسیلەوە OH - e - کە لە پێکهاتوەکەیدا هەیە. بەبۆنەی ئەم کۆمــەڵــەوە ئەسپـرین لەگـەڵ شلاوی کاربـونـاتـا کار دەکات و ئەم کارە ئاشکرایەوە گازی CO2 بەرەڵا دەبێت بە شێوەیەکی دیار (شلاوەکە کەفێکی زۆر دەکات و هەڵ دەکفێت):

بەڵام زۆربــەی ئەسپــرینــەکـە لەم ڕادەیـەدا ناوەستیو شی‌دەبێتـەوە بۆ ترشی سالیسیلیـك بەگـۆیـرەی هاوکێشـەی خوارەوە: -






شایانی باسە مرۆڤ دەتوانێت بەتاقی‌کردنەوەیەکی ئاسان بزانێت ئایــا نمـونـەیـەك لە ئەسپرین شی‌بـوّتـەوە یان نا؟ وەیـاخـوود چەندێکی لێ‌شی‌بوّتەوە؟ ئەم جۆرە تاقی‌کردنەوە بەم شێوەیەی خوارەوە جێ‌بەجێ دەکرێت: ـ

کەمێـــك لە ئەسپـــرینـــەکـــە لە دۆلّێکـدا دەی هارین و دەیگـوازێتـەوە بۆ ناو لولـەیەکی تاقی‌کردنەوە. لەپاشان چەن میلیلیترێك لە ئاوی دلّۆپاوی دەکەینەسەراو باش تێکەلّیان دەکەین. ئەمجا چەن دلّۆپێك لە شلاوی ترنگی کلوریدی ئاسنیك[29] Ferrie ehloide دەکەین بەسەر ماددەکانا. ئەگەر هاتـــوو ڕەنگێکی مۆر دروست بوو بەهـــۆی ئەم تێکـــەلّ بونـە، ئەوە نیشـانـەیـە کە ئەسپرینەکە شی‌بوّتەوە بۆ ترشی سالـیـــسـیـلیـــك Salieylie aeid. هەر وەهـــا چەیـنــەتـی شی‌بوونەوەی ئەسپرینەکە دەپێورێت بەپێوانی ڕادوەی تۆخی ڕەنگە مۆرەکەی کە لەسەرەوە باسمان کرد. بۆ مەبەستی ئەم جۆرە پێـــوانـــەکــردنـە ئامێـری هەستیـاری تایبـەتی بەکـار دەهێنرێت، وە ڕێژەی شی‌بوونەوەی ئەسپرینەکە بە دیقەت پێوانە ئەکرێت.

بێ‌گومان لەم سالاّنەی دووایییەدا چەن تەکنیکی تریش بەکـار هێنـراوە لە جیهـانی دەرمـانســازیـرا بۆ پێـوانـەکردنی ڕاددەی شی‌بـوونـەوەی ئەسپـرین. بەداخـەوە ماوەو شوێنی باسکـــردنی ئەو هەمـوو تەکنیکـانـە لەم وتـارەدا نیە. ئایـا چۆن چۆنـی ئەســپــرین هەلّ بگـــرین لە مالّـــەوە وەیـــا لە مەدخەرەکان بۆ ماوەیەکی زۆر؟؟ بەبێ ئەوەی شی‌ببێتەوە؟

بۆ ئەم مەبەستە بایەخ بە دوو شت دەدەین:

1 ـ ڕتووبەت. واتە ئاو یا شێ.

2 ـ تیشکی خۆر واتە ڕووناکی ڕۆژ.

ئەگەر بێتو ئەسپرین لەو دوو شتەی سەرەوە بپارێزرێت ئەوا هەرگیـــز هیچی لێ‌نـایـەت و کۆن نابێت واتـە سوودی دەرمانی هەمیشە وەکو خۆی دەمینێتەوە. بۆیە ئامۆژگاریمان دەربارەی هەلّگرتن و پاشەکەوت کردنی ئەسپرین ئەمەیە؛:

**«ئەسپرین لە شوێنێکی ووشك و تاریك هەلّبگرە»**

**میکانسمی کارلێکردنی ئەسپرین:**

بێ‌گـومـان ئەسپرین هەر بە تەنها دەرمانی سەرئێشە نیە بەلّکـو گەلّێـك سوودی‌تـری هەیـە. لە خالّـەکانی خوارەوە ؛ باسی هەموو سوودەکانی دەرمانەکە دەکەین:

1 ـ **ئەسپرین دژی تایە**: واتە پلەی گەرمی لەشی مرۆڤ کەم دەکاتەوە وە دەیگەڕینێتەوە پلەی گەرمی ئاسایی، واتە 37,5ص. ئەم جۆرە کارە بە ئینگلیزی پێی‌دەلّین:

سروشتیە کە ئەسپرین تەنها دەرمان نیە کە گەرمی لەش کەم دەکاتەوەوە کەم کردنەوەی پلەی گەرمی لەش بۆ پلەی گەرمی ئاســایی. هەمیشـە ئەم کارە بەراستی چارەسـەری هۆی تای ئەو نەخـوشـە نیـە بەلّکـو تەنهـا مەترسی گەرمای لەشی لەسـەر دەبـات بۆ ماوەی چەن سەعـاتێك وە دووبارە تایـەکـەی دەگـەڕێتـەوە کە کاری ئەسپرینەکە تەواو دەبێت.

دوو حەپی ئەســپـــریـن دەتـــوانێت زۆر چاك پلەی گەرمی مرۆڤی نەخۆش بهێنێتەخوارەوە لە ماوەی (1 ـ 2) سەعاتدا ـ چۆنیەتی واتە میکانسمی داگرتنی پلەی گەرمی لەش بەم شێوەیەی خوارەوە جێ‌بەجێ دەبێت: ـ

ئەسپرین لەناو شانەکان و لولەکانی خوێن کاردەکەتەسەر لولەکان ودەکشێنەوە[30] واتە قەبارەی لولەکانی خوێن فراوانتر

ئەبنەوە، ئەمەش دەبێتەهۆی دابەشکردنی گەرمایی بەسەر قەبارەیەکی گەورەتر وە بەم جۆرە پلەی گەرمی لەش نزم دەبێتەوە. هەندێك جار نەخۆشەکە تا بەریدەدات هەموو لەشی ئارەق دەکات.

**2 ـ هێمن کردنی ئێش و ئازاری لەش:** Amalgesie egteet

یەکێك لە گرنگترین سوودەکانی ئەسپرین بۆ مرۆڤ ئەوەیە کە ئەسپرین ئێش کەم دەکاتەوەو هەندێك جار بەجاری مرۆڤ چاك دەکاتەوەو لە ئێشەکە سەرفراز دەبێت. مەگەر ئێشەکە یەگجار قورس بێت بە رادەیەك کە ئەسپرین هیچی پێ نەکات، ئەوسا ماددەی بەهێزتر هەیە وەکو مۆرفین وەیا دەرمانی تر. بۆ وێنە ئەسپرین دەرمانێکی زۆر بەکارە بۆ سەرئێشە، گیان ئێشە وەیا ددان ئێشە. هەروەها سك ئێشەو ئازاری باداریو کۆلێج و ئێشی ئافرەتی زەیستان و[31] زامداری ئاسان، هەموو بە ئەسپرین خواردن لادەچن.

ئایا چۆن چۆنی ئەسپرین ئەم هەموو ئێش وئازارە لادەبات؟

بەراستی زۆر باش روون نەبۆتەوە، هەرچەندە دوو جۆر لێکدانەوە بۆ ئەمانە پێش کەش کراون: ـ

1 ـ ئەسپرین کار دەکاتە سەر ئەوشانانەی کە سووتانەتەوە[32] وە ئێشیان کەم دەکاتەوە (سەیری خاڵی ئایندە بکە).

2 ـ بەشێك لە زاناکان لەو بڕوایەدان کە ئەسپرین کاردەکاتەسەر ئەو ئەنزیمانەی کە لە مێشك دروست دەبن و دەبن بە هۆی هەست کردن بە ئێش وئازار.

**3 ـ ئەسپرین دژی سووتاندنەوەی شانەکانە:**

Antinblammatoy effeet.

هەمیشە ئەسپرین دەرمانێکی بەکارە دژی سووتاندنەوەی شانەکان وە توانای چاکردنەوەیانی هەیە. ئایا چۆن ئەم سوودە دەبەخشێت بە مرۆڤی نەخۆش؟ لە خوارەوە وەڵامی دەدەینەوە:

وا دیارە ماددەی ئەسپرین شانە سووتاوەکان چاك دەکاتەوە بەهۆی کەم کردنەوەی دروست کردنی ماددەی پروستاگلاندین Prostaglandin لەلایەوە وە ماددەی ثرومبۆکسان A2 Thromboxane لەلایەکی ترەوە.

ئەم دوو ماددەیە واتە پروستاگلاندین و ثرومبوکسان بەهەمیشەیی لە هەوو شانەکانی لەشدا دروست دەبن و سیفەتێکیان ئەوەیە چاك بوونەوەی شانە سووتاوەکان دوا دەخەن. ئەمجا دەوری ئەسپرین لێرەدا ئەوەیە کە چالاکی ئەو ئەنزیمانەی ئەم دوو ماددانە دروست دەکەن کە دەکاتەوە واتە ئەسپرین دەبێت بە کۆسپ لە ڕێگای دروست کردنی پروستاگلاندین و ثرومبوکسان. لەلایەکی ترەوە ئەسپرین کار دەکاتەسەر ئەو ماددانەی کە شانەکانی لەشی مرۆڤ دەفەوتێنن. وێنەی ژمارە (5) لە خوارەوە دەوری ئەسپرین لە کەم کردنەوەی دروست کردنی ماددەی پروستاگلاندین و ثرومبوکسان نیشان دەدات: ـ

فوسفولیپید Phosplipids
↓
ترشی ئەراکیدۆنیك Araehidonie aeid
↓ (ئەسپرین لێرەدا ئەم هەنگاوە دوا ئەخات)
ئیندوپیرئۆکسید Endoperoxides
پروستاسایکلین
سیتاتیر
↓ ثرومبوکسیم
سیتاتیر
پروستاسایکلین
↓ Prostaeyelin
پروستاگلاندین Prostaglandin
ثرومبوکسان Thromboxane A2



وێنە ژمارە (5)

4 ـ ئەسپرین دەزگای هەست و وریابونەوە، دەگەشێنێتەوە.

- - - - - - - - - - - - - - - - - -

Genesal Nesvous Syten Stmulatin

واتـە ئەم دەرمـاتـە کار دەکاتەسەر هۆشیاری دەمارەکان و مێشك وگەشە بە پیشەیان دەدات.

5 ـ کاری ئەسپـرین بەسـەر چینـە لینجـاویـەکـەی رووی ناوەوەی گەدەدا.

- - - - - - - - - - - - - - - - - - - - - -

Gastrointestinal eggeets

ئاشکـــرایـــە کە گەدە لە ناوەوە بەچینێکی لێنجـــاوی[34] تەنــك، داپــۆشــراوە. ئەم چینــە لینجـاویـە بەراستی بۆ پارێـزگـاری گەدە دروست بوە دژ ی شلاوی زۆر ترش وەیـا زۆر تفت. ئەسپرینیش بەبونەی ئەوەی کە ترشە (کۆمەڵەی کاربوکسیلی[35] ـ COOH تیادا هەیە) هەندێك جار ئازاری چینە لیخەکەی ناو گە دەدات.

بەتـــایبـەتی ئەگـەر هاتـو لەسـەر سکی برسی ئەسپرین خورا، ئەوا لەوانـەیـە چینـە لینجاویەکەی گەدە بسوتێنێتەوەو بیکـات بە زام. لەبـەر ئەم هۆیـە چاك وایـە ئەسپرین پاش نان خواردن واتە بەسەر سکی تێرّدا قووت بدرێت.

6 ـ کاری ئەسپرین بەسەر گیرسانەوەی خوێنی بەربوو.

- - - - - - - - - - - - - - - - -

بە ئینگلیـــزی ئەم سیفـــەتـــە پێی‌دەڵێن «Platalet effeets»

تاقی‌کردنەوەکان وای ئاشکراکردوە کە ئەسپرین خواردن کـ دەکـاتـەسـەر خێرایی گیرسانەوەو وەستانی خوێنی بەربوو نە لەشی مرۆڤـــدا. واتـە ئەگـەر هاتـوو بۆ ماوەی حەفتـەیـەك کەسێـــك ئەسپـرین بەکـارهێنـا دەبینیت خوێنی ئەو کەسـە پێویستی بە ماوەیەکی دوقات درێژتر هەیە بۆ گیرسانەوەی خوێنی بەگوێرەی حەفتەیە لەمەوپێش. ئەم ماوەیە زیاد دەك بە زیادتر بەردەوام بوون لەسەر خواردنی ئەسپرین.

وادیـــارە ئەسپـــرین ئەم ئەنجـامـە پێـك دێنێت چونکـە ناهێڵێت وردیلە خرەکانی خوێن بەیەکەوە کۆببنەوەو بنیشن. شایانی باسە حەفتەیەکی پێویستە پاش نەخواردنی ئەسپرین بۆ ئەوەی خوێـن بتـــوانێت وردیلەی تازە دروست بکـــات و کۆی بکاتەوە تاوەکو بە شێوەیەکی ئاسایی بمەیەت لە کاتی بەربوونا.

7 ـ کارەکانی‌تری ئەسپرین.

- - - - - - - - - - - - - - - - -

بۆ زانـاکـان ئاشکـرابـوە کە بە خواردنی دوو حەپ وەیـا کەم تر لە ماوەی رۆژێکدا دەبێتە هۆی بەرزبونەوەی رێژەی ماددەی ترشی یووریك Urie aeid [36]، لەناو خوێندا کەچی ئەگـەر هاتـوو چوار حەپ زیـادتـر رۆژ ی بەکارهێنرا دەبینین رێـــژەی ترشی یووریـــك دێتـــە خوارەوە. لەلایـەکی‌تـرەوە ئەسپرین خواردن بەشێوەیەکی گشتی سوورانی خوێن لەناو لەشی مرۆڤا سست کات.

## چەنێك لە ئەسپرین خواردن دروستە؟

گومانی تیادا نیە کە زۆر خواردنی هەر شتێك باش وەیا خراپ ئەنجامەکەی زیان و زەرەر بەخشە بۆ تەندروستی مرۆڤ. بۆ وێنە ئاوخواردنی یەگجار زۆر زیان دەبەخشیت بە تەندروستی وەیا زۆر خواردنی ڤیتامینەکان وەیا «دەرمانی بەهێزکردن»[36] مروڤ ژەهراوی دەکات و تەندروستی تێك دەدات. ئەسپرینیش دەرمانێکی زۆر بەسوودە، بەلام پێویستە بەگوێرەی ئاموژگاری پزیشك بخورێت. لەلای زۆربەی خەلك ئاشکرایە کە دوو حەپ ئەسپرین لە ماوەی چوار سەعاتا زۆر بەجێیەو بەسوودە.

پاش چوار سەعاتەکە بۆ ئەو کەسە هەیە دوو حەپی تر قووت بدات. لەوە زیاتر ئەسپرین لەشی مروڤ ژەراوی دەکات.

ئەوەی راستی بێت هەرگیز نابێت زیادتر لە (12) حەپ ئەسپرین بخوێت لە ماوەی (24) سەعات، چونکە لەوە زیادتر لەشی مروڤ ژەهراوی دەبێت. نیشانەکانی ژەهراوی بووت گەلێکەو لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆرێت. هەندێك کەس لە ئەنجامی زۆر خواردنی حەپی ئەسپرین پێشتیان دەنکەی[37] (زیتکە) سوور دەردەدات. گەلێك جار پزیشکەکان ئەم رووداوە بە «هەستیاری»[38] دەدەنە قەلەم. واتە ئەگەر کەسێك هاتوو دە دوانزە حەپی ئەسپرینی بەجارێك قووت دا ئەوا ئەو کەسە دوورنیە بمرێت چونکە ئەو دەرمانە زۆرە ئەو کەسە ژەهراوی دەکات.

گەلێك جار دەبیستین کەهەندێك هالووڵاتیە ئەورووپاییەکان وە ئەمریکاییەکان ژیانی خۆیان کۆتایی پێدێنن و خۆیان[39] بە ئەسپرین خواردن دەکوژن سروشتیە کە ئەم جۆرە کەسانە کە خۆیان دەکوژن هۆش و بیری ئاساییان لە مێشکدا نامێنێت لەو کاتەی خۆیان دەکوژن.

بۆیە لێرەدا دەڵێین: زۆر پێویستە ئاگاداربین لەماڵەوە نەوەکا منداڵ دەستی بگاتە ئەسپرین وەیا دەرمانی تر بیخوات. چونکە هەموو دەزانین کە منداڵ نەفامەو پەلاماری هەموو شتێك دەدات وەدەیخوات. ئەسپرین و هەموو دەرمانێکی تر پێویستە لە شوێنێکی تایبەتی قفڵ بدرێت و بە هیچ جۆرێك منداڵ دەستی پێ نەگات.

بێگومان دەتوانین بڵێین وەك برێشکە خواردن ئەسپرین دەخورێت لەلایەن گەلی وولاتە پێش کەوتووەکانەوە. بۆ وێنە هەر لە ئەمەریکا بەتەنها لە ساڵی 1955 نزیکەی (15) ملیون پاوند (واتە حەوت هەزار تەن) ئەسپرین بەکارهێنراوە لەلایەن هاووڵاتیەکانەوە. واتە هەر کەسێ پێنج حەپ ئەسپرینی بەدەکەوێت.[40]

بۆ لێکۆڵینەوەیەکی فراونتر تکایە پرس بە سەرچاوەکانی ژمارە (41 ـ 45) بکە.

### پەراویزو سەرچاوەکان:

(1) ـ تاولەرز = سێ بەرۆ = الملاریا.

(2) ـ درەختی کینا = شجرة الکینا Cin Chona Tree

(3) R. Q. Brewster, and W. E. Me Ewen, - Organie Chemistry, Prntice - Holl, gne. 1961, Page 661.

(4) داربیی = درەختیکی ناسراوە لە کوردستان.

(5) ئاوگە = الأفرازات النابعة من الغدد.

(6) C. R. Nollev, Chemisyry of Orgamie Compowds and. eel., Saundess Compewy, 1957, Pass 560.

(7) زیانی لابەلا = الأضرار الجانبية أو التأثيرات الثانوية Side effeets

(8) سالیسیلات Salieylate بریتیە لەم ئایۆنە OH COO.

(9) رێخۆلەی دوانزە گرێ = المعی الأثنی عشری.

(10) گۆران = تمثیل = Metabolisn واتە ئەو کارە کیمیاییە ژیانیاتەی بەسەر مادەدا پێك دێت لەناو شانەکانا.

(11) ئەنزیم = Engyme ـ گەردیکی زۆر درێژە لە چەشنی پۆلیمەرە Polymero پێك هاتوە لە یەك گرتنی ترشە ئەمینیەکان (R - eooH - NH2) e لەناو شانەکانی لەش. ئەم ئەنزیمانە پێویستن بۆ جێبەجێ بوونی کارە کیمیایی ژیانی.

(12) ئیستەر = Ester - چەشنێکی تایبەتیە لە ماددە ئۆرگانیکەکان پێك دێت لە کارکردنی ترشی کاربوکسیل لەگەڵ ئەلکحول.

(13) ئەلبۆمین ـ چەشنێکی پروتینە کە بەزۆری لەناو خوێندا هەیە.

(14) تفتی = قاعدية Basicity

(15) ترشی سرکەی بێئاو = حامض الخليك اللامائي.

(16) نەخشەی هێڵی = شکل تخطيطي Skeletal

(17) کاریلابەلا = تفاعل جانبي أو عرضي أو ثانوي.

(18) ژووری بللوور کردن = Cystallyatin غرفة البلورة أو التبلور.

(19) ژووری خولانـدن = Ceutifuytoin Clawben خولێنـەر (Ceutsifuse) بریتیە لە ئامێـرێکی تایبـەتی کە لە ئاسنێکی خر پێکهاتووەو وەك مزراح دەخولێتەوە. بەقەد ئەم ئاسنەوە شوێنی تایبەت دروست کراوە بۆ داناتی لولەی بچوك وەیا گەورە تیایان دا ئەو تێکەڵە دادەنرێت کە مەبەستمان جیاکردنەوەی بەشە رەقەکەی لە شلەکەیە. ئەمجا بەخولاندنی ئامێرەکە ماددە رەقەکە دەچێتە خوارەوەی لولەکەو دەنیشێت وە شلەکەیش لەسەرەوە دەمێنێتەوە. ئەم جۆرە تەکنیکـە دەتـوانین بڵێین تازەیـەو لەجیـاتی پالاوتنی جاران بەکار دەهێنرێت بەتایبەتی لە کارگەکاندا.

(20) توێنەر = مذيب Solvent

(21) چوارەم کلۆریـدی کاربـون = رابـع کلوریـد الکـاربـون Conlon Tetsachloide
Carbon tetrachloride
$CCl_4$

(22) ئەم زانیـاریـەی دەربـارەی پیشـەسازی ئەسپرین لەم سەرچاوەیە پوختە کراوە: ـ

W. L. faith, D. B. Keyes, and R. xlark, «Indu strial Chemicals» and. ed., Jolm Wiley, (1957), PP - 126.

(23) باوێتی = شیوع = Populaity

(24) هەمەجۆر = من نفس النوع (مشابه).

(25) أ

Merk Index, 8 th ed., (1968), Pase 12.

(25) ب بەتاك = مشكوف.

(26) میل = مل = Ml کورتەناوی میللیلترە واتە (1/1000)ی لیترێك.

(27) پلەی ئاسـایی = درجـة الحـرارة الاعتيـادية = Room Teupesotuse بریتیە لە 25م.

(28) C. O. Wilsn, O. Cisvold, and R. F. Doerge, Textbook of oaganic medicinal and Phasma Ceutical Chemistrg 6 th ed., J. Lippincott Conpany, (1971) P - 738 -

(29) کلوریـدی ئاسنیـك = کلوریـد الحـدیـدیك Fecl3 (شلاویکی 5٪).

(30) کشانەوە = تمدد.

(31) زەیستان = ئەو ئافرەتەیەکە تازە منداڵی بوویێ ـ ماوەکەی چل رۆژە پاش منداڵ بوون.

(32) سوتاونەتەوە = ملتهبه.

(33) دەزگای هەست و وریابوونەوە = الجهاز العصبي والحسي.

(34) چینێکی لینجاوی = طبقة مخاطية.

(35) کۆمەڵەی کاربۆکسیل بریتیە لە (C - OH -) وە دەبێ بە هۆی سیفەتی ترشی ئاوێتەکە بەتایبەتی بە بۆنەی هایدروجینەکەی کە بەئاسانی دەبێت بە ئایون Ion لە ئاودا واتە:

$$R-\overset{O}{\overset{\|}{C}}-OH \xrightarrow{\text{ئاو}} R-\overset{O}{\overset{\|}{C}}-O^{\ominus} + H$$

(36) دەرمانی بەهێزکردن = مقوي.

(37) دەنکە = زیتکە = بثور، حبوب تظهر على الجلد بشكل أحمر.

(38) هەستیاری = حساسیه.

(39) خۆیان دەکوژن = يتخثرون.

(40) سەرچاوە ژمارە (3)، لاپەرە 661.

(41) B. G. Kteuns, «Basic and Clineal Pharmaeology Middle east eelition, Lenge - Lebanan, 1983 Pase 3,9 - 375 -

(42) Coheu, L. S, «Clinical Pharmaeolosy of aeetyl Salicylic aeid», Semin thromb Hemostas 1976.

(43) Cotlies Shama YR, «Aspirin and Senile Catasaets in rheumatoid arthritis (letters) Lancet, 1981.

(44) Abrishani M. A and Thomas J., «Aspirin Inoleranee, areuoew, Amm Allesgy, 1977.

(45) Furst DE Gupta N., and Palulus H. E, Salicylate Metabolism in Twins, Evidenee Huggesting a genetic wflueuee and in duetion Salicylusate Fowation, J. Clin gnvest, 1977, 60, 32.

# مەکینەی تۆوکردن

د. جهاد کیاف
زانکۆی سەلاحەدین ـ کۆلێجی ـ
ئاندازیاری ـ هەولێر ـ

پرۆسیسی «Process» چاندنی تۆو بە گرنگترین پرۆسیسی کشت وکاڵی دەژمێردرێت لە پاش کێڵانی زەوی. بەرهەمی کشت وکاڵ بە پلەیەکی سەرەکی رادەوەستێت لەسەر چۆنیەتی چاندنی تۆو چاندنی یەکسان بە مەرجێکی سەرەکی دادەنرێت بۆ شین «نما» بوون و پەرە پێدانی رووەك لە خولی ژیانی دا. لەبەر ئەوە رووەك رووبەری خواردەمەنی بەشێوەیەکی باش دەتوانێ بەکار بهێنێت و بەچاکی سوود لەتیشکی رۆژ و تەرایەتی زەوی وەر دەگرێت. ئێجا بۆ ئەمەش چەند مەرجێکی کشت وکاڵی هەیە کەپێویستە چاوەروان بکرێت لەکاتی چاندنی تۆو، و شەتڵ بۆ ئەوەی باشترین مەرجی ژیانی رووەك بهێنرێتە کایەوەو باشترین بەرهەم گردەکۆ بکرێتەوە. بەگشتی ئەم مەرجانەی کشتوکاڵی دیار دەکرێت:

1 ـ بەیەکسانی دابەش کردنی تۆو بەرووبەری زەوی.

2 ـ چاندنی تۆو لەقوڵایەکی یەکسانی دیارکراو قوڵایی چاندنی تۆو بەگوێرەی کەراکتەری رووەك و ئاووهەوای شوێنەکان رەچاو دەکرێت.

3 ـ چەندایەتی چاندنی تۆو (quantity) بۆ هەر دونمێك بەشێوەیەکی راست چاوەروان بکرێت. بۆ هەر جۆرە رووەکێك ولەشوێنی جیاجیادا رێگای چاندنی بۆ دیار دەکرێت بەپێی مەرجەکانی کشتوکاڵی هەر جۆرە تۆویەك چەندایەتی چاندنی لە هەر دونمێك جیاوازە لەگەڵ جۆرێکی‌تر.

چەندایەتی چاندن بۆ هەر دونمێك بە کیلوگرام دەپێورێت کغم/دۆنم.

4 ـ چاندنی تۆو وشەتڵ پێویستە لە کاتی دیارکراوی خۆی دەست پێ بکرێت.

دابەش کردنی یەکسانی تۆوو چەندایەتی چاندن، رووبەری زەوی بۆ هەر رووەکێك کەپێویستیەتی لە خولی ژیانی دا دیار دەکات، کە بە رووربەری خواردەمەنی ناو دەبردرێت.

## رێگاکانی چاندنی تۆوو شەتڵ

رێگەکانی چاندن بۆ دوو جۆری سەرەکی دابەش دەکرێت:

1 ـ چاندنی تۆو لەسەر رووتەختی تانی (Vertical Plane) «برگەی دیارکراوی رووی زەوی».

2 ـ چاندن لەسەر رووتەختی ئاسۆیی .(Horizontal Plane) (یانی خەتەکانی جووت و دابەش کردنی تۆو بەسەر خەتەکانی جووت).

1 ـ چاندنی تۆو لەسەر رووتەختی تانی بۆ ئەم جۆرانەی خوارەوەوە دابەش دەکرێت (وێنەی 1):

أ ـ چاندنی لەسەر رووی زەوی پان «تەخت کراو» (Flat Sowing) (وێنەی 1 ـ أ).

ئەم جۆرە چاندنە بۆ ئەو شوێنانەی کە بارانیان ئاسایی و کەمە بەکار دەهێنرێت.

ب ـ چاندن لەسەر خەتی جووت (Bed Sowing) (وێنەی 1 ـ ب):
ئەم جۆرە چاندنە بۆ ئەو شوێنانەی کە بارانیان زۆرە هەروەها بۆ زەوی‌یە ئاودێرەکان «بەراوەکان» بەکار دەهێنرێت.

لە دێراوەکان تۆو لەسەر رووی زەوێکی پان «رووتەخت» دەچێنرێت لە هەمان کاتیش جوگە هەڵ دەکنرێت.

دەنکی «تۆی» دانەوێلە لە رێزێك دا وێنەی 1 ـ ب) یان لەچەند رێزدا (وێنەی 1 ـ ب2) لەسەر جوگە دەنێژرێت.

حـ ـ چاندنی لە ناو خەتی «جوگەلەی» جووت:

«Furrow Sowing»

ئەم جۆرە چاندنە بۆ ناوچەکانی کە ووشکن و یان نیمچە ووشکن بەکار دەهێنرێت.

١

چاندن بەم شێوەیە کە بۆ رووەك پێویستە لەباشترین رێژدا بۆ ماوەیەکی درێژ ئامادە دەکات و لە مەترسی بۆن بەهەڵمەوە دەپارێزێت و پارێزگاری رووەك لەسەرما بردن دەکات.

گەنمە شامی و پەمۆ بەم جۆرە چاندنە باشترە بچێنرێت.

د ـ چاندن لەناوپەرێز: (Stubble Planting)

(وێنەی 1 ـ 2)

ئەم جۆرە چاندنە بۆ ئەو ناوچانەی کە دەکەونە ژێر مەترسی رامالینی بای بەهێز بەکار دەهێنرێت. لەئەنجامی ئەمەدا چاندراو لەمەترسی رامالینی بای توندوتیژ و کەم بوونەوەی تەرایەتی دەپارێزدرێت.




(وێنەی 1) جۆرەکانی چاندنی تۆو
لەسەر رووتەختی
تانی یاخود (ستوونی)

2 ـ چاندنی تۆو لەسەر رووتەختی (ئاسویی) وپانی لەمابین خەتەکانی جووت و دابەش کردنی تۆو لە خەتەکانی جووت دا.

ئەم رێگایە بۆ ئەم جۆرانە دابەش دەکرێت:

أ ـ چاندن لەرێزدا:

(وێنەی 2 ـ أ) (Vow Sowing)

چاندن لە رێزدا بەزۆری بۆ چاندنی گەنم و جۆ و کاڵەك و خەیار (ئاروو) هتد. بەڵاو بووەتەوە.

پانی مابێن خەت بەگوێرەی پێویستیەکانی کشت وکاڵی و کەراکتەری جۆری رووەك رەچاو دەکرێت. بۆگەنم و جۆ پانی مابین خەت 15 سەنتیمەتر بەکار دەهێنرێت. چاندن لەرێزدا بۆچەند جۆری جیاجیای رەچاو دەکرێت وەکو:

گەورە پانی رێز (Wide - Space Sowing)

________ (وێنەی 2 ـ أ)

ئەم جۆرە چاندنە بۆ پەتاتەو گەنمە شامی و گوڵە بەرۆژەو چەوەندەرو. . هتد. . بەکار دەهێنرێت کەپانی مابین خەت دەکەوێتە نێوان (45 . . . 90) سەنتیمەترو پتر.

تەسکە پانی رێز (harrow - row Sowing)

________ (وێنەی 2 ـ أ)،

ئەمەش بۆگەنم و جۆ و تۆوی وورد بەکار دەهێنرێت پانی لەنێوان خەت دا دەکەوێتە مابین (7 . . . 6) سەنتیمەتر شێوەی رووبەری خواردەمەنی رووەك لەتەسکە رێزدا شێوەی چوارگۆشە وەردگرێت.

کەم و کوری ئەم چاندنە بریتیە لەزۆر بوونی چەندایەتی چاندن بەگوێرەی چاندنی گەورەپانی رێز.

ب) چاندنی زنجیرەیی (bond Sowing)

________ وێنەی 2 ـ ب)

ئەم چاندنە لە چەند رێزۆکەیەکی تەنها زنجیرەیی پێك هاتووە کە پانیەکەی لەپانی نێوان رێزەکان گەورەترە.

حـ) چاندنی دانەدانە (یەك یەك) (Precision Sowing)

________ (وێنەی 2 ـ حـ)




(وێنەی2) چاندنی تۆو لەسەر رووتەختی ئاسۆیی.

ئەم جۆرە چاندنە لەم ساڵانەی دوایی‌دا بە شێوەیەکی زۆر بڵاو بووەتەوە بۆ چاندنی چەوەندەرو گەنمە شامی و پەمۆو گوڵە بەرۆژەو. . هتد. کە دانە دانــە «یـەك یەك» دەنکی تۆو لە ماوەیـەکی نزیکی یەکسـانی یەك لەدوای یەك دا دەچێنرێت.

ماوە لەنێوان دەنکەکانی دانەوێلە لەسەر جۆری تۆو ومەرجی ئەو شوێنەی لێی دەچێنـرێت رادەوە ستێت. بەگشتی ماوەی نێـوان دەنکـەکـانی تۆو. دەکەوێتە نزیکەی (25 . . . 5) سەنتیمەتر.

د) چاندنی پیاچوونەوەیی «چاندنی بەشێوەی شەترەنجی»
(Cross Sowing) ________

(وێنەی 2 ـ د)

ڕووەك بەم جۆرە چانــدنــە لە سەر ڕیــزی خەتی جووت بەگـوێـرەی یەکتــری وەکـو هێڵی شەتـرەنـج دەوەستێن «یـان دابـەش دەکـرێت». لە ئەنجام دا بەسێ رووکاری «سەمتی» جیاجیا بەدرێژی کێلگەو بەدوو تیرەی یەکتر بردا، چاودێری لە چاندراو دەکرێت «یانی بەسێ رووکار «سەمت» خەرماشە دەکرێت». .

هـ) چاندنی هێلانەیی (holeu «nest» Sowing)
________ (وێنەی 2 ـ هـ)

ئەم جۆرە کێـڵانـەش شێـوەیـەکە لەشێوەی چاندنی گەورەپانی چاندنی ڕیزیی. چەند دەنکە تۆویەك لەهێلانەدا دەنێژرێت بەپێچەوانەی شێوەکانی چاندنی کەلەسەرەوە باسمان کردن.

تۆو لەڕێزدا بەپری ناچێنرێت.

ماوە لەنیـوان هێـلانـەکـان لەڕیـزدا یەکسـان نیە ئینجا لەبەر ئەمە تەنها بەدرێژی ڕێز چاودێری لەچاندراو دەکرێت.

«یــانی بەدرێــژایی ڕیــز چانــدراو خەرمــاشـە دەکـرێت». ئەمـەش کەم وکوری چاندنی هێلانەییە. هێلانەیییە).

و) چاندنی چوارگوشە ـ هێلانەیی
________ (وێنەی 2 ـ و)

ئەم جۆرە چاندنە جیاوازی لەگەڵ چاندنی هێلانەیی ئەمەیە کەماوە لە نێـوان هێـلانـەکـان بەدرێـژایی ڕیـز یەکسان و هێلانەی ڕێزەکانی دراوسێ دەکەونە بەرامبەر یەکتری.

لەم ڕێگایەدا دوو جۆرە پێوان چاودێری دەکرێت، یەکیان پانی لەنێوان ڕێزدا B ئەوەی تریان درێژی لەنێوان هێلانەکان دا a.

ئەو کاتــەی «a - B» بە چانــدراو دەڵین چوارگــۆشـە ـ هێـلانـەیی، بۆ چاندنی تۆو. بەکار دەهێنرێت. بەڵام ئەگەر a - B «یانی B گەوەتر بێت لە a» یان B - a یانـی a گەورە تربـێـت لە B» . چانــدراو پێ‌دەڵـێن لاکێشــە ـ هێلانەیی و بۆچاندنی شەتڵ بەکار دەهێنرێت.

بەم شێوەیە چاندراو بەدوو ڕووکاری «سەمتی» تانی چاودێری لەنێوان خەت دا بەتەواوی میکانزم دەکرێت «یانی ئامێری کەپێویستە بۆ چاودێری کردن لەنێوان خەت دا دەتوانرێت بەکار بهێنرێت، بۆ هەر پرۆسێسك».

ح) چاندنی بەپێ‌ڕێز (وێنەی 2 ـ ح).
________: ئەم جۆرەچاندنە برێتیە بەیەکسانی چاندنی تۆو بەپـری لە زنجیـرەیـەك پانیەکەی (4/000/00)ملیمەتر بەبێ ئەوەی هیچ نێـوانێکی سەربـەخـۆیی هەبێت. بەڵام ئەم جۆرە چانـدنـە هەتـاکو ئێستا بەزۆر بەڵاو نەبووەتەوە.

خ) چاندنی وەشاندن (broadcast Sowing)

________

ئەم جۆرە چانـدنـە کۆنتـرین شێـوەی چانـدنـە هەتـاکو ئێستاش لەزۆر دەولەتەکانی جیهان دا بەکار دەهێنرێت. تۆو بە سەر ڕووی زەوی بەهۆی ئامێری میکانیکی یان بەدەستەوە دابەش دەکرێت.

بەهـۆی میکـانیکـەو فرۆکـەی کشت وکاڵ و مەکینەی تۆکردنی بنکەیی (Centrifugol Spreade) و ـ ماکینــەی چانــدنـی تۆوی تایبــەتی بەکــار دەهێنـرێت. ئەگـەر بەدەست تۆو بەسـەر زەوی دابـەش بکـرێت لەپـاشان زەوی خەرماشە دەکرێت یان شانە دەکرێت.

بەم جۆرە چاندنە تۆوزۆر بەنارێکی «نایەکسان» بەسەر ڕووی زەویی و بە قوڵایی چاندن دابەش دەکرێت. لە ئەنجام دا بە شێوەیەکی سلبی کار دەکاتە سەر بەرهەم.

ماکینەی تۆوکردن .grain drill ئەم جۆرە ماکینەی بەزۆری بڵاو بووەتەوە لە بەرهەم دا دابەش دەکرێت بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ دوو بەش:

1 ـ ماکینـەی تۆوکـردنی گشتی «Universal» : ئەم ماکینـە بۆچـاندنی زۆربــەی زۆری تۆوی کشــت وکــاڵ وەکــو گەنــم و جۆو تۆوی گیــاو

کتان وبرنج . . هتد بەکار دەهێنرێت. هەر لەهەمان کاتیش دا پەینی کیمیاوی لەگەڵ تۆو دابەش دەکات و دەیگەیەنێتە زەوی.

ئەم ماکینە بەشێوەیەکی سەرەکی دانەوێڵە لەرێزدا دەچێنێت.

2 ـ ماکینەی چاندنی تایبەتی «Special»:

ئەم ماکینە بۆچاندنی تەنها جۆرێك یان چەند جۆری دیارکراوی تۆوی لە یەك چوون ویان نزیك بن لەگەڵ یەك بە کەراکتەری (Character) فیزیاوی‌و میکانیکی بەکار دەهێنرێت. ئەم ماکینە بەگرنگی بۆ ئەم شێوانە دابەش دەکرێت:

أ ـ ماکینەی چاندنی چەوەندەر

ب ـ ماکینەی چاندنی گوڵە بەرۆژە وچاندنی دانەدانەو هێلانەیی».

حـ ـ ئامێری چاندنی پەمۆ.

3 ـ ماکینەی چاندن بەگوێرەی راکێشان دابەش دەکرێت بۆ:

أ ـ ماکینەی چاندنی تراکتور وئەمەش دابەش دەکرێت بەگوێرەی بەستانی بەتراکتۆرە بە: هەڵگیراو، نیوە هەڵگیراو، راکێشەر.

ب ـ ماکینەی چاندنی هێستر حـ، ماکینەی چاندنی دەست.

نەخشە سازی (Construction) و پرۆسێسی

---

کارکردنی مەکینەی تۆوکردن ڕێزی‌گشتی

---

هەموو مەکینەك وە هەروەها مەکینەی تۆوکردن لە چەند پارچەی جیاواز پێك دێت.

هەندێك لەو پارچانە کارکەرن و ئەوانەی تریش یاریدەدەرن. هەر یەکێك لەمانەش رۆڵی تایبەتی خۆیان دەبینن (وێنەی ـ 3).

پارچەکانی کارکەری مەکینەی تۆوکردنی ڕێزی‌گشتی بریتیە لە ئامێری تۆودەری (Seeding apparatus) 11 و ئامێری دابەش کردنی پەینی کیمیاوی (Fertilizer distribution) 12 و بۆری هەڵگری تۆوی (Seed tube) 3 لە هەمان کاتیش دا بۆ هەڵگرتنی پەینی کیمیاوی بەکار دەهێنرێت وەکو لە (وێنەی 3 ـ أوحـ) بەڵام لە هەندێك مەکینە بۆری هەڵگری پەینی کیمیاوی 13 تایبەتی خۆی هەیە. گاسنی چاندنی، خەت بۆناشتنی تۆو لەژێر خاك ئامادەدەکات. عەماری (Lrill Box) 1 کە دابەش کراو بۆ دوو بەش یەکیان پێشەوە بۆ هەڵگرتنی تۆو بەکار دەهێنرێت ئەوەی تریان لەپاشەوەیە بۆ هەڵگرتنی پەینی کیمیاوی بەکار دەهێنرێت.

شانەی داپۆشەری 7 (Coverer) (وێنەی 3 ـ حـ) یان زنجیری 14 (وێنەی 3 ـ أوب) بۆ داپۆشتنی دانەوێڵە (تۆو) بەخاکی هەڵکزاو بەکار دەهێنرێت و لەهەمان کات دا زەوی تەخت و راست دەکاتەوە.

پارچەکانی یارمەتیدەری مەکینەی چاندن بریتیە لەشاصی ویرگەی شێوەی چوار گۆشەیە لەبورێکی چوارگۆشەیی دروست دەکرێت و لەسەر دوو پێچکەی پاڵپشتی 5 توند دەکرێت. شەفتی (Shaft) 4 دوو پارچەیە گاسنەکانی چاندنی لای‌راست و چەپ بڵندو نزم دەکات.

دابەش کەری بزوتنەوەی 8 (transmission Mecanism) لەگەڵ گێر (Gear) رۆڵی خولانەوەی (سورانەوەی) ئامێری تۆودەر ویەپنی‌کیمیاوی دەبینێت.

مژانەی 15 (trailer) مەکینەی تۆوکردن لەگەڵ تراکتورەوە دەبەستێت.

هیدروسلیندەری (Hydraulic Cylinder) 2 بۆ بەرزکردنەوەو خستنە کارکردنی گاسنەکان بەکار دەهێنرێت. سپرینگی رێکخەری قولایی چاندنی‌و دەسکی (Lever) رێکخەری چەندایەتی تۆو نیشانەی (Signal) خولانەوەی (سورانەوەی ئامێری تۆودەرو دابەش کەری پەینی کیمیاوی وقولی چاندن.

چێگای (تەختەی) راوەستانی کرێکاری، پرۆسێسی کارکردن: لەپێش ئەوەی مەکینەکە بکەوێتە کارکردن عەمارەکە لە دووبەش پێك هاتووە یەکیان بۆ تۆووە ئەوەی تریان بۆ پەینی کیمیاوی‌یە پر دەکرێن.

لە کاتی پرکردنی عەمارەکە بە تۆوو پەینی کیمیاوی ئامێری تۆو دەرو دابەش کەری پەینی کیمیاویش سەر بەخۆ لە کولانکێکی (Feed Opening) تایبەتی خۆی بە تۆو وپەینی کیمیاوی پر دەبێت.

لە کاتی کارکردن گاسنەکانی مەکینە بۆ باری کارکردن نزم دەکرێتەوە خوارەوەو زەوی دادەخەن بۆ قولاییەکی دیار کراو بەپێی مەرجەکانی کشت وکاڵی لە هەمان کاتیش دا شەفتی ئامێری تۆودەرو ئامێری دابەش کەری پەینی کیمیاوی دەخولێنەوەو ئامێرەکان دەکەونە کارکردن و ئەو تۆو وپەینی کیمیاوی کە لە ناویان کۆ بوتەوە لەگەڵ خۆیان دەخولێنەوە هەتاکو بەردەم بۆری هەڵگری تۆو وپەینی کیمیاوی (لەهەندێك مەکینە تەنها یەك بۆری هەڵگری هەیە بۆ دانەوێڵەو پەینی هەروەکو لە (وێنەی 3 ـ أو جـ) کە سەرێکی لەبانەوە بەئامێری تۆوەر وپەینی‌کیمیاوی دەبەسرێت ئەوەی تریشی لەخوارەوە بە بۆری گاسن توند دەکرێت. بەڵام لەهەندێك



أ



ب



ج

(وێنەی - ٢) مەکینەی تۆوکردنی گشتی

مەکینەی تۆوکردن بۆری هەڵگری تایبەتی تۆو وبۆری هەڵگری تایبەتی پەینی کیمیاوی جیا جیا بەکار دەهێنرێت (وێنەی 3 ـ ب).

ئینجا تۆو وپەینی کیمیاوی بەرەوبۆری گاسنی چاندن سەربەخۆ دەکەونە خوارەوەو لەوێشەوە بەسەر پارچە رووکارێك (guide) بۆ ناو خەتی جووت کە گاسنەکان ئامادەیان کردووە دەخرێتە خوارەوەو لەپاشان بەهۆی شانە یان زنجیر وەیا باگوردان تۆوی چاندراو بەچینێکی خاکی نەرم شێدار دادەپۆشرێت.

### ئامێری تۆودەر

ئامێری تۆودەر بریتیە لە گرنگترین پارچەی کارکەی مەکینەی تۆوکردن چۆنیەتی تکنولوجیای چاندن و چەندایەتی بەرهەم لەسەری رادەوەستێت.

ئامێری تۆودەر بە گوێرەی چۆنیەتی چاندن بۆ دووبەشی سەرەکی دابەش دەکرێت:

1 ـ ئامێری تۆو دەری کۆمەڵ کۆمەڵ ئەم ئامێرە قەبارەیەکی دیارکراوی

تۆو هەڵ دەگرێت و بەسەر زەویدا دابەش دەکات و بۆ چاندنی تۆوی گەنم و جۆو برنج و کونجی و تۆورەشی پیازو تۆوی کاڵەك و تەوری . . هتد بەکار دەهێنرێت.

2 ـ ئامێری تۆودەری یەکسان (دانە دانە): ئەم ئامێرانە دەنکێك یاچەند دەنکی تۆو لەماوەیەکی دوو لەیەکتری (یان لەنێوان دوو دەنك ماوەیەکی دیارکراویان لەنێوان دا هەبێت، دیارکراو دەچێنێت و بۆچاندنی تۆوی پەمۆو گەنمەشامی و چەوەندەر. . هتد بەکار دەهێنرێت.

لەنەخشەدا چەندهای جۆری ئامێری تۆودەر بەرچاو دەکەوێت، بەڵام لە مانەش چەند جۆرێك بەزۆری بڵاوبونە ـ تەوە وەئێستەش هەندێك لە ئامێری تۆودەری کۆمەڵ کۆمەڵ بەزۆری لەمەکینەکانی چاندنی ئێستادا بەکار دەهێنرێت و بەرچاوی خوێنەوارانی خۆشەویستی دەخەین و ئومێدەوارم سود بەخش بن.

جۆرەکانی ئامێری دابەش کەری دانەوێڵەی (ئامێری تۆودەری) کۆمەڵ کومەڵ:




1 ـ ئامێری کەوچك دار (Creep Feed mechanism)

ئەم جۆرە ئامێرە کۆنترین ئامێری تۆدەری (دابەش کەری دانەوێڵەی) میکانیکیە بۆ چاندنی زۆربەی زۆری دانەوێڵە بەکار دەهێنرێت.

لەسەدەی نۆزدەهەم بەشێوەیەکی بنچینەیی ئەم ئامێرە بڵاو بوویەوەو لەبەر ئەمەش بەسەر چاوەی ئامێرە نوێیەکانی ئێستاکە لەبەرهەم بڵاو بووەتەوە دەژمێردرێت.

ئامێرە نوێیەکانی ئێستا بەگوێرەی ئامێری کەوچك دار گۆڕاوون و پەرەیان پێدراوە. بەڵام لەم سەدەیەدا زۆر بەجۆرێکی کەم بەکار دەهێنرێت لەبەر چەند کەم وکورریەك کە لەدوایی ئەم باسەدا ئاشکرای دەکەین.

ئەم ئامێرە لەچەند دیسکی (disk) 1 و کەوچکەکانی (Spoon) 2و عەماری تۆوی 93 شەفتی (Shoft) خولانەوەی دیسکەکان 4 پێك هاتووە. لەهەردوو ڕووی دیسکەکەوە کەوچکەکانی لێدەبەسرێت و تونلدەکرێت هەر یەکێك لەم کەوچکانە سەر بەخۆ لەناو عەماری تۆو دەخولێتەوە لەکاتی خولانەوەی دیسکەکەدا لە چینەکانی تۆوەکەدا نقوم دەبێت و بەشێك لەتۆو هەڵ دەگرێت و بۆباری بەرەو سەربەرزی دەکاتەوە. لەکاتێ کە دیسکەکە لەباری سەرەوە بەرەو خوارەوە نزم دەبێتەوە کەوچکەکانی وردە وردە باریان دەگۆرێت یانی وردە وردە لار دەبنەوە هەتاکوبە تەواوی وەراوگێر دەبن. ئێنجا تۆو دەکەوێتە ناو بۆری هەڵگری تۆو لەوێشەوە سەربەخۆ بەرەو گاسنی چاندن دەکەوێتە خوارەوە لەپاشان دەکەوێتە ناو خەتی جووت کەئامادەکراوە لەپێشاندا.

چەندایەتی چاندنی تۆوی پێویست لەدونمێك دا بەهۆی گۆڕینی خێرایی خولانەوەی شەفتی دیسکەکان ڕێك دەخرێت یان بەگۆڕینی کەوچکەکان کە قەبارەی جیا جیایان هەبێت. لە ئەنجام دا چەندایەتی چاندن کەم یان زیاد دەبێت.

وەبۆ چارەسەرکردنی ئەم کارەش دوو ڕێگا ڕەچاو دەکرێت:

1 ـ گۆڕینی شەفتەکە لەگەڵ دیسك و کەوچکەکانیدا بە شەفتێکی تر کەکەوچکەکانی جیاوازبن بە قەبارەیان بەگۆێرەی کەوچکەکانی پێشوو. لەئەنجام چەندایەتی چاندن زیادیان کەم دەبێت.

2 ـ یان هەر دیسکەکە دوو جۆرە کەوچکی جیاواز بەقەبارە، یەکیان گەورە ئەوەی تریان بچوك بەکار دەهێنرێت. ئەو کاتەی کە قەبارەی هەڵگرتنی تۆو پێویستە بگۆڕدرێت باری شەفتەکە وەردەگەرێت لەئەنجامی ئەمە یۆچەندایەتی چاندنی دیارکراو دەتوانرێت ڕێك بخرێت.

بۆچاندنی تۆوێك کەپێوانەیان جیاوازە بەگوێرەی تۆویەکانی‌تر، شەفت و دیسك و کەوچکەکان پێویستە بگۆڕدرێن بەجۆرێکی تر کە لەگەڵ پێوانەی تۆویەکە بگونجێت، بۆ نمونە کەتۆودان لەگەنمەوە بگۆڕدرێت بۆکونجی.

مانای ئەمە ئەوەیە کە بۆچەند جۆرێکی تۆو شەفت و دیسك و کەوچکی تایبەتی خۆی‌پێویستە.

کەم و کووڕی ئەم ئامێرە بریتیە

1 ـ کەم بوونــەوەی بەرزی دیـارکـراوی تۆو لەعـەمـاری مەکینـەکـەدا بەشێوەیەکی ناشیاو کاردەکاتە سەر چۆنیەتی چاندن.

بەهــۆی کەم بوونـەوەی بەرزی دیـارکـراو تۆو، کەوچکـەکـان ناتـوانن چەنـدایـەتی دیـارکـراو تۆو هەڵ بگـرن. بەم جۆرە چەنـدایەتی چاندن لە دۆنمێك دا کەم دەبێتەوە.

لەئـەنجـامی ئەمـەدا مەکینـەی ئەم شێـوە چانـدنە ناتوانێ بەچاکی لەو زەوی‌یانەی کە تەلانەکان خۆی پیشان بدات ئەمجا تەنها بۆئەو زەوی‌یانەی کە تەختن «کە دەشتن» بەکار دەهێنرێت.

بەڵام ئەگەر ئەم مەکینەیە بۆچاندنی زەوی‌یە تەلانەکان بخرێتەکار کردن پێویستە بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ رووکاری هەرواز و نشێووەکانی زەوی رێك بخرێت.

2 ـ خێرایی مەکینەی ئەم جۆرە دیارکراوە. لەگەڵ زۆر بوونی خێرایی مەکینـەی تۆکـردن. تۆوەکـە لەنـاو کەوچکـەکـانـەوە دەرژێتەوە ناو عەماری تۆوەکـە. لەئـەنجـام تۆودانـەکـە تەنك دەبێت. ئێنجا لەبەر ئەمە بەتەواوی توانای تراکتۆر ناتواندرێت بەکار بهێنرێت، بەم شێوەیە بەرهەمی رۆژانەی مەکینەکە کەم دەبێتەوە. چاکی ئەم ئامێرە بریتیەلە: 1 ـ بەیەکسانی تۆو بەسەر رووی زەوی‌یەکەدا دابەش دەکات، بەپێی مەرجانەکانی کشتوکاڵی.

2 ـ ئەم ئامێــری تۆوە لەنـاو عەمـاری مەکینـەکـەدا لەســەرخـۆوەیمن هەڵ دەگرێت بەبێ ئەوەی ورد بکات و بشکێنێت.

3 ـ توانای چاندنی جۆرەهای دانەوێڵەی جیاجیا بە پێوانەیان هەیە. هەتاکو دانەوێڵەی دەنك گەورەش وەکو فاسۆلیاو لوبیاو نۆك و... هتد دەچێنێت.

2 ـ ئامێری تۆودەی گرنیدار

(Fluted roller Seeding Mechanism)

ئەم ئامێرە بۆ چاندنی تۆوی گەنم و جۆو برنج وکتان و کونجی و سەوزەو کاڵەك و ئارو وگیاو... هتد بەکار دەهێنرێت.

بۆ هەر جۆرە چەنـدایـەتی چانـدنی پێویست ئامێرەکە رێك دەخرێت. بەڵام بۆ تۆودانی گشتی (Universal) ئامێری تۆودانی سەرو خوارو رەچاو دەکـرێت یانی ئامێـرەکـە تۆوەکـە لەسـەرەوە (وێنـەی 5 ـ أ) یان لە ژێرەوە (وێنەی 5 ـ ب) دابەش دەکات.

لەئەنجام میکانزمی بزوتنەوەی ئامێرەکە سەخت دەکات. لەبەر ئەوەی میکانزمی بزوتنەوە پێویستە ئامێرەکە بە رووکار و دژی رووکاری خولانەوەی کات ژمێر بخولێنێتەوە. ئەمەش رێك خستنی چەندایەتی چاندن (Seeding rate) سەخت دەکـات. دابــەش کردنی سەرەوە تەنهـا بۆچـانـدنی تۆوی درشت بەکار دەهێنرێت.

ئامێری تۆودەری گرنیدار لەسەندوقی تۆوی 4و واشەری گرنیداری 3و لولـەی گرنیـداری (grain Cylinder) وشـەفتی (Shoft) ئامێرەکانی تۆودەری، دۆشەکی (Valve) 1و لولەی لوسی کارنەکەری 5 پێك هاتووە (وێنەی 5 ـ جـ).

دووگرنی (rosette) دراوسێی لولەی گرنیدار جۆرکۆلەیەك (riffle) بۆ هەڵ گرتنی تۆوێك دەهێنن.

سنـدوقی تۆوی 4 لەپێش و پاشـەوەو تەنیشتـەکـانیـەوە دەقوپێنرێت و بۆ ئەوەی لێوی (Side) 12 لێ‌دروست بکرێت.

لەم لێوانەش کونی درێژی لێ‌دەکرێت و لە ئەنجام دا سندوقەکە لەگەڵ عەمـاری دانــەوێڵەی مەکینــەکـە (Seeding Box) بەهـۆی برغیـەوە تونـد دەکــرێت. لەکـاتی پر کردنی عەمـاری مەکینـەکـە بە تۆو هەمـوو جۆرە بەتاڵیەکانی سندوقی 4 بەدەورو بەرو ژێری لولەی گرنیدار پر دەکاتەوە.

لەکـاتی خولانــەوەی لولــەی گرنیــدار لە ناو سنــدوقی تۆودا تۆودان دەست پێ دەکـات. چەنـدایـەتی چانـدنی تۆودان لەسـەر درێژی بەشی کارکەری لولەی گرنیدار رادەوەستێت. بۆ زیادبوونی چەندایەتی‌ی چاندن بەشی کارکەری لولەی گرنیدار بۆ ناوەوەی سندوقەکە دەجولێنرێتەوە (یانی باشی کارکـەری درێـژ دەکـرێت)و بۆکـەم کردنەوەی بۆ دەرەوەی سندوقەکە دەجولێنرێتەوە (یانی بەشی‌ءکارکەی کورت دەکرێتەوە).

لەکـاتی جوونـە دەرەوەی لولـەی گرنیـدار لەسنـدوقـەکەدا لولەی لوسی کارنەکەری 5 کولانکەکەی دادەخات و بەم جۆرە تۆو لەرژاندنی سەر بەخۆ دەپـارێـزرێت. ئەم لولـە لوسـە بەشلی لەشفتی، دادەمەزرێت و ناخولێتەوە لەگەڵ لولەی گرنیداردا.




(وێنەی ٥) ئامێری تۆودەری گرنیدار

بەلام بووش و لولەی گرنیدار وشفتەکە پێکەوە بەدرێژی دەجولیتەوە. لولەی گرنیداری 2 لەواشەری (Washer) گرنیداری 3 (کەپێوانەی گرنەکانی یەکسانە بەپێوانەی جۆرکەکانی لولەی گرنیدار) هەڵ دەکێشرێت. واشەری گرنیدار لەکاتی پێویستی دا جۆرکۆلەی کارکەری لولەی گرنیدار دادەخات و والای دەکاتەوەو لەگەلی دا دەخولێتەوە.

لەکاتی چوونە دەرەوەی بەشی کارکەری لولەی گرنیدار لەسندوقی تۆودا واشەری گرنیدار پارێزگاری لەرژانی تۆو دەکات و لە هەمان کاتیش دا رۆلی پالپشتی لولەی گرنیدار دەبینێت.

بەشی کارکەری لولەی گرنیدار لەگەل بووشی 11 پێکەوە دادەرێژرێت. لولەی لوسی کارنەکەری 5 لەبووشی، 11 هەل دەکێشرێت و لولەی گرنیدارو بووشی 11 هەردوکیان پێکەوە لەسەر شفتی، ئامێرەکیان دەخولێنەوە. بەلام لولەی لوسی 5 ولولەی گرنیداری 2 تەنها بەدرێژای شفتی، بەهۆی دەسکی (Levavage) رێك خەری چەندایەتی چاندن دەجولێنەوە. دۆشەکی 1 لە ژێرەوە سندوقی دانەوێلە دادەخات و لەهەمان کاتیش دا رۆلی زمانە (Valve) دەبینێت و بەهۆی بووشی 13 لەشەفتۆکەی 7 (Voller) هەل دەکێشرێت.

لەنێوان گوارەی 15 بووشی 13 گوارەی 14 دۆشەکی 1 بزماری دامەزرێنی (رێك خەری) g(adjusting bolt) دادەنرێت و سپرینگی سپیرالی 15 (Spiral Spring) تی دەئالێت (پێوە دەپێچرێت)و بەبرغی 16 توند دەکرێت. بارزمانەی (دۆشەکی) 1 **بوورغی** پالپشتی و دەگۆردرێت. لەئەنجام دا زمانەی (دوشەکی) 1 بەئەسپایی بۆ ژێرەوە دەجولێتەوەو بەسەر هیزی سپرینگی سپیرال زال دەبێت لەدەوری بووشی 13 لەگەل شفتۆکەی

7 دەخولێتەوە.

بورغی 16 ماوە لەنێـوان بەشی کارکـەری لولـەی گرنیـدارو دۆشـەکی ئامێرەکە دەگۆرێت.

ئێنجا بەم جۆرە بەبێ گۆرینی رووکاری (سەمتی) خولانەوەی لولەی گرنیدار ئامێرەکە بۆ چاندنی دانەوێلەی درشت (دەنك گەورەو)و ورد (دەنك بچوك) رێك دەخرێت (دادەمەزرێت).

چۆنیتی (Process) کارکـردنی ئامێـری گرنیـدار بەم شێـوەیـە: لەکـاتی کارکردن دا جۆرکۆلەکانی لولەی گرنیداری 2 پرن لە تۆو لەگەڵ شفتی 6 دەخـولێنـەوە. بێجگـە لەمـەش لەئـەنجـامی لێك خشانی کێوەکانی لولەی گرنیدار لەگەڵ چینەکانی ژێرەوەی دانەوێلە کە نزیکن لەلولەکە، چینێکی ئەکتیڤ (active) دەهێنێتەکایەوە. بەڵام لەم چینە ئەکتیڤەدا تۆو بەخێرایی جیـاجیـا دەخـولێتـەوەو هەرچـەنـدە تۆوەکە (دەنکەکان) نزیك بن لەلولەکە خێراییان زیاتر دەبێت و بەپێچوانە. ئێنجا دانەوێلەی ناوجۆرکەکان و چینە ئەکتیڤەکە پێکەوە بەرەو تخوبی 17 دەخولێنەوە. لەوێشەوە تۆو سەربەخۆ بۆبـۆری هەڵگـری تۆو (Seed tube) و جۆرکی گاسنی چانـدن دەکـەونـە خوارەوە. لەپـاشـان تۆو بەسـەر پارچـە رووکارێك (guide) بۆناو جوگەلەی (هێلی) جووتی ئامادەکراو دەخزێتە خوارەوەو بەچینەخاکێکی تەرو شێدار دا دەپۆشرێت.

ئامێری تۆودەری ددان دار Feed toothed roller mechanism

---

ئەم ئامێرە بەزۆری لەمەکینەکانی چاندنی وولاتە ئەوروپایەکانی رۆژئاوا بەلاو بووەتـەوەو بۆ تۆودانـو بلاوکـردنەوەی پەینی کیمیاوی بەکار دەهێنرێت (وێنەی 6).

ئامێـــری ددان دار لە دەرگـای رێـك خەری (adjustable Slide) 1 کە لەسنورێکی کەم دا چەندایەتی چاندن رێك دەخات و لولەی ددان داری (Feel tooth roller) 2 لەدوو رێزدا ددانەکانی بەشێوەی خانەی شەترەنجی دابـەش دەکـرێن و شفتی ئامێـرەکـانی 3 لولـەی ددان دار دەخـولێنێتـەوەو سنـدوقی دانـەوێلەی یان پەینی کیمیـاوی 4 لەپۆلا دروست دەکـرێت و زمانەی 5 رۆلی رێك خستنی چەندایەتی چاندن و پاك کردنەوەی ئامێرەکە دەبینێت و شفتـۆکـەی 6 و دەسکی 7 زمـانـە وەراوگێـر دەکـات (trun) و







(وێنەی ٦) ئامێری تۆوودەری ددان دار

دووگەی 8 (Sector) پێك هاتووە.

تۆو یان پەینی کیمیاوی سەربەخۆ لە عەماری مەکینەکەدا بەرەوخوارەوە بۆ سندوقی ئامێری ددان دار دەبزوێتەوە.

لەکاتێ کە شەفتی 3 لەگەڵ ئامێری ددان دار دەخولێتەوە. ددانەکان لە تۆو دا گیردەبن و لەگەڵ خۆیان چینێکی تۆو هەتاکو کۆتایی زمانەی 5 دەخولێنێتەوە. ئینجا تۆو سەر بەخۆ بەرەو بۆری‌هەڵگری دانەوێڵە دەکەوێتە خوارەوە.

چەندایەتی چاندن بەم جۆرانە دەگۆردرێت:

لەئەنجامی گۆرانی خێرایی خولانەوەی (Speed of rotation) لولەی ددان دار چەندایەتی چاندن زیادوکەم دەکات گۆرینی باری دەرگای رێك خەری 1 بۆ سەرەوە چەندایەتی چاندن زیاد دەکات بۆخوارەوە کەم دەبێت گۆرینی لولەی ددان دار بەزیاد کردنی یان کەم کردنەوەی رێزەکانی ددان چەندایەتی چاندن زیادو کەم دەبێت.

بەچۆنیەتی یەکسانی دابەش کردنی تۆو بەسەر رووبەری زەویدا ئامێری ددان دار جیاوازێکی ئەوتۆی نیە بەرامبەر ئامێری گرنیدار.

کەم و کوری ئەم ئامێرە بریتیە: لە گۆرینی لولەی ددان دار بۆ تۆوی درشت و ورد یانی بۆدانەوێڵەی درشت لولەی تایبەتی خۆی پێویستەو تۆوی وردیش لولەی تایبەتی خۆی پێویستە.

### ئامێری تۆودەری دانەوێڵەی کوزداری

---

ناوەوە: (Double - run Seeding Mechanism)

---

ئەم جۆرە ئامێرە بەزۆری لە هەندێك مەکینەی تۆدەری ئەمەریکی





(وێنەی ٧) ئامێری/تۆوەدەری کوزداری ناوەوە

وکەنەدی بەڵاوە بووەتەوەو بۆچاندنی تۆوی درشت و ورد بەکار دەهێنرێت.

ئامێـری ناوبـراو لە ئاڵقـەی 2و سنـدوقی1و دەسکی 3و زمـانـەی 4و دیسکی5و شەفتی 6 پێك هاتووە (وێنەی 4 ـ أ).

ئاڵقەی 2 (ring) لەرووی ژوورەوەی بەدرێژایەکەی کوز (قاش) (Slice) دەکرێت و بۆ سەرەوەش دەقوپێنرێت دیسکی 5 (disk) بە پێوانەی کوزەکانی (قاشەکانی) ئاڵقەی 2 هەڵ دەپاچرێت و لەسەر شەفتی 6 توند دەکرێت. ئەم دیسکـە درێـژی کارکـەری ئاڵقـەی 2 دەگـۆڕێت. لەئەنجامی ئەمەدا چەندایەتی چاندن دەگۆڕێت (یانی زیادوکەم دەبێت).

بەڵام لەهەندێك مەکینەی چاندن ئاڵقەی نەگۆڕاوی (Constant) درێژی بەکـار دەهـێنـرێت. بەم شێـوەیـە دیسکی 5 پشت گوێ دەخـرێت و بەکـارنـاهێنـرێت (وێنـەی 7 ـ ب وحـ). زمـانـەی 4 بەهـۆی دەسکی 3 چەندایەتی چاندن دادەمەزرێنێت (رێك دەخات).

لەکاتی پڕکردنی عەماری مەکینەکە دانەوێڵە سەربەخۆ بەرەو سندوق و ئاڵقـە دێتـە خوارەوە. ئاڵقـەی 2 لەکـاتی خولانـەوەی دانـەوێڵە (تـۆ) بو بەرزایەکی دیارکراو بڵند دەکاتەوە. لەپاشان دانەوێڵە لەکۆلانکەی کراوەی لای ئاڵقەکەی 2 (وێنەی 4 ـ أ) یان لەکولانکەکانی هەردوو لای ئاڵقەی 2 (وێنە 4 ـ ب وحـ) بۆناو بۆری هەڵگری دانەوێڵە ڕوودەکات (هەڵ دەرێژێت).

ئەم ئامێرە بەگوێرەی ئامێری گرنیدار دانەوێڵە باشتر بەیەکسانی دابەش دەکات.

بەڵام بەپێچەوانە پێویستی بە میکانزمی بزوتنەوەی سەخت دەبێت.

لە ئەنجام دا خزمەت کردنی مەکینەکە سەخت تر دەکات. بۆهەر جۆرە تۆویـەك خولانـەوەی ئاڵقـەکـە لەچرکەیەك دا پێویستە لەتخوێکی دیارکراو بێت. بەرزیو نزمی بەشێوەیەکی ناشیاو کار لەسەر چۆنیەتی چاندنی تۆو دەکات، یانی چەندایەتی چاندن دەگۆڕێت.

بەم شێوانەی خوارەوە چەندایەتی چاندنی ئەم ئامێرە دادەمەزرێت (رێك دەخرێت):

1 ـ گۆڕینی درێژی کارکەری ئاڵقەی ئامێرەکە (وێنەی 4 ـ أ) بەهۆی دیسکی 5. بەزیـاد کردنی درێـژی ئاڵقـەکـە چەنـدایـەتی چانـدن زیـاد دەبێت و بەکەم کردنەوەی کەم دەبێت.

2 ـ بەگـۆڕینی (زیـاد یان کەم) کردنی خێـرایی خولانــەوەی ئاڵقـە چەندایەتی چاندن دەگۆڕێت.

3 ـ گۆڕینی باری زمانەی 4 (بەرز یان نزم) کردنی بەرەو سەرەوە یان خوارەوە چەندایەتی چاندن دەگۆڕێت (زۆر یان کەم دەبێت).

بەڵام بۆ چاندنی تۆوی ورد ئاڵقەی کوز ورد بەکار دەهێنرێت (وێنەی 4ب)و بۆ تۆوی درشت ئامێری ئاڵقەی کوزدرشت ڕەچاو دەکرێت (وێنەی 4 ـ حـ).

## بۆری هەڵگری تۆو (Seed tube)

بۆری تۆو لەئـامێـری تۆودەر تۆو بەرەو گاسنی چانـدن رووکـار دەکـات یانی تۆو بوگاسنی چاندن دەنێرێت.

بەشی سەرەوەی بۆری بەجومگەیی لە گەڵ ژێرەوەی سندوقی ئامێری دابەش کەر دەبەسترێت. بەشی خوارەوەشی لەگاسنی چاندنی تۆو توند دەکرێت.

بۆری تۆو لەقـوماش و پلاستیـك و کانـزا دروست دەکـرێت. پێویستە بۆری پلەی نەرمـایـەتی بەرز بێت بۆ ئەوەی لەگـەڵ بەرزبـوونـەوەو نزم بوونەوەی گاسنی چاندن لەکاتی کارکردن لەکێلگەدا بگونجێت.

بۆری تۆوی لوس (وێنـەی 8 ـ أ) ئەم بۆریـە لەقـوماشی داپـۆشـەراو بەپـلاستیـك دروست دەکـرێت کێشی کەم و نرخی هەرزانـە. ئەم جۆرە بۆریە بەتەواوی کەراکتەری (Character) نەرمی (Felexility) و بەشێوەیەکی چاك توانای گواستنەوەی تۆوی لێ ـ ڕەچاو دەکرێت. بەڵام ناتوانێ خۆی بەرامبـەر کت وپـڕ گۆڕینی پلەی گەرمـایی ڕابگـرێت. بۆ ئەوەی برگـەی بۆریەکە نەگۆڕبێت (Constont) پێویستە لەناووەی شورکی (پارچە) داری لێ چەسپ بکرێت.

## بۆری پێچاوپێچی تۆو (وێنەی 8 ـ ب)

(Crimping, goffering)

ئەم جۆرە بۆریـە لەپـلاستیـك دروست دەکـرێت. تخـوبی (سنـوری) بەرهەڵستی پسانی بەبەرز بونەوەی پلەی گەرمایی لە سفر (0) هەتاکو 30 پێوانەی رووبەری برگەی ئەم جۆرە بۆریە ناگۆڕێت.

بۆ بەرزکـردنـەوەی تەمـەنی کارکـردنی بۆری دانەوێڵە پێویستە لەکۆتایی کاری مەکینەی چاندن لەجێگایەکی ووشك هەڵ بگیرێت و بپارێزرێت و دوور لەبنزین وگیروسین و ڕۆن بێت.



و هـ د جـ ب أ

(وێنەی 8) جۆرەکانی بۆری هەڵگری دانەوێڵە

بۆری کانزایی پێچاوپێچی زنجیرەیی

(وێنەی 8 - جـ) ———

ئەم بۆریە بۆ مەکینەکانی چاندنی کێڵگەکانی پەرێزو بۆهەڵگرتنی پەینی کیمیاوی لەزۆربەی زۆری مەکینەکانی چاندنی تۆو بەکار دەهێنرێت و لەپارچە شریتێکی پۆلایی پێوانەی برگەکەی 36 × 5,6 ملیمەتر دروست دەکرێت و کێشی کەم بەچاکی دەشکێتەوە. بەڵام لەکاتی کارکردن دا زۆرجار رادەکشێت و تێك دەچێت و چاك کردنەوەی زۆر سەختە.

ئینجا لەبەر ئەمە لەجێگەی بۆری تێك چووەکە بۆری نوێ دادەنرێت.

بۆری تۆوی رحەتی (وێنە 8 - 2).

Funnel - Shapel

———

ئەم بۆریە بۆ هەڵگرتنی پەینی کیمیاوی‌و لە هەندێك مەکینەکانی چاندنی تۆوی دارستان بەکار دەهێنرێت و پلەی نەرمی بەرزنیە.

بۆری تۆوی قەف قەف (قەدقەد)

(Telescopy) ———

ئەم جۆرە بۆریە زۆر بەکەمی بەکار دەهێنرێت. ئەو کەم وکوریەیی کە لە بۆری رحەتی هەیە لە بۆری قەف قەفیش (قەد قەدیش) رەچاو دەکرێت.

بۆری تۆوی تێل

(وێنەی 5 - و) ———

ئەم بۆریە لە باداتی تەڵ بەتیرەبەکی دیار کراو دروست دەکرێت و توانای نەرمی زۆر بەرزە. بەڵام هەرکاتێك لێك راکێشرا تێك دەچێت و بەسەختی چاك دەکرێتەوە.

جۆرەکانی گاسنی چاندن

(Furrow Oppeners) ———

گاسنی چاندن بەیەکێك لەئەندامە کارکەرە گرینگەکانی مەکینەی چاندن دەژمێردرێت.

کاری گاسنی چاندن بریتیە لەهەڵکەندنی خەتی جووت و ئامادەکردنی و دابەش کردنی تۆو بەناو خەتی جووت دا بەیەکسانی و داپۆشتنی تۆو بەخاکێکی نەرم و شی‌دار گاسنی چاندن لەکاتی کارکردن دا چەند رووداوێکی گرینگ پێویستە بگرێتە ئەستۆی خۆی کە بەشێوەیەکی سەرەکی کار لەسەر بەرهەم دەکات.

گاسنی چاندن پێویستە خەتی جووت ئامادە بکات بەبێ ئەوەی خاکی تەڕو شی‌دار بۆسەر رووی زەوی وەرگێرێتەوەو بۆ ئەوەی پارێزگاری لەچوونە

خوارەوەی ئاوو تەرایەتی بۆچینەکانی ژێرەوەی قوڵایی دیار کراو بکات.

پێویستە ژێر خەتی جوتەکە بپەستێتەوە وتۆو لەقوڵایی یەکسانی دیارکراو بەخاکی هەڵ کەنراوی شێدارو تەرداپۆشێ و لادان (بەرزیو نزمی) (deviation) لە قوڵایی دیارکراو نابێت لە - م پتر بێت وپانی ڕیزی دیارکراویش نابێت لە - 1سم زیاتر بێت و بەیەکسانی بەدرێژایی خەتی جووت تۆو دابەش بکات ونابێت قوڕت (نزمی)و گردۆلکەی (بەرزی) گەورەلە سەر ڕووی کێڵگەی چاندراو. بەجێ بهێڵێت بێجگە لەمانەش گاسن نابێت قوڕوخاکی پێوە بنوسێت و بەپاشماوەی ڕووەك بگیرێت.

گاسنی چاندن بەشێوەی دروست کردنی دابەش دەکرێت بۆ: گاسنی چاندنی قەڵانگ و گاسنی چەقۆو گاسنی دووبەرو گاسنی بۆریو گاسنی دیسك (سێل).

### گاسنی چاندنی قەڵانگ

(Hole - Type Furrow Oppener) (وێنەی 9).

ئەم جۆرە گاسنە لە مەکینەکانی چاندنی تۆو و هەندێك مەکینەی




(وێنەی ٩٥) جۆرەکانی گاسنی چاندنی دانەوێڵە.

چاندنی تایبەتی بەکار دەهێنرێت. بۆ چاندنی تۆو لەو کێگانەی کەراست و نەرم و بێ کەستەکی گەورەن و بەرداوی نین و پاشماوەی رووەکیان تیادا بەر چاو ناکەوێت ئەم گاسنە بە باشی خۆی پیشان دەدات و قولایی کێڵانی دیارکراو بەچاکی مسۆگەر دەکات و رادەگرێت گاسنی چاندنی قەلانگ بەشێوەی گشتی لە جۆرکی 1 (Funnel) و دەمی 2 (      )و ماشەی 3و وەرگری تۆوی 4 (Seed Plate) پێك هاتووە.

ئەم گاسنە دابەش دەکرێت بۆ:

گاسنی قەلانگی پاژنەدار وگاسنی قەلانگی بێ پاژنە.

### گاسنی قەلانگی بێ پاژنە (وێنەی 9 ـ أ)

ئەم گاسنە بەگۆشەی تیژ (acute angle) لەگەڵ زەویدا یان لەگەڵ هێلی ئاسۆیی یان لەگەڵ هێلی بزوتنەوەی مەکینەکە دادەمەزرێت (رێك دەخرێت)و پێی دەڵێن گۆشەی تیژی چەقین لە خاك دا. لەکاتی هەڵکەندنی جوگەلە ئەم گاسنە زۆرتر چینەکانی تەروشێدار بەرەو سەر رووی کێلگە بەرز دەکاتەوەو لەئەنجام دا جۆگەلەیەکی ژێر شێداروتەر پێك دەهێنێت و ئینجا لەبەر ئەمە بۆ چاندنی تۆو لەو زەوییانەی کە بارانیان کەمە باش تر وایە بەکار نەهێنرێت.

قولایی چاندن گاسنی قەلانگ لەسنوری 4 هەتاکو 7 سەنتیمەتر دەگۆرێت (رێك دەخرێت)و بۆ ئەم مەبەستەش لەکوتایی ماشەی 3 پارچە قورسایی تایبەتی بەکار دەهێنرێت و گۆشەی چەقین لەزەوی دەگۆرێت.

بۆمسۆگەر کردنی باشترین مەرجی کارکردنی ئەم گاسنە پێویستە رێژەی شێداری (تەرایەتی) زەوی لە 20٪ پتر نەبێت و زەوییەکە زۆر بەچاکی کێڵدرابێت.

لەچاو گاسنەکانی چاندنی تر ئەم گاسنە باراستایی سوکە 2 ـ 2,2 کیلوگرامەو بەرهەڵستی هێزی راکێشانی لە 30 ـ 100 نیوتنە.

### گاسنی قەلانگی پاژنەدار

(وێنەی 9 ـ ب)

ئەم گاسنە جیاوازی لەگەڵ گاسنی قەلانگی بێ پاژنە ئەمەیە کە پشت دەمی بۆپاشەوە پان کراوەتەوەو هیچ گۆشەیەك لەگەڵ رووتەختی ئاسۆیی زەوی لەپاشەوە پێك ناهێنێت و باش تر لەگاسنی قەلانگی بێ پاژنە بەگوێرەی راگرتنی یەکسانی قولایی کێلان خۆی پیشان دەدات و بەلام خراپ تر لەگاسنی قەلانگی بێ پاژنە لەزەوی دەچەقێت (زەوی دادەخا).

ئینجا لەبەر ئەمە پێویستە لەو زەوییانەی کەزۆر چاك کێڵدراون بەکاربهێنرێت.

### گاسنی چاندنی چەقۆ

(وێنەی 9 ـ ج)

ئەم گاسنە لەمەکینەکانی تۆوکردنی ورد وەکو کەتان و تۆوی گیاو کونجی.. هتد بەکار دەهێنرێت و لە دەمی 1 (Keel) و جۆرکی 2و ماشەی 3 پێك هاتووەو دەمی 1 قەراغەکانی تیژکراوەو لەگەڵ زەویدا گۆشەیەکی کراوە (Obtues angle) پێك دەهێنێت.

لەکاتی کێڵان ئەم گاسنە زەوی لە سەرەوە بەرەو خوارەوە دەپەستێتەوەو لە ئەنجامی ئەمە خەتی جوتی ژێر پەستراوەی توندو باریك پێك دەهێنێت و ئەمەش رۆڵێکی بالای هەیە بۆ زوو شین (نما) بوونی تۆو.

ئینجا لەبەر ئەمە بەکارهێنانی گاسنی چەقۆ باش ترو سود بەخشەبۆ ئەو زەوییانەی کەبارانیان کەم لێ دەبارێت. بەهۆی کێشی خۆیو پالە پەستۆی سپرینگ ئەم گاسنە لە زەوی دەچەقێت (یان زەوی دادەخا)و قولایی چاندن لە، 1 هەتاکو 6 سەنتیمەتر دەگۆرێت (رێك دەخرێت).

کەمتر ئەم گاسنە بەگوێرەی گاسنی قەلانگ بەپاشماوەی رووەك دەگیرێت (لێ دەئالێت).

هێزی بەرهەڵستی راکێشانی (draught resistance) 30 ـ 40 نیوتنە.

### گاسنی بۆری (tube Furrow Oppener)

وێنەی 9 ـ د).

ئەم گاسنە بۆچاندنی تۆو لە پەرێزە کێلدراوەکان کە دەکەونە ژێر مەترسی رامالینیبا (erosion) بەکار دەهێنرێت و لە دەمی شاقولی 1و جۆرکی 2 پێك هاتووەو دەمی شاقولی 1 بەگۆشەی 90پلە لەگەڵ رووتەختی زەوی دادەمەزرێت بەجومگەیی نەرم (elasticity joint) ئەم گاسنە لەشاصی توند دەکرێت لەکاتی کارکردن ئەم جۆرە توند کردنە گاسنەکە دەلەرزێنێتەوەو خۆبەخۆی لەقورو خاك و پاشماوەی رووەك پێوەنووساندن پاك دەکاتەوە.

لەکاتی کارکردن ئەم گاسنە چینەکانی زەوی دەبرێت بەبێ ئەوەی خاك

زۆر وەرگێـڕێتـە سەرڕووی زەویو لە ئەنجام دا جوگەلەیەکی تەسك پێك دەهێنێت و تۆو بە ناو جوگـەلـە تەسکـەکـەدا دابـەش دەکات و بەهـۆی سەربەخۆ بەربوونەوەی خاك لەقەراغ لێوەکانی تۆو دادەپۆشرێت.

## گاسنی چاندنی دووپەڕ (وێنەی 9 ـ هـ)

(V - Shaped Seewp Oppener)

ئەم جۆرە گاسنە زۆر بەو گاسنە دەچێت لەکوردەواریدا بەکار دەهێنرێت بۆجـووت کردن. ئەم گاسنـە بۆ چانـدنی تۆو لەکێلگـە پەرێـزەکـان کە نەکێلدروان و دەکـەونـە ژێـر مەترسی ڕامالینیبا (erosion) بەکار دەهێنرێت وچـەنـد پرۆسێـسی جیـاجیـا لەهـەمان کات دا وەکو نەرم کردنەوەی زەویو برینی بژار (Weed) و دابەش کردنی تۆو پەینی کیمیاوی جێبەجێ دەکات.

گاسنـی دووپـەڕ لە دەمـی 5و جۆرکـی 2 پێـك هاتـووەو دەمـی 5 پێمەرەیی یە (V - Shapped Seewp).

ئەم گاسـنـە لەکـاتی، کارکـردن یانی دروست کردنی خەتی جووت ژێـرەوەی زەوی نەرم دەکـاتـەوەو بەبێ ئەوەی خاکی هەڵ کەنـراو بۆ سەر







(وێنەی 10) گاسنی چاندنی دیسك

رووی کێڵگە وەراوگێر بکات و لە ئەنجام تۆو لەژێرەوەی زەوی دابەش دەکات. قوڵایی چاندن بە هۆی هایدرۆ سلیندر دادەمەزرێت دەگۆرێت.

**گاسنی چاندنی تەنها دیسك (وێنەی 10**

**Single - disk Furrow Oppener)**

ئەم گاسنە بۆچاندنی تۆو لەکێڵگەکانی کێڵدراو نەکێڵدراو بەرێز بەکار دەهێنرێت و لەهەمان کاتیش دا پرۆسێسی گرینگ وەکو کێلان و خۆش کردنی زەوی و ئامادەکردنی خەتی جووت تۆوکردن. دەگرێتە ئەستۆی خۆی. گاسنی دیسك لەبۆری 2و دیسکی 1 پێك هاتووە. بەڵام هەندێك گاسنی دیسك دوو بۆری بەکار دەهێنرێت و یەکێك لەم بۆریانە بۆ دابەش کردنی دانەوێڵەیە ئەوەی تریشیان بۆ دابەش کردنی پەینی کیمیاوی‌یە (وێنە 10 ـ ب).

دیسك بە گۆشەیەکی دیارکراو بەگوێرەی رووکاری بزوتنەوەی مەکینەکە دادەمەزرێت.

بۆری 2 لەپاشە لەرووی قوپێنراوی (Concare) دیسك توند دەکرێت و تۆو بۆ خەتی جووتی ئامادەکراو رووکار دەکات. باری بۆری 2 بەگوێرەی دیسکی 1 دابەش کردنی تۆو رێك دەخات و هەرچەند لەدیسك نزیك بێت.

یلاو بوونەوەی تۆو بەم لاو بەولا کەم دەبێتەوە یانی یەکسان تر دەبێت.

گاسنی تەنها دیسك بەگوێرەی گاسنی دوو دیسك باش تر پاشماوەی رووەك دەبرێت و لەزەوی دەچەقێتە خوارەوە (زەوی دادەخا)و لەقوڕوخاك و پاشماوەی رووەك پێوەنوسان پاك دەکرێتەوە.

ئینجا لەبەر ئەمە ئەم گاسنە بۆ چاندنی تۆو لەو زەوی‌یانەی کە رەقن و پاشماوەی رووەکی زۆرەو شێدارو تەرە هەتاکو رێژەی تەرایەتی (شێداری) 85٪ بەکار دەهێنرێت.

بەڵام بەیەکسانی قوڵایی چاندنی تۆو گاسنی دوو دیسك باش ترە بەگوێرەی گاسنی تەنها دیسك. قوڵایی چاندن بەهۆی سپرینگ و گۆڕینی قوڵی هیدرو سلیندر دادەمەزرێت (رێك دەخرێت).

لەهەندێك گاسنی دیسك لەجیاتی بۆری گاسنی چەقۆ بەکار دەهێنرێت و لەهەمان کات دا ئەم گاسنە رۆڵی بۆری‌دەبینێت و چەقینە خوارەوەی دیسك لەزەوی‌دا ئاسان تر دەکات و باش تر پاشماوەی رووەك دەبرێت.

**گاسنی چاندنی دوودیسك (وێنەی 10 ـ حـ، د)**

**double - dis furrow oppener**

ئەم جۆرە گاسنە بۆ چاندنی تۆو بەکار دەهێنرێت و لەشاصی 3 (bed) و جۆرکی 2و ماشە 6 (drag - bar) وکامپی 5 (Cap) و دیسکی 1 وگێسکی 4 (Cleaning) پێك هاتووەو لەشاصی 3 دوودیسك لەسەر بۆڵبەرین بەگۆشەی 10 پلە بەرامبەر یەکتری توند دەکرێن و دیسکەکان لە رووی پێشەوە بۆلای یەکتری نزیك دەبنەوە (یان بەیەکتری دەگەنەوە)و لە ئەنجام دا چەقۆ پێك دەهێنن.

گێسکی 4 رووی ژوورەوەی دیسکەکان لەپێوەنووساندنی خاك و قوڕ پاك دەکاتەوە.

لەکاتی بزوتنەوەی مەکینەی‌چاندن دیسك دەخولێتەوەو جۆگەلە پێك دەهێنێت. لە ئەنجام دا گاسنی دیسك بەپاشماوەی رووەك و خاك ناگیرێت.

بەڵام قورت و گردۆڵکەی بچوك و جۆگەلەی باریك و کەم قوڵ لەپاش تێ‌پەر بوونی بەجێ دەمێنێت.

گاسنی چاندنی دیسك بەگوێرەی جۆرەکانی تری گاسنی چاندن نەخشەی (design, construction) سەخت ترەو هێزی بەرهەڵستی راکێشانی زۆر ترەو خراپ تر تۆو بەناو خەتی جووت دا دابەش دەکات. بەڵام بە شێوەیەکی گونجاو تۆو لە کێڵگەکانی خراپ کێڵدراوو کەستەکاوی‌و پاشماوەی رووەکی زۆر تیادا مابێت خۆی چاك تر لەگاسنی جۆرەکانی تریپشان دەدات و کەمتر دەگیرێت.

گاسنی چاندنی دوودیسکی تەسکە رێز بەرامبەر یەکتر بەگۆشەیەکی گەورەتر 18 پلە دادەمەزرێت و لەئەنجام دا دوو جۆگەلەی تەسك پێك دەهێنێت و گردۆلەیەکی باریك لە یەکتریان جیا دەکاتەوە.

لەنێوان دیسکەکان جۆرکێکی درێژ دەبەسترێت و لەکۆتایی بۆدوو بەش دابەش دەکرێت و لەکاتی چاندن تۆو بۆ بەشی یەکسان دابەش دەکات و هەر یەکیان بۆ جۆگەلەیەك رووکار دەکات.

بەرهەڵستی هێزی راکێشانی گاسنی دیسك 70 ـ 95 نیوتنە.

**مەکینەی تۆوکردنی بنکەیی**

**(Circulation System)**

ئامێری دابەش کەر دانەوێڵە کە لەسەرەوە باسمان کردوون بۆ

دابەش کردنی دانەویلە بەسەر یەك یان دووگاسنی چاندن بەکاردەهێنرێت. ئینجا لەبەر ئەمە هەر مەکینێکی تۆوکردن پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر لەم ئامێرانە دەبێت لە ئەنجام دا کێش و نرخی مەکینەی تۆوکردن گران دەبێت.

لە ساڵانی 50ی ئەم سەدەدا بیر لە بەکارهێنانی مەکینەی تۆوکردنی بنکەیی هاتووەتەکایەوە. چاکی ئەم مەکینەیە بریتیە لە بەکارهێنانی تەنها یەك ئامێر بۆ دابەش کردنی تۆو بەسەر هەموو گاسنەکانی چاندن. بەڵام بۆ گواستنەوەی تۆو دوو دەستوری جیاجیا بەکار دەهێنرێت و یەکیان تەزوی بای بەهێزە ئەوەی تریان دەستوری سەر بەخۆ هاتنە خوارەوەیە.

چەند جۆری ئەم مەکینانە ڕۆن دەکەینەوە.

### مەکینەی تۆوکردنی پنیوماتیکی بنکەیی
### (ستوکلاند) (وێنەی 11)

(Pneu matic Circulation System) ______

ئەم مەکینەیە لەنەروێج دروست دەکرێت و بەزۆری لەووڵاتەکانی ئەسکەندەناڤیا بڵاو بووەتەوە. لەم مەکینەیەدا ئامێری تۆودەری بنکەیی بەکار دەهێنرێت. یانی دابەش کردنی تۆو بەسەر گاسنەکانی چاندن تەنها یەك ئامێری تۆودەر ڕەچاو دەکرێت.

ئامێری تۆودەری ئەم مەکینەیە لە قوچەکی دەرەوەی 1 (External cone) و قوچەکی ژورەوەی 9 (anteral cone) پێك هاتووە. قوچەکی ژوورەوەی لەسەر دوو بوڵبەرین توند دەکرێت و کولانکەی 5 لێ دروست دەکرێت و ڕۆڵی ڕێك خستنی چەندایەتی چاندن دەبینێت (یانی چەندایەتی چاندن دەگۆرێت) پرۆسیسی کارکردنی ئەم مەکینەیە بەم شێوەیە: تۆو سەر بەخۆ لەعەماری بەرەو کولانکەکانی سەرەوەی 3 دێتە خوارەوەو لەوێشەوە دەرژێتە بەتاڵی (Space) نێوان هەردوو قوچەکەکانی 1 و 9. لەکاتی خوڵانەوەی قوچەکی ژوورەوە زۆر لەدەنکەکانی تۆو دەکات و کە بەرەو سندوقی 4 هەڵ کشێت وپێوەی بنوسێت. لەهەمان کاتیش دا لەکولانکەکانی تەزوی بایی بەهێز ڕووکاری ژوورەوەی قوچەکی 9 دەکرێت و لەسایی پەرەکانی 8 کە توندکراون لەڕووی. ژوورەوەی قوچەکی تۆو بۆ کوڵانکەکانی 10 ڕووی دەرەوەی قوچەکی 1. دەگوێزێتەوە وئینجا.

بەناو بۆریەکانی هەڵگری تۆو هەڵ دەرژێت و لەوێشەوە بۆجۆرکەکانی




(وێنەی ١١) مەکینەی تۆوکردنی ستۆکلاند

گاسنەکان رووکار دەکرێت و لەپاشان بەناو خەتی جووتی ئامادەکراو دابەش دەکرێت. خوڵانەوەی ئامێری تۆودەر بەهۆی گێر و میکانزمی بزوتنەوە لە ماتۆری تراکتۆرەوە وەردەگیرێت ئینجا لەبەر ئەمە خوڵانەوەی ئامێرەکە لەسەر خێرایی بزوتنەوەی تراکتۆر رادەوەستێت.

ئەوکاتەی خوڵانەوەی ئامێری تۆودەر 5 ـ 20 خولێکە/ چرەکە بێت باشترین یەکسانی دابەش کردنی تۆو دەهێنرێتە کایەوە.

چەندایەتی چاندنی ئەم ئامێرە لە 0,25 ـ 125 کیلۆگرام دونم مسۆگەر دەکات و شکاندنی دانەوێڵە 3,1٪ زیاترنیە.

توانای پێویست بۆ راکێشانی ئەم مەکینە 3,91 کیلوواتە. ئەم توانایە (Power) زۆر کەمترە لەتوانای پێویست بەگوێرەی مەکینەکانی چاندنی ئاسایی کە 8,31 کیلوواتە. کێشی مەکینەی چاندنی ستۆکلاند 310 کیلۆگرامەو زۆر سوك ترە بەگوێرەی مەکینەکانی چاندنی ئاسایی کە 1340 کیلۆگرامە.

بەلام گۆرینی خێرایی بزوتنەوەی تراکتۆر چەندایەتی چاندن لە 5 ـ 75 کیلۆگرام/ دۆنم کەم دەبێتەوەو پری دانەوێڵە لەعەمارەکەی کا لەسەر چەندایەتی چاندن دەکات.

ئینجا لەبەر ئەمە پێویستە تۆو لە عەمارەکەی نابێت کەم بێت.

### مەکینەی تۆودەری پنیوماتیکی دابەش کەری

بنکەیی (ئەکۆرد)

(وێنەی 12)

ئەم مەکینەیە بۆچاندنی تۆو لەرێزدا بەکار دەهێنرێت و لەعەماری تۆوی 2و دابەش کەری 1 (distributor) و ئامێری دابەش کەری 4و بۆری دانەوێڵەی سەرەکی 3و گاسنی چاندنی، و بۆری دانەوێڵەی 7و پانکەی 8 (fan) پێك هاتووە.

ئامێری چاندن بریتیە لەیەك لولەی گرنیداری گەورە تیرەکەی 110 ملیمەترەو درێژی 140 ملیمەترە. یەك ئامێر بۆ 120 گاسنی چاندن دەتوانرێت بەکار بهێنرێت.

پرۆسێسی چاندنی مەکینەی ئەکۆرد بەم جۆرەی خوارەوە:




(وێنەی ١٢) مەکینەی تۆوکردنی ئەکۆرد

دانەوێلە بەهۆی کەوچکی سوڕێنەری (agitator) 9 بۆئامێری تۆودەر نزیك دەبێتەوەو جۆرکەکانی لولەی گرێندار بە تۆو پڕدەبن. لەکاتی خولانەوەی لولەی گرێندار تۆو بۆناو بۆری 3 هەڵ دەڕێژێت و لەهەمان کاتیش دا تەزوی بای بەهێز لەپانکەی 8 دێت و دانەوێلە هەڵ دەگرێت و بەرەو دابەش کەری 1 دەگوزێتەوە. ئینجا دانەوێلە بۆ بۆریەکانی هەڵگری تۆو دابەش دەکرێت و بەرەو گاسنەکانی چاندن رووکار دەکرێت.

خێرایی بزوتنەوەی تراکتۆر هەتاکو 33,3م/ چرکە ئامێری دابەش کەری بنکەیی ئەکۆرد بەچۆنیەتیەکی باش تۆوی گەنم و جۆو سەوزەو لۆبیاو فاسولیاو دانەوێلەی کێش سوك و دەنك بچوك دەچێنێت.

نرخی چاندنی هەر دونمێك بەم مەکینەیە بەگوێرەی مەکینەی چاندنی ئاسایی 6 ـ 6,7٪ هەرزان ترە.

مەکینەی تۆوکردنی بنکەیی (ئەمەزۆن)

(وێنەی 13) ——————

(Circulation System)

لە مەکینەکانی چاندنی ئەکۆرد وستۆکلاند تەزوی بای بەهێز بۆگواستنەوەی تۆو بەکار دەهێنرێت. بەڵام بەپێچەوانە لەمەکینەی تۆوکردنی ئەمەزۆن دەستوری (Principle) سەربەخۆ هاتنە خوارەوە رەچاو دەکرێت.

ئەم مەکینەیە بۆ چاندنی جۆری جیا جیای تۆو بەکار دەهێنرێت و لە بریمی شاقوڵی (Vertical auger) 1 و ئامێری دابەش کەری بریمی ئاسۆیی 2 (horizantal auger) و بۆری دانەوێلەی 5 و گاسنی چەقۆی، (Suffolk - Coulter) پێك هاتووە.

پرۆسێسی کارکردنی مەکینەی ئەمەزۆن بەم جۆرەیە:

بریمی شاقوڵی 1 لە کاتی خولانەوەی لەعەمارەکە تۆو بەرەو سەرەوە




(وێنەی ١٢) مەکینەی تۆوکردنی ئەمەزۆن

بەرز دەکاتەوەو بۆ ئامێری تۆودەری بریمی ئاسۆیی 2 دەگوزرێتەوە ئینجا ئامێـری تۆودەری بریمی تۆو بەسـەر بۆریـەکـانی هەڵگـری تۆو دابـەش دەکات و بە دەستوری سەربەخۆ هاتنە خوارەوە (Free Falling) بەرەوگاسنی چاندن رووکار دەکرێت و تۆوی زیاد بەهۆی بۆری 3 بۆ عەماری تۆو دەگەڕێتەوە.

ئینجا تۆو بەناو جۆگەلەی ئامادە کراو دابەش دەکرێت و بەهۆی شانەی شەنەیی تۆوی چاندراو دادەپۆشرێت.

ئەم مەکینە بەسێ مودیل دروست دەکرێت و پانی کارکەریان 4، 5، 6 مەتـرەو کێشیـان 65, 700 و 750 کیلۆگـرامـەو ژمـارەی گاسنی چانـدن 33, 41, 49.

بۆکـەم کردنـەوەی پانی مەکینـەکـە لەباری گواستنەوە باسکی شاصی لە هەردوو بەجومگەیی لەگەڵ شاصی سەرەکی دەبەسترێت و بەلای عەماری تۆو لە هەردوو لابەرز دەکرێتەوە.


## سەرچاوەکان

### أ) بە زمانی عەرەبی

1 ـ لطفي حسين و الدكتور المهندس عبدالسلام محمود عزت.
معدات مكننة المحاصيل الحقلية بغداد 1978.

2 ـ ترجمـة: الـدكتـور عبـدالمعطي الخفـاف والمهنـدس عبدالعزيز كامل.
المعدات الزراعية (الجزء الاول) بغداد 1981.

3 ـ الدكتور المهندس عبدالحميد ابوسبع والدكتور المهندس يسري كريم.
الالات الزراعية دار المعارف 1980.

### ب) بەزمانی ئینگلیزی:

4 - Principles Of Farm Machinery By Professor R. A Kener, Roy Bainer and E. L. Barger. 1972. -

5 - Machines for Power (Farming Edition) By Archie A. Stone, and Harold E. Gulvin.

6 - Element of agricultural Machinery Volume 2, By Robert M. Wilkinson and Oscar A. Braunbeck. 1977

### حـ) بەزمانی رووسی:

7 ـ پرۆفیسور ن ی. کلێین و دکتۆر ڤ. ئا. ساکون.
مەکینەکانی کشت وکاڵی موسکو 1980.

8 ـ پرۆفیـسـور ڤ. س. کۆسـینـسکی: زەوی‌و بەرهـەمی بنچینەیی کشت وکاڵ موسکو 1980.

9 ـ پروفیسور ئا. ب لوربێ وئا. ئا گرۆمیچیفسکی بیرکاری‌و نەخشەسازی مەکینەکانی کشت وکاڵ لینینگراد. 1977.

10 ـ پرۆفیسور توربین.
تیۆر یاو بیرکاری تکنولۆجیای مەکینەکانی کشت وکاڵ ـ 1967.

11 ـ پرۆفیسور گە. یَ لیسته پادۆڤ: مەکینەکانی کشت وکاڵ موسکو ـ 1976.

12 ـ جهاد کیانی.
لێکـۆڵینـەوەی ئامێـری گواستنـەوەی تۆو بۆ رژێمی تۆودەری پنیوماتیکی بنکەیی.
نامێلکەی دکتۆرا. گۆرگی ـ بیلۆروسیا ـ 1981.

13 ـ پیشاندەری (referenee book) نەخشەسازی (designer) مەکینەکانی کشت وکاڵ بەرگی دووەم موسکو ـ 1967.

### د) فەرهەنگەکان

14 ـ ~~جلال كمال~~ غريـب. 3891 ـ ثلاثـلا ءزجـلا وا9791 ىناثلا ءزجلا ،4791 ـ هيناميسلا ـ لولاا ءزجلا .ىدرك ـ ىزيلكنا ـ ىبرع ىملعلا ىسوماقلا مت

15 ـ ف. م. بوريسوف ـ قاموس روسى ـ عربى الجزء الاول والثانى 19°83.

16 ـ فەرهەنگی پۆلیتکنیکی ـ روسی ـ ئینگلیزی ب. ڤ. کوزنیچۆڤ ـ 1980.

17 ـ منير البعلبكي.
المورد قاموس إنكليزي ـ عربي.

# چاندن و پێش خستنی تووتن لە کوردستاندا

○ ئاشتی عثمان شریف ○

«پێشەکی»

وەك ئاشکرایە تووتن بایەخێکی ئابووری گەورەی هەیە، بەتایبەتی لە ناوچەی کوردستاندا، ژمارەیەکی زۆر لە جوتیاری ناوچەکە خەریکی ئەم ڕووەکەن لەگەڵ ئەوەشدا خزمەتێکی زۆری ئەوێ هەر لەچاندنی تۆوەوە، هەتا وشك کردنەوەو داگرتنی (تووتنەکە لەفەردەدا . . . ئێستا جووتیاری کورد ئاشنایەتێکی زۆری هەیە لەگەڵ تووتن دا ، هەرچەندە ئەم ڕووەکە تۆوەکەی هێنراوە نەك لەڕەگەزدا هەمان بووبێ ، هەزارەها چیرۆك و حیکایەتی لەسەرە، وەیان ڕووی‌داوە بەڵام ئێستاش جووتیار هەر بەڕێگا تایبەتی‌یەکەی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا ئەکات، جابۆیە ئەم بەرهەمە گرنگی پێ‌دراوەو. . . دەیان پسپۆڕو لێزان بەڵگەی لەم بواردە داهێناوە زیاتر هەوڵ ئەدرێ کەچاك بکرێت و پێش بخرێت بۆ ئەوەی زیاتر هانی جووتیار بدرێت کە بایەخێکی باش بەم ڕووەکە بدات چونکە هەڵکەوتنی خاك و ئاوهەوای ناوچەی کوردستان زۆر لەبارە بۆ ئەم ڕووەکە ئابووریە ئێمەش بەباشمان زانی کەوا هەوڵێکمان هەبێ لەم بوارەدا ئەگەر کەمیش بێت بەڵام جێبگرێت. . .

## کورتەیەکی مێژووی تووتن

مێژووی

زانراوی تووتن ئەگەڕێتەوە بۆ گەشتەکەی کرستۆفەر کۆلومبس بۆ وولاتی هیندیەکان لە ساڵانی 1492دا، هیندی‌یە سوورەکان گەڵای تووتنیان بۆ کێشان بەکارهێناوە لە جەژنە ئایینی‌یەکاندا، هەروەها بۆ چارەسەرکردنی هەندێ نەخۆشی وەك سەرئێشە، هەر لەو ڕۆژەدا واتا لەڕێکەوتی 28 تشرینی

یەکەمی ساڵی 1492دا کۆلۆمبس فەرمان ئەدا بەدووان لە پیاوەکانی زیاتر لەو دووکەڵە نزیك ببنەوە، ئەمانیش لە ڕێگا زۆر لە هیندی‌یەکان لە ژن و پیاو ئەبینن کە قامیشێکی درێژ بە دەمیانەوەیەو دووکەڵی لێ بەرز ئەبێتەوە، هەروەها کۆلۆمبس لەلایەن (بارتملی لاکازاس)ەوە پشتگیری کراوە لەدوای گەڕانەوەی لە وولاتی هیندی ڕۆژئاوادا ووتویەتی :-

کە دانیشتووانی ئەم وولاتە جۆرە سەبیلێکی درێژ ئەکێشن کە پێیان ووتووە «تۆباکۆس» لەو سەرەی لای لێویانەوە دووکەڵێکی زۆری لێ هاتۆتەدەر ،ئەمەش وای ڕاگەیاندوە کە باری هیلاکیان سووك ئەکات.

بالوێزی فەرەنسی (جینانیکۆت) لە پورتوگال لە ساڵی 1561دا دەستێکی باڵای هەبووە لە ناسینی تووتن بە ئەوروپا ،ئەمەش بەهۆی ئەوەوەی کە هەندێ تۆوی نارد بۆ شاژنی فەرەنسا کە ناوی «کاترین» بوو تابەکاری بهێنێت بۆ چارەسەرکردنی سەرئێشەکە ،هەر بۆیە ناوی زانستی تووتن بە Nicotina ناوی دەرکرد وەك ڕێزلێنان بۆ جینانیکۆت.

- یەکەم کەس تووتنی گەیاندە ئیسپانیا (ڕامۆن پۆن) بوو.

- ئەو کەسەی لەسەر تووتن زۆری خوێندوە پزیشکی فلیپی دووەم بووە، کە ناوی (فرانسیسکۆ هرناندز)ە

- لە ساڵی 1559 دا پاشای ئینگلتەرە «جاکی یەکەم» جگەرە کێشانی قەدەغە کردوە، دیسان لەساڵی 1642ز «بابا ئوربانی هەشتەم» ئەوانەی جگەرەکێش بوون هەموویانی بێ بەش کرد لە هاتو چۆکردنی ناوکڵیسە...

## دەرکەوتنی تووتن لە عێراقدا:

چاندنی ——————

تووتن لە ئەوروپاوە گەیشتە دەوڵەتی عوسمانی کەلەشەڕی (قەرم) لە ساڵی 1855دا سەربازەکانی لە شێوەی سیغاردا تووتنیان ئەکێشا، لەو کاتەشدا دەوڵەتی عێراق سەر بەئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوو، بەڵام زۆر جار بەکارهێنانی قەدەغە کراوە لەلایەن سوڵتان مرادی چوارەمەوە، تا ساڵی 1890 پەیوەندیەکی بازرگانی بەستراوە لەنێوان عیراق و کۆمپانیایەکی فەرەنسی دا کەناوی «ڕێزی Rezi» بووە بۆ ماوەی 30ساڵ...

ئاشکرایە باری سروشتی عیراق لە خاك و ئاوهەوا هاندەرێکی لەبار بووە بۆلێکۆڵینەوەو تاقی‌کردنەوە لەسەر جۆرو بەشەکانی تووتن. هەر بەم بۆنەیەوە لەساڵی 1939دا بەڕیوەبەرایەتی ئینحصاری تووتن دامەزرا بۆچاودێری کردنی چاندنی تووتن لەعیراقدا، لە ساڵی 1952دا ناوەکەی گۆڕرا بۆ بەرژەوندی بەڕێوەبەرێتی ئینحصاری تووتن بەپێی یاسای ژمارە (52) هەر لە هەمان ساڵدا میری ئەوکاتە تووتنی ڕۆژهەڵاتی لە تورکیاو بلگاریاو یۆنانەوە هێنایە ناو وولاتەوە.

## نیشانەکانی ڕووەکی تووتن

—————— : تووتن لەبارەی ڕووەکیەوە ئەگەڕێتەوە بۆ خێزانی (SoLaneceae) کە ڕەگەزی. نیکۆتینایە (Nicotiana) وە ژمارەی کرۆمۆزۆمەکانی (24) جووتە تووتن بریتی‌یە لە ڕووەکێکی نێرە مووك کە توانای خۆپیشاندانی هەیە لەکێڵگەدا لەدووریەکی تایبەتی‌دا بەرێژەی 97 - 100 ./. لەسەدا.

درێژی ڕووەکی تووتن لەباری تایبەتی‌دا 70 - 200سم وەیان زیاترە، قەبارەی گەڵاکانی جیاوازە بچووکەکانی درێژیان لە 4 - 6سم، بەڵام گەورەکانی ئەگاتە 25 - 120سم ژمارەی گەڵاکانی 14 - 30 گەڵایە، شێوەی گەڵاکانی درێژ و ئەسکە وەیان پان و هێلکەیی‌یە، هەندێکیان گوێچکەی هەیەو، هەندێکی تریان نی‌یەتی. گەڵاکان بە شێوەی لابەلا لەسەر قەد ئەبینرێت و ڕیزئەبێت 1 بو 3 ، 2 بۆ 2 ، 3 بۆ 8 وەیان بەکەمی 13/5 گەڵا ڕیزئەبن.

ڕەنگی گوڵەکان سپی‌یەوەیان سوورە بەڵام بەشێوەیەکی

گشتی گوڵەکان ڕەنگیان (پەمەیی)یە درێژیان لەنێوان 10 ـ 60 ملیمەترە شێوەیان وەك ڕەحەتی وایە، پێنج گەڵایی‌یە، بەتەنها ڕووەکێك 10 ـ 20گرام تۆو بەرهەم ئەهێنێت، قەبارەی دەنکە تۆزەوەکان بچوکە، هەر 10 ـ 12 هەزارە دەنکە تۆو کێشەکەی ئەگاتە اگرام شێوەی مەیلەو هێلکەیی وەیان پانە، درێژی 75 و. ملیمەتر ئەبێت، ڕەنگی تۆوی توتن قاوەیی کاڵە بەڵام ئەگۆڕرێت بەرەش وەیان قاوەیی تۆخ ،لەبەر ئەوەی تۆو نیکۆتنی تیانی‌یە وەك خۆراك بەکار ئەهێنرێت، تۆوی توتن توانای مانەوەی هەیە بۆ (20) ساڵ ئەگەر هاتوو باری هەڵگرتنی گونجاوبێت واتاووشکی وی پلەی گەرمای 10 ـ 16 سەدی بێت.

باری سروشتی‌و پەیوەندی بەشوێنی چاندنی توتنەوە:ـ

---

باری سروشتی لە (خاك و ئاو وهەوا) پەیوندیەکی بەتینی هەیە بۆ دیاریکردنی شوێنی چاندن و بەرهەم هێنانی ،وەکو لای خوارەوە ڕوونی ئەکەینەو:

أ ـ خاك: ئەو خاکەی توتنی تیا ئەکرێت ئەبێت نورینی لماوی بێت ئاو بگرێ‌و باش ئاو بخواتەوە، ترشی PH 5/5 ـ 7/2 بێت، بزاری نەبێت مادەی ئۆرگانیك و کانزایی زۆر بێت.
کانزایی زۆر بێت. خاکی قەد پاڵی شاخەکان (دەشتە شاخاوی‌یەکان) کەشێ‌ی کەم بێت بەچاکترین و گونجاوترین شوێنی چاندنی توتن دائەنرێ ،هەروەها دەرکەو توە کەخاکی قورس توتنەکەی بەشێکی زۆر لە نایترۆجین و نیکۆتین و کالیسیۆمی تیا ئەبێت، ئەو توتنەش کە بەرهەم دێ دیسان بەشێکی کەم لە پۆتاسیوم و کاربۆهیدراتی تیائەبێت.

ب ـ ئاو وهەوا: توتن لە شوێنی فێنك دا ئەکرێت، لە جیهاندا لە نێوان هێڵی پانی (60) لەسەرەوە تاهێڵی پانی (40) لەخوار هێلی ئیستواوە بڵاو بۆتەوە، ئاو هەواش بریتی یەلە:

1 ـ پلەی گەرما:ـ توتن پێویستی بەوەرزێك هەیەکە بەستنی تیا ڕوونەدات هەر لەشەتڵ لێدانەوە تا شکاندنەوەو ووشك کردنەوەی ،پاشترین پلەی گەرما بۆ ڕوواندنی تۆو لە شە تڵگا 27 ـ 30 پلەی سەدی‌یە، وە بۆ گەشەکردنی شەتڵەکان (27°س)یە یان لە(12 ـ 36°س) ئەگەر پلەی گەرمی لە 12س نزم بۆوە ئەوا ژمارەی گەڵا کەم ئەبێت و زووگوڵ ئەکات بەڵام ئەگەر هاتوو لە 36س زیاتر بوو لەگەڵ ئەوەشا شێ‌ی زۆریش ئەبێتە هۆی دواکەوتنی گوڵ کردن، زۆر بوونی بوون بەهەڵم کارێکی خراپ ئەکاتە سەر تامی توتنەکە.

2 ـ شێ: باشترین ڕێژەی شێ لە هەوادا کەتوتن پێویستی پێ‌ی هەیە لە 40 ـ 60 ./. لە سەدا، باران پێویستە لەکاتی تۆوکردنەوە تا پێگەیشتنی [لەگەڵ ئاودانی توتنەکە بەپێ‌ی پێویست]، بەڵام بارانی زۆر ئەبێتە هۆی کەم بوونی نیکۆتین لەگەڵادا، بەپێچەوانەوە بارانی کەم ئەبێتە هۆی زۆر بوونی نیکۆتین و نایترۆجین و کالیسوم.

3 ـ «با»:ـ «با»ی بەهێز ئەبێتە هۆی و وشك کردنەوەی زەوی، کارێکی خراپ ئەکاتە سەر ڕووەکی توتن بۆشکاندن و دراندنی گەڵا ،هەروەها بەهۆی «با»وە لەشوێنی ترەوە سەوزات و تۆوی گیای کێوی دێتە ناوکێڵگەوەو ئەبێتە هۆی کەم بوونی بەرهەمی توتن و خراپ بوونی جۆری پلەی توتنەکە.

4 ـ تیشکی ڕۆژ: تیشکی ڕۆژ گرنگی‌یەکی گەورەی هەیە لە کرداری ڕۆشنە پێك هاتن دا، وەبەپلەی دووەم دێت لە دوای بارانەوە، هەتا تیشکی ڕۆژ بەتەواوی هەبێت گەشە کردنی ڕووەکی توتن چاکتر ئەبێت.

**«دابەش کردنی توتن بەگوێرەی ڕێگەی‌و وشك کردنەوەو بەکارهێنانی»**

بەشێوەیەکی گشتی ئەتوانین توتن دابەش بکەین بەچوار کۆمەڵەوە بەپێ‌ی ڕێگەی‌و وشك کردنەوەو بەکارهێنانی:ـ

1 ـ توتنی ڕۆژهەڵاتی (التبوغ الشرقیە):ـ ئەم جۆرە

تووتنە لە بەرتیشکی ڕۆژدا و وشك ئەکرێتەوە، لە نیشانە جیاکە ڕەوەکانی ئەم جۆرە ئەوەیە، قەبارەی بچوکەو دەمارەکانی ناسکە تام بۆنێکی سروشتی تایبەتی خۆی هەیە، ئەو وولاتانەی ئەم جۆرە تووتنە بەرهەم ئەهێنن تورکیا ـ یۆنان ـ بولغاریا ـ یۆغۆسلافیا ـ ئێران ـ عێراق ـ سووریا ـ ئیتالیا.

2 ـ تووتنی فەرجینی (التبوغ الفرجينية):ـ ئەم جۆرە تووتنە بەزۆری لەبارنی تایبەتی‌دا کە بۆ ئەم مەبەستە سازکراوە بەئامێری پلەی گەرماوشێ و وشك ئەکرێتەوە، لە نیشانەو دیاردەکانی ئەم جۆرە ئەوەیە گەڵاکانی گەورەو ئەستورە ڕەنگی زەردباوەو شانەکانیشی بە هێزە ،ڕێژەیەکی بەرز لەشەکری تێدایە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ جۆرەکانی تری تووتندا.

ئەو و وڵاتانەی ئەم جۆرە بەرهەم ئەهێنن بریتین لە:

ئەمەریکا ـ هیند ـ چین ـ کەنەدا ـ فلیپین ـ ئەوەی شایانی باسە چەند جۆرێك لەم تووتنە لەژێر تیشکی ڕۆژداو وشك ئەکرێتەوە کەپێی ئەوترێ (sun - cured) بەناوبانگ ترین و وڵاتی بەرهەم هێنەری ئەم جۆرە بریتین لە:

ئەمەریکا ـ چین ـ ئەردەن ـ پاکستان ـ هیند.

3 ـ تووتنی بێرلی :ـ ئەم جۆرە تووتنە لەژێر سێبەردا ووشك ئەکرێتە وە بێ پشت بەستن بەهیچ جۆرە ئامێرێکی پلەی‌گەرما، بۆیەپشت بەباری سروشتی ناوچەکە ئەبەسترێ، لە نیشانەو دیاردەکانی ئەم جۆرە ئەوەیە:ـ ڕەنگی گەڵاکانی تۆخە، گەڵاکانی گەورەیە، شانەکانی تەنکە ڕێژەی ماددەی شەکر تیادا کەمە توانای هەڵمژینی هەیە بۆ ماددەی شلەدارو عەتر لەپێشە سازی جگەرەدا. وڵاتانی بەرهەم هێنەری ئەم جۆرە بریتین لە :ـ ئەمەریکا ـ ئیتالیا ـ ئیسپانیا ـ کەنەدا.

4 ـ تووتنی دارك فایرکیوردDark Fire - cured) ئەم جۆرە لەتووتن لەژووری تایبەتی‌دا کەپێی ئەوترێ بارن و وشك ئەکرێتەوە، ئەدرێتە بەر دووکەڵی تەختەی سووتاو، بەتایبەتی دووکەڵی داری سنەوبەر، ئەم جۆرە بۆ پایپ بەکار ئەهێنرێت، ئەو و وڵاتانەی ئەم جۆرە بەرهەم ئەهێنن بریتین لە ئەمەریکا ـ مەلایو ـ سووریا ـ .

## «ئامادەکردنی شەتڵگاو بەخێوکردنی»

1 ـ هەڵبژاردنی زەوی بۆشەتڵگا: بۆ دەست نیشان کردنی پارچە زەوی‌یەك بۆ شەتڵگاکە ئەبێ ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:ـ

أ ـ ئاشکرایە کاتی بەخێوکردنی تووتن لەسەرەتای وەرزی بەهاردا دەست پێ ئەکات لەم مانگەشدا ئاوهەوا بەرادەیەك ساردە لەبەر ئەوە ئەبێت شوێنێکی باش هەڵبژێرێت کەوا بەدرێژایی ڕۆژ ڕوو لەخۆر بێت وە دوور بێت لە تەووژمی «با»ی ساردەوە.

2 ـ پێویستە زەوی‌یەکە قورینی لماوی بێت، هەروەها دەوڵەمەندبێت بەزیندە ماددەی تواوەو ئاوە دەرچوونی باش بێت، نابێت جۆری زەوی‌یەکە قوراوی بێت لەبەر ئەوەی بۆماوەیەکی زۆر تەرایی تیا ئەمێنێتەوە بەمەش پلەی گەرمی دێتە خوارەوە لەزەوی‌یەکەدا، کەپلەی گەرما بەرز بووەوە شەتڵەکان تووشی نەخۆشی ئەبێت، ڕەگەکانی ئەرزێت، هەروەها ڕووی زەوی یەکە ڕەق ئەبێت، بەڵام زەوی لماوی هەژارەو ئاوە دەرچونی زۆرە.

3 ـ چاکترەوایە ئەو زەوی‌یەی ئامادە ئەکرێ بۆ دامەزراندنی شەتڵگا لەوەرزێك زیاتر بەکار نەهێنرێ.

4 ـ پێویستە شوێنی شەتڵگاکە نزیك بێت لەسەر چاوەی ئاوەوە، هەروەها ئاوە کە لەبەری بروات باشترە لەئاوی وەستاو، پێویستە ئاوی بیر بەکار نەهێنرێ لەبەر ئەوەی خوێی کلۆری تێدایە.

5 ـ پێویستە زەوی‌یەکە ڕێك بێت، پاك بێت و دووربێت لە نەخۆشی یەوە.

## «ئامادە کردنی زەوی شەتڵگا»

بۆ ئەوەی شەتڵێکی بەهێزو لەبارمان دەست کەوێت بۆ رواندن ، ئەبێ گڵەکە نەرم بێت دەوڵەمەندبێت بەخۆراك بۆ ئەوەی گەشەکردنی ئاسان بێت، زەوییەکە بکێڵرێت و پەین بکرێت بەپەیینی ئاژەڵ بەپێی پێویست، ئەم کێڵانەش لە پاییزا دەست پێ ئەکات لەمانگی تشرینی یەکەمەدا بە قوڵی 30 ـ 35سم، بۆ هەڵگێڕانەوەی گڵەکە لەگەڵ گژ وگیادا وەشی کردنەوەی زەوی یەکە تاوەکو پارێزگاری بەباراناوەوە بکات بۆ لەناوبردنی تۆو گژ وگیاو هێلکەی مارومێرو، چاکتروایە پەیینی ئاژەڵی سووتاوی پێوەبکرێ، بەڵام کێڵانی دووەم لەسەرەتای وەرزی بەهاردا دەست پێ ئەکات واتا لەمانگی شوباتدا بەڵام ئەمجارە کێڵانەکە قوڵ نابێت، قووڵی یەکەی ئەگاتە 10 ـ 15 سم ئینجا گڵەکەشی ئەکرێتەوەو ـ رێك ئەکرێت، زەوییەکە پاکژ ئەکرێتەوە، بە بەکارهێنانی یەکێ لەم (مبیدانە).

1 ـ بازامید بەرێژەی 110 ـ 150 کگم بۆ یەك دۆنم

2 ـ دیمید بەرێژەی 2½ ـ 4 کگم بۆ یەك دۆنم.

3 ـ دیترینۆل بەرێژەی 1 کگم بۆ یەك دۆنم

«پاکژ کردنەوەی پەیینی ئاژەڵ بۆ بەکارهێنانی داپۆشینی رووی دووکانە شەتڵ»:ـ ـ پێش ئەوەی دەست بکەین بە پاکژ کردنەوە پێویستە پەیینەکە بیژرێتەوە، پاش ئەمە بە ئەستوری 10سم کەڵەکە ئەکرێت لەسەر زەوی ماددەی فۆرمالین بەخەستی 5 . /. لەسەدا یان فابام بەخەستی 10 . /. لەسەدا وە بەرێژەی 10 لیتر بۆیەك مەتر چوارگۆشە، پاش ئەمە چینێکی ترپەیین ئەکرێتە سەر پەیینی یەکەم وە بەهەمان مادده ئەپرژێنرێ ، ئەم کردارە دووبارە ئەکرێتەوە تا ئەستوری پەیینەکە ئەگاتە مەترێك ئینجا تێکەڵ ئەکرێت تاوەکو پەیین و ماددەکان تێکەڵی یەکتر ئەبن، دوای ئەوە بە نایلۆن دا ئەپۆشرێ بۆماوەی (15) رۆژ، پاشان پەیینەکە ئامادە ئەبێت بۆ بەکار هێنان.

## «جۆرەکانی شەتڵگا»

لێرەدا چەند هۆیەك کار ئەگێڕرێت لەدەست نیشان کردنی جۆرەکانی شەتڵگا، لەو هۆعویانەش ئابوریو جوگرافیو گەورەیی رووبەری شەتڵگاکە، سێ جۆر شەتڵگامان هەیە

1 ـ دوکانە شەتڵی نزم

2 ـ دووکانە شەتڵی مام ناوەندی.

دووکانە شەتڵی بەرز (بڵند).

1 ـ دووکانە شەتڵی نزم :ـ ئاستی ئەم جۆرە 10سم نزمتر ئەبێت لەرووی زەوییەوە ، پلەی گەرما لە سەرەتای بەهاردا تیا لەبارە، کار ئەکاتە سەر خێرایی چەکەرە کردنی تۆوەکە، بەڵام ئەم رووی خراپی هەیە وەك پارێزگاری بەهێندەیەکی زۆر لەئاوەوە ئەکات زیاتر لە پێویستی شەتڵەکان، ئەمەش ئەبێتە هۆی رێگرتن لە گەشەکردنی شەتڵەکان و بڵاو بوونەوەی نەخۆشی، ئەم جۆرە لە ناوچە شاخاویەکاندا لەبارە، چونکە هەمیشە روو لە «با»ی بەهێزە.

2 ـ شەتڵە دووکانی مام ناوەندی، بەرزایی ئەم جۆرەیان لە رووی زەوییەوە ئەگاتە نزیکەی 10سم، چەند روویەکی باشی هەیە وەك پارێزگاری بەتەرایی زیادەوە ناکات، کەمتر توشی نەخۆشی ئەبێت، رێژەی خێرایی چەکەرە کردن و پێگەیشتن تیا بەرزە.

3 ـ دووکانە شەتڵی بەرز «بڵند»: بەرزایی لە رووی زەوییەوە ئەگاتە نزیکەی 20سم، بەوە بەناویانگە ئاوە دەرچوونی تیا باشە، کەمتر توشی نەخۆشی ئەبێت، بەڵام رووی خراپی ئەوەیە هەمیشە روو لە «با»ی بەهێزە لەبەر ئەوە تۆو پەینەکەی بەهۆی ئەم «با»یەوە زۆر بڵاو ئەبێتەوەو سوودی نامێنێ.

## چاندنی تۆو:

دوای ڕێـك کردن و چاککـردنی ڕووی دووکـانــه شەتڵەکــه هەنــدێ تۆو ئەهێنین لەگـەڵ خۆڵەمێش یان لمدا تێکەڵی ئەکەین بەڕێژەی 5 ـ8 گرام بۆ 10 مەتـر چوار گۆشـه بەنیسبـەتی تۆوی ڕۆژهـەڵاتی یـەوە، بەڵام بەنیسبەتی تۆوی فەرجینی و بێرلی یەوە 3 ـ 5 گرام بۆ 10 مەتر چوار گۆشه بەکار ئەهێنین، پاش ئەوەی تۆو خۆڵە مێشـەکـەمـان جوان تێکـەڵ کرد ئینجا بە شێوەیەکی ڕێك و دروست بڵاوی ئەکەینەوە بەسەر ڕووی دووکانە شەتڵەکەدا ،پـاشــان ئەم تۆوە بەچـینێکی تەنـك لەپــەیینی بێـژاوە بەئەستوری ەو. ـ 1سم دا ئەپۆشین ،بەپارچەیەك تەختەی ساف لەشێـوەی لاکێشـەدا ئەکـوتـرێتـەوە تاوەکـو تۆوەکـان سەقـامگیـربن لەڕووی دووکـانـه شەتڵەکـەدا ئینجا بەهۆی ئاوپرژێنەوە (رشاشات)ەوە ئاوی ئەدەین و بەنایلۆن دای ئەپۆشین.

تێبینی: لەکـاتی چانــدنی تۆوەکـەدا ئەبێت ڕۆژەکـەی خۆش بێت و هەتاو سایەقە بێت و (با) هێمن بێت.

## کارتێکردنی پلەی گەرما لە سەر چەکەرەکردن

باشترین پلەی گەرما بۆ چەکەرەکردنی تۆو لە نێوان 20 ـ 28 پلەی سەدی دایە، ئەگەر ئەم پلەی گەرمایە لەم ڕادە هاتــە خوارەوە ئەبێ بەهـۆی دواکـەوتنی چەکـەرە کردن و مانـەوەی تۆوەکـە لەدەوری سربـوونـدا ،پاش گەیشتنی ئاو بەتۆوەکە دەست ئەکات بە هەڵمژینی لە سەدا 30 ـ 35 لە کێشی، پاشان ڕەگ گەشە ئەکات وە لە سەدا 60 ـ 70 لە کێشی تۆوە کە ئاو هەڵئەمژێ بۆ ئەوەی ڕەگی سەرەکی پەیدا بکات، تۆو بەچوار قۆناغدا تێئەپەڕێت تاپەیدابوونی شەتڵ:

أ ـ قۆناغی سڕبوون
ب ـ قۆناغی ئاوسان، هەڵهاتن
ح ـ قۆناغی دەرچوونی چکەرە لەتۆو
د ـ قۆناغی ڕەگ کردن (ڕەگ دەرچوون)

## ئاودان

: کرداری ئاودێـری یەکێکـە لە کردارە سەرەکیــەکـانی کشت و کاڵ، ژمـارەی ئاودان و چەنـدێتی ئاو، وە ستـاوە لەسـەر باری ئاوهـەوا، جۆری ئاودانـەکان و جۆرووتـەمـەنی شەتڵەکـه بەپێی پێـویستی بەئـاو ئەتـوانین دابەشی بکەین بەچەند قۆناغێکەوە:

1 ـ لەتـۆو کردنـەوە بۆ چەکـرە کردن: پێـویستـه ڕووی دووکانەکە هەمیشە تەربێت ڕۆژانە پێویستی یەك مەتر چوار گۆشە 1/2 2 تا 3 لیتر ئاوە.

2 ـ لەدەر کەوتنی چەکەرەوە بۆ گەڵاکردن: لەم قۆناغەدا پێویستی بە بەشێکی زیاتر ئاوهەیە، ڕۆژانە پێویستی یەك مەتر چوار گۆشە پێویستی 3,5 تا 4 لیتر ئاوهەیە.

3 ـ لەدەر کەوتنی گەڵاوە تا گواستنــەوەی شەتڵەکـان:ـ لەم قۆنــاغــەدا پێــویستی ؤ بەئـاوێکی زۆر هەیـە، نێـوان ئاودانـەکـان درێـژە، بەڵام بەهێنـدەیـەکی زۆر ،پێـویستـه ڕێژەی تەرایی لە گڵەکەدا بگاتە قووڵی 10سم.

## شەتڵگا بەچەند ڕێگایەك ئاو ئەدرێ:

1 ـ بەهۆی ئاوپرژێنی دەستی یەوە.

2 ـ بەهۆی بۆری درێژەوە، ئەم بۆریانە دابەش ئەکرێ لە چواردەوری شەتڵگاکە، لقیان لێ ئەبێتەوە بەهۆی بۆری بچوکی پلاستکیەوە، کۆتایی سەری ئەم بۆریانە لەشێوەی ڕەحەتی دان وەك (دوش)ی گەرماو، ڕووی دووکانەکانی پێ ئاو ئەدرێ.

3 ـ بە[illegible]کوگـای ئاوەوە کە ڕاکێشـەر ڕایشـەکێشێ لە ژێـرەوەیـدا بۆرییـەکی پێـوەیـە بەکونی نەرم داپۆشـراوە ڕوویەری دووکانە شەتڵەکانی پێ ئاو ئەدرێ.

4 ـ ئاو دان بەهۆی پرژێنەری باراناوییەوە (سپرینگلر)

بژار

ـــــــــــــ:ـ بەپێی پێویست بژار ئەکرێت یان لەکاتی دەرکەوتنی گژوگیادا ،پاش کرداری بژارکردن یەکسەر شەتڵگاکە ئاو ئەدرێ، بژارکردن پاش (4) هەفتە دوای چەکەرە کردن دەست پێ ئەکات، بۆ ئەنجام هێنانی ئەم کردارە ئەبێت ئاگاداری شەتڵەکان بین کەبەدە ستمانەوە هەڵنەکێشرێت ،چاکتروایە ئەو گیایەی ئەمانەوێ هەڵیکێشین بخرێتە نێوان دووپەنجەوە، پاشان لەسەر لایەکی دووکانەکە دائەنرێت.

پەیین کردن

ـــــــــــــ:ـ ئەگەر هاتوو شەتڵەکان لاواز بوون پەیینی کیمیاوی تێ ئەکەین تا بەهێز بێت بەم رێژانەی خوارەوە:

1 ـ نەنتراتی ئامۆنیا 21./. 15گم بۆ /م2 بۆ تووتنی رۆژهەلاتی

2 ـ سوپەر فۆسفات 18./. 30گم بو /م2 بۆ توونی رۆژهەلاتی

ئەمەش ئەبێ لە ئاوا بتوێنرێتەوە بەهۆی ئاوپرژێنەوە بکرێت بەشە تلگاکەوە، پاشان یەکسەر ئاوی ئەکەین بەسەردا تا گەلاکان بشۆرێنەوە، بۆ تووتنی فەرجینی و بێرلی ئەم رێژانە ئەگۆررێن بەم شێوەیەی خوارەوە

1 ـ نەنتراتی ئامۆنیا 45./. 15 ـ 20گم بۆ /م2

2 ـ سوپەر فۆسفات 18./. 40 ـ 50گم بۆ /م2

داپۆشین

ـــــــــــــ:ـ بە نایلون دووکانە شەتڵەکان دائەپۆشرێت بۆ پارێزگاری کردن لە زوقم و سەرما ،پێش چەکەرەکردن دوای هەموو ئاودانێك دائەپۆشرێت، پاش چەکەرە کردن پێویستە بەرۆژ دانەپۆشرێت بەمەرجێك ئاوهەوا خۆش بێت بەدرێژایی رۆژ خۆر بەدەرەوە بێت، بەیانیان لەگەڵ دەرکەوتنی خۆردا نایلۆنەکە بەرز ئەکرێتەوە تا خۆر ئاوابوون پاشان دائەپۆشرێتەوە، بەڵام لە رۆژی باراندا یان ئەگەر هەور بوو پاش ئاودان یەکسەر دائەپۆشرێتەوە.

تێبینی

ـــــــــــ: ئەم کردارە ئەبێت زۆر بەووردی بەئەنجام بگەیەنرێن ئەگینا شەتڵەکان تووشی نەخۆشی ئەبن بەهۆی کۆبونەوەی شێ و بەرز بوونەوەی پلەی گەرماوە.

ـ پێش گواستنەوەی شەتڵەکان بۆکێڵگە بە ماوەی 3 تا 4 رۆژ ئاو لە شەتڵگاکە ئەبرین تاوەکو شەتڵەکان رابهێنین بۆ زروفی کێڵگە.

## ـ هەڵکەندی شەتڵ و گواستنەوەی بۆکێڵگە

ـــــــــــــــــــــ:ـ

ئەگەر بۆ مان دەرکەوت شەتڵەکان پێگەیشتوون ئەو کاتە دەست ئەکەین بەهە ڵکێشانیان، ئەمەش بەهۆی چەند دیاردەیەکەوە ئەتوانین بزانین شەتڵە کە گەیوە.

1 ـ گەلاکانی رەنگیان سەوزێکی کراوەیە.

2 ـ درێژی شەتڵەکان لە کۆتایی رەگەکەیەوە تا کۆتایی گەلاکانی ئەگاتە نزیکەی 12 ـ 14سم.

3 ـ ژمارەی گەلا لە نێوان 5 ـ6 دایە.

هەروەها شێوەیەکی تریش هەیە بۆئەوەی بزانین شەتڵەکان پێگەیشتوون ئەویش ئەوەیە شەتڵەکە لە پەنجەمانەوە ئەئالێنین ئەگەر هاتوو نەشکایەوەو نەرم بوو ئەوا دەلالەت لەسەر ئەوە ئەکات کە پێگەیوە.

پێش هەڵکێشانی شەتڵ شەتڵگاکە بە ئاوێکی زۆر ئاو ئەدەین، پاشان بەجێ ئەهێلرێت بۆ ماوە (2) سەعات، دوای ئەمە دەست ئەکرێت بە هەڵکێشانی شەتڵەکان، پاشان لە شێوەی گورزەیەکدا ئەبەسترێت وە لە شوێنێکی سێبەردا دائەنرێت بۆ ئەوەی ئاماوە بێت بۆ چاندنی لە کێڵگەدا.

## کارەکانی چاندنی توووتن لە کێڵگەدا:

1 ـ کێـڵان: زەوی یەکـە لەسـەرەتـای مانگی تشرینی یەکەمدا ئەکێـڵرێت بۆ لەنـاو بردنی هێلکـەو کرمی مێـروەکـان و هەڵمـژینی بارانـاو، دووبـارە لەمـانگی کانـوونی دووەم دا دەست ئەکـەینـەوە بەکێـڵان تاگڵەکـە بەتـەواوی ووردبێت، باشتروایە لەمانگی (مارت)دا جارێکی تر بکێڵرێتەوە بۆ لە ناو بردنی بژارەکەی پاشان لە نیوەی مانگی نیساندا دەست ئەکرێت بەرێك و پێك کردن و شی‌کردنەوەی زەوی‌یەکە.

2 ـ دێـراوهـەڵـدان: لە سەرەتای مانگی مایسدا دەست ئەکـرێت بەدێـراو هەڵـدان [بـەرێگـای دەستی بەهـۆی (کـەتـو)وەوە کە بەدوو کەس هەڵئـەدرێتـەوە] یان بەهـۆی گاسنی دێراو هەڵدانەوە (مرازة) کە تراکتۆر رای ئەکێشێ، دووری نێـوان دێـراوێـك بۆیـەکێکی‌تر (1) مەترە بۆ توووتنی فەرجینی، نیومەتر بۆ توووتنی رۆژهەڵاتی.

3 ـ شەتـڵ لێـدان: شەتـڵی فەرجینی ئەبێت 6 ـ 8 گەڵای پێـوە بێـت ،درێـژی لە 15سـم کەمتـر نەبێت، رەگێکی تۆپـزی باشی پێـوەبێت لاسکـەکـەی لاواز نەبێت ،بـەڵام شەتڵی توووتنی رۆژهـەڵاتی ئەبێت 4 ـ 6 گەڵای پێوە بێت لاسکەکەی بەهێز بێت رەگێکی چاکی هەبێت وە نەخۆش نەبێت لە هەفتەی یەکەمی مانگی مایسدا دەست ئەکرێ بەلێدانی شەتڵ لە کێڵگەدا توووتنی فەرجینی لەیەك بەری دێراو لێ ئەدرێت، نێوان شەتڵێك بۆیەکێکی تر نیو مەتـر ئەبێت ،بـەڵام شەتڵی توووتنی رۆژهـەڵاتی لە هەردوو بەری دێـراوە کەلێشـەدرێت بەدووری 20 ـ 25سم نێـوانی شەتڵێك بۆیەکێکر تر.

### ئاودان

ــــــــ: توووتن پێویستی بە 11 ـ 12 جار ئاودان هەیە.

ئەمــەش جیـاوازی هەیـە بە گوێـرەی چۆنێتی گڵەکـەو ئاوهەوای ناوچەکەوە توووتنی کۆرپەپێویـستی بە ئاوێکی زۆر هەیـە بەڵام نێـوان ئاودانێـك بۆ یەکێکی کە نزیکـەی (15) رۆژ ئەبێت لەم ماوەیــەدا سێ‌جـار ئاو ئەدرێت، بەڵام لە ئاودانـی چوارەمــەوە تا کۆتــایـی ژیــانی توووتنــەکــە یانی (شکــانــدەوەی) زوو زوو ئاو ئەدرێت بەڵام بەرێـژەیـەکی کەم، ماوەی نێوان ئاودانێك بۆ یەکێکی‌تر نزیکەی ئەگاتە هەفتەیەك.

### پەین کردن:

ــــــــــ پاش هەفتـەیـەك دوای لێـدانی شەتڵ ،پەیینی پێوە ئەکریت ،پەیینی ئاژەڵی لەگەڵ ئاوی ئاودانــدا تێکــەڵ ئەکــەیـن بەڵام پەیینی کیمیــاوی، لە ناوەراستی دێــراوەکــەدا خەتێکی درێـژ بەهـۆی دارێکـەوە دروست ئەکـریت پەیینـەکـەی تێ ئەکـریت و دائەپۆشرێت ،یـان بەهـۆی چاڵـەوە لەنێوان شەتڵەکاندا بەقوولی 5سم و دووری 10سم پاشان دائەپۆشرێتەوە، بۆ توووتنی فەرجینی پەیینی تێکەڵاو بەکار ئەهێنرێت کە لەئێستگەکان (محطة) تێکەڵ ئەکرێت وەك N.P.K بەرێژەی 2/ 88 کگم بۆ یەك دۆنم ئەگەر هاتوو سەرچاوەی نایترۆجینەکە سەلفاتی ئامۆنیۆم بوو بەم جۆرە تێکـەڵ ئەکـرێت 8 /27 کگم سەلفـاتی ئامـۆنیـۆم + 44/4 کگم سۆپـەر فۆسفـاتی سێ‌ینـە + 20 کگم سلفاتی پۆتـاسیـوم. وەبـە رێـژەی 4 / 75 کگم بۆیەك دۆنم لە پەیینی کیمیـاوی ئەگـەر سەرچـاوەی نایترۆجینەکە یوریا بوو بەم جۆرە ئەبێت: 11 کگم یۆریا + 4 / 44 کگم سۆپەر فۆسفاتی سێ‌ینە + 20 کگم سەلفاتی پۆتاسیوم

بۆ توووتنی رۆژهەڵاتی پەیینی گیراوە بەکار ئەهێنرێت بەرێژە 50کگم بۆیەك دۆنم.

### پاچەکۆڵەو بژار

ــــــــــــ: ـ گرنگیـەکی گەورەیان

هەیە بۆ توتن پاش 7 تا 10 رۆژ لەدوای شەتڵ لێدانەوە پاچە کۆڵە ئەکرێت چونکە ئەبێتە هۆی شیکردنەوەی گڵەکەو ئەمەش یارمەتی رەگەکان ئەدات بۆمژینی هەواو بەهێزبوونی. لە دوای (12) رۆژ پاش پاچەکۆڵەی یەکەم، دووەم بەئەنجام ئەگەیێنرێت وە سێیەمیش بە (11) رۆژ دوای دووەم، لە خاکی قوورسدا پاچە کۆڵە بەقوولی ئەکرێت ئەتوانین ماددەی کیمیاوی بەکار بهێنین بۆ لەناو بردنی گژوگیا.

### سەرکردن و وەچ کردن

ـــــــــــ:- ئەگەر تۆومان پێویست بێت، نابێت سەر بکرێت بەڵام وەچ ئەکرێت بەدەست. بۆتووتنی فەرجینی لە سەروو 20 ـ 24 گەڵاوە سەری ئەکرێت بەتایبەتی پۆلی سپێشەڵ (S.L) چونکە زوو پێ ئەگات باڵاشی ئەگاتە (2) مەتر، بۆ ئەوەی ماددەی شەکرو نایترۆجین زۆر بێت لەگەڵا کاندا، ئەگەر سەری توتن کرا بەماددەی مالیك هایدرزایدا ئەرشێنرێت بۆئەوەی وەچ دەرنەکات و هەرچیەکی پێوەبوو بەدەست لائەبرێت.

## پێگەیشتن و شکاندنەوەی گەڵا:

ـــــــــــ پاش 2/5 دوومانگ و نیو دوای شەتڵ لێدان توتن دەست ئەکات بەگەیشتن لەنیشانەکانی زەرد بوونی سێیەکی سەرەوەی گەڵا، لەکاتی دەست لێدانی گەڵادا بوونی بڵاو ئەبێتەوە، کەگەڵا ئەشکێنینەوە دەنگێکی تایبەتی ئەبیسترێت... 4 بۆ 5 جار گەڵا ئەشکێنینەوە ماوەی نێوان جارێك بۆیەکێکی تر (20) رۆژە، لەهەر جارێکدا 4 تا 5 گەڵا لێ ئەکرێتەوە.

## شریت لێدان

ـــــــــــ:- لە شوێنێکی سێبەردا شریت لێدان بە ئەنجام ئەگەیێنرێت، گەڵا توتنەکان لەسەر گونیەیەك کۆمەڵ ئەکرێت بەهۆی دەرزی تایبەتی یەوە ئەکرێت بەگوشەوە توتنەکەی پێوە ئەکرێت بەڵام نابێت زۆر پربێت چونکە لەکاتی ووشك کردنەوەدا ئەبێتە هۆی رەش بوون و بۆگەن کردن.

ئەم کارە بەئامێری تایبەتیش کە بۆ ئەم مەبەستە دروست کراوە بەئەنجام ئەگەیێنرێت.

### ووشك کردنەوە

ـــــــــــ:- دوای ئەوەی شریتەکان ئامادە بوون بە چەرداغدا هەڵئەواسرێت کەماوەی نێوان شریت و یەکێکی تر 10 ـ 15سم بۆئەم مەبەستە ئامادە کراوە بۆووشك کردنەوەی تەواو یانی (ووشك بوونی لەپی گەڵاو دەماری ناوەراست) بەپێی جۆری توتنەکە رێگای ووشك کردنەوە ئەگۆررێت.

أ ـ تیشکی رۆژ: بۆ توتنی رۆژهەڵاتی.

ب ـ هەوای گەرم (بارن): بۆ توتنی فەرجینی

ح ـ سێبەر: بۆ توتنی بێرلی.

## خستنە زیندان و فەردە داگرتن

ـــــــــــ:- دوای ووشك بوونەوەی توتنەکە شریتەکان ئەگوێزرێنەوە بۆ ناو زیندان، ئەم زیندانە ئاوی تێ ئەکرێ‌و شریتەکان تیا هەڵئەواسرێ دەمی زیندانەکە بە نایلون دائەپۆشرێ بۆئەوەی توتنەکە تیایا خاو بێتەوەو شێ وەربگرێ هەتا لەکاتی فەردە داگرتندا توتنەکە وورد نەبێت، پاشان دوای (2) رۆژ لەزیندان دەرئەهێنرێت لە سندوقدا دائەگرێت بەکێشی 18 ـ 25 کگم بەرێژەی 25 ـ 30 شریت لە سندوقی بچوکدا پاش ئەوەی ئەم سندوقە پر ئەبێت بەردێکی گەورە یان بلوکێك یان (بەهۆی ئامێری تایبەتی یەوە کەبۆ ئەم مەبەستە ساز کراوە) بۆ ماوەی رۆژێك دائەنرێت لەسەر توتنەکە بۆ ئەوەی بپەسترێتەوە، پاشان فەردەکە ئەدروێتەوەو لەژوورێکی

تایبـەتی‌دا لەسـەر تەختـەیان فلیین (ستایرۆبۆر) دائەنرێت، هەر بە 7 تا 10 ڕۆژ جارێك هەڵئەگێرڕێتەوەو لەسەر لایان شان دائەنرێت بۆئەوەی ڕەش نەبێتەوەو خراپ نەبێت تا ئەو ڕۆژەی ئەنێـرێت بۆلیـژنـەی وەرگـرتنی تووتن، بەم شێـوەیە تووتنەکە باش دەرئەچێت و پلەی بەرز وەرئەگرێت.

**«گـۆڕانی کیمیـاوی کە بەسـەر پێکهـاتـوەکـانی گەڵای تووتندا دێت لە کاتی ووشك بوونەوەی گەڵادا»**

ئەتـوانین سیفـاتی کیمیـاوی‌و فیـزیـاوی گەڵای تووتن دیاری بکەین بەهۆی:ـ

1 سیفاتی زگماکی (وراثی) ئەو جۆرە تووتنەی کە ڕۆێندراوە

2 کارتێکردنی ئاووهەوای ئەوکەژە.

3 ـ بەهۆی ئەورێگایەی کە بۆ و وشك کردنەوەی تووتن بەکارئەهێنرێ.

**«ووشك کردنەوە بەهەوای گەرم»**

ئەم کردارە کۆتـایی پێـدێت بەچـرکردنەوەی پلەی گەرماو شێ لە دەوری گەڵای ناو کورەکە یان بارنەکە کەئەبێتە هۆی ڕوودانـی گۆڕانکـاری لەڕەوشتی فیـزیـاوی‌و کیمیـاوی گونجاوی ڕەچاو کراودا.

ئەم کردارە زۆر گرنگە بۆپارێزگاری کردنی جۆری گەڵا ،کـە ئەتـوانین چۆنێتی‌و چەنـدێتی گەڵا دیـاری بکـەین، گرنـگـێـتی کرداری ووشـك کردنـەوەی گەڵا کاتی بوونی دیاری ئەدات. چەند هۆیەك کار ئەکاتە سەر ڕێ ڕەوی ئەم کردارە لەبارەی خێرایی‌و کۆتایی هاتنی یەوە.

1 ـ بری ئەو ئاوەی لە گەڵادایە.

2 ـ پلەی گەرمـاو ڕێـژەی شێ لەدەرەوەو ناووەی بارنـەکـەدا جگـە لەم هۆیـانـە پرۆگـرامێ کەپێویستە ڕەچاو بکرێ لەکاتی ئەم کردارەدا پشت ئەبەستێ بە

أ ـ شێوەی گەڵا

ب ـ کاتی گەڵا ڕنین و تەمەنی گەڵاکە

جـ ـ شوێنی گەڵاکە لەسەر قەدی ڕووەکەکە.

**( ـ باری چاندن و باری ئاوهەوا لەکاتی گەڵا ڕنینیندا)**

ئەتـوانین کرداری‌و وشـك کردنـەوەی گەڵا دابەش بکەین بۆ دوو قۆناغ.

یەکـەم / لەم قۆنـاغـەدا کرداری گۆڕانی زیندە چالاکی زاڵە لەگەڵ گۆڕانی فیزیاوی‌دا.

دووەم / کرداری فیزیاوی سەرەکی‌یەو زیاتر ڕووئەدات ،کە لەکاتی‌و وشك کردنەوەدا 50 تا 80کات ژمێری یەکەم ئەبات.

لەقـۆنـاغی یەکـەم واتـە (گـۆڕانی زینـدەچـالاکی) ئەم گۆڕانانە ڕووئەدات

(1) زەرد بوونی گەڵا

(2) جێگیـر بوونی ڕەنـگ لەباری کرداری‌و هونەری یەوە دوا دواجێگربوونی ئەم قۆناغە ئەتوانین دای بنێین بە سەرەتای قۆناغی دووەم کە بەزۆری 40 تا 60 کات ژمێر ئەخایەنێ ،کـە بەشێـوەی هونـەری/و وشـك/ بوونـەوەی لاسـك و دەماری گەڵا کۆتایی دێت.

**مەرجەکانی خەزن کردنی‌تووتن لەکۆگادا (مخزن) ـ:**

دوای وەرگرتنی فەردە تووتنەکان لەبرا تووتنەوانەکان لەلایەن لیـژنـەکـانی وەرگـرتنی تووتنـەوە، گشتی لەمـەخـزەنـدا هەڵـەگیـرێت تاکـاتی پێـویـست و ناردنی بۆکـارگـەی پاك کردن و دروست کردنی جگـەرە، لەکـاتی هەڵگـرتنـدا ئەبێت پەیرەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت:ـ

1 ـ دانانی فەردەکان لەسەر تەختە یان فلیین لە شێوەی ڕیزدا، دووری ڕیزێك لەوی ترەوە ئەبێت لەیەك مەتر کەمتر نەبێت، ڕێـژەی شێ لە مەخـزەنـدا 60 ـ 65 ./. بێت پلەی گەرمیشی بگاتە 20 بۆ 25 پلەی سەدی.

2 ـ نابێت لە (5) فەردە زیـاتـر لەیـەك ڕیـزدا بخـرێتـە سەریەك ،بۆ ئەوەی هەوا بە ئاسانی بە ناویاندا هات و چۆ بکـات و تووتـنـەکـە گەرم نەبـێـت، یان بۆ ئەوەی فەردە

تووتنەکان ووردنەبن

3 ـ هەڵگێرانەوەی فەردەکان (ئەم دیوو ئەو دیوکردنی فەردەکان بەهەردوولادا) هەر سێ مانگ جارێك ئەم کردارە بەجێ ئەهێنرێ، بۆ ئەوەی تووتنەکە رەش نەبێت و خراپ نەبیت، هەروەها /ڕێژەی /شێ /، پیشکنین (فحص) بۆ ئەوەی بزانرێت چەندە؟، تا بە پێی پێویست دەرگاو پەنجەرە بکوێتەوەو، فەردەکان ئەم دیوو ئەو دیوو بکرێت.

4 ـ پشکنینی (فحص) کردنی فەردە تووتنەکان بۆئەوەی بزانرێت کەمێرووی زیان بەخشی مەخزەنی تیاپەیدا نەبووە، بۆ ئەوەی جۆرەکەی دیاری بکرێت و بەزوویی لەناو ببرێت.

5 ـ بۆ خۆ پاراستن لە تووش بوونی مەخزەن بەمێروو باشتروایە مەخزەنەکە پاکژ (تعقیم) بکرێت بەماددەی فوسفو توکسین، لەکاتی رشاندنی مەخزەنەکەدا ئەبێت دەرگاوپەنجەرە بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێك دابخرێت، لەم ماوەیەدا غازی فۆسفین دروست ئەبێت هەرجۆرە مێرویەکی تووتن هەبێت ئەمرێت، لەم جۆرە مێروە مەخزە نیانەش کەزیانی گەورە ئەدەن لە تووتن (لایزودیرما)، لەگەڵ هێنانی تووتن لە بولگاریەوە بۆعیراق ساڵی 1965 لە شێوەی هێلکەو کرمۆکەدا لەگەڵ فەردە تووتنەکاندا هاتووە.

، مێرووی ئیفیستیا مێروویەکی مەخزەنی زیان بەخشە لەسەر گەڵای تووتن ئەژی، بێجگە لە ماددەی فۆسفوتوکیسن، چەند ماددەیەکی تریش بە کار دێت بۆ لە ناو بردنی مێرووی مەخزەن وەك ماددەی گازی برۆمیدی مەثیل یان ئۆکسیدی ئەسیلین.

## پاککردنی تووتن (لە کارگەی پوختە کردنی توتن لەسلیمانی)

پاش ئەوەی تووتنەکە لەجووتیار وەرئەگیرێت لە کۆگا (مخزن)ی تایبەتیدا هەڵئەگیرێت، تاکاتی پێویستی کە ئەنێرێت بۆکارگەی پاککردنی تووتن و دروست کردنی جگەرە.

پاککردنەوەی تووتن بەم کردارانەی خوارەوەدا تێپەڕ ئەبێت:ـ

1 ـ خاو کردنەوە

________: ئەو تووتنەی کە لەجووتیار وەرگیراون بێ گوێ دان بەجۆری پلەکەی، ئەخرێتە ئامێری خاو کردنەوەوە (چامپر) ڕێژەی شێ لەم چامبەرەدا ئەگاتە 100 ./. ، وەپلەی گەرمی تیایدا بریتی یە لە 30 پلەی سەدی، بۆ ماوەی 10 تا 12 سەعات تووتنەکەی تێ ئەکرێ تاوەکوشێی تووتنەکە ئەگاتە 15 ـ 17 ./. ، بەلام ڕێژەی شێی تووتنەکە پێش خستنە ناوچەمبەرەوە بریتی یە لە 11 ـ 12 ./. مانەوەی تووتنەکە لەناو چەمبەرەکەدا ئەگۆرێت بەپێی شێی تووتنەکە خۆی.

2 ـ هەڵوەشاندن

________: تووتنە خاوو بۆوەکە لەسەر قایشی تایبەتی کە بەهۆی ئامێرەوە ئەسورێتەوە (بەردەوام ئەڕوات) هەڵئەوە شێنرێت و گەڵاکان لەشریتەکە جیا ئەکرێتەوە، ئەمیش بێ گوێدانەپلەی تووتنەکە.

3 ـ جیا کردنەوە

________: پاش ئەوەی شریتەکان هەڵوەشێنرا، تووتنەکە پاك ئەکرێت و ئەکرێ بەسێ بەشەوە:

أ ـ بەشی A : بریتی یە لەو گەڵا ساغ و جوانانەی پلەی مومتازو یەکەمی دراوەتێ هیچ جۆرە نەخۆشیەکی پێوەنی یە.

ب ـ بەشی B : بریتی یە لەو گەڵایانەی پلەی دووەمی دراوەتێ.

ح ـ بەشی C : ئەمەش ئەوگەڵایانە ئەگرێتەوە کەشکاون و پلەی سێ و چواریان دراوەتێ، پاشماوەی هەندێ نەخۆشیان پێوە ماوە، پاش ئەم جیاکردنەوەیە هەر بەشێك لەم بەشانەی سەرەوە کە باسمان لیوەکرد بەجیا ئەنێرێت بۆ بێژانەوە، پاشان تووتنە وورد بووە کەش ئەبێژرێتەوەو کۆ ئەکرێتەوەو،

ئەنێرێت بۆ بولگاریا بۆ ئەوەی کەبس بکرێت لە شێوەی گەڵای ساغ دا، کە دەماری ناوەڕاستی تیانی‌یە، بەکاردێ بۆ دروست کردنی جگەرە.

4 ـ بێژانەوە

ـــــــــ: پاش جیاکردنەوە، بەهۆی ئامێری تایبەتی‌یەوە ئەبێژرێتەوەو گەڵا پاکە ئەمێنێتەوە، تۆزو خۆڵ و گەڵا وورد بووەکە ئەکەوێتە ژێرەوە، گەڵا پاککراوەکەش بەسەر قایشەکەدا ئەڕوات بۆ کەبس کردن (فەردە داگرتن).

5 ـ فەردە داگرتن

ـــــــــ: گەڵا پاکراوەکان هەر بەشێك بن، ئەگاتە ئامێری فەردە داگرتن، لەلایەن کرێکارەوە سندوقی تایبەتی ئەخرێتە ژێر ئەم ئامێرەوە، بۆ ئەوەی فەردەیەکی پڕ دابگیرێت و ئینجا ئامێرە کە خۆی ئەوەستێت، پاشان دەرئەهێنرێت جانفاسەکەی ئەدورێت ،پاشان هەر بەشێك لەبەشەکانی C, B, A, کێش و ساڵی بەرهەم هێنان و شوێنەکەی لەسەر ئەنووسرێت و لە مەخزەنی تایبەتی‌دا هەڵئەگیرێت بۆکاتی پێویست.

6 ـ خەزن کردن

ـــــــــ: هەر فەردەیەك بەکێشی 25کغم وە بەشی C, B, A لەسەر نووسراوە لە مەخزەندا هەڵئەگیرێت وەك لەپێشەوە باسمان کرد.

## «دابەش بوونی شوێنی چاندنی تووتن لە جیهاندا»

ـ ڕێژەی دابەش بوونی شوێنی چاندنی توتن لە ڕووی بەرهەم هێنانی تووتنەوە لە جیهاندا بەپێی سەرژمێری ساڵی 1978 بەم جۆرەی لای خوارەوە نیشاندراوە:

1 ـ کیشوەری ئاسیا لە 49 ./. ی جیهان بەرهەم دێنێ

2 ـ کیشوەری ئەمەریکای سەرو 26 ./. ی جیهان بەرهەم دێنێ.

3 ـ کیشوەری ئەوروپا لە 18/5 ./. ی جیهان بەرهەم دێنێ.

4 ـ کیشوەری ئەمەریکای خواروو 4/5 ./. ی جیهان بەرهەم دێنێ.

5 ـ کیشوەری ئەفەریقا لە 2 ./. ی جیهان بەرهەم دێنێ.

## نەخۆشی ومێرووی تووتن لە کێڵگەدا:

1 ـ مێرووی مژۆك: ئەم مێروانە لە شێوەی مێشوولەی ووردان کە ڕەنگیان خۆڵەمێشی‌یان ڕەشە، بەسەرو ژێری گەڵاوقەدی توتنەو ە ئەمێنێتەوە، بەڵام بەزۆری لەژێری گەڵادا زۆرە، لە مانەش مێرووی (مەن) (تربەس) ئاووگی ڕوەکە کە هەڵئەمژن، نیشانەکانی زەردبوونی گەڵاو لوول بوونی، پەڵەی قاوەیی بریقەدار لەسەر ڕووی گەڵاکە دەر ئەکەوێت پاشان پەیدابوونی لینجیەکی شەکراوی.

کاتێك کە ئەو نیشانانەی سەرەوەی بینران لەسەر توتن یان هەر ڕوەکێکی تر ،بەو ڕووەکانە ئەوترێت تووشی نەخۆشی شیرینە (کەزۆو مێشوولە)ەبوە، ئەمەش بەهۆی مێرووی (مەن و(تربەس)ە واچاکترەوە پێویستە خێرا ئەم نەخۆشی‌یە چارە سەر بکرێ ،ئەم دەرمانانەی خوارەوە بەکار ئەهێنین.

| جۆری دەرمان | ڕێژەی دەرمان |
|---|---|
| مالاثیۆن 50 ./. | 10سم3 بۆگالۆنێك ئاو |
| نۆکۆز 40 ./. | 60سم3 بۆگالۆنێك ئاو |
| بریمۆر | 2/5 ـ 5گم بۆگالۆنێك ئاو |

کرم و مێرووی قرتێنەر (حشرات القارضه):

2 ـ مێرووی قرتێنەر (هارە) دەست ئەکات بە قرتاندنی شەتڵە کۆر پەکان لەدەم گڵەکەدا ،شوێنەکەی چۆڵ ئەبێت و پێویستە دووبارە شەتڵ بکرێتەوە، هەندێ جار شەتڵەکە

نافــەوتیّو سەر لەنــویّ هەلّئــەداتــەوە بەلاّم لقــەتــووتنــەکــە لاوازئــەبیّت، دیســان (ملّە) کە میّــروویەکی زیان بەخشە، ئەمــە رِەگی تووتنــەکــە ئەقــرتیّنیو ووشك ئەبیّت، هەروەها سیســـرك قەدو گەلاّی شەتلّە کۆرپــەکـان ئەخــۆن و ئەبیّتــە هۆیو وشــك بوون، جابــۆیــە ئەبیّت برا تووتنــەوانــەکـان خیّــرافــریــای تووتنــەکەیان بکەون و ئەم کرم و میّروانە لەناو بەرن، بەرِیّگــای بەکــار هیّنــانی (دەرمــانی کیمــاویوە بەم شیّوەیەی خوارەوە.

| جۆری دەرمان | رِیّژەی دەرمان |
| --- | --- |
| سەڤن 8،5 ./. | 5/7گم بۆ گالۆنیّك ئاو |
| دیتریّکس | 5/7گم بۆ گالۆنیّك ئاو |
| ئیفۆریل | 5/7کم بۆ گالۆنیّك ئاو |

یان بەووشکی بەبنکی لقــە تووتنــەکــەوەی ئەکەین بەرِیّژەی مو.کگم بۆ یەك دۆنم ،یان ئەتوانین ئەم دەرمانانە هەر بەو رِیّــژانــەی سەرەوە لەگــەلّ ئاوی ئاودانــدا تیّکــەلّ بکــەین، رِیّگایەکی ترمان هەیە ئەویش ئەمەیە قەدی شەتلّەکە یانی نیّوان (رِەگ و گەلاّ) بەرِۆژنــامــە بپیّچین ،ئەگەر هاتوو ئەم رِۆژ نامانــە لەگــەل یەکیّ لەو دەرمانانەی سەرەوە بەکارهیّنرا چاکترا ،کاتیّك میــرووەکــە لە شەتلّەکــە نزیــك ئەبیّتــەوە ئەترسیّت و لەبۆنی دەرمانەکە رِائەکات ئەگەر نەشی کوژیّ لقــەتــوورتنــەکە بەجیّ ئەهیّلیّو لیّ ی دوور ئەکەویّتەوە، بەلاّم ئەم رِیّــگــایــە گرانــەو کاتیّــکــی زۆری ئەویّت ،بــەلاّم ئەنجامیّکی باشی هەیە.

## «نەخۆشی یەکان»

- نەخۆشی «نیماتۆدا»ی رِەگ -

لەنیشــانــەو دیــاردەکــانی تووش بوونی ئەم نەخۆشی یە، نیماتۆدای رِەگ بە ئاسانی جیا ئەکریّتەوە، کە هەلّئاوسان و گریّ گریّ بوون دەرئــەکــەویّــت لەســـەر رِەگی سەرەکیو لاوەکــی رِووەکـــە تووش بووەکـــە بەهــۆی دروست بوونی گریّی یەك لەدوای یەك ئەم نەخۆشی یە بلاّوئەبیّتەوە بەسەر هەمــوو ناوچــەکــەدا ،دیــار دەکــانی ئەم نەخــۆشی یە لەسەر رِووی خاك (واتــە گەلاّ) وەك دیــاردەکــانی نەخۆشی بوگەن کردنــی قاوەیــیرِەك یان بۆگەن کردنــی رِەشی رِەگ وایـــە، وەنیماتۆدای گریّی رِەگ مشەخۆر نی یە لەسەر رِەگی گیاو گولّ، بەلّکــو بەرز بوونــەوەی پلەی گەرمــای زەوی یارمەتی زیاتر گەشەکردن و خیّرایی سوری ژیانی نیما تۆدا ئەدات.

پاریّزگاری کردن: رِەچاو کردنی سورِی کشتوکالّی باش.

## «لارِەشەی قەد»

تووش کەری ئەم نەخــۆشی یــە جۆرە کەرِوویــەکــە پیّ ی ئەوتریّت - phytophora para sitica var nicotiar;mae

دیاردەکانی تووش بوونی ئەم نەخۆشی یە

______________:- ئەم نەخــۆشی یــە لەبـــەشـــی خوارەوەی قەدو رِەگــی رِووەکــی تووتــن ئەدات ،دیــاردەو نیشــانــەکــانی ئەم نەخــۆشی یــە جیاوازەو ئەگۆرِیّ بەپیّ ی تەمەنی رِووەکەکەو توانای بەرگری گرتنی رِووەکەکە بۆئــەم نەخــۆشی یە، ئەم ئەخۆشی یە لەکیّلّگەدا دەرئەکەویّت بەتــایبــەتی لەو شویّنــانــەی نزمــەو پلەی شیّ (رطـوبە) تیایا بەرزە، ئەم نەخۆشی یە بۆیەکەم جار لەسەر چەند رِووەکیّك دەرئــەکـــەویّت بەلاّم بۆجــاری دووەم واتــەســالّی داهــاتــو ژمــارەیــەکی زۆر لەروەکــەکــان توشی ئەم نەخۆشی یە ئەبن لەهەمان کیّلّگەدا.

کەنیشـــانـــەو دیــاردەکــان تووش بوون بەم نەخــۆشی یــە دەرئەکەویّت بەم شیّوەیەی لای خوارەوە ئەبیّت:-

أ - کاتیّ توتن کەدرِیّژی دەگاتە نزیکەی پیّ یەك یازیاتر

لەرۆژدا سیس ئەبێت و لەشـەودا ئەچێتــە دۆخی تایبــەتی خۆیی بەڵام پاش چەنــد رۆژێــك گەڵاكــانی زەرد هەڵ دەگەرێت و شۆردەبێتەوە بۆ خوارەوە واتە رووەكە بەووشكی (سیسی) دەمێنێتەوە.

ب - كاتێك پارچەیەك لەرەگی رووەكە نەخۆشەكە بهێنین تەماشای بكەین دەرئەكەوێت كەیەك رەگ یاچەند رەگێكی لاوەكی لەقۆنـاغی یەكـەمی سیس بوون یان و وشك بوون دان و رەش هەڵگەراون وەیان مردوون بەڵام قەدەكەی هیچ تووش بونێكی تیــادەرنــەكــەوتــوە بەڵام وردە وردە دەست دەكـات بە گۆڕان و نەخـۆشی یـەكە بڵاودەبێتەوە بۆشانەكانی قەد كەچــەنــد (سم) بەرز دەبێتـەوە لەسـەر قەد. وە نیـان (اللجاء) دەبێتە هۆی بە رەش بوون، وە ئەگەر قەدی رووەكە لەسەر شێوەیەكی درێژی دوولەت بكەین ئەبینین كەكرۆك (لب) لەزۆر رووەكدا. جیا بۆتەوە بەشێوەی خەپلە (قرص) بەدرێژای ماوەی توش بونەكەی.

وەكەرووە (فطر) توش بوەكە لەرێگەی رەگەوە ئەتوانێت بچێتـە ناو رووەكـەوە وە هەروەها لەرێگەی ئەو گەڵایانەی كەنـوساوون بەزەوی یەوە وەیـان خاكـەوە كەپیس بوون بەو جۆرە كەڕووەیان نەخۆشی‌یە.

## پارێز گاری كردن لەم نەخۆشی‌یە

باشترین و ئابوری ترین رێگا سوری كشتوكاڵی‌یە (الدورة لزراعية) وەئەگەر زەوی زۆرمان نەبوو بۆ سوری كشتوكاڵی ئەوا باشتــرین جۆر (صنف) بە كاردێنین كەبــەرگـەی ئەم نەخــۆشی‌یــە بگــرێت وەهــەر وەهـا پێـویستـە كاروبـاری كشتوكاڵی بەشێوەیەكی رێك و پێك ئەنجام بدرێت.

**ئەو كارانەی كە پێویستە بكرێت بۆ سەركەوتن وەیا زاڵ بوون بەسەر ئەم نەخۆشی‌یەدا:.**

لەكاتی نەبوونی نەخۆشی لارەشەی قەد لە ناو كێڵگەدا، ئەبێت ئەمانەمان لەبیر نەچێت:-

1 - ئەبێ ئەو شەتڵانەی ئەهێنرێت بێ گومان بین كە لە جێگەیەك هێنراوە نەخۆشی تیانەبوە.

2 - ئەبێ ئەو ئامێرو ئامرازانەی كە بەكار ئەهێنین هیچ گومــانی ئەوەی لێ نەكــرێ نەخــۆشی پێـوەیــەو لە شوێنی نەخـۆشـاویدا بەكار هێنراوە. وەئەبێت تەواو پاكی بكەینەوە بەمادەی كیمیاوی پێش بەكار هێنانی لەكێڵگەدا.

3 - ئەبــێ ئەو ئاوەی كە بەكــار ئەهـێـنرێ بۆ ئاودانــی شەتڵەكان پاكژ و پاك بێتەوەو میكرۆبی ئەو نەخۆشی یەی تیا نەبێت.

4 - ئەبـێت بێ گومــان بین لەوەی كەپــاش ماوەی قەد وەیان پەینی بەكار هێنراو و پاشماوەی ناوبازنەكە (مستودع) كەفرێ دراوەتە ناوكێڵگەكە هیچ نەخۆشی پێوەنیەو خاوێنە.

ئەگـەر لارەشـەی قەد لەنـاو كێڵگـەدا بلاو بووە وەئەبێت رەچاوی ئەمكارانە بكەین.

١- چاندنی گژوگیاو بەروبومی پاقلەیی لەگەڵیاو نەهێشتنی چاندنی كێڵگە بەتوتن بۆماوەی (3) ساڵ.

2 - پێـویستـە هەمـوو ئەو كەرەسـەو ئامێـرانەی كەبە كار ئەهێنـرێت پاكـژ بكـرێت وپاك بكرێتەوە پێش بەكار هێنانی لەكێڵگەی توتن دا.

3 - ئەگەر زەوی تەواومان نەبوو بۆسوری كشتوكاڵی ئەوا ئەبێت رەچاوی ئەمانەی لای خوارەوە بكەین:-

أ - پێ ویستە جۆرێكی باش لەتوتن بەكار بهێنین كە بەرگـرری هەبێ بۆ ئەو نەخـۆشی‌یـە (واتە جۆری بەرگرری كەربەو نەخۆشی‌یە).

ب - نەناشتنی كێڵگە كە بەتوتن بۆماوەی سێ (3) ساڵ گەرگومان لێ كراوبوو وەیان نەمان توانی جۆری بەرگری‌كەر بەو خۆشی‌یەوە دەست بهێنین.

## (نەخۆشی گەنانی رەگ)

جۆرە كەڕوویەك ئەبێتە هۆی توش بوون بەم نەخۆشی یە كەپــێی ئەوتــرێ [ Thielaviopsis basicola ] ئەم جۆرە

نەخۆشی‌یە ڕوودەدات لەهەندێ جێگای کێلگەدا کەئەبێتە هۆی کورت بونی ڕووەکـەکـان لەژێـرتـوش بونێکی زۆر بەهێزدا کەئەبێتە هۆی ڕەنگە زەرد هەڵگەڕانی ڕووەکە توش بوەکـە وەهـە ڕووەهـا ئەبێتە هۆی گوڵ کردنی ڕووەکە پێش ئەوەی بگات (قبل النضج).

بەڵام لەکاتی توش بونێکی کەم و مام ناوەندی‌دا ڕەگی دووم دروست ئەبێت و ڕووەکەکە قەبارەی تایبەتی خۆی وەر ئەگرێت بەڵام پێگەیشتنی دووا ئەکەوێت لەدیاردەکانی توش بوون بەم نەخۆشی‌یە

---

دەرکـەوتنی خاڵی ڕەش ڕەش (lesions) کە لەسـەر ڕەگی مێخی (جـذر وتـري) وەرەگـە لاوەکی یەکانی ڕووەکە تووش بووەکە دەرئەکەوێت.

وەکـە ڕووەکـەکـان لە چاڵـەکانداەبن وتیایدا پەرەئەسێنن کەئـەتـوانین دیاری بکەین بەمیکرۆ سکۆپ ئەم نەخۆشی‌یە پەرە ئەسێنێت لەو زەویـانــەی کە کەم ئاوڕێــژ ن (صـرف ضعـیـف) وەك خاکـی گران و قوڕاوی (طـینیــە ثقیلە) کە ئاوتیـای پەنـگە ئەخـواتـەوە .وەهـەروەهـا ئەوزەوی یانـەی ترشییان کەمە (قلیلة الحموضیە) ئەبێتە هۆی پەرەسەندنی ئەم نەخـۆشی‌یـە بەتـایبـەتی لەوکـاتـەی کە هەواساردو شێ داربێت (الجو بارد ورطب).

نەهێشتنی ڕووانی (عدم زراعة) ڕووەکە پاقلەیی یەکان (beans) لەدوای توتـن لەسـوڕی کشـتـوکـاڵی‌دا (الـدورة الزراعیە) چونکە ئەم ڕووەکانە ئەبنە خانەخوێ بۆکەرووەکان.

## چارە سەرکردنی

---:-

(1) گواستنەوەی شەتڵی بێ نەخۆشی واتە ساغ و خاڵی بێت لەچاڵ کە لەسەر ڕەگە کەیەتی.

(2) ناشتنی جۆری بەرگری کەر بەم نەخۆشی‌یە.

(3) ڕەچـاوکـردنی باشـتـرین دەورەی کشتوکاڵی کەباش بێت بۆی.

## «نەخۆشی کەڕوە شینە»

ناوی ئەم نەخـۆشی‌یـە بەکـوردی (کـەڕوە شینـە)یـە وە بەعــەرەبی (مـرض العفن الأزرق علی التبـغ) یا (مـرض البیاض الزغبی علی التبغ)ی پێ ئەڵێن.

بۆ یەپێی ئەڵێن (کـەڕوە شینــە) چونکــە بەســەر لای خوارەوەی گەڵا توتنـە توش بووەکـانـەوە کەڕوویـەکی شینی خۆڵە مێشی پەیدائەبێ.

ئەم نەخـۆشی‌یـە بەهـۆی یەکێـك لەکۆمەڵی (الفطریات الاشنیة) وەپەیدا ئەبێ کەپێی ئەڵێن «Peronispora Tabacina Adem» ئەم دەردە سەرەڕای ئەوەکـەتـوشـی شەتـڵی توتن و برکـەتـوتن ئەبێ، توشی شەتڵێ تەمـاتـەو بیبەرو باینجانیش ئەبێ نەخوازەلا ئەگەر هەوا لەباربێ بۆئەوە بەلام گرنگی ئەم دەردە لەوەدایـە کەمـەتـرسی دارتـرین نەخۆشی یەکە توشی شەتڵە توتن ئەبێ.

## مێژووی ئەم نەخۆشی‌یە / -

---

ئەم دەردە، لە سەد ساڵ لە مەوبەر لە ئوستراڵیادا پێیان زانیـوە، لەوانـەشـە کە ئوسـتـراڵیـا سەرچـاوەی یەکەمی ئەم دەردەبێ پاشان لە 1921دا وەك مافەتە (وباء) کەوتۆتە ناو توتنی وولاتـە یەك گرتـوەکـانی ئەمـەریکاوە. پاشانیش هەر چەنــد ساڵێـك سەری هەڵ دایـەوە، تالـە ساڵی 1938دا لەکەنەداش پەیدابوو لەوێ شەوە خۆی گەیاندە ئەورووپا وە لە ساڵی 1958دا وەك گەیشتـە وولاتـەکـانی تری ئەورووپا وەلـەولاتـانی بەلقـانـەوە بەتایبەتی لەیوناندا زیانێکی زۆری گەیاندبە بەرهەمی توتن. لە ساڵی 1962 یشدا لەتورکیادا بلاوبـووەوە لەوێ وەگــەیشتــە سوریـاو لوبنـان وەلـە ساڵی 1963دا گەیشتە ئەردەن.

---

له عێراقیشدا یەکەم جار لەمانگی مارتی ساڵی 1969دا گەیشتە عێراق و لە شەتڵگەکانی (مشاتل) تەماکۆ (تنباك)ی ناوچەی (هندیە)و ناوچەی کەربەلادا دیاریدا.

بۆیەکەم جار کاربەدەستانی بەشی دەردوداوی سەوزەوات (قسم وقاية الخضراوات) لەکۆلیجی کشتوکاڵی پێیان زانی‌و ناسی‌یانەوە.

لەوێ شەوە خۆیان گەیاندە کوردستانی عێراق و وەك مافەتەبلاو بووەوە بەشەتڵگەکانی توتنی ئەو ناوچەیەدا.

## گرنگێتی ئابووری ئەم نەخۆشی‌یە

نەخۆشی کەرووەشینە گرنگترین و مەترسی دارترین نەخۆشی‌یە کەتووشی شەتڵگەی توتن ئەبێ وەئەبێ بەهۆی لەناوبردنی شەتڵە بچوکەکان وە وایش هەیە ئەبێ بەهۆی دامردنەوەی هەموو شەتڵگەکانی توتن لەو ناوچەیەکەتیای بلاوبۆتەوە، سەرە ڕای ئەوەکە ئەگاتە کێڵگە توتنەکانیش و توشی ئەوانیش ئەبێ ئەم نەخۆشی‌یە دەردێکی یەکجار کاریگەرە. پێویستەبە شێوەیەکی باش و وردبەربەرەکانی‌و چارە بکرێ بەتایبەتی لەبەرئەوە کەهێشتا ئەو جۆرەتوتن و تەماکۆیانەی (تنباك) کە لە عێراقدا دەچێنرێن لەخۆیانەوە بەربەرەکانێی ئەم دەردەیان پێ‌ناکرێ.

## دیاردەو نیشانەکانی ئەم نەخۆشی‌یە

أ ـ نەخۆشی کەرووە شینە نیشانەکانی بەسەر شەتڵە توتنە ووردەکانەوە. پەڵەی زەردپەیدا ئەبێ بەسەر ڕووی گەڵا توش هاتووە کانەوە. ئەوەتە ئەبینین ئەوگەڵا ووردەیی کە کەتوش ئەم دەردە بوە پەڵەیەك یان چەندپەڵەیەکی زەردی بەسەرەوەپەیدائەبێ. وە ئەگەر هەوا ووشك بوو ئەو گەڵایانەی کەتوشی ئەم دەردەهاتن ئەشێوێن و وردەوردە دەوران دەورەکانیان سیس ئەبێ‌و ووشك ئەبێ، دائەمرکێتەوە خۆ ئەگەر دەردەکە توندبێ ئەبینین وابەشی زۆری گەڵای شەتڵەکان ووشك بوون. وەك بڵێی هەڵبرۆز کاون هەروەها دیووی ژێرەوەی گەڵا توش بووەکان کەرویەکی شینی وەك ڕەنگی خوڵەمێشی لەسەر پەیدا ئەبێ. وەئەگەر هەوانم وشێ‌ی پێوە بوو کەرووەکە ڕەنگی شینی وەنەوشەی وەرئەگرێ ئەم کەرووە جێگای گەرای میکرۆبی دەردەکەیە، ئەو شەتڵەی کەتوشی کەرووە شینەبوویێ لەوانەیە چاك ببێتەوە. بەتایبەتی ئەگەر لاسکەکەی توش نەهاتبێ. بەڵام لەوانەشە دیسانەوە تووشی دەردەکە ببێتەوە ئەگەر هاتو هەوانم و شێ‌ی پێوەبێ چونکە هەوای شێ‌دار پەیوەندیەکی زۆری هەیە بەبلاوبونەوەی ئەم نەخۆشی‌یەوە.

ب ـ نیشانەی ئەم نەخۆشی‌یە بەشینایی ناو دێەرەوە یان کێڵگەوە ئەگەر هەواساردو شێ داربێ، لەوانەیە پاش شەتڵ لێدان، برکە توتنەکانی ناو دێراوی توتن تووشی ئەم دەردەبن. ئەم توش بونەش بەوەدەبێ شەتڵی نەخۆشی لێ بدرێت یاخود پاش هەڵکێشان و گواستنەوەی شەتڵەکان دەردەکە بلاو دەبێتەوە، نیشانەی ئەم نەخۆشی‌یەش بەوەدا دەردەکەوێ پەڵەی زەردی بچوك بەسەر ڕووی گەڵاوە بەشی سەرووی گەڵا نەخۆشەکانەوە پەیدائەبێ‌و وردەو ردەگەورەئەبێ ورەنگەکەی ئەبێ بەقاوەی یەکی کاڵ و ئەنجا شوێنەکەی ووشك ئەبێ‌تەوە ریشوەکانی لەیەك ئەبنەوەو دائەرزێ.

خۆئەگەر هەواشێ دارابێ‌و بارانی هەبێ ئەوە گەڵاتوش بوەکان کە نزیکن لەزەوی‌یەوە کەرووەیەکی شینی خوڵە مێشیان پێوەیە ژمارەی ئەم پەڵانەو گەورەیی‌و بچوکیان بەپێی هەوای شوێن ئەگۆڕێ. وەبەپێی زۆری‌و کەمی‌ی توش بوون گەڵا توتنەکەو توانایی بەربەرەکانێی لەوبرکە توتنەدا.

ئەگەر هەواش خۆش بێ‌و هەرلەسەرەتاوە گەڵاتوتنە کەتوش بوبێ، ژمارەی پەڵەکان زۆرتر ئەبێ‌و گەورەترئەبێ

ڕوناكی كارێكی زۆر ئەكاتە سەر بڵاوبونەوەی نەخۆشی كەروە شینە بەگەڵا توتندا. سەرنج دراوە ئەم نەخۆشی یە لەهەندێ وەرزدا وەك مافەتە بڵاوئەبێتەوە مەترسی ی لێ ئەكرێ. كەچی لەهەندێ وەرزی تردا بەدەگمەن نەبێ پەیدانابێ. بەگوێرەی باری هەوا. ئەگەر هەوا مام ناوەندی بێو نەگەرم ونەسارد، وەعاسمان هەوربێو بارانی هەبێ بایش مام ناوەندبێ ،ئەم نەخۆشی یە زۆر توندوتیژ ئەبێ ،وەبە پێ چەوانەوە ئەگەر هەوا ووشك بێو گەرم بێت و عاسمان سایەقە بێ ئەم دەردە زیان كەم ئەبێ ئەگەر پلەی گەرما هاتێتە خوارەوە بۆ نێوان (10 - 20.) ئەوا هەواكەی زۆر لەبار ئەبێ بۆپەرە سەندنی ئەو (فطریاتەی) كەئەبن بەهۆی بڵاوبونەوەی ئەم دەردە.

وە ئەگەر پلەی گەرما سەركەو تویێ زیاتر لە (25.) ئەوا تۆوی ئەم فطریاتە پێ ی ئەڵێن (كۆنیدیا) كەڵكی پەرەسەندنی پێوەنامێنێ.

تەڕایش ئەوەندەی گەرما گرنكە گەباران و شەونم بەسەر گەڵای توتنەوە هۆیەكی گرنگی پەیدابوون و پەرە سەندنی ئەم نەخۆشی یەن هەلی یەكجار لەبار بۆتوش بوونی گەڵا توتن ئەوەتا گەڵاكان (2 - 3) سەعات لەپاش خۆركەوتن بەتەڕی بمێنێتەوە..

وەهەتاگەڵاكان زۆرتر تەڕبن زۆرتر مەترسی توش بووهەیەو دەردەكە مەترسی دارترئەبێ. بەش بەحاڵی تیشكی ڕۆژیش لەگەڵێ سەرەوە كارئەكاتە سەرپەرەسەندن وبڵاوبونەوەی نەخۆشی یەكە، چونكە ئەگەر ئەو تۆوی (فطریات كونیدیی)یە 2 - 3 سەعات خۆر لێ ی بدات ئەمرێ. هەروەها تیشكی ڕۆژ مەودای توش بوونی بەم دەردە كەم ئەكاتەوە. چونكە كارئەكاتە سەركەم كردنەوەی تەڕای بۆ پەیدا بوونی دەردەكە.

## ڕێگای پاراستن وچاكردنی ئەم دەردە:-

لەكاتی نەخۆشی كەروە شینەدا پێویستە برای توتنەوان دوای ئەو ئامۆژگاریانە بكەوێ كە ئەی درێتێ بۆئەوەی توتنەكەی تووش نەبێ.

1 - تۆوی ساغیوا داشەچێنێ كەپێشان قەدە (ساق) توتنەكەی نەخۆش نەبوویێ هەروەها نابێتۆری واداچێنێ كەدوودڵ بێ لەبارەی ساغیو نەخۆش یەوە.

2 - ئەبێ شەتڵگەی توتن خۆڵێكی چاكی هەبێو حەوزەكان بچوك بن وەلەهەر مەترێكی چوارگۆشەی شەتڵگە كەیرا لە (1 / 2 )غم تۆوو زیاتر دانەچێنێ بۆئەوەی شەتڵگەكان و پر نەبن و بێ بەهۆی زۆری ی تەڕایو لەئەنجاما بێ بەهۆی بڵاوو بونەوەی نەخۆشی كەروەشینە.

3 - جارێكی تردانە چێزێتەوە ئەوشوێن شەتڵگانەی كەجاران تووشی كەروە شینەبوون چونكە لەوانەیە خۆڵەكەیان پیس بوبێو تۆوی (فطریاتی) ئەم نەخۆشی یەی پێوە بێت واباشە خۆڵی شەتڵگە بەهۆی گەرمای بەتین (وەك ئاگرتێ بەردان) یا بە هۆی ڕشاندنی دەرمانی كیمیاوی پێوەی پاك بكرێتەوە.

4 - لەكاتی هەڵبژاردنی شوێن شەتڵگەدا ئەبێ شوێنی واهەڵبژێرێ كە بەدەرەوەبێو خۆروهەو الێ یبدات، وە ئەبێ لە شوێنی شێدارو سێبەرو لەچاڵا بێت تۆودانەكات.

5 - هەر شەتڵێكی زیاد كەپێویستی هەبوو دەس بەجێخۆی لێ دەرباز بكاو بێتەوتێنێو بیكات بەژێر خۆڵەوە تانەبێ بەهۆی بڵاوبونەوەی نەخۆشی كەروەشینە.

6 - پاش شكاندنەوەی گەڵا توتنەكان قەدەكانیان هەڵكێشێو لەگەڵ هەرچی پاشماوەی گەڵا توتندا هەیە هەمووی بسوتێنێو زەوی یەكە بكێڵێتەوە بەكێڵانێكی قوڵ و هەڵی گێرێتەوە.

7 - پێویستە لەسەر توتنەوان شەتڵەتوتن لەشەتڵگەی دەرداوی یەوە نەبا بۆناو دێراو تالەڕێگای ئەم شەتڵانەوە دێراوەكان توش نەبن.

8 - ئەبێ هۆی چاكردنی ئەم دەردە بەكار بهێنرێ

